457

ڕۆمان



# پشتاشان

PSHTASHAN

حیکایەتێکە خەریکە بەسەرهاتی وڵاتگەلێک بگێڕێتەوە دڕندە و مرۆڤی تێدا دەمرن

نووسینی
عامر حوسێن

لە عەرەبییەوە
ڕابەر ڕەشید

فام

# پشتئاشان

حیکایەتێکە خەریکە بەسەرهاتی وڵاتگەلێک
بگێڕێتەوە دڕندە و مرۆڤی تێدا دەمرن




**دەزگای فام**

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAMpublication

**بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری**

**عنوان العربي**

**خلف الطواحين**

**حكاية باتت تحكي من بلدان يموت فيها الوحش والإنسان**

**تأليف: عامر حسين**

الناشر: دار ابن رشد للطباعة والنشر ٢٠١٧

ISBN: 9789776510722





**چاپی یەکەم - ٢٠٢٣**

**پشتتاشان**

نووسینی

**عامر حوسێن**

لە عەرەبییەوە

**رابەر رەشید**

بابەت: رۆمان

**پێوانە**

١٣.٥*٢١سم (٧٩٠) لاپەڕە

ISBN: 978-9922-9877-8-1

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٥١٢)ی ساڵی ٢٠٢٣ی پێ دراوە.

ڕۆمان

# پشتئاشان

حیکایەتێکە خەریکە بەسەرهاتی وڵاتگەلێك
بگێڕێتەوە دڕندە و مرۆڤی تێدا دەمرن

نووسینی:

عامر حوسێن

وەرگێڕانی لە عەربییەوە:

ڕابەر ڕەشید

# ناوەڕۆك

## پێشەکیی وەرگێڕ:

کـرداری وەرگێـڕان، لای مـن ڕەوشـت و سەرڕاسـتی و ڕاستگۆییە، زۆر جـار لە پێنـاوی گواسـتنەوەی دەقێکـدا پـێ لە تێڕامـانی هـزری خـۆم دەنـێم، جـاری وا هەیە پـێچەوانەی بیرکردنەوەی خۆیشم دەقێك وەردەگێڕم، یان بۆ سـاغکردنەوەی وشـەیەك، یـان دەسـتەواژە و دەربڕینێـك کە لەوانەیە هەڵەی چاپیش بێت، ماوەیەکی باش لە وەرگێڕانی دەقەکە ڕامدەگرێت و ئەگەر خۆم بۆم ساغ نەکرێتەوە، هانا بۆ کەسانی ئەزموونداز و بەتواناتر دەبەم، تاکوو لەوەدا دەستبارم بن، ئـاخر ئەوە ئەمـانەتی وەرگێڕانە.

لە وەرگێڕانـی ئەم ڕۆمانەشـدا -پشتئاشـان- هەمـان ڕێچـکەم گرتـۆتە بەر، چـونکە ئەگەر مـن ئەم ڕۆمـانەم بنووسـیبووایە، بە دڵنیـاییەوە بە جـۆرێکی دیـکەم دەنووسـی، لەگەڵ ئەوەی مـافی تەواو بە نووسـەر دەدەم، لەوەی نووسـیویەتی، وەك ئەوەی ئەو مافە بە خۆیشـم دەدەم دەقـی نووسـینی ئەوم وەرگێـڕاوەتە سـەر زمـانی کـوردی. لەگەڵ ئەوەی لە هەنـدێك شـوێن بـۆ دەوڵەمەنـدکردنی دەقەکە ڕسـتەیەك یـان دەسـتەواژەیەك، یـاخود

هەتا پەرەگرافێکیشم بۆ زیاد کردووە، کە هیوادارم لەمەیاندا ڕەزامەندیی نووسەر و خوێنەریشم بەدەست هێنابێت، نەك پێچەوانەکەی.

"پشتئاشان" ڕۆمانێکە لە چوارچێوەی دەقێکی ئەدەبیدا، ڕووداوەکانی ڕۆژگارێکی پڕ لە ستەمکاریی ڕژێمێکی دڕندە و خوێنڕێژ، بزووتنەوەیەکی چەکداریی ئاڵۆز و تەمومژاوی بە ناوی شۆڕشەوە، خیانەتی براکان، دەرد و نەهامەتییە کۆمەڵایەتییە کوشندەکان، تێڕوانین و هزرە فەلسەفییە جیاوازەکان، سیستەمی نێرسالاری و ڕەخنە لە هەموو شتێك، سیخوڕی و شۆڕشگێڕی و داڕووخانی ورەی پۆلایینی تێکۆشەرانی سەرسەخت و کۆمەڵێك سەردێڕی دیکە، دەگێڕێتەوە، کە هەر یەکەیان شایانی ڕۆمانێکن و لە دووتوێی "پشتئاشان"دا بە شێوازێکی ئەدەبیانە و گرێچنێکی تۆکمەی ڕووداوەکان وەستایانە ئاوێتەی یەکتری کراون.

ئەوەی لە "پشتئاشان" سەرنجی نەرێنییانەی ڕاکێشام، پشتگوێخستنی هەندێك هێزی دیکەی سەر گۆڕەپانی بزووتنەوەی چەکداریی ئەو سەردەمەیە، کە ڕووداوەکانی ڕۆمانەکەی تێدا بەرجەستە کراوە و لە خودی ئەو خیانەتکارییەی پشتئاشان، ئەوانیش قوربانیی کەمیان نەداوە. پاساوی نووسەر بۆ ئەم سەرنجە، ئەوەیە گوایە ئەوانەی دیکەش کتومت ئەو هێزانەن کە چەقی قورسایی ڕووداوەکانی ڕۆمانەکەن.

ئەوەی هانی دام "پشتئاشان" بکەمە کوردی، داواکاریی

هاوڕێ "**عومەر خدر کاکیل**" و ناونیشانی خودی ڕۆمانەکە بوو، چونکە هەردوو هۆکارەکە شایانی ئەوە بوون کە شان بدەمە بەر ئەم ئەرکە گرانە. جگە لەوەی کاتی ڕوودانی تاوانە پڕ لە خیانەتکارییەکەی "پشتئاشان" خۆشم وەکوو ئەندامێکی یەکێك لەو هێزانەی گورزی گورچکبڕیان بەر کەوت و کۆمەڵێك شەهیدی قارەمانیان دا، تا ئێستا لە هزر و ویژدانمدا، بە داخێکی زۆرەوە هەر زیندووە.

دەمەوێ ئەوەش بڵێم کە من وەکوو وەرگێڕ لە ناوهێنانی کەسایەتییەکانی ناو ڕۆمانەکە بەرپرسیار نیم.

هیوادارم توانیبێتم سەرڕاستانە و ڕاستگۆیانە ڕۆمانی "خلف الطواحین" بکەمەوە "پشتئاشان" و خوێنەری کورد بە دەقێکی ئەدەبی ئاشنا بکەمەوە.

**ڕابەر ڕەشید**

کەرکووك - بەهاری ٢٠٢٢

# پێشەکی

ئەو کەسەی من لە بارەیەوە دەدوێم، لاوێکە هاوشێوەی هەموو گەنجانی دیکە، هزرشێواوێکی جیهانی سێیەمە و خودان چەردەیەك خەسڵەت و خووی نامۆیە، ئەوانەی بە دوای بێهاوتاییبووندا وێڵ و هەڵوەدان، ئەوانەی لە ژینگەیەکدا دەژین، خودی ژینگەکەیان بەوپەڕی دژواری و سەختییەوە بەشداری لە تێکدانی هاوسەنگییان دەکات.

هەست و نەستەکانی تێکەڵەیەك بوون لە شڵەژان و ڕاڕاییەکی دژوار و تێکچڕژانێکی بە ژان. لەناو ئەو گێژاو و ژاوەژاوەدا بە دوای خودی خۆیدا وێڵ و سەرگەردانە. زۆربەی هەرە زۆری ئەم جۆرە لاوە سەرکێش و خوێنگەرمانە، کاتێك شەیدای بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆژیایەکی مرۆڤدۆستانە دەبن، ئیدی دەبنە مرۆڤێکی زۆر مەترسیدار. لەبەر ئەوەی ئامادەن هەموو دونیا لە پێناوی ئەو بیروباوەڕە مرۆڤانەیەدا سووتماك و نغرۆ بکەن، کە خۆیان باوەڕیان پێیەتی! ئەی دەبێ چی ڕوو بدات، کاتێك ئەو جۆرە گەنجانە لەناکاو بۆیان دەربکەوێت، ئەوەی ئەوان لە پێناویدا ڕەنج دەدەن و شەونخونی دەکێشن و ئامادەن بۆ هێنانەدیی ئامانجەکانیان بە نێو کێڵگەی مین و دەشتی پڕ لە دڕکەزیدا بە پێخواسی ڕێ بکەن و تەقەی سەریان بێت، جگە لە گەمژە و کاڵفامێك بەولاوە هیچی تر نین و بە دوای تراویلکەدا وێڵ و سەرگەردانن و لە گەڕانێکی بێهوودەدان؟!
کەسانێکیش هەن لەسەر هانداینان وەکوو کێچ و مێرووە

مشەخۆرەکان خۆیان دەژیێنن و ختووکەی ڕۆحیان دەدەن و بەرەو مەرگ پاڵیان پێوە دەنێن، بەوەی خۆیان هەرزان و بیروباوەڕەکەشیان لە خۆیان هەرزانترە، هەردوولاش —هەم بیروباوەڕەکە و هەمیش خۆی- لە بازاڕی بەرژەوەندییە تایبەتییەکان، شایانی سەوداکردن و ئاڵوێرکردنن. لەم حاڵەتەدا، ئەو گەنجە یان دەبێتە تارمایی و خێوێك و ئەوە هەڵدەلووشێت کە سووکایەتیی پێ کردووە و بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاری هێناوە، یان بە بەخت و چارەنووسی خۆی ڕازی دەبێت و لە داخی ئەو ڕۆژگارە سەخت و جوانەی ژیانی کە لە پێناوی درۆیەکی شاخداردا بەخشیویەتی و باوەڕی پێ کردووە، بە بێدەنگی دەستەپاچە دەبێت و خۆی گرمۆڵە دەکات و دەست بە خۆیدا شۆڕ دەکاتەوە و تف لە هەموو شتێکی دەوروبەری خۆی دەکات، ئەوەی تاکوو دوێنێ بە لایەوە بەشێك بوو لە پیرۆزییەکان، بەر شەق دەدات و نائومێدی وەکوو مۆڕیکانە سەرتاپای خولیا و خەونەکانی ئەنجن ئەنجن دەکەن، هەتا تف لەو پیرۆزی و بێهاوتابوونەیشی دەکات، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆی پێ فریو دابوو.

# بەشی یەکەم

لە یەکێـــك لە شـــەوە گەرمەکـــانی هـــاوینی ١٩٨١، کە ئەستێرەکان لە باوەشی ئاسماندا بۆ سرووشت بزەیـان دەهـاتن و دەخنـانەوە، دەسـتەیەك لەو پێشـمەرگانەی لەسـەر داروپەردووی گونـدێکی چـۆل و وێـرانەدا بارەگایەکیـان چـێ کردبـوو، ئەو گوندەی دەکەوێتە ئامێزی قەدپاڵێکی چیای حەسارۆسـت، ئەوان لەو کاتەدا بۆ بەهاناوەچوون و فریاکەوتنی دەستەیەکی دیکەیـان ڕێگەیەکی سەختیان گرتبووە بەر، کە لە دووریی دوو ڕۆژەڕێی پیادە لێیانەوە دوور بوون، لە نزیك ئاواییەك بە نـاوی وەرتـێ کە ئەویش پاڵی بە لایەکی چیـای کـارۆخەوە داوە و ڕاستەوخۆ لە پشت چیای هەندرێنی سەرکەش و بەناوبانگەوەیە.

بەهاناوەچوونەکەش لە سۆنگەی ڕووداوی دەسـتدرێژیکردنە سـەر ئەو کـۆمەڵە پێشـمەرگەیەی ئەوێ بـوو، کە لە لایەن پێشـمەرگە هاوپەیمانەکـانی دیکەیـانەوە کرابـووە سـەریان، دەسـتدرێژییەك جـارێکی تـر خەریـکە ڕیزەکـان لە یەکتـری دەترازێنێـت و خـوێن لە نێوانیانـدا دەڕژێتەوە، لەجیـاتیی ئەوەی هەردوولایان لە شەڕی دوژمنێکـی هاوبەشـیان بوونـایە نەك دژی یەکتری بجەنگن. وا دیارە ئەو شەڕ و پێکـدادان و لێکتـرازانەی نێوان پێشمەرگەکان کۆتایی نایەت، تەنانەت لەناو ئەوانەی سـەر بە یەك نەتەوەشـــن. تـــا ئێســـتا کەس هۆکـــاری پشـــت ئەم دەسـتدرێژییەی دوایـی نازانێـت. هەنـدێکیان دەیـانگوت: مـام جەمالی سەرکردەیان بە نهێنی دەستی لەگەڵ حکوومەتدا تێکەڵە و هاوکاریـان دەکـات، بەمەش هەرچـی فەرمـانی ڕژێـم هەیە

جێبەجێی دەکات، تاکوو ئەوانەی لە دەستی ستەم و زۆرداریـی دەسـەڵات ڕا دەکەن، نەچـنە ڕیـزی پێشـمەرگەی ئەو لایەنەی خەریکە گەشە دەکەن و بەهێز دەبن و ناوبانگیان لەناو خەڵکیدا زیاتر دەبێت و جێی خۆشیان زیـاتر و پتەوتـر دەکەنەوە. کەسـی دیـکەش هەبـوو دەیگـوت: پرسـەکە تەنهـا ململانێـیە لەسـەر سەپاندنی دەسەڵات و کوێخایەتی بەسەر ناوچەکە و هیچی تر. کەسانی دیکەش هەبوون دەیانگوت: هەموو کێشـەکە پەیوەستە بەو کەیف و هەوەسـەی کە مـام جەمـال هەیەتـی، چونکە ئەو جـاری وا هەیە هەتـا شـەڕ لەگەڵ مێشـەکانی سـەر ڕوخسـاری خۆشی دەکات.

ئەم مـام جەمـالە، لە دەوروبەری تەمەنـی پەنجـا سـاڵیدایە، دەموچـاوێکی گـوپن و جەسـتەیەکی تێکسـمڕاو و قەڵەو و دیمەنێکـی قەبە و زلـی هەیە، وەك ئەوەی پەیکەرێـك بێـت لە شـاخ، کێشـێکی وا گرانیشـی هەیە، هەتـا ئەو هێسـترەی لەسـەر پشتی خۆیشی هەڵیدەگرێت، نرکەی دێت و بە دەست ئەو بـارە گـرانەوە دەناڵێنێـت، بە دڵنیاییشـەوە نەفـرەت لەو بەخـت و نـاوچەوانە ڕەشـەی خـۆی دەکـات کە تووشـی ئەو ڕۆژگـارەی کـردووە و بەو بـارە قورسـەی سەرپشـتییەوە بەو چیـایەدا هەڵدەزنێت، تاکوو بەو تووڵەڕێیەدا بیگەیەنێتە یەکێك لەو شـوێنە خۆشانەی کە لێرە و لەوێ بۆیان دروست کردووە. مـام جەمـال دەسـەڵاتێکی بەهێـز و تـۆکمە و ژمـارەیەك چەکـداری زۆری هەبوو. ڕووبەرێکی فراوانـی لە چیـا و پێدەشـتەکانی کوردسـتان داگیـر کردبـوو. پەیوەنـدییەکی هەمیشـەیی پـڕ لە دڕدۆنگـی و نائارامیشی لەگەڵ سەرکردەیەکی دیکە هەبوو بە ناوی مەحموود بورهانی، ئەویش دەسەڵاتێکی یەکسان و هاوشێوەی دەسـەڵاتی مام جەمالی هەبوو ئەگەر زیاتر نەبووبێت. هەر یەکێکیشیان هیوا

و ئاواتی لەمێژینەی سەرکەوتن و زاڵبوون بوو بەسەر ئەوەی تردا، چەندین جار شەڕی درێژ و خوێناوییان لە نێواندا هەڵدەگیرسا و بە سەدان چەکدار لە هەردوو لایان دەکوژرا و زیانی گەورەیان بەر دەکەوت، هیچ لایەکیان توانای کۆتاییهێنان و لادان و دوورخستنەوەی ئەوەی تریانی لە گۆڕەپانەکە نەبوو. دیارترین خەسڵەت و خوویەك کە مام جەمال هەیبوو، بە دەستێك تەوقەی لەگەڵ دەکردی و بە دەستەکەی دیکەش خەنجەری لێ دەدای. وا دیارە ئێستا دەستی چۆتە خوێنی هاوڕێکانیان و لە ناکاو و بێئاگاییدا پاشقوولی داون و غەدری لە چەکدارەکانیان کردووە، وێڕای ئەوەی ئەو هاوڕێیانەی کە ئێستا دەستدرێژییان کراوەتە سەر، هەمیشە لە پێشبڕکێدا بوون بۆ ناوبژیکردن و کوژاندنەوەی ئاگری نێوان خۆی و دژبەرەکەی، بۆ ئەوەی ئەو شەڕە خوێناوییەی نێوانیان ڕابگرن و کۆتایی پێ بهێنن و چیتر خوێنی گەنجان و چەکدارانی هەردوولا بە دەستی یەکتری نەڕژێنرێت و بە فیڕۆ نەچێت و نەکوژرێن.

دەبوایە دەستەکەی ڕۆستە کە ئیبراهیم سەرپەرشتی دەکردن، بۆ گەیشتن بە چیای هەندرێن خۆیان بخزێننە نێوان ڕەبایە سەربازییەکانی سەر بە حکوومەت، ئەو چیایەی کە دواتر ناویان نا چیای تینوو. ئەوەش بە هۆی ئەوەی ئەو چیایە سەرکەش و تۆقێنەرە، جگە لە کانیاوێکی بچووك، هیچ کانی و سەرچاوەیەکی دیکەی ئاوی تێدا نییە، کانیاوێك پڕاوپڕ لە زیروو و جۆرەها کرم و میکرۆبی تر، ئەو کانییەش "کانیی گوێز" بوو، تێکڕای دەستەکە تەنها سێ زەمزەمییەی ئاویان پێ بوو، کە هەر یەکەیان نزیکەی سێ پەرداخ ئاوی دەگرت، ماوەیەکی درێژیش بوو سەرباری ڕەزیلی و وەکوو پێشمەرگەیەکیان گوتەنی: "قرچۆکی" و دەستپێوەرگرتن و

ناوەناوە دابەشکردنیشیان لە نێوان خۆیاندا، وەلێ دووانیان بەتاڵ و سێیەمیشیان بە قەد کەسێکەوە بوو ناوی قاسم بوو، وای لەو قاسمە، جووتیارێکی ملهوڕ و لەخۆبایی و کەللەڕەقی یەکێك لە گوندەکانی ناوچەکە بوو، تەمەنی لە دەوروبەری بیست و پێنج ساڵیدا بوو، دوای نەگونجان و کێشەی لەگەڵ ماڵەوەیان پەیوەندیی بە دەستەکەوە کردبوو، دواتریش هۆکارەکەی بۆ هەموو لایەك ئاشکرا بوو، بەهەرحاڵ ئەوانە کێشەی نەزۆك و هەمیشەیین و کۆتاییان نایەت، هۆکارە سەرەکییەکەیشی ئافرەت و ژن و ژنخوازی بوو، جووتیاران بە درێژایی دەیان سەدە پشتاوپشت بۆیان ماوەتەوە و چەندین سەدەی دیکەش دەمێنێتەوە و هیچ یاسا و ڕێسایەکیش دەستی بۆ نابات، هیچ با و باهۆزێکی گۆڕانکارییش نایانگرێت و نایانگۆڕێت و پەی بە ڕیشەکێشکردنیان نابات.

ئەو قاسمە لای جووتیارانی ناوچەکە پاڵەوانێك بوو بۆ خۆی، ئاخر ئەوان پێوەری نامۆ و سەمەرەی خۆیان بۆ هەڵسەنگاندنی مرۆڤ هەیە. قاسم سمێڵێکی گەورە و پڕی هەبوو، لە کاتی داربڕیندا کاتێکیش دەسکی بیورەکەی دەگرت، مرۆڤ سڵی لێ دەکردەوە، ئەو دوو نیشانەیەش بەس بوون بۆ ئەوەی وەکوو پیاوێکی زۆر بەهێز دەربکەوێت! ئەوە جگە لەوەی کەس نییە قسەی لە عەردی بدات، قاسم بە ئاشکرا بڕیاری کوشتنی خوشکەکەی و ئەو کوڕەی هەڵیگرتبوو و تەنانەت ئەوانەشی دابوو، کە پیرۆزباییان لێ کردبوو و داڵدەیان دابوو، سووریش بوو لەسەر جێبەجێکردنی، لەبەر ئەوەی خوشکە شێتەکەی کارە "قۆڕ و پڕ لە شەرمەزاری"یەکەی ئەنجام دابوو، بێ ئەوەی حیسابێك بۆ سمێڵە بابڕ و گەورەکەی براکەی بکات، کە هەردوو لا لێوی داگرتبوو و بەسەر زاریدا هاتبوونە

خوار. عەشیرەتیش، گەورە و بچووك ئومێدی تۆڵەی شەڕەفیان لەسەر قاسم هەڵچنابوو، بەوەی کە گوایە ئەو کیژۆڵەیە -بە حیساب- ئەو شەڕەفەی دۆڕاندبوو. ئیدی خزمانی خێڵ تا دەهات بۆ تۆڵەکردنەوە ناخیان پڕتر و وێرانتر دەکرد و زیاتر هانیان دەدا، بەمەش ڕق و کینەی ناخی خۆی دەخواردەوە و زیاتر هەستی بە کێماسی و لەدەستدانی پیاوەتی و سەرشۆڕی و شکۆی لەدەستچووی خۆی دەکرد و ڕقی لە هەموو شتێکی دەوروبەری خۆی دەبووەوە، هەتا لە خودی خۆیشی، بە تێپەڕبوونی کات ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕا و لەڕوڵاوازتر دەبوو و ڕوخساری هیچ نیشانەیەکی مرۆڤبوونی پێوە نەدەما، ئەوەتا ئێستا وا لەگەڵ دەستەکەدا بەڕێوەیە و چاوەکانیشی ڕێشکەوپێشکە دەکەن، مرۆڤ لە کاتی سەرنجدان لێی وا مەزەندە دەکات هیچ نابینێت و بیر لە هیچ شتێکیش ناکاتەوە.

ئەو دەستەیە زۆر شارەزای بزنەڕێیەکانی چیای هەندرێن نەبوون و سەرەدەرەییان لێ دەرنەدەکرد، بە ناچاری لەناو خۆیاندا پشتیان بە کەسێك بەست، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان پێیدا تێپەڕیبوو، وەلێ ئەو کەسە هەتا لە هەنگاوەکانی خۆیشی دڵنیا نەبوو، چ جای تووڵەڕێگەکانی قەدپاڵی هەندرێن.

ڕێککەوت وای هێنا، قەدپاڵی چیایەکە مینڕێژ کرابوو، یەکەم کەسیش ڕێنیشاندەرەکەیان پێوە بوو. هیچ یەکێك لە دەستەکە لە ترسی تەقینەوەی مینێکی تر، بوێری ئەوەی تێدا نەما، یەك هەنگاوی دیکە بۆ پێشەوە بە قەدپاڵەکەدا هەنگاو بنێت، بە ناچاری پشتیان بە قاسم بەست، بەڵکوو ئێ ئەمە خوایە بزنەڕێیەکانی ئەم شاخە ترسناکە ڕووتەنە بزانێت و بدۆزێتەوە، بەڵام کاتێك داوای ئەوەیان لە قاسم کرد کە ڕێبەرییان بکات، هەموو ئومێدەکانی بەتاڵ کردنەوە و گوتی لە ژیانیدا بەم

نــاوچەیەدا تێنەپەڕیــوە، بــۆیە دەســتەکە بە بێســەروبەرەیی و ڕێنیشاندەرێك لەم تاشەبەردەوە بۆ ئەویان و لەو قەدپاڵەیانەوە بـۆ ئەمیان لە بازبازۆکێدا بوون. پاش چەنـدین کـاتژمێر ڕێکـردن و هەڵگژانـی هەڕەمەکـی بە شـاخەکەدا، تێنـویێتی پەلامـاری دان و پـرزەی لەبەر بڕیبـوون، خەریـك بـوو تێنـویێتی نـاو هەناویـان بسووتێنێ. تا وایان لێ هات تراویلکەی بیرە ئاو، یان کانیاوی پڕ لە ئاو و جەڕەی شکاویان بە بەرچاودا گوزەر بکـات، کانیـاوی سازگار و جەڕەی تەزیوی ئەوتۆ کە هێشتا دڵۆپە ئاوی ساردیان لێ دەچۆڕێت. بەڵکـوو ئەم تێنـویێتیە دڵـڕەقە خـۆی لێیـان بکـاتە هونەرمەنـدێکی هەسـت ناسـك و بە پەڕەمـووچەکەی دەسـتی جـوانترین وێـنەی خـوای ئـاوی سـازگار بکێشـێت، ئەم تـابلۆ باراناوییە بێدەنگە ناخی پڕ لە ژیان دەکردنەوە، کاتێك گوێیان لە خوڕەی ئاوێکی خەیاڵی دەبوو کە لە جۆگەلە ئاوێکی قەدپاڵەکە و لە نێوان تاشەبەردەکانەوە شـۆڕ دەبێـتەوە و کەف و قەڵـبەزەی بە دەوروبەری خۆیـدا ئـاوپرژێن دەکـات، وەلـێ کـوانێ ئـاو؟! تێنـویێتیەکە تـا دێـت زیـاتر گەروویـان وشـك و هەنگاوەکانیـان خاوتر دەکاتەوە.

لەو کـاتەدا ژمارەیـان حەڤـدە کەس بـوو. پیـرە "کاکیـل"ی تێکۆشـەر و دونیادیـدە و خـاوەن ئەزمـوونی درێـژی خەباتیـان لەگەڵدا نەبوو، تـاکوو بێـتە فریادڕەسیان، ئـاخر ئەو هەمیشـە لە دۆخی وادا ژیرانە بڕیاری دەدا، خـۆ ئەگەر لەگەڵیـان بـووایە بە دڵنیـاییەوە چـارەیەکی دەکـردن، بەڵام ئیبراهیمـی سەردەسـتە و سەرپەرشتیاری ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیە، ئەو ئەزمـوونەی نەبـوو، چونکە ئیبراهیم کوڕی شاری و زۆربەی ئەو ژیـانەی ژیـابوو لە شارە گەورەکاندا بەسەری بردبوو، هـیچ سـەروکاری بە شـاخ و شەڕەوە نەبوو، بەڵام ئەو جەنگانەی دەسەڵات بەرپایان دەکـات،

ڕێـگە بە کەسـێکی وا نـادەن لە شـاردا ئاسـوودە بێـت. لەو سـەروبەندەی هێشـتا ئەو لە شـاردا بـوو، مەرگ هەمـوو چرکەساتێك چاوشارکێی لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکرد و بێشەرمانە لە دەرگای ژیانی دەدان. تا حاڵ گەیشتبووە ئەوەی خەڵکی لە هەرزانبوونی ژیانی خۆیان بکەونە گومانەوە و لەوەی بۆچی پەتای جەنگ وا دەسکەنەیان دەکات؟ بۆیە بە ناچاری ڕوویان لە شاخ و پەیوەندیکردن بەو پێشمەرگانەوە دەکرد، کە بڕیاری بەرەنگاربوونەوەی مەرگی سەرشۆڕییان دابوو، خۆ بە لایەنی کەمەوە لە شاخ دەزانن بۆچی شەڕ دەکەن؟

پێشـمەرگەکان خۆیـان ئیبراهیمیـان وەکـوو سەردەسـتە و فەرمەندەیان دەستنیشان کردبوو، وەلێ دوای ئەوەی تێکۆشـەرە بە ئەزمـوونەکە، پیـرە "کاکیـل" ڕووی لە شـاخ کـرد، ئەو دەستبەرداری بەرپرسیاریتییەکەی بوو، بەڵام پیرە تێکۆشەرەکە وای پێ باشتر بوو لەژێرەوە ڕێنوێنییان بکات و هەر کاتێك و لە هەر کارێکدا ئەوان ڕاوێژی پێ بکەن، ئەو ئامادەی هاوکارییان بێـت، هەرچەنـدە خۆیشـی بەو تەمەنەوە یەکێـك بـوو لە پێشمەرگەکان.

ئیبراهیم کوڕێکی ڕەشتاڵە و تێکسمڕاو، دەست و مەچەك و ئێسك و پڕووسکێکی تۆکمە و پتەوی هەبوو، ڕێك لە کۆڵەگە و ستوون دەچوو، پێیەکانی کتومت لە پێی فیل دەچوون، ئەو بونیاد و لەشولارەی کە بێ کێشە و تەندروست دەکەوتنە بەر چاو و مرۆڤ ئیرەیی پێ دەبردن، وەلێ لە ڕاستیدا ئەو هێزەی نەبوو، چونکە نە خواردنێکی باشی چنگ دەکەوت و نە پشوودانێکی ئارام، خۆراك و پێخۆری ئەویش جیاوازیی لەگەڵ پێخۆری ئەوانی تر نەبوو، لە لەڕولاوازیدا لەیەکتری دەچوون، لە تابلۆیەك دەچوون، برسێتی و ماندوێتی شەکەتی کردبن، بەڵام

ویڕای ئەو بێهێزییەی کە لەگەڵ ئەو بونیادە تۆکمە و پتەوەیدا وێک نایەنەوە، ئارامگرێکی سەیر بوو، دەڵێن لە زستانێکی تەڕوتووشدا زنجیرە چیای حەسارۆستی بڕیوە، ئەو حەسارۆستەی وەك دەڵێن لە زستاندا ڕێك لە بیابانێکی بەفراوی دەچێت، بێ ئەوەی پێیەکانی لە بەڵای ڕچین و تەزینیش بپارێزێت، بێ ئەوەی کەسێك لەوانەی لەگەڵیدا بوون بەوە بزانن، تاکوو پێیەکانی بەفر دەیانبەستێت و هیچ هەستێکیان تێدا نامێنێت، بێ ئەوەی خۆی هەستیشی پێ بکات، ئەو بەفرە بێبەزەییانە تاکە پێلاوێکی لە پێ دادەماڵێنێت، کاتێکیش هاوڕێکانی پێی دەزانن، هیچ چارەیەکیان نامێنێت، جگە لەوەی بە پارچە جەمەدانییەکانی سەریان ئەو پێیە ساردوسڕەی بۆ دەپێچن، بە جۆرێك ڕێك لە شێوەی تۆپ بچێت. دوای ئەوە بەو حاڵەوە بۆ چەندین کاتژمێری تر لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبێت، کاتێکیش دەگەنە گوندێك، ئینجا ئیبراهیم گوێ لە ئازاری پێی دەگرێت و وەڵامی ئەو ئازارە گورچکبڕەی لاقی دەداتەوە، بێ ئەوەی ڕێگە بدات ئەوانەی لەگەڵیدان هەستی پێ بکەن و پێی بزانن، ئیدی بە ناچاری خۆی دەداتە دەست تایەکی گەرمەوە، کاتێکیش پێشمەرگەکانی دەوروبەری پێ دەزانن بە نیگەرانییەوە سەرنجی دەدەن و هەوڵی ئارامکردنەوەی دەدەن، تا خەوی لێ دەکەوێت و کاتێکیش هەڵدەستێ ژانەکەی وەکوو پەرچوویەك و موژدەیەکی خۆش دەڕەوێتەوە و نامێنێت، وەك ئەوەی هەر هیچ نەبووبێت، خۆ ئەگەر ئەم بەڵایە تووشی هەر کەسێکی دیکە بووایە، بێگومان دەبووە مایەی بڕینەوەی قاچی، ئاخر لە هەلومەرجی وادا گانگری کوندەپەپۆیەکی شوومە و لەسەر کەلاوەی شکستخواردووی مرۆڤەکاندا بە دەنگێکی گڕەوە دەخوێنێت و هەواڵی ڕەشبوونەوەی قاچە ساردوسڕەکان ڕادەگەیەنێت، وەلێ دیارە ڕێککەوت لەناو هەموویان ئەوی

هەڵبـژارد، چـونكە لە هەموويـان پشـوودرێژتر و خـۆڕاگرتر و بەئارامتر و جەستە پتەوتر بوو.

ئەم دەسـتەیە كەموكـووڕیی زۆریـان هەبـوو، سـەرباری سەنگەرگرتن لە كاتی شەڕ و پێكدادان و ئەزمـوونیش. چـونكە سـادەترین پێداویسـتییەكانی مانەوەیـان نەبـوو، نە ئـازووقەیەكی عەمبـاركراو و نە چەك و جبەخـانەیەك، ئەوان چـاوەڕوانی ئەو دەسـتكەوتانە بـوون كە دوای شـەڕەكان لە دوژمـنەوە دەسـتیان دەكەوت. زۆربەی ئەو دەستە پێشمەرگانەش لە شەڕەكاندا پلانی "لێـدە و ڕاكە"یـان پەیـڕەو دەكـرد، زۆر جـاریش دەبـوونە پـارووەكی چەوری دەسـەڵات، چـونكە هەر سـیخوڕ و بەكرێگیراوێكـی ڕژێـم كە بە گوندەكانـدا پەرتەیـان كردبـوو، ڕژێمیان لە جووڵەی ئەو دەستە چەكدارانە ئاگادار بكردبووایەوە لە هەر پەناگە و بن بەرد و شاخێك، دەیان و سەدان بۆسەیان بۆ دادەنـانەوە و كۆپتەرەكـانیش كێومـاڵی شـاخەكانیان دەكـرد و بەدوایانـدا دەگەڕان، هەر لەگەڵ دۆزینەوەیـان، ئیـدی گـورزی گورچكبڕیان لێ دەوەشاندن و بەزەییـان بە هـیچ زیـڕۆحێكیش نەدەهاتەوە، كە لە دەوروبەریاندا بجـووڵێنەوە، تـاكوو بە تەواوی قڕیان دەكردن. ئەو دەستەیەش كە لە قەدپاڵی چیـای هەندرێنـدا وێـڵ بووبـوون، چـاوەڕوانی هەمـان چارەنووسـیان دەكـرد، بە تـایبەتییش دوای تەقیـنەوەی مینێـك بە ڕێنیشـاندەرەكەیانەوە وا سەری لێ شێواندن، نەزانن هەنگاو بەرەو كوێ بهـاوێژن و ڕوو لە كام لا بكەن.

سبەینێ كە خۆرهەڵات، هێندەی نەبرد تاشەبەردەكان گڕیان لـێ هەڵدەسـتا و شـەپۆلە گەرمـایەكی وا لە نێـو هەناویـانەوە دەردەچـوو، ڕێـك لە گەرمـایی نـاو كـوورەی ئاسـنگەرەكانی سەردەمی زوو دەچوو. هەڵگـژان و سـەركەوتنیش بەو قەدپـاڵەدا

شەکەتی و وشکھەڵاتنێکی وای لێ چاوەڕوان دەکرا، کە بە قسە باس نەکرێت. هیچ گیانلەبەرێك توانای ڕێکردنی بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك نامێنێت، ئەگەر دوا دڵۆپە ئارەقی جەستەی چك بکات، چونکە هەر خانە و بەشێکی ئەو جەستە شەکەتە هاواری ئاو دەکەن و دەبنە بەردێکی وشکوبرینگی مردوو و بێ ژیان.

پێشمەرگەکان دەیانزانی ڕێگەیان ون کردووە و هەرگیز ناگەنە سەر کانییە تاقانەکە و لەناوچوونیان مسۆگەرە، یەك دوو ڕۆژی دیکە بۆنی تەرمەکانیان چیای هەندرێن بۆگەنی و پڕ دەکات، چونکە تیشکی خۆرە گەرمەکە بۆگەن و وشکیان دەکاتەوە، ڕێك لە شێوەی مرۆڤە مۆمیاکراوەکان. هەتا ئاژەڵە دڕندە و کێوییەکانیش بوێری و سەرکێشیی ئەوە ناکەن بێن و ڕوو لە زەوییەکی شەقارشەقاربووی تێنوو بکەن لە پێناوی پاروویەکی بۆگەندا.

گەروویان وشك وشك، لێوەکانیشیان قڵیشابوون، جلوبەرگە چڵکنەکانیشیان بە ئارەقی جەستەیان بۆنێکی ناخۆشیان لێ دەهات، لووتی مرۆڤی دەچزاندەوە.

ئومێدی ئەوەی لێوەکانیان بەو کەمە ئاوەی ناو تاکە زەمزەمییەکە تەڕ بکەن، هێشتا کەمێك وزەی پێ بەخشیون و هێشتا کاتیش بە بەرییەوە ماوە و چەندین کاتژمێری دیکەشیان لە بەردەمدایە پێش ئەوەی یەك یەك لە تێنواندا لە پەلوپۆ بکەون.

لە نیوەڕۆدا گەرمیی خۆرەکە تاوی سەند و یەك لە دوای یەك دەکەوتنە سەر زەوی و سەرلەنوێ هەڵدەستانەوە و بە کووڕە کووڕە بەلادا دەهاتن و دەستەکانیشیان شلوخاو، وەك ئەوەی دەستەکانیان بەشێك نەبن لە جەستەیان، یان وەك ئەوەی

بە دەرزیـــلە بە شـــانیانەوە هەڵواســـرابن، وەلـــێ ئیبـــراهیم بە زەردەخەنەوە هـانی ئەوانـی دیـکەی دەدا لەسـەر ئـارامگرتن و بەردەوامبوون! بەڵام بەردەوامبوون بۆ کوێ؟! کەس نازانێت!

تەنانەت خۆیشی نازانێت بەرەو کوێیان دەبات! جارجارەش نـوکتەیەك و قسـەیەکی خۆشـی بـۆ دەکـردن، بـۆ ئەوەی پێشمەرگەکانی بە نـوکتەکەی پێبکەنن و بـۆ چەنـد خولەکێـك، کورە تۆ بڵێ بۆ چەند چرکەیەك تێنوێتییەکەیان لە بیـر بچێتەوە، وەلێ نوکتەکـانی هـیچ کاریگەرییـان لەسـەر دەروونیـان نەبـوو، بەڵکـوو ئەوەیشـی نەدەزانـی کە ئەو پێکەنینە ئەگەر لەدەسـت دەربچێـت، ئەوا گرژییەکـانی دەبـنە گریـانێکی بە کـوڵ و هیسـتریایانەی ئەوتـۆ، هـیچ کەسـێك توانـای بەرزەفتکـردن و جڵەوکردنی نامێنێت، چونکە لەو جۆرە بارودۆخانەدا دەرگـا و دەروازەی سۆزداری، هەر کامێکیان بن، شـادی یـان خەمبـاری، دەبێت دابخرێن و نەورووژێندرێن، ئەگەرنا ئەنجامەکەی بە دڵی کەسیان نابێت.

دوای تێپەڕبوونی چەنـد کـاتژمێرێکی تـر هەموویـان لێـرە و لەوێ دەکەوتن، ئیبـراهیم لە قاسـم نزیـك کەوتەوە و دەسـتێکی لەرزۆکی بۆ درێژکرد، تاکوو زەمزەمییەکەی لێ وەربگرێـت، لە هەمان کاتدا بەوانەی گوت کە بەرەو لای قاسـم سکەخشـکێیان بوو:

- هەر کەسە و بەشی خۆی پێ دەدەم، بـێ کەم و زیـاد، هەر یەکە و نیو سەرە زەمزەمییەی ئاو، تەنها نیو سەرە زەمزەمییە، بەڵکوو بەشمان بکات!

هەر باشە خۆ بەرلەوەی بمـرن، جـارێکی تـر دڵۆپە ئاوێـك دەمیان تەڕ دەکاتەوە. زۆربەیـان لە خەمـی نیـو سـەرە زەمزەمییە

بەشە ئاوەکەیان بوون، لە ناکاو هەموویان بە لای قاسمدا ئاوڕیان دایەوە کاتێك گوتی:

- زەمزەمییەکە بەتاڵە.

ئیبراهیم چاوەکانی بە جۆرێك زەق بوونەوە خەریك بوو لەناو چاڵی چاویدا بێنە دەرەوە و بەو قەدپاڵە وشکەدا خلۆر ببنەوە خوارەوە، هەرا و دەنگەدەنگ لەناو پێشمەرگەکاندا تەشەنەی سەند و جۆرێك لە وزە و چالاکی پێ بەخشین و هەندێك لەو هەستانەی بە ئاگا هێنانەوە کە خۆیان دابووە دەستی لەناوچوون و مەرگەوە.

ئیبراهیم بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

- چییی...؟ چۆۆن...؟!

مامۆستا عومەر بە تەوەزەلی و دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- ئەی ئاوەکە بۆ کوێ چوو؟

ئیبراهیم بۆی تەواو کرد، وەك ئەوەی یارمەتیی مامۆستا بدات لە قسەکردن:

- خواردتەوە؟

سعوود بە گاگۆلکێ بەرەو لای قاسم چوو:

- ئەمە کەی؟! بڵێ!

زەمزەمییەکەی لە دەست ڕاپسکاند، ڕایشەقاند، تاکوو گوێ لە ئاوەکەی ناوی بگرێت. وەك ئەوەی باوەڕ نەکات. پاشان سەرەکەی کردەوە، لە بەتاڵییەکەی دڵنیابوو، سەرەوژێری کرد، بینی ناو هەناوی زەمزەمییەکەش لەناو هەناوی ئەوان وشکترە. تەنها دڵۆپێکی بچووك لە دەمی زەمزەمییەکەوە خزی و بازیدایە

خوارەوە، ئیدی لەپی دەستەکان بەدوای ئەو دڵۆپە ئاوەدا کەوتنە جـووڵە بـۆ ئەوەی بیگـرنەوە، وەك ئەوەی پاشـماوەی ژیـانێکی سەرگەردان بێت و بەرەو نغرۆبوون و لەناوچوون بچێت.

ئیدی هەمووان بە چاوی ڕق و خەمبـارییەوە سـەرنجیان لە قاسـم دەدا و زەمـزەمییەکەش لەم دەسـتەوە بـۆ ئەو دەسـت لە خووڵانەوەدا بوو. ئەویش بێدەنگ، وەك ئەوەی کەللەسەری بەر چەکوچ بکەوێت، هێشتا وەڵامی پرسـیارێکی نەدەدایەوە، دەیـان پرسیاری دیکە دەبارییە سەری.

ئەوەشیان یەکێکی تـرە بە نـاوی هـۆبی، کە خزمـایەتییەکی دووری لەگەڵ قاسمدا هەیە و دەیەوێت لەگەڵیدا تێکی بدات و بیقەومێنـێ، بە ڕوویـدا قیژانـدی و هـاواری کـرد و لەگەڵ هەر وشەیەکیشـدا شـانی خـزمەکەی بە تونـدی ڕادەوەشـاند. کەس نەیدەزانی ئەو هەموو هێزەی لە کوێ کۆ کردۆتەوە، بەو جـۆرە یەخەی قاسم ڕادەتەکێنێت:

قاسم کە هێشتا پەشۆکابوو گوتی:

- چی بکەم، هیچ پارچە پەڕۆیەکم پێ نەبوو؟

یەکێکیان دایە پرمەی گریان و لە ناکاو هاواری کرد:

- کوڕی قەحبە... واتە پاشەڵت پێی شوشتووە؟

ئەو گەنـجە ڕەحمـان بـوو. چەنـد خـولەکێکە چـاودێریی هەموویان دەکات و ڕوخساری سەخت و دژوار دەردەکەوێـت، قژێکی نەرم و درێژی هەبوو کە تا سەرشـانی شـۆڕ بووبـووەوە. ڕیشێکی تۆخیشی هەبوو لە نەرمەی گوێچکەیەوە بە پانـایی دوو پەنجە دەستی پێ دەکرد، تا دەگەیشـتە خـوار چەنـاگەیەوە و لە تۆپی تێنس دەچوو، ڕێك وەکوو داری حەیزەرانیش باریکەڵە.

ئیبراهیم بۆ هێورکردنەوەی ئەوانەی خەریکە بە شەڕ دێن هاتە دەنگ:

- هەمووتان واز بێنن. ئەمە چ هەڵسوکەوتێکی گەمژانەیە؟! هاتوهاوارتان بێسوودە و زیاتر تێنووتان دەکات. هەموومان ئەم هەڵەیە لە ئەستۆ دەگرین، هەرچییەکیش بکەین، تازە ئاوەکە ناگەڕێتەوە و... پاش کەمێك بێدەنگی بزەیەکی کرد و گوتی:

- ئەوە چ قوون و پاشەڵێکە نرخەکەی ژیانی حەڤدە پێشمەرگە بێت..؟!

برینپێچی دەستەکە، یان چاکتر وایە بڵێین دکتۆری دەستەکە، ئاخر لە شاخ و لەناو پارتیزانەکان و هێزە چەکدارەکانی شاخ، هەر کەسێك تەنها توانای دەرزیلێدانی هەبێت، نازناوی دکتۆری بە بالادا دەبڕن و هەتاهەتا ئەو نازناوەی لێ نابێتەوە، ڕێك وەك ئەوەی کۆلیژی پزیشکی تەواو کردبێت. بۆیە ئێمەش لێرەدا هەر بە دکتۆر ناوی دەبەین. دکتۆرەکە ساکەکەی لە پشتی هێنایە خوارەوە و بە بێتاقەتی لەسەر زەوییەکە ڕاکشا، لەبەر خۆیەوە منگەمنگێکی کرد:

- هەر بە ڕاستی کوڕی قەحپەی.

پێشمەرگەیەکی دیکەش کە ناوی ئازار بوو لە تەنیشتییەوە ڕاکشا، شەبەنگی زەردەخەنەیەکی ماندوو لەسەر ڕوخساری دەرکەوت و ئەویش لەژێر لێوەوە:

- دەك داوەشێی.!

هەندێکی دیکەشیان بەرەو لایان خشین و لە نزیکیانەوە ڕاکشان. ئەو پارچە زەوییە ڕووتەڵان و خۆڵاوی بوو، ڕێژەیەکی بێئەندازە قارچکی سپیی وشکەوەبووی وەکوو بەردی لێوە

دەرچووبوو، هەر یەکێکیان هێندەی گندۆرەیەکی مامناوەندی دەبوون.

عومەر بە هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵەوە پرسی:

- ئێستا دەبێ چی بکەین؟!

وای گوت و ئەویش لەسەر زەوییە خۆڵاوییەکە ڕاکشا و یەکێك لەو قارچکە وشکانەی هەڵگرت و دەستی بە پشکنینی کرد، پاشان کەمێك تووڕی هەڵدا. لە شوێنی خۆیدا وشك بوو و هیچی نەگوت. عومەر پێش ئەوەی بێتە ڕیزییانەوە، لە یەکێك لە شارە شاخاوییەکان پیشەی مامۆستا بوو. ئەو ئەرکی فێرکردنی زمانی کوردی بەم دەستە پێشمەرگە عەرەبەی لە ئەستۆ گرتبوو، بەڵام لە کۆششەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو.

ئیبراهیم کە ڕوخساری ڕەش هەڵگەڕابوو بە سەرسوڕمانەوە وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ. ئەمە پرسیارێکی گرنگ و چارەنووسسازە... ئێوە چۆنتان پێ باشە؟! ئایا شەڕ لەگەڵ یەکتریدا بکەین؟!

خۆی وەڵامی خۆی دایەوە:

- هەڵبەتە نەخێر... تەنها هەلومەرجەکە تووشی ئەم قەیرانەی کردووین، جگە لەوەش هەتا ئەگەر ئەم زەمزەمییەیە ئاویشی تێدا بمایە، پێتان وایە بەشی حەڤدە کەسی دەکرد؟! خۆتان دەزانن هەر سەد هەنگاوێك لەم کەشوهەوا گەرمە بۆ هەر کەسێکمان پێویستی بە زەمزەمییەك ئاوە... ها... دەی وەڵامم بدەنەوە... ئەرێ وا نییە؟! قسەکەم ڕاست نییە؟!

دوای بێدەنگییەکی کورت، دیسانەوە خۆی وەڵامی خۆی دایەوە:

- به دڵنیاییەوە ڕاستە و مەعقوولیشە... کەواتە با ئەمە لە بیر بکەین و بیر لەوە بکەینەوە چۆن تەگبیری حاڵی خۆمان بکەین... بە بۆچوونی من تاکە ڕێگە ئەوەیە بەرگە بگرین و ڕزگاربوونیشمان لە بەرگەگرتنمان و خۆڕاگریماندایە، ئێوە پارتیزانن پارتیزان...

سعوود وەك ئەوەی گوێی لە هیچ شتێك نەبووبێت، پرسی:

- ئێستا چی بکەین؟!

ئیبراهیم وەها پێکەنی، خەریك بوو زەردەهەڵگەڕێت و ببووریتەوە، پاشان گوتی:

- دەی هەمووتان نەفرەت لە پاشەڵی قاسم بکەن، دژی ئەو پاشەڵە نەگریسە دەنگ هەڵبڕن و خۆپیشاندان بکەن!

قاقای هەندێکیان ئەو ناوەی تەنییەوە، کەوتنە هوتافکێشان:

- نەخێر بۆ پاشەڵی قاسم.

- پاشەڵی قاسم خەریکە لەناومان دەبات.

- بڕووخێ قاسم و پاشەڵیشی.!

پاشان بێدەنگی باڵی بەسەرداکێشان، دواتر هەر خۆی بە ساردی و زمانێکی عەرەبیی ناتەواوەوە گوتی:

- من دڵنیام حکوومەت خەڵاتی پاشەڵی قاسم دەکەن و مێدالیای زێڕینیشی پێ دەبەخشن، کاتێك بە چیرۆکی لەناوچوونی هەموومان دەزانن.

لە ناکاو لە شوێنی خۆیەوە بازێکی دا و دەستی نایە بینەقاقای قاسم و بەوپەڕی تووڕەییەوە نەڕاندی:

- کوڕی سۆزانی، هەر دەتکوژم، بۆچی ئاوەکەت خواردەوە؟! من دڵنیام تۆ ئاوەکەت خواردۆتەوە! ئاخر تۆ لە ماڵی باوکیشت پاشەڵت نەشوشتووە! دەتەوێ بەو درۆیەت باوەڕ بکەین؟! هەی هیچوپووچ... هەی گەمژە.

پێشمەرگەکان بە زۆر توانییان سەری قاسم لە نێو دەستەکانی دەربێنن، لە ناکاو ئادەمیش هاواری لێ هەستا و دواتر هەر خۆی هەستێکی ڕاگرت و گوتی:

- هاوڕێیان کەمێك بێدەنگ بن، بێدەنگ... پێم وایە گوێم لە دەنگی وەڕینی سەگ بوو.

سعوود بە بێزاری و دەستڕاوەشاندنەوە گوتی:

- ئەوە نیشانەی وڕێنەیە، خەریکە تووشی یەکێکمان دەبێت... ئەوەی لێی دەترسام خەریکە دەست پێ دەکات، بەرگە بگرە ئەزیزم، ئاخر هەتا سەگەکانیش لەم شاخە نەفرەتلێکراوە ناژین و ئامادە نین ژیانی خۆیان بە هەدەر بدەن.

ئادەم خەریك بوو باوەڕ بەوە بکات کە سعوود گوتی، نەخاسمە چەند کاتژمێرێکە گوێی نەبۆتەوە، تاکوو گوێی لە خەیاڵپڵاوی و وڕێنەی ئەوتۆ بێت کە هیچ بوونێکیان نییە. کەچی دەنگی وەڕینی سەگ، خەریکە لێیان نزیك دەبێتەوە، دوای ئەوەی بۆ چەند چرکەساتێك دەنگی نامێنێت و دووبارە دەنگی دەکەوێتەوە بەر گوێیان، چیتر ناتوانن نکۆڵی لە بوونی بکەن، یان وای دابنێن کە خەیاڵ و وڕێنەیە.

ئەم جارە ڕەحمان هاواری کرد:

- بۆ خاتری شەیتان، گوێ بگرن.

ئادەمیش بە شادییەکی بێئەندازەوە هاواری کرد:

- ئەها پێم نەگوتن؟ پێم گوتن... گوێ بگرن... گوێ بگرن.

ئیبراهیم گوتی:

- پەلە مەکەن، با وریا بین. لەوانەیە جاشە چڵکاوخۆرەکان بن و شوێن پێمان هەڵبگرن و بەدوامانـدا بێن، دوای ئەوەی شەوی ڕابردوو تەقینەوەی مینەکە ئاشکرای کردین.

مامۆستا عومەر بە ناڕەزاییەوە گوتی:

- جاشە بەکرێگیراوەکان ئەوەندە ئازا نین بەبێ کۆپتەر و فڕۆکە دوامان بکەون، دەی با بە پەلە بەرەو سەرچاوەی دەنگەکە بڕۆین و ونی نەکەین.

ئیبراهیم بە زمانێکی فەرماندەییانەوە هاواری کرد:

- نەخێر... سەرشێتیی هەر یەکێکتان، هەمووومان تەفروتونا دەکات و هیچ دوور نییە قڕمان بکات.

دکتۆرەکە قسەکەی پێ بڕی و وەڵامی دایەوە:

- بەهەرحاڵ هەر چۆنێك بێت لە تێنوێتیدا هەر دەمرین و لەناو دەچین. ئەی باشە ئەوە بۆ سەگی شوانەکان نەبێت؟!

ئیبراهیم گوتی:

- پێم ناڵێن شوان و ڕانەکەی لەم شاخە ڕووتەنییە چی دەکەن، کە هەتا گژوگیایەکی هێندەی یەك پەنجەشی تێدا نەڕواوە تا بیخۆن، ئەها نابینن...؟!

ڕەحمان بە دەنگێکی تۆکمە و جێگیرەوە هاواری کرد:

- دە باشە... کەواتە با لە پێناوی بەدەستهێنانی ئاوەکانیان شەڕیان لەگەڵدا بکەین.

هۆبی بەرهەڵستی کرد و دەنگی خستەپاڵ دەنگی ئیبراهیم و گوتی:

- ئەمە لۆژیکێکی دروست نییە. ئێمە حەڤدە کەسین و ئەوان نزیکەی سێ سەد کەس، ئەگەر زیاتریش نەبن.

سعوود بە دەنگێکی کز و لاوازەوە گوتی:

- لە ڕاستیدا من گوللەی جاشێکم پێ باشترە لە مردن بە تینوێتی.

ڕەحمانیش بە پەرۆشییەوە لایەنگیری کرد:

- ئەوە ڕێك دەبێتە "گوللەی بەزەیی".

ئازاریش دەنگی خستە پاڵ دەنگیان:

- من لەگەڵتانم... شەڕیان لەگەڵدا دەکەین.

هەندێکی دیکەشیان خەویان بە ئاوی جاشەکانەوە دەبینی، ئەوانیش بوونە لایەنگریان.

ئیبراهیم بۆ ئەوەی ئەو جۆشوخرۆشەیان کەم بکاتەوە، گوتی:

- بەڵام خۆ ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین تاکوو خۆمان بکوژین، بەرگریکردن و تێکۆشانمان دژی تینوێتی هیچ کەمتر نییە لە ئازایەتی و شەڕکردن دژی جاشەکان.

پاش کەمێك بیرکردنەوە و گوێ لێ گرتنیان، بۆ ئەوەی بە ترسنۆکی دانەنێن، گوتی:

- بۆ هیچ شتێك زۆرتان لێ ناکەم، مادام بڕیاری خۆتان داوە، ئێوە کارێکی خۆکوژی دەکەن و منیش لەگەڵ ئەو شێتی و سەرکێشییەتانم.

ئینجا هەر یەکە و لە پەنای گاشە بەردێکدا خۆیان لە بۆسە نا، بەوپەڕی وریاییەوە چاوەڕێی پێشهاتێك بوون، دوای تێپەڕبوونی کاتێکی سەخت، وەك ئەوەی سەدەیەکی ڕەبەق لە چاوەڕوانیدابن، بینییان جووتیارێك لەگەڵ سەگەکانی لێیان نزیك دەکەوێتەوە، دێمکەیەکی پڕ لە ئاویشی لەسەر شانی خۆی هەڵگرتووە، هاتنەکەیشی ڕێککەوت نەبوو، بەڵکوو لە پێناوی ئەواندا بوو! خۆ ئەگەر ئەو هەرا و دەنگەدەنگەیان لەگەڵ یەکتری نەبووایە لەوانەیە سەگەکان هەر هەستیشیان بە بوونیان نەکردبووایە. هەموویان لە ناخی خۆیاندا ئۆخەی ئەوەیان کرد کە ئەم جارەش مەرگ مەودای ژیانێکی دیکەی پێ بەخشین و ئەو جووتیارە بووە فریادڕەسیان و لە مەرگی مسۆگەر ڕزگاری کردن.

جووتیارەکە گەنجێکی جوان و قەدوباڵا ڕێك بوو، لە ڕەشماڵێکی نزیك کانییە تاقانەکەوە هاتبوو، لەوێ لەگەڵ هاوسەرە گەنجەکەی و کیژە پێنج ساڵانەکەی و دایکی و برایەکی بچووکی پێکەوە دەژیان. هەر هەموویان لەو ڕەشماڵەدا دەژیان و بە پارچە بەرد و کەرتە شاخ بە دیواربەندێکی نزم ڕەشماڵەکەیان بۆ دووبەش دابەش کردبوو، ڕانە بزنێکی بچووکیشیان هەبوو، لێرە و لەوێ سەرقاڵی لەوەڕاندن و بەخێوکردنیان بوون، شەوانیش لە پەناگەیەکی نێوان تاشەبەردەکاندا کۆیان دەکردنەوە و دەیانخەواندن، کون و

دەروازەی ناو تاشەبەردەکانیشیان بە دیوار و ئەستوندی دارین گرتبوو، تەنها یەك دەرچەی تەنگیان وەکوو دەروازە بۆ هێشتبوونەوە، هەموو ئەوانەش لە ترسی گورگ و دەعبای کێوی.

ئەم خێزانە وەکوو نەریتی ساڵانە، هەموو هاوینێك بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك گوندەکەی خۆیان جێ دەهێشت و پەنایان بۆ ئەم مێرگە سەوزە دەهێنا و بایەخێکی باشیان پێی دەدا و سەرباری بەخێوکردنی بزنەکانیان سەرقاڵی کردنەوە و کۆکردنەوەی بەری دارگوێژە گەورەکەش بوون، کە لقوپۆپ و گەڵاکانی بە دەوراندەوری کانیاوەکەدا پەرشوبڵاو و پەخشان بووبوونەوە، دارگوێژێك بە دڵنیاییەوە دەیان و سەدان چیرۆك و سەربوردەی هەبوو.

لە کاتێکدا هەموویان لە ئەنجامی کاری ڕۆژانەیاندا شەکەت و ماندوو لە شیرین خەودا دەبن، حەپەی سەگەکانیان هەواڵی هاتنی میوانێکی غەریبیان پێ ڕادەگەیەنن و بەر لە قووقەی کەڵەشێر لە خەو بێداریان دەکەنەوە. دەبینن کەسێك بە ڕوخسارێکی تۆزاوی و جلوبەرگێکی دڕاو و جەستەی خوێناوییەوە بۆ لایان دێت، بەڵام بەرلەوەی بگاتە لایان دەکەوێتە سەر زەوی و لە نێوان بەئاگایی و بێئاگاییدا لە سەرەمەرگدا دەبێت، تومەزە ئەو مێوانە ڕێنیشاندەری دەستەکەیان دەبێت، کە ئەوان وایان زانیبوو مردووە.

جووتیارەکە و براکەی هەڵیانگرتبوو و بردبوویانە ناو ڕەشماڵەکەیان و برینەکانیان بۆ تیمار کردبوو. دوای ئەوەی هاتبووەوە سەر خۆی، چیرۆکی تەقینەوەی مینەکە و ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیەی بۆ گێڕابوونەوە، کە ئەو بە دڵنیاییەوە پێی وابوو کەس فریایان ناکەوێت و هەموویان لە تێنوواندا لێرە و لەوێ

دەمرن. لەو کاتەوە ئەو جووتیارە بە ئەمەك و ئازایە دێمەکە ئاوێکی گەورە لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت و بەدوای پێشمەرگەکاندا دەگەڕێت تا دەیاندۆزێتەوە، کە هەموویان بێئومێد و خەریك بوو لەناو دەچوون و لە تینووان دەخنکان.

ئیدی بەرەو کانیاوەکە پێشیان دەکەوێت. لەو کاتەدا خەم و ناسۆری سەر ڕوخساری بریندارەکە ئاماژەی گلەیی و گازاندە بوو، سەرنجەکانی پێی دەگوتن: "ئای چ ڕیسواییەکە.! خۆ جێتان هێشتم.! نەکەن بەدوای هیچ پاساو و بیانوویەکدا بگەڕێن، ئاخر ئێوە تەنانەت ئاوڕێکیشتان لێ نەدامەوە، بە ڕاستی بە داخەوە!".

پێشمەرگەکان -بە ناچاری- بڕیاری مانەوەیان لای ئەو خێزانە دا، بە تایبەتی دوای ئەوەی زانییان کێشە و هەتا پێکدادانیش لەگەڵ چەکدارەکانی مام جەمال قەوماوە و شەڕیش هەڵگیرساوەتەوە، دوای ئەوەی پێشتر ئاشتبوونەوەی نێوانیان ئاگری شەڕی نێوانیانی کوژاندبووەوە. ئەو هەواڵەشیان لە ڕێگەی دووەمین گەنجی خێزانەکەوە بیست. چونکە ئەو بۆ زانینی پەرچەکرداری سوپا و جاشە بەکرێگراوەکان لە ئەنجامی پرسی تەقینەوەی مینەکە، چووبووە گوندێکی خوار شاخەکەوە، لەوێ هەموو شتێکی زانیبوو. ئای ئەو هەواڵانە چەند بە خێرایی لە نێوان گوندەکاندا دەماودەم دەکەن و دەگوازرێنەوە.

مندالە پێنج ساڵانەکە بە نامۆییەوە سێرە نیگای گرتبووە ڕوخساری پێشمەرگەکان، کاتێکیش گاڵتە و شۆخییان لەگەڵیدا دەکرد، بزەی بۆ دەکردن، ڕوخسارێکی سپیکەڵانەی جوان و قژێکی گەنمڕەنگی هەبوو، دوو چاوی گەورە و هەنگوینییش، زیاتر ڕوخساری ڕازاندبووەوە. جلوبەرگێکی ڕەنگاوڕەنگی کۆن، بەڵام خاوێنی لەبەردابوو، ماوەماوە یەکێك لە چەکدارەکان داوایان لێی دەکرد ئاویان بۆ بێنێت. ئەویش بە

ڕاکردن و خۆشییەوە لەناو تەقیلەیەکی بچووك ئاوی بۆ دەهێنان، بەڵام هەتا تەقیلە ئاوەکەی دەگەیاندە دەستیان نیوەی زیاتری لێ دەڕژا. ئینجا دادەنیشت و هێندەی نەدەبرد یەکێکی دیکەیان داوای ئاویان لێی دەکردەوە، ئەویش بە هەمان شێوە بۆی دەهێنانەوە.

هەر لەگەڵ یەکەم تاڵە دەزووەکانی کازیوەدا، مووشەك، چەشنی ڕێژنەی باران بەسەریاندا دباری، هەر یەکە و بەلایەکدا هەڵاتن و خۆیان لە نێوان تاشەبەردەکان حەشار دەدا، بڵاچەی ئاگری مووشەکەکان، گەواهیی دەستدرێژی و تاوانبارکردنی تاقە ڕەبایە بەرزەکەی پێ ڕادەگەیاندن، دوای نزیکەی کاتژمێرێك، سپێدەی بەیان ماڵوێرانی و کاولکارییەکانی بۆردوومانە تۆقێنەرەکەی ئاشکرا کرد، چی ببینن: ئەگەر سەری خلۆرەوەبووی کیژۆڵە بچووکەکەی ژێر درەختەکە و تابلۆی گورچکبڕی دایکی نەبووایە، کە بە حەپەساوییەوە جەستە بچووکە خوێناوییەکەی کچە نەشمیلەکەی لە ئامێز گرتبوو و باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد و زمانیشی وا بەسترابوو نەتوانێت تەنانەت وشەیەکیش گۆ بکات، ئەگەرنا ڕووداوەکە ڕووداوێکی ئەوتۆ نەدەبوو، بەڵام ئەوەی ڕووی دا گورچکبڕ بوو، هەموویانی تاساندبوو. ئاخر ئەمان دژی ڕژێم چەك هەڵدەگرن و بەرهەڵستکاریی دەکەن، کەچی ئەو ڕژێمە ستەمکارە سەری نەشمیلەیەکی فریشتەئاسا بە گوللەی تۆپ و مووشەکەکانی لە جەستەی دەکاتەوە و جەرگی دایکێکی گەنجیش دەسووتێنێت.!

ئیبراهیم لەسەر چینچکان دانیشتبوو، سەری لە ئامێزی خۆی نابوو، پێشمەرگەکانیش دەورەیان دابوو و سەرنجیان دابووە سەری پەڕیوی کیژۆڵە ڕەنگهەڵبزرکاوەکە و چاوە تۆقیوەکانی.

سەری هەڵبڕی و بۆ ماوەیەك لە ڕوخساری خەماویی هاوڕێکانی ڕاما و پاشان بە دەنگێکی پڕ لە ژان و ناسۆرەوە پێی گوتن:

- دەزانن... ئەم زەوییە جێگەی ئێمە و ئەوانی تێدا نابێتەوە... یان دەبێ ئەوان بکوژرێن یان ئێمە، یاخود بۆ هەتاهەتایە شەرمەزاری پارووەنانێك و چاوی ئەم کیژۆڵە فریشتەییە ڕاومان دەنێت!

بەمەش دوژمنکارییەکی سەخت و دژوار و بێ ئەندازە لە نێوان ئەو دەستە پێشمەرگەیە و ڕەبایە بەرزەکەدا ڕۆحی دەرزیئاژن دەکردن، دوژمنکارییەکی ئەوتۆ هەتا شوێنەوارەکانی نەسڕدرێتەوە، ئەو دوژمنکارییە کپ و خامۆش نابێت و ناخی ئەوانیش ئاسوودە نابێت!

## بەشی دووەم

ئەو مۆڵگە سەربازییە، مۆڵگەیەکی قایم و تۆکمەی سەر یەکێك لە لوتکە بەرزەکان بوو. تاشەبەردی ترسناك و تیژ دەورواندەوریان دابوو. تەلبەندێکی کۆنی دڕکاویی چڕیش کە بۆ قایمکردنی مۆڵگەکەیان زۆر پشتیان پێ نەدەبەست، بۆیە مینێکی زۆریان وەك مینەتەڵە، یان تەڵەی ڕاوکردن لە هەموو شوێنێکدا چاندبوو، کە گومانی گەیشتنی "العصاة" واتە یاخیبووەکانیان لێ دەکرد، ئەو زاراوەیەی سوپا و جاشەکان وەکوو نازناو لە پێشمەرگەیان نابوو.

ئەو ڕەبایەیە ساڵانێکی دوورودرێژ و زۆرە گوند و شوانکارەکانی ئەو دەڤەرەی تۆقاندووە، هیچ کەس و هێز و دەستەیەك بوێریی ئەوەی نەکردووە پەلاماری بدات و دەستی بەسەردا بگرێت، چونکە بە تۆڕە مۆڵگەیەکی دیکەی سەربازی دەورواندەوری تەنرابوو، لەوێوە چاودێریی وردترین جووڵەی ناوچەکە دەکرا. کۆمەڵە پێشمەرگەیەکی مەحموود بورهانیش وەکوو پێشتر ئاماژەمان پێی دا، ئەو پیاوە جیاوازەی کە بە بەردەوامی لەگەڵ مام جەمالدا لە شەڕدا بوون، چەند دەیەیەك لەوەوبەر، کۆمەڵێك لە پێشمەرگەکانی کە ژمارەیان شەست پێشمەرگە دەبوون، هەوڵی دەستبەسەرداگرتنی ئەو ڕەبایەیان دابوو، وەلێ لە لێدانی شکۆمەندی و نازوفیزی ئەو مۆڵگەیە شکستیان هێنابوو، لە ئەنجامیشدا، یازدە شەهیدیان دابوو. ئاخر تەنها چوار سەرباز بەس بوو بۆ ئەوەی لە هەر چوار گۆشەی مۆڵگەکە دابمەزرێن و سوپایەکی تەواو قڕ و قەڵاچۆ بکەن.

پێشمەرگەکانی ڕۆست خاوەن بەڵێنی خۆیان نەبوون، چونکە لەو چەند مانگەدا پەلامار و هێرشەکانی دەسەڵات لە چیای حەسارۆست بەردەوام بوو، سەرتابەری چیایەکە لەژێر مووشەکی کۆپتەرەکان ئاگری گرتبوو، ئەوانەی لەوێدا بوون، خەو و خۆراك و ئارامییان لێ هەڵگیرابوو، بە دەگمەن کەرویشکەخەوێکیان دەکرد و دەنگی کۆپتەر و فڕۆکە و زرمەوهوڕی مووشەکەکانی دوژمن هەراسانی کردبوون، تا ئەو کاتەی زستان هات و بەفرێکی زۆر باری، ئەو بەفرەی بۆ ئەوان، وێڕای ساردی و ئاستەنگ و دەرهاویشتەکانی، وەلێ دانوستانێکی باش بوو بۆیان. چونکە هەرچی شەڕوشۆڕ و بێنەوبەردە هەیە، لە کەشوهەوای ساف و بێگەرد ئەنجام دەدرێت و هەوری چڵکن و بارانی بەخوڕ و بەفر و زریانیش، هەمیشە ئاسمانی دۆخی پێشمەرگەکان بە ئارامی دەهێڵێتەوە و ترسی هێرشی سوپا و جاشیش لەسەریان سووك دەبێت.

لە کۆتایی مانگی مارس، کاتێك بەفر دەتوێتەوە و دۆڵ و لوتکە نزمەکان گەرم دادێن. پیرە کاکیل ماوەی دوو هەفتە دەبێت بە یاوەریی پێشمەرگەیەك دەستەکەی ڕۆستیان جێ هێشتووە، کەس نازانێت بۆ کوێ چووە و بە نیازی چییە؟! هەر کە تاریکاییش داهات بە تەنیا دەردەچێت و زانیاری لەسەر مۆڵگەکە و سەربازەکانی ناوی و ئەو قەدپاڵانەی دەچنەوە ناو مۆڵگەکە کۆ دەکاتەوە و لە هزری خۆیدا تۆماریان دەکات، یادگەی پیرە کاکیل ڕێك دەڵێی تۆمارێکی سەربازییە و دەیان نەخشە و نەخشەسازیی تێدا هێلکاری کراون و دەستکەوتی هەندێکیان زۆر و مانەوەی هەندێکیشیان بە جێبەجێنەکراوی بوونەتە مایەی ئاهێکی ئەو پیرە تێکۆشەرە، ئەو لەم دەرچوونەیدا لە هەوڵی ئەوەدایە تا ئەوپەڕی توانای پێشمەرگانە لە مۆڵگەکە

نزیك بكەویتەوە و نەخشەكاریيەكی ورد و تۆكمە لە مێشـك و هزری خۆیدا دابڕێژێت و بە كەمترین زیـان تـۆڵەی ئەو هەمـوو تاوانانەیـان لـێ بكـاتەوە، كـاتێكیش هەستی كـرد، ئیـدی تەواو كـاتی گرتنـی مۆڵگەكە هـاتووە، بـۆ سـاتێكیش دوای ناخـات. ئەوەتـانێ هەر لەوێـوە لە دووریـی چـوار كـاتژمێر پیـادەڕۆیی، هەواڵێكی بەپەلەی بۆ دەستەكە نارد و تیایدا ئیبراهیمی بەرپرسی دەستەكەی لەوە ئاگادار كردەوە كە چی دەكەن و چی نـاكەن! ئیبـــراهیمیش دەمودەســـت كەوتە خـــۆ و بە پێشـــمەرگەكانی ڕاگەیاند، كە دەبێ سبەینێ چـی بـكەن و چـۆن بە پەلە خۆیـان ئامادە بكەن! پاشان ئەویش دەسـتەكەی جـێ هێشـت و بـۆ لای پیرە كاكیل بە قەدپاڵەكەدا بەرەو لـوتكە هەڵژنـا، تـاكوو بزانێـت كارەكان چۆن بەڕێوە دەچن و چ ئامادەباشییەك كراوە.

پێشتر ئاماژەمان پێی دابوو، بارەگای دەستەكە لە یەكێـك لە قەدپاڵەكـانی چیـای حەسارۆسـت بـوو، ئەو چیـایەی بەرزتـرین چیای هەرێمـی كوردسـتانە، بارەگاكەیـان لەسـەر داروپەردووی گونـدێكی چـۆڵ و وێـرانە چـێ كردبـوو، گونـدێك لەوەتەی مرۆڤ پێی كەوتۆتە نـاوی و ئاوەدانیـان كـردۆتەوە، هەمیشـە لە سەنگەری بەرخۆداندا بووە و ڕۆژێكیش چۆكی بۆ داگیركەرانی دانەداوە، وەلـێ دوا جـار دەسـتی سـتەمكارانی گەیشـتێ و بە پاساوی سازدانی پشتێنەی ئەمنی و چۆلكردنی گوندەكانی نزیك سـنوور، ئەویـش خـاپوور و كـاول كـرا و دانیشتوانەكەشـیان ڕاگواست، هەرچەندە دەستەكە ئەوەندە تیایدا نەدەمـانەوە، جـگە لە زســتانان، كە بـۆ پشــوودان بـۆی دەگەڕانەوە و ئاوەدانیـان دەكردەوە، دوای ئەوەی لە وەرزەكانی دیكە، لە دوای گەڕان و سـووڕانێكی زۆری شـاخ و گونـدەكانی نـاوچەكە، دەگەڕانەوە كـــۆنە هەوار، بارەگاكەیـــان دوو ژووری گەورەی لە بەرد

دروستکراو بوو، نیوەیان لەژێر زەوی و نیوەکەی دیکەشیان لە زەوییەوە بەرز بووبووەوە، بە شەقڵە و کاریتەی سوورە چنار سەربانەکانیان دارەڕا کرابوون و بە گەڵا و چرووی دار و درەختی ئەو ناوەش داپۆشرابوون، خۆڵەبانێکی ئەستووریش کرابوون، کە نزیکەی نیو مەترێك دەبوو و لەسەر گەڵای درەختەکان ڕاخرابوو، بە باگردێنەکەش -کە بەردێکی لوولەیی بوو، تایبەت بۆ ئەو مەبەستە وەستایانە بەردکاریی بۆ کرابوو، ئەو سەربانەیان دەپەستایەوە، نەخاسمە لە کاتی بارینی بەفر و باران، تاکوو ڕێگە لە دزەکردنی ئاو بگرێت و نەبێتە هۆی دڵۆپەکردنی ژوورەکان.

چێشتخانەکەشیان نزیکەی بیست هەنگاوێك لە هەردوو ژوورەکە وە دوور بوو، ئەویش بریتی بوو لە بنمیچێك کە لەسەر چەند ستوندێکی دار جێگیر کرابوو، لەژێریدا دوو کوانووی بەردین بۆ چایە و چێشتلێنان ساز کرابوون، هەمیشە دوو مەنجەڵی گەورەیان لەسەر بوو، ڕەشێنە و تەنیی دووکەڵی بەردەوامی ئاگرەکە، ژەش ڕەشی کردبوون و جێگەی خواردنی بیست کەسێکیان تێدا دەبووەوە، لە هەموو شوێنێکی -ئەوەی پێیان دەگوت چێشتخانە- قاپوقاچاخ و کەوچك و مڵاکی کانزایی و قووتوو و پەرداخی شووشەیی و کانزایی بۆ چاخواردنەوە هەبوون، ئەو چایەی لە کتریەك و قۆرییەکی گەورەی ڕەش لێ دەنرا، ئەوانیش هەمیشە بەسەر ئاگری کوانووی ئاگردانەکەوە بوون و پشکۆی ئاگرەکە کز کز لەژێریان لە تاوسەندندا بوو. هەر لەناو بارەگاکەدا ژوورێکی بچکۆلانە هەبوو، ئەوەش ژووری ئازووقە بوو، نانەواخانەیەکی بچووکیش هاوشێوەی بنمیچی چێشتخانەکە دروست کرابوو، لەژێر بنمیچی نانەواخانەکەدا گومبەتێك لە شێوەی نیوە تۆپێك بە

پانتایی سێ باڵ هەبوو، ئەویش لە پارچە بەردی بچووك دروست کرابوو، بە چینە قوڕێکی ئەستووریش سواخ درابوو، زەوییەکەی بە پارچە بەردی پان و ڕێك بە تەنیشت یەکترییەوە وەستایانە ڕیز کرابوون، گومبەتی تەندوورەکەش کونێکی بچووکی هەبوو لە بەرزیی پشتێنەوە دەستی پێ دەکرد و لە نزیکی شانومل کۆتایی دەهات، لە تەنیشت کونەکەشەوە، مێزێکی لە دار دروستکراو ڕێك خرابوو، کە ئەویش وەستایانە بە تەور و بیور لە قەدی درەختە بڕاوەکانەوە ساز و ئامادە کرابوو، کونوکەلەبەر و خواروخێچیی پارچە دارەکانیش وەستایانە لووس و مشتوماڵ کرابوون، نانەواکە گونکە هەویری لەسەر ڕیز دەکردن، بە درێژایی مێزەکەش دوو داری درێژ دانرابوون، سەری یەکێکیان تەختەدارێکی پانی پێوە لکێنرابوو، بۆ پانکردنەوەی گونکەکان و ڕاخستنی هەویرەکە بۆ ناو شوێنی نانبرژاندنەکە، یان فڕنەکە، داری دووەمیش بۆ ڕاکێشانی نانە برژاوەکان.

ڕەحمان لە نزیك فڕنەکەوە لەسەر بەردێك دانیشتووە، ئادەم بەرەو لای ڕۆیشت و شتێکی بۆ فڕێ دا، ئەویش گرتییەوە و سەرنجی دایە کلیلی کردنەوەی قووتووی بچووك بوو، ژمارەیەکی زۆری لەو کلیلانەی پێ بوو، هەر کەسێکیانی دەبینی دانەیەکی دەدایێ، دەبێ ئەو کلیلانەی لە قووتووی ماسییە سەردینەکانی ژووری ئازووقە کردبێتەوە.

کاتێك ئادەم نزیکی کەوتەوە گوتی:

- ئەمە لای خۆت هەڵبگرە، دەڵێن لە مۆڵگە سەربازییەکە گۆشتی قووتوو هەیە، لەوانەیە بۆ کردنەوەی هەڵوەدابین و پێویستمان پێی بێت.

ڕەحمان کلیلەکەی خستە گیرفانی و گوتی:

- داوەتێکی باش دەبێت.!

پاشان سەرنجی دا، نانەواکەی بینی بە خێرایی بۆ لای دەهات و گوتی:

- ئەوە زوهێرە، دیارە هێشتا کاری لە نانەواخەنەکە تەواو نەبووە، داوای لێ دەکەم نانێکی بە گوێز و شەکرمان بۆ بکات.

ئادەم هاواری کرد:

- بۆ منیش.

ڕەحمان گوتی:

- دانەیەك بەشمان دەکات، ئەگەر داوای زیاتر بکەین، دەرمان دەکات.

پاشان بازی دایە سەر بەردێکی گەورە و بە دەنگی بەرز دەستی بە قسان کرد، وەك ئەوەی لەسەر تەختەی شانۆ ڕۆڵ بگێڕێت:

- وای چ ڕۆژێکی پرشنگدارە، بە ڕاستی ڕۆژێکی مەزنە، دەی باهۆزەکە هەڵکە، ڕەشەبایەکی بەهێز، ئەو هەورە ڕەش و ژەهراوییانە ڕابماڵە و دووریان بخەرەوە، وا پەرشوبڵاویان بکە لەبەر چاومانیان لابەرە، ڕۆشنایی ڕووی تێ کردووین، وای چ ڕۆژێکی قەشەنگە. هەر بە ڕاستی ئەم ڕۆژە شایانی ئەوەیە بەبێ ڕێگریکردن بچێتە لاپەڕەکانی مێژووەوە و تۆمار بکرێت، ئەو زوهێرە دەرگاکانی مێژوو دەخاتە سەر گازەرای پشت، بە هەویر و نانە جوانەکانی ڕووداوەکانی ئەمڕۆمان بۆ تۆمار دەکات، دە ئێوە سەرنجی ڕووە گەشەکەی بدەن، تەماشای بریقەی چاویلکەکەی بکەن، سەرنج لە دووکەڵی جگەرەکەی بدەن. دەی بایەکە هەڵی کە و دووکەڵی جگەرەکەی بەملا و بەولادا

پەرتوبڵاو بکەرەوە، ڕوخسارەکەی دەربخە و زەردیی ددانەکانی پاك بکەرەوە، ئەو زوهێرە مانگە و هەورەکان بەری تیشکەکەیان گرتووە، مانگی چی؟! بەڵکوو مەریخە مەریخ.!

ئادەمیش بە گاڵتەجاڕییەوە هەڵیدایێ:

- نا نەخێر، ئەوە خۆرە خۆر.

ڕەحمانیش گوتی:

- قسەکانم پێ مەبڕە، با قسەکانم تەواو بکەم، زوهێر مەریخە و تەواو، کەس مشتومڕم لەگەڵدا نەکات.

- جا بۆچی خۆر نەبێت؟

- نا ئەزیزم، زوهێر خۆر نییە، بەڵکوو مەریخە مەریخ، لەبەر ئەوەی بە بۆچوونی من مەریخ لە خۆر جوانترە، بەڵکوو هەتا لە زوحەل و خەرمانەی دەوریشی جوانترە. جگە لەوەش ڕێگەمان بدەن با دەربارەی ڕووداوە هەنووکەییەکان بدوێین، بە نموونە سەرنجی ڕوخساری بدەن، ڕوخسارێکی خۆشەویست و نەرمونیان و شۆخوشەنگ، بە مەرجێك تەنها چاوەکانی و لووتی و دەم و چەناگەی بگۆڕێت. تەماشا کەن چ ڕیشێکی هەیە، ڕێك ئەو ژیژکە مردووەی وەبیر هێنامەوە کە لە یەکێك لە قەدپاڵەکاندا تووشی بووم، ڕوخساری ژیژکەکە وای پیشان دەدا کە لە ئەنجامی خۆشەویستیدا مردووە، لە ئەنجامی ئیرەیی و پەرۆشیی بۆ ژیژکە دڵخوازەکەی مردووە، بەهەرحاڵ من زوهێر لە مەریخ بە کەمتر دانانێم.

زوهێر بە دەنگێکی نووساوەوە نەڕاندی کە لە ئەنجامی جگەرەکێشانەوە بە زەحمەت لە سینەی هاتە دەرەوە:

- مەریخی چی هەی مەریخت تێ هەڵسووم.! چیت دەوێ؟!

- هاوڕێم هیچم ناوێ، هەرگیز هیچ! من تەنها دەمەوێت بە جوانترین وشە وەسفت بکەم. من هاوڕێی تەمەنتم. ئادەم بڕوانە چەند بە سۆزە ئەم هاوڕێیەی تەمەنمان! زوهێر باوەڕ بکە ئەمشەو کە بە شاخەکەدا هەڵدەگەڕێین تۆمان لە خەیاڵ دەبێت، تەنها تۆ و بەس، کەسی تر نا. باست دەکەین کاتێك نانە بە شەکر و گوێژەکەی تۆ دەخۆین کە بەو دەستە پیرۆزانەت دروست کراون. ئای ئادەم، چەند جوان و قەشەنگ دەبێت کاتێك دەمرین سکمان یادەوەرییەکی دەستی زوهێر هەڵبگرێت.

وەلێ زوهێر سەرقاڵی هەڵکردنی ئاگری ناو کوورەی تەندوورەکەی بوو. هێندەی نەخایاند، چرەدووکەڵ بنمیچەکەی داپۆشی و دابەزییە سەر سەریان، بەمەش چاوەکانی فرمێسکاوی بوون و چاویلکەکەی پیس و تەڵخ بوو، کە لە نزیك ژێرپیاڵەیەکی چای تورکی بوو. چاویلکەکەی سڕییەوە، پاشان چاویلکەکەی کردەوە چاوی، ئینجا خێرا چاویلکەکەی لە چاوی کردەوە و بە دەستە دووکەڵاوییەکەی سڕییەوە، ئەمەش زیاتر تەڵخ و پیستری کرد. ئادەم و ڕەحمانیش بە پێکەنینەوە سەیریان دەکرد، هاواری بەسەردا کردن:

- لە بەرچاوم ون بن، لەمەودوا تامی ئەو نانە ناچێژن!

ڕەحمان بە جۆشەوە هاواری کرد:

- ئەوە چ پیاوەتییەکە! ئەها ئادەم پێم نەگوتی؟! پێم نەگوتی شیلەی سۆز و خۆشەویستی لێ دەچۆڕێ.

زوهێر بە ڕقەوە گوتی:

- نغرۆ بە و لە بەرچاوم ون بە، ئەگەرنا سەرت دەخەمە ناو تەشتی هەویرەکەوە.

قاقای پێکەنینی ئادەم دەنگی دایەوە و گوتی:

-	وای چەندە ناسکە، چ مرۆڤێکی باشە.

بەڵام ڕەحمان بە زوهێری گوت:

-	زوهێر ئێستا با ویژدانت لەگەڵتدا بدوێت. هەستت چۆن دەبێت کاتێك بە سکی برسییەوە بمرم؟ نا، لەوەش زیاتر بە تایبەتی کە ئارەزووی نانێکی دەستی تۆ بکەم؟!

زوهێر گوتی:

-	دەمریت بە جەهەننەم.

ئادەمیش بە سەربادانەوە گوتی:

-	وا دیارە ئەم شێوازە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا بێسوودە، بۆیە یا ڕەحمان و یا ڕەحیم، دەبێ تەکتیکی خۆمان لەگەڵیدا بگۆڕین.

-	من پێم وایە بەکارهێنانی توندوتیژی باشترین ئامرازە بۆ گەیشتن بە مەبەست.

ئینجا هەردووکیان هێرشیان کردە سەری و لە زەویدا گەوزاندیان و بە سەریدا هاواریان کرد:

-	بۆمانی دەکەیت یان نا؟!

ئیدی زوهێر زیاتر دەهری و تووڕە بوو، گوتی:

-	بۆتانی دروست ناکەم ئەگەر ڕۆحتان لە کونەلووتتانەوە بێتە دەرەوە.

ئینجا هەردووکیان وا خۆیان دایە سەری جووڵەیان لێ بڕی و دەستیان بە ختووکەدانی قەبرغەی کرد، ئیدی ئەویش دایە

قاقای پێکەنین و لە تاوی ختووکەدانەکەی بە زەویدا دەتلایەوە و هاواری لێ هەستابوو:

- دەیــکەم... ســوێند دەخــۆم دەیــکەم، بەڵام واز لەو سووکایەتییەی خۆتان بێنن. کاتێك وازیان لێی هێنا، هەناسەیەکی هاتەوە بەر و خۆی تەکاند و لە ترسی ئەوەی نەبادا بشکێت، خێرا چاویلکەکەی کردەوە چاوی و بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- وەرە گــوێزەکە بشــکێنە، بەڵام ئاگــادار بە بە کەســی نەڵێیت، دوایی لە دەست داواکارییەکانیان دەرباز نابم.

ڕەحمان بە هەڵەداوان خۆی گەیانـدە گوێزەکـان و بە دەم گوێزشکاندنەوە گوتی:

- خۆ ئەگەر ئەنجامەکەیمان بزانیبووایە هەر لە سـەرەتاوە وەهامان لێ دەکردی، تاکوو زووتـر ئـاڵای سپی هەڵبکەیـت و لاساریی نەکەیت، لەگەڵ ئەوەشدا من هێشتا دڵێکی باشـم هەیە، لە مۆڵگە سەربازییەکە کاتژمێرێکی جوانت بۆ دەهێنم.

ڕاز و نهێنییەکانی زوهێر کرانەوە، دەمی لە گـوێی ڕەحمـان نزیك خستەوە و بە چپەوە پێی گوت:

- هەر بە ڕاســتی پێویســتیم بە کــاتژمێرێکە، هەر دەبێــت دانەیەکم بۆ بهێنیت.

گــوێی ئـادەم ئەو چـپەیەی وەرگــرت و بە گاڵتەجـاڕییەوە گوتی:

- کەسـێك نەمـاوە داوای کــاتژمێری لــێ نەکردبێــت، وا دیـارە دەتەوێ لەم شـاخەدا پیشـانگایەك بـۆ فرۆشـتنی کـاتژمێر بکەیتەوە! بۆ ڕۆڵە ئێمە دەچینە بازاڕ، یان بۆ......؟!

ئیدی هەمووان پڕ بە زاریان دایانە قاقای پێکەنین.

پاش نیوەڕۆکەی هەموو پێشمەرگەکان چەك و تەقەمەنـی و پێداویستیی خۆیان هەڵگرت و بەرەو ئەو گوندە کەوتنە ڕێ کە پێشتر لەسەری ڕێك کەوتبـوون، لەوێ یەکتـر ببیـنن، گونـدەکە بریتـی بـوو لە بیسـت ماڵێـك، ڕووبـارێکی بچـووك بەناویـدا تێـدەپەڕی، لەمـبەر و ئەوبەری ڕووبـارەکە سـوورەچناری تێـدا ڕووابـوو. دەکەوتە دەروازەی دۆڵێـك و وەکـوو مـار بە دەوری شـاخەکەدا دەسـوورپایەوە. لە بەردەم دۆڵەکەدا ئەشـکەوتێکی بچووك هەبوو، ڕێك لە دەمی پیرە پیاوێکی بێ ددان دەچوو.

خەڵکـی ئەو گونـدە شـاخاوییانە مـاوەی دەیـان سـاڵ بـوو ڕاهاتبوون پاروووە نـانی دەمـی خۆیـان لەگەڵ پێشـمەرگەدا بەش بکەن، ئەوەتا ئەم کۆمەڵە پێشمەرگەیەش بەرەو گوندەکە هەنگاو دەنـێن و هـانکە هانکییـانە، تـاکوو بەرلەوەی دەسـت بە چالاکییەکەیان بـکەن، تێـر نـان بخۆن و پێداویسـتیی خۆیشـیان هەڵبگرن.

ئەو ماوەیەی پێویست بـوو بـۆ گەیشـتن بە گونـدەکە، بەس بوو بۆ ئەوەی گەدەیان بەتـاڵ ببێـتەوە، کە خۆیشـی لە بنەڕەتـدا هەر بەتاڵ بوو. ئاخر دەبێ لەو چیـا و دۆڵ و چـۆڵەوانییەدا چـی هەبێت، تا کارێکی وا بکەن گەدەیان گلەییان لێ نەکات.

خۆرەتـاو و کەشـوهەوایەکی خـۆش بـاڵی بەسـەر تەواوی ناوچەکەدا کێشابوو، ئەو دۆڵانەی پێیدا تێدەپەڕن پڕە لە کانیاوی سازگار، بۆیە هەر کە بە تەنیشت یەکێکیاندا تێدەپەڕین، تینوێتیی خۆیان بەو ئاوە سازگارە دەشکاند.

بەڵام تەواوی ناوچەکە لە مەترسیی سرووشتی بەدەر نییە، بە تایبەتی ئەو ڕێگەیەی ئەوان گرتوویـانەتە بەر، تاشـەبەردی بەرز، ئـاوی ڕووبـارەکە دەوری داون و لە خوارەوەشـیان چـاڵەبەفری

گەورە و قووڵی وایان دروست کردووە، ئەستەمە بە ئاسانی لێی دەرباز بن، بۆیە ناچارن لە ڕێگەی قەدپاڵە ڕك و تووشەکانەوە بە دەوریاندا بسووڕێنەوە و بچنە پشتییانەوە. ئەمەش توانایەکی ئێجگار زۆر و کاتێکی درێژیشی دەوێت، کە هەندێك جار لێژی و تووشیی قەدپاڵەکە ناچاریان دەکات لە ئاوی تیژی ڕووبارەکە بپەڕنەوە، پەڕینەوە لە ئاوەکەش پێویستیی بەوە بوو بە سەر کاریتەیەکی گەورە کە ئەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکەی بە یەکتری دەبەستەوە، یان هەندێك جاری تر بەسەر پردێکی داڕووخاودا بپەڕنەوە کە لە لق و گەڵای دار دروستکراوە و بە هۆی تێپەڕبوون و هاموشۆی زۆری خەڵکی بەسەری و کاریگەریی باوبۆرانەوە لە یەکتری دوور کەوتوونەتەوە و چنین و دروستکردنەکەی خەریکە لەباڵ یەکتر هەڵبوەشێتەوە، هەر کەسێکیش بەسەریدا تێبپەڕێت وای دادەنێت کە ئێستا نا ئێستا لەژێر پێیدا دادەڕووخێت و دەکەوێتە ئاوەکەوە. ئەوەی زیاتریش دۆخەکە ترسناکتر دەکات، ئەوەیە کە خوڕە و قەڵبەزە و دەنگی ئاوی ڕووبارەکە بە جۆرێك هاژەیان دێت و هەڵدەچن و دەنەڕێنن، وەك ئەوەی دەنگی دەیان شێر بن و لە یەك کاتدا بنەڕێنن، کەفوکوڵی ئاوەکەش بە جۆرێك لە هەڵبەزودابەزدایە، خۆی بەم شاخ و ئەو تاشەبەردەدا دەدات و زیاتر و زیاتر دۆخەکە دەشڵەژێنێت، بۆیە بە دەگمەن نەبێت، ئەگەرنا هیچ یەکێك لە کاتی پەڕینەوەدا بوێریی تەماشاکردنی ژێر پێی خۆی نەبوو لە ترسی ئەوەی نەبادا سەرەگێژە بیگرێت و بکەوێتە خوارەوە.

ئەم ناوچەیە بە هۆی بەرزی و نزمی و پێکهاتە سرووشتییەکەی ناوچەیەکی سەختە و پێشمەرگەکان دەتوانن بە

ئاسانی خۆیانی تێدا بشارنەوە و وا خۆیان قایم بکەن، کەس زەفەریان پێ نەبات.

دوای چەند کاتژمێرێک، گوندنشینەکان ڕیزی پێشمەرگەکانیان لە قەدپاڵێکی دوور بە دی کرد، ڕێك وەکوو ڕیزە مێروولەیەك بەرەو گوندەکەیان لە هەڵکشان و داکشان و چەپ و ڕاستکردندا بوون.

ئیبراهیم و پیرە کاکیل لە مزگەوتی گوندەکە چاوەڕێی هاوڕێیانیان دەکرد، ئەو مزگەوتەی جێگەی هەمووانی تێدا دەبێتەوە، پێچەوانەی مزگەوتی گوندەکانی دیکە کە زۆر بچووك و پشتگوێخراو بوون و بە بینینی وا هەست دەکرا کەس ڕووی تێ ناکات. زیاتر ئەو گوندانەی بایەخیان بە مزگەوتەکانیان دەدا، بۆ ئەوەبوو خۆیان لە شەونووستنی پێشمەرگەکان لە ماڵە بچووکەکانیاندا بپارێزن.

ئەم مزگەوتە بریتییە لە هۆڵێکی گەورە، زەوییەکەی بە حەسیری چنراو لە زەل و قامیشی باریك داپۆشراوە، لە ناوەڕاستیدا بەرماڵێکی گەورەی لێیە، لە بەردەمیدا گۆشەیەك یان قولغێکی کەمێك جیاواز هەبوو، وا پێ دەچوو شوێنی دانیشتنی مەلای گوندی بێت، وێڕای ئەوەی مزگەوتەکە خاوێن بوو، بەڵام ئەم پاکوخاوێنییە ڕێگە لە ئەسپێ و کێچ ناگرێت شانشینی خۆیانی تێدا دابمەزرێنن و لە کاتی چوونە ناوەوەی هەر کەسێکیش بەوپەڕی خێراییەوە بە هەموو بستێکی مزگەوتەکەدا بڵاوەی لێ بکەن، هێرشی خۆیان دەست پێ بکەن و بەر ببنە ویژەی مێوانەکە.

بەڵام شوێنی وا گەورە، بە تایبەتی بۆ زستانان، گەرمکردنەوەی بە زۆپای ئاسایی دار زەحمەت بوو، بۆیە

خەڵکی گوندەکە بیریان لە گۆڕینی بەرمیلێکی گەورە کردبووەوە بۆ ئەوەی بیکەنە زۆپایەکی زل و لوولەیەکی گەورەش وەکوو دووکەڵکێشی بۆ دابنێن، دیوارەکانی بە مەرمەڕێکی سپی و نوێ مشتوماڵ بکەن و وێنەی چوارچێوەداری هەمەجۆری لە ئایەتی قورئانی بە قەدەوە هەڵبواسن.

ئیبراهیم بە جۆرێکی وا دەستی بە قسان کرد، وەك ئەوەی ئەو مەبەستەی دەیەوێ ڕاڤە و شرۆڤەی بکات، هەر هەمووی ئەزبەر کردبێت:

- پێویستە بە خێرایی کات بە فیڕۆ نەدەین، لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانەی دەربارەی مۆڵگەکەی دوژمن کۆمان کردووەتەوە، ئەم ئەرکەتان بۆ باس دەکەم، باش ئاگادار بن و بە وردی گوێم لێ بگرن، ئاخر ئەمە پرسی مان و نەمانە و هەر کەمتەرخەمییەك سەرمان دەخوات، دابەشی چەند دەستەیەکی بچووك بچووك دەبین و هەر یەکە و ئەرکی خۆمان هەیە. ئەو زانیارییانەی لامانە ئەوە دەردەخەن کە ئەو شوێنەی ئێمە لێی دەبین کەمێك لە شوێنی مۆڵگەکەی دوژمن بەرزترە، لەسەر ئەم بنەمایەش ئەم نەخشەکارییەی خوارەوە جێبەجێ دەکەین:

یەکەم جار دەبێ هەڵگری "VB" بی سێڤنەکە مووشەکەکەی ئاڕاستەی مۆڵگەکە بکات و زەنگی دەستپێکردنی چالاکییەکە لێ بدات، ئینجا ڕاستەوخۆ ئەوانی تر سەربانی ژوورەکان بەر دەستڕێژی چەکەکانمان دەدەین، بۆ زانینتان سەری ژوورەکان هەمووی بە چینکۆ داپۆشراون و گوللە بە ئاسانی دەیانبڕێت، پاشان فەرمانێکی دیکە دەدەین و ئێوە لە تەقەکردن دەوەستن و دەستەی هێرشکردن دەست بە گرتن و چوونە ناو مۆڵگەکە دەکات و دەستی بەسەردا دەگرێت. لە کاتی پێکانی

یەکێکیشتان، بۆ ماوەیەکی کاتی کەس بەلایدا ناچێت، تاکوو چالاکییەکە تەواو دەبێت، تەنها هەردوو دکتۆری دەستەکەش لەو حاڵەتەدا ئەو کارە دەکەن، ئایا کەسێك بەرهەڵستی یان بۆچوونێکی زیاتری هەیە؟

ڕەحمان بە لووتبەرزی و نیمچە لەخۆباییبوونێکەوە وەك ئەوەی خۆی ستوون و بڕبڕەی پشتی چالاکییەکە بێت گوتی:

- ڕۆژێکیان دەربارەی ئەم مۆڵگەیە هەندێك وردەکاریم بیستووە، لەوانەش مەودای تەلبەندە دڕکاوییەکان تاکوو لای پەرژینی مۆڵگەکە نزیکەی پانزە مەتر دەبێت، ئەگەر هەڵە نەکەم، قازیفەکەم بە کەمتر لە بیست و پێنج مەتر ناتەقێتەوە، من ئەم زانیارییانەم لەسەر چەکەکەم هەیە، ئایا ئەم پرسەتان بە هەند و لە بەرچاو گرتووە؟

ئیبراهیم بە متمانەیەکی تەواوەوە وەڵامی دایەوە:

- مەوداکە لەوە زیاترە و شوێنی تۆش گونجاو دەبێت.

پاشان دڕکی بە کارێکی دیکە کرد کە خەریك بوو لە بیری بکات، بۆیە گوتی:

- ڕێگەش بە هەر پێشمەرگەیەك دەدەین، هەر ئێستا لێرە پاشەکشە بکات، ئەگەر نەخۆشە، یان لەبەر هەر هۆیەك بێت، توانای جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەی نییە، جا بە هەر هۆیەکەوە بێت، چونکە هەر کەمتەرخەمی و کەموکوڕییەك، سەرئێشەی زۆرمان بۆ دێنێت کە لەوانەیە هەر لە خەیاڵیشماندا نەبێت.

یەك یەك سەرنجی دایە ڕوخساری پێشمەرگەکان، تەنها ڕوخساری پیاوە پیرەکە نەبێت کە لە بەردەم ئەڵقەی کۆبوونەوەکەیان دانیشتبوو، چونکە سەرنجدان لە ڕوخساری ئەو

بۆ هەمان مەبەست، بوێری و پیاوی خۆی دەوێت، ئاخر ئەو خۆی دارێژەری بیرۆکە و سەرپەرشتیاری چالاکییەکەیە... دوای بێدەنگبوونێکی کەم، ئەوەیشی خستە سەر قسەکانی:

- ئێستا بۆ نانخواردن بەسەر ماڵەکاندا دابەش دەبین، پاشان دێینەوە مزگەتەکە و لێرەوە دەست بە ڕۆیشتن دەکەین، بەم بۆنەیەشەوە ئەوەتان پێ بڵێم کە هەر کەسێکتان زمانی کوردی دەزانن با کەسێکی دیکە لەگەڵ خۆی ببات کە زمانی کوردی نازانێت، بۆ ئەوەی لە ماڵان تووشی ڕووگیری نەبن، تەنها سێ چارەك کاتتان لەبەردەمدایە، لەوە زیاتر دوا نەکەون.

هۆبی خۆی بۆ نەگیرا و بە ڕووگرژییەوە گوتی:

- ئاخر سێ چارەك کات کەمە، بەشی چی دەکات؟! لەوانەیە ماڵەکان لە ئامادەکردنی نانی شێوان دوابکەون.

ئیبراهیم بە بێزارییەوە بە دەست ئاماژەی بۆ کرد و گوتی:

- بۆ پێت وایە بەرخی برژاوت بۆ ئامادە دەکەن؟ بۆ هەر شوێنێك بچیت، جگە لە ژاژییە نەفرەتییەکە شتێکی دیکە نییە.

لە ناکاو ڕەحمان بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- ها... ها هەڵمهێنا. دەزانن چی؟ لە نزیك یەکێك لە ماڵەکان پەرە کەوی سەربڕاوم بینی.

هەندێکیان ڕوویان تێ کرد و گوتیان:

- لە کوێ؟ دە پێمان نیشان بدە!

هۆبی ڕاچڵەکی و بە دەنگی بەرز گوتی:

- بێدەنگ بە، پێیان مەڵێ، لەگەڵ خۆم دەتبەم!

ڕەحمان لە شوێنی خۆی و لەبەرخۆیەوە دەستی بە قسان

کرد:

- لەم حاڵەتەدا هیچ ناڵێم، پێشنیارەکە فریودەرانەیە، خاوەنماڵ تەنها میوانداریی دووان دەکات.

ئیدی پێشمەرگەکان دوو دوو بەسەر ماڵەکانی گونددا دابەش بوون، تاکوو ئەو ژەمەش ورگی خۆیان تێر بکەن.

ئەو ماڵەی مێوانداریی ڕەحمان و هۆبی کرد، ماڵێکی زۆر گەورە بوو. کەچی ژووری دانیشتنیان درێژ و تەسك بوو، تا ئەو ئاستەی مرۆڤ تێ بکۆشێت بۆ ئەوەی گیانی لە لووتییەوە دەرنەچێت.

ڕەحمان لە نزیك دەرگاکەوە دانیشت و لاقەکانی بۆ ناو ئەو هەموو پێڵاوە درێژ کرد کە لەوێدا بوون. ئەو پێڵاوێکی ملدرێژی لە پێدا بوو. پێشتر لەناو بارەگا سەربازییەکە لە یەکێك لە سەربازە دیلەکانی وەرگرتبوو، دوای ئەوەی پێڵاوە لاستیکە نوێیەکەی خۆی لەدەست دابوو. ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەی کۆمەڵە پێشمەرگەیەك بە بارەگاکەی ئەماندا تێپەڕیبوون و پێڵاوەکەیان گۆڕیبوو، دانەیەکی کۆن و دڕاویان بۆ جێ هێشتبوو، ئەم حاڵەتە لەناو پێشمەرگەدا بڵاو بوو، تا ئاستێکی وا وای لە زۆربەیان کردبوو، بۆ هەر شوێنێك بچن پێڵاوەکەیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵبگرن، یان لەژێر خۆیانی دابنێن لە ترسی ئەوەی نەبادا بدزرێت. لە ڕاستیدا پێڵاوەکەی ڕەحمان پۆستاڵێکی سەربازی بوو، کە مرۆڤ هەر بە بینینی هەترەشی دەچێت!

ڕەحمان بە نهێنی گوتی: "ئێمە تەنها سێ چارەگە سەعات دەمێنینەوە. داکەندنی ئەم پێڵاوە و کردنەوە پێی بە لای کەمەوە کاتژمێرێکی تەواوی دەوێ! واتە تامی چێشتی کەوەکە ناکەم. وا باشترە بەم جۆرە و لە نزیك پێڵاوەکان دابنیشم، هەرچەندە

ئەمە پـێچەوانەی نەریتـی جووتیـار و گوندنشـینان بـوو. هـیچ بژاردەیەکـی دیـکەم نیـیە. قیروسـیا لە پێنـاوی گۆشـتی کەوەکە هەرچـی دابونەریـت هەیە بە دۆزەخ. پاشـان ئەم ژووره هـانی مرۆڤ دەدات بەم جۆرە دابنیشێت!".

"کەوناس"ەکە سەرنجێکی گاڵتەجاڕییانەی ئاڕاستەی ڕەحمان کرد و پرسی:

- ئەوە چییە؟! ناکا بتەوێ بەو جۆرە دابنیشیت؟!

ڕەحمان بە بێزارییەوە گوتی:

- بـۆچی نـا؟! هەمـووی چەنـد خـولەکێکە و دەڕۆیـن، داکەنـــدنی ئەم پـــێڵاوە وەڕس و بێـــزارم دەکـــات. ئەهـــا ملەدرێژەکەی نابینیت؟

- دەی دایکەنە و وەرە ئێرە، خەڵکی مـاڵەکە چیمـان پـێ دەڵێن؟!

ڕەحمـــان بە بێـــزاری و قســـەی پچڕپچـــڕەوە دەســـتی بە کردنەوەی قەیتانی پێڵاوەکەی کرد:

- نەفـرەت لە خـۆت و خەڵکـی مـاڵەکەش. نەفـرەتیش لەوەی پێڵاوەکەی دزیم، وا دایدەکەنم، بەڵام پێت وانەبێت ئەمە لە پێناوی دابونەریتدا دەکەم، من ئەمە تەنها لە خۆشـیی کەوەکە دەکەم.

ژوورەکە تاریـك و خەمـاوی بـوو. زۆپـایەکی داریـن لە ناوەڕاســتی ژوورەکەدا بـــوو، لە بەرمیلێکـــی تەنەکە دروســـت کرابوو، دەرگایەکی بچـووکی هەبـوو، لە سـەرەوەی لـوولەیەك بنمیچە نزمەکەی دووبەدەر کردبوو، مرۆڤ دەیتـوانی بە ئاسـانی دەست لە بنمیچەکەی بدات، لە شەقڵە و کاریتەی سووره چنـار

دروست کرابوو، بە دووریی یەکسان ڕیز کرابوون، گەڵا و لقوپۆپی درەختەکانیان بە چڕی خستبووە سەری و خۆڵەبانێکی باشیان کردبوو، بە باگردێنیش چاکیان پەستابووەوە، نەبادا لە کەشوهەوای باراناویدا دڵۆپە بکات، ئاخر دڵۆپەی بنمیچی خانووەکان لە وەرزی زستاندا چ بۆ خاوەنماڵ و چ بۆ مێوانیش هەر بەڵایەکە بۆ خۆی! لە بەردەم زۆپاکەش چاڵێکی بچووك هەبوو، پشکۆی گڕگرتووی ناو زۆپاکەی تێدا دادەنێن بۆ کوڵاندنی چای، ژوورەکە هیچ پەنجەرەیەکی نەبوو، لەوانەیە بۆ پاراستنی گەرمیی ژوورەکە بووبێت، ژوورێك بوو، ڕێك لە بەندیخانە دەچوو، زیاتر لەوەی ژووری ژیان و خۆشی بێت.

کاتەکە بە خێرایی تێدەپەڕێت و هیچ یەکێك لە خەڵکی ماڵەکە هەتا نەهاتووە بەخێرهاتنی ئەم دوو میوانەش بکات، بە ڕاستی چاوەڕوانی لەو هەلومەرجە ئەستەمەدا وا لە مرۆڤ دەکات تووشی دڵەڕاوکێ بێت، چونکە هەر چرکەیەك تێدەپەڕی بە لای ئەوانەوە بەها و سەنگی خۆی هەبوو.

کەوناسەکە بە چپەیەکەوە:

- زۆر دواکەوتن، لەوانەیە چەور بێت!

ڕەحمان خەریك بوو ئارامی لە دەست بدات، گوتی:

- بانگیان بکە با پەلە بکەن، کاتەکە تەنگاوی کردووین، ئەوەندەی بە بەرەوە نەماوە.

هۆبی دەستی بە قسان کردەوە:

- لەسەرخۆ بە. تۆزێکی تر چاوەڕوان بە، ئەگەر پەلەیان لێ بکەین، ئەوا شتێکی دیکەمان دەرخوارد دەدەن، نەك کەوەکە.

ڕەحمـان لە بەردەم سـەلامەتیی لـۆژیکی هـۆبی پەشـیمان بووەوە و بە لایەنگیرییەوە گوتی:

- ڕاسـتە، لێیـان بـگەڕێ بە کەیفـی خۆیـان بـکەن، لە چاوەڕوانیدا گۆشتی کەو و سەلامەتی، لە پەلەکردنیش ژاژی و پەشیمانی.

پـاش تێپەڕبـوونی چەنـدین چرکەسـاتی توانـاپڕووکێن و سـەخت و چـاوەڕوانییەکی ترسـناك، بە دوودڵییەکـی زۆرەوە سەرنجی کاتژمێرەکەیـان دەدا، لەژێـر ئەشـکەنجەی لەدەسـتدانی ئارامی، بە حەپەساوییەوە دەیانپرسـی: "چـی بکەیـن؟!" بەرلەوەی بۆچوونیان لەسەر تەگبیرێك سـەقامگیر بێـت. لە ناکـاو پیـاوێکی پیر هاتە ژوورەوە. دەرگاکە لە تەنەکەی ڕۆن دروسـت کرابـوو، بـۆیە دەنگێکـی وای لێـوە هـات ڕێـك لە دەنگـی تەقینـەوەی مووشەکێکی هەوایی دەچوو!

پیاوەکە ڕستەی تـێکەڵ و خێـرای بەکـار دەهێنـا، ڕەحمـان هیچی لێ حاڵی نەبوو، وێڕای ئەوەی تەنها سڵاو و بەخێرهێنـانی هەردوو مێـوانەکە بـوو. هـۆبییش ڕسـتەیەکی هاوشـێوەی ئەوەی خۆی بۆ دووبارە کـردەوە، پیـرەکە بە خۆشـییەکی زۆرەوە لێـی وەرگرتەوە، بە ئاشکرا پێی وابوو ئەوە ستایشی چاکە و پیاوەتیی ئەوانە، بەوەی خزمەتی پێشمەرگەکانی شاخ دەکەن.

ئۆخخەی... لە کۆتاییدا ڕزگاریان بوو! سینییەك پـانییەکەی لە دەرگای ژوورەکە زیاتر بوو، بـۆیە ئەو گەنـجەی سـینییەکەی بە دەستەوە بوو، ناچار بـوو بە خـواری بێـتە ژوورەوە، سـینییەکە وەکوو دەفری فڕیوی ئاسمانی دەرەوە و هەسارەکانی دیـکە لە بەردەم هەردوو مێوانەکەدا نیشتەوە.

گەنجەکە نۆردووە نانە تیـرییە تەنـکەکەی سـەر سینییەکەی

لادا، ئەو نۆردووە نانەی کەمێك لە تیرەی سینییەکە کەمتر بوو، پاشان نانەکەی خستە سەر پارچە نایلۆنێکی کەمێك ئەستوور، ئینجا چووە دەرەوە تاکوو خواردنەکانی دیکەی سەر خوانەکە بهێنێت، ئەو خوانەی دوو مێوانەکە لە چاوەڕوانیی هاتنیدا خەریك بوو لە زگ بدەن، ئەوەندە درێژەی کێشابوو.

پیاوە پیرەکە بە جووڵەیەکی سووکەڵانەوە کە لەگەڵ تەمەنی ئەودا نەدەگونجا، هەستا بۆ ئەوەی فانۆسە کوژاوە هەڵواسراوەکەی قەد چڵە داری بنمیچی ژوورەکە بهێنێت، هەرچەندە ڕووناکیی تاکە فانۆسێك خەمۆکی دەورووژاند و وەکوو مۆتەکە ڕۆحی دەکێشت، وەلێ چی بکەن؟!

شووشە پیسەکەی فانۆسەکەی کردەوە کە بە گازی سووتاو ڕەش و پیس بووبوو. پیاوە پیرەکە تفێکی کردە ناو شووشەکە، پاشان بە دەنگێکی بڵند و بەردەوام و بێ پسانەوە، بێ ئەوەی بۆشاییەك لە نێوان قەسەکانیدا هەبێت بۆ هەناسەدان، بە دەنگی بەرز بانگی کردن. لەگەڵ هەورەتریشقەی دەنگی ئەم، وەڵامێك لە دەرەوەی ژوورەکە تێکەڵ بە هاوارەکەی ئەم بوو، کوڕێکی لاوی نزیکەی بیست ساڵان بە خۆی و کۆنە پەڕۆیەکەوە خۆی کوتایە ژوورەوە. ئەو کاتە ڕەحمان تێگەیشت کە ئەو هاتوهاوارە هەمووی بۆ هێنانی پارچە پەڕۆیەك بووە.

پیاوە پیرەکە، پەڕۆکەی ئاخنییە ناو هەناوی شووشەکەوە، دەستی بە سووڕاندنی پەڕۆکە کرد لەناو شووشەکە، پەڕۆکەی دەرکردەوە و بە وردی سەرنجی خاوێنیی شووشەکەی دا، بریقەکەی بە دڵ نەبوو، بۆیە جارێکی دیکە پارچە پەڕۆکەی خستەوە ناو هەناوی شووشەکە، چەند جارێکی دیکە پەڕۆکەی سووڕاند و بەناو شووشەکەی داهێنا، ڕێك وەکوو بلووری لێ کرد. ئینجا فتیلەکەی داگیرساند و فانۆسەکەی لە نزیك

سـینییه‌که‌وه‌ دانـا، کـانزا زیـوینه‌که‌ی سـینییه‌که‌ به‌ ڕه‌نـگه‌ زه‌رده‌هه‌ڵبزڕکاوه‌ کزه‌که‌ی فانۆسه‌که‌ ده‌بریسکایه‌وه‌.

بـێ هـیچ پێشـبینی و چـاوه‌ڕوانییه‌ك، مانـگ له‌ ئاسـمانه‌وه‌ دابه‌زی! مـانگی چـی؟! تـۆ بڵـێ ئه‌سـتێره‌یه‌کی پڕشـنگداره‌ و له‌ تاریکییه‌کی ئه‌نگوسته‌چاوه‌وه‌ تیشك ده‌دات، ئه‌ستێره‌ی کازیوه‌ی به‌یانی هه‌ڵاتووه‌ و خه‌واڵوو بووه‌، نا نا ئه‌وانه‌ش نییه‌، به‌ڵکوو هه‌ر خودی ئاسمانه‌ به‌ هه‌مـوو ئه‌سـتێره‌ و هه‌سـاره‌کانییه‌وه‌ دابه‌زیـوه‌، تاکوو تاریکایی ئه‌م ژووره‌ پڕاوپڕ له‌ ڕووناکی و نووری خـۆی بکات، ڕووناکیی فانۆسه‌که‌ به‌ شه‌رمه‌وه‌ کڕنۆشـی بـۆ ڕوخسـاره‌ جوانه‌که‌ی برد و له‌ بریسکه‌ی چاوه‌کانیدا نقوم بوو.

به‌ زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌که‌وه‌ به‌خێرهاتنی مێوانه‌کانی کـرد، به‌ به‌ری ده‌سـتی نـانه‌ تیـرییه‌ وشـکه‌کانی ئـاوپڕژێن کـرد، وای له‌و نـانه‌ وشکانه‌ چۆن له‌ناو ده‌سته‌کانیدا نه‌رم نه‌رم، دوو دوو و سێ سـێ ده‌نووشتانه‌وه‌ و کڕنۆشیان ده‌بـرد کاتێـك قه‌دی ده‌کـردن، ئینجـا له‌ناو "ده‌فره‌ فڕیوه‌که‌"ی به‌رده‌ممانی دانا.

هه‌ر کتومت خانمه‌ گه‌ڕیده‌یه‌کی ئاسـمانییه‌ و له‌ زه‌مه‌نێکـی ونه‌وه‌ به‌م ده‌فره‌ فڕیوه‌ بریسکه‌داره‌وه‌ خـۆی گه‌یانـدووه‌ته‌ ئێـره‌، تاکوو ئه‌م که‌لاوه‌یه‌ بکاته‌ فیرده‌وسی ئاسووده‌. خانمه‌ گه‌ڕیـده‌ی ئاسمانیی چی؟! تۆ بڵێ فریشته‌یه‌ فریشته‌، ئـاخر فریشـته‌کان وا به‌ ئاسانی پێناسـه‌ و بـاس نـاکرێن، چـونکه‌ ئه‌وان خۆیـان جوانییـان دروست کردووه‌ و جوانییش به‌وانه‌وه‌ وه‌سف ده‌کرێت.

له‌ نزیك سه‌ماوه‌ره‌که‌وه‌ دانیشت و ده‌ستی به‌ تێکردنی چای کـرد، بـزه‌ و زه‌رده‌خه‌نه‌که‌ی سـه‌ر لێوه‌کـانی ڕووناکـایی ڕوخساریان زیاتر ڕۆشن ده‌کرده‌وه‌.

به‌ڵام!

گەنجە بیست ساڵانەکە خۆی کوتایە ژوورەوە و دیسانەوە شەیتانۆکەکەی لەسەر دەستەکانی هەڵگرتووە! شەیتانۆکەیەکی بچووك لە شێوەی قاپێکی ژاژی، وای لەو بۆنە، ڕێك لە بۆنی دەرمانی قڕکەری مێروو، یان بۆنی مەرگەمووشی لێ دێت دوای تەقینەوەی. هەر کەسێك بیخوات وا هەست دەکات پارچە سابوونێکی لەناو دەمی هاڕیوە و ناو دەم و قوڕگی سووتاندووە، بۆنی ئەو قاپە ژاژییە بەس بوو بۆ ئەوەی لەو کەش و دانیشتنە ڕۆمانسییەیان دابڕێت و تێکڕای جەنگەکان و نازییەتیان وەبیر بهێنێتەوە.

گەنجەکە قاپە ژاژییە بچکۆلانەکەی کە هەر هێندەی مشتێك دەبوو، ڕێك وەکوو زاری یاری تاوڵی فڕێدایە ناو سینییەکەی بەردەمیانەوە، قاپەکە کتومت وەکوو سەماکەرێکی قەدوباڵا جوان لە سەرەتای سینییەکەوە خزی و لە بەردەمیاندا ئیستێکی کرد و ڕاوەستا.

ڕەحمان بە دزییەوە نوقرچێکی لە "کەوناس" دا و بە چپەوە پێی گوت:

- با لێرە بڕۆین، خۆم دەزانم چۆن نرخی ئەو لاساری و گەمژەییەت پێ دەبژێرم. ئەدی پێم نەگوتی ئەم ماڵە خۆی نییە و هەڵەت کردووە؟

هۆبی بێ ئەوەی بێئومێد بێت گوتی:

- کەمێك چاوەڕێ کە، پەلەت نەبێ، لەوانەیە ئێستا کەوەکەمان بە برژاوی بۆ بهێنن.

ڕەحمان دەستی لەسەر دەمی خۆی دانا، گوایە دەکۆخێت بۆ ئەوەی پێکەنینەکەی بشارێتەوە. پاشان تیلەی چاوی گرتە قاپە ژاژییەکە و بە چپەوە گوتی:

- ئەی ئەم ژەهرەی بەردەمت! وا بزانم ئەمەیان پێشخوانە... نا نا بەرکوڵە، تاکوو ئارەزووی خواردنی کەوەکەت زیاتر بکات!

- وەریبگرە وەریبگرە، چایەکەی لە دەست وەربگرە هەی نەگبەت.

هۆبی بە خێرایی ڕەحمانی ئاگادار کردەوە. بە هێواشی مشتەکۆڵەیەکی لە قەبرغەی دا.

ئەویش بە منگەمنگەوە چایەکەی لە دەستی وەرگرت:

- دە تۆ سەیری پەنجەکانی بکە چەندە جوانن. بە دڵنیاییەوە شوێنی ئەم پەنجانە سەر دوگمەی پیانۆ، یان ژێی ئامێری کەمانچەن!

هۆبی وەك ئەوەی مێشکی نەیەوێت دەستبەرداری خەونی خواردنی کەوەکە بێت گوتی:

- نەخێر پێم وایە ئەو پەنجانە دەیانەوێ کەوەکەمان دەرخوارد بدەن.

ڕەحمان بە چپەوە پێی گوت:

- گەمژە مەبە،ماڵەکەت هەڵە کردووە.

- باشە وا گریمان هەڵەم کردووە، چۆن ئەوەم بۆ دەسەلمێنیت؟!

- کورە پەڕەکان هەی گەلحۆ... پەڕی کەوەکە!

هۆبی گوتی:

- پەڕەکان لە نزیك ئەم ماڵە پەرشوبڵاو بووبوونەوە.

- هەروەها لە نزیك ئەوماڵەی بەردەمیشیان.

هۆبی لەگەڵ دەربڕینی هەر قسەیەکی بە سەرراوەشاندنەوە دەیگوت:

- دەی دە تۆ بۆمی ڕوون بکەرەوە، بۆچی ئەویان بێت و ئەمیان نەبێت؟!

ڕەحمان دوای هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵ گوتی:

- وای لە لاساری و سەرسەختی و گەمژەییت، کەوەکەت لەدەست داین. ئەگەرنا وزەیەکی باشی پێ دەبەخشین.

کەمێك بێدەنگ بوو، ئینجا ئەمەی بۆ زیاد کرد:

- ئەرێ تۆ بە هەموو تەمەنت پەڕی پەلەوەڕت دیوە پێچەوانەی با پەرشوبڵاو ببێتەوە؟! ئەو پەڕانەی تۆ بینیوتن لەگەڵ شنە بایەکە بەملادا هاتوون، ئەو کاتە هەستت بە نەرمە بایەکە نەدەکرد، یاریی بە تاڵە قژەکانت دەکرد؟

هۆبی بزەیەکی کرد و بەرگری نەکرد، گوتی:

- یەکەم جارە هەست دەکەم کە زیرەکیت.

ڕەحمان نقورچێکی بەهێزی لێ دا هێندەی نەمابوو هاواری لێ هەستێنێت:

- کوڕی چەپەڵ، بۆ پێشتر منت بە چی زانیوە؟! با لێرە بڕۆین وانەیەکی وات دادەدەم هەرگیز لە یادی نەکەیت!

هۆبی بە گوێیدا چپاند و گوتی:

- تۆ ئەو خوایەت پێم بڵێ؟ کامیان باشترن، کەو یان ئەم مانگەی بەرانبەرت؟!

ڕەحمـان بە دزیـیەوە تـیلەی چـاوێکی بروسکەئاسـای تـێ سـرەواند، تێڕامـان و سـەرنجی هەردووکیـان لە ناکـاو ئـاوێتەی یەکتری بـوون. وا هەسـتی کـرد لە تـرس و شـەرمان سـەرتاپای جەستەی هەژی، دوای بێدەنگییەکی کورت گوتی:

- لەوانەیە لەبەر پڕشنگی ئەم مانگەشەوە، لەو گەمژەیـی و بێبەشکردنەم لە گۆشتی کەوەکە بتبورم.

سەرنجی پیاوە پیرەکە و کوڕە گەنجەکە لە ڕوخسارياندا بە دوای شتێکدا وێڵ بـوون. ڕەحمـان بەو سـەرنجە بەردەوامانەیـان تەنگەتاو بووبوو، بە منجەمنجەوە بە هۆبی گوت:

- نەفرەت لە زمان دات، کورە تۆ بـۆچی بێـدەنگیت؟! دە لەگەڵیان بدوێ. هەرچی دەڵێی بڵـێ... ئـاخ لە دەسـتی تـۆ، وای ئەگەر دەمزانی بە زمانی ئێوە بدوێم. ئاخر کێ باوەڕ دەکات ئەم مـانگە درەوشـاوەیە لەم پیـرە پیـاوەوە خولقابێـت... پـێم گـوتی قسەیان لەگەڵدا بکە و بیاندوێنە. وا بە بێدەنگی دامەنیشە.

هۆبی گوتی:

- ئا بۆ ئەوەی بۆت تاك بێتەوە... ها وایە؟

ڕەحمان وەڵامی دایەوە:

- ئەوە چ بیرکردنەوەیەکـــی گـــێلانەیە؟! ئەی ئەم دوو شـەیتانۆکەیە نابینیـت چـۆن بە درێژایـی کـاتەکە لـێم دەڕوانـن، خەریکە بە سەرنجەکانیان بمخۆن! جگە لەوەش چـۆن بـۆم تـاك دەبێتەوە کە من زمانەکەی نەزانم؟!

- زمانی چاو پێویستیی بە قسەکردن نییە.

ڕەحمان خنەخنێکی بە مەبەستی کرد و ئینجا گوتی:

- وێـڕای گەمژەیـێـت، ئەم جارەیـان لێـت بـوردمەوە. وا تەماشـام مەکە، هەمـووان دەڵـێن هێنـدەی گەمژەیـی کەرێـك گەمژەیـت، بەڵام ڕێـز لە گەمـژەییەکەت دەگـرم، تـا ئاسـتی پیـرۆزی، لەبەر ئەوەی بەخششـێکی خـودایيە. خـودا ئەگەر کۆیلەیەکی خۆی خۆش ویست، بێ سێ و دوو، بەخششێکی وای پـێ دەبەخشـێت خـۆی پێشـبینی نەکـات، چـونکە کلیلـی بەختەوەرییە لە ژیان.

هۆبی بە بۆڵەبۆڵەوە پرسی:

- چۆن؟

ڕەحمان گوتی:

- بۆ نموونە سەیری تێکسـمراویی جەسـتەی خـۆت بـکە، چۆن پەنماویت و خواردنیشت هەرگیز لە هی من زیاتر نەبووە؟

ڕەحمـان بـۆ هەراسـانکردن و گـاڵتەپێکردنی لە قسـەکانی بەردەوام بوو و گوتی:

- بـۆچی ڕوومەتەکـانی مـن ژاکـاو و تێکقوپـاون، کوڵمەکانی تۆش ئەستوور و گۆشتن؟ شیکردنەوەی ئەمە ڕوون و ڕەوانە، ئەوەش ئەوەیە من پڕاوپڕم لە هەستی ناسك، زۆریـش بیر دەکەمەوە، کارێکی سرووشتیشە بیرکردنەوەی بەردەوام ئەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ دەگۆڕێت و پەرەی پێ دەدات، وێڕای ئەوەی جەسـتە وێـران دەکـات. ئەنجـامەکەش ئەوەیە کە منـی زیـرەك خـاوەنی دوو ڕوومەتـی تێکقوپـاوم، کەچـی تـۆی گەمـژەش خاوەنی دوو ڕوومەت و گۆنای گۆشتن و خرپنیت.

هۆبی بە شێلگیرانەوە گوتی:

- چی دەڵێیت ئەگەر ڕۆژێك بە دوو ڕوومەتی گۆشـتن و خرپنەوە بتبینم؟

ڕەحمان لێوەکانی گرژ کردنەوە و گوتی:

- لە ڕاستیدا من وێڕای ڕێزی بێکۆتاییم بۆ گەمژەیی و وێڕای ئەوەی ئاوات دەخوازم خوا -ئەوە ئەگەر هەبێت هاڕۆژێك خۆشەویستییەکەی بمگرێتەوە و ئەو نیعمەتەم پێ ببەخشێت و گۆناکانم خرپن بکات، ئەو کاتە ئەگەر ڕاستیت دەوێ بیرۆکەی خۆم سەبارەت بە گەمژەیی و زیرەکی دەگۆڕم، وا دەکەم ئەوەی ڕوومەتەکانی خرپن بن بە زیرەك و ئەوەی دیکەش بە گەمژە دابنێم. ئەزیزم ژیان ئاوها بەڕێوە دەچێت، مانەوە بۆ قێزەونترینە، منیش خەو بەوەوە دەبینم قێزەونترین و گەمژەترینیان بم. بەڵام بە داخەوە ئەم دووانە هەرگیز ئاوێتەی یەکتری نابن. بەهەرحاڵ من ئەمە بۆچوونمە. با ئەوەش بڵێم تۆ زیرەکیت، بەڵام خۆت گەمژە دەنوێنی، وەك دەڵێن کەسێکی "گێل کەززابیت"!

پیاڵەی چایەکان بەتاڵ بووبوون. کیژەکە ئارامیی لێ بڕابوو خەریك بوو پیاڵەکانی هەڵدەگرت، هێزێکی ئەهریمەنیانە ڕەحمانی ناچار کرد تەماشای چاوەکانی بکات، هەورەتریشقەیەك وەکوو لێدانی تەزووی کارەبا سەرتاپای جەستەی داگرت، هەتا ویستی شتێك بە هۆبی بڵێت، بەڵام شڵەژا، بە پچڕپچڕی لە سینگیدا مایەوە، لەگەڵ ئاهێکی پڕ لە ژان، وەلێ چێژێکی خۆش و تایبەتی هەبوو، هەر لەگەڵ خۆیدا گوتی: "دەبێ ئەو کەسە بەختەوەرە کێ بێت خۆشەویستی و دڵی ئەم مانگە بباتەوە؟!". پەی بەوە دەبات و بیر دەکاتەوە: "ئاخ... ئایا ڕێگە بەم چۆلەکەیە دەدەن خۆشەویستی بکات؟! وا باشترە بڵێم: ئەو بەختەوەرە کێیە دەیهێنێت؟! نەخێر هەتا ئەوەش نا، کەواتە شتێك نەماوە بیڵێم، ئەو دڕندە بەختەوەرە کێیە کە دەیکڕێت و بەپێی شەرع و یاسا و پیرۆزکردنی خواش دەستدرێژیی دەکاتە سەر؟!".

دوای ئەوە منجەمنجێکــی کــرد و بە دەنگێکــی نــزم کە پەڵەهەورێکــی ژان و ئـازار بە سـەر ئـاوازی دەنگیـدا زاڵ بـوو گوتی:

- باوەڕ ناکەم بەختەوەر بێت!

هۆبی ئەم وشانەی قۆستەوە و لەو کـاتەی پـارووەکەی بە زۆر دەپەستاندە دەمی پڕ لە نان و ژاژییەوە پرسی:

- کێ؟!

- ئەم خەلقەندە بەستەزمانە.

- تا ئێستاش لەگەڵیدایت؟!

- ئاخر جوانە دەڵێی گوڵە.

- هەر کەسێك نرخی زیاتر بدات بەدەستی دەهێنێت. ئەم پیرە شێتۆکەیە بە کەمتر لە بیست هەزاری نادات.

- منــیش بیــرم لەوە دەکــردەوە... چ ژیــانێکە؟! چەنــدین کەس هەن خــاوەنی ســادەترین شــت نــین، هەتــا خــاوەنی هەســتەکانی خۆشــیان نــین. هەمــوو شــتێك شــایانی کــڕین و فرۆشتنە.

- بخۆ بخۆ، باش بخۆ، ڕێگەیەکی دوورودرێژمان لەپێشە.

- نـاتوانم، ئـارەزووی خـواردنم نەمـاوە. ئەم جـوانکیلەیە هەستی نووستووی لەمێژینەی بەئا گاهێنام.

- واز لە سۆزەکانت بێنە بە دۆزەخ بن، ئەمڕۆکە کێشـە و ئارێشەیەکی زۆر و تەقوتۆقمان هەیە، ئەمە قسەی تۆ نییە؟!

ڕەحمان بۆ ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوو. بە سـاردییەکەوە گوێچکە نائێکی تیریی بچووکی هێندەی سێ پەنجەی پێکەوە

نووساوی لێ کردەوە و کەمێك ژاژی تێ هاویشت و وەکوو جگەرەکێشێك، چۆن توتن لەناو پەڕەی جگەرە دادەنێت و دەینووشتێنێتەوە، ئەویش بەو شێوەیە گوێچکە نانەکەی نووشتاندەوە و فڕێی دایە دەمییەوە و لەوێوەش بۆ نێو قورگی و بە فڕە چایەکی گەورەش، گڕی ژاژییەکەی کوژاندەوە.

بە خەمبارییەوە بە هۆبیی گوت، کە ئاگری ڕقی لە پیاوە پیرەکە و کوڕەکەی گەیشتبووە ئەوپەڕی:

- بۆچی وا بێدەنگیت؟ قسەیان لەگەڵ بکە، بیاندوێنە، شتێك بڵێ. بە نموونە بەو گەنجە شێتۆکەیە بڵێ با چیتر بەو شێوەیە سەیرم نەکات، ئەگەرنا هەردوو چاوی دەردەکەم.

هۆبی پێکەنی، خەریك بوو پارووە سووتێنەرەکەی دەخستە دەمییەوە و لەناو دەمیدا گەمەی پێ دەکرد. کۆخی و پارچە و پرووشەی ژاژی لە دەمییەوە دەرچوون و دەموچاوی ڕەحمانی گرتەوە، ئەمەش ڕەحمانی زیاتر تووڕە کرد و بە کرۆشتنی دەم و لێوی خۆیەوە و بە تووڕەییەوە گوتی:

- ئەرێ دە بەسسە واز لە خواردنی ئەم نەفرەتی و قوزەلقورتە بێنە.

هۆبی لە کاتێکدا هەوڵی زاڵبوونی بەسەر پێکەنینەکەی دەدا گوتی:

- بڕوانە چۆن تەماشات دەکات، ئاخر پێشتر خەلقەندەیەکی وای بەو ڕیش و قژە درێژەوە نەبینیوە. بەڵام تۆ ئەو خوایەت ئەگەر کچەکە ئەو سەرنجانەی لە دەموچاوت بگرتایە، ئەوەندە تووڕە دەبوویت؟!

ڕەحمان برۆکانی لێك نا و گوتی:

- به ڕاستی تۆ گەمژەیت! ئەگەر گەمژە نەبیت چۆن سەرنجی ئەو فریشتەیە بە سەرنجی ئەم ناڕەسەنە بەراورد دەکەیت؟!

- من تەنها دەپرسم.

- ئاخر پرسیارەکەشت نیشانەی گەمژەییتە بەرانبەر زایەندەی فریشتەکان، یان ئەم شاخ و داخە وای لێ کردوویت هەموو شتێك بە یەك چاو تەماشا بکەیت؟!

پیاوە پیرەکە گفتوگۆکەیانی بڕی و گوتی: یاخوا بەخێر بێن.

ئەو دەیویست هەست بە بوونی بکەن، بەمەش گفتوگۆکە بەرەو لای ئەو گوازرایەوە، ئیدی لەسەر زۆر شت دەستیان بە گفتوگۆ کرد، بەڵام ڕەحمان زۆر بە لایەوە گرنگ نەبوو، چونکە ڕووی لەم زار و ئەو زاریان نەکرد، تا بزانێت چی دەڵێن و چی ناڵێن و هەر لە ڕێگەی لێوەکانیانەوە قسەکانیان بخوێنێتەوە، وەکوو چۆن کەڕولاڵەکان وا دەکەن. بەهەرحاڵ، گفتوگۆکە دووبارەیە، لەوانەیە وەڕسکەریش بێت، بە دڵنیاییەوە قسەکانیان لە پرسینی بارودۆخی هێستر و ڕەشەوڵاغ و داهاتی ئەمساڵ و هەندێك شتی دیکە بەولاوە هیچی تر نییە، ئاخر جووتیار هیچ شتێك هێندەی ئەو قسەوباسانە سەرنجی ڕاناکێشن و چێژی پێ نابەخشن، دەمێکیشە گوتراوە بیروباوەڕ و هەڵسوکەوتیش ڕەنگدانەوەی ئەو واقیعەیە کە مرۆڤ تێیدا دەژێت، ئێ باشە ئەوانیش جگە لەو قسەوباسانە دەبێ چیتر سەرنجیان ڕابکێشێت؟!

تا ئێستا دوو ساڵ بەسەر هاتنی ڕەحمان بۆ شاخەکانی کوردستان تێپەڕیوە، کەچی جگە لە چەند ڕستەیەکی کەم

نەبێت، شتێکی ئەوتۆ لە زمانی کوردی فێر نەبووە، حاڵی حاڵی ئەوانەی دیکە. هەمیشە خۆی لەو وانانە دزیوەتەوە کە مامۆستا عومەر بە زۆری زۆرداری و بە مەبەستی فێرکردنی زمانی کوردی سووربوو لەسەر کۆکردنەوەی پێشمەرگەکان، خۆ ئەگەر بەڵێنی ئامادەبوونی وانەکانیشیان بدابوایە، وەکوو پەیکەرێکی بێگیان دادەنیشتن و ئاگایان لە هیچ نەدەما، پاشان دەرفەتێکیان بۆ پێکەنین و گاڵتەجاڕی دەدۆزییەوە و کاتەکەیان پێ دەکوشت، مامۆستاکەشیان لە بەرانبەریان دەستەپاچە و بێدەسەڵات خۆی دەهاتە بەر چاو و لە زاڵبوونی بەسەر وانەکەی بێئومێد دەبوو و ئەویش دەهاتە ڕیزیانەوە.

هەندێکیان دەیانگوت:

- من ئەوەندەم ئەزبەر کردووە، دەستەبەری زۆر شتم بۆ دەکات و وام لێ دەکات هەرگیز پەکم نەکەوێت، چونکە من لێرەدا تەنها پێویستیم بە دوو ڕستەیە.

ئەوانیش بە گاڵتەجاڕییەوە لێیان دەپرسی:

- ئەو دوو ڕستەیەی تۆ چین وا بە لاتەوە گرنگن؟!

بە خێرایی وەڵامیان دەداتەوە:

- خواردنەکەتان خۆشە... ئایا هی دیکەتان هەیە؟

ئیدی هەموویان دەست بە پێکەنین دەکەن و یەکێکیان قیژەیەکی هەورەتریشقەیی دەکات:

- ئەوە چ خواردنێکی خۆشە، جگە لە ژاژیی نەفرەتی تۆ خواردووتە؟!

بەم جۆرە بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام دەبن، کاتێکیش مامۆستا عومەر هەوڵی باسکردنی بایەخی زمان دەدات، قسەکەی

پێ دەبڕن و دەڵێن:

- تێکڕای ئەو شتانە دەزانین کە دەتەوێ بیانڵێیت، ئێمە لە هیچ شتێك بێئاگا نین، تۆ لەسەر هەقی و لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شاخوداخە عەقڵی لە کەللەدا نەهێشتووین، تاکوو لە ڕێگەیەوە فێری زمان ببین.

یەکێکیان هاوار دەکات:

- هەروەها زۆر کەسیشمان توانای وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی کاکەشینمان هەیە.

ئیدی هەموویان نوقمی پێکەنینێکی درێژ دەبن و لاسایی دەنگی کاکەشین دەکەنەوە، کە لە دەنگی کەوەوە نزیکە.

شینە، پێشمەرگەی یەکێك لە دەستە هاوپەیمانەکانە و لە دۆڵێکی نزیکی ئەم ناوچەیە نیشتەجێیە. ئەویش وەکوو هەر جووتیارێکی سادە، بێ بیرکردنەوە چەکی هەڵگرتووە و بە شێوەیەکی خۆڕسکانە و سرووشتییانە دژایەتی دەسەڵات دەکات، نەك هەر دەسەڵاتیش، بەڵکوو سەرسەختانە دژایەتیی هەر کەسێك دەکات کە سەر بە نەتەوەکەی نەبێت. بەمەش هەموو عەرەبێك دوژمنی کوردە... لەوانەیە لەسەر بینینی ڕوخسارێکی دیکەی عەرەب ڕاهاتبن و وێنە ناشیرین و قێزەونەکانیان لە مێشکیان دەرهاویشتبن. ئا ئەوەتانێ کاکەشین خۆشویستنێکی وا خۆشی دەوێن بێسنوورە، ئەم دەستەواژەیەشی هەر بە جووتیارییە سادەییەکەی خۆیەوە گوت: "بۆیە خۆشم دەوێن، چونکە عەرەبن و لەگەڵ عەرەبیشدا شەڕ دەکەن!"

ئەمە هەموو ئەو ئاوەز و پەیبردنەیە کە هەیەتی، چونکە دوژمنی دوژمنەکەت دۆستتە.

مێشکی کاکەشین وەکوو دەزگا و ئامێرێکی (ڕادیۆ) وایە، تەنها وەردەگرێت و هەرگیز پەخش ناکات.

"خۆشم دەوێن"، بەو جۆرە فەرمان دەدات.

"رقم لێیانە" وەڵام دەداتەوە.

بەڵام "پرسیارەکانی" لای دەستەکەی، ڕێك وەکوو ئامێرێکی نێرەر بوو، توانای وەرگرتنی هیچ شتێکی نەبوو، ئەم کەسە سەیرە پرسیارکردنی دەربارەی هەموو شتێك پێ خۆش بوو، بە لایەوە گرنگ نەبوو، وەڵامی پرسیارەکەی وەردەگرێتەوە یان نا؟! جاری وا هەیە دەیبینیت لەگەڵ هەر کەسێك دانیشتووە، لەوانەی بە زمانی کوردی قسە دەکەن، یان لە تەك ئەوانەی زمانەکەش نازانن و پرسیاریان بەسەردا دەبارێنێت و لە لووتییەوە قسە دەکات، لیك بە لالغاوەیدا شۆڕ دەبێتەوە و وردە تف بە ڕوخساری کەسی بەرانبەری دەبارێنێت، کە تا کۆتایی دانیشتنەکەش هەر بە بێدەنگی دەمێنێتەوە و وەڵامی ناداتەوە.

- دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم.

ئینجا دەست پێ دەکاتەوە و بە لێشاو پرسیاری بەسەردا دەبارێنێت:

- ئەرێ ڕاستە لە ناوتان ئافرەتیش هەیە شەڕ دەکات و دەجەنگێت؟ ئەی باشە ئەوانە لە کوێ دەنوون و دەمێننەوە؟! ئایا لە هەمان ژوور لەگەڵ ئێوەدا دەنوون؟! ئەوانە هیچ کەسوکار و برایان نییە؟! ئەگەر براکانیان تووشیان بن چییان بەسەر دێت؟! ئایا دەیانکوژن لەبەر ئەوەی لەگەڵ پیاواندا دەژین؟! کاتێك ئەوەی لەگەڵی دانیشتووە و پرسیارەکانی ئاڕاستە دەکرێت دەیەوێ وەڵام بداتەوە، کاکەشین بواری نادات و بە خێرایی دەڵێت:

- بیستوومه ئێوه کافرن، له خوا ناترسن، بەڵکوو هەتا باوەڕیشتان پێی نییه، ئایا ئەوه ڕاسته؟! چۆن باوەڕتان به خوا نییه؟! ئەی ئێوه له ئاگری دۆزەخ ناترسێن؟! گوێم لێ بوو چەکدارێکتان به یەکێکی دیکەتانی دەگوت: ئایا خوا هەیه یان نا؟! تۆبه خوایه لەم پرسیاره!

پێیم بڵێ: هیچ دەربارەی ئەم ژانه دەزانیت؟ ئەم ژانه نەیهێشتووه به درێژایی دوێنێ شەو خەو بچێته چاوەکانم.

ئەوەی لەگەڵی دابنیشێت هیچی بۆ ناکرێت، جگه لەوەی دەستی لەسەر چەناگەی خۆی دابنێت و به خەندەوه تەماشای بکات.

پاشان کاکەشین دەچێته سەر ڕابردوو و وەکوو دێوەره به خێرایی بەناو ڕووداوەکاندا دەگەڕێت، به داخێکی زۆر و خەمێکی ئاشکراوه دەڵێت:

- ئەرێ ئەسپه سپییه بەهێزەکەتان چۆن تۆپی؟ به ڕاستی تۆپینی ئەو ئەسپه زیانێکی گەوره بوو. باشه بۆچی بایەخ به هێسترەکانتان نادەن؟! هەر هێسترێك بێته ناو بارەگاکانتانەوه هێنده نابات له بەر پشتگوێخستنی یەکسەر پیر دەبێت و دەتۆپێت.

بەم شێوەیه کاکەشین له ناویان ناوبانگی دەرکردبوو. هەر که پرسیارەکانیشی تەواو دەبێت، ئیدی ماڵئاوایی دەکات و دەڕوات، دوای ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دیسان دێتەوه و مێشکی پڕ بۆتەوه له پرسیاری نوێ، لەو پرسیارانەی لێره و لەوێ گوێبیستیان دەبێت. هەمان شت لەگەڵ ئەو کەسه دووباره دەکاتەوه که چاوی پێی بکەوێت و لەگەڵیدا دابنیشێت.

زۆربەی جووتیاران له شێوەی ئەم بوون، هەتا هەندێکیان

ڕۆڵی گەمژەیەکیان دەبینی، وەکوو دەردەکەوت، بە مەبەستێکی نادیار، مەگەر خوا بیدۆزێتەوە و بزانێت ئەو گەمژەیە سەرچاوەی چ بەختەوەرییەکی مەزنە، وەك ئەوەی ڕەحمان پەی پێ برد. بەڵام مرۆڤی زیرەك ئەوەیە بزانێت چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و ڕۆڵێکی باشیان لە بەڕێوەبردنی گفتوگۆکە پێ ببەخشێت، وەك ئەوەی هۆبی لەگەڵ ئەم پیرە و کوڕەکەی کردوویەتی.

دوای ئەوەی سێ چارەکەکە تەواو بوو، ڕەحمان و هۆبییش کۆتاییان بە نانخواردنی ئێوارەیان هێنابوو. پاشان خانەخوێیەکەیان بەوە فریو دا کە بۆ کڕینی ئازووقە هاتوون و سبەینێ دەگەڕێنەوە بۆ بارەگاکەیان. بۆ چەسپاندنی ئەم بیرۆکەیەش لە مێشکی خانەخوێیەکەیان و سەلماندنی قسەکانیان، داوای پێخەفیان لێ کردن بۆ مزگەوت. ئەم تەگبیرە لە شوێنی خۆیدا بوو، تاکوو کەس ئەرکەکەیان ئاشکرا نەکات. چونکە ئەوانەی سوودیان لە فرۆشتنی زانیارییەکان وەردەگرت، ژمارەیان لەناو جووتیار و شوانکارەکاندا زۆر بوون و دوژمن دەستی گەیاندبووە هەموو کونوکەلەبەرێکی ناوچە ئازادکراوەکان.

## بەشی سێیەم

گومـان لەوەدا نیـیە کە جووتیـاران خـووی مریشـکیان هەیە، هەر لە ئێوارەیەکی زووەوە خۆیان دەخەنە ژێـر پێخەفەکانیـانەوە و دەنوون، چونکە بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ قـووقەی کەڵەشـێر و کـــازیوەی بەیانـــدا لە خەو ڕادەبـــن، ئەمەش یـــارمەتیی پێشـمەرگەکانی دا زۆر لە گونـدەکەدا چـاوەڕوان نەبـن. بە سووکی دزەیان کـرد و ڕوونـاکیی فانۆسـەکەیان لە پەنـجەرەی مزگەوتەکە بە کزی بەجێ هێشت، لە سەربانیش پاسەوانێکیان بۆ فریودانی خەڵکـی ئـاوایی بەجـێ هێشـت، چـونکە پێویستیان بە چەنـد کـاتژمێرێکی بێـدەنگی و خۆشـاردنەوە هەبـوو، تـاکوو گـــورزی خۆیـــان بوەشـــێنن، دوای ئەوە بـــا هەر ســـیخوڕ و بەکرێگیراوەکان چۆنیان دەوێ هەواڵیان لێ بدەن.

پێشمەرگەکان پڵینگئاسـا بە جەسـتەییەکی سـووکەوە ڕێیـان دەکـرد و چپەیەکیشـان لێـوە نەدەهـات، لەو شـەوە تاریـك و ئەنگوستەچاوەدا لە نێوان یەکێك و یەکێکی دیکەیاندا مەودایەك هەبوو، پیرە کاکیل پێشەنگ و ڕێنیشاندەریان بوو، وای لەو پیرە کـاکیلەی ڕێـك دەڵێـی سرووشـت بـۆ ئەو قەدپـاڵ و شـاخانەی دروســـت کـــردووە، ئەوەتـــانێ هەنگـــاو بە هەنگـــاو ڕێـــگەی قەدپاڵەکەیان بۆ دابین و مسۆگەر دەکات و ماوەماوەش دەسـت بـۆ لقوپـۆپی درەختەکـان درێـژ دەکـات، کە لە قەدپـاڵەکەوە نـزیکن، ئەو بە دوای ئەو لـقە شـکاوانەدا دەگەڕێـت کە بەر لە چەند ڕۆژێك بە دەستی خۆی وەکـوو نیشـانەیەك شـکاندبوونی، تاکوو بزانێت بە ئاڕاستەی درووستدا ڕێ دەکەن یان نا؟!

هەرچەنـدە کـاروانەکە لە ئامـانجەکەی نزیـك دەکەوتەوە، وریایی و ئاگایی و خۆپارێزییان زیاتر دەبوو، هەندێك جاریش پێشمەرگەکان ئاماژەی دیاریکراویان لە پیرە کاکیل وەردەگرت، یەکسـەر لە نێـوان تاشـەبەردەکان بڵاوەیـان دەکـرد و پەنجەیـان لەسەر پەلاپیتکەی چەکەکانیـان دادەنـا و هەناسـەیان لە خۆیـان دەبـڕی. لەگەڵ ئامـاژەیەکی دیـکەی پیـرە کاکیـل دەسـتیان بە جووڵە دەکردەوە و بە هەمان شێوەی پێشوو دەکەوتنەوە ڕێ.

چەنـدین کـاتژمێر تێپەڕی، شـەکەتی هەراسـانی کردبـوون، ئینجا گەیشتنە دۆڵی بن ئەو چیایەی مەبەستیان بوو، لەو ماوەیەدا کۆمەڵە مـۆڵگە و ڕەبـایەیەکی دوژمنیـان تێپەڕانـدبوو کە لەسـەر لوتکەی شاخەکاندا خۆیان مەڵاس دابوو. بەڵام خۆیان لە چوونە نـاو ئەوبەری دۆڵەکە بە دوور گـرت، چـونکە مـۆڵگەیەکی سەربازیی گەورەی لێ بـوو، ئازووقە و تەقەمەنـی بـۆ ڕەبـایە و مۆڵگەکـانی دیـکە دابـین دەکـرد و ماوەمـاوەش دەسـەڵات سـەربازی نـاو مۆڵگەکەیـان دەگـۆڕی، نەبـادا دەسـت لەگەڵ پێشـمەرگەکان تـێکەڵ بـکەن و بە گـوتەی خۆیـان خیـانەت لە دەسەڵات بکەن.

پێشـمەرگەکان لە پێچەیەکـدا بە بێـدەنگی دانیشـتبوون و چـاوەڕێی ئامـاژەی ئاگادارکردنەوەیـان بـوون، تـاکوو بەرەو ئامانجەکەیان دزە بکەن. بەڵام چاوەڕوانییەکە کەمێك درێژەی کێشا، لەوانەیە کێشەیەك هەبێت و پێشتر بیری لێ نەکرابێتەوە.

قەدپـاڵەکە لەو نـاوچەیەدا بە شـێوەیەکی سـەیر و نـامۆ پێچاوپێچ بوو، چەندین لقی دیکەی فریودەرانەی لـێ دەبـووەوە. ئەوەی زیـاتر مـایەی سەرسـوڕمان بـوو، تاشـەبەردێکی زۆر زل لەوێدا بوو، چەندین گۆشەی هاوشێوەی یەکتری هەبـوو، بۆیە پیرە کاکیل بۆ دڵنیابوون و شارەزایی تەواو، پێش چەند ڕۆژێك

دزەی کردبووە ئەوێ و بۆ ئەوەی ئاڕاستەی دروستی لێ تێك نەچێت، بیری لەوە کردبووەوە کە لە یەکێك لە گۆشەکانی تاشەبەردە زلەکە هەندێك وردە بەردی دیکە کۆمەڵەی سەر یەکتری بکات، تاکوو وەکوو ڕێنوێنییەك لە ئایندەدا ئاڕاستەی دروستی بەرەو ئامانجەکەی پیشان بدات و لێی تێك نەچێت، بەڵام ئەوجارەیان بەخت یاوەری نەبوو، لەوەی هیچ بەردێکی بچووك هەتا هێندەی مشتێکیش بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی لەسەر یەکتری دابنێت، بۆیە بە ناچاری میزی بە گۆشەیەکی بەردە زلەکەدا کردبوو، تاکوو دوایی لە ڕێگەی بۆنکردنی میزەکەیەوە ئاڕاستەی دروست بدۆزێتەوە، بۆیە بە دەوری بەردە زلەکەدا سووڕایەوە و بۆنی گۆشەکانی بەردەکەی دەکرد، بەمەش ئاڕاستەی دروستی دۆزییەوە، ئەی نەمانگوت: پیرە کاکیل وەستایەکی هێندە مەعلانە، لە هیچ کار و چالاکییەك دانامێنێت، بۆ زیاتر دڵنیابوونیش، پیرە کاکیل دەستی لە خۆڵی قەدپاڵەکە دەدا کە بە بەردەوامی لە ئەنجامی هاموشۆکردنی سەربازەکان خۆڵەکەی ژێر پێیان وردوخاش دەبوو و دەهاڕی، بەمەش ئەو خاك و خۆڵەی دیکەی قەدپاڵەکە کە بەرەو ڕەبایەکە نەدەچوو و پێی سەربازەکانی وێ نەکەوتبوو، خۆڵێکی زبر بوو، ئەمەش زیاتر دڵنیای کردەوە.

ئەو مەترسیانەی دەوراندەوری ئەو ناوچەیەیان دابوو، هێندە زۆر و ترسناك بوون، نەدەکرا پشتگوێ بخرێن و بە هەند وەرنەگیرێن، چونکە بۆ خەڵکی سڤیل و هەتا شوانکارە و جووتیارەکانیش ناوچەیەکی قەدەغەکراو بوو، هەرگیز بۆیان نەبوو هاتوچۆی تێدا بکەن. پێشمەرگەکان باش دەیانزانی وا بە پێی خۆیان بەرەو مەرگی مسۆگەر هەنگاو دەنێن، دەبێ کێ تەنها چەند کاتژمێرێکی کەمی ژیانی مابێت؟! ئەم پرسیارە بە

زۆری زۆرداری خۆی بە مێشك و کەڵلەسەری هەموویاندا دەکرد، ئیدی یادگەی هەر هەموویان کەسە ئازیز و خۆشەویستەکانیانی وەیاد دەهێنانەوە. بۆیە هەندێکیان چاویان دەبڕییە شتێك و یادگەشیان بەرەو ڕابردوو پەلکێشی دەکردنەوە و هەزار و یەك یادەوەرییان وەبیر دەهاتەوە.

ئـادەم یـادی خۆشەویسـتەکەی ختـووکەی ڕۆحـی دا، کە نزیکەی دوو سـاڵ دەبـوو هـیچ هەواڵێکـی نەدەزانـی. ئەو کـاتە خوێنـدکاری زانکـۆ بـوو، پـێش ئەوەی بـارودۆخەکە ناچـاری هەڵاتنـی بـکەن، ڕوخسـاری خۆشەویسـتەکەی بە خەنـدەیەکی ئەفسـووناوی و لەریـنەوەی قـژە زەردە زیـوینە درێـژەکەیەوە ئاراستەی شنەبایەکەی دەست نیشان دەکرد. ئەم جارەیان بەو قژە درێـژەیەوە کەوتەوە یـادی، وێـڕای ئەوەی ڕۆژێکیـان ئەو قـژە زیـوینەی بڕیبـوو، ئەو کارەشـی ئـادەمی زۆر بێـزار و وەڕس کردبوو، لە بەرچـاوی ئادەمـدا ڕوخسـاری بە تەواوی گۆڕابـوو. ئەو حەزی دەکـرد ژن وەکـوو ژن ببینێـت، بە قـژی درێـژ و جلـوبەرگی ژنـانەوە، کە زۆری بەلاوە سەرسـوڕهێنەر بـوو، خۆشەویستەکەی دوو چاوی سەوزی قەرسیلیی جوانی هەبـوون، بەڵام ئەوەندە پتەو و ڕەقەکار بوون، هەرگیـز لەگەڵ بە نـازی و ئەفسـووناویی جوانییەکەیـدا وێـك نەدەهـاتنەوە، وەك ئەوەی ڕۆژێـك وایگوتبـوو، ئەوەی زۆر نـامۆو سەیریشـە ئەو چـاوانە هەرگیـز فرمێسـکیان بە خۆیـانەوە نەبینیـوە! چـونکە خۆشەویستەکەی هەرگیـز وەك کچـانیتر نەدەگریـا، ئەمەش زۆر سەرسـامی کردبـوو، لە گەرمەی بەریەککەوتنیشیان، چاوەکـانی لـێ دەشـاردنەوە و لە نـاخی دڵـیەوە دەگریـا. وەلـێ ڕۆژێکیـان ناچاری کردبوو فرمێسکەکانی چاوی ببینێت، ئەو جارەی زۆری لێ کرد بە دەستەکانی چـاوی خـۆی نەگرێـت، ئەویـش بە دوو

چاوی گەورە و دوور لە فرمێسکەوە تێر تێر تەماشـای کردبـوو، پێستی دەموچاویشی سپییەکی مەیلەو سوور و زەرد وەکوو قـژە زیوینەکەی باڵی بەسەردا کێشابوون.

کـاتێکیش مەودای نێوانیـان درێـژ بـوو، تەنهـا نـامەیەکی بۆنـداری بە بـۆنی خـۆی و بە مەرەکەبـی پێنووسـەکەی دڵـۆپ دڵۆپ لەسەر کاغەزەکە نەخشاندبوو، تیایـدا نووسـیبووی: "ئەوانە فرمێسکن".

بە سەرخۆشی و بە مەبەستەوە هـاواری کردبـوو: "ئەوەتـا لە کۆتاییدا خۆشەویستەکەم گریا. ئای لە مەکر و نازی کچان!"

ئادەم شاعیر بوو، یان شەیدای شیعر بوو، لە ڕاسـتیدا نـازانم کامیان بوو، چونکە زۆر جـار خەیـاڵ دەیبـردەوە و دەوروبەری خۆی لە یاد دەکرد، هەندێ جاری دیکەش بە ڕستەی کـورت کــورت گــۆرانی دەچــڕی، گومــانی زۆر هەبــوو کە لە چرکەسـاتێکی شـەیدایی و دڵداریـدا بە شـێوەیەکی سـەرپێیی لەگەڵ خۆیدا لە ئامێزی بگرێت و گۆرانی بۆ بڵێت، خـۆ ئەگەر کەسێك گوێبیستی بێت و دەستخۆشی لێ بکات: "دەی بەردەوام بە، هەڵمانپەڕێنە... دەی بەردەوام بە"، وەلێ ئەو هەر ئاگایشی لەو هەرا و دەستخۆشییەش نەدەما.

جارێکیـان پـارچەیەك لە زوڵفــی خۆشەویســتەکەی مــاچ دەکرد، کە لای خۆی پاراسـتبووی و لەبەر خـۆیەوە دەیگـوت: "ئای لە ئەشکەنجەی دڵم ئەگەر شوو بکات، وای لە بەدبەختیم ئەگەر نکۆڵیم لێ بکات، ئای لە پەشیمانیی ڕۆحم ئەگەر عاشـق بێت".

ئەوەتانێ، سەرنجی دەنـێ لەنـاو تاشـەبەردەکاندا دانیشـتووە، جارێـك بە خەیـاڵی خـۆی پێکەنینـی دێـت و جـارێکیش بە

حەســرەتەوە هەناســەی ناسـۆری هەڵدەکێشـێت و خەون بەوە دەبینێت: "خۆزگە بۆ ساتێك بە سینگی خـۆمەوەم دەنووسـاند و تێر تێر ئاوێزانی دەبووم".

سعوودیش خەیاڵی بەرەو لای خێزانەکەی باڵی گرت و لەو خەیاڵکردنە درێژەدا ون بوو: "تۆ بڵێی جارێکی تـر بیـانبینمەوە؟" ئەمەی بە نهێنی گوت. پاشان بە گوێی ڕەحمانیـدا چپانـد کە بە تەنیشـتییەوە دانیشـتبوو: "چەنــد حەزم لە دانیشـتنێکە لەگەڵ خێزانەکەم و چایەکیان لەگەڵدا بخۆمەوە".

ڕەحمانیش بە چپەوە گوتی: "منیش خەون بەوە دەبینم لەناو ئاوێکی گەرمدا ڕاکشێم، دوای ئەوە هەموو ژیانم بە دۆزەخ".

هەموویان وایان هەست دەکـرد ئەوە دوا شـەویانە، زۆربەی پێشـمەرگەکان بە نهێنــی لەگەڵ خۆیانــدا مەزەنــدەی ئەوەیــان لێدابوو کە کۆتایی ڕەحمان نزیـك بـۆتەوە. ئـاخر ئەو کەسـێکی سەرکێشە و گوێ بە هیچ نادات، ئەستەمە ئەمشەو بە سـەلامەتی دەربازی ببێت. وایان پێ باشتر بوو یاوەری نەکەن. ئـاخر هێشـتا ئەوەیــان لە بیــر نەچــووە کە لەو شــارە شــاخاوییەدا چـــی لە درنــدەکانی دەســەڵات کــرد و چ دۆزەخ و مەنجەنیقێکــی بـۆ سازدان؟ بەڵام ڕەحمان وەك ئەوەی بیرۆکەکانیـانی خوێنـدبێتەوە لەگەڵ خۆیدا دەیگوت: "لەوانەیە کەمێـك بە هەڵـبەز و هەڵەشـە بم، بەڵام زۆر بە وریاییەوە هەڵسوکەوت دەکەم، بەڵکوو لەوانەیە لە هەموویـان ئاگـادارتر و وریـاتریش بـم". هەرچەنـدە ڕەحمـان هەوڵ بدات، جگە لەوان بیـر لە هیچـی تـر نەکـاتەوە، وەلـێ لە کۆتاییـدا هەر دیلـی خەیـاڵی خـۆی دەبێـت، بـۆیە لە دەروونـی خۆیـدا دەڵێـت: "نەفـرەت! تـۆ بڵێـی لە پشـت ئەو شـاخ و داخە چۆڵەوانییە ئەنگوستەچاوەوە، ژیان و شارستانییەتێك هەبێت؟! ئایا خەڵکانێك هەن لەسەر ڕایەخی نەرمونیان بنوون، ڕایەخێك شێی

تەڕی لە کەڵکـــی نەخـــات و کـــاریگەری نەکـــاتە ســـەر پەراسووەکانی؟! تـۆ بڵێـی هێشـتا شـەقامی ئەوتـۆ مـابن، خەڵـکە جیاوازەکان و ئاشقە کەشـخە و پۆشـتەکان، مرۆڤـانە بە سـەریدا پیاسـە بـکەن، کـاتێکیش لە پیاسـەکردن بێـزار دەبـن، سـواری تاکسییەك دەبن و لە چەند خولەکێکدا دەیانگەیەنێتە ماڵەوە؟! تۆ بڵێی هێشتا لە پشـت ئەو شـاخوداخانەوە شـاری ئەوتـۆ هەبـن بە گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ ڕووناك کرابێتنەوە و چێشـتخانە و دوکـانی جیاوازی ئەوتۆیان تێدا بێت، خەڵکی ڕووی تێ بـکەن و تیایـدا سەودا و مامەڵە بکەن و بفرۆشن و بکڕن و ژیانی ئاسایی خۆیان بژین؟!"

پاشـان بە گومـانەوە لە بێئاگـاییەکەی خـۆی بە ئاگـا هـات، کاتێك ئەوان دەستیان بە ڕۆیشتن کردبوو. لەگەڵ خۆیدا گوتی: "ئەوەتا ڕەحمان، زیندەخەو ماوەیەکی باش کاری تێ کردی".

دوای مـــاوەیەك و توانـــایەکی بـــاش، گەیشـــتنە لـــوتکەی شاخەکە. لەوێ تاریکییەکە کەمتـر بـوو، لەوێ لـوتکە خەریـکە ئـامێز بە ئاسـماندا بکـات، لەو بەرزایـیە شـکۆدارەوە تـابلۆکەی بەردەمی کراوەتر و ڕووتەن دەهاتە بەر چاوی، جـگە لە چەنـد درەختێك لێرە و لەوێ شتێکی تر نەبوو. ئاسمانە پـانوبەرینەکەش ڕەش ڕەش بەرەو دوورییەکـــی دوور هەڵکشـــابوو، نە شـــاخ و داخێك پێشی دەگرێت و نە دارستان و جەنگەڵستانێکیش لە بەر چاوان ونی دەکات، پانتاییەك تا چاو بڕ بکات پانتایی.

پیرە کاکیـل، بڕنەوێکـی کـۆنی لە شـانە و شـوولە دارێکـی بـاریکی ڕووتەڵەی بە دەسـتەوە بـوو، درێـژییەکەی زیـاتر لە مەترێك، بە مەبەسـتی دۆزیـنەوە و ئاشـکراکردنی جـۆرە مینێـك بەکـاری دەهێنـا، پێیـان دەگـوت: مینـەتەڵە، یـاخوا ئەو مینـە بە کەسـدا نەتەقێـتەوە، چـونکە بەو شـەوە قیـامەت ڕا دەبـێ، بە

پەنجەکەڵە و دۆشاومژەی دەستێکییەوە وەستایانە شوولە دارەکەی گرتبــوو و ڕێــك وەکــوو نابینــایەکی مەعــلان، لەگەڵ هەر هەنگاوێکیــدا لە بەردەمــی خــۆی دڵنیــای دەکــردەوە، بەمەش بەرکەوتنــی ئەو لــقە بــاریکە بە تەلــی مینــەکە نەدەبــووە هــۆی تەقاندنەوەی، ئەم پیرە کاکیلە لەمەشیاندا هەر وەستای وەســتایان بــوو، ئــاخر ئەو لە دووری چەنــدین هەنگــاوەوە هەســت بە مەترسییەکان دەکات.

مـام کاکیـل، ئەو پیـرەی ژانـی هەژاری هێنـایە دونیـاوە و شـەکەتی و ماندوێتی پەروەردەیـان کـرد و گەشـەیان پـێ دا، بەمەش لافاوی خەم و ناسۆر سـەرتاپای ڕوخسـاریان چـالوچۆل کردبوو و تەڕاییان تێدا نەهێشتبووەوە و زەمینەکەشی شەقارشەقار کردبـوون، ڕۆژگـاریش لەگەڵ خۆیـدا پەلکێشـی کـرد و دوور دووری برد و سەر و ڕیشی کردە لوتکەی شاخێکی بەفرین.

پیـاوێکی کـورتەبنە، لەڕولاواز، پڕاوپـڕ لە جـووڵە، خـاوەن ڕەوشــت و خــوویەکی جووتیـارانە، هەر لە منـداڵییەوە سـەرقاڵی کاری تەلارسازی و دروستکردنی خانووبەرە بوو، لە گەنجێتیـدا گەڕەك لە دوای گەڕەکی بونیاد ناوە. جێپەنجەی لەسـەر هەمـوو بەردی لا دیـواری مـاڵی شـارە بچووکەکـانی نێـوان شـاخەکان نەخشاندووە. مام کاکیل کەسێکی هێمن و مێشـکێکی تـۆکمە و ورە و باوەڕێکی پـۆلایین، بە ئومێـدی وەشـاندنی گـورزێکی لە ناکـاو، سـەرقافڵەی دەسـتەکەیەتی بەرەو ئاسـمان، بزنەڕێیەکـان وەکوو پشتوێنەکەی پشـتی بەمـلا و بەولایـدا دەبەن و دەیهێـنن، هەنگاو هەنگاو ورەی بەرزتر و ئاسۆی ڕوونتر، مێشکێکی سارد، کتومــــت ســــاردیی کانیــــاوێکی قەدپــــاڵێکی بەفــــراوی، ئەو هەڵوێستەیشــی لەوەوە هــاتبوو، چــونکە دڵنیــابوو دەســتەکەی لە کاتی پێویست و لە ناکاودا هەڵوێستی دروسـتیان دەبێـت، وەلـێ

ئەوەتـانێ بە هێمنـی و ناچـاری لەم شـوێنە تـۆقێنەرە دانیشـتووە، دوای ئەوەی زانی نیـوەی کـاروانەکەی دابـڕاون و لە نیـوەکەی دیکەی گوم بوون، بێ ئەوەی پێشتر پەی بەو ونبوونەیـان بـبەن. ئەو ئیبراهیمـی لە ناوەڕاسـتی کـاروانەکەی دانـابوو، بـۆ ئەوەی تەواوی کـاروانەکە، وەکـوو ئەڵـقەی زنجیرێکـی پـۆلایین بە یەکترییەوە ببەستێتەوە و شیرازەی چالاکییەکەی لێ تێك نەدات، کەچـــی وا دیـــارە هەڵەیەك، یـــان چرکەســـاتی خەیاڵێـــك هەنگاوەکـانی ئیبراهیمـی بەرەو ئاقـار و قەدپـاڵێکی دیـکە وێـڵ کردبێت و خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدان لەمـان دابڕیبێـت، هەمـوو ئەوانەی بە دواوەیشی بوون، دوای هەنگاوەکانی ئەو کەوتبوون.

لە کۆتاییـدا ئیبـراهیم بە ئاگاهـاتەوە، سـەرقاڵ و بێـدەنگ و پەسـت ئیسـتێکی کـرد و ڕاوەسـتا، ئەوانەی بە دوای هەنگـاوەونەکانییەوە وێڵ بوون، هێدی هێدی گەیشـتنە لای و لە دەوری کۆ بوونەوە. پاشان سەبارەت بەو دۆخەی تێی کەوتوون کەوتـنە چپەچپ، لەوانەیە تاریکییەکە دوای ئەوەی کەمێك لە یەکتـری دوور کەوتبـنەوە ئەوانەی لە پێشـیانەوە بـوون لـێ ون کـردبن و تووشی ئەم دۆخە نالەبارەی کردبن، هەرچەندە ئەوانیش تا ئێستا بە هەمـان قەدپاڵـدا ڕێ دەکەن و لایـان نەداوە، وەلـێ کاتێـك دڵنیابوو ئەو قەدپاڵەیان هەڵە کردووە، بە ناچـاری بزنەڕێیەکانیـان بەردا و هەر کەسە و لە شوێنی خـۆیەوە بە شـاخەکەدا هەڵگـژا، تاکوو یەکتریان دۆزییەوە. ئیبراهیم بەپەلە ڕووی لە پیرە کاکیل کرد تاکوو فەرمانی لێ وەربگرێـت و ڕاوێـژی لەگەڵـدا بکـات. پاش چەند ساتێك ئاماژەی بەو کەسـانە دا لەگەڵیـدابوون چەنـد هەنگاوێك بێنە پێش و بە تەنگەبەرێکـی نێـوان دوو تاشـەبەردی نزمدا تێپەڕین. لە ئەنجـامی ئەو تێپەڕینەشـدا شـەو دەسـتبەرداری کپـی و بێـدەنگییەکەی بـوو، مێشـك و هـزر و نـاخی ئەوانەی

بەرەوپیری مەرگیش دەچوون، بە دەنگی ئەو بەردەی لەو کاتەدا پێی یەکێکیان ساتمەی لێ کرد و غلۆر بووەوە، ڕاچڵەکین و بە ئاگاهاتن، چونکە ڕێبوارانی کاروانەکە هەر یەکە و خەیاڵی لە شوێنێك و هەنگاوەکانیشی بەرەو مۆڵگەی دوژمن نزیکی دەخستەوە. هەرچەندە ژیانی هەموویان بەند بوو بەو تۆزقاڵە ئاگایی و وریاییەی کە دەبووایە هەموویان هەیانبووایە، وەلێ هەڵەنگوتنی پێی ئەوەیان لەو بەردە، ترسی خستە ناخیانەوە، بەهەرحاڵ پێشمەرگەکان هەموویان شڵەژان و کەوتنە چپەچپ و کەوتنە ئاگادارییەکی تەواوەوە، بەمەش دەنگەدەنگێکی زیاتریان خستە سەر ئەو دەنگانەی بەردەکە هێنایە کایەوە. دوای ئەو چەند چرکە شڵەژانە، جارێکی تر هەموویان بەوپەڕی توانایانەوە گوێی خۆیان هەڵخست بۆ چنینەوەی دەنگی هەر جووڵەیەك کە وەکوو پەرچەکردارێکی غلۆربوونەوەی بەردەکە لە لایەن ئەوانەی لە مۆڵگە و ڕەبایەکاندا بوون بێتە ئاراوە، بەوەی شتێك لە خواریانەوە ڕووی داوە و جووڵەیەك شەوی خامۆش و بێدەنگیی ئەوانیشی بێدار کردبێتەوە. خۆشبەختانە هیچ شتێك لە ئارادا نییە. وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت، یان شوێنێکی تەواو چۆڵەوانی بێت.

پێشمەرگەکان جارێکی تر و لە پێشووتر بە هێواشی دەستیان بە دزەکردن کردەوە. تا گەیشتنە تەلە دڕکاوییەکان کە بە چواردەوری مۆڵگە سەربازییەکەدا بە زەوییەوە توند توند شەتەك درابوون و لە زۆر شوێنیشەوە ژەنگ دایڕزاندبوون. یەکێکیان بەرزی کردەوە و ئەوانی دیکەش بە ژێریدا تێپەڕین، وەك ئەوەی ژێی تار و چەنگێك بن، چونکە هەر بەرکەوتنێك بەو تەلانە، دەنگ و ئاوازێکی ئەوتۆ دەژەنن، بە دڵنیاییەوە سروودی مەرگ بۆ ئەو ئارامی و تاریکییە دەڵێنەوە و پێشکەشی کوڕانی

پیره کاکیلی دەکەن.

چەند هەنگاوێکی دیکە، بەناو زەوییەکی داپۆشراو بە قوتووی بەتاڵی خۆراکدا هەنگاویان نا، تۆ بڵێی زەوییەك بە هەزاران قووتووی بەتاڵی تێدا ڕوواوە، کەس نازانێت ئەوە تاکتیك و پلانسازیی سەربازییە زەویی ئەو دەوروبەرەی پڕ کردووە لە قووتووی بەتاڵ، یان کەمتەرخەمی و تەوەزەلیی دانیشتووی مۆڵگە سەربازییەکەیە وای کردووە ئەو هەموو قوتووە بەو جۆرە هەڕەمەکییە فڕێ بدەن و بەو ئاقارەدا پەرتوبڵاوی بکەنەوە، ئەمەش وای کردووە مەحاڵە کەسێك بەسەریاندا تێپەڕێت و دەنگی قرچوهوڕ و تەقەتەقیان خەڵکی ئەشکەوتەکە نەخەنە مەترسییەوە و کارەساتێکی گەورە چاوەڕوانیان نەکات، هەتا ئەگەر لەسەر نووکی پێیەکانیشیان هەنگاو بنێن. وەلێ وا پێ دەچێت لەو ئانوساتەدا خەیاڵی پاسەوانەکە تونێلێکی دووردرێژی ئەوتۆی گرتبێتە بەر، نە سەرەتای هەبێت و نە کۆتایی، هیچ شتێك نییە بیهێنێتەوە سەر خۆی و هیچ بەها و سەنگێکیشی بۆ ئەوانەی لەو شەوی مەرگەدا ژیانی خۆیان ڕادەستی ئەو کردووە، دانابێت!

دیسانەوە بە بێدەنگی لەناو تاشەبەردەکان دانیشتنەوە و گوێیان لە ترپەی دڵی یەکتر دەبوو، ئاخر هەر کەسێك بە چاوی خۆی هەڵوێستی وای بینیبێت، سەرەتا تووشی دڵەڕاوکێیەکی سەخت دەبێت، ئینجا هێدی هێدی ئارام دەبێتەوە. دیسانەوە پیرە کاکیلیان لێ ون بوو، "بی سێڤن"هاوێژەکە بەوپەڕی ئارامییەوە چاوەڕوانی دەستنیشانکردنی شوێنەکەی بوو، لەبەر ئەوەی ئەم بەپێی پلانی داڕێژراو کۆڵەگەو ستوونی سەرەکیی چالاکییەکەیە و هەتا ئەم گورزی خۆی نەوەشێنێت، نابێ یەك چەکی دیکەیان نووزەی لێوە بێت، ئەگەر وا نەکەن نەخشەکارییەکەیان کورت

دەهێنێت و ئامانجی خۆی ناپێکێت، بۆیە بە تەواوەتی ئۆقرەی لێ بڕابوو، هەر پرتەوبۆڵەی بوو، لە شوێنی خۆی وەك ئەوەی کێچی لە کەوڵان وەربوویێت دانەدەسەکنا، لەو ئانوساتەدا بە وردی سەرنجی لە دەوروبەری خۆی دەدا، چاوی بڕیبووە تاوێرە بەردێکی گەورەی پێش خۆی، خەریك بوو دڵ و گیانی لە سینگییەوە دەربچنە دەرێ، دڵەڕاوکێکە هەراسانی کردبوو، لەگەڵ خۆیدا کەوتەوە پرتەوبۆڵە: "نەفرەت... ئەمە چییە؟ کەواتە چەکەکەم هیچ سوودێکی نەما، ئاخر باوەڕ ناکەم مووشەکی چەکەکەم لەم مەودا کورتەدا بتەقێتەوە". پەرژینی ڕەبایەکە لەبەردەمیدایە و شوێنەکەی ئەویش لە بەرانبەری.

ئەم مۆڵگەیە نموونەیەکی دیار و بەرچاوی تۆقاندنی خەڵکی ناوچەکە بوو، لەوێوە، لەو لوتکە شاخەوە، گوللە تۆپ و مووشەکەکان هەواڵی مەرگیان بە خەڵکی ناوچەکە دەبەخشی، هەر لێرەوە چاودێریی هەموو پیادەڕۆیەکی ناوچەکە دەکرێت و پرووشەی مەرگیان بەسەردا دەبارێتن، بەڵێ ئێرە، ڕێك ئێرە، چاوگەی هاویشتنی مووشەك و گوللە تۆپەکانە، ئەو گوللە تۆپانەی لوورەی دەنگیان بەر لە ئاگرەکانیان ئاگاداریی مەرگ و نغرۆبوون و کاولکاری بەوانە ڕادەگەیەنن، کە ئەگەر گوێ بەو ئاگربارانە نەدەن و لەسەر دەم خۆیان بە زەویدا نەدەن، ئەوا مەرگی مسۆگەر چاوەڕێیان دەکات، هەر لێرەشەوە باغ و بێستان و زەوییە کشتوکاڵییەکان سووتماك دەکرێن و مەڕ و ماڵاتەکانیش لەتوپەت و ڕەشماڵەکانیش ئاگریان تێبەردەدرێت و دەکرێنە قەرەبرووت، سەرباری ئەمانەش لێرەوە یارمەتییە سەربازییەکان دابین دەکرێن و پشتگیریی زرێپۆشەکانیش دەکرێت. ئێرە ئەو ڕوخسارە عەرەبییە ناشیرین و قێزەونەیە کە جگە لە کورد چاوی هیچ شوێنێکی دیکە نابینێت، هەر بە

ڕاستی ئێرە سەرچاوەی نەهامەتییەکانی ناوچەکەیە، بۆیە دەبێ ئەمشەو تاڵاوی مەرگیان بە گەروودا بکرێت و کارێکیان پێ بکرێت با بە دەواری شڕی نەکردبێ، دەبێ تۆڵەی ئەو کچۆڵە جوانکیلەیەی سەر کانییە تاقانەکەیان لێ بکرێتەوە.

ڕەحمان مشتەکۆڵەیەکی هێواشی لە چەکەکەی دا و بە بۆڵەبۆڵەوە: "دیسانەوە نەفرەت، ئەم هەموو ڕێگە دوورە هەڵمگرتی و شانوشەپیلکم شکا، کەچی ئێستا هیچ سوودێکت نییە! ئۆقرەی لێ بڕا و لە شوێنی خۆیەوە نیگەرانی هەراسانی کردبوو و پیشی دەخواردەوە، خۆی بۆ نەگیرا و بە سکەخشکێیەکی سووکەڵانەوە بەملا و بەولادا چاوی دەگێڕا تاکوو بزانێت چی لە تەنیشتییەوە هەیە، کە سەرنجی دا پارچە بەردێکی گەورەی بە قووڵایی دوو مەتر بینی، پەیژەیەکی دارینی کورت سەرنجی ڕاکێشا، پاڵی داوەتە تاشەبەردەکە و لای سەرەوەی دەگاتە سەنگەرێکی لە بەرد دروستکراو، وا دیارە سەنگەرێکی پێشەوەی ڕەبایەکە بێت، دۆزینەوەی بە لایەوە شتێکی کتوپڕ و نامۆ نەبوو، چونکە زۆر جاری دیکە چۆتە ناو ئەو مۆڵگە و ڕەبایە کۆنانەی کە سوپا چۆڵی کردوون، بە مەبەستی ئاشکراکردنی نهێنییەکانی دروستکردنیان، هەموویان هاوشێوەی یەکترین: چوار سەنگەر لە هەر چوار لای پەرژینی مۆڵگەکە، ڕێك لە شێوەی ژووری بچووك و تا نیوەشیان لەژێر زەویدان، نیوە دیارەکەیشی چەندین کونی تێدایە بۆ ئەوەی لەو کونانەوە پاسەوانەکان دوژمنەکانیان سەرقاڵ بکەن، وا دیار بوو ئەندازیارەکەی بەوەندەشەوە ڕانەوەستابێت، بەڵکوو لە دووریی پێنج مەترێك چوار سەنگەری نهێنیی دیکەی بونیاد نابێت و لە ڕێگەی خەندەکێك بەژێر زەویدا دەگەنە ئەو سەنگەرانە. ئەمەش بە زۆری بۆ هێرشی پێچەوانە بەکار دەهێنران، ئەگەر پەرژینی

دەوری مۆڵگەکە لە دەرەوە دەستی بەسەردا بگیرابووایە.

ڕەحمان گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی و چپاندییە گوێی هۆبی: "ئەمە سەنگەرێکە لە تەنیشتمەوە، ئاگادار بە، نەبادا لە دواوە ڕووبەڕوومان بنەوە".

هۆبی نقفەی لێوە نەهات و تەنانەت بە سەریشی ئاماژەیەکی وەڵامدانەوەی نەکرد. ڕوخسارێکی تۆزاوی هاتە بەر چاوی و لە ناخیدا سەرسوڕمانێکی گوماناوی بڵاو بووەوە.

ڕەحمان لەبەر خۆیەوە گوتی: "کوڕی تەڕەس دەبینم زمانت بەستراوە، ئەوە چ بەڵایەکە تۆی هێناوەتە نزیکی من. ئەگەر زوو ڕێگەی هاتنە ناو ئەم سەنگەرانەیان لێ نەگرین، جەستەمان دەکەنە سەرەند و بێژینگ. پاشان دەمانچەکەی ڕاکێشا و خۆی بۆ یەکەم چرکەساتی دەستپێکردن ئامادە کرد.

پێشمەرگەکان شڵەژابوون، دڵنیا بوون کە گۆڕانێکی کتوپڕ لە نەخشەی گرتنی مۆڵگەکە ڕووی داوە، کەوتبوونە حاڵەتێکی سەرسوڕمانەوە و نەیاندەزانی چی بکەن؟! نە دەیانتوانی دەست بە هێرشەکەیان بکەن و نە توانای چاوەڕوانیشیان مابوو!

پیرە کاکیل و ئیبراهیم لەگەڵ دوو پێشمەرگەی دیکە دزەیان کردبووە نزکترین خاڵی مۆڵگەکە، لەوانەیە بیریان لەوە کردبێتەوە کە چەکە کاریگەرەکەیان بایەخی نەمابێت. شوێنەکەشیان لە مۆڵگەکە بەرزتر نەبوو، وەك ئەوەی پێشبینییان بۆ کردبوو، هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەوەشدا نەخشە و پلانی هێرشیان دارشتبوو. ئێستا پێویستە بە خێرایی و ژیرییەوە هەڵسوکەوت بکەن، یان لەوانەیە هەلومەرجێکیان بۆ بڕەخسێت بەبێ خوێنڕشتن مۆڵگەکە بگرن، لەو کاتەدا ئەوان گەیشتبوونە پەرژینەکە و لەژێریدا خۆیان مەڵاس دابوو، وەك ئەوەی هەڵێکی

گونجاویـان بـۆ هەڵبکەویـت بـۆ هێرشـکردن، کاتێـك سـەریان هەڵبڕی لەو ناوەدا سەربازێکیان بینی لە ژوورێکەوە دەردەچـوو، بریســـکەی ئـــاگری جـــگەرەکەی بە پشـــکۆ ســـوورەکەی تاریکییەکەی دەدڕی.

سەربازەکە بۆ ئەوەی پاسەوانەکە ئاگادار بکاتەوە گوتی:

- پاسەوان... دەچم پێویستیی خۆم جێبەجێ دەکەم.

پاسەوانەکە گوێی بەو ئاگادارکردنەوەیە نەدا، چونکە شەوانە ئەم جۆرە حاڵەتە چەندین جار ڕوو دەدات. بەڵکوو هەتـا ئەگەر گوێی لە دەنگی خشپەخشـپێك، یـان هەتـا دەنگـی پـێش بێـت، گومانی بۆ شتێکی نامۆ نەچێت، بەڵکوو وا بزانێـت ئەوە دەنگـی پێی سەربازە هاوڕێکەیەتی بەبـێ پـرس و ئاگـادارکردنەوەی ئەو چۆتە دەرەوە، چونکە بە عەقڵی هیچ کەسێکدا ناچێت، کەسێکی نامۆ بگـاتە ئەم قەڵا مەترسـیدارە، نە بەم شـەوە تـۆقێنەرە و نە بە ڕۆژی ڕووناکیش، چونکە ئێرە ترس و دڵەڕاوکێیەکی تۆقێنەر لە دەرووندا دروست دەکات و کەس بە ئاسانی نایگاتێ.

سەربازەکە لایتەکەی دەستی هەڵکـرد و بە ڕێـگەی خۆیـدا دەڕۆیشت، ڕووناکیی لایتەکەی لە تاشەبەردێکەوە دەچووە سەر بەردێکی دیکە و لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشـەیەکی دیـکە، تـا لە کۆتاییدا لەسەر مەسـینەکە جێگیـر بـوو کە مـاوەیەکە بە دوایـدا دەگەڕێـت و لە دۆخێکیشـدایە بە کەڵکـی چـاوەڕوانی نـایەت. ئەمەش وای کـرد سـەربازەکە بەوپەڕی تـووڕەییەوە دەسـت بە پرتەوبـۆڵە بکـات دژی ئەو کەسـەی بەو جـۆرە مەسـینەکەی لە شوێنی خۆی دانەناوەتەوە.

کاتێکیش ڕووی لە ئاودەستەکە کرد، ڕوونـاکیی لایـتەکەی ئەو ڕوخسارە تۆزاوی و ماندووانەی ڕووناك کردەوە، کە زۆر بە

وردی چــاودێریی هەر هەنگاوێــك و هەر ئــاوڕدانەوەیەکی سەربازەکەیان دەکرد، لە شـوێنی خۆیـدا ڕەق بـوو. ویسـتی لە ترسان هاوارێك بکات، بەڵام قوڕگی گیرا و هاوارەکەی وەکوو چپەیەك لە دەمییەوە دەرچوو، ترسەکە وا تۆقاندبووی دەسـتی لە بینەقاقای نابوو و دەنگـی لە قوڕگیـدا زینـدانی کردبـوو، هەر بە تەواوی لاڵی کرد و توانای هیچ دەنگێکی نەما بۆ گوتن.

هەر چواریـان ئەو نەخشـە و پـلانەی لە کەللەیانـدا بـوو بـۆ دەستبەسـەرداگرتنی مـۆڵگەکە بەبـێ خوێنڕشـتن لە کەللەیـان دەرهێنا، سەربازەکە دەرفەتی هەڵاتنی بۆ نەڕەخسا، دوای ئەوەی گوللەکانیـــان دایـــانبێژا و دەمودەســـت لە بەردەم دەرگـــای مۆڵگەکەدا کەوتە سەر زەوی.

پاسەوانەکەش بە تەواوی خۆی قایم نەکردبوو، مام کاکیـل شوێنەکەی دەستنیشان کـرد و هەتـا دەرفەتـی جووڵەیەکیشـی لە شوێنی خۆی پێ نەدا و بە گوللەیەك ساردی کردەوە.

ئینجا پەنجەرە و دەرگای ژوورەکانیـان دایە بەر دەسـتڕێژی گـوللە، بـۆ ئەوەی ڕێـگە بە سـەربازەکان نەدەن بـگەنە شـوێنی خۆیان و بەرگری بکەن، کەچی ئـاگری سـەنگەری بەرانبەریـان بە شەپڕێوی و بەو ناکاوییە لای دووەمی مۆڵگەکەوە دەستی پێ کـرد و زۆر بە چـڕی دەدرەوشـایەوە. هێنـدەی نەخایانـد ئەوەی تەقەی دەکرد بەسەر ترسەکەیدا زاڵ بوو. یەکێك لەو چوارەیـان هاواری لێ هەستا و کەوتە سەر زەوی:

- پێکرام... پێکرام...

ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵیدا بوون کاتێك گوێیـان لە دەنگـی بـوو ڕاچڵەکـین، ئەوە ئـازارە، ئەو گەنــجە هـێمن و مەنـدەی هەمـووان شـانازییان بە هـاوڕێیەتییەوە دەکـرد. تـۆ بڵێـی توانـای

بەرگەگرتنی هەبێت تاکوو ئەوان دەست بەسەر ڕەبایەکەدا دەگرن و چارەسەری دەکەن؟ ئایا پێکانەکەی زۆرە، یان شتێکی کەم و سووکە؟ ئازار خودان خوویەکی جوان و شیرین ڕەفتار بوو، کاریگەریی بە سەر هەر کەسێکەوە دەبوو کە لەگەڵیدا گفتوگۆی بکردبووایە... شکستێکی گەورەیە ئەگەر لە دەستی بدەن.

پیرە کاکیل ئاگادار بووەوە و هاواری بەسەر پێشمەرگەکاندا کرد، کە تا ئەو کاتە لە دواوەی بوون:

- تەقە مەکەن، دەمانکوژن... دەی خێرا بۆ پێشەوە بڕۆن.

ئەو پێشمەرگانەی هێشتا شوێنەکانی خۆیان نەگرتبوو، بەرەو پەرژینی ڕەبایەکە و بە بازدان کەوتنە هێرشکردن و دەستڕێژییان لێ دەکردن، ئەوەیان لە بیر چووبوو کە ئەو چوار تارماییە لە خۆیانن. بەڵام ئەو سەربازانەی خۆیان لەناو ژوورەکان مەڵاس دابوو و دەرفەتی وەرگرتنی سەنگەرەکانی خۆیان بۆ نەڕەخسابوو، لە پەنجەرەکانەوە دەستیان بە هاویشتنی نارنجۆك کرد، زۆربەی نارنجۆکەکان بەر پەرژینی بەردینی ڕەبایەکە دەکەوتن و لە چۆلەوانیدا دەتەقینەوە، بەمەش ئەو دیوارە بووبووە مەتەرێزێك و لە پارچەی تەقینەوەی نارنجۆکەکانی دەپاراستن.

دەستەی پیاوە پیرەکە بە سەر سەربازەکاندا هاواریان دەکرد:

- خۆتان بە دەستەوە بدەن، بەرگریکردنتان هیچ سوودێکی نییە.

- خۆتان بە دەستەوە بدەن، نامانەوێ ئازارتان بدەین.

- لاساری و سەرسەختیتان دەبێتە مایەی مردنتان.

بەڵام کاتێک سەربازەکان لە هاویشتنی نارنجۆک سوور و بەردەوام بوون، شێوازی ئاخاوتنی ئەوانیش گۆڕا. یەکێک لەو نارنجۆکانەش لە پشتیانەوە لەناو تاشەبەردەکاندا تەقییەوە.

- لەگەڵ ئێوەمانە هەی زۆڵینە... خۆتان بەدەستەوە بدەن ئەگەرنا لەناوتان دەبەین.

مام کاکیل بە شێوەزارە عەرەبییە لاوازەکەی خۆی، کە لە کاتی قسەکردندا کۆی بە تاك و تاکی بە کۆ و نێریشی بە مێ دەردەبڕی، هاواری کرد:

- ولك سلمي عيوني لا تخافوا... ولك قلت سلمي. واتە کورە چاوەکەم خۆت بەدەستەوە بدە، مەترسێن... کورە گوتم خۆت بە دەستەوە بدە.

پاشان ئارامیی لێ بڕا و بە خێرایی ڕوو لە دەرگا و پەنجەرەکان دەستی بە تەقەکردن کرد و بەڵێنی ئەوەی پێ دەدان:

- کورە گەواد خۆت بە دەستەوە بدە، مەترسێن.

ئینجا شەڕێکی خوێناوی دەستی پێ کرد، هەر یەکەیان دەیویست ئەوەی دیکە قووت بدات، وەك ئەوەی دڕندە و کێوی بن.

ڕەحمان لە پیرە نزیك کەوتەوە و پێی گوت:

- مام کاکیل، پشتم بگرە، ئەم مووشەکەیان تێ دەگرم. دەنگی ئەمە دەیانتۆقێنێت و خۆیان بە دەستەوە دەدەن، ئاگادار بن دەیهاوێژم... دەیهاوێژم.

بێ سێڤنەکەی نایە سەر شانی و بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بکات، پیرە دەستی گرت و بە ساردییەکەوە پێی گوت:

- کاکە چاوەڕوان بە، تۆزێک ڕاوەستە، ئەو گەوادەی "بیکەیسی"یەکەی بە دەستەوەیە لێ ناگەڕێت مۆلگەکە بگرین، هەتا چەکەکەی ئەویش قریشکەی بێت و بریسکە بداتەوە یەک سەرباز خۆی بە دەستەوە نادات، وەرە کاکە لێرەوە مووشەکێکیان تێ گرە.

ڕەحمان لەگەڵیدا ڕۆیشت تا گەیشتنە گۆشەیەکی پەرژینەکە، کاکیل لوولەی چەکی پێشمەرگە برینندارەکەی، کە لەگەڵ چەکە کۆنەکەی خۆی گۆڕیبوویەوە، خستە ناو کونی یەکێک لە سەنگەرەکان و دەستڕێژێکی پچڕپچڕی کرد، لە ترسی ئەوەی نەبادا یەکێکیان خۆی تێدا حەشار دابێت. دوای ئەوە پلنگئاسا خۆی هەڵدایە سەر سەنگەرەکە. ڕەحمان بێ ئەوەی بیر بکاتەوە خۆی بینی سواری دیوارەکەی تەنیشتی بووە، لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەمەی کردم هیچ مەترسییەکی نییە، ئەو پیرە باشترین پشتگیریم دەکات و بە ئاگری چەکەکەی لە دەستڕێژی چەکی دوژمن دەمپارێزێت".

گوللە بەسەر سەری پێشمەرگەکاندا گیزەگیزی بوو، لەناویاندا بە دوای قوربانییەکدا دەگەڕا، ئاسمانی دەبڕی تا ئەو شوێنەی لە پەلوپۆ دەکەوت و توانای نەدەما و بە شەکەتی و لەتوپەتی دەکەوتە سەر زەوی، هەندێکی دیکەی ئەو گوللانەش بەر تاشەبەرد و دیواری ژوورەکان دەکەوتن و بۆ خۆیان دەگەڕانەوە و مەرگیان پیشان دەدان.

کاتێک چەکی پیرە کاکیل کەوتە هاوڕە "بیکەیسی"یەکە بێدەنگ بوو، هەستی بەوە کرد توانای بەرگریی ئەو پەرچەکردارە بەردەوامەی نییە، زۆر بە خراپی لەسەر

سەنگەرەکەوە کەوتە خـوارەوە، وەك ئەوەی پێکرابێ، تەنـانەت ڕەحمانیش هەمان گومانی کرد، وەلێ بە خێرایی هەستایەوە و بە تووڕەییەوە گوتی:

- کاکە بڕنەوەکە لەم چەکە باشترە.

پاشان مووشەکەکەی ڕەحمـان ڕێگەی خـۆی بەرەو عەدەد "بیکەیسـی"یەکە بـڕی، کە بە جەسـتەیەکی خوێنـاوییەوە خـۆی گەیانـــدە ســـەنگەرێکی دیـــکە، لەوانەیە ســـەرلەنوێ بەرگـــری بکـاتەوە، بەڵام گوللەکـان دەرفەتێکـی دیکەیـان پـێ نەدا. پیـرە کاکیـل لە دڵـی خۆیـدا دەیگـوت: "ئەم سـەربازە ئـازایە شـایانی ڕێزگرتنە."

ئیبراهیم لە گۆشەیەکی دیکەی ڕەبایەکەوە هاواری کرد:

- ڕەحمان وەرە مووشەکێك ئاڕاستەی ئەم دیوارە بکە.

تەنها چەند قەڵەمبازێك و ڕەحمان گەیشتە تەنیشتی.

ئیبراهیم گوتی:

- لەو ژوورە بدە.

بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد. لە بن بەردێکی بچووك دانیشت و بە هەموو دەنگییەوە هاواری بەسەر سەربازەکاندا کرد:

- خۆتـان بە دەسـتەوە بـدەن، پـێش ئەوەی ژوورەکەتـان بتەقێنینـەوە. "بـی سـێڤن"ەکە ئامـادەی تەقانـدنە. دوا دەرفەتتـان دەدەمێ.

چەنـد چـرکەیەك تێـپەڕی. کەس وەڵامــی بـانگەوازەکەی نەدایەوە. سەربازەکان لە بەرگریکردن بەردەوام بوون.

ئیبراهیم بە دەنگێکی بەرزەوە هاواری کرد:

- "بی سێڤن" بیهاوێژە.

بەڵام ڕەحمان نەیهاویشت. سەرقاڵی بیرکردنەوەی شتێکی تر بوو: "ئەمە مەعقوولە؟ خۆ دەیەوێ لەم مەودا کورتەوە بیهاوێژم!"

دیـواری ژوورەکە تەنهـا دوو مەتـر لێیـانەوە دوور بـوو، لە پشتیشـیانەوە تاشـەبەردێکی گەورە هەبـوو زەویـیەکەی بەرەو دۆزەخ دەبـــرد. یەك هەنگـــاو بکشـــێتە دواوە دۆڵەکە بەرەو چارەنووسێکی مسۆگەر قووتی دەدا.

بە ئیبراهیمی گوت:

- توانـای گەڕانەوەم نیـیە. دیـوارەکەش نـزیکە. پـارچەی بەردەکان دەمکوژن.

ئیبراهیم وەك ئەوەی گوێی لە ڕەحمان نەبووبێت، بە توندی قیژاندییەوە:

-"بی سێڤن" بیهاوێژە، چاوەڕێی چیتە؟!

ڕەحمان ئامادەی هاویشتن بوو و لە دڵی خۆیـدا دەیگـوت: "هەموویـان گلەیـی لە مـن دەکەن ئەگەر لە گرتنـی مـۆڵگەکە شکست بخۆین، مردن باشترە لەوەی بە ترسنۆك ناوزەدم بکەن".

دیـواری ژوورەکە هەڕەشـەی لـێ دەکـرد و بەردەکـانی چاوەڕوانی بوون، ناوبانگیش دەیترسـاند و گـاڵتەی پـێ دەکـرد، ئیبراهیمیش دەنگی نووسا. ڕەحمان لەبەرخۆیەوە: سەرکێشـیەکە و بـۆ پاراسـتنی کەڕامەتـی خـۆم لە گـوتی گـوتی، هەر دەبـێ بـیکەم: "بەڵام کەڕامەت و ناوبانـگ چـین، ئەی شـەڕەف چ واتایەکی هەیە؟".

ئەم بیرۆکەیە وەکوو برووسکە بە مێشکیدا تێپەڕی: "ئەم شتانە لەگەڵمان دەژین و بەسەر ژیانماندا زاڵ دەبن. چۆن دەخرێتە ناو کەللەسەری کەسێکەوە و کێن ئەوانەی ئەو ناوونـاتۆرانە دەدەنە پاڵمان؟!" کەڕامەت چ شتێك دەگرێتەوە؟! ئەی شەرەف چییە؟! لە کۆمەڵگەی ئێمەدا دەڵێن شەرەفی ژن پەردەی کچێنییەتی... واتە هەستەکانی... کەواتە پێویستە ئەو هەستانە لە ڕیشەوە دەربهێنێت کە پەیوەستن بەو ئەندامەی جەستەیەوە، تاکوو پارێزگاری لە گەلاوکردنی شەرەفی بکات! بەڵام دەزانم شەرەفی گەلە شارستانی و پێشکەوتووەکان لە مامەڵەکردنیانە نەك لە جەستەیان. واقیع وا دەڵێت، کەواتە ئەوە چ گاڵتەجارییەکە ئێمە تێیدا دەژین. جگە لەوەش شەرەف خراوەتە ئەستۆی ئافرەت بەرلەوەی بخرێتە ئەستۆی پیاو... بەهەرحاڵ، ئەم بیرۆکانە بۆ دوو نەوەی دیکەش لەگەڵماندا دەژین و دەمێننەوە، ئەگەر زیاتریش نەبێت، بەرلەوەی ڕاستگۆیی ببێتە شەرەف لەجیاتیی پەردەی کچێنی. درۆ و تەڵەکەبازییش کە دەیانبەخشینەوە، بەبێ شەرم و تەریقبوونەوە، ببنە بێشەرەفی و بنەچەی گەندەڵی. ئۆف، من لە کوێم؟! خەریکە خۆم لە یاد دەکەم و دەکەومە ناو گەرمەی ئەو زاراوانەی کە جگە لە سەرئێشە هیچ سوودێك ناگەیەنن... دەنگی ئیبراهیم زیاتر نووسابوو کاتێك فەرمانی پێ دام کارێکی خۆکوژی بکەم".

هاواری کرد، ئاواتی ئەوەبوو وەڵامی بانگەوازەکەی بدەنەوە، تاکوو هاویشتنی مووشەکەکەی ڕێك بکاتەوە و بەم ڕێگە گەمژەییەش کوشتنی خۆی هەموار بکاتەوە:

- خۆتان بە دەستەوە بدەن، ئەگەرنا ژووردکە دەتەقێنمەوە. خۆتان بدەن بە دەستەوە. نەفرەت لە هەمووتان... لە تۆش ئیبراهیم.

چاوەکانی نوقاند و تا توانی ئاوڕی دواوەی دایەوە، ئینجا دەنگی تەقینەوەی مووشەکەکە ترسناك و تۆقێنەر بوو. ڕەحمان کەوتە سەر زەوی، لە حاڵەتێکی شڵەژان و حەپەسانی زۆردا بوو، پاش کەمێك هەستایەوە و دەستی بە جەستەی خۆیدا دەهێنا، وەك ئەوەی لە بوونی خۆی دڵنیابێتەوە... کە تا ئێستاش دەژیێت. ئەی پارچەکانی مەرگ بەرەو کوێ چوون؟! ئەوە بەختە؟! بەڵێ، هەڵبەتە ئەوە بەختە لە مەرگی مسۆگەر ئەم جارە دەربازی کرد، کونەکە بچووك نەبوو، پارچە بەردیش زەوی دەوروبەری پڕ کردبوو. مووشەکەکە ڕێك لە شێوەی بەردێکی گەورە بوو کە جاران بە چەکی مەنجەنیقی کۆن دەهاوێژرا، ئەمەش لە بەختی سەربازەکان بوو، خۆ ئەگەر مەوداکەی تەواو بووایە بۆ تەقینەوە، ئەوا ژوورەکەی دەکردە کەشتییەکی ئاسمانی و داروپەردووی بە ئاسماندا دەفڕاند. لەوانەبوو بە هۆی پاڵەپەستۆکەیەوە سەربانی ژوورەکەی چەندین مەتر بە ئاسماندا بفڕاندبووایە.

لە ئەنجامی بیستنی دەنگی مووشەکەکە، ئاگری چەکی سەربازەکان بێدەنگ بوون، ڕەحمانیش هۆشی هاتەوە سەر خۆی کە خەریك بوو لە خۆی بچێت و بێئاگا بێت.

بەوپەڕی پەرۆشییەوە هاواری کرد:

- ئەها لە کۆتاییدا ترس ناچاری کردن بێدەنگ بن، کەواتە بگرن، ئەوەش مووشەکێکی دیکە. ئێوە هەر خۆتان بە دەستەوە مەدەن، با ڕژێمی فاشی ڕزگارتان بکات.

ئیبراهیم هاواری کرد:

- لێرەوە بیهاوێژە، لەناو ئەو بۆشاییەوە.

ڕەحمان میلەکەی هێنایەوە و سێرەی لێ گرت، بەرلەوەی

دەست بە سەر پەلاپیتکەی چەکەکەیدا بنێت، ئیبراهیم بەپەلە هاواری کرد:

- ڕەحمان بوەستە، مەیهاویژە. گوێم لە دەنگی مامۆستا عومەرە، ئاگادار بە ئەگەرنا دەیکوژیت، پێ دەچێ چووبێتە ژوورەوە.

پێشمەرگەکان بێدەنگبوونی ئاگری چەکی سەربازەکانیان بە دەرفەت زانیبوو، بۆ دەستبەسەرداگرتنی مۆڵگەکە لەناوەوە هەڵیانکوتابووە سەری. یەکەم سەرباز هاتە دەرەوە و هەردوو دەستی بەرز کردبووەوە، بە ترسەوە سەرنجی لە لوولەی تفەنگی پێشمەرگەکان گرتبوو، کە ڕوویان لەو بوو، پاشان دووەم و سێیەمیشی بەدوادا هاتن، سێ سەربازی دیکەشیان لەژێر نوێنەکانەوە دەرهێنابوو. هەموویانیان لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا کۆ کردەوە و هەموویان بە تەنیشتی یەکەوە وەها جەستەیان بەیەکترییەوە نووساندبوو، ڕێك لە گورزە دارێك دەچوون بە توندی پێکەوە شەتەك درابن.

ئیبراهیم یەکەم جار بە دەنگێکی ڕەق و توندەوە گوتی:

- لێرە بوەستن. لە شوێنی خۆتان نەجووڵێن.

پاشان بەملا و بەولای خۆیدا ئاوڕی دایەوە، جگە لە ڕەحمان کەسی تری لەگەڵ نەبوو، بۆیە پێی گوت:

- لە تەنیشت یەکترییەوە ڕایانبگرە و باش ئاگاداریان بە ڕەحمان.

ڕەحمان ڕووی لایتە سەوزەکەی دەستی ئاراستەی ڕوخساری یەکێکیان کرد، کە لە ترسان وشك بووبوو، بە دەنگێکی فەرماندەییانەوە گوتی:

- تۆ، پێم بڵێ هیچ پەناگەیەکی نهێنیتان هەیە؟ ئەوانەی دیکە بۆ کوێ ڕایانکرد؟

سەربازەکە لە شوێنی خۆی بێدەنگ بوو، نووزەی لێوە نەهات، ڕەحمان لوولەی دەمانچەکەی ئاڕاستەی سەری کرد، تا لوولەی دەمانچەکەی گەیشتە لاجانگی و بە سەریدا نەڕاندی:

- قسە بکە، ئەگەرنا گوللەی دەمانچەکە مێشکت دەپژێنێت.

سەربازەکە بە دەنگێکی لەرزۆك و خەمناوییەوە کەوتە منگەمنگ، کاتێك باوەڕی بەوە هێنا کە ژیانی پەیوەستە بە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە ئاسانە:

- بەڵێ، دەڵێم، بەس مەمکوژە. من نازانم... هیچ پەناگەیەکی نهێنیمان نییە.

ڕەحمان دیسان هاواری کردەوە:

- چۆن نیتانە؟ درۆ دەکەی!

سەربازەکە بە پەشۆکاوی و شڵەژانێکی زۆرەوە گوتی:

- سوێندت بۆ دەخۆم من هیچ نازانم، خەوتبووم.

- ژمارەتان لێرە چەندە؟ بە خێرایی وەڵام بدەرەوە و دەستی دەستیم پێ مەکە.

بە هەمان شێوە سەربازەکە دەستی بە منگەمنگ کردەوە و گەیشتبووە حاڵەتی وڕێنەکردن، نەك وەك یەکێك ئاگای لە خۆی بێت:

- بەڵێ، بەڵێ، دەستی دەستیتان پێ ناکەم. هەموویان مردن. من نووستبووم. ئەها بیرم کەوتەوە، زۆربەمان بە مۆڵەت

ڕۆیشتووینەتەوە... باوەڕم پێ بکە، ئەوانەی دیکەش مردن، هەموویان هەڵاتن... من نووستبووم. خۆ ئەگەر بمزانیبووایە منیش ڕامدەکرد.

ئەم قسانەی گوت و زۆر بە توندی دەستی بە گریان کرد. لەو ساتەوەختەدا ڕەحمان هەستی بە قێزلێبوونەوەیەکی سەیری فرمێسکەکانی کرد، لە دڵی خۆیدا گوتی: "دیمەنی ئەم فرمێسکانە گەدەم تێك دەدەن و تووشی ڕشانەوەم دەکەن". هەر بە خۆی گوت: بۆچی پیاوان ناگریێن؟ لێی گەڕێ ڕەحمان با بگرییێ. مرۆڤ هەستە، هەستیش ئازار دەچێژێت".

- ئایا دەمانکوژن؟ ئێمە منداڵمان هەیە... منداڵ و... دەربەدەر دەبن.

هەستی ئیبراهیم هەژی و بەئاگا هات، ئەو باوکی چەندین منداڵە، ئاشکرایە کە هەستی باوکایەتی سەرڕێژ دەکات، هەر کەسێك سەرنجی بدات، دەزانێت کەوتە ژێر کاریگەریی ئەو فرمێسکە گەرمانەوە، هەوڵی ئەوە دەدات ڕێگەیەك بدۆزێتەوە تاکوو دڵنیاییان پێ ببەخشێت، بۆیە بە دەنگێك کەوتە قسە، هەرچی تووڕەیی و توندوتیژی هەبوو تێیدا نەمابوو، کە پێویستبوو جەنگاوەرێکی وەکوو ئەو لە هەلومەرجی وادا بە لای کەمەوە هەیبێت.

- هەرگیز... کەس ناتانکوژێت. ئێوە برای ئێمەن، بە هەموو پیرۆزییەکانمان سوێندتان بۆ دەخۆم کە نامانەوێ هیچ خەراپەیەکتان بەرانبەر بکەین.

لەجیاتیی ئەوەی واز لە گوتیان گوتیان و هەنسك و پەلەقاژەی مەرگ بهێنن، لەناو ئەو سۆزە هەڵکشاوەدا دەنگی گریانیان بەرز بووەوە، ڕەحمان سەرنجێکی گاڵتەجاڕیانەی

ئاڕاستەی ئیبراهیم کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: "کارێکی زۆر مەزنە، دەی با هەموومان چەکەکانمان فڕێ بدەینە لاوە و دابنیشین و شیوەن و واوەیلا و گلەیی لە یەکتری بکەین".

بەڵام ئیبراهیم لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئازار و ئەشکەنجەی دەسەڵات بەس نییە؟ ئەگەر ئێمە دڵنیاییان پێ نەبەخشین ئەی پەنا بۆ کێ و بۆ کوێ ببەن؟ پاشان من گلەییت لێ ناکەم ڕەحمان، لەبەر ئەوەی هێشتا هەست و سۆزی باوکایەتی نازانیت، دڵنیام ئەو ڕۆژەی دەبیتە باوك ئەم چرکەساتەت بیر دەکەوێتەوە. ئەو کاتە گلەیی لە خۆت دەکەیت، لەبەر ئەوەی بەو سەرنجە سەخت و دژوارەوە تێت ڕوانیم".

لەو کاتانەدا، کەللە و مێشکەکان پیت و وشەکانیان هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد، تاکوو سەرلەنوێ واتایەك بۆ ژیان و مردن دابڕێژنەوە، یەکێك لە سەربازە بریندارەکان نارنجۆکێکی دەستی فڕێدایە ناو حەوشەکەوە. ڕەحمان بڵاچەیەکی فسفۆریی سەوزی بینی کە لە یەکێك لە ژوورەکانەوە دەرچووە دەرەوە، تاکوو لە پشت سەربازە دیلە ڕیزکراوەکاندا بتەقێتەوە، هەر کە گەیشتە سەر زەوی دەنگی تەقینەوە و هەژان و پارچەی نارنجۆك و ناڵە و هاواریان ئەو ناوەیان پڕ کردبوو.

چەند خولەکێك تێپەڕیبوو، تا ڕەحمان هاتەوە سەر خۆی، خۆی بینی وا لە یەکێك لە ژوورەکانی نزیك تەقینەوەکە درێژ کراوە و چاوەکانی پڕ بوون لە خۆڵ و نقومی فرمێسك بوون، مامۆستا عومەر و پیرە کاکیل خەریکین چارەسەری دەکەن، بەو هیوایەی لە هۆش خۆی نەچێت و نەبووریتەوە، پاشان گوێچکەکانی بە شڵەژاوی لە دەرەوەی ژوورەکە هەندێك دەنگیان دەچنییەوە لەگەڵ یەکتری تێك دەچڕژان و هەندێك دەنگی دیکەش لە نزیکییەوە دەیانپرسی: "ها ڕەحمان بەرکەوتی؟ هەستە... هەستە بەئاگا وەرە".

ئەویش بە دەنگێکی نزمەوە هەندێك قسەی هەڵبزڕکاوی دەکردن: "هەستب بە قاچم ناکەم. دەستم ژان دەکات... ئەی خوایە وەك ئەوەی بە ئاسماندا فڕیبم... بێ سێڤنەکەم لە کوێیە...؟! ئێ خۆ بە شانمەوە بوو، ئەی چی لێ هات...؟! ئەوە چی بوو؟!".

دیلەکان لە حەوشەکەدا بەسەر یەکتریدا ڕاکشابوون، ئەوانیش بەشی خۆیان لە پارچەی تەقینەوەی نارنجۆکەکە بەر کەوتبوو. تیایان هەبوو جووڵەی نەمابوو، گیانی دەرچووبوو و خۆی دابووە دەستی مەرگەوە، هەندێکی دیکەشیان لەبەر ئازاری برینەکانیان دەیانناڵاند و هاوار هاواریان بوو، چاوەڕوانی کۆچی هەتاهەتاییان دەکرد.

پیرە کاکیل هاواری بە سەر ئیبراهیمدا کرد:

- بزانە ئەو دڕندەیەی نارنجۆکەکەی هاویشت مردووە؟ لێی دڵنیا بە.

ئیبراهیمیش بەناو لەپی دەستی چاوی دەسڕی و بە منگەمنگەوە دەیگوت:

- ناتوانم ببینم.

پیرە بە حەپەساوی قسەی پچڕپچڕەوە:

- ئەی هاوار! نەفرەت!

پاشان نارنجۆکە دەستییەکەی خۆی کە بە قایشەکەی پشتییەوە هەڵواسرابوو کردەوە و ئەڵقەکەی ترازاند و هاویشتییە ئەو ژوورەی سەربازە بریندارەکە نارنجۆکەکەی لێیەوە هاویشت و ئەم کارەساتەی خولقاند و هەموانی شەق و پەل کرد.

## بەشی چوارەم

مامۆستا عومەر بە سەرنجەکانی ڕەحمانی دەپشکنی و بە دوودڵییەوە پێی گوت:

- کوانێ ئەو کیسانەی پێت بوون؟ یەکێکیانم نادەیتێ؟

ڕەحمان بەسەر یەکێک لە جێخەوەکاندا نووشتابووەوە، دەموچاوی لەناو پێخەفە کەڵەکەبووەکان حەشاردابوو. مامۆستا عومەر پەی بەوە برد کە دەبێ قسەی لەگەڵ بکرێت، نەبادا هۆشی لە خۆی بچێت، چونکە زۆر پێویستیی بە ئاگاداری و وریایی هەیە. ڕەحمانیش هەوڵی تەواوی دەدا بۆ ئەوەی جووڵە و چالاکی بێتەوە بەر. ئەم کارەساتەی بەسەری هات وا ئاسان نەبوو بە سەلامەتی لێی دەرباز بێت. ئاخر نێوانی ئەو و تەقینەوەی نارنجۆکەکە تەنها مەترێك بوو، دیارە هێشتا دوا چرکەسات، موژدەی مەرگی بۆ نەهێناوە، خۆ ئەگەر ڕیزبوونی سەربازەکان نەبوونایەتە پەرژین و بەربەست لە نێوان ئەو و مەرگدا، حەوت زەمان بوو ماڵئاوایی کردبوو. ڕەحمان بە سستی سەری هەڵبڕی و بە دەنگێکی شەکەتەوە گوتی:

- هەموو کیسەکانم دایە ئەوان... چیت دەوێ لەناو کۆڵەپشتەکەم دابنێ.

دەنگی تەقینەوەکە لە مێشکیدا وەکوو گڕکان لرفەلرف و زرموهوڕی بوو. ئەوەی سەرنجی ڕادەکێشا هێشتا لایتەکەی لەناو مشتی چەپی و دەمانچە مەکاریۆفەکەشی لەناو مشتی ڕاستیدا بوو، وێڕای تەقینەوەکە فڕێی نەدابوون.

پاشان هێزی خۆی کۆ کردەوە و هەستایە سەر پێ و قیت بووەوە، لە ناخی خۆیدا دەیگوت: "وا بڕوات لە هۆش خۆم دەچم. ئەم دۆخە دۆخی نازو پشوودان و خاوبوونەوە نییە. هێشتا کاتێکی درێژمان لە پێشە، بەرلەوەی خۆم بدەمە دەست شەکەتییەوەو ئاڵای خۆبەدەستەوەدان هەڵدەم".

بە ناولەپیشی لەو تاریکییەدا لە دەستکەوتێك دەگەڕا. دەستی بەر دەموچاوێك کەوت لە هەردوو کونە لووتییەوە هەناسەیەکی گەرم دەردەچوو. ڕووناکییە سەوزە هەڵبزڕکاوەکەی لایتەکەی دەستی ئاڕاستە کرد، سەربازێکی بینی لەسەر پێخەفێك ڕاکشاوە و خەڵتانی خوێن بووە. خوێنێکی زۆری لەبەر دەڕوات، وا پێ دەچێت ئەو گوللانەی ئاڕاستەی دەرگای ژوورەکە کران، تووشی ئەو برینە زۆرەیان کردبێت.

بە هەموو هێز و توانایەوە خۆی بە ژیاندا هەڵواسیبوو، وێڕای ئەوەی دەستی لێ شوشتبوو، وەلێ سوور بوو لەسەر ئەوەی بژیێت.

ڕەحمان لەگەڵ خۆیدا گوتی: "هیچ ئومێدێك نییە بۆ ژیانی ئەمە، زۆر ئازار دەچێژێت". بێ ترس و دوودڵی دەمانچەکەی ئاڕاستەی سەری سەربازەکە کرد. گلێنەی چاوەکانی کە ئاڕاستەی بنمیچی ژوورەکە کردبوو، بڕییە چاوە تۆزاوییەکانی ڕەحمان کە هێشتا فرمێسکیان لێ دەهات، بە چپەوە پێی گوت... نا نا بەڵکوو دوواندی و پێی گوت:

- بۆچی دەمکوژیت؟ خۆ من هیچم نەکردووە!

چاوە فرمێسکاوییەکانی ڕەحمان وەڵامیان دایەوە:

- دەمەوێ یارمەتیت بدەم.

- دەتەوێ یارمەتیم بدەیت؟!

هەروەها چاوەکانی سەربازەکە بە حەپەساوییەوە ئەمەشیان زیاد کرد:

- ئەگەر دەتەوێ یارمەتیم بدەیت، بە دەردی خۆمەوە لێمگەڕێ و جێم بهێڵە.

ڕەحمان دەمانچەکەی لە سەری سەربازە بریندارەکە هێنایە خوارەوە و وازی لێ هێنا، تاکوو بیر لە دوا ساتەکانی ژیانی بکاتەوە.

- مامۆستا عومەر تۆ چی دەڵێیت؟

جارێکی دیکەش ڕووناکی لایتەکەی و لوولەی دەمانچەکەی ئاراستەی سەری سەربازەکە کردەوە.

دەروونی خۆی وەڵامی دایەوە:

- کورە نەکەی ڕەحمان.

گوتی:

- دەمەوێ یارمەتیی بدەم.

دیسانەوە ناخی خۆی وەڵامی دایەوە:

- بەم ڕێگەیە؟! چییە پێت وایە ئەسپە؟!

وەڵامی دایەوە:

- ئاخر ئازار دەچێژێت!

ناخی گوتی:

- هەتا ئەگەر ئازاریش بچێژێت. ئەوەی تۆ دەیکەیت

کـارێکی ترسـنۆکانەیە و هەرگیـز لە دەسـت قسەوقسـەڵۆکی خەڵکی دەربازت نابێت.

بە پاساوهێنانەوە گوتی:

- ئەوە گوللەی بەزەییە.

- گوللەی بەزەیی چی، خۆ ئەمە ئەسپ نییە؟! ئەمە مرۆڤە مرۆڤ، هەرگیز نەکەی بەرانبەر کەسێکی بێدەسەڵات دەست بە پەلاپیتکەدا بنێیت. ئەو فیشەکەت هەڵبگرە، لەوانەیە پێویستت پێی بێت.

شێوەی قسەکردن و سووربوونەکەی گۆڕا:

- ئاخر هەر دەبێ هەموویان بکوژرێن.

- پـێم گـوتی کوشـتنی کەسـی بێدەسـەڵات کـاری ترسنۆکەکانە. بەڵکوو هەتا لە ترسنۆکی و نامەردییش خەراپترە.

ڕەحمان خۆی خستە ئەو هەڵوێستەوە و گوتی:

- باشە، بیر لەوە بکەوە کاتێك ئێمە خەریکی پاشەکشـەین و ئەو هەمـوو دەسـتکەوت و بـارە گرانەمـان پێیە و بەو هەمـوو شەکەتییەمانەوە، یەکێـك لە سـەربازە برینـدارەکان هەسـتایەوە و دەستڕێژیی لـێ کـردین، نـرخەکەی چـی دەبێـت؟! وەك ئەوەی پێش کەمێـك ئەو برینـدارە سەرشـێتە کـردی کە وامـان زانیبـوو مردووە و ئەو نارنجۆکە تۆقێنەرەی پێدا تەقاندینەوە، خـۆ ئەگەر دیواربەندی جەسـتەی سـەربازەکان نەبوونـایە لەبەردەممـدا، ئەوا ئێسـتا منـیش لە ڕیـزی مردووەکانـدا بـووم، چیـیە تـۆ دەتەوێ دیسانەوە بەم ڕێگە گەمژەییەوە، ژیانمان بخەیـنەوە بەر مەترسـیی مەرگ و لەنـاوچوون؟! لە پێنـاوی کـێش؟ هە... لە پێنـاوی برینداریێك کە کۆڵەگە و پشتوپەنای مانەوەی دەسەڵاتە؟!

- ڕەحمان تۆ لەمەیاندا لەسەر حەقیت، بەڵام خۆ دەرگاکانی چارەسەرکردن هەمووی بە یەکجار بە ڕوومانـدا دانەخراون. کێشەکە ئاسانە... هەموو ئەو بریندارە بەستەزمانانە بپشکنە، کە گوتت کۆڵەگەی دەسەڵاتن، منیش لەمەیاندا هاوڕام لەگەڵت، باش بیانپشکنە و ئەوەی توانای ڕۆیشتنی هەیە لەگەڵ خۆماندا وەکوو دیل دەیانبەین.

ڕەحمان گوتی:

- لەوانەیە توانای ڕێکردنی نەبێت، بەڵام دەتوانێت سەنگەرمان لێ بگرێت و لە کاتی پاشەکشێماندا دەستڕێژمان لێ بکات.

لەگەڵ خۆیدا بە منگەمنگەوە گوتی:

- ناتوانین. ئێمە سەرقاڵین و ژمارە و کاتی تەواویشمان نییە بۆ ئەوە.

- کەواتە بریندارەکان لە ڕەبایەکە دوور بخەنەوە و مۆڵگەکەیان بتەقێننەوە.

ڕەحمان لە خۆی تووڕەبوو و هاواری کرد:

- ئەرێ ئەوە چییە تۆ ئەی ویژدان... بۆ واز لە مرۆڤایەتییەکەت ناهێنیت، وێڕای ئەوەی لە قەوارەیەکی وردوخاشکراویشدا دەژیت؟!

- پابەندبە بەوەی پێت دەڵێم، تۆ تا ئێستاش مولکی منیت.

- من کۆیلەی تۆ نیم، کاتی ئەوە هاتووە لە یەکتری

دابـڕێین و دوور بکەوینەوە و هەر کەسە و ڕێگەی خۆمـان بگرین.

ڕەحمـانیش وای گـوت و ئەم جارەشـیان بە سـووربوونەوە لـوولەی دەمـانچەکەی ئاراستەی سـەری سـەربازە بریـندارەکە کـردەوە، بەڵام هەر زوو بە ترسـەوە پەشـیمان بـووەوە، کاتێـك ڕوخساری سەربازە برینـدارەکە "بە ئەفسوونێکی شاراوە" گۆڕا بۆ ڕوخسـاری خـۆی، تـا وا خەیـاڵی کـرد، تەقە لە خـودی خـۆی دەکات!

ڕوخسارە نوێیەکە گوتی:

- دەی تەقە بکە ئەگەر دەتوانیت.

ڕەحمان بە دەنگێکی لەرزۆکەوە هاواری کرد:

- نەخێر!

- بۆچی... ئەی کاتی ئەوە نەهاتووە ماڵئـاوایی لە یەکتـری بکەین؟!

- ماڵئاوایی و لەیەکتریدابڕان؟!

- بەڵێ، دابڕێین و جیا ببینەوە.

- نەخێر هێشتا نا! هێشتا نا!

- بۆچی لە بڕیـارەکەت پاشـگەز بـوویتەوە؟ گونجـاوترین شوێنە بۆ لێکدابڕان.

- بەڵام هێشتا بڕیارم نەداوە.

ویژدانی پێی گوت:

- کەواتە بۆچی زماندرێژیم بەسەردا دەکەیت؟!

- زمانـــدرێژیم نەکـــردووە، بەڵکـــوو لە دەســـت ئەو کۆیلەبوونەم کەمێك بێزار بووم.

- کەواتە گوێ بگرە. تـۆ کـۆیلەی منیـت... کۆیلەمیـت و ڕێـگەت نـادەم ئـازاد بیـت. ئەو ئـازادبوونەت لەسـەر شـەبەنگی لاشەکەم دەبێت! تێگەیشتی؟ تۆ کـۆیلەمی کـۆیلە... تـۆ مـوڵکی منی.

ڕەحمان بە کەمێك پاشەکشێوە گوتی:

- مــن مــوڵکی تــۆم، ئەمەیــان ڕاســتە، بەڵام ئەمــڕۆکە لێمگەڕێ... تەنها ئەمڕۆکە!

- دەتەوێ گاڵتە و گەمە بە کوشتنەوە بکەیت! ئەی بۆچی پێشتر ڕاستییەکەت نەدرکانـد. تـۆ فریـوت دام بەوەی بەو ڕێـگە گەوجانەیەتەوە دەتەوێ یارمەتیی بدەیت، بـۆیە وەکـوو ویـژدان بیرم کردەوە هوشیارت بکەمەوە. بۆچی درۆت لەگەڵدا کـردم؟! دەی قسە بکە.

ڕوخســاری ڕەحمــان ســوورێکی تــۆخ هەڵــگەڕاو هەوڵــی هەڵاتنـــی لە وەڵامـــدانەوە دەدا، کەچـــی خـــۆی بینیـــیەوە بە ڕاستگۆییەوە دەڵێت:

- لە گلەیی و گازاندە و قسەی خەڵکی ترسام.

- بۆچی؟!

- لەبەر ئەوەی مولکی تۆم.

- جا ئەگەر مولکی من نەبوویتایە؟

ڕەحمان زۆردارانە هاواری کرد و دەیویست شتێك لەسەر شانی خۆی دوور بخاتەوە کە ئازاری دەدا:

- هەڵبەتە دەبوومە قەسابێك!

- بۆچی؟!

- لەبەر ئەوەی ئەوانیش قەسابن.

- نەك هەموویان.

- بەڵێ هەموویان!

- گوتم نەك هەموویان.

ڕەحمان بە ناولەپی بە ناوچەوانی خۆیدا کێشا و پێی بە زەویدا دا و هاواری کرد:

- بەلکوو هەموویان! هەموویان! هەر هەموویییان.

- چۆن؟!

- هەر هەموویان کۆڵەگە و پشتوپەنای گورگەکەن. وەکوو بەرخ دەیانداتە پێش خۆی.

- بەڵام شوانەکە ڕاوی گورگەکە دەنێت، تاکوو بەرخەکانی بپارێزێت. ئەرێ تۆ بینیوتە شوانێك گورگ و بەرخەکانیشی پێکەوە بکوژێت؟!

- خۆزگە بەرخی ڕاستەقینە دەبوون!

- مرۆڤایەتی خەتابار مەکە!

ڕەحمان نوقمی بێدەنگی بووبوو، چاوەڕوانی کرد تاکوو هەناسە بچڕاوەکانی هاتنەوەبەری و کەمێک هاوسەنگیی بۆ گەڕایەوە، ئینجا گوتی:

- چ قەیدییە... ئەو بەرخانە مرۆڤن... خەراپترین مرۆڤ، لەبەر ئەوەی کۆلەگەی دەسەڵاتن. لەوانەیە بەو جۆرە بگۆڕێن و بمانەوێ و نەمانەوێ ببنە گورگ، بۆیە دەبێ کەڵبەکانیان لە ڕەگەوە هەڵکێشین.

- بەڵێ، ئەوە باشترین هۆشمەندییە. ئەوەی گوتت دروستە، کەڵبەی ئەو گورگانە وردوخاش بکە، یان با بڵێین ئەو بەرخە دڕندانە، بەڵام مەیانکوژە. هەرگیز مەیانکوژە، ئایا گوێت لێ بوو؟

- باشە تۆ بۆچی دژی کوشتنی؟

- من دژی کوشتنی ئەو کەسانە نیم کە شایانی کوشتنن، بەڵام تۆ دەتەوێ هەمووان بکوژیت.

- ئەی ئەگەر هەمووان شایانی کوشتن بن؟

- ئەمە لۆژیکی نییە. چونکە تۆ ناتوانی هەموو گەل لە سێدارە بدەیت، ئەگەر هەڵەشیان کردبێت.

- بەڵکوو دەتوانم... خۆ ئەگەر کارەکە بە من ڕابسپێرن،

هەر کەسێك لە سێدارە دەدەم ئەگەر هەڵە بکات، هەتا ئەگەر تێکڕای گەلیش بێت!

- کەواتە ئەزیزم تۆ لەگەڵ گورگێکی کەتە و زل و چڕنووك بە خوێن هیچ جیاوازیت نییە. جارێکی دیکە و سەرلەنوێ ئەم بەرخانە دەدەیتەوە پێشەخۆت، ئەو کاتە دەبێ یەکێك بە دواتدا بگەڕێت، بە تایبەتی بۆ ئەوەی لەو بەرخانە دەربازت بکات، تەنها کەڵبەکانیشت ناشکێنێت، بەڵکوو سەریشت دەشکێنێت و ونجڕ ونجڕت دەکات.

- جگە لە تۆڵەکردنەوە لێیان شتێکی ترم ناوێت.

- ها دیسانەوە سەرلەنوێ گەڕاینەوە بۆ...

به سکاڵاوە قسەکانی خۆی بڕی:

- ئاخر ئەو کاتەی لەژێر پێیەکاندا بێدەسەڵات بووم، هیچیان بەزەییان بە مندا نەدەهاتەوە.

- ئەمە کێشەی تۆیە.

- کاتێك ئەشکەنجەیان دەدام و ئازارم دەچەشت، ئەوان قاقا پێدەکەنین و سووکایەتییان پێ دەکردم.

- لەبەر ئەوەی دڕندەبوون.

- بۆیە هەر دەبێ بکوژرێن.

- بەڵکوو دەبێ کەوی و دەستەمۆ بکرێن.

- گوتم دەبێ بکوژرێن.

- منیش گوتم ماڵیکردن و دەستەمۆکردنیان.

ڕەحمان هاواری کرد و قیژاندی:

- نەفرەت لە مرۆڤایەتی.

دەروونیشی هاواری کرد:

- لە ئازارەکانی خۆتەوە مەدوێ.

ڕەحمان مشتی خۆی بە بێزاری بەرزکردەوە و بە دەنگێکی ماندووەوە گوتی:

- لێمگەڕێ... ئەی ئەوەی لە جەستە و قەبارەیەکی شەکەت و بێزار و هاڕدراودا دەژی، لێمگەڕێ و لەوە زیاتر ئازارم مەدە... من... من دەمەوێ ئەوانە بکوژم کە ئەشکەنجەیاندام، بۆیە ناچارم مەکە لەوەی بتکوژم.

- بمکوژە و بەو جۆرە بژی کە خۆت دەتەوێت.

- ئیدی بەسە... بەسە و زیاتر تووڕەم مەکە، واز لەم سەربازە دێنم، وا هەست دەکەم لەگەڵ تۆدا ناگەمە هیچ ئەنجامێك.

پاشان لاجانگی خۆی گرت، وەك ئەوەی سەرئێشەیەکی لە ناکاو ئازاری دابێت، بە لادا هات و سەقامگیریی خۆی لەدەست دا، بە دەنگێکی شەکەت و ماندوو کە بیرکردنەوە دایدڕیبوو بە خۆی گوت:

- پشتگیریم بکە ئەی ئەو کەسەی لە جەستە و قەبارەیەکی داهێزراودا دەژیت، پشتگیریم بکەو وام لێ مەکە

لەگەڵــت لە ململانێــدا بــم... تــۆ ئەشــکەنجەیەکی تــۆقێنەرانەم دەدەیت، من بە تونـدی ئـازار دەچێژم، بە سـەختی دەتلێمەوە، بەزەییت بە حاڵمدا بێتەوە... من دان بەوەدا دەنێم کە لە دەریـای ئازارەکانمــدا نقــوم بــووم، بە دوای هەســتگەلێکدا دەگەڕێــم ڕۆژگـــار وردوخاشـــی کـــردوون. بەڵام هەیهـــات... مەحـــاڵە بیاندۆزمەوە... پشـتگیریم بـکە و گلەیـیم لـێ مەکە. قەوارەم ون بــووە. هەســتەکانم ون بــوون، لەتــلەت و پارچەپارچە بــوون... جەســتەی پارچەپـارچەبووی مرۆڤێکـی دڕنـدە و ترسـناك... مـن نامەوێ دڕنـدە بـم. سازشـم لەگەڵـدا بـکە ئەی ئەوەی لەناومـدا دەژیت، یان پیسـم دەکەیـت... مـن تێـك شـکاوم... مـن شـتێك نەماوم جگە لە مرۆڤێکی بێئومێد و ون و ڕووخـاو... پاشـماوە... مرۆڤ... ونبوو... مرۆڤێکی ونبوو... ونبوووووووووووو.

ڕەحمــان بە هەناســەبڕکێیەکی لەرزۆك و شــێواوەوە بیــری دەکــردەوە. بێــدەنگی بــاڵی بەســەر مــۆڵگەکەدا کێشــابوو، پێشمەرگەکانیش بە هێواشـی و لەسـەرخۆ لە جووڵانەوەدابـوون، کـاتیش وەکـوو نەریتــی خــۆی تێــدەپەڕی و ســووکایەتی بە مرۆڤەوە دەکرد. هەردوو دیـلە برینـدارەکەش بە دەنگێکـی نـزم دەگریـان. ئـا ئەوەتـا دکتـۆرەکە هەواڵــی ئـادەم دەگەیەنێــت، سەرلەنوێ خەیاڵ بەسەر ڕەحمانـدا زاڵ دەبێـت: "لەمـڕۆ بەدواوە ئـادەم لەگەڵمانــدا نامێنێــت، بە ڕاسـتی ئەم ژیـانە گاڵتەجـاڕییە". لەبەرخــۆیەوە کەوتە پرتەوبــۆڵە. بە تونــدی دەســتی کــردە نــاو گیرفانی و ئەو کلیلەی بەدەستی گووشی کە دوای نیوەڕۆ ئادەم پێی دابوو، کلیلەکەی کاریگەرییەکی لەناو لەپی بەجێ هێشـت، گفتوگۆی نێوان خـۆی و ئـادەمی بیـر هـاتەوە. بەڵام بە خێرایـی

بەئاگا هاتەوە. پێویستە کاتی زیاتر بە فیرۆ نەدات، ڕاستە ئەو بیرۆکانەی بە مێشکیدا تێپەڕین، لە خێرایی برووسکە دەچوون، شتێکی وایان لە کات نەدەبڕی، تەنها مەودای تیلەی چاوێك نەبێـــت. بەڵام ئەو مەودا کەمە لەو هەلـــومەرجە ناســـك و ڕووگیرییەدا گرانبەها و بە نرخ بوو، بۆیە هێندەی نەخایاند کەوتە باڵەفڕکێ، بە لای ڕاست و چەپی خۆیدا دەیڕوانی، بە دوای شتێکی دیاریکراودا دەگەڕا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەو تۆپە لە کوێیە کە لە شاخی هەندرێنەوە تۆپبارانی دەکردین؟ خۆ لە حەوشەکەشدا نییە، ئەی کەواتە لە کوێیە؟". لە نێو دیواری ژوورەکاندا کەوتە گەڕان کە لە کۆڵانی تەنگەبەر دەچوون، لە هەر کەسێکی دەپرسی تووشی دەهات: "تۆپەکەتان دۆزییەوە؟".

لەناو حەوشەکەدا پێشمەرگەکان دەهاتن و دەچوون، تەماشای دەوروبەری پەرژینەکانیان دەکرد، سەرنجی نێوان دیوارەکانیان دەدا، پەلاماری ژوورەکانیان دەدا، ژێر نوێنەکانیش دەگەڕان، دەچوونە ناو سەنگەرەکانەوە و دەستیان لە دیوارەکەی دەدا، وەك ئەوەی بیانەوێ ئاستی تۆکمەیی و شارەزایی بونیادنان و دروستکردنی بزانن. لەوێ لە بۆشاییەکی کراوەدا بەرخێکی سپی و جوانیان دۆزییەوە، لە کاتی شەڕەکەدا هیچ گوللەیەکی وێڵی بەر نەکەوتبوو، لەوەش زیاتر ئەو مێوانە ناوەختەکانیشی پشتگوێ خستبوو و بۆ خۆی ئەو گژوگیایەی دەخوارد کە لە پێشـــی دانرابـــوو، لە تـــاوەرە بەرزەکەیَ خـــۆیەوە بە چاوسوورکردنەوە سەیری هەمووانی دەکرد. چ بەرژەوەندییەکی لەو هەراوهوریایەی نێوان ئەو خەڵکەدا هەیە؟! بەرخەکە باش دەیزانی هیچ یەکێك لەوان لە پێناوی ئازادی و ڕزگارکردنی

ئەودا ئەو هەمــوو سەرکێشــییەیان نەکــردووە، بە لای ئەوەوە هەردوولا وەکوو یەکن، چونکە هەردوو لایان بە لای ئەوەوە قەســابن، چ بەدبەختیــیەکە؟! بەڵکــوو لە چارەڕەشــێکیش چارەڕەشترە، ئاخر ئەو لێرە بێت، یان لەگەڵ ئەماندا بڕوات، جگە لە چەقۆیەکی تیژ کە بە سەر ملییەوە سەمای کانیاوێکی سووری فوارەبەستوو بکات، شتێکی تر نییە، چیت بۆ دەکەن؟! گلەییان لێ مەکە، ئەوە نەریتی ژیانە لای ئەوان!

# بەشی پێنجەم

چەند چرکەساتێك بەر لە پاشەکشێکردن، پێشمەرگەکان ئاماژەی سەوزیان لە یەکێك لە مۆڵگە سەربازییەکانی نزیکیانەوە بینی کە لەسەر لوتکەیەکی بەرزدا بوو. کەوتنە ڕمڵێدان و مەزەندەکردن بەوەی ئەو تیشکە سەوزانە چ واتایەکیان هەیە و بۆچی بەو جۆرە ئاڕاستەیان دەکرێت؟! بەمەش چپەچپی نێوانیان دەستی پێ کرد و هەندێکیان هانی ئەوانەی دیکەیان دەدا کە پەلە بکەن:

- ئەوان ئاماژە دەدەن، لەوانەیە ڕەبایەکە تۆپباران بکەن و گوێ نەدەنە ئەوەی هەرچییەکی تێدا ماوە و نەماوە.

دکتۆرەکە وای گوت و وا خۆی نیشان دا کە ئەوەندە گوێی پێ نادات:

- بۆردومانی ناکەن، ئەوە قسەی قۆڕە.

عومەر دەپرسێت:

- تۆ لە کوێ دەزانی ئەوان بۆردومانی ناکەن؟!

دکتۆرەکە بە متمانەبەخۆبوونەوە وەڵامی دایەوە:

- لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەوان بیانەوێ ئەو کارە بکەن، پێت وایە ئاماژەی ئاگاداربوونەوەت بۆ دەنێرن، تاکوو پاشەکشێ بکەیت؟!

- نەخێر، بەڵکوو لەوانەیە لەسەر ئاماژەیەکی دیاریکراو

ڕێك كەوتبێتن، ئەگەر وەڵام نەبوو، ئەو كـاتە دڵنیـا دەبـنەوە كە ڕەبایەكە گیراوە و كۆتایی هاتووە. ئینجـا بۆردوومـانی دەكەن... پێویستە پەلە بكەین.

ڕەحمان لەو كاتەی سەرقاڵی كردنەوەی بنكەی تۆپەكە بوو لە لوولەكەی و ستوونەكانی، گوتی:

- دەبا ئێمەش وەكوو ئەوان بكەین؟ وەكوو ئەوان وەڵامی ئاماژەكانیان بدەینەوە و فریویـان بـدەین بەوەی هێشـتا ڕەبـایەكە وەكوو خۆیەتی و نەگیراوە، تەنها وردە شەڕێك بـووە و هیچـی تر.

عومەر لە كاتێكدا بیرۆكەكەی لە مێشكی خۆیدا هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەكرد، گوتی:

- بیرۆكەیەكـی باشـە. بەڵام كـێ دەڵـێ وەڵامەكەی ئـێمە هەمـان ئەو مەتەڵەیە كە هەردوو ڕەبـایەكە لەسـەر هەڵهێنـان و وەڵامدانەوەی ڕێك كەوتوون. وا باشترە هەردوو دیـلەكە بهێنیـنە قسـە و لە جـۆری ئامـاژەكە دڵنیـابین، چـونكە ئەگەر مـۆڵگە دراوسێكانی ئەم مۆڵگە سەربازییە بزانن دەستی بەسـەردا گیـراوە و ئەو وەڵامە وەڵامی سەربازەكانی خۆیان نییە، بەڵكوو لە ئێمەوە بووە، ئەوكاتە بارودۆخمان زۆر سەخت دەبێت.

ڕەحمـان لەگەڵ سـەركەوتن و كۆتاییهـاتنی لە كـردنەوەی بنكەی تۆپەكە گوتی:

- پێم باشە هەر هەوڵێك تاقی بكەینەوە، تـا بەوە فریویـان بـدەین كە مـۆڵگەكە نەكەوتـووە و هێشـتا دەسـتی بەسـەردا نەگیــراوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر وەڵامیــان نەدەیــنەوە، ئەوان بۆردومانمان دەكەن.

پاشان ڕوویان لە دیلەکان کرد، تاکوو بیانهێننە قسە، بەڵام ئەوان وەکوو مشکی تۆقیو و تەڕبوو زمانیان گیرابوو و هەڵدەلەرزین. بەمەش هیچیان بە دەستەوە نەما جگە لە پەلەکردن بۆ پاشەکشێ و چۆلکردنی مۆڵگەکە، بەرلەوەی چرکەساتی سفر بێت و وەکوو باران گوللە تۆپیان بەسەردا بارێنن.

پیرە کاکیلیش ئەنجامی چالاکییەکەی باش دەزانی، بۆیە ئەویش دەمودەست و بەبێ خۆگنخاندن و خۆسەرقاڵکردن بە شتی لابەلاوە، پێی باش بوو هەرچی زووە پاشەکشێ بکەن و مۆڵگەکە چۆل بکەن و بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان.

پێشمەرگەکان دەیانزانی و ئەزموونی ئەوەیان پەیدا کردبوو کە دەسەڵات سەرسەختتر و دڕندەتر دەبێت، کاتێك هەست بکات مۆڵگەیەکی دەستی بەسەردا گیراوە و کەوتۆتە دەستی پێشمەرگە. ئەو کاتە بە لایەوە ئاسایی دەبێت ئەگەر هەموو ناوچەکە سووتماك و کاول بکات، بەڵکوو ژمارەی زیاتری کوشتار و برینداری لێ بکەوێتەوە. ئەمەش ئەو پێشمەرگانەی تووشی دڵەڕاوکێ کردبوو کە ئاستی دڕندەیی و توندوتیژیی دوژمنەکەیان دەزانی. بۆیە بە شێوەیەکی ناڕێك دەستیان بە پاشەکشێ کرد، بە جۆرێك کەس ئاگای لەوەیتر نەمێنێت.

ڕەحمان لوولە و ستوونەکانی تۆپەکەی هەڵگرت و بنکەی تۆپەکەیشی دایە پێشمەرگەیەکی تر و بە گورگەلۆقە بۆی دەرچوون.

پێیەکانی ڕەحمان بەو شەوە تاریکە هەڵبەزودابەزیان بوو، قەدپاڵەکە لەبەر کزیی چاوی ون دەبوو و نەدەما و دار و درەخت و تاشەبەردەکانیش بەناویەکتریدا تێك دەقژان و تێکەڵی یەکتر دەبوون، بۆیە بە جووڵەی هاوسەنگی لە شێوەی ترپە و ڕەزم شەپۆلی دەدا. لە شوێنە زۆر لێژەکانیش لەسەر زەوی

دادەنیشت و تۆپەکەی دەخستە نێوان ڕانەکانی و بەسەر هەردوو ئامێرەکەدا دەخشی و کۆڵەپشتەکەیشی بەسەر زەویدا دەخشا و لەگەڵ خۆیدا هەرچی بەرد و خۆڵ و خاشاك هەبوو ڕایدەماڵی. کاتێکیش کەسی لە نزیك خۆیەوە نەبینی بە خۆی گوت: "تاکەی بەم جۆرە بە سەر زەویدا بخشێم؟! یان ماوەی چەند دەتوانم بەم شێوەیە ڕێگەکە ببڕم؟ خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی ئاسایی ڕێ بکەم، ئەو کاتە لەگەڵ تاڵە دەزووەکانی کازیوە ئینجا دەگەمە شوێنی ئارام.

ڕەحمان دوای ئەوەی شەکەتی باڵی بەسەردا کێشا، دەستی بە بیرکردنەوە کرد لەوەی کام ڕێگەیان هەڵبژێرێت، بۆیە لەبەرخۆیەوە دەیگوت: "تەقەمەنییەکان بەجێ بهێڵم یان تۆپەکە؟" بە سەرسامییەوە خۆی وەڵامی خۆی دەدایەوە: "نەخێر... تۆپەکە نا!" پاشان بیری دەکردەوە: "کەواتە تەقەمەنییەکان!" بەڵام خێرا وەڵامی خۆی دەدایەوە: "فیشەك و تەقەمەنییەکانیش فڕێ نادەم، چونکە زۆر پێویستیمان پێیانە." ئێمە ئەوەندە فیشەکمان پێ نەماوە هەتا بەرگرییش لە خۆمان بکەین... کەواتە چی بکەم؟!"

ئیبراهیم گەڕایەوە لای، ئەوەندە دەستکەوتی هەڵگرتبوو، بە هیچ کەسێك هەڵنەگیرێت، زنجیرەی بیرکردنەوەی ڕەحمانی پچڕاند، کە خەریك بوو لە شەکەتی و ماندوێتیدا هەرەس بێنێت.

- بمدەرێ با بیخەمە سەر شانت.

بە دەنگێکی شەکەت و ماندووەوە وەڵامی دایەوە.

- ئاخر زۆر قورسە.

ئیبراهیم حەپەسابوو، چاوێکیشی بە پارچە پەڕۆیەك بەسترابوو:

- بەم جۆرە ناتوانی هاوشانی ئێمە ڕێ بکەیت و بەجێ دەمێنیت.

ئینجا گوێیان لە دەنگی مامۆستا عومەر بوو لەژێر قەدپاڵەکەوە دەنگ بەرز دەکاتەوە:

- ئەرێ کەسێك هەیە یارمەتیم بدات؟ ئادەم لەسەر پشتی هێسترەکە خزی و کەوتەخوارەوە.

پاش کەمێك گەیشتنە لای، ئادەم لە قەدپاڵەکە لەژێر پێی هێسترەکە گرمۆڵە بووبوو، هێسترەکەش ناوەناوە لە شوێنی خۆی سمکۆڵانی دەکرد و مامۆستا عومەریش ڕەشمەکەی گرتبوو و بێئومێدانە هەوڵی جڵەوگیرکردنی دەدا و ترسی لێ نیشتبوو. کەس لەو باوەڕەدا نەبوو ئەو جەستە باریکەی ئادەم ئەوەندە گران بێت. هەوڵیان دا لە زەوییەوە بەرزی بکەنەوە، کارێکی مەحاڵ بوو. ئەوان سێ کەس بوون و بەهێزێکی پڕووکاوەوە لەگەڵ کات چوونە ناو پێشبڕکێیەکەوە.

ئیبراهیم دوای ئەوەی ئارامی لێ بڕا، بە دڵەڕاوکێوە چپاندییە گوێیان:

- ئەرێ ئەوە چیمان بەسەر هاتووە؟! ئەمە دەچێتە عەقڵی کێوە؟! بۆ خاتری ئاسمان کەمێك هێز و توانا بدەنە بەر خۆتان. ئەم جارەیان لەسەر پشتی هێسترەکە خۆیان نووشتاندەوە، هەردوو باڵی ئادەمیان گرت و بەرزیان کردەوە. ڕەحمانیش هەوڵی دا لە سمتییەوە بڵندی بکات، کاتێکیش بێئومێد بوو، چەمایەوە سەر چۆکەکانی و سەری نایە نێوان ڕانە شلوخاوەکانی ئادەم و خەریك بوو بە دەستی پاڵ بە زەوییەکەوە بنێت و خۆی هەستێنێتەوە و لەگەڵ هەستانەوەی خۆی ئادەمیش بەرز بکاتەوە، کەچی هێسترەکە کەوتە ئەملا و ئەولا و بەردی ژێر سمی هێسترەکە دەخزین.

- ده ڕایکێشن... بە خێرایی ڕایکشێن...

ڕەحمانیش هەر وای گوت. ئیبراهیمیش بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- ماندوو بووم! زیاتر توانام نەما. وا هەست دەکەم بڕبڕەکانی پشتم تێك دەشکێن.

ئیبراهیم بە نائومێدییەوە گوتی:

- باش دەستی پێوە بگرە، لەسەر زەوی درێژی دەکەین... کێشی بۆ ئەوەندە گران بووە!

مامۆستا عومەر ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

- هەرگیز سوودی نییە، هەتا ئەگەر لە هەڵگرتنی سەرکەوتووش بین، جارێکی دیکە لەسەر پشتی هێسترەکە دەخزێت و دەکەوێت. چونکە بەبێ کورتان و گوریس مەحاڵە لەسەر پشتی جێگیر بێت و لە بەرانبەر ئەم لێژییە تووشەی شاخەکە بەرگە بگرێت.

ئیبراهیم لە کاتێکدا زۆر شەکەت و ماندوو بووبوو، ئەو دەستکەوتانەی لەسەر زەوییەکەی دانابوون هەڵگرتەوە و گوتی:

- تەنها چەند خولەکێك چاوەڕوانم بن، دەڕۆم یەکێکیان لەگەڵ خۆمدا دەهێنم و دێمەوە.

چەندین چرکەساتی ترسناك و تۆقێنەر تێپەڕین. ئەم جارەیان کات بە خێراییەکی چاوەڕوانەکراو تێدەپەڕی! کەچی ئیبراهیم نە گەڕایەوە و نە هیچ شوێنەوارێکیشی دیار بوو.

شپرزەیی ناخ و ڕوخساری هەردووکیانی داگرتبوو، دوای ئەوەی لە گەڕانەوەی ئیبراهیم نائومێد بوون، ڕەحمان لەگەڵ

خۆیدا بە پرتەوبۆڵە و دوودڵییەوە گوتی: "نەفرەت لە هەمووتان. ئێوە لە کوێن؟! ئاخ... هیچ سوودێك لە بەهەدەردانی کات نییە، ئیبراهیمیش وەك ئەوانی تر تاریکایی قووتی دا". لە ناکاو ئەو هێسترەی لە مۆڵگەکە دەستیان کەوتبوو، ئەویش هەڵات و خۆی دزییەوە. لەو ساتەوەختە شڵۆقەش مەحاڵ بوو بتوانرێت بیدۆزنەوە.

ڕەحمان تووشی سەرەگێژە هاتبوو، پرسی:

- ئێستا چی بکەین؟! ئەرێ تۆ چارەسەرێکت لایە؟! دە قسەیەك بکە، شتێك بڵێ، دڵم تەقی!

عومەر کەمێك بێدەنگ بوو، دواتر کە هاتەگۆ شپرزەیی لە وەڵامەکەیدا بەرجەستە دەبوو:

- نازانم!

ڕەحمان کاتێك گوێبیستی ئەم وەڵامە شپرزە و شێواوە بوو:

- پێم وابێ هاوڕای لەگەڵمدا ئەگەر بڵێم: خۆمان بگەیەنینە ئەوانەی دیکە، چونکە دواکەوتنی زیاتر لە بەرژەوەندیماندا نییە، نەخاسمە شارەزای ڕێگەی گەڕانەوەش نین.

عومەر بە دەنگێکی زۆر کز و شێواوەوە گوتی:

- ئەی چی لە ئادەم بکەین؟!

ڕەحمان بە منگەمنگەوە، وەك ئەوەی لەگەڵ خۆیدا بدوێ:

- ئای چ نەهامەتی و ڕیسواییەکە، قسەوقسەڵۆکی دونیامان دەهێنێتە سەر.

لە دەوری دانیشتن، چاویان لەسەری هەڵنەدەگرت، هەردوو

شانیان گرت، وەك ئەوەی داوای لێبوردن و گەردنئازادی لێ بکەن.

ڕەحمان دووبارە گوتییەوە:

- عومەر پێویستە بە عەقڵ هەڵسوکەوت بکەین. چۆن دەتوانین ئەم هەموو دەستکەوتە بەجێ بهێڵین، لە کاتێکدا ئێمە ئەوپەڕی پێویستیمان پێیانە؟!

مامۆستا عومەر بە شڵەژاوییەوە گوتی:

- بەڵام، ناتوانین دەستکەوتەکان و ئادەمیش هەڵبگرین.

ڕەحمان بە هەناسەهەڵکێشانەوە ڕوونی کردەوە:

- من نەمگوتووە دەستکەوتەکان و ئادەمیش هەڵدەگرین. ئەمە لە توانای ئێمەدا نییە و هیچ پێویستیش بە مشتومڕ ناکات.

- مەبەستت ئەوەیە بەجێی بهێڵین و دەستەکەوتەکان ببەین؟!

ڕەحمان هەرچی پرسیار و ئەگەری لە ناخدا هەبوو هەمووی دەرخست:

- تۆ دەزانی ئێمە خەونمان بەم تۆپەوە دەبینی، ئەوەش لە بیر مەکە کە نرخەکەی ئێستا گیانی ئادەمە... ئادەم، تۆ بەوە ڕازی دەبیت نرخێکی وا گرانبەهای وەکوو ئادەم لەدەست بدەین و بەبێ دەستکەوت بگەڕێینەوە؟! پاشان چۆن دەتوانین هەڵیبگرین، ئێمە سێ کەس بووین نەمانتوانی! یان دەتەوێ بە زەویدا ڕایکێشین؟! تا چەند دەتوانین ڕایبکێشین؟ دڵنیام پێش ئەوەی بیگەیەنینە نزیکترین گوند، پارچەپارچە دەبێت. ئەو کاتە چ بەهایەك بۆ گەیاندنی دەمێنێتەوە. ئەی هەڵوێستمان بەرانبەر خەڵکی گوندەکان چی دەبێت؟!

- بەڵام جووتیارەکان لە نرخ و بەهامان کەم دەکەنەوە و ئەو کاتە هیچ سامێکمان لایان نامێنێت. تۆ دەزانی ئەو جووتیارانە چۆن بیر دەکەنەوە؟ ئەم کارەمان بە ڕیسوایی دادەنێن.

ڕەحمان قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- ئاخر ئەو کاتەش دەڵێن یەکێکیان لەدەست دا و ئەوانی دیکەش برینـدار بوون و دەستکەوتەکانیشیان بەجێ هێشت، بەڵکوو من دڵنیام ئەوان دەڵێن: چەکەکانیان فڕێ دا و هەڵاتن. عومەر لێم تێبگە، ئەو جووتیارانە دواکەوتوون. بە چاوی سووکەوە تەماشای هەر شەڕێك دەکەن، ئەگەر بە دەستکەوتی باشەوە نەچیتە ناو چاویانەوە، هیچ شتێکیش چاویان تێر ناکات، تەنها تۆپەکە نەبێت.

عومەر لە مێشکی خۆیدا بابەتەکەی حینجە دەکردەوە و نەیدەزانی چ بڕیارێك بدات، بە پێوە ڕەق ڕاوەستابوو، نەیدەزانی کام هەڵوێست و کام هەنگاویان دروستترە، جێهێشتنی تەرمی پیرۆزی هاوڕێکەیان، یان لە دەستدانی ئەو هەموو دەستکەوتە؟! پاش چرکەساتێك هەردووکیان بە خێرایی کەوتنە خۆیان و بۆ گەیشتن بەوانەی دیکە کەوتنە ڕێگا، بیرۆکەکانیش وەکوو ڕەشەبا هەراسان و شپرزەی کردبوون.

ڕەحمان ئیستێکی کرد و ڕاوەستا، دەریای سۆز و خۆشەویستی کەوتە بەر ڕەشەبای بیرۆکەکانی:

"ڕەحمان، خۆ ئادەم هاوڕێی تۆ بوو، تۆ چ بوونەوەرێکی؟! تۆ چ دڵڕەقییەکت لە ناخدا هەڵگرتووە؟! هەی داوەشێی!"

بە شڵەژاوییەوە وەڵامی خۆی دایەوە: "دڵڕەق نیم، بەڵام لە حاڵەتی وادا لۆژیك و واقیع بڕیاری خۆیان دەدەن، ئەی باشە چی بکەین؟".

دیسانەوە دەڵێت: "هەمیشە بۆ ئەوەی خۆت ئاسوودە و بێ خەتا بکەیت بیانوو دەدۆزیتەوە".

کەمێك بیر دەکاتەوە و لەگەڵ خۆیدا بە چپەوە دەڵێت: "هەرگیز، نە پاساوم هێناوەتەوە و نە بیانووش. نکۆڵی لەوە ناکەم، هەندێك جار دڵڕەقی باڵ بە سەر سۆز و هەستمدا دەکێشێت، بەڵام تەنها وەکوو توێکڵێك دامدەپۆشێت، ئەگەرنا ئەو سۆز و خۆشەویستییەی لە ناخی مندا هەیە، باوەڕ ناکەم لە هیچ مرۆڤێکدا هەبێت".

پاشان ئاوڕێکی لە دواوە دایەوە. ئادەم لەسەر زەوییە شێدارەکە ڕاکشابوو، تاشەبەردە ساردەکان دوا شەپۆلی گەرمی جەستەیان هەڵدەمژی. تاریکییش تا دەهات چین لە دوای چینی دەخستە سەر بارستاییەکەی و هەرچەندە دوورتریش دەکەوتنەوە تاریکاییەکە تاریکتر و ئەنگوستەچاوتر دەبوو، هەموو شتێکی ئەوێ و دەوروبەریشی ڕەش و ڕەشتر دەبوون.

ڕەحمان بە ئاخ و حەسرەتەوە: "خەریکە باوەڕ بە خۆم نەکەم، ئەوە چاوم چی لێ هاتووە؟! دەترسم ئەمەشیان تووش بووبێت! چاوم ڕێشکەوپێشکە دەکات، تەنها بە نیو چاو دەبینم، ئاخ چەند بەدبەخت و سەرگەردانم! خۆزگە کەسێك دەبوو دەستی دەگرتم و لەگەڵ خۆیدا دەیبردم، چەندە هیوای ئەوە دەخوازم!"

بەڵام بە وەڕسبوونەوە دەڵێت: "ئاخ... بەرگەی ئەمە ناگرم! باوەڕ ناکەم بتوانم پێی ڕازی بم!"

دیسانەوە دەڵێت: "بەڵام کوا یارمەتی لە کوێیە؟! کێ دەستم دەگرێت و دەبێتە دارشەقەی بن باڵم؟ وای کە شەکەت و داهێزراوم، بە تەنها توانای بەردەوامبوونم ئەستەمە، ئاخر ئەگەر

ئەوان بهاتبـــایەن، وا شـــەرمەزار و ڕووزەردی لای ئـــادەمیش نەدەبووین!" ئاخ ئادەمی هـاوڕێ، خەونەکانـت لە ژیـان گەلێـك بوون، وەلێ هیچیان نەهاتنە دی و بەو گەنجییەوە سەرت نـایەوە و وا نزیکترین هاوڕێت خیانەتت لەگەڵدا دەکـات و بە ناچـاری بەجێت دەهێڵێت؟!

لەگەڵ خۆی لە ململانێیەکی سەختدا بوو، زۆرانبازی لەگەڵ بیرۆکەکانیدا دەکرد. بە سـەرگەردانی بە قوولاییـدا ڕۆ دەچـووە خـوارێ، پاشـان سـەر شـەپۆلەکان دەکەوتەوە، بە دوودڵییەکـی دژوارەوە دەیگوت: "ئەوە چیم بەسەرهاتووە بۆ خاتری شەیتان؟! ئەوە خۆ خەریکە نەتوانم هەتا لەنـاو ئەو بیرۆکـانەی لە کەڵـلەی سەریشمەوە دەردەچن مەلە بکەم! تووشی چـی بـووم؟! جارێـك خەون بە یارمەتیدانەوە دەبیـنم و جـارێکی دیـکەش خەونەکەی خـۆم ڕەت دەکەمەوە. جـاری سـێیەمیش خـۆم و خەونەکانیشـم فڕێ دەدەمە دۆزەخەوە، بۆ یەکێکی دیکەشیان ئاخ هەڵدەکێشـم و دەریـدەهێنمەوە. وای چەنـد هەسـت بە داهێـزران و ونبـوون دەکەم! وای بـۆ بەدبەختـیم، وای لەوە خـۆ پیـر بـووم، هەر بە ڕاستی پیر و کەنەفت بـووم، هەسـت بە لاوازی دەکەم، هەسـت بە بێهێزی و بێدەسەلاتی دەکەم... ئاخ...! ئەو هێـز و توانـایەم بـۆ کوێ چوون؟! خەریکە توانای هیچم نەمێنێت، ئەم تۆپە تا دێت کێشـەکەی قورسـتر دەبێـت و لە بەرانـبەر ئەو هێـزەی خەریـکە هەنگـاو دوای هەنگـاو زیـاتر دادەڕووخێـت، ئەویـش گـران و گرانتـر دەبێـت، هێنـدەی نەمـاوە بە یەکجـار ورە و وزەم تێـدا نەمێنێت!"

دەنگی مامۆستا عومەر کە لە پێشییەوە بوو، پێی ڕاگەیاند:

- خێـراکە، بـا زیـاتر بەجـێ نەمێنـین و پێیـان بگەیـن، بەرلەوەی لەناو ئەو دار و دەوەنە لێمان ون بن.

ڕۆیشتنەکەیان زیاتر لە ڕاکردن دەچوو، ڕەحمان ماندوو دەبێت و خاوەخاو دەکات، مەودای نێوانیان زیاتر و زیاتر دەبێت، بۆیە مامۆستا عومەر بە ناچاری لە هەر پێچە و سووڕانەوە و بزنەڕێیەك ئیستێك دەکات و ڕادەوەستێت، هەر کە ڕەحمان گەیشتە نزیکی سەرلەنوێ دەردەپەڕێت و دوور دەکەوێتەوە. خۆ ئەگەر ڕەحمان زیاتر دوا بکەوێت، عومەر ماوەیەکی زیاتر ڕادەوەستێت و چاوەڕێی دەکات، گرنگ ئەوەیە لە یەکتری ون نەبن، پاشان چرپەیەکی بۆ دەکات و ئەویش بە دوای چرپەکەدا شوێنی دەکەوێت، بەم شێوەیە بەردەوام بوون. عومەر دەڕوا و ڕادەوەستێت، ڕەحمانیش خاوەخاویەتی و کۆشش دەکات بیگاتێ و ون نەبێت، ئەو ئێسکە پەیکەرە هەر لە تەمەنی بیست و پێنج سالییەوە پیرێتی کەنەفتی کردووە و دایهاڕیوە.

بێ هیچ چاوەڕوانی و پێشبینییەك لە مۆلگە و ڕەبایە سەربازییەکانی سەر لوتکەکانەوە دەستڕێژی گوللە دابارییە سەریان، بە هاوار هاوارەوە کەوتنە ئاگادارکردنەوەی یەکتری، پاشان خۆرێکی زۆر بچووك کە تیشکێکی زێڕینی بریسکەداری هەبوو، بە ئاسمانی ئەنگوستەچاوی ناوچەکەدا کەوتە باڵلێکدان، ئەو شەوە تاریکستانەی کردە ڕۆژی نیوەڕۆ. ڕەحمان لە ناکاو بە خۆشییەوە دەستی بە پێکەنین کرد و سەریشی لە پەنای بنکەی تۆپەکەی باوەشی شاردبووەوە کە بۆی بووبووە مەتەرێزێکی بچووك لە پێشەوەی، شتێك وای لێ کرد وەك منداڵ شاد و خۆشحاڵ بێت و بە شێوەیەکی هیستیریایانە دەست بە پێکەنین و هاواریش بکات:

- جوانە جوانە... وای لەو جوانییە سەرنجڕاکێشە، ئەوە چ

داهێنـانێکە ئەو تیشـکە جـوانە ئاسـمانی تـاریکی ئەم شـاخانەی ڕووناك کردۆتەوە.

هەندێکیان گوتیان ڕۆمانسییە، هەندێکی دیکەشیان گوتیـان خوێناوی و سادیزمانەیە. بەڵام ئەوانی تر بەو پیاوەیان چوانـد کە لە دارسـتانێکدا دەژیێـت نـاوی دێرسـۆ ئـۆزۆلایە. سـەرباری خەسـڵەتی دیـکە کە بە کـۆمەڵایەتی دەسـت پـێ دەکـات و بە گۆشەگیری کۆتایی دێت! یان بە واقیعییانە دەست پێ دەکات و بە خەیاڵییانە کۆتایی دێت! تێکڕای ئەو خەسڵەتانەش تا ئەوپەڕی لایەنی هاودژی یەکتری بوون، هەتا مرۆڤ نەیدەزانی چۆن ئەو هەموو هەستە دژبەرە تا ئاستی توندڕەوی، هەمووی بە یەکجار و لە تاکە مرۆڤێکدا کۆ بنەوە!

دوای ئەوەی تـۆپەڵە ڕووناکییەکـانی ئاسـمان کـوژانەوە، ڕێـژنەی دەسـتڕێژی گـولله بـۆ سـەر هێڵـی پاشەکشێیان نەمـا، بێدەنگییش باڵی بەسەریاندا کێشایەوە، تەنها هەناسە و چرپەکانی عـومەر نەبێـت. ڕەحمـان لەبەر خـۆیەوە کەوتە منگەمنـگ: "بە نەفـرەت بـن، لە کـوێ ون بـوون؟! خـۆ هەر دەبـوو تۆزێـك چاوەڕێ بکەن."

عومەر گەڕایەوە لای و لە هەڵگرتنی تۆپەکە یارمەتی دا، بە هەردووکیان نایانەوە سەرشانیان، ئیـدی وەکـوو سەرخۆشـەکان ڕێیـان دەکـرد، لە بەرد و چـاڵی بـزنەڕێیەکە سـاتمەیان دەدا و لەسەر گژوگیایەکە هەڵدەخلیسکان. لە کاتی کەوتنیشـدا دەنگـی چەکەکانیـان کە بەر یەکتـری و بەرد و شـاخی لاڕێـیەکە دەکەوت دەزرینگایەوە، لێژایی شاخەکە لەوەدا نەبـوو، ڕێکـردن ئەستەم بوو، ئەمە وای لێ کردبوون ماسولکەکانی قاچیـان گـرژ ببنەوە و بکەونە لەرزە، وەکوو لاقی مشکێکی تۆقیو.

عـــومەر هەنـــدێك وشـــەی لەرزۆكـــی لە زار هـــاتنەدەر، هەناسەبڕكێكە كردنی بە پیت:

- ڕ ە ح مان چی د ە ڵێی...؟!

پاشان ئیستێكی كرد و ڕاوەستا، لەناو هەناسەبڕكێیەكانیدا هەناسەیەكی قووڵی كێشا و دەستی بە وشەی پچڕپچڕ كردەوە:

- پێم باشە... بنكەكە... لە تۆپەكە... بكەینەوە... ئینجا هەڵیانبگرین... هەر یەكە و... هەر یەكە و... بە تەنها.

- با ئەوە تاقی بكەینەوە... لەوانەیە... باشتر بێت بۆمان.

وەڵامەكەی ڕەحمـــانیش لە پرســـیارەكانی عـــومەر باشـــتر نەبوون، ئاخر وەڵامەكانی ڕەحمانیش ئەوەندە بێهێز و لەرزۆكانە بوون، هەر كەسێك گوێی لە قسەكانیان بووایە، وای دەزانی ئەم دووانە فسەزمانن.

بارەكەیان دانایە سەر زەوی، بنكەی تۆپەكە و لوولە و پارچەكانی دیكەیان لە یەكتری ترازاند، كە دەستیان بە ڕۆیشتن كردەوە، عومەر بە ڕەزامەندییەوە گوتی:

- وا هەست دەكەم ئێستا بە ئازادانە دەجووڵێمەوە و ڕێ دەكەم.

وەلێ حاڵی ڕەحمان لە پێشتر باشتر نەبوو. هەنگاوەكانی تا دەهات شلوخاوتر دەبوونەوە، تا وای لێ هات نەفرەت لەو هێزە داڕووخاو و لاوازییەی خۆی بكات، جارێكی دیكەش هەستی بەوە كردەوە كە بارەكەی سەر شانی تا دێت لە بەرانبەر هێزە داڕووخاوەكەی بە بەردەوامی زیاتر و زۆرتر و گرانتر دەبێت.

ڕاوەستا و ڕوخسارە ڕەقهەڵاتووەكەی بە تەواوی گۆڕانی بەسەردا هات، وەك ئەوەی ژیان لە ڕوخساریدا نەمابێت و تەنها

کۆمەڵێك ئێسکوپرووسك بن، بینینیشی شەکەتی و ماندویێتی باڵی بەسەردا کێشابوو، تۆز و خۆڵێکی خۆڵەمێشی بۆ ماوەی چەند چرکەیەك بەری بینینی لێ گرت، ماوەیەکە ورەوڕێکی درێژخایەنی نەفرەتی لەناو سەریدا هەراسانی کردووە، ئەوەش لە ئەنجامی دەنگی تەقینەوەی چەکە نەفرەتییەکەی خۆی بوو، ئاخر ئەو چەکە ئەگەر شارەزایانە بەکاری نەهێنیت، زیانی زۆر بەو کەسە دەگەیەنێت کە بەکاری دەهێنێت، ئەو شەوە خەریکە بەرگەی ئەو هاشوهووشەی ناو مێشکیشی نەگرێت کە تا دێت لە دەنگی تەقوهوڕی کۆنە مەنجەڵێك بەرزتر و زیاتر دەبێت، بۆیە لە کاتی ڕۆیشتنیدا بەرەو پێشەوە و دواوە دەهات و دەچوو.

بە منگەمنگ و دەنگێکی پچڕپچڕ و لە بارێکی نیوە ئاگاییدا بوو:

- تۆ لە کوێی؟ ڕاوەستە... سەرم خەریکە دەتەقێت.

پاشان کەوت و خلۆر بووەوە، هێندەی نەمابوو دۆڵەکە هەڵیلووشێت و قووتی بدات و تووناوتوون بچێت، ئەگەر بە خۆی و تۆپەکەوە بەر درەختێکی گەورەی قەدپاڵەکە نەکەوتبوونایە و لەژێریدا گرمۆڵە نەبووایە، ئەوا هەتا دونیا دونیایە کەس شوێنەواریشی نەدەدۆزییەوە، دوای کەمێك شلوخاوی، هێزی خۆی کۆ کردەوە و بە قەدپاڵەکەدا هەڵگژا. بەڵام دیسانەوە خلۆر بووەوە، ئاخر ئەوە لێژایی نەبوو، ڕێك لە لادیوارێکی دابڕاو دەچوو کە بە تاشەبەرد مشتوماڵ کرابێت، جارێکی دیکەش هەوڵی دایەوە، دەستی کەوتە بەر تاشەبەردێکی تیژ، ڕێك وەکوو چەقۆ، ئیدی بەو تاشەبەردە کەوتە هەڵکەندنی شوێن پێی و پێی لێ گیر دەکرد، بەو جۆرە دەستی پێ کرد و بەردەوام بوو، چاڵ لە دوای چاڵ بە درێژایی بەژنی خۆی، تا گەیشتەوە قەدپاڵەکە.

حەپەساو و داماو و بێزار، نەخاسمە گومان وای لێ کردبوو، کە ئیدی کەسێك بۆ هەواڵپرسینی نایەت و هەرگیز سەرکێشیی وا ناکات، ئەو هەموو ماوەیە ناگەڕێتەوە و ژیانی خۆی ناخاتە مەترسییەوە، تاکوو یارمەتیی ئەم بدات، وەلێ ئەو لەو خەیاڵانەدا بوو گوێی لە دەنگی دکتۆرەکە بوو دەیگوت:

- دەی ڕەحمان خێراکە. ئەم هەموو دواکەوتنە بۆ؟! چیت بەسەر هاتووە؟!

ڕەحمان بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- ماندوو بووم. وەك ئەوەی داوەشابم.

دکتۆرەکە:

- ئەوە ئەنجامی برسێتییە، دەزانی لە ئێوارەوە چ وزەیەکمان سووتاندووە و چ توانایەکمان بەخشیوە... ئەی چاوت چی لێ هاتەوە؟

ڕەحمان بە چاو هەڵگلۆفینەوە گوتی:

- تەنها تۆز و خۆڵە.

دکتۆرەکە:

- با بگەینە نزیکترین گوند بۆتی خاوێن دەکەمەوە. ئێستا تۆپەکەم بدێ بۆتی هەڵبگرم، خۆتیش چەکەکەی ئادەم و بی سێڤنەکە هەڵگرە، دەبێ بگەینە هاوڕێیان بەرلەوەی زۆر دوور بکەونەوە.

ڕەحمان بەو یارمەتییەی دکتۆر، تەواو هەستی بە بارسووکییەکی ئەوتۆ کرد نەبێتەوە، تەنانەت خەریك بوو هەست بە قورسایی کۆڵەپشتە پڕ لە تەقەمەنییەکەیشی نەکات.

دکتۆرەکە لە پێشییەوە دەستی بە ڕۆیشتن کرد و گوتی:

- خۆشبەختانە عومەر گەیشت پێمان و لە هەواڵی تۆ ئاگاداری کردینەوە، ئەگەرنا لە دەستمان دەدای.

دوای ماوەیەك ڕۆیشتنی بە خێرایی کە لە ڕاکردن دەچوو. تارمایی ئەوانەی پێش خۆیان لە پێچەکە بەدی کرد، بەڵام هێندەی نەخایاند لەناو دار و دەوەنەکاندا ون بوون، کە نزیکتر کەوتنەوە، کۆمەڵێك تارمایی دیکەیان بەدی کرد، وا لەسەر زەوی ڕاکشاون، وەك ئەوەی تەرمی بێگیان بن!

فەرماندەی دەستەکە خۆی کۆ کردەوە تاکوو هەستێت:

- دەی گەنجینە، هەستن با پێیان بگەین، پێم وایە پشوویەکی باشمان داوە.

سعوود بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

- لەسەرخۆ بن، من هێشتا ماندووم، ئێستا ناتوانم ڕێ بکەم.

فەرماندەی دەستەکە بە سووربوونەوە گوتی:

- هیچ کاتمان بە دەستەوە نییە. هەستە، ئەگەرنا جەستەت زیاتر شلوخاو دەبێت.

ڕەحمان کە تازە ڕاکشابوو گوتی:

- باسی من مەکەن، هەر تەواو شەکەتم، ئێستا ناتوانم تەنها هەنگاوێکیش بهاوێژم، ئەگەر ئێوە دەتانەوێ پاشەکشێ بکەن، بڕۆن و لێمان گەڕێن با ماوەیەك لێرە پشوویەك بدەین.

فەرماندەی دەستەکە گوتی:

- ئاخر دوایی ڕێگاکە ون دەکەن.

ڕەحمان بە منگەمنگەوە چاوە فرمێسکاوییەکانی هەڵدەگلۆفی و گوتی:

- یەکێکتان لەگەڵماندا بمێننەوە، وا دیارە قاسم نایەوێت جارێ بێت، کاتێك بڕیاری پاشەکشێی دا ئێمەش لەگەڵی دێین.

قاسم لەسەر گازەرای پشت ڕاکشابوو، چەکەکەی لە نێو گەڵی نابوو، نە بەمەلا و بەولادا ئاوڕی دەدایەوە و نە لەگەڵ کەسیش قسەی دەکرد. پێشمەرگەکانیش ئەویان پشتگوێ خستبوو. خەریك بوون دەستکەوتەکانیان کۆ بکەنەوە و شوێنەکە بەجێ بهێڵن.

لە ناکاو، لە دووریی چەند مەترێك. گوێیان لە کەوتنێکی تۆقێنەرانە بوو بەرەو دۆڵەکە خلۆر دەبێتەوە، بەو هۆیەشەوە لقە وشکەکان دەشکان و بەردیشی لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵی و خلۆر دەکردەوە.

پێشمەرگەکان بە حەپەساوییەوە هاواریان کرد.

- ئەوە چییە؟! ئەوە کێیە کەوتە خەرەندەکەوە؟!

مامۆستا عومەر گوتی:

- دڵتان هیچ نەکات، کەسمان هەڵنەدێراوین. ئەوە هێسترەکە بوو، چالاکییەکی خۆکوژی ئەنجام دا!

سعوود بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

- چۆن ئەوە ڕووی دا؟! خۆی خۆی فڕێ دایە خوارەوە یان چی؟! هێستر چۆن کردەوەی خۆکوژی دەکات؟!

دکتۆرەکە بۆ خۆشی گوتی:

- خستمە سەرشانم و فڕێم دایە خوارەوە.

سعوود بە منگەمنگەوە:

- ئای چ شەیتانێکە! ئەو سەرشێتە بۆچی خۆی کوشت؟! چی وای لێ کرد ئەوها خۆی هەڵدێرێت؟!

فەرماندەی دەستەکە بە بێزارییەوە گوتی:

- بە داخەوە، تەقەمەنییەکـــان لەگەڵ هێســـترەکەدا لە دەستمان چوون.

مامۆستا عومەر بە حەپەساوییەوە گوتی:

- گوێ بگرن! بەرزایی ئەم خەرەندە چەندە؟! تـا ئێسـتاش خلۆربوونەوەکەی بەردەوامە! ئەم ئاژەڵە چەند گەمژەیە. نەفرەتـی لە ژیانی خۆی کرد و خۆی هەڵدێرا.

ڕەحمان بە دەستی ئاماژەی دا و گوتی:

- کورە تۆ بڵێ چ زیرەکییەکە! کێ بۆ مانەوە لەم ژیانە بە داخ و حەسرەتە؟!

عومەر بە هەناسەبڕکێوە:

- وای چەندە ژیانێکی سەختە؟!

سعوود منگەمنگێکی کرد و بە ئازارەوە گوتی:

- کێ؟

عومەر وەڵامی دایەوە:

- ژیان!

دکتۆرەکە بە قاقاوە گوتی:

- دەی فەلســـەفە لێـــدە فەلســـەفە... وا باشـــترە ئەم دەستەواژەیەشـی بخەیـتە سـەر تـاکوو کرۆکـی ئاخـاوتنەکەت

قووڵتر بێت. دە بڵێ: وای لە خەراپی و کوێرەوەریی ئەم ژیانە، هەموو شتێك تیایدا بە خێرایی دەڕوات و تێدەپەڕێت، بڵێ: پێش کەمێك ئەو هێسترە ڕووخۆشە دەیپرماند و بیری لە ژیان دەکردەوە...

فەرماندەی دەستەکە ئاگاداری کردنەوە کە شوێنەکە مەترسیدارە، وەختی گاڵتە و شۆخی نییە، بۆیە بە تووڕییەوە هاواری کرد:

- دوای چی؟! هەڵدێرا و کۆتایی هات. ئایا دەتانەوێ جەستەمان بکەنە سەرەند و بێژینگ؟!

پاشان ئاوڕێکی توندی بە لایەکدا دایەوە و ئەوەیشی بۆ زیاد کرد:

- ئەوە ئێوە بۆچی ڕاوەستاون؟! کەستان دەتانەوێ بچنە خوارەوە بۆ لای؟! دەی بجووڵێن، بە فیڕۆدانی کات لە بەرژەوەندیماندا نییە.

سعوود و ڕەحمان لە شوێنی خۆیان ڕاکشابوون. تەنها دوای چەند خولەکێك و هیچی تر، قاسم بە پێدزکێ کەوتە جووڵە و بە هێواشی خەریك بوو دەڕۆیشت، خۆ ئەگەر شکانی گەڵای وشکی درەختەکان و پووشوپەڵاشی ژێر پێی نەبووایە، هیچ کامێکیان هەستیان بە جووڵەی، یان ڕۆیشتن و ونبوونی نەدەکرد.

ڕەحمان لە نێوان ددانەکانییەوە گوتی:

- هەی دڵڕەشی دواکەوتوو.

ئینجا بە منگەمنگەوە پرسی:

- ئەوە شتێك دەکەیت، یان بە تەمای بڕۆیت؟

بە شێوەزارێکی وشك و برینگەوە وەڵامی دایەوە:

- دەی با ئێستا بڕۆین.

ناچـــار بـــوون، هەر دەبـــوایە بە دوای هەنگاوەکـــانی ئەو بکەون، ئاخر لەناو شەپۆلەکانی ئەم دەریا شاخاوییە زەبەلاحـانەدا قاسم بۆتە قیبلەنومایان.

وا پـێ دەچـوو سـعوود لە ڕۆیشـتنەکە هەسـت بە ئازارێـك بکات، بۆیە ڕەحمان لێی پرسی:

- ئەوە چیـتە بـۆ وا بەلادا دێـت؟ وا پـێ دەچـێ تـۆش زامدار بیت؟

سعوود بە منگەمنگێکەوە ملی خۆی گرت:

- لێـرە لە لاملـمە... هەســت بە ئـازارێکی ئەوتـۆ دەکەم خەریکە بەرگەی نەگرم.

ڕەحمان هانی دا و گوتی:

- هیچ چارەیەکمان نییە، جگە لەوەی بەرگە بگرین.

سعوود سەرنجێکی گومڕاییانەی دا و گوتی:

- ئەوە چاوت چییەتی؟!

ڕەحمان گوتی:

- نازانم، هەست دەکەم توانای کردنەوەیم نەبێت. لەوانەیە خۆڵ و تۆزی تێ چووبێت. بەڵام ئەی تۆ چۆن زامدار بوویت؟

سعوود ویستی ئەو دۆخەی بۆ باس بکات کە تیایدا بریندار بوو، بەڵام هەر ئەوەندەی گوت:

- به دوا مووشەك كە هێرشمان كردە سەر ڕەبایەكە.

ڕەحمان گوتی:

- وای چ مووشـەكێكی نەگـبەت بـوو، خەریـك بـوو هەموومان لەناو ببات!

پاشان گەیشتنە شوێنێك لە قەدپاڵەكە ڕێگەكە دەبـووە دوو لـقەوە. لەو كـاتەدا قاسـم لە تـاریكییەكەدا ون بووبـوو، بە حەپەساوییەوە ڕاوەستان. تیلەی سەرنجەكانیان گرتە هەردوو لای قەدپاڵەكە و بە دوای شتێكدا دەگەڕان.

- ئێستا كامیان بگرین؟

سـعوود بە منگەمنگـێكەوە گـوتی، ڕەحمـانیش بە حەپەساوییەوە وەڵامی دایەوە:

- نازانم.

دوای ئەم وەڵامە هیچیان لە بەردەمدا نەمایەوە، جگە لەوەی بانگی قاسمی ڕێنیشـاندەریان بـكەن، بەڵكـوو وەڵامیـان بـداتەوە. دوای كەمێك بینییان لەسەر زەوییەكە ڕاكشاوە و دەستی ڕاستەی ناوەتە ژێر سەرە بچووكەكەی كە لە شێوەی گـوێزێكی هینـدی دەچـوو. بە دەسـتی دووەمیشـی یـاری بە سـمێڵە بـادراوەكەی دەكات.

سعوود گوتی:

- قاسـم، تـۆ خەڵكـی ئەم نـاوچەیەی، ڕێـگەكە بـاش شـارەزای، زۆر لێمـان دوور مەكەوە، ئـێمە ڕێـگەی گەڕانەوە شارەزا نین.

بەرلەوەی قسەكەی تەواو بكات، قاسـم هەسـتایە سـەرپێ و

بێ ئەوەی یەك وشەش بڵێ، لێیان دوور کەوتەوە.

ڕەحمان بە بێزاری و قێزلێبوونەوەی گوتی:

- با پەلە بکەین، وا دیارە هیچ بایەخێکمان پێ نادات.

سعوود بە هەناسەدانەوە گوتی:

- خۆ لە بنەڕەتدا ئەو لە پێناوی ئێمەدا نەماوەتەوە.

بە هەموو توانایانەوە دوای کەوتن، نەبادا ونی بکەن، کەچی سەرلەنوێ لێیان ون بووەوە. کاتێکیش سەرلەنوێ دۆزییانەوە، ڕەحمان بە چپەوە بۆ ئەوەی هەست و ژێی هەستی پیاوەتیی جووتیارانەی ببزوێنێت، گوتی:

- تکایە قاسم زۆر لێمان دوور مەکەوە، ئێمە بریندارین و بەو خێراییەی تۆ ناتوانین بە ڕێگەدا بڕۆین، تۆ دەزانی ئەم ناوچەیە چەندە مەترسیدارە، لەوانەیە لە ئەنجامی ئەو هەموو بانگکردنەت بمانخاتە بۆسەیەکەوە.

قاسم بە ساردی و بایەخنەدانەوە گوتی:

- چیتان لێ بکەم؟! بۆچی پەلە ناکەن؟!

ڕەحمان دەمودەست کەفوکوڵی تووڕەیی سەری کرد و خۆی بۆ شەڕکردن ئامادە کردبوو:

- نابینی بارمان گرانە! جگە لەوە تۆ چی هەڵدەگریت؟! ئەوەی تۆ هەڵتگرتوون، تەنها چەك و تاخمەکەی خۆتە.

قاسمیش بە ساردوسڕی و بە منگەمنگەوە:

- من ناتوانم هیچ هەڵبگرم.

ڕەحمان بە تووڕەییەوە گوتی:

- به جەهەننەم، خۆ دەڵێ من ناتوانم! گوێ بگرە، واز لەم هیچوپووچییە بهێنە، چەکەکەت بدە سعوود هەڵیگرێت و عەفارۆفەکەی لێ وەربگرە.

بە زمانی دایکی گوتی:

- سوێندتان بۆ دەخۆم من شەکەت و ماندووم و ناتوانم.

ڕەحمان بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

- کەواتە ون بە لەبەرچاومان، ئەگەر لە بەردەممدا بتبینم ئەو گوێژە هیندییەت بە یەك گوللە دەتەقێنمەوە.

ئەمەی گوت و ئاماژەی بۆ کەللە سەری بچووکی قاسم دەکرد. بە سەرنجێکی شەڕانگێزانەوە تەماشای کرد و لە شوێنی خۆیدا وشك بوو، بێ ئەوەی یەك وشە بڵێت، سعوودیش کەوتە ڕاکێشانی ڕەحمان، کە لەوپەڕی تووڕەییدا بوو.

- وازی لێ بێنە. خۆ ئەو عەقلییەتە پۆخڵەی تازە نییە؟ ئەوە شایانی ئەوە نییە مێشکی خۆتی پێوە سەرقاڵ بکەیت!

- ئاخر ئەو ئاژەڵە هەر بە جارێك دەهەری کردم، خۆ ئەگەر جارێکی تر لە بەردەمی خۆمدا بیبینمەوە لەتوپەتی دەکەم.

بە هەمان شێوازی پێشوو دەستیان بە ڕۆیشتن کردەوە. هەندێك جار پێکەوە دەبوون و هەندێك جاری دیکەش لە یەکتر جیا دەبوونەوە و دادەبڕان. ئەوەتانێ ئێستا ئەوان لە ناوەڕاستی شوێنێکی کراوە و لە بەردەم ڕەبایە و مۆڵگەکانی دوژمندا کۆ بوونەتەوە. شوێنێك نە دار و درەخت و نە تاشەبەردێکیش، هەر جووڵەیەکیان بە ئاسانی ئاشکرا دەبێت. ئەو لێژبوونەوە خێرایە تەواوی هێزی جەستەی بردبوون، هەتا سعوود گەیشتبووە حاڵەتێك مرۆڤ بەزەیی پێدا دەهاتەوە.

به دەنگێکی نووساو و پەلەقاژەوە خۆی بە زەویدا دا:

- یەك هەنگاوی دیکە بەم بارە گرانەوە توانای ڕێکردنم نەماوە.

ڕەحمان بە چپە و هەناسەبڕکێوە:

- سعوود نرخی دانیشتن و مانەوەمان لێرە زۆر لەسەر دەکەوێت، ها... ناوچەکە بە تەواوی لەژێر چاودێریی ڕەبایە و مۆلگەکانی دوژمندان، بەرگە بگرە هەتا لەم ناوچەیە دوور دەکەوینەوە.

سعوود بەوپەڕی نائومێدییەوە:

- ناتوانم... بڕۆ بەجێم بێڵە... وای چ ئازارێکی تواناپڕووکێنە... ڕەحمان خەریکە دەبورێمەوە... کۆتاییمە و لەناو دەچم، هیچ چارەیەك نییە... دەبورێمەوە.

"ئاخ، چی بکەم؟! هێزی لەبەر براوە"، ڕەحمان لەبەرخۆیەوە وای گوت.

ناچار بوو جارێکی دیکە داوای یارمەتی لە قاسم بکاتەوە، کە لە نزیکییەوە دانیشتبوو، بە دەنگ و ئاوازێکی ئاشتییانەوە گوتی:

- برام دە وەرە یارمەتیی سعوود بدەین و لەم شوێنە دووری بخەینەوە، بەرلەوەی ببورێتەوە و ئاگای لە خۆی نەمێنێت، دەی دەوەرە یارمەتیم دە.

قاسم هەمان قسەکانی پێشووتری دووبارە کردەوە:

- بە خوا زۆر ماندووم و ناتوانم.

گومان لەوەدا نییە وەڵامێکی لەم جۆرە و هەتا لە

هەلـومەرجێکی ئاساییشـدا، گرکانێـك لە دەروونـی مرۆڤـدا دەتەقێنێتەوە، ڕاستە جووتیار دواکەوتووە، بەڵام ئازایەتییەکەی و پیاوەتی و چاوتێرییەکەی و باشییەکەی بەسەر دواکەوتنەکەیدا زاڵە و دەبێتە چوارچێوەیەکی جوان و وێنە قێزەونەکەیشی دەشارێتەوە. وەلـێ ئەگەر ئەو چوارچێوەیە لا ببەین و لێی دابماڵین، ئەرێ دەبێ چی لێ بمێنێتەوە؟! بەڵکوو با دوورتریش لەمە بڕۆین؛ حاڵەتەکە هەر پەسەند ناکرێت ئەگەر تەنها هەمان وێنەی قێزەون بمێنێتەوە. تەنها مەگەر ترس جێگەی ئازایەتی و قرچۆکی جێگەی چاوتێرییەکەی و ڕق و کینەکەی جێگەی خۆشەویستی بگرێتەوە "تۆ سەیری ئەم وەسفە بکە" وێنەیەکە لە قێزەونیدا نە تێر دەبێت و نە پڕیش، بەڵکوو چوارچێوەیەکی قێزەونتری وەرگرتووە، کەواتە ئێستا دەبێتە چی؟! ئێ خۆ لەوە قێزەونتر نابێت... ڕاستە ئەو دواکەوتوویە تەنها خودی کەسەکە لە ئەستۆی ناگرێت، بەڵکوو بەرهەمی حاڵەتێکی دیاریکراوە، وەلێ خۆپەرستی و ترسنۆکی هەرگیز نابێت بەرهەمی حاڵەتێکی دیاریکراو بێت.

دوای ئەوەی ڕەحمـان لە بەدەسـتهێنانی یـارمەتی، لەو جووتیارەی ڕوخسار و چوارچێوەیەکی جوانی نییە، بۆ ئەوەی دەمارگیری بکات گوتی:

- بڕۆ هەی ترسنۆك خۆت ڕزگار کە. باش بزانە تۆ جووتیارێکی دواکەوتوو و نامەردیت.

پاشان بێدەنگییەك باڵی بەسەرداکێشان، تەنها لەناو سەری ڕەحمان نەبێت، چونکە جەنگێکی ترسناك لەناو مێشکیدا لە پێکدادانددا بوو: "دەی کوڕی هیچوپووچ قسە بکە! هەر شتێك بڵێ! لێمگەڕێ با زیاتر مێشکم لەدەست بدەم، ئەو کاتە سنوورێك، تۆ بڵێ کۆتاییەك بۆ ژیانت دادەنێم و ئاسوودە دەبم!"

هەر لە بیرکردنەوەی خۆیدا بوو، دیسانەوە لەگەڵ خۆیدا گوتی: "یان لەوانەیە دەیەوێ لێی ببورم! بەڵام بۆچی؟! ئەم بەڕەڵڵایە بیر لە چی دەکاتەوە؟! بۆچی وەڵامی ئەو زمانەدرێژییەی من ناداتەوە؟! ئەو جووتیارە و جووتیاریش هەرگیز ڕازی نابێت جنێوی پێ بدرێت، یان بە ترسنۆك ناوزەد بکرێت و سووکایەتیی پێ بکرێت. ئەم بەدفەڕە بۆچی بێدەنگە؟! تۆ بڵێی بزانێت وەڵامدانەوەی زیاتر دەمورووژێنێت و بە ئاگام دەهێنێتەوە، یان چاوەڕوانی ئەوەیە ئارام و خاو ببمەوە، یان ببورم! ئاخ لەوانەیە بیر لە هەرزانفرۆشیمان بکاتەوە. چۆن ئەوەم پشتگوێ خست کە لە مێشکیدا دەخولێتەوە؟ لە نێوان ئەمە و خیانەتدا پارچە چەکێك، یان چەند دینارێك هەیە. دوور نییە شەڕێك بخولقێنێت و قوربانییەکانی ئێمە بین و ئەویش دەستکەوتەکانمان بشارێتەوە و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچێت، چونکە ئەو زۆر بە ئاسانی دەتوانێ لەم ناوچەیەدا دزە بکات و خۆی دەرباز بکات، لەبەر ئەوەی بست بە بستی شارەزایە، سبەینێش دەبێتە پاڵەوانێك و ئەوەیان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن مۆڵگەکانی دوژمن لێیانداین و ئێمە چۆن کوژراین و ئەویش دوای بەرگرییەکی قارەمانانە توانی خۆی دەرباز بکات. بەڵێ، ئەمەیە مەبەستی سەرەکی. نابێت چاوی خۆمی لێ دابخەم و بێ ئاگا بم، بەڵکوو هەتا نابێ پشتیشی لێ بکەم، هەر دەبێت بەرەوڕووی بوەستم، تاکوو بەرگەی ئەو خەونە نەفرەتییەی بگرم و بەسەریشیدا زاڵ بم... بەڵام ئەی بۆچی ئێستا نامانکوژێت؟! خۆ لەوانەیە بیری لەوەش کردبێتەوە، بەڵام دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخسابێت کە بتوانێت ئەو کارە بکات و ئەو چەکانەش بشارێتەوە کە ئارەزووی دزینیان دەکات، چونکە ڕەبایە و مۆڵگەکانی دوژمن لە دەنگی ئەو گوللانە ئاگادار دەبنەوە کە بە دەستی ئەم جووتیارە دواکەوتووە دڵی هەردووکمان دادەبێژێت

و خۆیشی هیچ کاتی بەدەستەوە نامێنێت بۆ خۆدەربازکردنی. هەر بە ڕاستی گرێبەستێکی گەورەیە و بەشی دەوڵەمەندبوونی چەند ساڵێکی دەکات.

تۆ بڵێی بیر لە کوشتنمان بکاتەوە، بێ ئەوەی ئاگای لە مۆلگەکانی دوژمن بێت و بە هەندیان وەربگرێت؟! ئەی بۆچی بە نێزەکەی لێمان نادات؟ ئەم ڕێگەیە توانای شاردنەوەی چەکەکانی بۆ مەیسەر دەکات و دواتریش وا بە باش بزانێت کە دەسترێژێکی گوللە لە سینگمان بەتاڵ بکات و هەمووانیش هەڵبخەڵەتێنێت کە ئێمە هەردووکمان بە گوللەی زۆری مۆلگەکانی دوژمن پێکراوین و شەهید بووین. خۆ لەوانەیە ئەمەشی بە مێشکدا هاتبێت، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبادا لەگەڵ یەکەم نێزەلێدانی بە ئاگا بێین و لێی بێینە دەست، یان بە ئازار و ژانی نێزەکە و هاواری ئێمە مۆلگەکان بە ئاگا بێن و بورووژێن، بەمەش هەموو شتێکی لەدەست دەچێت و ئەم پیلانەیشی لەوەی پێشووتری جیاواز نییە، هەروەها لەوانەیە شیکردنەوەی قووڵیشی کردبێت و گەیشتبێتە ئەگەرێکی دیکە، ئەگەر بە نێزە بمانکوژێت، لەوانەیە بە هۆی ئەو شەکەتی و ماندووبوونەمانەوە، هەتا فریای هاوار و ناڵەیەکیش نەکەوین، بەڵام لەوانەیە پەی بەوە بردبێت کە سبەینێ ڕاستییەکان ئاشکرا دەبن و جووتیارەکان دەڵێن ڕژێم دوو تەرمی دۆزیوەتەوە بە نێزە کوژراون و بە گوللەش جەستەیان دابێژراوە، چ گوللەیەکە، ئەوە گرنگ نییە! لەوانەیە بڵێن گوللەی مۆلگەکانی دوژمنە، وەلێ ئەی چی لە برینی نێزەکان دەکات، ئەی ئەوانە چۆن گەیشتنە جەستەیان؟ ئای قاسم لەوانەیە هەموو بابەتەکەت هەڵگێڕ و وەرگێڕ کردبێت، ناتەوێ جێپەنجەی گڵاوت لەسەر کوشتن و غەدرلێکردنمان دابنێیت، هیچ گومانی تێدا نییە چ

ئەهریمەنێکــی نەگریســیت؟ بەڵــێ ئەوە ڕاســتییەکەیە، هەمــوو هەڵسوکەوتەکانی نیشانەی ئەوەیە، ســەرنجەکانی، هەنگاوەکـانی، نەگریسییەکەی، گرتنی چەکەکەی... چەتەگەریـیەکەی بەرانـبەر کوژراوەکانی دوژمن و ئەمـدیو و ئەودیوکردنیـان و پشـکنین و گەڕانی گیرفانەکانیان. ئەی خوایە هەموو شتێك تیایدا ئاماژەن بۆ ئەوە! قاســم مەحـاڵە بهـێلم دەسـتت بمانگـاتێ. ئەو سـەرنجانەی ماومە هەمووی دەکەمە چـاودێریی تـۆ. شـەوێکە و هەرچۆنێـك بێت لەگەڵ تۆدا بەسەری دەبەم و هەر چۆنێکیش ڕێك بکەوێت وا دەکەم، دە تـۆ گەمـژەییەك بنـوێنە و هەر جـووڵەیەك بـکە، دەبینــی چـۆن جەسـتە و سـەرە پـووتە بچـووکەکەت دەکەمە سەرەند و بێژینگ!"

بیرکردنەوەی ڕەحمـان وای لـێ کـرد، بێـدەنگییەکی قـووڵ باڵی بەسەردا بکێشێت، هەتا مێشکیشی لە هەموو خەیاڵێك بەتـاڵ بووەوە. بە چاوی ڕاوچییانەوە کەوتە سەرنجدانی قاسم، هێنـدەی نەخایاند لە دەروونی خۆیدا گوتی: "ژیانی خـۆم وێـران دەکەم، ئەگەر لەم بیرکـردنەوەیە بەردەوام بـم. چەنـد خۆشـە مێشـکی مرۆڤ ئارام و ئاسوودە و هێمن بێت. ئەم بیرکـردنەوەیە توانـای بەهەدەردانــی هێــزی کەرێکــی گەورەی هەیە، بە مەرجێــك کەرەکە لەو بیرکردنەوە نەبڕاوەیە بەردەوام بێت. من چیم تاکوو لەم دونیایەدا توانای زۆرانبازیم لەگەڵ هەموو شـتێکدا هەبێـت؟! ئایا زۆرانبازی لەگەڵ بیرکردنەوەکانمدا بکەم؟ یـان دڕنـدەیی و سەرشێتیی ئەم ژیانە سووك و بێبەهایە؟ یـان چـی دەربـارەی ئەو خەڵك و کات و ماندوێتی و بێخەوی و برسێتییە؟ پێم وایە تەنها کـات جەنـگەکە دەبـاتەوە و ململانـێکە کۆتـایی پـێ دەهێنێـت، خولەکەکان بە گۆڕەپـانەکەدا دەخـولێنەوە، تـاکوو بـگەنە هێڵـی کۆتایی. منیش سەرم لە خولانەوەیەکی بەردەوامدایە و نازانم لە

چ خولانەوەیەکیشـدا دەگـاتە هێڵـی کۆتـایی. لەوانەیە ئەمشـەو کۆتاییم بێ. بەڵێ ئەمشەو... کەواتە ئەوە کاتە کات... تەنها کاتە گـرەوەکە دەبـاتەوە. گومـان لەوەدا نیـیە کە ئێسـتا هێزێـك لە جاشەکان خۆیان بۆ دانانی بۆسەیەك ئامادە دەکەن، چونکە ئەم زەوییانە "قەدەغەکراون"، هیچ کەسێك پێیـان لـێ دانانێـت، تەنهـا سەرباز و جاشەکان نەبێ، بۆیە ڕژێم بە چەند خولەکێك دەتوانێ ئابلۆقەی هەر خاڵێك بدات کە مەبەستی بێت و بیەوێت".

- ئەوە چییە؟ گوێت لە دەنگی باڵندەکەیە؟ سعوود گـوێ بگرە... گوێ بگرە... گوێ بگرە!

ڕەحمان شانی سـعوودی بە تونـدی ڕادەتەکانـد و وای پـێ دەگوت.

سعوود هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە شڵەژاوییەوە پرسی:

- چی؟! ڕەحمان ئەوە چیت گوت؟!

- باڵندە باڵندە. گوێت لە دەنگی باڵندە بوو؟!

- چ باڵندەیەك؟!

- لەسـەر ئەو لـوتکەیەی سـەرەوەمانە. ئەهـا گـوێ بگـرە، ڕێك لەسەرەوەمانە. گوێت لێ بوو؟!

ئەم باڵندەیە لەم وەرزەدا نایەتە ناوچەکە و تەنها لە ڕۆژیشدا دەردەکەوێت. مام کاکیل جارێکیان وای گوت، کاتێك بـۆ ڕاو دەرچـووین، فێـری لاسـاییکردنەوەی دەنگەکەیشـی کـردین بە فووکردنە نێوان هەردوو مستمان بە نووشتاوەیی.

- مەبەستت چییە؟!

- مەبەستم ئەوەیە دەبێ ئاگادار بین و پاشەکشێ بکەین.

- پێت وایە ئەو دەنگە؟

- بەڵێ، لەوانەیە ئاماژە بێت، پێم وایە ئەوە بۆسەیە.

قاسم لێیان نزیک کەوتەوە و بە هەموو هەستەکانی گوێی لێ گرتبوون، پاشان بە تەواوی دڵنیا بوون، کاتێك گوێیان لە دەنگەدەنگێکی نزم بوو، قاسم ئەوەیشی خستەسەر: کە گوایە گوێی لە شکانی دەنگی گەڵا وشکەکانی ژێر پێی یەکێکیان بووە.

ڕەحمان بە ئاگایی و چرپەوە گوتی:

- گوێ بگرن، دەبێ هەر ئێستا پاشەکشێ بکەین، چونکە ئەگەر هەست بە بوونمان بکەن، لەوانەیە بە هەڵدانی گوللەیەکی ڕووناککەرەوە شاخەکە بکەنە چراخان.

لەژێر پاڵەپەستۆ و کاریگەریی ئەو بیرۆکانە هەموو هەستەوەرەکانیان بە یەکجار بەئاگا هاتن و هەستیان بە هێزێکی گەورە کرد کە لەو کاتەدا هەرگیز هەتا خەونیشیان بە بوونییەوە نەبینیبوو.

لە ناکاو شاخەکە بە مووشەکی ئارپی جی زرینگایەوە، بۆیە سعوود پێی گوتن:

- لێرە دابنیشن و هیچ جووڵەیەك نەکەن، نەبادا هەست بە بوونمان بکەن و ئاشکرا بین.

ڕەحمان گەڕایەوە و بە چپەوە هەستی بە خۆشی و لووتبەرزی دەکرد:

- سعوود پێم نەگوتی، پێم نەگوتی؟ هەستکردنم بە دەنگی باڵندەکە لە خۆڕا نەبوو.

پاشان وریا بووەوە و لەگەڵ خۆیدا گوتی: "بەڵام کێ دەڵێ ئەو هەستە ڕاستگۆیە، لەوانەیە ئەوەی ڕووی دا ڕێککەوت بێت! بەهەرحاڵ، پووچیی بیرۆکەکانم هەموو ئارەزووە خۆڕسکەکانی بە ئاگا هێنایەن، تاکوو پێشبڕکێ لەگەڵ ئەم ڕۆژگارە نەفرەتلێکراوەدا بکەین، کە لەوانەیە سەرئێشە و ماندووبوونێکی وامان بۆ بهێنێت هەر لە خەیاڵدا نەبووبێت."

ماوەیەکی درێژ لەو پێشبڕکێیە بەردەوام بوون و بە دوای بازدانەکانی قاسم کەوتبوون، بێ ئەوەی بزانن ئەو سەرلێشێواوە شێتۆکەیە بۆ کوێیان دەبات. پاشان گەیشتنە لێواری بەستێکی گەورە کە شوێنەواری ڕووبارێکی وشکی پڕ لە تاوێرە بەردی گەورە بوو، سێلاوە وەرزییەکان بە درێژایی ڕۆژگار بەو بەستەدا شەپۆلیان داوە و هونەرمەندانە پەیکەری قەبەی وای لێ دروست کردوون، مرۆڤ پێیان سەرسام دەبێت، ڕێك لە پیاوی زل و زەبەللاحی ناوقەد باریکی ژنانە دەچن. دوای نزیکەی کاتژمێرێك و زیاتریش، گازیوەی بەیان هەڵات و ئەو ئەشکەوتەی لە دەروازەی ئەو گوندەدایە کە دوێنێ شەو لێی کۆ بوونەوە بەدی کرد، دەرگای ئەشکەوتەکە ڕێك لە دەمی پیرە پیاوێکی بەساڵاچوو دەچوو، کە باوێشك بدات و هیچ ددانێکیشی تێدا نەمابێت.

# بەشی شەشەم

بەرلەوەی دەستەکەی مام کاکیل بگاتە شاخە سەختەکەی حەسارۆست، سوپا و جاشێکی زۆر ئابلۆقەی مۆڵگە ئازادکراوەکە و شاخەکانی دەوروبەریان دا، ڕیزە زرێپۆشێکی زۆریش لەسەر ئەو ڕێگە سەربازییە سەرەکییەی کە ئەو ناوچە قەدەغەکراوە بە شارە نزیکەکان دەبەستێتەوە پەرشوبڵاو بوونەتەوە.

بە وریاییەکی زۆرەوە چوونە ناو ڕەبایەکەوە، لە ترسی ئەوەی نەبادا دەستە یاخییەکە شوێنی وایان مینڕێژ کردبێت بە ئەقڵی کەسدا نەیەت. کاریگەریی چالاکییەکە بە هەموو شوێنێکەوە دیار بوو. تەرمی کوژراوەکان لێرە و لەوێ کەوتبوون. سەرکردە سەربازییەکان پەیوەندییان بە دەزگاکانیانەوە دەکرد و بە نیگەرانی و دڵەڕاوکێوە چاوەڕوانی فەرمانیان دەکرد. مۆڵگە و ڕەبایەکانی دیکەی سەر لوتکەکان لەوپەڕی ئامادەباشیدا بوون. فەرماندەکانیشیان بووبوونە نێچیری لەناوچوون و هەترەشیان چووبوو. نەخاسمە کاتێك ئەندامانی هەواڵگری سەربازی پەلاماریان دان و ئەفسەرەکانیان بۆ شوێنێکی نادیار ڕاپێچ کرد. جاشەکانیش تەرمەکەی ئادەمیان دۆزییەوە و هێنایانەوە نزیکی بارەگا سەرەکییەکەی سەربازگەکە.

نزیکەی کاتژمێر دەی بەیانی ڕیزە ئۆتۆمبێلێکی سەربازی و زرێپۆشەکان ئامادە کران و بەرەو لای نزیکترین شار هەنگاویان هەڵهێنا. لەوێ هەردوو پێی ئادەمیان بە پەت بەستەوە و بە

ئۆتۆمبیلە سەربازییەکانیان بەسەر زەویدا ڕایاندەکێشا و زەوی و شاخ و دۆڵەکان لەژێر جەستەی زامدار و ڕووشاویدا کڕنۆشیان دەبرد و دەست لەسەر سینگ بۆی ڕاوەستابوون، ئاخر ئادەم بۆ ئازادیی ئەم دەشت و شاخ و دۆڵانە ڕووی لە شاخ کردووە، کەچی ئێستا وا تەرمەکەی بەو جۆرە سووکایەتیی پێ دەکرێت. خەڵکی هاتبوونە سەر شەقامەکان تاکوو ئەو دیمەنە ببینن. سەربازەکان بە بڵندگۆ داوایان لە هەمووان دەکرد لە گۆڕەپانی شار کۆ ببنەوە. ئیدی منگەمنگ و پرتەوبۆڵەی خەڵکیش لە ترسان کپ و بێدەنگتر بووەوە و لە ترسان دەنگیان کز و نزمتر دەکرد و بە چپە لەگەڵ یەکتری دەدوان.

پیرەژنێکی لەڕولاواز ڕێك دەڵێی مۆمیاکراوە هەڵی دایە و گوتی:

- ئەوانە چ مرۆڤگەلێکن، هەتا لە مردنیشیاندا خەڵکی نیگەران و دوودڵ دەکەن.

گۆجێکیش لەبەرخۆیەوە:

- هەتا دوای مردنیش لە چنگی ئەمانە دەربازبوونمان نییە.

یەکێکی دیکەش دەڵێت:

- خوا بەزەیی پێماندا بێتەوە.

پیرەژنەکە بە دەنگێکی کەمێك لە چپە بەرزترەوە، کەوتە سینگکوتین و واوەیلا:

- خوا تۆڵە لە ستەمکار بکاتەوە، من نەوەیەك و کوڕێکم لە شاخە.

پیاوە پیرەکەی تەنیشتی گرتی و بە توندی شانی ڕاوەشاند، وەك ئەوەی لە خەوی بێهۆشی بە ئاگای بهێنێتەوە.

به بۆڵەبۆڵ و ناڕەزایەتییەوە ڕووبەڕوو پێی گوت:

- بێدەنگ بە هەی گەمژە، دەتەوێ پێستت داماڵن؟

فرمێسکەکانی چاوی بە جۆگەلەی چرچولۆچییەکانی قەدپاڵی گۆنا و چەناگەیدا شۆڕ بوونەوە، ئەو ڕوخسارەی نەهامەتی و تاڵی و مەرگەساتەکانی ژیان هەزار و یەك هێڵ و کەندولەندی جۆراوجۆریان لە ڕوخساریدا نەخشاندبوو، تابلۆیەکی مێژوویی پڕ لە نەهامەتی نمایش دەکرد، بە چپەوە گوتی:

- تەمەنمان بە خەم و ناسۆرەوە بە هەدەر دا. هیچ شتێکم نییە لێی بترسێم، نابینی چییان لە شار کردووە؟ جگە لە پیر و هەتیو و برسی بەولاوە کەسی دیکەی تێدا نابینیت!

ساتێك بێدەنگ بوو، سەرلەنوێ دایەوە پڕمەی گریان و لەبەرخۆیەوە گوتی:

- ئەگەر شەڕ حەپەلووشیان نەکات، چیاکان هەڵیان دەلووشێت و لە ئەشکەوت و دۆڵەکاندا ون دەبن، یان لە ژێرزەمینی بەندیخانەکاندا دەیانبینیتەوە و جۆرەها ئەشکەنجە دەچێژن، مەرگ بە ئاوات دەخوازن... وای لەم بەڵایە وای!

پیاوە پیرەکە ئارامیی لێ بڕابوو، لەبەرخۆیەوە:

- پێم گوتی بێدەنگ بە. وای چ پیرەژنێکی سەرشێت و زۆربڵێی. ئەگەر بەردەوام بیت، ئەوان واز لە تەرمەکە دێنن و هەمووومان لەجیاتیی ئەو بە دوای ئۆتۆمبیلەکانیاندا ڕادەکێشن.

پیرەژنەکە بە لاسارییەکی منداڵانە و بە پرتەوبۆڵەوە:

- دەبا بیکەن، بۆ ئێمە لەم گەنجە ستەملێکراوە چاکتر و زیاترین؟!

پیاوەکە ڕووی گرژ بوو، بە خێرایی لێی دوورکەوتەوە و لەبەرخۆیەوە دەیگوت: "ئەمە چ بەڵایەکە...! چ ژنێکی گەوج و کاڵفامە، وا دەزانێت بە زمانی توانای شکاندنی بەردی هەیە و بە قسەکانیشی گورگی برسیش دەتۆقێنێت!"

لە گۆڕەپانی شارەکەدا چەند ستوونێك لە زەویدا داکوترابوون. تەنها دوای چەند چرکەساتێك ئەفسەری مۆڵگە و ڕەبایەکانی دیکەیان بە دەستبەستراوی هێنا، ئەوەندە شێوابوون، هەندێکیان نەیاندەزانی لە دەوروبەریان چی ڕوو دەدات. دوێنێکە خاوەن گیان و ژیانی خۆیان بوون و نازیان بەسەر سەرباز و ئەوانەی خوار خۆیانەوە دەکرد، وەلێ ئێستا ئەو نازوفیزەیان لێ دەستێننەوە، بەو جۆرە لە ناکاو، بە هەموو سادەییەکەوە! ئەو ئەفسەرانە یاسای ژیانیان لە یاد چوو. "بۆ ئەوەی بژیت دەبێ بکوژیت، جا هەر کەسێك بێت". کوشتن و هەر کوشتن و هەر کوشتن!

ئینجا فەرماندەی هێزەکە هاواری بە سەر جەماوەرەکەدا کرد و هەڕەشەی ئەوەی لێ کردن هەر کەسێك لە ڕووبەڕووبوونەوەی یاخیبووەکان و تێکدەرەکان کەمتەرخەمی بکات، وەك ئەمانەی لێ دێت! ژمارەیەك سەرباز لوولەی چەکەکانیان ئاڕاستەی ئەفسەرە کەمتەرخەمەکان کرد، هەر چەند ساتێکی کەم و هیچی تر، دەسترێژیی گوللە لە هەموو لایەکەوە سەر و سینگ و تەواوی جەستەیانی دابێژا، خەڵکیش بۆ ئەو دیمەنە خوێناوییە بە ناچاری چەپڵەیان لێ دەدا و تارمایی مەرگیان لە خۆیان دوور دەخستەوە. مرۆڤ لەم پەڵە زەوییەدا شتێك شك نابات، جگە لەوەی دڕ و جانەوەر و پیاوکوژ بێت، بۆ ئەوەی بژێت، دەبێ بکوژێت، هەر بە ڕاستی ئەمە ڕۆشنبیری و هوشیاریی مەرگە، کە دەزگای تۆقاندن و خوێن بڵاوی

دەکاتەوە و ڕەواجی پێ دەدات، هەر بوونەوەریکیش لێرە، لە یەك کاتدا دەبێتە قوربانی و جەللادیش.

ئەم ڕووداوانە وا لە شاخەکاندا تەشەنەیان کرد، وەك گڕسەندنی ئاگر لە کا. دەستەکەی ڕۆست پێشبینیی ئەوەیان دەکرد کە دەسەڵات پەرچەکردار و وەڵامێکی تۆڵەسەندنەوەی خێرا و توندی دەبێت، بۆیە تەواوی ئاگایی خۆیان وەرگرتبوو. وەلێ بۆ ماوەی دوو ڕۆژ هیچ یەکێك لەو پێشبینیانە ڕوویان نەدا.

سەرۆك خێڵ و پیاوماقووڵانی گوندەکان و جووتیارانی بەساڵاچوو، دەستیان بە سەردانیکردنی بارەگای دەستەکە کرد. پیرۆزباییان لە پێشمەرگەکان دەکرد بە هۆی سەرکەوتنیان لە چالاکییەکە، بە جۆرێك قسەوباس لە گوندەکان زۆر و بڵاو بووبوونەوە، هەتا جووتیاران، هەرچەندە ئەوە شتێکی سرووشتی و باویشە، کە زێدەڕۆییان لە گێڕانەوەی شەڕەکە و چالاکییەکەدا دەکرد و لە مێشك و خەیاڵی خۆیاندا چەندین شتی دیکەیان بۆ زیاد دەکرد و دەخستە سەر. ئەمە وای لە خودی ئەو پێشمەرگانەش کردبوو کە لە چالاکییەکەدا بەشداربوون، لە کاتی بیستنی ئەو زێدەڕۆییە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان و دروستکردنی سەربوردەی سەیروسەمەرە دەمەبەشە بیانگرێت و تووشی سەرسوڕمان بێن و لەگەڵ یەکتری شرۆڤەی ڕاستی و دروستیی ئەو قسانە بکەن، تا حاڵ دەگەیشتە ئەوەی باوەڕ بە هەندێك لەو زێدەڕۆییانە بکەن کە خەڵکی گوندەکان بۆ ئەوانیان هەڵدەبەستا.

پیرە کاکیل بە سەری بەرز و شکۆوە دانیشتبوو، جووتیاران ڕێز لە کەس ناگرن، تەنها ئەوانەی زۆر ئازا و بوێر نەبن. ئەو باش دەیزانی چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و متمانەیان بەدەست دەهێنێت. هەمیشە بە نهێنی و لەگەڵ خۆیدا دەیگوت:

"دەبێ بەهێزترینیان بین، بۆ ئەوەی پێیان لەسەر شانمان دادەنێن."

ژوورەکە وێڕای گەورەیی، کەچی تەنها پەنجەرەیەکی بچووکی هەبوو، تیشکی ئەو خۆرەی لەو پەنجەرە بچووکەوە دزەی دەکردە ناو ژوورەکە، بەشی ڕەواندنەوەی تاریکایی نەدەکرد، هەتا دووان لەوانەی لەو گۆشەیەی لەگەڵ پەنجەرەکەدا درێژ بووەتەوە دانیشتوون، هیچ دیار نین تەنها تارماییەکانیان نەبێت.

ناوازەیی و سەیروسەمەرەیی ئەم دانیشتنە لە تاموچێژی خۆی بێبەش نابێت، بۆ ئەو کەسەی سەرنجی دەداتێ. یەکێک لە میوانەکان گەمە لەگەڵ جاڵجاڵۆکەیەکی بەدبەخت دەکات کە لە بنمیچەکەوە بە تاڵە دەزوویەکەوە خۆی شۆڕ کردووەتە خوارەوە و دەیەوێ دابەزێت، بێ ئەوەی ئەنجامی دابەزینەکەی بۆ خوارەوە بزانێت. ئەوەش یەکێکی دیکەیە بە چەقۆ تیژەکەی سەرقاڵی نینۆککردنی نینۆکەکانی پێیەتی، ئەو نینۆکەی دەیشیبرێت، بە هەر لایەکدا بۆی بڕەخسێت تووڕی دەدات، هەتا پارچەیەکیان کەوتە ناو لەپی ئەوەی لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو. یەکێکی دیکەیان لە کێشی گرانی چەکێك لەوانەی تر تووشی شۆك بووە، گوللەیەکی بە پێچەوانەوە کردۆتە ناو لوولەکەیەوە بۆ ئەوەی پێوانەی تیرەی کونی لوولەکە بکات، لێرەوەش ستایشێکی زۆری بەر کەوت لە سۆنگەی ئەوەی ئەو دۆزینەوە تازەیەی بە ئامادەبووان نیشان دەدا و ساتمەی لە پێی ئەم و ئەویان دەکرد، بەمەش زەوییەکە لەژێر پێی هەنگاوەکانیدا دەهەژی و بنمیچەکەش لەبەر هاتوهەراکانی شەپۆلی دەدا، لە شوێنەکەی خۆیدا بێدەنگ نەبوو، هەتا ئەو کاتەی شیرنەمەنی و وردە خواردنەکانی دیکەیان نەهێنا، ئینجا دانیشت و

زەردەخەنەیەکی گەوجانەی بێکۆتایی و بێسنوور ڕوخساری داگرتبوو. پاشان بێدەنگییەك باڵی بەسەر ئامادەبووانددا کێشا و دەنگی هیچ نەدەهات، جگە لە دەنگی فڕەی خواردنەوەیەك، ئەو کاتەی یەکێك لەوانەی چێژی لە خواردنەوەی خۆشاوەکە وەردەگرت، فڕێکی وای لە خۆشاوەکە دا و دەنگێکی وای بە لێوەکانی دەرکرد، خۆشی و خەندەی بەسەر هەمووانددا بەشاندەوە، تەنها بەوەندەشەوە نەوەستا، بەڵکوو دەنگێك لەژێر قوڕگییەوە دەرچوو، عوق، عوق، عوق، ڕێك وەك ئەوەی بۆقی زیندوو قووت بدات و لە قوڕگیدا گیر ببێت و بە بەردەوامی قووڕەی بێت و ئامادە نەبێت بچێتە ناو گەدەیەوە.

پاشان گفتوگۆی ئامادەبووانی ناو ژوورەکە کەوتە شەپۆلدان، جاری وا هەیە ژوورەکە ئەوەندە بێدەنگ و کپ و کڕ و خامۆشە، وەك ئەوەی کەسی تێدا نەبێت، یەك وشەشت بەر گوێچکان ناکەوێ، جاری واش هەیە دەنگەکان وا بەرز دەبنەوە، ڕێك دەڵێی جەنگ و پێکدادانێکی گەورە لەناو ئەو ژوورەدا بەرپا بووە. بەڵام کاتێك گەورەی خەڵکەکە بهاتبایەتە قسان، ئیدی دەنگەکان نزم دەبوونەوە، کاتێکیش ئەو بێدەنگ دەبوو، ئیدی لە هەموو لایەکەوە وشە و ڕستە و دەستەواژەکان لە زار دەهاتنە دەرێ و ژوورەکەیان پڕاوپڕ دەکردەوە، ڕستە و دەستەواژەی وا، هیچ ڕابەڵە و پەیوەندییەکیان بە یەکترییەوە نەبێت، بە کورتی گەڕەلاوژەیەکە بۆ خۆی، هەر یەکە و باراشی خۆی لێ دەکات، یەکێك باسی هێستر و ئەوی تر گوێدرێژەکەی و تا دەگاتە جاشك و سەگەکانیشیان، سەرەداوی باسێکیشیان هەر بە لای داهات و دەستکەوتی ئەو ساڵەیانەوە پەلی دەهاویشت، دوای ئەوەش دەچوونەوە سەر باسی ژنان و ژن و ژنخوازی و شیربایی و شایی و داوەتێ. هەر کاتێکیش

ئەوەی لە کەلـلە و مێشـکیاندا بـوو بە تەواوی ڕوویـان دەکـردە سەر زەوی و بە گوێی یەکترییاندا دەدا، جارێکی تر دەگەڕانەوە سەر ستایش و پێداهەڵگوتنی پیرە کاکیل. باسی توانای خـۆی و پێشمەرگەکان و ئازایەتی و جەربەزەییان دەکردن، دوای ئەوەی ئەوانیان بە کوڕی شاری دانابوو، بەوەی توانـای ژیـانی شـاخیان نییە، سـەرباری ئەوەی خـاوەن هەڵسـوکەوت و خـوو و نەریتـی نامۆ و سەیرن.

مـاوەی چەنـد ڕۆژێـك پێـی مێـوان و پیرۆزبـاییکەران لەو ژووره نەبڕا، هەتا دەتـوانین ئەو پیرۆزباییانە وەکـوو جۆرێـك لە ئەرك و گوێڕایەڵی و پابەندبوون و وابەستەییش ئەژمـار بکەیـن، بـۆ ئەوانەی خـودان ئـازایەتی و جەربەزەیـین، هاوشـێوەی پیـرە کاکیـــل و هاوڕێکـــانی. خـــۆ ئەگەر ڕاســـتیمان بوێـــت، ئەو پێشمەرگانە بارێکی قورسی سەرشانی گوندنشینان بوون. چـونکە وای دەخواســت و وا پێویسـتی دەکـرد کە لە پـارووی دەمـی منداڵەکانیان بەشدارییان پێ بکەن، بێ ئەوەی شتێکی بەسوودیان لێ بچننەوە و دەست بکەوێت، نەخاسـمە ڕۆژێـك لە ڕۆژان ئەو هێزانە نەیانتوانی گوندنشینان لە ستەم و دەسـتدرێژییەکانی ڕژێـم بپارێزن. چونکە کاتێك هێزەکانی ڕژێـم پەلامـاری نـاوچەیەك لە ناوچەکانیـــان دەدا، بە هەر هـــۆیەکەوە بـــووایە، ئەو دەســـتە پێشمەرگانە کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ یەکتـری لە بـارێکی دژواری براکوژیدا بوون، بەرەو قووڵایی چیاکـان پاشەکشێیان دەکـرد و خۆیان دەشاردەوە و گوندنشینانیان بۆ چارەنووسی ڕەشی خۆیان بەجێ دەهێشـت. زۆربەی بۆچوونەکـان لەگەڵ ئەوەدا بـوون کە ئەوان لەسەر حەقن. ئاخر ئەوان بەو ژمـارە کەمە پێشـمەرگەیەوە چـۆن دەتـوانن ڕووبەڕووی سـەدان و هەنـدێك جـاریش بگـرە هەزاران پیـاوی دەســەڵات ببـــنەوە کە تینـــووی خـــوێن و لە

ئاسمانیشەوە فڕۆکە و کۆپتەر پشتگیری و هاوکارییان دەکات. ئەمە کارێکە لە توانای ئەوان بەدەرە. گوندنشینانیش باش ئەو بێدەسەڵاتییەی ئەوانیان درك پێ کردبوو. پێشمەرگەکانیش لاوازیی خۆیان پشتگوێ نەدەخست و بەوەش ڕازی بوون کە لە توانایاندایە و ئەنجامیان داوە. کەواتە ئەم دەستە چەکدارانە چارەنووسێکە و لە ناوچەوانی گوندنشینان نووسراون و بیانەوێ و نەیانەوێ ناچارن بەرگەیان بگرن، ئەگەرنا چاوەڕوانی کاری خەراپتریان لێ دەکەن، ئەگەر پێیان ڕازی نەبن و بەرگەی باری گرانیان نەگرن. بەڵکوو گەلێ جاران، وێڕای پێشوازی و بەخێرهێنانی گەرمی جووتیارانیش لێیان، کەچی بەر خەراپترین مامەڵەیان دەکەوتن و لە ناخی خۆیاندا ئاواتی ئەوەیان دەخواست کە ئەم دەستە چەکدارانە هەر لە بنەچەدا نەبوونایە. جووتیاران فێری ئەوە بووبوون کە چۆن لایەنگیری بەهێزترینیان بکەن و خۆیان بدەنە پاڵیان و خۆیان لە شەڕی ئەوانی تر بپارێزن، ئەوەتانێ ئەمانیش خۆیان داوەتە پەنای مام کاکیل و دەستەکەی و جنێو بەوانی تر دەدەن، نەخاسمە ئەوانەی زیانیان لێ داون.

لە خانۆچکەیەکی بچووك، جووتیارە بەساڵاچووەکە دوای ئەوەی خواردنی ئێوارەی پێشکەش دەکردن، چاوی بڕیوەتە هەر سێ مێوانەکەی، بێ ئەوەی گوێ بە چەکەکانیان بدات، پاشان ڕووی لە زۆپا دارینەکە کرد و بەوپەڕی توانایەوە فووی لەو پشکۆو ژیلەمۆ خامۆشبووانەی ناوی دەکرد، تاکوو سەرلەنوێ دایانبگیرسێنێتەوە، بە جۆرێك فووی لێ دەکردن، وەك ئەوەی بزوێنەرێکی هەوای بە خۆیەوە بەستبێت، پاش کەمێك زۆپا دارینەکە بە جۆرێك کەوتە بڕکەبڕك، دۆزەخی لەناودا بەرپابوو، گڕ و بڵێسەکان بە جۆشەوە پارچەدارەکانیان هەڵدەلووشی، وەك

ئەوەی ڕۆحی شەیتان دابەزیبێتە ناو ئەو زۆپا کانزاییەوە، هێندەی نەبرد، وەکوو دەندووکی کەوی لێ هات... سوور سوور، وات هەست دەکرد ئێستا نا ئێستا زۆپای بەستەزمان لەبەر نێڵەی ئاگرەکە و ئەو دۆزەخەی لەناویدا بەرپابووە دەتەقێتەوە، یان دەتوێتەوە.

سەرەتا بە دەنگێکی نزمەوە پرتەوبۆڵەی بوو، وەك ئەوەی بەو خواردنەی پێشکەشی کردوون منەتیان بەسەردا بکات، لە گەرمەی بێدەنگیی ئەواندا تا دەهات دەنگی بەرز و بەرزتر دەکردەوە، تا گەیشتە ئەوەی لە هاتوهاوار بچێت، نەخاسمە کاتێك قسان دەکات و دەکۆخێت و لە هەمان کاتیشدا تفان ڕوو دەکاتە سەر زەوی، بە جنێودانەوە پێی گوتن: "بە چاوی خۆتان بینیتان ئەو نامۆ و بێگانانە چییان پێ کردین؟ ئاخر ئەوانە لەگەڵ ژیانی شاخدا ڕانەهاتوون، چونکە ئەوان وەکوو ئێوە لێرە لەدایك نەبوون. ئەوان لە کەسوکاریان دوورن و زۆربەشیان خاوەن جلوبەرگێکی باشی وەکوو ئێوە نین. لەوەش زیاتر هەتا نازانن جگەرەیەکیش بپێچنەوە و کڵاو و جەمەدانییەکیش بە سەریانەوە ببەستن! بەڵکوو زۆر لەوەش زیاتر بە پێوەش میزێ دەکەن! چەند سووکایەتیمان پێوە کردن، بەڵام تۆ تەماشاکە چییان لە دەسەڵات کردووە؟! وەڵڵا ئەمانە مانای ترس نازانن و هەر کاتێك بیانەوێ سەرکێشی بە ژیانیانەوە دەکەن و باکیان بە مردن نییە".

پاشان ئاوڕی لە هاوسەرەکەی دایەوە و ئاماژەیەکی بۆ کرد کە چایان بۆ تێ بکات، خۆیشی جگەرەکەی دەپێچایەوە و گوتی: "زۆریان بەلامانەدا گوزەریان کرد، دوای ئەوەی بە قەدپاڵەکاندا هەڵزنان و بە لوتکەی شاخەکاندا تێپەڕین، بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ بەناو زریانی تواناپڕووکێنی سەهۆڵبەنداندا ڕێگەیان

بڕی، وەك ئەوەی سەدان ساڵ بێ لەم دەڤەرەدا ژیابن... من هەموو ژیانی گەنجیم لەم شاخ و دۆڵانە بەسەر بردووە، کەچی زاخی ئەوە ناکەم لە وەرزی زریان و کرێوەدا ئەو لوتکانە ببڕم. تۆ بڕوانە ئەمانە دەبێ لە چ بنەگە و قوڕێك بن و چی وای لێ کردبن ئەم هەموو سەرکێشییە بکەن؟ بە ڕاستی بەهێزن و شەکەتی و ماندوێتی نازانن. بەڵام ئێوە هیچیتان نییە، جگە لە گەڕان و خوولانەوە بە گوندەکان و چاوبازێ لەگەڵ کچان... نزیکەی بیست ساڵی تەواوە پارووی دەمی منداڵەکانمان دەخۆن، کوا چیتان کردووە؟! ئەی بۆچی چەکتان هەڵگرتووە؟! ئەرێ وا باشتر نییە چەکەکانتان فڕێ بدەن و لە کاری کشتوکاڵ و شوانکارەیی یارمەتیی کەسوکارتان بدەن؟!"

هەر سێ چەکدارەکە کە لە دەستەکەی مام جەمال بوون، حەپەسان، کاتێك پیاوە بەساڵاچووەکە بە وشە ڕەقەکانی بەر توانجی دان، کە پێشتر گوێیان لە شتی وا نەبووبوو، تا وایان لێ هات پارووەکەی دەمیان بە سستی و شەرمێکی ئاشکراوە ئەملا و ئەولا پێ بکەن، وەك ئەوەی ئارەزووی خواردنیان نەمابێت و بە ناچاری و تەنها بۆ بێدەنگکردنی گەدەی بەتاڵیان نان بخۆن. لەوەش خەراپتر ئەوەبوو توانای وەڵامدانەوە، یان بەڵێن و هەڕەشەشیان نەبوو، چونکە ئەوان باش دەیانزانی کە پەنا دەباتە بەر کاکیل، یان لە ڕاستیدا بۆ ئەو لێژنەیەی کە لە ناوچەکەدا مام کاکیل لەگەڵ کۆمەڵە چەکدارەکانی دیکەدا پێکیان هێنابوو. ئەو لێژنەیەی لەجیاتیی دادگا ئەگەر جووتیاران دووچاری مامەڵەی خەراپی چەکدارانی هێز و کۆمەڵە جیاوازەکان بوونایەتەوە پەنایان بۆ دەبرد و سکاڵای خۆیان لای تۆمار دەکرد. یاساش لەناو لێژنەکەدا بەهێزەکەیان دایدەڕشت. هەردوو تای تەرازووەکەیشی لە نێوان حەق و ناحەقدا لە هەڵبەزودابەزدا

بوو، هەرگیز ڕێگەی سەقامگیری نەدەزانی، تەنها بە هێزی پیرە کاکیل و کۆمەڵەکەی نەبووایە.

چەند ڕۆژێك بەسەر چالاکیی دەستبەسەرداگرتنی مۆڵگە سەربازییەکە تێپەڕیبوو. لە بەرەبەیانی ڕۆژی حەوتەم، کەشوهەوا پێچەوانەی ڕۆژانی ڕابردوو ساردی کرد، وێڕای ئەوەی هێشتا تیشکی خۆر ڕووناکیی دەڕژاندە سەر شاخە شێدارەکان، خۆ ئەگەر هاتنی پەڵە هەورێکی ڕەش و چلکن نەبووایە، کەشوهەوا گەرم و خۆش دەبوو. هەورەکە بە تەوەزەلییەوە بە ئاسماندا دەکشا، ڕێك لە پەلەکانی ئەمیبای وردیلە دەچوو، کاتێك نێچیرەکەی هەڵدەلووشێت. پەڵە هەورەکەش ڕێك بەو شێوەیە تیشکی خۆرەکەی کردبووە نێچیر و هێدی هێدی ئابلۆوقەی دەدا و لە خۆیدا ونی دەکرد، تا حاڵ گەیشتە ئەوەی تیشك و ڕووناکییەکەی قووت بدا، تیشکەکەش لە هەوڵی خۆشاردنەوەدا بوو، گورزەی تیشکی خۆرەکە لەناو چڕیی هەورەکەدا تەواو بوون و خۆرە خڕەکە بە لاوازی و بێهێزی دەرکەوت. پاشان هێندەی نەخایاند چووە قووڵایی هەناوییەوە.

مامۆستا عومەر گەڕایەوە ژوورەکە، دوای ئەوەی کاتی پاسەوانییە یەك کاتژمێرییەکەی تەواو بوو. هەردوو دەستی بە یەکتریدا دەسوو، گوتی:

- تا ئێستاش کەشەکە ساردە.

هۆبی کە تازە هەستابووە سەر پێ گوتی:

- هێشتا زووە. هەست بە ئاسوودەیی و ئارامییەکی زۆر دەکەم، وەك ئەوەی ئەمڕۆکە ڕۆژێکی خۆش و قەشەنگ بێت، تەنها هەستکردنە و هیچی تر.

مامۆستا عومەر گوتی:

- ئـــارامی و ئاســـوودەیی هەســـتی تـــۆ شـــتێکە و گۆڕانکارییەکـانی کەشـوهەواش شـتێکی تـر. ئەو هەورە ڕەشـە نەفرەتییە پێش تۆزێك هەموو ئاسمانی داپۆشی.

هـۆبی ویسـتی ئەوە بسـەلمێنێت کە سـەرچاوەی خۆشـی و ئاسـوودەییەکەی باشـبوونی ئەو کەشـەیە کە پێشـبینی دەکـات، گوتی:

- بایەکە ڕایدەماڵێت و دەیبات.

عومەر وەڵامی دایەوە:

- بایەکە کپ و خامۆشە.

یەکێکی دیکەیان گوتی:

- هەر کە هەڵیکرد خۆرەکە لەژێر هەورەکە دەردەکات و سەرلەنوێ هەڵدێتەوە.

سعوود کەمێك پێخەفەکەی لەسەر خۆی لادا و گوتی:

- چ بەیانییەکی بەدبەختە کە لەسەر مشتومڕی فەلسـەفە بە ئاگا بێین. ئافەرین، ئەوەی پەپـکە خـۆرەکەی وا لـێ کـرد، هەر ئەویش دەریدەکاتەوە و سـەرلەنوێ هەڵـدێتەوە و فڕۆکەکـانیش دێنەوە و بارەگاکەمان بۆردومان دەکەنەوە... هێی واز لە خۆر و واز لە باوبۆرانیش بێنن، لێگەڕێن با تۆزێك بنووین.

کـاتێکیش عـومەر ویسـتی زۆپـاکە هەڵبکـات، فەرمانـدەی دەستەکە لە شوێنی خۆیەوە هاواری کرد:

- کـورە عـومەر چـی دەکەیـت؟ هەزار جـار گوتوومـانە هەڵکردنی زۆپا بە بەیانیـان قەدەغەیە، ئـاخر بە هـۆی دووکەڵـی زۆپاکانەوە فڕۆکەکان شـوێنی بارەگاکەمـان دەستنیشـان دەکەن.

دەی هەمووتـان هەسـتن. خـواردن نـیـە بـۆ هەر کەسـێك دوای کـاتژمێر حەوت هەڵبسـێت. دەی زوو کەن، دەبـێ پەرتەی لـێ بکەین.

ڕەحمان هاواری کرد:

- تەنها برینداره‌کان نەبێت، وا بزانم منیش یەکێکم لەوان. لێگەڕێن با بنووین، چی تر بێزارمان مەکەن.

کاتێـك سەردەسـتەکە پەتـووەکەی لەسـەر سـعوود لادا بە پرتەوبۆڵەوە گوتی:

- تا ئێستاش کەشوهەوا ساردە. ناکرێ کەمێکـی دیـکەش چـاوەڕوان بیـت؟ چەنـد پەرۆشـی ئەوەم بنـووم و هەڵبسـتم بـێ ئەوەی هیچ کەسێك ئاگادارم بکاتەوە.

- دەی، زوو کەن لە دەرچـــــوون لە بارەگـــــا و پەرتبوونەوەمان دواکەوتین. تەوەزەلی بەسە. تەنها ئازار بمێنێتەوە، ئەو توانای ڕێکردنی نییە.

ئـازار بە پێکەنینێکـی گاڵتەجـاڕانەوە سـەیری دەموچـاوە خەواڵووەکانی دەکرد و بە چاوداگرتنەوە گوتی:

- ئای چەند شتێکی خۆشە، مرۆڤ بریندار بێت، تاکوو بە ئارەزووی خۆی بنوێت. من زۆرم خەو دێـت، وای خەو چەنـد خۆشە.

هۆبی هاواری لێ هەستا:

- مادام شوێنەکە مەترسیدارە ئەی بۆچی ئـازار بمێنێتەوە؟ پێم وایە ژیانی من لە ژیانی ئەو بەنرختر نییە، ئـازار مـن لەگەڵ تۆدا دەمێنمەوە.

سەردەستەکە گەڕایەوە و کەوتەوە هاندانی پێشمەرگەکان، بۆ ئەوەی ژوورەکە چۆل بکەن، دەستی کردەوە ڕاکێشانی یەك بە یەکی پێخەفی سەر ئەوانەی دووبارە خۆیان نابووە ناو پێخەفەکانیان.

- دەی سعوود لاساری مەکە، دەی هەستە.

- بەڵام خۆ منیش بریندارم... ملم دێشێ. لێم گەڕێ با کەمێك بنووم.

- دەی... دەی درێژە بە گاڵتەجاڕییەکەت مەدە، دەی ڕەحمان تۆش، هەستە تەوەزەلی بەسە. بەڵام ئیبراهیم کە پێکراوە...

ڕەحمان قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- هەڵدەستم... هەڵدەستم. من دەزانم توانای بیانووهێنانەوەم نییە، لەبەر ئەوەی خەریکە دەڵێیت: برینداریيەکەی ئیبراهیم لەوەی تۆ زیاترە و دەبینی زوو هەستاوە. هەموو ڕۆژێك گوێم لەم ئاوازە دەبێت، هەی نەفرەتت لێ دا ئیبراهیم.

لە شوێنی خۆیدا بە ئازارەوە پرتەوبۆڵەی بوو. کاتێك ڕاوەستا سەرئێشەیەکی لە ناکاو وەك ئەوانەی ناوەناوە تووشی دەبن دایگرت، بەلادا هات و خۆی بە لوولەی زۆپاکەدا کێشا، کە بنمیچی ژوورەکەی دووبەدەر کردبوو، هێندەی نەمابوو بکەوێت. لەگەڵ ئەو سووکە سەرئێشەیەدا، وای بە خەیاڵدا هات لە خەرەندێکی بەرزەوە خۆی فڕێ بداتە خوارەوە. دواتر پێش

ئەوەی بەر زەوی بکەوێت، هەڵۆیەکی گەورە هەر لە ئاسمانڕا بۆ خۆی هەڵیرفێنێت و بیبات. هەر بە ئاسمانەوە بەرەو بەرزاییەکی زۆر و سەرەوەی شاخە سەرکەشەکەی ببات و لەوێ بە چرنۆکەکانی پارچە پارچەی بکات. کەچی هێشتا هەستی بە بەختیاری دەکردا!

دکتۆرەکە شانی گرتبوو گوتی:

- ئەوە چیتە؟! خەریك بوو زۆپاکە لە بنەوە هەڵتەکێنیت!

ڕەحمان بە بێزاری و لەژێر لێوەوە گوتی:

- هەست بە سەرەسووڕێ دەکەم.

- ئەم سەرەسووڕێیە بە هۆی چاوتەوەیە. پەڕۆکەی قەدی بکەوە هاوڕێ، وا نابێت، تۆ چەند ڕۆژێکە نەتهێشتووە ڕووناکی بەر بکەوێت.

- ڕووناکی ئازارم دەدات.

- لەبەر ئەوەی لەگەڵ ڕووناکی ڕاتنەهێناوە.

پاشان لەسەر زەوی دانیشت و بە هەردوو دەستی توند سەری گرتبوو، تاکوو سەرئێشەکەی ڕۆیشت، ئینجا گوتی:

- بۆچی توانای مرۆڤ لە بەرگەگرتنی هەلومەرجی ئاسایی ناتەقێتەوە. من ناتوانم بیر لەوە بکەمەوە کە چۆن ئەو هەموو ماوە درێژەم لەو ڕۆژە تواناپڕووکێنەدا بڕی! کەچی ئێستا هەتا ناتوانم پێخەفەکەم بەجێ بهێڵم. بە ڕاستی کارێکی سەیرە!

دکتۆرەکە گوتی:

- ئەوە کـارێکی سرووشـتییە، چـونکە وزەیەکـی زۆر لە جەستەماندا پاشەکەوت دەکەین، لەوانەیە چەند هێندەی ئەوەبـێ کە خۆمان هەستی پێ دەکەین و ناشتوانین وا بە ئاسانی پەی پێ بـبەین و بیـدۆزینەوە، یـان لەوانەیە بەو بەشـە کەمەی کە لە چالاکییەکانمانـدا بەکـاری دەهێنـین قایـل و ڕازی بـین، ئەو وزەیەی دەشمێنێتەوە ناتەقێتەوە، تەنهـا لە هەلـومەرجی نائاسـاییدا نەبێت.

ڕەحمان قسەکەی پێ بڕی:

- مـن ئێسـتا لە دۆخێکـی نائاسـاییدام و هـیچ وزەیەکـی شاراوە و پاشـەکەوتکراوم نیـیە، هەتـا وزەیەکـی زۆر ئاسـایی و سادەش.

دکتۆرەکە گوتی:

- یەکجار واش نا.

ڕەحمان وەڵامی دایەوە:

- کەواتە ئەی چۆن؟!

دکتۆرەکە بە ڕاڤەکردنی بیرۆکەکەیەوە گوتی:

- تۆ بە نموونە لە هەلومەرجی ئاساییدا، توانای هەڵگرتنـی پـارچە بەردێکـت نیـە گـرانییەکەی شەسـت کیلـۆ بێـت، بەڵام ئەگەر وا ڕێـك کەوت مـارێکی گەورەی ژەهـراوی پەلامـاری دایت و ڕێگەی دەربازبوونت لێ داخرابـوو، هـیچ چەکێکیشـت پێ نەبوو، خـۆت دەبینیـتەوە بـێ ئەوەی ئاگـات لە خـۆت بێـت

بەردە گەورەکە هەڵدەگریت و بە هەموو هێزت بە مارەکەیدا دەکێشیت و سەری مارەکەی پێ دەپلیشێنیتەوە، بەڵکوو وا هەست دەکەیت کە ئەو بەردەی لە نێو دەستەکانتدایە سووکیشە، ئەو هەموو هێزە زیادەیەت لە کوێ هێنا؟! هەڵبەتە لەو وزە شاراوەیەدایە.

ڕەحمان پرسی و گەڕایەوە ناو نوێنەکەی خۆی:

- لەوە تێدەگەم، بەڵام بۆچی ئەو وزەیە لە هەلومەرجی ئاساییدا ناتەقێتەوە؟!

- ئێ باشە لە بارودۆخی ئاساییدا تۆ چ پێویستیت بەو وزەیە هەیە.

ڕەحمان بە بێزارییەوە گوتی:

- بەڵکوو پێویستم پێیەتی! ئەی نابینی بەم بەیانییە زووە و لەگەڵ ئەو هەموو شەکەتی و برینداریيەشم چۆن لە خەو هەڵیانساندم؟!

ئیبراهیم سەری هێنایە ژوورەوە و چاویشی بە پارچە پەڕۆیەکی سپی و خاوێن پێچابوو:

- تەنها پێنج خولەکتان لەبەردەستدایە، ئەگەرنا لە نانی بەیانی بێبەش دەبن و هەڵیشتاندەستێنن.

بە شێوەیەکی بەرپرسانە قسەکەی کرد و بە خێرایی لە ژوورەکەی چووە دەرەوە. سعوود بە سەرسامییەوە گوتی:

- ئەم ئیبراهیمە سەیرە، هێزێکی وای هەیە هێندەی هێزی

هێستریك دەبێت.

دكتۆرەكە بە دەنگێكی پڕ لە داخەوە گوتی:

- لە بەدبەختییەكەی چاوێكی لەدەست داوە، بە تەواوی دادڕاوە، دەبێ خۆی لەسەر بەردەوامبوونی لە ژیان بە یەك چاوەوە ڕابهێنێت.

ڕەحمان ویستی شتێك بڵێت، دكتۆرەكە خێرا ئەمەشی خستەسەر:

- بەڵام ڕەحمان بەركەوتنەكەی تۆ ڕووكەشانەیە و لە نۆڕینگەی ناوزەنگ بە ئاسانی پارچەكەی لێ دەردەهێنن، هەڵبەتە ئەگەر داوودەرمان و ئامێری تایبەت بەوە هەبێت.

- چەند ئەوە بە ئاوات دەخوازم... بەڵام ئەی حاڵی چاوەكەی دیكەم چۆن دەبێت؟! ئەوەیان هەر بە ڕاستی ساغە و هیچی لێ نەهاتووە؟ خۆ ئەگەر وایە، ئەی بۆچی ناتوانم بیكەمەوە؟ بۆچی تیشكەكە هەرچەندە كزیش بێت ئازاری ئەویش دەدات، هاوڕێ هەر خەریكە بە ڕاستی كوێر دەبم.

- دڵنیات دەكەمەوە كە تەنها تۆز و خۆڵە و هیچی تر، خۆتیش دەزانیت چ توانایەكم بەخشی بۆ خاوێنكردنەوەی. بەڵام سەبارەت بە ڕووناكی، ئەوەیان لەسەر خۆت ڕادەوەستێت. ڕاستە تیشك و ڕووناكی ڕاستەوخۆ كاریگەری بۆ سەری هەیە، بەڵام بەستانی بەو جۆرە و ڕێگەگرتن لە تیشكەكە بە شێوەیەكی گشتی ئازارەكەی زیاتر دەكات. خۆ ئەگەر كەسێكی چاوساغیش بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە ژوورێكی تاریك

دابنیشێت، دوای ئەوە هەر ڕووناکییەك بەرچاوی بکەوێت، هەرچەندە کزیش بێت ماسولکەکانی چاوی ئازار دەدات و ماندوویان دەکات.

- قسەکانت زۆر ماقوولن. ئێستا فیلمی پەپوولەم بیر کەوتەوە، کاتێك "ستیف ماکوین"یان خستە ناو زیندانە تاکەکەسییەکەوە. پاشان وەکوو سزایەك بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ڕووناکییان لێ بڕی، کاتێکیش لە ناکاو لە دەروازەیەکی بنمیچەکەوە زیندانەکەیان ڕووناك کردەوە، شڵەژا و لە تاو ئازاری چاوی بە هۆی ڕووناکییەکەوە قیژانی و هاواری کرد. بە تەواوی نایەتەوە یادم، ئایا خۆی لەژێر پێخەفەکە شاردەوە، یان دەموچاوی لەناو نوێنەکەدا داپۆشی، گرنگ ئەوەیە چاوی زۆر بە دژواری بە هۆی ڕووناکییەکەوە ئازاری دا.

لێرەدا پاسەوانەکە ئەو قسەیەی پێ بڕی، کاتێك گوێی لە هاواری بوو:

- دەی زوو کەن بڵاوەی لێ بکەن، فڕۆکەکان بەسەر سەرمانەوەن.

بایەکە هەورە ڕەشەکەی بە ئاسمانەوە نەهێشتبوو، کۆپتەرەکانیش بێویژدانانە پەلاماریان دان، ئاشکرایە کۆپتەر و فڕۆکە تەنها لە کەشوهەوای ساف و بێگەرددا هێرشی خۆیان دەکەن و تەڕ و وشك پێکەوە دەسووتێنن، هەرگیز گوێنادەنە خەڵکی بێدەسەڵات و سڤیل و بەوپەڕی ڕق و تووڕەییەوە ڕۆکێت و بۆمبەکانیان لە ئاسمانەوە دەبارێنن، گرنگ نییە کێ و چی بەر دەکەوێت، گرنگ ئەوەیە زیان بەم خەڵکە ڕەشوڕووتە

بگەیەنن، هەموو ئەوانەش بە پاساوی بوونی بەرهەڵستکارانی ڕژێمەوە. وێڕای ئەوەی پێشمەرگەکان لە هەر چرکەساتێکدا پێشبینیی هاتنیان دەکرد، وەلێ ئەوەی بووە مایەی حەپەسان و سەرسوڕمانیان بێدەنگییەکەیان بوو، ئاخر ئەوان ئەوەندە بە بێدەنگی و کشوماتی هاتن کەس گوێی لە دەنگیان نەبوو، دەبێ هاڕەی بزوێنەرەکانیان چۆن شاردبێتەوە؟ خەڵکی و هەرچی زیڕۆحێکی سەر ڕووی زەوی هەبوو، هەمیشە لە دوورەوە گوێیان لە دەنگە تۆقێنەر و بێزارکەرەکانیان دەبوو، تا دەگەیشتنە سەریان هەر کەسە و بە جۆرێك خۆیان ئامادە دەکرد و لە پەناوپەسێو و کونە تەیارە و بن بەرد و پەنای دار و درەختەکان خۆیان دەشاردەوە و هەر کەسە و لە شوێنی حەشارگەکەی خۆیەوە خۆی بۆ ئامادە دەکرد، وەلێ لەوانەیە ئەم جارەیان بە هۆی گوێپێنەدان و بێزاریی پێشمەرگەکانەوە کۆپتەرەکان دەنگی خۆیان قوت دابێتەوە، یان تۆ بڵێی ئەم کۆپتەرە داهێنراوێکی تازە بێت، نەخاسمە دەنگۆی ئەوە بڵاو بووبووەوە کە ڕژێم جۆرە فڕۆکەیەکی پەرەسەندووی هاوردەکردووە و هەر ئەوەتە و گوێت لە دەنگی دەبێت، هەتا جووتیارەکانیش دەیانگوت: هەر بە تەواوی بێدەنگە! هەرچەندە هەموو جارێکیش گوێیان لە دەنگی دەبوو! خۆ لەوانەشە ئەم جارە بە هۆی کەشوهەواکەوە بووبێت. چونکە ڕۆژێکیان یەکێك لە پێشمەرگەکان لەگەڵ تاڵە دەزووەکانی کازیوەیەکی زوودا، گوللەیەکی بە کەروێشکێکەوە نابوو کە لەسەر بەفرەکە ڕایکردبوو، کەس گوێی لە دەنگی تەقەکەی نەبوو، وەك ئەوەی بە چەکی بێدەنگ تەقەی کردبێت، دواتر گوتیان نەمانی ئەو دەنگە بە هۆی کەشوهەواوەیە لە

هەلومەرجێکی دیاریکراودا، یەکێك لەو ناوانەیان لێی نا کە لە کتێبی فیزیادا هەبوون.

دەنگــی تەقیــنەوەی مووشــەکەکان لە هەمــوو شــوێنێکی شاخەکەوە دەهات. هەموویان لەناو تاشەبەردەکاندا خۆیان لە گڕ و پــارچەی بۆمــب و مووشــەکەکان دەپاراســت، دوای ئەوەی کۆپتەرەکـان بـاری ڕق و قینـی ڕەشـی خۆیـان بەتـاڵ کـرد، بە نائومێــدی گەڕانەوە بــێ ئەوەی هــیچ کەســێکیان زیانیــان بەر بکەوێت. ئەمەش سەرلەنوێ ئاگـایی و وریـایی پــێ بەخشــینەوە، دوای ئەوەی تەوەزەلـی و شـلوخاوی بەسـەریاندا زاڵ بووبـوو و لەگەڵ دۆخەکەدا ڕاهاتبوون.

# بەشی حەوتەم

مام کاکیل لە ڕوخساردا لە تەمەنی ئاسایی و ڕاستەقینەی خۆی گەورەتر دەردەکەوت. ئاخر ئەو ناحەقی نەبوو، ئەو ژیانەی ئەو ژیابوو، هەر کەسێکی دیکە بژیابووایە تەفروتوونای دەکرد و ئەوەندەشی لێ نەدەهێشتەوە، ئەو نەبوونییەی ئەو ژیابوو، کەم کەس هەبووە بینیبێتی و ئەو ئازارەی ئەو چەشتوویەتی، کەم کەس هەیە بەلایشیدا تێپەڕیبێت و وەکوو ئەو خۆڕاگرانە شانی دابێتە بەر نەهامەتییەکان و لە هیچەوە بوونی دروست کردبێت، وەلێ ئەو بۆ بژێوی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی نانی لە قوڕگی شێردا پەیدا کردووە، هەر ئەو ژیانە کولەمەرگییە پێشوەختەیەش بونیاد و سەرتاپای جەستەی شەکەت و ماندوو کردووە، کەچی وێڕای ئەوەش لە هیچ بوارێکدا ناتوانی لێی ببەیتەوە. هەر کاتێکیش بەڵا و کارەساتێك ڕووی تێ کردبێت، ئەو بە توانا و گەشبینییەکی بێئەندازەوە ڕووبەڕووی بۆتەوە و بەسەریدا زاڵ بووە و دەستەمۆی کردووە، چونکە بەوپەڕی توانا و هۆشمەندییەوە لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بووەتەوە، وەك ئەوەی لە مەیدانی زۆرانبازیدا بن، هەر کاتێکیش بە زەویدا دابێت، ئەو دەمودەست هەستاوەتەوە و چنگی لێ گیر کردووە و بەوپەڕی بوێری و ئارامگیرییەوە ڕووبەڕووی بووەتەوە و چۆکی بۆ دانەداوە، دەستی بەخۆدا شۆڕ نەکردووەتەوە و ئاڵای سپی خۆبەدەستەوەدانی هەڵنەکردووە، هەرگیز ڕێگەی نەداوە بیخات و شکۆی بشکێنێت. هەر بۆیە ئەو سەختییەی ژیانی بەلاوە پەسەند و ئاسایی بووە و لێیشی بێزار

نەبووە، چونکە پێویستە مرۆڤ لە پێناو ژیاندا تێ بکۆشێت و ڕەنج بدات و گرفت و ئاریشەکان لۆژیکیانە بخاتە خزمەتی خۆی و ئەو دۆزەی تێیدا دەژیت، ئەمیش هەروا بووە و هەر وایشی کردووە، چونکە ژیان ململانێیە لە پێناوی مانەوەدا. مام کاکیلیش هەر لە منداڵییەوە پەی بەمە بردبوو، ئەو کاتەی نەخۆشی، باوکی لە ماڵەوە لە پەلوپۆخست، ئەوی بەو گەنجی و خوێنگەرمییەوە بە تاق و تەنها و بێ پشت و پەنا لە بەرانبەر ژیاندا هێشتەوە. بەمەش توانی بەرگەی بەرپرسیاریتی بگرێت و پێداویستییەکانی خانەوادەکەی کە خوشکێك و دایك و باوکی بوون، دابین بکات، باوکی هەتا کۆچی دواییشی کرد هەر بە نەخۆشی لەسەر جێگە مایەوە. ئەو کاتە کاکیلی گەنج لە خەمی ئەوەدا بوو ببێتە مامۆستا، هەتا ئەم خواست و ئومێدە لای بووە خەونێکی جوان و ئەرخەوانی و زۆر جار لە کاتی نووستن و هەتا ئاگاییشدا بە مێشکیدا دەهات و بە ئامان و زەمان لێی دوور نەدەکەوتەوە، بەڵام ئەو خولیا و خەونە جوانەی بوونە بلقی سەر ئاو، دوای ئەوەی ڕۆژگار ستەمی لێ کرد و خەون و خولیاکانی پێچایەوە. بۆیە ناچار بوو بچێتە ناو قووڵایی و گەرمەی نەهامەتییەکانی ژیانەوە، تاکوو ڕێگە بە هەژاری و نەداری نەدات مۆرانەئاسا خۆیان بخزێننە ناو ماڵە پەڕپووتەکەیەوە، بەڵام دەتوانێ چی بکات؟! ئاخر ئەو خۆی بۆ ئەم دۆخە لە ناکاوە ساز نەدابوو و هەر بە خەیاڵیشیدا نەدەهات. وەلێ چ دەکەی؟! دەستکورتی و نەداری ستەمیان لێ کرد، ئەوەی ئێستا لە دەستی دێ بیکات، تێکۆشان و ئەنجامدانی هەر کارێکە لێنەگەڕێ سەری بەرزی نەوی بکات و دەست بۆ هیچ کەسێك پان بکاتەوە. خۆ ئەگەر دابینکردنی پارووەنانەکە تەنها بۆ خودی خۆی بووایە، هەرگیز ئەو هەموو بایەخەی پێ نەدەدا و ئەو هەموو هەڵبەزودابەزەی بۆ نەدەکرد، ئەوەندەش بە لایەوە

گرنگ نەدەبوو، ئاخر خۆ ئەو دەتوانێ بژێویی خۆی بە ئاسانی پەیدا بکات، بەڵکوو لەوانەیە ئەگەر لە خوێندنەکەی بەردەوام بووایە، ئەوا خەونەکەیشی دەهاتە دی و دەبووە مامۆستاش. کەچی پرسەکە بە لای ئەو لەوە گەورەتر بوو. کێشەکە دایك و خوشکی بوون. کاکیل ئامادە بوو بمرێت، بەڵام خێزانە بچووکەکەی نەبینێت کە برسێتی وردوخاشیان دەکات، دوای ئەوەی تاکە کۆڵەگە و ستوندی ماڵەکەیان لەدەست دا، هەڵبەتە باوك لەم جۆرە کۆمەڵگایانە بە کۆڵەگەی ماڵێ دادەنرێت، ئیدی هەلومەرجی سەختی ژیان کردییە پیاوێك بۆ تاکە ساتێکیش چۆك دانەدات، یان بەرانبەر شەکەتی و ماندوێتیی ژیان لە پێناو بڕە پارەیەك کە لە هەموو دۆخەکاندا لە هەمبەر ئەو توانایەی دەیبەخشی هەر هیچ نەبوو، سەرکەش سەرکەش بە ژیان پێیکەنێت. کار و پیشە نەما بە ڕۆژەکرێ کاری تێدا نەکات و ئارەقەی تێدا نەڕێژێت. جارێك دەتبینی نانەوایە و لە نانەواخانەدا کار دەکات. جارێکی تر جووتیارێکی بە دەستوبازووە و لە کێڵگەکاندا جووت دەکات و خەلەوخەرمان وەبەر دێنێت، یان مەڕومالات بەخێو دەکات و شوانکارەیە، یاخود دارکەرە و خەریکی دارفرۆشییە، یان دەتبینی چایچییە و لە چایخانەکان و سەر شۆستەکاندا چای دەفرۆشێت. ئەو بۆ خۆی ئارەزووی کاری تەلارسازیشی هەبوو، بۆیە بە خێرایی پیشەکە فێر بوو و شارەزاییەکی باشیشی لێ پەیدا کرد و هیوای دەخواست لەم کارەیدا بەردەوام بێت و درێژەی پێ بدات. بەڵام کاری تەلارسازی پیشەیەکی وەرزیانەیە و خەڵکی تەنها لە وەرزی هاویندا پێویستیان پێیەتی. هەروەها داواکاری لەسەر کاری تەلارسازی بەرەبەرە بە هۆی بەرتەسکبوونەوە و کەمبوونەوەی دروستکردنی خانوو لەبەر هەژاری و دەستکورتی لە کەمیدا بوو و شار کەوتبووە ژێر قورساییەکەیەوە. بۆیە هەر دەبوو ئەو

گەنجە بۆ بژێویی خۆی و کەسوکارەکەی داهاتێکی هەبێت. کاکیل بە هۆی ئەو کرێ کەمەی دەستی دەکەوت توانای پاشەکەوتکردنی برە پارەیەکی نەبوو بۆ ڕۆژی ڕەش، بۆیە بڕیاری دا ببێتە کاروانچی، ئەمەش پیشەیەکی زۆر ئەستەمە و پێویستی بە گەیاندنی کاڵا و خۆراك و کەلوپەل هەیە لەسەر پشتی هێستر و بەرزەوە بۆ گوندە دوورەدەستەکان، هەلومەرج و ئاو و هەواش هەرچییەك و هەر چۆنێك بێت، خاوەنی دوکانە بچووکەکانی گوندە دوور و دابڕاوەکانی ناو شاخەکان ناچار بوون بۆ بازاڕکردن و کڕینی کاڵا و پێداویستییەکانیان بە هێسترەکانیانەوە ڕوویان لە شارە خنجیلانەکەی کاکیل بکردبووایە. لەگەڵ هەندێکیان ڕێك کەوت کە کارئاسانییان بۆ بکات و پیداویستییەکانیان بۆ بگوازێتەوە گوندەکانیان، مەوداکەی هەرچەند دووریش بێت، ئەمەش وای کرد بۆ ماوەی چەندین شەو و ڕۆژ لە شارە خنجیلانەکەی دوور بکەوێتەوە و داببڕێت، لەم کارە زەحمەت و ناخۆشەش برە پارەیەکی باشی دەست دەکەوت، بەڵام کێشەکە لە دەگمەنبوونی کڕیارەکانی بوون، چونکە ئەو کاڵا و کەلوپەل و خۆراکانەی بۆ گوندەکان دەیگواستنەوە بۆ ماوەیەکی زۆر بەشی دەکردن و پێویستیان بە کاڵای نوێ نەدەبوو. بێبازاڕیی کاڵاکان و کەمیی قازانج وای لە خاوەن دوکانەکان کرد، سەرلەنوێ بیر لە دابینکردنی کرێی گواستنەوەی کەلوپەلەکانیان بکەنەوە، ئەمەش نەدەبوو، تەنها بە پشتبەستن بە خۆیان و دەستبەرداربوونی کاکیل. وەلێ ڕێگەکان لە بەردەم ئەم گەنجە خودان ئیرادەیە هەرگیز بە تەواوی دانەدەخران، وێڕای کەمیی کار، وەلێ ڕۆژێك لە ڕۆژان بەبێ ئیشوکار دانەدەنیشت و بە زۆرییش بووایە کارێکی بۆ خۆی مەیسەر دەکرد. لەو ماوەیەدا خوشکەکەی شووی کرد و ڕووی لە ماڵی مێردی کرد. بەمەش کەمێك باری کاکیل سووکتر بوو،

هەرچەندە ڕۆژێك لە ڕۆژان خوشکەکەی گلەیی لێ نەکردبوو. وا دیار بوو ئەو هەلومەرجە سەختەی کە لە لایەکەوە زۆریی ئازار و ئەشکەنجە دابوو، لە لایەکی دیکەشەوە بەزەیی پێدا هاتبووەوە و لە بەرانبەر ئەو توانایەی بەخشیبووی و ئەو دەستپاکی و سەرڕاستییەی هەیبوو پاداشتی بکات، ژیانی وشکی جوانتر و تەڕ و پاراوتریشی بکات. ئەوەتا کاکیلی گەنج لە گوندێك لە گوندەکانی ناوچەی ڕۆست بە دیداری کیژی خەونەکانی شاد دەبێت، کە دڵی کۆت و دیل کردبوو و جۆشوخرۆشی پێ دەبەخشی. ئیدی بووە گەڕیدەیەکی بەردەوامی ئەو گوندە و لەبەر خاتری خاترداران سەری پێیەکی هەر لەوێ بوو، ئەوەش بە مەبەستی ڕاوکردنی سەرنجی ئەو کیژە جوانەی خۆشی دەویست و ببووە ڕووگەی خەون و ئاواتەکانی، ئەو خۆشەویستەی کە وای لێ کردبوو هەست بە جوانیی دونیا بکات. ئەو خۆشەویستییەی لە ناکاو داگیری کرد و وای لێ کرد لە ناخەوە بهەژێت و هەر کە لە گوندی دڵخوازەکەی نزیك بکەوێتەوە دڵی بکەوێتە خورپە. خەیاڵ دەیبردەوە و لێدانی دڵی زیاتر دەکرد، جۆرە شڵەژانێك دایدەگرت هەر مەپرسە، نەیدەزانی لەو گوندە بمێنێتەوە یان بڕوات و بەجێی بهێڵێت، کاکیلی گەنج وا هەستی دەکرد ڕۆحی لەو گوندەدایە و ناتوانێ ماڵئاوایی لێ بکات. کەواتە مرۆڤ چۆن دەتوانێ بەبێ ڕۆحی خۆی ماڵئاوایی بکات؟! ڕەوشت و ناوبانگی کاکیلی گەنج لای خەڵکی ئەو گوندانە بە ئازایەتی و پیاوەتی ناسرابوو. وێڕای ئەو هەژارییەی هەیبوو، وەلێ ماڵباتێکی زۆری گوندەکان، بە ئاواتەوە بوون، ئەگەر ئەو بۆ هاوسەرگیری داوای کچەکانیان بکات، بێ سێ و دوو قایل دەبوون و پێشوازیشیان لێی دەکرد. ئینجا لەوە گرنگتر و زیاتر مرۆڤ چی دەوێت کە کچەکەی بداتە پیاوێك پارووە نانێکی

ئازادانە و ئابڕوومەندانەی بۆ دابین بكات و پێی ببەخشێت؟ ئەوەتانێ كاكیل لەگەڵماڵباتی كچە كە ناوی "حەلیمە" بوو یەكتر دەناسن و دواتر داوای دەكات، بێ ئەوەی هیچ موڵك و ماڵێكی هەبێت، جگە لە ناوبانگی باش و ڕەوشتی بەرزی نێو خەڵكی، كە وەكوو مارەیی پێشكەشی ماڵباتە هەژارەكەی بكات، ئەوانیش دەستی بە ڕوودا نانێن و داوای هیچ شتێكی لێ ناكەن، بەمەش "حەلیمە" دەبێتە هاوسەری. لەگەڵیدا ڕەنجی دەكێشا و تێدەكۆشا و منداڵەكانی بەخێو دەكرد و بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە پارووە نانێكی لەگەڵدا بەش دەكرد، ئاسوودە و بەختەوەر سەریان پێكەوەنابوو و لە ئاسۆیەكی گەشیان دەڕوانی، لە كاتی ئەو ئاستەنگی و زەحمەتییانەی دەهاتنە ڕێگەی و ڕووبەڕووی خێزانەكەیان دەبووەوە، پشتگیری دەكرد، بۆیە كاكیلی گەنج بە جۆرێكی وا پشتی پێ دەبەست هەر نەبێتەوە. نەخاسمە ئەو كاتانەی بە دوای پارووە نانێكەوە ئەم دێ و ئەو جێی دەكرد، متمانەی تەواوی بەوە هەبوو كە ژنێكی لاوازی بەجێ نەهێشتووە، توانای تەگبیری حاڵی خۆی و خانەوادەكەی نەبێت. بەڵكوو سێبەری خۆی لە حەلیمەی هاوسەریدا بەرجەستە كردبوو، خەڵكی لە گەڕەكە هەژارەكاندا ئەوپەڕی ڕێزیان لە خۆی و هاوسەرەكەیشی دەنا. چونكە وێڕای نەداری و دەستكورتیی خۆی، كەچی دەستی یارمەتیی بۆ ئەو كەسانەش درێژ دەكرد كە لە خۆی دەستكورت و نەدارتر بوون، ئەوانەی هەموو ڕێگەیەكی ژیانیان بە ڕوودا داخرابوو. هاوسەرەكەیشی هاوشێوەی پیاوەكەی خەم و ئازاری ئەو خەڵكە هەژارەی هەڵگرتبوو. ئەو گەڕەكەی ئەوانی تێدا نیشتەجێبوون لە هەژاری و نەداریدا هاوشێوەی یەكتری بوون، وەلێ هەژاری ڕێگەی بیركردنەوە و داهێنان ناگرێت، بەڵكوو وەك دەڵێن "پێویستی دایكی داهێنانەكانە". ئەوەتانێ كاكیلی لاویش هەوڵ دەدات

ماڵەکەی لەو گەڕەکە هەژارەدا جیاواز بێت، هەر کاتێك دەستی بەتاڵ بووایە بەردی جۆراوجۆری لە حەوشەی ماڵەکەیدا کۆ دەکردنەوە، پاشان بە داسەنە و پاچ دەکەوتە وێزەیان، وەك ئەوەی یارییان لەگەڵدا بکات. کەس سەری لەو کارەی دەرنەدەچوو، ئایا چی لەو بەردە داتاشراوانە دەوێت، تاکوو دواتر دەرکەوت کە دەیەوێ گەرماوێکی جوان و پڕ لە نەخشیان لێ دروست بکات، چونکە ئەو کاتە لە ماڵە هەژارەکاندا گەرماو نەبوو، بەڵکوو خەڵکی لە ژوورێك لە ژوورەکانیان خۆیان دەشوشت، ئەوەش بە جۆرێك بوو، کە بەشێکی ژوورێکیان بەتاڵ دەکرد و بە تەنەکەی بەتاڵی ڕۆنی خواردن، یان لەناو قەزانی گەورە ئاویان گەرم دەکرد و بە دوای یەکتریدا خۆیان دەشوشت. کاتێکیش بە داهێنانەکەی کاکیلیان زانی، ئیدی لە هەموو لایەکەوە دراوسێکان ڕوویان لە ماڵیان کرد و بە بینینی ئەو گەرماوە گەرم و دڵگیرە و بە بەردە نەخشێنراوەکانی سەرسام بوون. بەڵام ئەوانەی خۆیان بە خزمی نزیکی کاکیل دەزانی بڕیاریان دا هەموو کۆتاییەکی هەفتە پریاسکە و بوخچەی جلە خاوێنەکانیان هەڵبگرن و ڕوو لە ماڵی کاکیل بکەن، تاکوو چێژ لە خۆشوشتنی ئەو گەرماوە گەرم و خۆشە وەربگرن، حەلیمەی هاوسەریشی بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی دەکردن، بێ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕووی گرژ بێت، یان لچی خوار بێت، یان بچووکترین ناڕەزایی دەرببڕێت، بەڵکوو هاتنی دراوسێکانی بۆ خۆشوشتن لە گەرماوەکەیان، زیاتر ڕووخۆشی و دڵشادی پێ دەبەخشی، هەر بەو ڕووخۆشییەوەش چای بۆ لێ دەنان و چاوەڕێی دەکردن تاکوو تەواو دەبوون، ئینجا دادەنیشتن و دەستیان بە چاخواردنەوە و قسەی خۆش دەکرد، خواردنەوەی چاش دوای گەرماوکردن، لەگەڵ گفتوگۆ و سەربوردەی هەمەجۆر، لە ناخەوە مرۆڤ

دڵخۆش دەکات و بێزاری و دڵتەنگی لێ دەڕەوێنێتەوە، نەخاسمە لە ڕۆژانی زستان و بەفرباریندا. کاکیلی لاو لە کاتی دەستبەتاڵی و تەنیاییدا ڕێگەی دیکەی بۆ بەدەستهێنانی داهاتی زیاتر دەدۆزییەوە و دادەهێنا، چونکە ئەو داهاتە کەمەی هەیبوو بەشی نەدەکرد، نەخوازەڵا کە دراوسێکان تازە فێری ماڵیان بوون و ئەویش هەستی بە نەنگی و شەرم دەکرد، یەکێك بێتە ماڵەکەی و شتێکی نەداتێ. بۆ ئەمەش بیری لە کارێکی نوێ کردەوە، ڕووی لە ڕووبارەکە کرد و ئاوبەند و چاڵی بچووك بچووکی لە کەناری ڕووبارەکە دروست دەکرد و لە ڕێگەی جۆگەلەیەکی بچووکەوە دەیگەیاندەوە ڕووبارەکە، ئینجا قەرتاڵەی شێوە قووچەکی لە هەردوولا کراوە لە شوولە داری تەڕی بەڕوو دروست دەکرد و وەکوو تۆڕ و تەڵە بۆ ڕاوەماسی بەکاری دەهێنا، هەر کە ماسییەکان لەمسەرییەوە دەچوونە ناوییەوە زۆر زەحمەت بوو بتوانن بەرەو دواوە بگەڕێنەوە و دەربازیان بێت، بەمەش بە بەندکراوی لەناو قەرتاڵە قووچەکییەکەی ناو ئاوبەند و چاڵەکە دەمانەوە، کە ڕاوچییە لێهاتووەکە لە داوی خستبوون. کاکیلی خاوەن هزر و بازوو، ناوەناوە سەردانی تەڵەی ماسییەکانی دەکرد و کوڕە بچووکەکەشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، بۆ ئەوەی کات بەسەر ببات و لێشییەوە فێر بێت چۆن هێز و بەهرە و زانایی بەدەست دەهێنێت و بەرانبەر نەهامەتییەکانی ژیان چۆك دانادات، لەوەش زیاتر فێری دەکرد چۆن ڕێز لە ژیان و زیندەوەرەکانیشی بگرێت. داوای لە کوڕە بچکۆلەکەی دەکرد ماسییە بچووکەکان ئازاد بکات و بیانخاتەوە ناو ئاوی ڕووبارەکە، بۆ ئەوەی تەمەنێکی زیاتر بژین و گەورە ببن و ئینجا خەڵکی سوودیان لێ وەربگرێت. بەڵام ماسییە گەورەکانی کۆ دەکردەوە و دەیبردنە ماڵەوە. بەشی خۆی لێ هەڵدەگرت و ئەوەی دەشمایەوە و لە خۆیان زیاد دەبوو بەسەر دراوسێکاندا

دابەشی دەکردن، ڕووبارەکەش ئەوەندە بەخشندە بوو ڕۆژێك لە ڕۆژان دەستی بە ڕووی کاکیلەوە نەنا و نائومێدی نەکرد، ئەو مرۆڤە زەحمەتکێشە پەی بەوەش بردبوو کە هەتا شاخ و دۆڵ و دەشتەکانیش هیچیان لە ڕووبار کەمتر نین لە بەخشش و چاوتێری، تەنها ئەوەندەی دەوێ مرۆڤ هیممەت و ئحمێك بکات و ئەوەی دەیەوێت بەدەستی بهێنێت. بۆیە شاخەکانی دەوروبەری شارۆچکەکەی بووبوونە ڕووگەی و هەر کاتێك بیویستبووایە ڕووی تێ دەکردن و بەشی خۆی لە خێروبێرەکەی دەچنییەوە، بۆ ئەوەش فێڵێکی دانابوو بۆ ڕاوکردنی کەو و کەروێشك و ڕێوی، دوای ڕاوکردنیان دەیبردنە ماڵەوە و خواردنێکی باشی لێ دروست دەکرد و هاوڕێکانی داوەتی نانخواردن دەکرد، پێکەوە ژەمەخواردنێکی چەوریان دەخوارد، یان هەر لە ڕێگەوە بەشی ئەوانەی دەدا کە تووشی دەهاتن، ڕووبار و شاخ لە خێروبێرەکانی خۆیان هەموو شتێکیان بەش دەدا کە هەیانبوو، ئەویش بەشێکی ئەو خێروبێرەی بەدەستی دەهێنا، بە ئارەزووی خۆی بەوانەی دەبەخشی کە پێویستییان پێیەتی. وێڕای ئەوەی ژیانی بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە دەچوو، وەلێ لە بەشێکی زۆری خانەوادە هەژارەکانی دەوروبەری خۆی باشتر بوو، کەچی ترسی لە هەژاری و دەستکورتی بۆ ڕۆژێکیش ئاسوودەیی پێ نەبەخشیبوو. چونکە هیوای ئەوەی دەخواست داهاتی زیاتر بکات و ژیانی خێزانەکەی مسۆگەر و دابین بکات، لەبەر ئەوەی کەس نازانێت ڕۆژگار چی بۆ لە هەگبەدا شاردووەتەوە و چی چاوەڕوێی دەکات؟ ترسی گەورەی ئەو لە کوڕەکەی بوو، نەبادا ڕۆژێك تووشی هەمان هەلومەرجی خۆی ببێتەوە و دەستبەرداری خوێندن ببێت و بە دابینکردنی پاروە نانێکی ژیانەوە سەرقاڵ بێت و بە هۆیەوە هەموو خەونەکانی بکاتە قوربانی. کاتێکیش

وەرزی زستان بەر دەرکی ماڵی لێ گرت و بەفرێکی چڕ باری، کار لە شاردا کەمی کرد و نەما، بۆیە دەستی دایە لایتێکی بە پیل و ڕووی لەو شاخە سپییە کرد، کە ڕێك وەکوو ناخی خۆی سپی بوو، دوای ئەوەی کەمێك دەستکاری لایتەکەی کرد و زیاتر پەرەی پێ دا و وای لێ کرد شەش پیلی گەورە بخوات، بەوەندەشەوە نەوەستا گڵۆپە بچووکەکەیشی گۆڕی و گڵۆپێکی گەورەتری بۆ بەکار هێنا کە لەگەڵ وزەی ئەو شەش پاترییەدا بگونجێت، کاتێکیش شەو دادەهات و دونیا تاریك دەبوو، تیشکی بەهێزی گڵۆپەکە چاوی کەوی بن کەندەڵان و پەنای تاشەبەردەکانی لێڵ و نابینا دەکرد و کاکیلیش بە نووکی پێ دزەی بۆ دەکردن و کاتێکیش لێیان نزیك دەبووەوە و تەنها چەند مەترێکی دەما دەستی بیانگاتێ، لایتەکەی لە دووڕ چاوی دەدان و کەوەکانیش لە تاوی ڕۆحی خۆیان دەپەشۆکان و نەیاندەزانی ڕوو لە کوێ بکەن و چۆن خۆیان دەرباز بکەن، ئیدی زیاتر خۆیان دەپەستایە پەنای یەکتر و ئەشکەوت و تاشەبەردەکانیان دەکردە پەناگەی خۆشاردنەوە، وەلێ لە هەمبەر چوست و چالاکیی ئەو کوڕە گەنجە، خۆیان بەدەستەوە دەدا و ئەویش بە ئاسانی ڕاوی دەکردن و لە قەفەسەکەی دەهاویشتن.

بەڵام کاکیل دوای ئەو ڕاوکردنانەی، جارێکیان تایەکی توند و دژوار ڕووی تێ کرد و فڕێی دایە ناو جێگە، بە جۆرێك جەستەی وەکوو "بی"ی ناو ئاو لە سەرمان هەڵدەلەرزی. حەلیمەی هاوسەری بە شۆربایەکی باش و بەتام و بایەخپێدان و ئاگالێبوونی زیاتر وای لێ کرد بەسەر نەخۆشییەکەیدا زاڵ بێت، هەر لەو نەخۆشکەوتنەیدا جارێکیان هاوسەرەکەی پەرداخێك ئاوی گەرمی پێشکەش کرد و پێی گوت: "ئەم ئاوە گەرمت دەکاتەوە و ئەو سارد و سەرمایەی جەستەت دەرەوێنێتەوە".

ئەویش بە قسەی کرد و دوای خواردنەوەی ئاوەکە، پەرداخی دووەمیشی بە دوادا هات و تەواو هەستی بە ئاسوودەیی کرد، دەنگە نووساوەکەی خەریك بوو ساف و خۆش دەبوو. هەر بەوەندەشەوە نەوەستا خەندەیەکی بۆ کرد و بە سینییەکی بچکۆڵەوە بۆ لای هات، سینییەکی سادە، بەڵام موژدەی چاکبوونەوەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو: دوو هێلکەی نیمچە کوڵاو، کەمێك خوێ، پارچە نانێك، دیاری و موتفەڕکی دەستی حەلیمەخانە و بۆ باوکی منداڵەکانی بوو. هەر خۆیشی بە کەوچکی چایەکە لای سەرەوەی توێکڵی هێلکەکەی کەمێك قرنجاند و کەمە خوێیەکی پێدا کرد و خانمانە دایەدەستی تاکوو بیخوات، کاکیلی باوك سەیرێکی کوڕە بچووکەکەی کرد و داوای لێ کرد پاروویەکی لەگەڵدا بخوات، وەلێ هاوسەرەکەی ڕازی نەبوو، بە نیگەرانییەوە گوتی: "ئەو نانی سبەینێی خواردووە. وازی لێ بێنە، بایەخ بە خۆت بدە، ئەمە تایبەتە بۆ تۆ، نانی ئاسایی نییە دەرمانە دەرمان! تۆ زیاتر پێویستیت بەم دوو هێلکەیە هەیە. ئیدی ئەویش لە شوێنی قرنجاندنی هێلکەکەوە کەوچکەکەی هاویشتە ناو هەناوی هێلکەکە و زەردێنە و سپێنەکەی لەگەڵ یەکتریدا تێکەڵ کرد، پاشان هەر بە شلی فڕی کردن. ئینجا کەوتە کرۆشتنی لەتە نانێکی بچووك. پاشان سینییەکەی لە پێش خۆی دوورخستەوە، وەك ئەوەی پێیان بڵێت ئیدی ئەو تێری خواردووە و بە زیادی کەن. هاوسەرەکەی ڕووی تێ کردەوە و گوتی: "خواردنەکەت تەواو بکە، تۆ دوو ڕۆژە هیچت نەخواردووە". کاکیل لەژێر لێوەوە: "تەواو تێر بووم، ناتوانم، بەڵام زۆرم حەز لە کلۆ قەندێك و چایەکی گەرمە"، پاش خولەکێك کاکیل دوای ئەوەی کلۆ قەندێکی بچووکی لەسەر زمانی دانا و فڕە چایەکی تاڵی بەسەردا کرد، کەوتە فڕلێدانی چایەکەی و بە ڕوویەکی خۆشەوە و وەکوو

پاداشتێك بۆ هاوسەرەكەی گوتی:

حـەلیمەی من چیاییـــــە

دەست و پەنجەی خەناییە

نەخۆشم و ئاگای لێم نییە

پێم بڵێن چاری من چییە؟

هاوسـەرەكەی بە زەردەخەنەیەكەوە و وەك ئەوەی گـاڵتەی لەگەڵ بكات پێـی گـوت: دەی لێمـان بـووی بە گـۆرانیبێژیش، سوپاس بۆ خوا تایەكە بە خێرایی بەری دای، دوێنێ شەو تۆقت بردم. هەموو جەستەت گڕی گرتبوو. ڕوخسارت تەواو شێواو و تێك چووبوو. قسـەی زۆر سـەیرت دەكـرد، پـێ دەچـوو وڕێـنە بكەیـت، لە ڕاسـتیدا زۆر لێـت ترسـام". ئەو لەگەڵ بیسـتنی ئەو قسـانەی هاوسـەرەكەی چـاوی بە ژوورەكەدا دەگێـڕا و دڵیشـی لای قسەكانی ئەو بوو، وەك ئەوەی بە دوای شـتێكدا بگەڕێـت. پاشان دەستی بۆ كوڕەكەی درێژ كـرد، كە لەو كـاتەدا هەسـتی لەو گفتوگـۆ سـەیرەی دایـك و بـاوكی ڕاگرتبـوو، كـوڕەكەی تێگەیشـت كە بـاوكی دەیەوێـت لە ئامێزی بگرێـت، تـاكوو لە كانیـاوی خۆشەویسـتی و سـۆزی بـاوك و كـوڕایەتی تێـر تێـر بخواتەوە. چەند هەنگاوێك لەسەر چۆكی هاتەپێش و بێ ئەوەی هەسـتێتە سـەر پـێ لەسـەر ئەو زەویـیەی بە مـافوور داپۆشـراوە. باوكەكە باوەشی پێدا كرد و كوڕەكەیشی شانەكانی باوكی توند توند گوشی و خۆی پێـوە نووسـاندبوو، هەسـتێكی بـێ ئەنـدازە خۆشی دەبەخشییە هەردووكیـان، تـێكەڵەیەك لە خۆشەویسـتی و دڵنیایی. كاكیـل بە ڕوویەكـی خۆشـەوە و بـۆ دڵخۆشـكردنی بە منگەمنگەوە لە هاوسەرەكەی پرسی:

- ئەرێ وەرە خاتوون، بە ڕاست وڕێنەی چیم دەكرد؟!

حەلیمە هەوڵ دەدات قسەکانی ئەوی بیر بکەویتەوە:

- هیچ، هەرگیز. تەنها هەندێك قسە و هیچی تر ئەوەش بە هۆی تایەکەتەوە بوو.

- دەمەوێ ئەو قسانە بزانم!

- بۆ نموونە دەتگوت: دەتەوێ بەفر لە چیا بچێنیت و لە وەرزی دروێنەشدا پارەیەکی زۆر کۆ بکەیتەوە... قسەی لەو جۆرە!

کاکیل پێکەنی و دڵی پڕ بوو و بە قسەی خۆش بە هاوسەرەکەی گوت:

- بەڵام من وڕێنەم نەکردووە. بەڵکوو هەر بە ڕاستی ئەو قسانەم دەکردا!

- ئەوەتا ئێستا دیسانەوە تۆ گاڵتە دەکەیت.

- نا نا بڵێ وڕێنە دەکەیت، باوەڕ بکە، نە شۆخی دەکەم و نە گاڵتەش... لەوانەیە قسەکانم کەمێك سەیر و شاراوە و تەمومژاوی بن، بەڵام لە تێکڕای ئەو قسانەی کردوومن مەبەستی تایبەتیی خۆم هەبووە.

- ئەیەڕۆ پیاوەکە ئەمە چۆن دەبێ! قسەیەکی تر بکە.

کاکیل بە پێکەنینەوە گوتی:

- کەواتە تۆ باوەڕت بە قسەکانم کردووە، ئەی بۆ بەملا و بەولامدا دەبەیت... وا دیارە منت بە شێت داناوە!

- دوور لە تۆ! بەڵام بەرزبوونەوەی تا وا لە نەخۆش دەکات هەموو شتێك بڵێت.

- کچێ خۆ ئێستا نەخۆش نیم و لەوپەڕی ئاگاییمەوە

دەدوێم و تاش بەری داوم... چی دەڵێی ئەگەر ئێستا بڵێم هەر بە ڕاستی بەفر لە چیا دەچێنم و لە هاویندا کۆی دەکەمەوە و داهاتێکی باشمان لێ دەست دەکەوێت.

حەلیمە وەڵامی نەدایەوە و بە دوودڵی و نیگەرانییەوە سەرنجی دەدا، پاشان بە منگەمنەگێکەوە:

- بە سادەیی عەقڵی خۆم لەگەڵم بکە، مێشکم تێك مەدە، بیرۆکەکەی خۆتم بۆ ڕوون بکەوە.

کاکیل کە ڕوخساری بزە و خەندەیەکی پڕ لە میهر و خۆشەویستی دایپۆشیبوو، گوتی:

- گوێم لە خەڵکی بووە لە جیهاندا هەندێك وڵات پەنا بۆ هەموو شتێك دەبەن، نەك وەکوو ئێمە.

- چ وڵاتێك؟! مەبەستت ئێران یان سعوودیەیە.

- نە ئێران و نە سعوودیەش. هە... تۆ ئەمانە بە وڵات دادەنێیت؟

- سعوودیەماڵی خوای تێدایە.

- گرنگ نییە... من دەربارەی ئەو وڵاتانە دەدوێم کە فڕۆکە و ئۆتۆمبیل و هەموو شتێکیان دروست کردووە.

هاوسەرەکەی بە سەرسامییەوە گوتی:

- ئایا ئەو وڵاتانە بەفریان چاندووە؟! هەهەهەهەهە! دەبا بۆ ئێرەش بێن و ئەم هەموو بەفرە بە خۆڕایی بۆ خۆیان ببەن.

کاکیل بە مەبەستی گەیاندنی بیرۆکەکەی بە هاوسەرەکەی گوت:

- ئەو وڵاتانە بەفر ناچێنن و هیچ پێویستیشیان پێی نییە.

هەموو شتێکیان هەیە، بەڵام دەزانی چی دەکەن؟

- چی دەکەن؟!

- خۆڵ و خاشاکی هەموو وڵات کۆ دەکەنەوە و شتی زۆر بە سوودی لێ دروست دەکەن.

- تۆ گاڵتە دەکەی؟! ئاخر لە خۆڵ و خاشاک چی دروست دەکرێت؟!

- هەرگیز گاڵتە ناکەم، بەڵام ناتوانم ئەمەت بۆ ڕاڤە و شی بکەمەوە، لەبەر ئەوەی هەتا خۆمیش نازانم چۆن ئەمە دەکەن. وەلێ بەهەرحاڵ هەموو شتێك دەکەن.

- باشە، بەڵام خۆڵ و خاشاك چ پەیوەندییان بە کشتوکاڵ و چاندنی بەفرەوە هەیە؟ تۆ ئەوەم بۆ ڕوون بکەرەوە!

- هیچ پەیوەندییان نییە. بەڵام ویستم بیرۆکەکەت کەمێك بۆ ئاسانتر بکەم، تا لێی حاڵی ببیت، ویستم ئەوەت پێ بڵێم هیچ شتێك بەرانبەر توانا و خواستی مرۆڤ مەحاڵ نییە، ئەگەر بڕیاری ئەنجامدانی کارێك بدات، هەر دەیکات و هێز نییە ڕێی لێ بگرێت.

- باشە... بەڵام چۆن بەفر... ئاخر بەفر چۆن دەچێندرێت!

- ئەزیزم من مەبەستم چاندنی بەفر نییە، وەکوو چۆن گەنم و جۆ دەچێندرێت، جگە لەوە ئێ باشە بۆ بیچێنین لە کاتێکدا دەبینین هەموو شتێکی دەوروبەرمانی داپۆشیوە و لە سرووشتەوە وەکوو دیاری پێمان بەخشراوە؟ من مەبەستم ئەوە بوو کردارێکی هاوشێوەی ئەمە هەیە، ئێستا تێدەگەیەنم چۆن؟ ئەم بیرۆکەیەم کاتێك بۆ هات، کە لەناو بەفر و بن تاشەبەردەکان خەریکی ڕاوە کەو بووم... تۆ دەزانی ئاوی

خـواردنەوە هاوینـان گەرم دەبێـت، هەرچەنـدە جەڕە و کـووپە گڵێنەکان ئاوەکە سارد بکەنەوە، بەڵام هەر بە گەرمی دەمێنێتەوە و چێژێکـی وای نابێـت و مـرۆڤ بە خـواردنەوەی تینـویتی ناشکێت، وەك ئەوەی لە ئاوی ساردا هەیە. ئەوەشیان گوتـووە کە لە شـارە گەورەکـان کـارگەی زل و قەبە هەن بـۆ دروسـتکردنی بەفـر. لەنـاو قـالبی گەورە لە ڕێـگەی تەزووی کارەباوە ئاوەکە دەبەستێت و دەبێتە بەفر. پاشان پـارچە پـارچەی دەکەن و هەر پارچەیەکی لە دوو بست زیاتر نەبێت، یـان هەتـا بە ئارەزووی خۆیان، ئینجا دەیفرۆشنە خەڵکی، ئەوانیش کیسە و فەردەی بەتاڵی ساوەر و ئاردی لێ دەئاڵێنن و تا مـاوەیەکی زۆر ناتوێتەوە، دواتر دەیخەنە ناو سندووقی دارینەوە و هەندێك ئاو و هەتـا هەنـدێك سـەوزە و میوەشـی پـێ سـارد دەکەنەوە ئەگەر هەیانبێت. من بیرم لەوە کردۆتەوە کە بەفـری زۆری چیاکـان لە چاڵێك کۆ بکەمەوە کە ڕاستەوخۆ تیشکی خۆری نەگاتێ، ئینجا بە بـاگردێن بیکـوتمەوە و بـکەومە سـەری، یـان بە کوتەکێـك دەیکوتم بۆ ئەوەی بەفـرەکە بچێـتە پـاڵ یەك و تونـد بێـت و بە خێرایـی نەتـوێتەوە. بیـرم لەوەش کـردۆتەوە بە کـا و پووشوپەڵاشیش دایبپۆشـم، بەمەش دەبێـتە کۆگـایەکی گەورەی بەفـر و بە درێژایـی وەرزی هـاوین دەمێنێـتەوە. هەرچەنـدەش بتوێتەوە، بەڵام بایی پێداویستییەکانی شاری هەر تێدا دەمێنێتەوە. ئەو کـاتە ڕۆژانە لە شـاخەوە دەیهێنینـەوە و پـارچە پـارچە بە نرخێکی هەرزان بە دانیشتوانی شاری دەفرۆشین، ئەوانەی پارەی کڕینی بەفرەکەشیان نەبوو، بە خۆڕایی بەشی خۆیانیان دەدەینێ، ئیدی خەڵکی شار چێژ لە خواردنەوەی ئاوی سارد وەردەگـرن. ئێستا لە بیرۆکەکە تێگەیشتیت؟ هاوین دەبێتە وەرزی دروویـنەی بەفر هەههههە.

چـاوی هاوسـەرەکەی دەبریسـکانەوە و بە سەرسـوڕمانەوە بزەیەکی هاتێ. بەڵکوو یادگەی بەرەو ئەو لێکدانەوەیەی برد کە چۆن شاخێك لە بەفر دەکەنە کۆمەڵ و ئینجا دەیگۆڕن بۆ پـارە. لەژێر لێوەوە:

- کەواتە ئەوهـا! هەر بە ڕاسـتی بـاوەڕ و متمانەشـت پـێ دەکەم. بیرۆکەیەکی زۆر گرنگە.

کاکیل گوتی:

- هەر کە تایەکە بە تەواوی بەری دام، یەکسەر شوێنێکی گونجـاو بـۆ ئەم پـڕۆژەیە دەستنیشـان دەکەم. کە زۆریـش لە قەدپاڵی شاخەکەوە دوور نەبێت، بۆ ئەوەی گواستنەوەیشی ئاسان بێت. ئینجا دەبینی چۆن خەڵکی پـێش ڕۆژێـك نـۆرە بـۆ پـارچە بەفرێکی کارگەی بەفری کاکیل دەگرن، چونکە لە یەك کاتـدا من توانای دابینکردنی بەفرم بۆ هەمووان نابێت.

- منـیش لە پەسـتاندنەوەی بەفـرەکە یارمەتیـت دەدەم. بەڵکوو هاوینیش بە سەر کڕیارەکاندا دابەشی دەکەم.

کاکیل بە دڵخۆشییەوە گوتی:

- دەستت خۆش بێت. مـن بەبـێ تـۆ توانـای ئەنجامـدانی هیچ شتێکم نییە، بەڵام تۆ خۆت لە ماندوێتیی ئەم کارە بە دوور بگرە. ماندوێتی کاری ماڵەوە کە هەرگیز کۆتایی نایەت بـۆ تـۆ بەسە. ئەو کاتانەی بە ماندوێتی و شەکەتی لە کـار دەگەڕێـمەوە پـارووە نـانێکم بـدەرێ، ئەوە کـارێکە بە هـیچ نرخێـك پێـوانە ناکرێت.

خەونی جوان بوون، ئەو دەیویست بیانگۆڕێت بۆ ڕاسـتی و لەگەڵیانـدا بژێـت، بەڵام ئەوە پێویسـتی بە کـارێکی گـران و

توانایەکی گەورە و تواناپڕووکێن هەیە، ئەگەرنا. بیرۆکەکە هەر لە خەیاڵ دەمێنێتەوە. ئەو خەونانە هێز و وزەیەکی وایان پێ بەخشی، وا هەستی دەکرد بە تەنها توانای تێکشکاندنی چیایەکی گەورەی هەیە، وێڕای جەستە باریك و لاوازەکەی. هێندەی نەخایاند لە جێگەکەی هەستایە سەرپێ و جلوبەرگەکەی بەری ڕێکخست، چاوی هاوسەرەکەیشی بە وردی و پەرۆشەوە لە پایدۆزی جووڵەکانیدا بوون، ئەو سەرنجانەی بوونە دوودڵی کاتێك ئەو داوای لێ کرد توورەبەیەکی بچووکی بۆ بهێنێت و هەندێك پارچە نانی وشك و هەرچی پێخۆرێکی وشکیش بەردەست بێت بۆی بکاتە ناو توورەبەکەوە، ئاخر ئەو دەیویست ڕاستەوخۆ دەست بە هێنانەدیی خەونەکەی بکات. حەلیمە هەرچەندی کرد و کۆشا، بۆ ئەوەی لە بڕیارەکەی ساردی بکاتەوە، بەڵام لە بەرانبەر ئەو ڕژدی و سووربوونەی چۆکی دادا، لە تەنیشتی ڕاوەستا و لە خوا پاڕایەوە کە بۆچوونەکەی بگۆڕێت و ساردی بکاتەوە. بەڵام کاکیل کە هەر بۆ خۆی کەسێکی سەرسەخت و کەللەڕەق بوو، هیچی لەبەردەستدا نەبوو. جگە لە جێبەجێکردنی ئەو بیرۆکەیەی بەسەر مێشکیدا زاڵ بوو، هیچی تری لێ چاوەڕوان نەدەکرا. ئیدی هاوسەرەکەیشی دوای ئەوەی خوا وەڵامی نزا و پاڕانەوەکەی نەدایەوە و نائومێدی کرد، وازی هێنا و گوێڕایەڵی سووربوونی پیاوەکەی بوو.

کاکیل دەستیدایە جامانەکەی، ئەو جامانەیەی پارچە قوماشێکی چوارگۆشەی نەخشدار بوو، درێژییەکەی لە باڵێك زیاتر دەبوو، بە شێوەیەکی سێگۆشەیی نووشتاندییەوە، پاشان بە پانی چوار پەنجە تا ئەوسەری لوولیدا، ڕێك وەکوو ماری لێ هات. کڵاوەکەیشی لەسەر نا و ئەمسەرونەوسەری

جەمەدانییەکەی گرت و دوو جار لە هەوادا بای دا و ئینجا بە شێوەیەکی پیشەگەرانە و لێزانانە، لە دەوری سەروچاوی لوولیدا، لوولـدانێکی وا تەنهـا هەردوو چـاوی بەدەرەوە بـوون، هـیچ کوردێك بەو جۆرە کـڵاو و جەمەدانـی نەدەبەسـتەوە. مانـدوێتی پیاوەکە و سارد و سەرما وایان لـێ کردبـوو بە جۆرێـك خـۆی داپۆشێت وەك ئەوەی کەسێکی تاوانبار بێت و بـیەوێ خـۆی لە چاوی خەڵکی بشارێتەوە.

پاشان چەکی ڕاوەکەی و توورەبەی خواردنەکەی خستە ناو گـونییەکەوە. ژمـارەیەك گـوللەی زیـادەی چەکەکەیشـی خسـتە گیرفانەکـانییەوە. تـۆڕێکی چنراویشـی لە لقـی دارودرەخـت کە ڕێك لە نەعل دەچوو خسـتە ژێـر پـێڵاوەکەی، کە بـۆ ڕێکـردن لەسەر بەفر یارمەتی دەدا بێ ئەوەی پێی لە بەفرەکە نقـوم بێـت، بەفرماڵێکیشی بۆ کۆکردنەوە و ڕامالینی بەفر خستە سەرشانی.

ڕووی لە چیـای هەنـدرێن کـرد، ئەو چیـایەی لەوسـەری شارەکەیدا بە شکۆوە ڕەگی لە خـاك داکوتـابوو و سەریشـی لە ئاسمانێ، چەندین چاڵی بەردینی سرووشتیی گەورە گەورەیشـی لەخۆ دەگرت. کاکیل دوای کاتژمێرێك ڕێکردن: "ئەوەی ئێسـتا دەیـکەم تەنهـا پەسـتانەوەی بەفـرە کەڵەکەبـووەکەی نـاو چاڵەبەفرەکانە، تاکوو گەردیلە وردەکانی بەفرەکە زیـاتر بـاوەش بە یەکتریـدا بـکەن و ڕێـگە نەدەن گەرمـی بیـانتوێنێتەوە، دوای ئەوە لە دەوروبەری چاڵە بەفری دیکەی بۆ کۆ دەکەمەوە و تێی داوێم و سـەرلەنوێ دەیپەستمەوە و بەسـەریدا دێـم و دەچـم و پـاکوتێکی باشـی دەکەم، تـاکوو بە تەواوی دەپەسـترێتەوە". ناوەناوەش لە دوورەوە کەروێشکێك، یان ڕێوییەکی دەبینی و بە ترسـەوە تەماشـایان دەکـرد، لەوانەیە ڕێـوییەکە بیـری لەوە کـردبێتەوە: "دەبـێ ئەم پیـاوە لەم نـاوچە دابـڕاوە و لەم وەرزەی

ساڵ کە هیچ کەسێك نایگاتێ، چی بکات و بۆچی هاتبێت؟!"
بەڵام بەرلەوەی ڕێوییەکە وەڵامێك بۆ پرسیارەکانی وەربگرێت، گوللەیەکی کاکیل کەلـلەی سـەری ئـاگر دەدا و ساردی دەکردەوە، دواتر دەبووە شۆربایەکی بە تامی ناو مەنجەڵەکەی.

کەشــوهەوا بە بەردەوامــی لە گۆڕانــدا بــوو، خــۆرەکە چاوشارکێی لەگەڵ سرووشتە بەفراوییەکە دەکرد و جارناجار دەردەکەوت و تیشکی خۆی دەئالاندە قەدوبالای شاخ و دار و بەردی ناوچەکە، بەڵام سەرماکە هی ئەوە نەبوو مرۆڤ خۆی لە بەردەم تیشکی خۆرەکەدا گەرم بکاتەوە، هێندەی نەدەخایاند کزە بایەك هەڵی دەکرد و بەفرەکەی هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد و دواتر بەفرێکی زۆری دیکە دەستی پێ دەکردەوە، دڵی کاکیلی خۆشتر دەکرد و زیاتر لە ناخەوە دەیگەشاندەوە و لە پەستانی بەفرەکە سوورتری دەکرد. دوای چەندین کاتژمێر هەڵبەز و دابەزی پەستانەوەی بەفرەکە هەستی بە ماندوێتییەکی بێ ئەندازە دەکرد و بەو سەرماوسۆڵە تواناپڕووکێنە ئارەقەی ڕەش و شینی دەردەدا، بە ناچاری بەرلەوەی تاریکی پەلاماری ڕووناکی بدات و شەودابێت، بڕیاری گەڕانەوەی دا. هەر کە گەیشتەوە نزیکی ماڵ بینی حەلیمەی هاوسەری بە نیگەرانی و دڵەڕاوکێوە لە بەردەم دەرگا ڕاوەستاوە و پێ دەچێ لە خەمی گەڕانەوەی ئەودا بێت. بە بینینی شاگەشکە بوو، لە ناخەوە بەختەوەری ئامێزی پێدا کرد و ڕوخساری گەشایەوە و دڵەڕاوکێ و نیگەرانییەکەی ڕەوییەوە. بە ڕاکردن بە پیرییەوە چوو، ئەگەر لەبەر دابونەریتی کۆمەڵگە نەبووایە لەوانەبوو هەر لەوێ باوەشی پێدا بکردبووایە، وەلێ لە دڵخۆشییەوە باروبنە و ڕێوییە ڕاوکراوەکەی لێ وەرگرت، پیاوەکەی لە ڕوخساریدا ئەو خۆشی و شادییە منداڵانەیەی بە ئاشکرا بەدی دەکرد،

هەستی بەوە دەکرد کە لە کاتی نەبوونی ئەودا چ خەم و ناسۆر و ترسێکی بۆ چەشتووە. خەیاڵ و پرسیار لە مێشکیدا لە هەڵپەدابوون، لە خەیاڵی خۆیدا دەیگوت: دەبێ ئێستا ئەو لە کوێ بێت؟! چی بەسەر هاتبێت؟! خوانەخواستە ئەگەر تووشی بەڵایەك بوو چۆن بتوانێت سەروسۆراخێکی بزانێت و خۆی بگەیەنێتە لای؟! خۆ ئەگەر کەسێکی لەگەڵ بووایە کارەکە ئاسانتر دەبوو، چی دەبێ ئەگەر تایەکە بیگرێتەوە؟! چی ڕوو دەدات ئەگەر ببووریتەوە و ئاگای لە خۆی نەمێنێت؟! ئەی چی ڕوو دەدات ئەگەر ورچێکی برسی پەلاماری بدات؟! ئەمانە و دەیان پرسیاری تر مێشکیان دەرزیئاژن دەکرد و بۆ ئەو هەموو پرسیارە، تەنانەت وەڵامێکیشی دەست نەدەکەوت.

کاکیل چووەماڵەوە، ئامێزی بە کوڕەکەیدا کرد. ماچێکی لەسەر گۆناکانی نەخشاند و تێر بۆنی کرد. دەستی بەسەریدا هێنا و لێی پرسی: هیوادارم ئەو کاتەی من لە ماڵ نەبووم بایەخت بە دایکت دابێت و بێزارت نەکردبێت. کوڕەکە ترس و دڵەڕاوکێکەی ڕەوییەوە و لەژێر لێوەوە وەڵامی دایەوە: نەخێر.

حەلیمە خاولی و جلوبەرگی خاوێنی بۆ پیاوەکەی هێنا و بەرلەوەی ڕوو لە گەرماوەکە بکات، پشکۆی ژێر مەنجەڵی گەرماوەکەی جۆش دایەوە، کە ماوەیەك بوو لێ نەدەگەڕا خامۆش بێت. گەڕایەوە و داوای لە پیاوەکەی کرد بچێتە گەرماوەکە، بۆ ئەوەی دوای ڕۆژێکی ڕەبەق لە کارکردنی گران لەناو ئەو بەفر و سەرماوسۆڵەیە، چێژێك لە گەرمی و هالاوی گەرماوەکە وەربگرێت، کاکیل هەر کە ڕووی لە گەرماوەکە کرد، وا هەستی دەکرد سەرماوسۆڵەی تەواوی ئەو ڕۆژە بە مۆخی ئێسکەکانیدا ڕۆ چوونەتە خوارێ و لەگەڵ ئەو ماندووبوونەی هەیبوو دەڕەوینەوە و نەدەمان.

حەلیمە ڕووی لە ژووری دانیشتن کرد و لەسەر پارچە نایلۆنێک دەستی بە ئامادەکردنی خواردن کرد، ئەو زەوق و سەلیقەیەکی سەیری لە ڕازاندنەوەی ناوماڵ هەبوو، شوێنی دانیشتنی مێوانەکانی پڕ لە سەرینی کوردیی ڕەنگاوڕەنگ کردبوو، تاکوو ئەوەی دادەنیشێت هەست بە ئارامی و پشوودان بکات، سۆبەکە وا گڕی گرتبوو نێڵەی ئاگری دەهات، ژوورەکە بە جۆرێك گەرم بووبوو مرۆڤ دوای کەمێك دانیشتن تیایدا هەستی بە باوێشکدانێکی بەچێژ دەکرد و هێندەی نەدەما خەو بیباتەوە. نەخاسمە دوای خواردنێکی چەور، لەو خواردنەی حەلیمە دروستی دەکرد، وێڕای شۆربا گەرم و بەتامەکەی، شیوی ساوەرەکەیشی لەناو قاپە بەلەمییەکە و گۆشتی ئەو کەوەی ڕۆژانی پێشتر ڕاوی کردبوو و گۆشتاوەکەیشی بۆ لە قاپێکی تر کردبوو، زەڵاتە و نانە تیرییەکەی لەسەر خوانەکە دانابوو. کابانێکی کارامە و لێهاتوو بوو، دۆیەکەیشی لە یاد نەکردبوو، چونکە دەیزانی پیاوەکەی زۆری حەز لە دۆیە، کەرەستەی چایەکەش لە نزیکی ئاگرەکەوە هەمیشە ئامادە بوو. ئاخر دانیشتنی ئێواران بەبێ خواردنەوەی چایە لەزەتی نییە، بە ڕاستی ساتەوەختی جوان و پڕ لە گەرموگوڕی و بەختەوەرییە کە ئەم خانەوادە بچووکە ئاوێتە و تێکەڵی خۆشییەکانی بوون.

هاوین هات. "وەرزی درووێنەی بەفر" سەرەتاتکێیەتی. کاتێك ئاوی خواردنەوەی شار گەرم بوو، کاکیل دەرفەتەکەی قۆستەوە و ڕووی لەو چاڵە بەفرانە کرد کە شەکەتی و ماندوێتیی چەند مانگێکی تێدا خەرج کردبوون، دەستی بە شکاندن و هەڵدانەوەی ئەو بەفرانە کرد کە تیشکی ڕۆژەکە لێی دەدان، تاکوو یەکەم جار کۆتایی بەوان بهێنێت. گواستنەوەکەیشی لەو هێز و توانایەی لە وەرزی زستاندا بەخشیبووی لە کۆکردنەوەی بەفرەکە کەمتر نەبوو. بەری ڕەنج

و ماندووبوونی خستبووە سەر پشتی هێسترەکەی. دەمودەست و بە خێرایی کاڵاکەی لە لایەن خەڵکییەوە دەکڕدرا و هیچی لێ نەدەمایەوە، بۆیە بە ناچاری جارێکی تر ڕووی لە چاڵە بەفرینەکان دەکردەوە و بەشێکی دیکەی لێ دەهێنایەوە و بە نرخێکی هەرزان دەیفرۆشتە دانیشتوانی شارە هەژارەکە، بەمەش هەمووان توانای کڕینیان هەبوو. ئیدی بەو کارەی کەمێك ژیانی بەرەو باشی ڕۆیشت.

بەڵام مرۆڤ هەرچەندە هەوڵی دەستەمۆکردنی هەلومەرج و بارودۆخی ژیانی بدات و خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێت، کەچی لە ناکاو بایەکی بەهێز هەڵدەکات و تێکڕای ئەو هەنگاوانە تێك دەشکێنێت کە وەکوو خەونێك هەوڵی هێنانەدیانی دەدا، پیاوێکیش هەڵگری خوو و هەڵسوکەوت و ڕەوشتی کاکیل بێت، هەرگیز چاو لە ئاست جەور و ستەم داناخات کە تووشی هەژارانی شار دەبوو. بێهوودە هەوڵی دەدا خۆی بداتە دەست گەشبینی و ئومێدەوە و کاروبارەکان چاکتر بن و دەسەڵاتی ڕژێمی داسەپاوی سەر ملی گەلانیش لەناو بچێت و نەمێنێت. خاکەکەیشی کوردستان لە نێوان وڵاتاندا بەش بەش و پەرشوبڵاو کراوە. مرۆڤیش بە سرووشتی خۆی ئارەزووی سەربەستی و ئازادبوون دەکات. مرۆڤی جیهانی سێیەمیش بە هۆی ئەو ستەمکارییەی هەمیشە لێی دەکرێت، گرێکوێرەی دەروونییان بەرانبەر داگیرکاری و ئیستیعمار لا چەکەرە و گەشە دەکات، بە جۆرێك وای پێ باشترە جەللادێکی نەتەوەکەی خۆی فەرمانڕەوایەتی بکات، نەك کەسێکی ژیر و دادپەروەر کە لە نەتەوەکەی خۆی نەبێت. ئایا چی دەبێت ئەگەر دەسەڵاتێکی دیکتاتۆر و چەوسێنەری دەرەوەی نەتەوەکەی خۆی فەرمانڕەوایەتی بکات؟! ئەو کاتە ستەم و زۆرداری چەند قات دەبێت و ژیانیش ئەستەم دەبێت. پاشان کاکیلی گەنج گەورە

بـوو، خەونەکانیشـی لەگەڵیـدا گەشـەیان کـرد و باڵایـان کـرد، خەمی گەورەی تەنها بە پەیداکردنی پـارووە نـانێکەوە نەوەسـتا، بەڵکوو ڕزگاربوون لەو ستەمکارییەی لە خەڵکی دەکرێت بـووە خەمـی گەورەی. هەر هەسـتکردنی بەو سـتەمکارییەش وای لـێ کرد بچێتە ڕیزی پێشـمەرگەکانەوە، کە بە هۆی دەسـتدرێژی و ستەمکارییەکانی دەسەڵات تا دەهات لە شاخ و دۆڵەکاندا زیـاتر و زۆرتـــر دەبـــوون. هەر کـــاتێکیش ســـەرکردایەتییان لەگەڵ حکـــوومەتە یەك لە دوای یەکەکـــان دانوســـتانیان بکـــردایە و ئاشتبوونایەتەوە، ئەگەر بە شێوەیەکی کاتییش بێـت بە مەبەسـتی وەرگرتنەوەی بەشـێك لە مافەکانیـان، هێـزە چەکـدارەکانیان ئەو ماوە بێدەنگییەیان دەقۆسـتەوە و دەگەڕانەوە لای خانەوادەکانیـان و ژیانێکی سرووشتییان دەست پێ دەکردەوە. بەڵام کەشوهەوای سیاسی هەمیشە لە ئـاڵوگۆڕی بەردەوامـدایە و ڕۆژێـك لە ڕۆژان لەسەر یەك شێوە نەمـاوەتەوە. کـاتێکیش لە کۆتـایی حەفتاکـانی سەدەی ڕابردوو دۆخەکە شڵەژا و تێك چوو، زۆربەیان ڕایانکرد و ڕوویان لە شاخ کـرد و دەسـتەی پـارتیزانیی جیاوازیـان پێـك هێنـا. ئەوەتـانێ کـاکیلیش کە تەمەنـی نـزیکەی شەسـت سـاڵ دەبێت، جارێکی دیکە دەچێتەوە ڕیـزی پێشـمەرگەکانی شـاخ، تاکوو ئەو ئەزموونەی ژیان پێـی بەخشـیوە ببەخشـێتە لاوان. دوا جار لەگەڵ دەستەکەی ڕۆسـتدا گیرسـایەوە و جێگیـر بـوو، کە زۆر بە خێرایی خۆشـیان ویسـت و متمـانەی تەواو و کـوێرانەی خۆیان پێ بەخشی و بەدوای هەنگاوەکانیـدا ڕێیـان دەکـرد، بـۆ هەر شـــوێن و جـــێگەیەك بچووبـــایە بەوپەڕی متمـــانەوە دوای دەکەوتن و لە قسەی دەرنەدەچوون، ئاخر ناهەقیـان نەبـوو، مـام کاکیـل کێوێـك بـوو لە کـرداری مرۆڤدۆسـتانە و کەسـێکی ئەزموونداری پڕ لە شکۆ و سەرووەری و ڕەوشتی بەرز بوو.

# بەشی هەشتەم

لە دووریی سێ کاتژمێرێك لە بارەگای دەستەکەی ڕۆست، کۆمەڵێکی سەر بە مام جەمال هەبوون. بارەگا و کەپرۆکەکانیان لە نێـوان ژمـارەیەك گونـدی نـاوچەکەدا دروسـت کردبـوو، گوندەکان هەر یەکە و نزیکەی کاتژمێرێك لە یەکترییەوە دوور بـوون. فەرمانـدەی دەستەکە کەسێك بـوو سی و پێنج سـاڵی تەمەنی تێپەڕاندبوو، هەمیشە خۆی بە باوان و بنەچەیەوە بادەدا و پێیـانەوە دەنـازی. بە خزمـایەتییەکی دووریـش دەگەیشـتەوە مـام جەمال، وەك ئەوەی خۆی بانگەشەی بۆ دەکرد و هەمیشە لێرە و لەوێ شانازیی پێوە دەکرد و گوندنشینەکانیش بۆیـان پشتڕاسـت دەکـردەوە، وەلـێ هەنـدێکیان ئەو نزیکییەیـان دەگەڕانـدەوە بـۆ ئەوەی گوایە باوکی لە خزمەتـی یەکێـك لە کەسـە نزیکەکـانی مـام جەمالـدا بـووە، نەك خزمـایەتی لەگەڵیـدا هەبێـت، ئەم پەیوەندییەش وای کردبـوو بـۆ هەر شـوێنێك بچێـت ڕێـزی لـێ بگیرێـت و بە شانوشـکۆوە خـۆی نمـایش بکـات و توانیبـووی نزیکیـی بـاوکی لەو خاوەنپـایەیە بقـۆزێتەوە و بە پلەوپـایە و بەرپرسـیارێتییەکاندا هەڵکشـێت. تـا گەیشـتە ئەو ئاسـتەی سەرپەرشـتی کـۆمەڵە پێشـمەرگەیەکی نـاوچەکە و ناوچەکـانی دەوروبەری سـەر بە هێزەکـانی مـام جەمـال بکـات، بەڵام بە دەگـمەن نەبێـت لە نـاوچەکەدا نەدەبینـرا، بەڵکـوو ئەگەر بگەڕابـووایەتەوەش، تەنهـا شـەوێك لە بارەگـاکەی دەمـایەوە. هەمیشـە بە هێزێکـی زۆرەوە لە گوندەکانـدا دەسـووڕایەوە. بارەگاکەشیان تەنها دە پانزە پێشمەرگەیەکی تێدابوو. ئەو هەمیشە

وەك دەڵێن پۆشتەوپەرداخ بوو، جلوبەرگێکی جوان و ڕێکی دەپۆشی، هەر خۆیشی نا، بەڵکوو ئەوانەی لەگەڵیشیدا بوون بە هەمان شێوە جلوبەرگی نوێ و جوانیان دەپۆشی. چەکەکانیشیان ئەوەندە تازە بوون وەك ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بەکار نەهێنرابن و تازە لە کارگەی دروستکردنی چەکەوە کارسازییان بۆ کرابێت، هێندە ڕەش و لووس و جوان بوون ڕێك لە زێروو دەچوون، بەهەرحاڵ جوانی و نایابیی چەکی بەرپرسەکەیان بۆ ئەوەبوو لەگەڵ جلوبەرگە هەمیشە جوان و نوێیەکەیدا بگونجێت و شکۆدارتر بکەوێتە بەر چاو. ئەوەتانێ دیسان ڕووی لە ناوچەکە کردووەتەوە، بۆ ئەوەی شکۆی خۆی و دەستەکەی بگەڕێنێتەوە، دوای ئەوەی لە لایەن جووتیارێکەوە سووکایەتی بە دەستەکەیەوە کرابوو. هەر کە دەستەکەی ڕۆست بەوەیان زانی ڕوویان لە گوندی ئەو جووتیارە کرد کە سووکایەتیی پێ کردبوون، نەبادا دەستدرێژی بکەنە سەر، وێڕای ئەوەی هەردوو دەستەکە بە دۆستایەتی و هاوڕێیەتییەوە بە دیداری یەکتری گەیشتن، وەلێ هێشتا سەرکردەکەیان ڕق و کینێکی زۆری بەرانبەر ئەو جووتیارە لە دڵدا مابوو، ئەو بەرپرسە هێندە بە لای گوندنشینانی ناوچەکەوە پەسەند و خۆشەویست نەبوو، ئەوەش بە هۆی ناوبانگی خەراپ و چڵێسییەوە. تەنانەت جووتیارەکان نازناوی "ڕبو جگارە"یان لێ نابوو. چونکە بەدڕەوشتیی ئەو بەرپرسە گەیشتبووە ئاستێکی ئەوتۆ بە بەرچاوی مێردەکەیەوە دۆستایەتی ئافرەتێکی یەکێك لە گوندەکان بکات، بێ ئەوەی هیچ سەنگ و بایەخێك بۆ ناووناوبانگی خۆی و هێزەکەیشی دابنێت. هەر کە دەگەیشتە ئەو گوندە یەکسەر لەگەڵ دوو پاسەوانی تایبەت و باوەڕپێکراوی خۆی ڕوویان لەو ماڵە دەکرد و داوای لە پیاوەکەی دەکرد بچێت لە دوکانی گوندەکە پاکەتێك جگەرەی بۆ بکڕێت، کاتێکیش جووتیارەکە

دەگەڕایەوەماڵەوە پاسەوانەکانی لە بەردەم ماڵەکەیدا ڕێگەیان لێ دەگرت. بە قسەوە سەرقاڵیان دەکرد، خۆ ئەگەر بە زۆریش هەوڵی چوونە ماڵەکەی خۆی بدابووایە، ئەوان ڕێگرییان لێی دەکرد، لە ترسی ئەوەی نەبادا گەورەکەیان لێیان تووڕە و دڵگران بێت، ئیدی کوڕە گەنجە هەرزەکارەکە بە تاسەوە سەیری چەکەکانیانی دەکرد و لە بەردەم ماڵەکەی خۆیدا بە بێدەنگی دادەنیشت، تاکوو ئەوەی تر حەز و ئارەزووە چڵێسەکانی خۆی تێر دەکرد.

ئەم حاڵەتە چەندین جار دووبارە دەبووەوە. تا وای لێ هات کوڕە گەنجەکە لە گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە خۆی دوا بخات، یان وێڕای دواکەوتنی لە گەڕانەوەی دەیبینی دەرگای ماڵەکەی داخراوە، ئیدی بە دڵی شکاوەوە دادەنیشت و پڕاوپڕ دەبوو لە سووکایەتی و بێئابڕوویی و هیچیشی لەدەست نەدەهات. لە ڕاستیدا ئەو بەدڕەوشتەی خزمی مام جەمال بوێریی ئەوەی نەبوو ئەو کارە لەگەڵ هەموو کەسدا بکات، چونکە جووتیاران و گوندنشینان، کێویکن لە ڕەوشت و پڕاوپڕن لە کەسایەتی، بەڵکوو زۆربەی قوربانییەکانی لەو بەدبەخت و سەرشۆڕ و بێبارانە بوون کە وا خۆیان دەناسی و خاوەن کەسایەتییەکی کەم بوون و هەمیشە خۆیان بە کەمتر و بچووکتر دەبینی. نەخاسمە ئەوانەی کەسایەتیی ژنەکانیان بەسەریاندا زاڵ بوو. ئەم پەیوەندییەش لەگەڵ ژنی ئەو گوندنشینە ئەو کاتە دروست بوو کە ئەبوجگارە لەگەڵ دوو پاسەوانی چووبوونە ئەو ماڵە بۆ میوانداری، وەك ئەوەی لە گوندە شاخاوییەکان باوە. ژنی خانەخوێ لە جوانی و شۆخوشەنگیدا بێئەندازە و کەسایەتییەکی بەهێزی دەبێت و وا لە پیاوەکەی دەکات کەسێکی پاشکۆ و ملکەچ، یان خزمەتکاری بێت و هیچی تر. لە ڕاستیدا ئەگەر ئەو

پیاوە تۆزێك جوامێری و پیاوەتی هەبووایە، هەرگیز ئەبوجگارە بوێریی ئەوەی نەدەکرد بەو جۆرە سەرشۆڕی بکات و ئابڕووی ببات. بەڵای گەورە ئەوەبوو ژنەکە خۆی ئەوەندە فێڵباز و زۆرزان بوو، ڕێی بۆ کابرا خۆش کردبوو، تاکوو چاوبازی لەگەڵدا بکات و دەستی لەگەڵدا تێکەڵ بکات. ڕۆژێك لە ڕۆژان کاتێك میوانەکەو هەردوو پاسەوانەکەی لە ماڵی خانەخوێیەکەیان دەربارەی هەموو بابەتێك دەدوان، ئەو پڕ بووبوو لە شانازی بە بوونی خزمی مام جەمال لە ماڵەکەی. ژنە گەنجەکە لە شوێنی خۆی هەستا و دەرگای سۆبە دارینەکەی کردەوە و پشکۆی ناو زۆپاکەی دەرکردە ناو ئاگردانی بەردەم زۆپاکە، کە چاڵێکی بچووك و تایبەت بۆ کۆکردنەوەی پشکۆی ناو زۆپاکە تەرخان کراوە. بۆ ئەوەی کتری و قۆری چایەکەی لەسەر دابنێت. ئەبوجگارەش بە تەنیشت زۆپاکەوە دانیشتبوو. سەرنجێکی گڕداری ئاڕاستەی چاوەکانی دەکرد. ئەبوجگارە پێویستیی بە خرۆشاندنی هەوەسبازی نەبوو، چونکە تەنها بێبەشبوونەکەی بەس بوو بۆ ئەوەی پشکۆی پیاوەتی بە داگیرساوی بمێنێتەوە. لە ناخیدا گڕکانی خۆر لە تەقینەوەدا بوو، خۆ ئەگەر بەسەریدا زاڵ بووایە دەیکردە خۆڵەمێش و بە تەواوی دەیکردە قەرەبرووت.

ژنەکە بەرلەوەی تیلەی چاوەکانی لێ بگوازێتەوە، دەستەواژەیەکی تەژی لە خرۆشاندنی ئاڕاستە کرد، گۆناکانی بە تیشکی ئاگرەکە سوور هەڵگەڕابوون، ڕێك وەکوو بڵێسەی بورکانێك. بە سەرنجدانێکی مەکربازانەوە:

- وریابە پشکۆکانم نەتسووتێنن.

پیاوەکە هەستی کرد وشەکانی وەکوو چزی دووپشکە پێوەیان دا و زیاتر ئارەزووەکانیان خرۆشاند و ئاڵۆشتریان کرد.

پاشان ڕۆیشت و مەقاڵەیەکی بچووکی هێنا، تا پڕی بکات لە پشکۆ و گەڕایەوە بۆ قوژبنی ژوورەکە لە نزیك کەرەسەی چایەکەوە دانیشت. پیاوەکەیشی لە نزیکییەوە دانیشتبوو و قاپێکی لە دار دروستکراوی سەیری لە بەردەم خۆی دانابوو، قاپێکی خڕ لە ناوەڕاستییەوە ستوونە دارێك هێندەی پەنجەیەك بەرز بووبووەوە، پارچە قەندەکەی لەسەر دادەناو بە چەکوچێکی بچووك کە تایبەت بۆ ئەمە دروست کرابوو، دەکردە پارچەی چوارگۆشە و بچووك بچووك. گوندنشینەکان لەسەر ئەوە ڕاهاتبوون کە پارچە قەندەکە بخەنە سەر زمانیان و چای تاڵیشی بەسەردا بکەن و ئینجا بە تامەوە بیخۆنەوە، هەندێکیشیان شەکری وردیان دەکردە چایەکانیانەوە و بە شیرینی دەیانخواردەوە. کاتێك قۆری چایەکە دەستی بە کوڵان کرد، ژنەکە هەڵیگرت و لەناو مەقاڵەکەی دانا. دوای نزیکەی پێنج خولەکێك چایەکە دەمی دا، ئینجا خانمانە زڕەی لە پیاڵەکانەوە هێنا و بە دەم قسەوە دەستی بە تێکردنی چایەکە کرد. ڕووی قسەکانیشی لە ئەبوجگارە بوو:

- چایەکەت بە قەند دەخۆیتەوە، یان حەزت لە شیرینییە؟

چاوی بڕییە ناو چاوەکانی و تێیگەیاند کە مادام ئەو ئارەزووی ئەوە دەکات، ئەویش ئامادە و لەسەر پێیە و بە جۆشەوە گوتی:

- هەڵبەتە حەزم لە شیرینییە.

سەرێکی پڕ لە واتای بۆ بادا و شەبەنگێکی زەردەخەنەی گاڵتەجاڕیانەش ڕوخساری داپۆشیبوو، وەك ئەوەی بڵێت: "کەواتە با ببینین".

قسە و تیروتوانجی ژنەکە تۆزقاڵێك سەرنجی مێردەکەی

ڕانەکێشا، مێردی چی؟! خۆ ئەو هیچ سەنگ و بەهایەکی بۆ دانانێت و هەر بایەخیشی پێ نادات. بەڵکوو هەتا بە چاوێکی سووکیشەوە تەماشای دەکات، وەك ئەوەی بێ بار بێت و شایانی ئەوە نەبێت مێردی ئەو بێت، ئاخر ئەو هێشتا تەمەنی نەگەیشتۆتە شانزە ساڵی، واتە هێشتا کوڕێکی هەرزەکارە و ماوەی دوو ساڵێکیشە هاوسەرگیرییان کردووە، وەلێ ئەو کاتە ئەو لە تەمەنی بیست و سێ ساڵاندا بوو. کوڕەی هەرزەکار دوای هاوسەرگیریکردنی لەگەڵیدا، ماوەی چەندین ڕۆژ بەجێی دەهێشت و بۆ لەوەڕاندنی بزنی ماڵی کابرایەك کە بە شوانی گرتبوویان ڕووی لەو دەشتودەرە دەکرد و نەدەگەڕایەوە ماڵ، ئەو خاوەن بزنەگەلەی کە لە بەرانبەر بڕە پارەیەکی کەم و چەند قاپە شیرێك شوانی بزنەکانی بۆ دەکرد. ئەویش لەو شیرە ماست و کەرە و پەنیری دروست دەکرد، زێدەباری ئەوەش، قورسایی کاری ماڵەوەیشی لە ئەستۆ بوو، ئەرکی ئاودان و خزمەتکردنی ئەو چەند بنە گوێز و میوە جیاوازانەیشی لە ئەستۆ گرتبوو کە لە قەدپاڵێك و لە باوانییەوە بۆی مابووەوە و نزیکەی نیو کاتژمێرێك بە پیادەڕۆیی لە ماڵەکەیەوە دوور بوو. لە کاتی پێگەیشتنی درەختەکانی بەری میوەکانی لێ دەکردەوە و خۆشاوی لێ دروست دەکردن، بەڵام بەری گوێزەکەی هەڵدەگرت بۆ زستان و ئەوەیشی لێی زیاد دەبوو لەگەڵ دوکانداری گوندەکەیان دەیگۆڕییەوە، کە ئەویش جووتیارێکی هەمان گوند بوو، ژوورێکی بچووکی کردبووە دوکان و هەندێك کاڵا و خۆراك و پێداویستیی ئەوتۆی تێدا دادەنا کە گوندنشینەکان پێویستیی زۆریان پێ بوو، زۆربەی کاڵا و کەلوپەلەکانی دوکانەکەیشی لە لایەن ئەو کەسانەوە دەکڕدران کە بە وڵاخەکانیانەوە بەوێدا هاتوچۆیان دەکرد. ئەو ژنە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەستی بەوە نەکردبوو کە مێردی هەیە، تەنها وەکوو دابونەریتێکی باوی

کۆمەڵگە خۆی پێوە بەستبووەوە و بەوپەڕی گۆشەگیرییەوە پێکەوە دەژیان، ئەو ئامۆزای خۆی بوو. خانەوادەکەی پێش چەندین ساڵ لە ئەنجامی ڕاگواستنی گوندەکان و کاولکردنی ماڵ و خانووەکانیان بە بەهانەی پاراستنی پشتێنی سنوور، لە لایەن ڕژێمەوە تووشی قڕکردن و لەناوچوون هاتبوون، ئەو کاتانەی ڕژێم پیاوە دڕندە و چڕنووك بە خوێنەکانی خۆی دەناردە سەر ئەو گوندە ئاشتیخوازانە و بە ڕژانی خوێنی هەژاران و نەدارانی ئەو گوندانە نەبووایە تینوێتییان نەدەشکا، بەمەش تەنگیان بەو خەڵکە بێدەسەڵاتە هەڵدەچنی و ژیانیان لێ دەکردنە دۆزەخ، هەتا زۆربەیان نەیاندەزانی ئەم هەموو دەرد و بەڵایە چییە دادەبارێتە سەریان و لە کوێوە دێن، لە کاتێکدا ئەوان لە دوورترین خاڵی دوورەدەستی جیهان و شارستانییەتیش گۆشەگیر و دابڕاو بوون؟ چییان کردووە و چییان لەدەست هاتووە تاکوو ڕژێم بەم جۆرە ئازاریان دەدات و ئاوا تاڵاوی مەرگیان بە گەروودا دەکات؟! خاوەن بەختیش ئەوە بوو لە دانیشتوانی ئەو گوندانە لە ژیاندا مابن و بۆ باشووری وڵات ڕاگواسترابن، بە مەبەستی ئەوەی نەوە لە دوای نەوە لە ڕووی نەتەوایەتیشەوە بیانتوێنێتەوە، ئەمەش لە ڕوانگەی ئەو فەلسەفەیەی کە دەڵێت مرۆڤ کوڕی ژینگەکەیەتی و چۆن پەروەردە بکرێت وای لێ دێت، بە دوورخستنەوەشیان لە ژینگەکەیان ئیدی نەوەی نوێ شتێکی ئەوتۆ دەربارەی کولتووری باوان و شتە دێرینەکان نازانن، تەنها کەمێك نەبێت، ئەوەش لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار لەوانەیە هەر نەمێنێت. لە ڕاستیدا دەسەڵات تا ڕادەیەك لەمەیاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە تاواندنەوەی هەندێکیان لەناو بۆتەی عەرەباندن، بە جۆرێك هەتا هەندێکیان گەیشتنە ئەو ئاستەی نەتوانن بە زمانی نەتەوەکەشیان بدوێن، بەڵکوو لە نەتەوەکەی خۆیان داماڵێندران و تا ڕادەیەك خەم و

ئەندێشەکانیان کەم بووەوە، ئەوەش دوای ئەوەی کەس لەگەڵ نەتەوەی سەردەست جیاوازییان ناکات و بە چاوێکی دوژمنکارانەوە سەیریان ناکەن، ئەمەش کارێکی سرووشتی بوو لە نێوان نەوە دوای نەوەی ئەوانەی ئەو کرداری پاکتاوی نەژادییەیان دەرهەق کرا و چیتر نەوەکانیان هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانییان نەمێنێت و هەتا زمانی دایکیشیان لە بیر بچێتەوە، بەڵام ئەوانەی وەکوو خۆیان مابوونەوە و ستەمی دەسەڵات نەیتوانیبوو کاریان تێ بکات، ئەوەی کەمێك باری دەروونیی ئەو خەڵکە ڕاگواستراوەی خۆش دەکرد، بەزەیی و سۆزی خەڵکی بوو لەگەڵیان، چونکە تێکڕای گەل بە دەست جۆرەها جەور و ستەمی دەسەڵاتەوە دەیانناڵاند. بە جۆرێك حاڵ گەیشتبووە ئەوەی گەردەلوولی کوشتن و گرتن جیاوازی لە نێوان نەتەوەکاندا نەکات. چونکە سیاسییەکان و بازرگانانی شەڕ و کاولکارییەکان، بە یەك چاو و لە گۆشەنیگای بەرژەوەندییەکانیان و چاویلکەی ڕەشی مانەوەی دەسەڵات و قۆرخکارییەکانیان سەیری هەموانیان دەکرد.

بەشی ئەم ژنە بەدبەختەش لەناوچوونی تەواوی خانەوادەکەیان بوو، ئەوەی ئەویشی ڕزگار کردبوو، تەنها بەختی بوو، ئەوی لەگەڵ ئامۆزا بچووکەکەیدا لە ژیاندا هێشتبووەوە، ئەو کاتەی لەگەڵ باوکیدا بە سەردان هاتبوونە ئەمماڵەی ئێستا تێیدا نیشتەجێن، ئەو ماڵەی مولکی پووریەتی و ئەویش کاتی خۆی گوندی براکەی جێ هێشتبوو، ئەو گوندەی ماوەی دوو ڕۆژە ڕێگە لێرەوە دوورە و لەگەڵ هاوسەرەکەی لێرەدا نیشتەجێ بوون و گیرسابوونەوە. لە کاتێکدا ئەوان هەموو پێکەوە کۆ بووبوونەوە و باسی خەم و ئەندێشەکانی خۆیان دەکرد. لە لایەن ئەوانەی لە مەرگ دەربازیان بووبوو، هەواڵی ئەو دەرد و

بەڵایەیان پێ گەیشت کە بەسەر خەڵکی گوندەکەیاندا هاتبوو. هەواڵەکە وەکوو برووسکە بەر سەر و مێشکی باوکی ئەم ژنە کەوت، دەمودەست هەستایە سەر پێ و بە خێرایی گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، تاکوو لە هەواڵی کەسوکاری دڵنیا بێت، کچەکەی و برازا بچووکەکەی لای پووریان بەجێ هێشت، وەلێ چۆن چوو نەگەڕایەوە و هیچ شوێنەوارێکیشی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشت. گوندەکەی لەگەڵ زەویدا تەخت کرابوو، باغ و دارستان و هەرچییەکیان هەبوو سووتێنرابوون، هەتا کانیاوەکانیشیان پڕ کرابوونەوە و هەندێکیان چیمەنتۆڕێژ کرابوون. ئەی هاوار! خەڵکی لە کوێن و چییان بەسەرهاتووە؟! ڕاگواستراون، یان هەر بە زیندوویێتی لە گۆڕی بە کۆمەڵدا زیندەبەچاڵ کراون؟ هیچ کەسێك نازانێت و تەنانەت شوێنەواری هیچ شتێکیش دیار نییە. بە هۆی ئەو دەرد و بەڵایانەی بەسەر ئەم خێزانەدا هاتبوو، پووره بەدبەختەکەشیان لە ناخەوە خەم و ئازاری چەشتبوو، ئەو پوورەی کە هەتا لە سەرەتای شووکردنیشیدا جگە لە چەند ڕۆژێکی کەم، خۆشیی دیکەی نەدیبوو، چونکە تەنها دوای چەند ڕۆژێك لە هاوسەرگیرییەکەی، سبەینانێکی زووی هاوینێکی جوان و خۆش بە هاتنی هەندێك مێوانی نەخوازراو و ڕەزاقورس بە ئاگا دێن، ئەوانەی پێیان دەگوتن جاش. ئەو جاشانەی پیاوی بەکرێگیراوی ڕژێم بوون و لە هەموو کار و ڕەفتارێکی خەراپدا هاوکاریی دەسەڵاتیان دەکرد و بووبوونە کەواسووری بەر لەشکری دوژمن و لە پەلاماردانی چیا و دۆڵ و گوندەکانیشدا چاوساغییان بۆ دەکردن، تاکوو دەسەڵات بە ئاسانی بتوانێت پەلاماری گوندە ئارام و ئاسوودەکان بدات. ئەو هەڵمەتەشیان بە مەبەستی گەڕان بوو بە دوای سەربازانی ڕاکردوو و ئەو گەنجانەی کاتی سەربازییان هاتووە. هەرواشیان کرد، گەنجانی

گونديان چەشنی ڕانەمەڕ وەپێش خۆيان دا، ئەوەی مايەوە تەنها ژن و منداڵ و پير و پەککەوتەکان بوون. لەو کاتەوە پووريشيان هيچ هەواڵێکی پياوەکەی نازانێت کە چی بەسەر هاتووە؟! ئيدی ئەويش بەرگەی گورزی گورچکبڕی زياتری ڕۆژگار و دەرد و بەڵاکانی نەگرت کە بەزەييان بە کەسدا نايەتەوە، تووشی نيوە ئيفليجی بوو و لە پەلوپۆی خست و بە ناچاری لەسەر جێگە مايەوە. کچی براکەيشی لەو کاتەدا تەمەنی گەيشتبووە چواردە ساڵێك، کچانيش لەو تەمەنەدا تەواو پێ دەگەن و دياردەکانی مێينەيی و جوانييان زياتر دەدرەوشێتەوە و وەکوو کانياوی بەهار دەتەقێنەوە، بەمەش ئەو کيژە بەدبەخت و بێکەسە تەواوی بەرپرسيارێتييەکانی ماڵی پووريشی لە ئەستۆ گرتبوو. بايەخی بە پووری و ئامۆزا بچووکەکەيشی دەدا کە ئەو کاتە تازە تەمەنی حەوت ساڵان بوو. زۆر جاريش بۆ ئەوەی ڕەفتارە منداڵييەکانی ڕاست بکاتەوە، لێيشی دەدا، وەکوو چۆن دايك لە کوڕەکەی و خوشکی گەورە لە برا بچووکەکەی دەدا. کاتێکيش تەمەنی گەيشتە بيست و يەك ساڵی و تەندروستيی پووريشی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو خەراپی دەچوو، ئەويش کۆچی دوايی کرد، ئيدی تەنها کچەکە و کوڕە ئامۆزاکەی لە ماڵەوە پێکەوە مانەوە کە ئەو کاتە تەمەنی گەيشتبووە چواردە ساڵان، بۆ ئەمەش پياوماقووڵانی گوندەکە لە مزگەوت کۆ بوونەوە، تاکوو چارەيەکی شياو بۆ کچەکە و کوڕە ئامۆزاکەی بدۆزنەوە. مەلای گوندی بەر لەوانی تر هاتە ناو قسانەوە و گوتی:

- ئامۆزاکەی لە هەموو کەسێك بۆی لەپێشترە. جگە لەوەش کوا گەنجی ديکە لە گوندەکە ماوە، ئەوانەی ماويشن ڕۆژێك دەيانبينين و مانگێك ون دەبن.

يەکێکی ديکەيان گوتی:

- ئاخر ئەوان چەندین ساڵە وەکوو خوشك و برا پێکەوە لە یەك ماڵدا دەژین.

مەلای گوندی گوتی:

- مادام لە یەك مەمك شیریان نەخواردووە، مارەییان لە یەکتری دێت.

جووتیارێکی دیکە بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

- مامۆستا وەك جەنابت دەفەرمووی، ئەی ئەگەر لە یەك مەمك شیریان خواردبێتەوە، هاوسەرگرییان حەرام و نەشیاو دەبێت؟

مەلای گوندی بە سەربادانی "بەڵێ"وە گوتی:

- ئەی چۆن! ئەو کاتە دەبنە خوشك و برای شیری، ئەمەش حەرامە، پەنا بە خوا.

جووتیارەکە ئەم جارەیان بە دەبەنگییەوە پرسی:

- مامۆستا گیان، وەك دەڵێن شەرم لە ئایندا نییە، ئێ خۆ ژنەکەی من ڕۆژێك لە ڕۆژان یەك دڵۆپە شیری لە مەمکی خۆی نەداوەتە منداڵەکانم، کچ و کوڕەکەم بە شیری بزنەکان گەورە کردووە، ئایا دەکرێ پێکەوە هاوسەرگیری بکەن؟!

مەلای گوندی چاوەکانی ئەبڵەق بوون و بە تووڕەیی و حەپەساوییەوە گوتی:

- کێ و کێ هاوسەرگیری بکەن؟!

جووتیارەکە گوتی:

- کوڕەکەم و کچەکەم... ئێستا نا، مەبەستم ئەوەیە کاتێك گەورە بوون؟!

- دەك خوا دەوامت نەدات، چۆن لە یەکتری مارەیان دەکەیت هەی...؟!

مەلاش هەر ئەستەغفیروڵڵای بوو، کاتێك جووتیارەکە بەو شێوەیە وەڵامی دایەوە:

- ئاخر مامۆستا لە یەك مەمك شیریان نەخواردۆتەوە!

- کورە ئاخر هەردووکیان منداڵی تۆن... هەی!

جووتیارەکە بە ڕژدی و سووربوونەوە گوتی:

- ئاخر تۆ گوتت ئەگەر پێکەوە لە یەك مەمك شیریان...

مەلا قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- بێدەنگ بە بێدەنگ! هەی نەفرەتی خوات لێ بێ. هاوسەرگیری منداڵەکانت لە یەکتری حەرامە حەرام، هەتا ئەگەر لە یەك مەمکیش شیریان نەخواردبێتەوە. نەکەی وا بکەیت ها... کافر دەبی!

ئیدی مەلا لەبەرخۆیەوە هەر پرتەوبۆڵەی بوو و بە دەنگێکی نزم گوتی:

- من پێم وایە مانەوەیان لە یەك ماڵ و بەبێ هاوسەرگیری کارێکی نەشیاوە و حەرامە، نەخاسمە دوای ئەوەی پووریشیان کۆچی دوایی کرد و بەجێی هێشتن.

جووتیارەکان لەژێر لێوەوە و لەبەرخۆیانەوە دەیانگوت:

- بەڵێ بەڵێ مامۆستا، ژیانیان پێکەوە بەم شێوەیە ناشایستەیە و شەرع ڕێگەی پێ نادات.

- کەواتە دەبێ لە یەکتریان مارە بکەین، دوای ئەوەی خەمی پرسەی پووریان دەڕەوێتەوە. تا ئەو کاتە کچەکە دەبەمە

ناو خێزانەکەی خۆم، نەبادا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەم کەمتەرخەمییەم سزام بدات، ئەگەر خوانەخواستە شتێکی نەشیاو ڕوو بدات.

جووتیارەکان پێکەوە ڕەزامەندیی خۆیان دەربڕی و گوتیان:

- دەست خۆش کارێکی تەواوە. خوا بتپارێزێ و بۆمانت بهێڵێت.

هەر مانگێکی بەسەردا تێپەڕی و تێنەپەڕی، کچەکە بینی ئەو ئامۆزایەی چەند ساڵێکە وەکوو منداڵ لەبەردەستیدایە، ئێستا بۆتە هاوسەری و لەسەر یەك جێگە پێکەوە دەنوون و جووت دەبن، بێ ئەوەی بە قسەیەکی خۆش و سەرنجڕاکێشی هاوسەرانە کوڵی دڵی دابمرکێنێت. بۆیە ئەویش ئێستا دەیەوێ چێژ لە مێینەیی خۆی وەربگرێت و ئارەزووەکانی خۆی تێر بکات. لەگەڵ یەکێك لە گەورە پیاوانی نزیکی مام جەمال، کە خاوەن ماڵ و دەسەڵاتیشە و خەڵکیش هەزار حیسابی بۆ دەکەن. بۆیە بە نازی کچە جووتیارانەوە کە چۆن چاوبازێ لەگەڵ کوڕاندا دەکەن، گوتی: "ئەگەر توانای نۆشینی شیرینیت هەیە ئەوەتانێم لەبەردەمتام. شیرینییەکی وات پێ دەچێژم، با بزانین تواناتت چەندە!"

لەو کاتەی کە چایەکەی پێشکەشی کرد و دوو کەوچکی گەورەی شەکریشی بۆ تێ کرد و بە دوو چاوی درەوشاوە و چڵێسەوە ئەوەی تێدەگەیاند، کە ئەو پیاوە نییە بتوانێت شان لە شانی مێینەیی ئەم بدات، ئەبوجگارەش بە تێڕوانینێکی ئاڵۆشییانەوە چاوەکانی قووت دا و پێی گوت: "دەیخۆمەوە ئەگەر ژەهری ماری حەوت سەریشت لەجیاتی شەکر بۆ تێ کردبم". وەها خرۆشابوو، لەو کاتەدا چاوی لە سینگوبەرۆکی

بڕیبوو و ئەم گۆرانییەی هونەرمەندی گەورە حەسەن زیرەکی وەبیر هاتەوە کە دەڵێ:

"شــەرابــی دەستــی دولبــــــەر بێ

ژەهری ئەژدیهــای حەوت سەر بێ

دەیخۆمەوە قەسدی سەر بێ".

نەیدەزانی چی بکات و چۆن ئەو خرۆشانە چڵێسییەی خۆی لێ بەتاڵ بکاتەوە؟! لەو کاتەدا، هەردوو پاسەوانەکەیشی لەگەڵ پیاوی ژنەکە سەرقاڵی گفتوگۆ بوون و هێشتا ئاگای لە بڵێسەی دڵداریی نێوان ژنەکەی و مێوانە شەرواڵپیسەکەی نەبوو. پیاڵە چایەکەی بە بەتاڵی دایە دەستی. ئەم جارەیان نیوەی لە شەکر کردەوە و دایەوە دەستی، پیاوەکە بە دەست تاواندنەوەی شەکرەکە وەڕس و بێزار بوو، بۆیە بە کەوچکی چایەکە دەستی بە خواردنی شەکری ناو پیاڵەکە کرد، تاکوو گەیاندییە ژێرەکەی. پاشان چایەکەی بە یەك فڕ هەڵقوڕاند. کاتێك ئەبوجگارە لە گەڕاندنەوەی پیاڵەکە خۆی گنخاند، وەك ئەوەی بیەوێت دوای گەڕی یەکەم پشوویەك بدات، ژنەکە کاتی زۆر نەدایێ. هەستایە سەر پێ و پیاڵەی بەتاڵی مێوانەکانی کۆ کردەوە و جارێکی تر پڕی کردنەوە لە چای و پارچە بچووکی قەندیشی لەناو سینییەکە دانا. بەڵام سێبەشی پیاڵەکەی دیکەی پڕ کرد لە شەکر و کەمێك چایشی بەسەریدا کرد، مێردە گەمژەکەی تێبینیی پیاڵەی پڕ لە شەکری مێوانەکەی نەکرد، خۆ هەتا بشیبینێت لە مەبەستەکەی تێناگات. ئەوەتا پیاوەکە جارێکی تر شەکرەکە بە کەوچك دەخوات، بەڵام بەرلەوەی شەکری ناو پیاڵەکە تەواو بکات، دەستی بۆ درێژکرد و لە بەرانبەر دەسەڵاتی ئەو جوانییەی خۆی بەدەستەوە دا و گوتی:

- چـایم بـۆ بەسـەرداکە، حەزم لە شـیرینییە و دەسـتم نایگاتێ!

سەرنجێکی ترسناکی پڕ لە هەوەسبازیی مێینانەی ئاڕاستە کـرد، وەك ئەوەی پێـی بڵێـت: "گـرەوەکەت دۆڕانـد... شـیرینی بەرگە ناگرێـت". بە درێژایـی دانیشـتنەکە هەردووکیـان بە سەرنجەکانیان ڕاوی یەکترییان دەکرد، هەتا ماندوو بوون و شەو ڕاکشـا. لە شـوێنی خـۆی هەسـتا و کەرەسـتەی چـایەکە و قاپوقاچاخەکانی کۆ کردەوە، پێخەفی بـۆ هێنـان و ڕووی کـردە ژوورەکەی خۆی بۆ نووستن. ئەبوجگارە بە درێژایی شەو خەو نەچووە چاوەکـانی، بیرکـردنەوە شـەکەتی کردبـوو. ئەویـش بە هەمـان شـێوە تووشـی هەمـان دەردی ئەو هـاتبوو، بەرگەی هەڵچوونەکەی نـاخی خـۆی نەدەگـرت. شـەوێکی سـەخت و درێژی ئەوتۆیان بە ڕێ کـرد کە هەرگیـز پێشتر شـەوی وایـان نەبینیبـوو. ئەبوجگـارە ئـارەزووی پەلامـاردانی سـەرجێیەکەی دەکـرد. پیاوەکەیشـی وەکـوو سـەگ دەربکـات و بەو چڵێسـییە گڕگرتووەی ناخی ئەویش بسووتێنێت، تاکوو هەردووکیان لەناو دەچن و دەبنە خۆڵەمێش. نیوەشـەو ڕابـورد، کەچـی هێشتا خەو پەی بە پێڵوەکانی نەبردووە، کاتێـك هەسـتی بە شـەکەتی کـرد، هەوری سووکە خەوێك بەسەریدا تێپەڕی، هاتە خەونی، سەیری دەکرد و ئەویش بە بزەکـانی وەڵامـی دەدایەوە. کاتێـك هەوڵـی گرتنی دەدا، ئەو هاواری بۆ مێردەکەی دەکرد، کە ڕێگەی لـێ بگرێـت، بەڵام پیـاوەکەی هـیچ گـوێی بە هـاواری ئەو نەدەدا و ڕێگەی لەویش نەدەگرت، بەڵکـوو پشـتی تـێ دەکـرد و ڕووی لەو دەشـتودەرە دەکـرد بـۆ لەوەڕانـدنی ئاژەڵەکـانی. ئیـدی ئەبوجگارە پەلاماری دەدا و ئـارەزووە چڵێسـییەکانی دەخرۆشـا، باوەشی پێـدا دەکـرد و هەردووکیـان لەسـەر زەوی دەگەوزیـن.

بەڵام خـۆی لە دەسـتی ڕادەپسـکاند و پێـی دەگـوت: "ئەکەی ئەوەم لەگەڵدا بکەیت! من وا هەرزان بەها نیم!"

ئەبوجگـارە لە خەونە سـووکەکەی بە ئاگـا هـات و لەسـەر جـێگەکەی ئەمـدیو و ئەودیـوی دەکـرد، ئینجـا جگەرەیەکـی داگیرساند و هەتا گەیشـتە قونکەکەی دەسـتی لـێ بەرنە دا، لە داخـــان هەمـــووی کێشـــا و هەر بە ئـــاگری جـــگەرەکەی، جگەرەیەکی دیـکەی داگیرسـاند، لە دوای چەنـد کـاتژمێرێکی خەوزڕان، خەو بـــــردییەوە، تـــــاکوو ســـــبەینێ زوو لەگەڵ پاسـەوانەکانی لە خەو هەسـتێت، تـاکوو خۆیـان بە کـردنەوەی ئاگری سۆبەکە سەرقاڵ بکەن، جـارێکی دیـکە وەکـوو شـەوی پێشوو دانیشتەوە. خواردنی بەیانییان لەناو سینییەکی گەورە دانـا، ماسـت و مرەبـا و پەنیـری سـپی و نـانی تیـریش. ژنەکە پیـاڵە چـایەکی دایە دەسـتی و بە زەردەخەنەیەکـی ئەهریمەنـانەوە چرپاندییە گوێیەوە و سەرنجی بڕیبووە چاوەکانی کە لە ئەنجامی خەوزڕاندا سوور هەڵگەڕابوون:

- ئەرێ باش نووستی؟!

ئەبوجگـارە وەڵامـی نەدایەوە، بەڵام هەناسـەیەکی قـووڵی هەڵکێشـا و هـاڵاوی نـاخی بە ئاشـکرا لە دەمیـیەوە بە ئاسـمانی ژوورەکەدا پەرشـوبڵاو دەبـووەوە. سـەرنجێکی بێمنەتـانەی بـڕییە چاوەکانی.

دوای ئەوەی لە خـــواردنی نـــانی بەیـــانی تەواو بـــوون، ئەبوجگارە فەرمانی بە یەکێك لە پاسەوانەکانی کرد، بچێت و بە هەموو پیاوەکانی ڕابگەیەنێت کە لە گوندەکەدا دابەش بووبوون دوای کاتژمێرێك لای مزگەوتی گوند کۆ ببنەوە. ئەم فەرمانەی دەریکرد بۆ نمایشکردنی هێـز و دەسـەڵاتی خـۆی بـوو، تـاکوو

خـانەخوێیەکەی هەسـت بە دەسـەڵاتی بکـات، کە لە بنەڕەتـدا لەگەڵ هەر یەکێـك لە ئەنـدامانی دەسـتەکەی لە یەك ئاسـت و پلەوپـــایەدا نەبـــوون. بەوەی کەس توانـــای ڕەتکـــردنەوەی فەرمانەکانی نەبوو، لەسەر ئەویش پێویستە بە باشی ئەمە بزانێـت. هەر کە پاســـەوانەکەی دەرچـــوو، ئـــاوڕی لە خـــانەخوێیە نەوجەوانەکەی دایەوە و پرسـیاری ئەوەی لـێ کـرد ئایـا هـیچ جگەرەیەکـی پێـیە، خانەخوێیەکەیشـی کیسـەیەك تـووتنی دایە دەستی، کەچی ئەبوجگارە گوتی:

- ئەو تووتنە خەراپە! من پرسیاری ئەوەم لـێ کـردی ئایـا جگارەی پاکەتت هەیە؟

هەرزەکارە نەوجەوانەکە لەژێر لێوەوە گوتی:

- من جگارەی پاکەت ناکێشم، چونکە گرانە.

ئەبوجگارە بە سەربادانەوە وەڵامی دایەوە:

- لە دوکانی گوندەکە پاکەت هەیە، دەچی دوو پـاکەت بهێنیت یەکیان بۆ من و ئەوەی دیکەش بۆ خۆت؟!

بەپەلە بـڕە پـارەیەکی لە گیرفـانی دەرکـرد و دایە دەسـتی، گەنجە هەرزەکارەکەش یەکسەر هەستا و پێڵاوەکانی کردە پێـی و ڕووی لە دوکانی گوندەکە کرد، تاکوو دوو پاکەت جگـارە بکڕێت، هێشتا نیو خولەك لە دەرچوونی مێردەکەی تێنەپەڕیبـوو، بە گـوێی پاسـەوانەکەیدا چرپانـد و پێـی گـوت: "لەبەر دەرگـا ڕاوەسـتە مەهـێڵە هـیچ کەسـێك لێمـان بێـتە ژوورەوە، نەخاسـمە پیاوەکەی، هەتا خۆم دێمە دەرەوە!"

ژنەکە لە فیتەی حەرامزادەیی ئەبوجگارە تێگەیشت، تووشی دڵەڕاوکـێ و شـڵەژان هـات، لە ترسـان دڵەکـوتێی بـوو، لە

هەڵچوونێکی سەیردا بوو، بە چاوەکانی چاودێری دەکرد و ڕەنگی هەڵبزڕکابوو. ترسی لێ نیشت، وەك ئەوەی ئەو ژنەکەی دوێنێ شەو نەبێت کە ئاگری چڵێسی و هەوەسبازی خرۆشاندبووی، بۆیە هەستایە سەر پێ و یەکسەر بچێتە دەرەوە، ژنەکە بیری لە سزای گاڵتەکەی نەکردەوە، تا ئەو کاتەی کار لە کار ترازا، ئیدی ئەبوجگارە لە شوێنی خۆی قەڵەمبازێکی دا و ڕێگەی دەرچوونی لێ گرت، بە نیمچە چرپەیەکەوە پێی گوت:

- چیت دەوێ؟! توو خوا ئەوەم لەگەڵدا مەکە، تکایە ڕێگەم بدە با بڕۆم، ئێستا پیاوەکەم دێتەوە.

وەلێ ئەبوجگارە بەوپەڕی هێزییەوە خۆی پێوە نابوو و لەسەر زەوی درێژی کرد. ئەویش هیچ بەرگرییەکی نەکرد، هەتا ڕێگەی هەڵماڵینی جلوبەرگە ڕەنگاوڕەنگەکانیشی لێ نەگرت، وێڕای پاڕانەوەکانی لێی کە وازی لێ بهێنێت. لە چرکەساتێکدا دەرپێ و شەرواڵی هەردووکیان هەتا خوار چۆکیان هاتە خوارەوە، ئینجا بەوپەڕی چڵێسی و خرۆشانەوە خۆی پێوە نووساند، وای لێ کرد چیتر نەپاڕێتەوە و بێدەنگ بێت، ئەویش ئارەزوویەکی بێئەندازەی هەبوو، لە نێوان ڕەتکردنەوە و نۆشینی چێژدا لاقەکانی بۆ کردەوە، تاکوو ئەو باشتر بتوانێت کاری خۆی بکات و گڕی ناخی بکوژێنێتەوە، نیو خولەکیشی نەخایاند، هەتا لە تاو ئەو چێژ و تەزووەی سەرتاپای جەستەی تەنیبووەوە کەوتبووە هاتوهاوارێکی سەیر، بەڵام ئەو لەو چرکەساتەدا لە تێنوێتیی بێبەشیدا دەژیا. وای هەست کرد شتێك لە ناخیدا وردوخاش بوو، شکانێکی وا کە هیچ شتێك چاکی نەکاتەوە. وەك ئەوەی یەکێك گەمەی بە تەقەمەنییەکی مەترسیدار کردبێت و چاوەڕوانی تەقینەوەی بەو کتوپڕی و توندوتیژی و دژوارییە نەبووبێت. بۆ ساتێك بە ترس و

حەپەسانەوە دۆش داما و سەیری ڕوخساری شێواوی خۆی و مستی دەکرد کە چۆن تەقینەوەکە پەڕاندوویەتی. چ چرکەساتێکی گاڵتەجاڕییانەیە بە مرۆڤدا تێپەڕ دەبێت و ئەنجامەکەی زۆر خەراپ دەبێت و ژیانی سەرەوژێر دەکات؟! ڕێك ئەوەی بەسەردا هات، زۆر هەستی بە پەشیمانی و شەرمەزاری دەکرد، هیوای ئەوەی دەخواست کە میلی کاتژمێر بەرەو دوا بگەڕێتەوە، ئەو کاتە بیری دەکردەوە و خۆی تووشی ئەم بێئابروویی و سووکایەتی و خۆهەرزانفرۆشییە نەدەکرد. پیاوەکە بە پێوە وەستا و شەرواڵەکەی کردە پێ و خۆی ڕێك خستەوە، کەچی ئەو بە ڕاکشاوی لەسەر زەوی و بە لاق کراوەیی مایەوە، لە شوێنی خۆیدا مردووئاسا ڕاکشابوو و چاوەکانی کرابوونەوە، تەنانەت مرۆڤ وای هەست دەکرد کە ئیدی ئەو مردووە و گیانی لەدەست داوە. بەڵام دوای ئەوەی پیاوەکە لە ژوورەکە چووە دەرەوە، ئەویش لە ناکاو هەستایە سەر پێ و بە خێرایی دەستی بە ڕێکخستنەوەی جلوبەرگەکانی خۆی کردەوە، خولەکێك بەسەر دەرچوونی ئەبوجگارەدا تێنەپەڕیبوو، مێردەکەی خۆی بە ژووردا کرد. ئەو بە خەمباری و سەرشۆڕییەوە دانیشتبوو، خەم و ناسۆر ناخیان پڕ کردبوو. پیاوەکەی یەك وشەی لەگەڵ نەگوت. بەڵکوو لە بەردەم دەرگاکە ڕاوەستا و ڕێی ڕووناکی لە ژوورەکە گرتبوو، ئیدی بە بێزاری لە خۆی و لە پیاوەکەیشی هەستایە سەر پێ و پاڵێکی بە مێردەکەیەوە نا، لە بەردەم دەرگاکە لای دا و چووە دەرەوە. ئیدی لەو کاتەوە ئەبوجگارە بووە مێوانێکی بەردەوامی ئەو خێزانە بەدبەختە و نەدەچووە هیچ ماڵێکی دیکە. ژنەکەش لەسەر ئەو کارەی ڕاهات و خووی پێوە گرت، زەبروزەنگ و سەرزەنشتی خۆی کەمتر بوو لەو قسەوقسەڵۆك و سووکایەتییانەی کە خەڵکی پێیانەوە دەکرد. ئیدی بووە

مێوژەخۆشەی بن ددانی خەڵکی ئاوایی و گوندنشینان، هەموویان بە گوێی یەکترییان دەچپاند و باسی ئەو ئابڕووچوونەیان دەکرد، بەڵام لە ترسی تووڕەیی ئەبوجگارە نەیاندەوێرا بە ئاشکرا ئەوە بڵێن، بۆیە ڕقی خۆیان بەسەر ئەو ژنەدا دەباراند، بەوەی ژنێکی سووك و خەراپە و ڕێگەیان بە کچ و ژنەکانیان نەدەدا لێی نزیك بکەونەوە و هاوڕێیەتی و مامەڵەیشی لەگەڵدا بکەن، نەبادا ئەوانیش وەکوو خۆی تووشی لادان بکات، هەتا ناوبانگی خەراپی بە گوندەکانی دیکەشدا بڵاو بووەوە، ئاخر دەمێکە گوتوویانە: "قسە کەوتە زارێ، دەکەوێتە شارێ".

## بەشی نۆیەم

لە ڕۆست، زۆر ئەستەم بوو دکتۆرەکە چارەسەری برینە قووڵ و هەستیارەکان بکات، بۆیە دۆخەکە وای لە ئیبراهیم و ڕەحمان دەخواست سبەینێ لەگەڵ مامۆستا عومەر ڕوو لە "ناوزەنگ" بکەن کە دەکەوێتە سەر سنووری ئێران، چونکە لەوێ دوو دکتۆری تەمەن چل ساڵان و نۆڕینگەیەك و دەرمانخانەیەکی هەژارانەشیان دامەزراندووە، لەوێ ئەوپەڕی توانای خۆیان تەرخان کردووە بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ ئەوانەی نەخۆش و زامدارن و پێویستییان بە چاودێریی تایبەت هەیە. ئەم ڕێگەیەش لێرەوە تا ئەوێ نزیکەی سێ ڕۆژە ڕێگەی پیادەیە. لەو نێوەندەشدا هەر دەبێت بەناو تۆڕێك مۆڵگە و ڕەبایەی سەربازیدا تێبپەڕن کە نزیکەی چوار کاتژمێر ڕێگە دەبێت، ئەوەش دەبێت ئەو کاتە بێ کە مانگ خۆی لە پشت شاخەکان دەشارێتەوە، بۆ ئەوەی ئەمان خۆیان لە تاریکایی زیاتر پەنا بدەن و شەو بکەنە قەڵای مێردان. بۆیە دەبێ پێشبڕکێ لەگەڵ دەرکەوتنی مانگدا بکەن، خۆ ئەگەر مانگ بەسەریاندا زاڵ بوو و خۆی گەیاندە ئاسمان، بەرلەوەی ئەمان ئەو ناوچە ترسناکە تێبپەڕێنن کە مۆڵگە سەربازییەکانی دوژمن بەسەریاندا زاڵە، ئەو کاتە حاڵیان خەراپ و تووشی دۆخێکی مەترسیدار دەبن و لەوانەشە هەر بە سەلامەتیش دەربازیان نەبێت، بۆیە لەگەڵ خۆیاندا هێسترێکیشیان برد، تاکوو لە ڕێگە یارمەتییان بدات و بە خێرایی بڕۆن و ئەگەر یەکێکیان توانای ڕێکردنی نەما، ئەوا سواری سەر پشتی وڵاخەکە ببێت.

دوای نیوەڕۆ گەیشتنە گوندێك دەبوو هەتا دونیا تاریك دادەهات لەوێ بمێننەوە، لەو کاتەدا خەڵکی گوندەکە ئاهەنگێکی هاوسەرگیریی هەژارانەیان بۆ یەکێك لە ڕۆڵەکانیان ساز دابوو. دوو بەرخیشیان کوشتبووەوە و لەسەر ئاوازی دەهۆڵ و زوڕنایەکیش بە جۆرەها شێوە هەڵدەپەڕین و شاییان دەکرد، سەرچۆپی کێشەکە لە هەمووان زیاتر جۆشی سەندبوو و بە دەستی ڕاستی دەسترەکەی بادەدا و یەك دوو گرێشی لێ دابوو، تاکوو باش بخولێتەوە و لەگەڵ ئاوازی دەهۆڵ و زوڕناکەدا بە ئاسماندا بای دەدا. ئەمەش جۆشوخرۆشێکی سەیری بە زەماوەندەکە بەخشیبوو، جاری وا هەبوو سەرچۆپی کێش دەستی ڕیزەکەی بەردەدا و بە تاقی تەنها و بە شایی و سەماوە تا ناوەڕاستی گۆڕەپانی ئاهەنگەکە دەڕۆیشت و زیاتر جۆشی دەسەند، جوانتریش شانی دەجوولاند و هەڵدەپەڕی و خۆی بەرزونزم دەکردەوە، جاری واش هەبوو هێندەی نەدەما لەسەر زەوی دابنیشێت و هەڵدەستایەوە و قاچەکانی لەگەڵ ترپە و ئاوازی زوڕنا و دەهۆڵەکەدا ئەملا و ئەولای دەکرد، دەسرۆکەی دەستیشی لە بادان نەدەکەوت. پاشان جارێکی تر دەگەڕایەوە لای هاوڕێکانی و بە شانهەڵتەکاندن و خۆبادانەوە سەرچۆپی وەردەگرتەوە.

زاوا لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵاندا بوو. لەشولارێکی باریك و ڕێك، بە بەردەوامی دەخنایەوە و بزەی لەسەر لێوان دەباری. چاوەکانی هەڵوەدا بوون، وات هەست دەکرد دەوروبەری خۆی نابینێت. هەندێکیان پێدەکەنین و باسی هەندێك شتیان بۆ دەکرد، ئەویش شەرم دایدەگرت، ئیدی قاقای پێرەکەی بەرز دەبووەوە. ئینجا دەستیان ڕادەکێشا و لەگەڵ خۆیاندا پەلکێشی ناو شاییەکەیان دەکرد. یەکێك دەچووە

بنباڵییەوە و ئەویش بەپێی ئاوازی زوڕناکە هەڵدەپەڕی و شایی دەکرد، ئیدی زاواش پێیەکانی بە شێوەی هەڕەمەکی بە زەویدا دەدا، وەك ئەوەی لە ژیانیدا هەڵپەڕکێی نەکردبێت، ئەم جووڵانەیشی قاقای پێکەنینی پێرەکەی زیاتر دەکرد، ئیدی خۆی لەناو شایی دەدزییەوە و دەگەڕایەوە شوێنی خۆی و بزەیەکی گەرمی بۆ دەکردن. بەمەش وازیان لێ دەهێنا و چیتر تەنگەتاو و بێزاریان نەدەکرد.

بووکێش لە گوندێکی دیکەوە دەهات، بەیانییەکەی بەسەر پشتی وڵاخێکەوە هێنابوویان. دوای ئەوەی پشوویەکی باشی دابوو، ژنەکان دەستیان بە ڕازاندنەوەی کردبوو. گەرماویان بۆ کردبوو و جۆرەها بۆنی خۆشیان لێ دابوو، بە شایی و سەما و گۆرانی و هەڵپەڕکێوە جلوبەرگی بووکێنیشیان لەبەر کردبوو و تاراشیان بەسەر سەریدا دابوو، گۆرانی تایبەتی بووکانەیان بۆ دەگوت:

بووکانە بووکانە بووکێ

بووکێمە زۆر جوانە بووکێ

بووکمان هێنا لە دوورەوە

بە (کێش)ی زەرد و سوورەوە

کێشی ڕەنگاوڕەنگی سەری

کەوای خامەك وا لەبەری

بووکێمە زۆر جوانە بووکێ.

کاتی بردنیشی بۆ لای زاوا، سواری وڵاخەکەیان کردەوە و یەکێك سەری وڵاخەکەی ڕادەکێشا، ئەوانی تریش لە چواردەوری چەپڵەیان دەکوتی و بووکانە بووکانەیان بۆ

دەگــوت، تــاکوو گەیانــدیانە دەســتی زاوا، کە ئەویــش بە کوڕوکــاڵان و گەنجــان دەورە درابــوو، ئیــدی دۆخەکە زیــاتر دەخرۆشــــا و هەموویــــــان بە دوایــــانەوە بەرەو هـــێلانەی هاوســەرگیرییان بە ڕێــان دەکــردن کە تیایــدا بحەســێنەوە و ژیانێکی نوێ دەست پێ بکەن.

زاوا دەرگای لە دوای خۆیانەوە داخست، بەمەش بـووکێ شڵەژا و بە تـیلەی چاوی و لەژێـر تـاراکەیەوە سـەرنجی زاوای دەدا.

لە دەرەوەش دەهـــۆڵ و زوڕنـــاکە لە بەزمـــی خۆیـــان نەدەکەوتــن. مامۆســتا عــومەر لەگەڵ هەنــدێك لە لاوەکــان لە گفتوگــۆدا بــوو. ئیبــراهیمیش بەپێــی توانــای خــۆی بەشــداری گفتوگۆکانی دەکردن. چونکە کەمێك بە زمانی کوردی قسـەی دەکرد و جارجارەش ئەو پەڕۆیەی کە چاوی پێ بەستابوو ڕێك دەخستەوە کە دەخزی و دەچووە سەر چاوەکەی دیکەی. بەڵام ڕەحمــان لەگەڵیــان ڕاوەســتابوو هەوڵــی دەدا لێیــان تێبگــات. ئاماژەیان بەوە دەکرد کە زاوا کەسێکی نـامۆیە لە گونـدەکە و ڕاستییەکەی ئەو خەڵکی شارە، هەڵسوکەوتەکانی شێتۆکانە، یـان نیوە شێتانەیە، بە زۆری باسی هەنـدێك شـت دەکـات کە ئەوان لێی تێنـاگەن. دەیـانگوت ئەو بە شـەقامەکانی شـارەکەی خۆیـدا ســـووڕاوەتەوە و جنێـــوی بە دەســـەڵات داوە، کەسوکاریشـــی بردوویــانەتە شــێتخانە. بەڵام بە هــۆیەك لە هۆیەکــانەوە لەوێ دەریانکردووە. هەنـدێکی دیکەشـیان دەڵـێن لە نەخۆشـخانە ڕای کــردووە. هەنــدێکی دیــکەش دەیــانگوت، گــوایە هــاتووە بــۆ سەردانی پیرەژنێك بـێ ئەوەی هۆکـاری سەردانەکەیشـی بـزانن، ئیـدی لای مـاوەتەوە و لە لەوەڕانـدن و بەخێـوکردنی مـاڵات و چاندنی زەوییە بچووکەکەیدا یارمەتیی داوە. ئەوەشیان دەگوت:

گوایە پیرەژنەکە خزمێکی دووری بووە و کاتی خۆیشی هەر خۆی مامانیشی بووە و هەمان پیرەژنیش هەوڵی بۆی داوە تاکوو ئەم کچەی بۆ بهێنێت. کچەکەش کەس پێی ڕازی نەبووە و نەیهێناوە، تەنها ئەم شێتۆکەیە نەبێت. لەبەر ئەوەی ناوبانگی خێزانەکەیان بە هۆی خوشکێکی جمکی زڕاوە و لەکەدار بووە. پاشان دەیانگوت کە پیرەژنەکە نەخۆش بووە و لە مردن نزیک بووەتەوە، سوور بووە لەسەر ئەوەی بەرلەوەی بمرێت ئەم هاوسەرگیرییە ڕێك بخات، کەسێکیشی نەبووە بایەخی پێ بدات و ئەو ئاواتەی بە خێرایی بهێنێتە دی و ئێستا خۆیشی لە ماڵی مەلای گوندییە و لەوێ لە لایەن ژنەکانییەوە چاودێری و سەرپەرشتی دەکرێ. ئەوەشیان دەگوت گوایە پیرەژنەکە وەسیەتی کردووە هەرچی موڵك و ماڵی هەیە بۆ ئەم بووك و زاوا ستەملێکراوە بێت -وەك ئەوەی ئەو بەو جۆرە ناوی دەبردن- تاکوو بەو موڵك و ماڵە دەست بە ژیان بکەن، کە بریتی بوو لە چەند سەر بزنێك و خانووەکەی و پارچە زەوییە بچووکەکەی.

ڕەحمان توانای زانین و تێگەیشتنی ئەم هەموو قسەیەی نەبوو، بەڵکوو هەر نەیدەزانی باسی چی و کێش دەکەن، چونکە ئەوەندە قسەکانیان پەرشوبڵاو و پچڕپچڕ بوو، هیچ هەستی لێ ڕانەدەگرتن. زیاتریش بە هۆی ئەوەی گوندنشینەکان ناوەناوە دەهاتن و تەوقە و دەستخۆشییان لە دەستەکەی ڕۆست دەکرد و سەرسامیی خۆیان پێیان ڕادەگەیاند بۆ ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیەی دژی دەسەڵات دەیکەن. یەکێك لەو کەسانەی دەستخۆشی لێ کردن ئەو گەنجە بوو کە میوانداریی ڕەحمانی کرد لە ماڵی خۆی، پێش ئەوەی چالاکییەکە ئەنجام بدەن. بەمەش خوشکە جوانەکەی وەبیر هاتەوە کە وای لێ کرد زیاتر لە جاران دڵی بکەوێتە کوتەکوت. بۆیە ئەوەندە بینایییەی مابووی بۆ سەرنجدان

و گەڕان بە دوای ئەو کچەدا لەناو ئاپۆرای کچگەلی ئاوایی خستە کار، کە لەوێ کۆ بووبوونەوە. زۆری حەز دەکرد بە دزییەوە سەرنجێکی ئاڕاستە بکات، لە دڵی خۆیدا بیری دەکردەوە: "بە دڵنیاییەوە ئەو شۆخە شایانی ژیانی ئێرە نییە، ئاخر چۆن دەبێت ئەو نازدارە لەم دوورەپەرێزی و ناوچە شاخاوییەدا بژیێت، ئاخر جوانێکی وا دەبێ یەکێك بێ لە ئەستێرەکانی هۆلیوود، جگە لە نواندنی چیرۆکی خۆشەویستیی ڕۆمانسیانە، هیچ ڕۆڵێکی دیکە نەگێڕێت، هیچ کەسێکیش لە بەرانبەری نەوەستێت، جگە لە کوڕە ئەستێرەیەکی کەشخە، جوانترین وشەی دڵداری و خۆشترینیان بە گوێدا بدات".

لەناو ئەو هەموو هەراوزەنا و ئاپۆرا زۆرە و بەو چاوە کز و فەوتاو و کولەوە لە بینینی کچەکە، بەخت یاوەری نەبوو، کاتێکیش نائومێد بوو، لەبەرخۆیەوە گوتی: "هەر دەبێت لە گوندەکەی خۆی مابێتەوە. ڕێگاکە دوورە و شایانی ئەوە نییە لە پێناوی زەماوەندێکی وا ئەو هەموو ڕێگایە ببڕێت".

ژووری بووك و زاوا شێوەی هەر ژوورێکی ماڵە شاخاوییەکان بوو. لەوێ یەکێك بە تەواوی بۆی ساز و ئامادە کردبوون. زەوییەکەی بە مافوورێکی خاوێن داپۆشرابوو. پێخەفەکەیان لە گۆشەیەکدا بە نەرمونیانی ڕاخرابوو. سەرینێکی درێژی دوو کەسی و یەك لێفەی گەورەش بۆ هەردووکیان، زۆپا دارینەکەشیان نێڵەی ئاگری دەهات لەو دارانەی لە تەنیشتی و نزیك دیوارەکەوە لەسەر یەکتری کەڵەکەو ڕیز کرابوون، داری بەڕوو، بەشی گەرمکردنەوەی دوو ڕۆژی ڕەبەقی یەك لە دوای یەکی دەکردن.

بووکێ لە ژوورەوە دوو هەنگاوی ناو لە شوێنی خۆی ڕەق ڕاوەستا و جووڵەی نەکرد، ڕووی لە دیوار و پشتیشی تیشکێکی

کزی فانۆسێکی ڕەنگ هەڵبزرکاو کە لە بنمیچی ژوورەکە وە شۆڕ کرابووەوە و تەنها بستێك لەسەر سەرییەوە بوو، ڕووناکایی پێ دەبەخشی.

دەنگی زوورنا و هەراوزەنایەکە لە دەرەوە گوێی کەڕ دەکرد، گرمەی دەهۆڵەکە وەکوو هەورەتریشقە بە ناخیدا ڕۆ دەچوو، تەواوی جەستەی دەلەزری و ڕادەچڵەکی و ترس دایدەگرت. ئەمە چارەنووسییە، چۆن ڕووبەڕووی دەبێتەوە؟ دڕندەکان بە دەوریدا سەما دەکەن. گورگەکان خۆیان بۆ مەلاس داوە و مڕەمڕیانە. ئیدی ئەمە جیهانی تازەی ئەوە. تۆ بڵێی هەموو خەڵکی بەو جۆرە بژیێن؟ ئایا لە پشت ئەو شاخە بەرز و دوورودرێژە بێکۆتاییانەوە ژیانێکی دیکەی جیاواز لەم ژیانە هەیە؟

کاتێك هەستی بە دەستی دڕندە شێتۆکەکە کرد لەسەر شانێتی، سەرتاپای جەستەی کەوتە لەرزین. بە ترسەوە کشایە دواوە و خۆی لە گۆشەیەکی ژوورەکە و دوور لە جێگە نەرمونیانەکەی نووستنی بووك و زاوایی گرمۆڵە کرد. هیوای مردنی دەخواست. بوێری تەماشاکردن و سەرنجدانی نەبوو. جا بۆچی تەماشای بکات؟! چی تێدا بە دی دەکات، جگە لە شەڕ و تۆقاندن؟! ئێستا ئیدی ئەم مولکی ئەوە. ژیان ملکەچبوونی بۆ ئەو بەسەردا سەپاندووە. ئاوا فێریان کردووە. وای هەست دەکرد کە کەسێکی کەم و دزێو و بێزراوە، تەنها مێشێکی بەندکراوی تۆڕێکی جاڵجاڵۆکەیەو بە دەوریدا دێت و دەچێت، دەیەوێ شیلەی ژیانی بمژێت، تا وشك دەبێت و تێك دەشکێت. دڕندەکە لێی نزیك کەوتەوە، بینی هەڵدەلەرزێت، بە ئاسپایی و سۆزەوە دەستی بۆ درێژ کرد، سەری ڕاوەشاند، پاشان ڕایکێشا و لەسەر جێگەی خەوتنەکە داینیشاند، کچەکە گۆشەگیر و

دووره‌په‌رێــز بــوو، خه‌ریــکه زاخــی ئه‌وه نه‌کــات ســه‌رنجی ڕوخساری بدات.

به ده‌نگێکی ناسك و سازگاره‌وه چپاندییه بناگوێیه‌وه:

- لێم مه‌ترسه، من هه‌رگیز به‌و جۆره نیم که تـۆ خه‌یـاڵی بۆ ده‌که‌یـت. دڵـم خه‌ریـکه بـۆت له‌تـله‌ت ده‌بێـت. به تـرس و وریاییه‌کی زۆره‌وه سه‌ری هه‌ڵبـڕی، ڕوخسـارێکی هه‌ڵبزڕکـاوی بینــی بــۆی ده‌خنــایه‌وه، له شۆخوشــه‌نگی به‌ده‌ر نه‌بــوو، له چاوه‌کانیدا ترس و شـه‌رمێکی وا به‌دی ده‌کـرا، مـرۆڤ به‌زه‌یـی پێدا ده‌هاته‌وه.

کچه‌که به ده‌نگێکی تێکشکاوه‌وه گوتی:

- ئاخر ئه‌وان چاوه‌ڕوانن.

به چپه‌وه گوتی:

- وازیان لێ بێنه... نغرۆی دۆزه‌خ و به نه‌فره‌ت بن.

چه‌قۆیه‌کی بچووکی له گیرفانی ده‌رهێنا، کچه‌که ڕاچڵه‌کی و هه‌ناسه‌یه‌کی هه‌ڵکێشا، ئه‌و هه‌نگاوێك کشایه دواوه، مه‌چه‌کی هه‌ڵکـرد و له چاوترووکانێکـدا به نـووکی چه‌قـۆکه‌ی که‌مێـك پێسـتی مه‌چه‌کـی خـۆی بـڕی، دڵـۆپه خوێنه‌کـان به هێواشـی له برینه‌که‌وه ده‌هاتنه ده‌ره‌وه، ئه‌و دڵـۆپه خوێنـانه‌ی به نه‌بوونیـان له شه‌وی بووك و زاواییدا سه‌دان بووکی خه‌ڵتانی خوێن و باوان و که‌سوکاریشیان تووشـی ئابڕووتکـان و ڕیسـوایی نـاو کـۆمه‌ڵگه کردووه، وای له‌و دڵۆپه خوێنانه له‌و کاته‌دا چ به‌هایه‌کیان هه‌یه. به ده‌سته‌سـڕه‌که‌ی خـوێنه‌که‌ی سـڕییه‌وه و به ده‌نگێکـی نـزمه‌وه گوتی:

- ئه‌مه به‌ڵگه‌ی پاکیزه‌ییته. مه‌ترسێ ده‌ستت لێ نادەم هه‌تا

بە تەواوی لێم دڵنیا نەبێت و خۆت ئارەزوو نەکەیت و ڕەزامەندی دەرنەبڕیت.

پاش کەمێك بێدەنگی، هەستایە سەر پێ و ڕووی کردە دەرگاکە و کەمێکی کردەوە. دەستەسڕەکەی کە بە خوێنەوە بوو درێژ کرد. ئەم نەریتە لێرە باو نەبوو، بەڵام زۆر پێویست بوو پاکیزەیی ئەم کچە بە تایبەتی بسەلمێندرێت. یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی بەوپەڕی بێ ئارامی و دوودڵییەکی زۆرەوە لە چاوەڕوانیدا بوو، دەستەسڕە خوێناوییەکەی وەرگرت و بە شانازییەوە بەرزی کردەوە و پیشانی هەمووانی دا و هەمووان بە پاکیزەییەکەی دڵخۆش بوون. پیرەژنەکانیش دەستەسڕەکەیان لە دەستی وەرگرت و پیرۆزباییان لێی کرد. بەمەش جۆشوخرۆشی ئەوانەی هێشتا لە گەرمەی هەڵپەڕکێدابوون و دەهۆڵ و زوڕناکەش هێشتا دەیژەنی و دەیکوتی، زیاتر جۆشی سەند، لەسەر ئەم شایی و هەڵپەڕکێیەی خۆیان بەردەوام بوون هەتا شەکەت و ماندوو بوون.

ئینجا کاتی نانخواردن هات و وازیان لە شایی و هەڵپەڕکێ هێنا و لە چاوەڕوانی هاتنی گۆشت و پلاودا بوون، لە شوێنێکی فراوان کۆ بوونەوە. یەك یەك و دوو دوو پێکەوە لە دەوری شلە و پلاوساوەرێکی سەر بە گۆشتی بەتام دەستیان بە نانخواردن کرد. تۆ وەرە ئەوەندە برسیت بێت و ئەو خواردنە خۆشەش بێتە بەردەستت، دەبێ چ تاموچێژێکی هەبێت، ئیدی لە هەموو لایەکەوە بەوپەڕی خۆشی و شۆخییەوە دەستیان بە نانخواردن کرد، وەك ئەوەی لە پێشبڕکێدا بن. ئەم خواردنە بە تایبەتی بۆ پێشمەرگەکانی ڕۆست هێز و وزە دەبەخشێت و هاندەرێکی باش دەبێت بۆ تێپەڕبوون بەناو تۆڕی مۆڵگە و ڕەبایەکانی دوژمن، چونکە ئەم خواردنە باشە وزەیان پێ دەبەخشێت و

وایان لێ دەکات بەبێ ئاستەنگێکی ئەوتۆ ڕێگاکە ببڕن. تا ئەو کاتە گوندنشینەکان نەیاندەزانی ئاراستەی ئەوان بەرەو کوێیە. هەر کە تاریکاییش داهات، هەرسێکیان بە ناو کێڵگە و دۆڵەکاندا هەیپەیان لێ کرد و بۆی دەرچوون، ئەو هێسترەشیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشا کە کەلوپەل و خواردن و چای و ئەو پێداویستییانەی لە گەشتێکی وادا پێویست بوو بۆیان لەسەر پشتی شەتەك دابوو.

ڕۆیشتنەکەیان زۆر ئاسانتر دەبوو، ئەگەر هێسترەکەیان پێ نەبووایە. چونکە هەندێك جار هێواش دەڕۆیشت وێڕای ئەو هەوڵەی لەگەڵی دەیاندا بۆ ئەوەی خێرا بڕوات، وەك ئەوەی بە ئەنقەست وا بکات، نەخاسمە لەو شوێنانەی کە پێویستیی بە ئاگایی و جووڵە و چالاکییەکی زۆر دەکرد، بەڵام دوا جار توانییان لە نێوان مۆڵگە و ڕەبایەکانی دوژمن بە سەلامەتی تێبپەڕن بەرلەوەی مانگ بەری ئاسمانیان لێ بگرێت و بە ڕووناکییەکەی ئاشکرایان بکات.

لە کاتی کازیوەدا ئەوان تەواوی ناوچەکەیان لە پشتی خۆیانەوە جێ هێشتبوو، بزنەڕێ و دۆڵە قووڵەکان قووتی دابوون، وێڕای ئەو خواردنە نایاب و چەورە، کەچی ماندوێتی شەکەتی کردبوون و لە پەلوپۆی خستبوون، سەرتاپای جەستەیان شەڵاڵی ئارەق بوو، بڕیاریان دا لە یەکێك لە ئەشکەوتە بچووکەکانی ناو دار و درەخت و تاشەبەردەکان کەمە پشوویەك بدەن.

هێسترەکەیان لەناو پووشوپەڵاش بەستەوە و چەند باوشە پووشوپەڵاشێکی دیکەشیان بۆی هێنا، تاکوو بە تەواوی تێر بخوات و لەو ڕێگەیەی ماویانە ئەزیەتیان نەدات. ئینجا دەستیان بە کۆکردنەوەی چڵەداری وشك کرد، بۆ ئەوەی دووکەڵی

ئـاگرەکە سـەرنجی دوژمـن ڕانەکێشـێت و کۆپتەرەکـان دۆخەکەیان لێ تێك نەدەن و شوێنیان پێ نەزانن و بکەونە ناو گێژاوێکی چاوەڕواننەکراوەوە.

ئـاگرێکی پێشـمەرگانەیان کـردەوە، هەنـدێك بەڕووی ژێـر دارەکانیان کۆ کردەوە و لەسەر بەردێکی تەختی ناو پشکۆکان دایانناو، بە چیلکەدارێك هەڵگێڕ و وەرگێڕیان دەکردن، هەر کە یەکێکیان دەبرژا، دەتەقی و تەپەیەکی لێوە دەهات و مـوژدەی برژانـی ڕادەگەیانـد. قۆریە چایەکەش وەکـوو نەریتـی ئاسـایی خۆیـان لەسـەر پشـکۆکان قـوڵپی دەدا، چای لە ژیـانی ئەوانـدا شـتێکە لە هەر حاڵێکـدا بـن، دەسـتبەرداربوونی بـۆ نیـیە، وەك هەمیشـە دەڵـێن چـای، مەی و شـەرابی شۆڕشـگێڕانە. هەنـدێك نانیشیان پێ بوو، لەگەڵ چایەکە گەدەی خۆیان پـێ پـڕ کـرد و وزە و گەرمـاییەك هـاتەوە جەسـتەیان. ئیـدی باوێشـکدان و خەوێکی جوان دزەی کردە ناو هەست و هۆشیان و هەستیان بە خـاوبوونەوە دەکـرد، پێڵوەکانیشـیان تـا دەهـات قورسـتر دەبـوو. بڕیاریان دا هەموویان سەرخەوێك بشکێنن بەبێ پاسەوانی گرتن، بەڵام وریایی و ئاگاییان دەسەڵاتی بەسەر خەونەکەشیاندا هەبوو، ئاخر ژیانی پێشمەرگایەتی و ئەو چیاوچۆڵە و ترسی ئەو ڕووداو و کارەساتە لە ناکاوەی لە دووتوێی خۆیـدا بـۆی هەڵگرتبـوون، وای لـێ کردبـوون، لە ئارەزووەکانیـان هاوشـێوەی ئـاژەڵە کێوییەکان بـن، ئەوان بە دانیشـتنەوە دەنووسـتن و هەستیشـیان بە ئاگـا بـوو. بە بچـووکترین خشـپە، قەڵەمبازیـان دەدایە نـاو تاشەبەردەکان و دەستیان لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکانیان ئامـادە بوو. ئاخر ئەوان دەیـانزانی مەرجـی مـانەوەی ژیانیـان بەنـدە بەو ئاگایی و وریاییەوە، هەرچەندە وەك دەڵێن خەو زاڵمە و بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە، بەڵام ئەمان کەسانی ئەزموونـدار و جەڕبـاوی ناو دۆخە ئاڵۆزەکە بوون.

کاتێکی زۆر بەسەر نووستنەکەیان تێنەپەڕیبوو، هێشتا چێژیان لێ وەرنەگرتبوو. لە ناکاو بێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەك لە لوتکەکەوە تاڤگەیەکی ترسناکی قوڕ و خۆڵ و دار و بەردی قەدپاڵەکە داڕمایە سەریان، سێلاوەکە هەموو شتێکی ڕادەماڵی کە دەکەوتە پێشی، خۆیان و بەختیان ئەشکەوتەکەیان لە خوارەوەی دۆڵەکە نەبوو، ئەگەرنا لەوانەیە تێبچووبانایە، وەلێ ئەوان هێشتا ترسی ئەوەیان هەبوو، نەبادا سێلاوەکە ئەشکەوتەکەیان بخاتە ژێرەوە و ئەوانیش تێیدا گیرۆدە بن، نەخاسمە ئاوەکە تا دەهات زیاتر شەپۆلی دەدا و سات لە دوای سات زیادی دەکرد و بەرزتر دەبووەوە، وەلێ تەنها گەیشتە بەردەمی ئەشکەوتەکەو زیاتر هەڵنەکشا. خۆ ئەگەر لەو کاتەدا ئەوان لەناو ئەشکەوتەکەدا نەبوونایە، ئەوا بە دڵنیاییەوە کۆتاییان پێ هاتبوو، سێلاوەکە وەکوو ئاومالکە ڕایماڵیبوون. ئەو ئاوە لە ئەنجامی تووانەوەی بەفر و لەژێر ڕەگی درەختەکان و تاشەبەردەکانەوە دەریاچەیەکی بچووکی لە ژێرەوە دروست کردبوو، کاتێکیش دەریاچەکەی ژێرزەوی سەرڕێژی کرد، پاڵەپەستۆکە وای کرد دەریاچەکە وەکوو گرکان بتەقێتەوە و چیتر بەربەستەکە بەرگەی نەگرێت، بۆیە ئەو ئاوە وا سەرشێتانە هێرشی بۆ هێنان و شێتێتی سرووشتی بۆ دەردەخستن کاتێك توورە دەبێت. دوای ئەوەی ئاوی دەریاچەکەی ژێرزەوی تەواو ڕژایە خوارەوە و لەگەڵ خۆیدا هەموو شتێکی ڕامالی، هێز و تەوژمەکەی کەمتر بووەوە و ڕێژگەی ئاوەکەش هێدی هێدی دابەزییە خوارەوە و گەڕایەوە دۆخی پێشتری و لە دوای خۆیشییەوە زەوییەکی خلیسکانی و پڕ لە قوڕ و چلپاوی بۆ جێ هێشتن.

ئیبراهیم لە کاتێکدا سەرنجی دابووە ئەو کاولکاری و زیانە

زۆرەی تاڤگە سەرشێتەکە بە دۆڵەکەی گەیاندبوو، گوتی:

- ڕەحمان بینیت لێرە چی ڕووی دا؟ ئەمەیە سرووشتە سەرنجڕاکێش و جوانەکەت، کە هەمیشە بە شانوباڵیدا هەڵدەڵێیت و ستایشی دەکەیت، وەك ئەوەی دڵداری لەگەڵ خانمێکی شۆخوشەنگ و جواندا بکەیت؟!

ڕەحمانیش:

- ژنی جوان خەراپتریش دەکات ئەگەر تووڕە بێت......ها!

مامۆستا عومەریش لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەوە وەڵامی دانەوە:

- نە ژنی جوان و نە سرووشتی سەرنجڕاکێشیش سوودێکمان پێ ناگەیەنن، با سەرێك لە هێسترەکە بدەین بزانین چی بەسەر هاتووە.

ئیبراهیم گوتی:

- باوەڕ ناکەم ئاوەکە گەیشتبێتە هێسترەکە.

بەڵام ڕەحمان لەو کاتەی فووی لە پشکۆکان دەکرد بۆ ئەوەی گڕ بگرنەوە، لەبەرخۆیەوە گوتی:

- دەبا ئاوەکە بگات پێی، ئەو بەناز و تەمبەڵە بە کەڵکی چی دێت! ڕاستیان گوتووە هێستر لە کەری دێزە لاسار و جینگزترە، هەر ئەوەندەی ماوە بە نۆرە لەسەر پشتی خۆمانی هەڵبگرین.

پاشان لەسەر بەردێکی بچووك بە چینچکەوە دانیشت و خۆی گەرم دەکردەوە. ئیبراهیمیش خەریکی چاوی بوو،

چونکە جارێکی تر دەستی بە ئازار کردبووەوە، بە توندی دەستی بە سەرییەوە گرتبوو، وەك ئەوەی سەرئێشەیەکی گرانی تووش هاتبێت. بۆیە پارچە پەڕۆیەکی بە گەرمی پشکۆکان گەرم کردەوە و خستییە سەر ناوچەوانی بەو ئومێدەی ئازارەکەی بڕەوێتەوە. ڕۆیشتنی عومەر هێندەی نەخایاند، گەڕایەوە و ئەوەی ڕاگەیاند کە هێسترەکە کڕ و بێدەنگە، تووشی هیچ بەڵایەك نەهاتووە و وا بە ئارەزووی خۆی لەو گیا و پووشوپەڵاشە دەلەوەڕێ کە قوڕاوەکە پیسی نەکردوون، تەنانەت نەیشیترساندووە.

خەو لە چاوی هەرسێکیان ڕەوییەوە، وێڕای ئەوەی هێشتا جەستەیان شلوخاوە و پێویستییان بە پشوودانی زیاتر هەیە. نزیکەی چارەگە کاتژمێرێك بە بێدەنگی بەرانبەر یەکتری دانیشتن و هیچیان ورتەیان لێوە نەدەهات. هەر یەکە و چووبوونە ناو جیهانی خۆیانەوە و هەر یەکەیان بە دەرد و خولیا و ئەندێشەکانی خۆیەوە سەرقاڵ بوو.

مامۆستا عومەر جگەرەیەکی داگیرساند، کە پێشتر نیوەی کێشابوو، زۆر بە چێژ و لەزەتەوە قومی لە جگەرەکەی دەدا و زۆر وەستایانەش دووکەڵەکەی بە هەوادا دەدا، هەوڵی دەدا بە دووکەڵی جگەرەکەی بازنەی دووکەڵاوی لە هەوادا دروست بکات، بەڵام لەو کارەیدا سەرکەوتوو نەبوو، ئاخر ئەوەش کوڕی خۆی دەوێ! بۆیە وازی لەو گەمەیە هێنا و لە ناکاو وەك ئەوەی ئەوانی دیکەش بکاتە هاوبەشی بیرۆکەکەی گوتی:

- ئەرێ مێشکی ئەو جووتیارانە پێویستییان بە پاککردنەوە و شوشتنەوە نییە لەوەی بۆیان ماوەتەوە؟!

ڕەحمان بە بێزارییەوە:

- مێشکی ئەوانە ناشووریتەوە و پاکیش نابێتەوە، هەتا ئەگەر باشترین سابوونیشیان بۆ بەکار بهێنیت!

عومەر بە قێزلێکردنەوە گوتی:

- هەموو گەمژەییەکانیان بە لایەك و گەمژەیی دوێنێ شەویشیان بە لایەك!

- چییان کردووە؟!

ڕەحمان بەوپەڕی پەرۆشییەوە پرسی و ئیبراهیمیش گوتی:

- جا گەمژەیی لەوەی دوێنێ شەو ئەنجامیان دا، زیاتر دەبێ چیتر هەبێت؟!

ڕەحمان کە خەریك بوو ئارامی نەمێنێت گوتی:

- ئەوە چییە؟! مەتەڵە؟ ئێستا تێگەیشتین گەمژەییەکیان ئەنجام داوە، دە پێم بڵێن چییە؟!

عومەر بە زەردەخەنەیەکەوە، ئارەزووی تووڕەکردنی ڕەحمانی بزۆز و هەمیشە وای لێ دەکرد دڕدۆنگ و نیگەران بێت، گوتی:

- پێم وابوو لەو قسانە تێگەیشتبوویت کە لە زەماوەندەکەدا بەڕێوە چوون.

- ئێوە باسی گەوجێکی گەمژەتان دەکرد. ئایا ئەوە ڕاستە؟

- کەواتە تۆ تێگەیشتوویت. ئایا لەوە سەیر و نامۆتر هەیە کە ئەو کچە بچووك و بەستەزمانەیان داوەتە ئەو گەمژەیە؟!

- ئەرێ ئەوە هەر بە ڕاستی شێت و گەمژەیە؟!

- ئەی بۆ نا، ئەو لە شێتخانە بووە. هەندێکیش دەڵێن ڕای کردووە. بەشێکی دیکەشیان دەیانگوت: کەسوکاری دەستەبەریان کردووە و گوتوویانە ئێمە چاودێری دەکەین. لە ماوەیەکی کەمدا جووتیارەکان چەندین چیرۆکی جۆراوجۆریان لەسەر دەگێڕایەوە، کەسیش نازانێت تا چەند ڕاستییان تێدایە، بەڵکوو تەنانەت دەیانگوت کاتێکیش لای ئەم پیرەژنە گیرساوەتەوە، ئەو بۆ ماوەیەك حەشاری داوە و نەیهێشتووە کەس بەو نهێنییەی بزانێت.

ڕەحمان پرسی:

- ئەی باشە چی وای لێ کردوون ئەو کچە جوانەی بدەنێ، مادام دەزانن شێتە؟!

عومەر کەمێك جووڵا و شوێنی دانیشتنەکەی ڕێك خست و گوتی:

- ئەوە چیرۆکێکی درێژە.

ڕەحمان بە پرتەوبۆڵەوە ملی دەتەقاند و بە بێزارییەوە گوتی:

- دەی دە باشە، وەك خەونەکەم ڕەوییەوە، دە ئەو چیرۆکەشم بۆ بگێڕەوە بەڵکوو بنوومەوە.

ئیبراهیم بە داخەوە گوتی:

- ئەوە خوشکە دووانەکەی ئەو کچە بوو کە لەناو بەفرەکە ڕەق بووبووەوە.

- بۆ ئەو کچەی ڕەق بووبووەوە و بەفر بەستبووی خوشکی دووانەی هەیە؟!

- ئەوە چییە ڕەحمان، دەڵێی لەگەڵ ئێمەدا نیت؟! ئەرێ کەسێك هەیە لەناو ئێمەدا هەموو شتێك دەربارەی ئەوە نەزانێت؟!

عومەر لەو کاتەی کیسە گەڵاچایەکەی بۆ فڕێ دا، وای پێ گوت، ڕەحمانیش بە منگەمنگەوە گەڵاچایەکەی وەرگرت و لەبەرخۆیەوە گوتی:

- من جگە لە چەند وشەیەکی کەم بەولاوە هیچی تری لەبارەوە نازانم.

عومەر گوتی:

- ئەگەر دەتەوێ بە تەواوی گوێ لە چیرۆکەکە بگریت، چایەکی خۆشمان بۆ لێبنێ و درێژەی زانینی چیرۆکەکەش لە من وەربگرە.

ڕەحمان کیسە چایەکەی بۆ فڕێ دایەوە و گوتی:

- نەخێر نامەوێ گوێم لێی بێت، تۆ چایەکە لێبنێ!

عومەر ویستی دیسان کیسە چایەکە بۆ ڕەحمان فڕێ بداتەوە، بەڵام ئیبراهیم لە دەستی سەند و گوتی:

- بێنە... من چایەکەتان بۆ دەکەم، هەردووکتان لە کەر لاسارترن، ئەو هێسترە تەمبەڵە لە ئێوە بەسوودترە.

عومەر ڕاستەوخۆ دەستی بە گێڕانەوەی چیرۆکی کچەکە کردەوە. پێ دەچوو پێشتر ئەو چیرۆکەی گێڕابێتەوە، دەستەواژەکان بە تەواوی لە یادگەیدا جێگیر بووبوون، گوتی:

- پێش دوو ساڵ دەستەکەمان بەرەو ناوچەی "کۆستا" دەڕۆیشتین و ڕوومان کردبووە "ڕۆست"، وەرز وەرزی باوبۆران

و ڕەهێڵە و بەفر بوو... دەرچوونمان لەو ئانوساتەدا هەڕەشە و ڕووبەڕووبوونەوەی سرووشتێکی سەخت و دژوار بوو، ململانێ بوو لەگەڵ ڕۆژگار...

ڕەحمان ئیستێکی پێ کرد و قسەکەی پێ بڕی:

- دەبینم دەستت بە باسکردنی شتێك کردووە پەیوەندی بە بابەتەکەوە نییە.

ئیبراهیم لە کاتێکدا کترییەکەی پڕ دەکرد لە ئاو گوتی:

- لێی گەڕێ ڕەحمان با باسی بکات، کاتێکی باشمان بە دەستەوەیە، ئەم دەستبەتاڵییە بە گێڕانەوەی چیرۆك نەبێت کۆتایی نایەت.

ڕەحمان گوتی:

- من پرسیارێکی ڕوون و ڕەوانم دەربارەی کچە بەفرینەکە کرد، نەك سەرمان بە قسەوباسی دیکەوە بێشێنێت. وا بزانم لەو کەسانەیە کە حەزیان لە وانەگوتنەوەیە بە هۆ و بەبێ هۆ.

ئیبراهیم وەڵامی دایەوە:

- ئێ باشە ئەوە چ زیانێکی تێدایە؟! دەبا کۆڕ ببەستێ و وانەش بڵێتەوە!

ڕەحمان بە شێوازێکی گاڵتەکردنەوە گوتی:

- هەهەهەهە... هەمووتان وەکوو یەکن، هیچ شتێکتان لە یەکتری جوودا نییە. هەمووتان حەزتان لێیە لە پێشەوە دابنیشن، لە شوێنێکی دیار و بەرچاو، مایکرۆفۆنێکتان لەبەردەمدا بێت و خەڵکیش لەبەرچاوتان قوتابی بچکۆلانەی پۆلن و گوێتان لێ

دەگرن. ئەوەشتان بەلاوە ئاساییە ئەگەر نیوەی ئەوانەی گوێتان لێ دەگرن، نووستبێتن و نیوەکەی دیکەش لە زیندەخەودا بن. گرنگ ئەوەیە چەقەچەق بکەن و فەیلەسووفانە بدوێن. نازانم ئێوە چیتان لەمە دەست دەکەوێت؟! وای کە فێڵبازن! هەتا لە شاخیش لە کۆڵمان نابنەوە، وا باشتر بوو لەگەڵ چەکەکان مایکرۆفۆنیشتان بۆ بهێنین. ئێوە ئەی وانەبێژە بەڕێزەکان، شەیدایەکی سەیری مایکرۆفۆنن... هەر بە جارێ عاشقین، خۆ ئەگەر بە دزییەوە لێفە و پەتووی سەر یەکێکتان لا بدەم و بزانم چی لە ژێردایە، دڵنیام دیمەنی دەستلەملانێی مایکرۆفۆنێک دەبینم، ئەوەندەتان حەز لێیە.

مامۆستا عومەر بە بزەیەکەوە وەلامی گاڵتەجارییەکەی ڕەحمانی دایەوە:

- به ڕاستی دەستەواژەی دەستلەملانێی مایکرۆفۆن سەرنجی ڕاکێشام، شۆخییەکی جوانە. ڕێک دەشێ ئەم دەستەواژەیە لە شێوەی کاریکاتێرێک دروست بکرێت، بەڵام ڕەحمانە فەنی تا ئێستا نە کۆڕم بەستووە و نە وانەشم گوتۆتەوە و نە لە ژیانیشمدا شەیدا و عاشقی مایکرۆفۆن بووم.

دیسانەوە ئیبراهیم هەڵیدایە و گوتی:

- ئەرێ عومەر تۆ واز لە ڕەحمان بێنە، هەر بە ڕاستی تۆ بۆچی چیرۆك نانووسیت، تۆ لە هەموو شتێکت تێدایە و لە هیچت کەم نییە، هەم بەهرە و هەم پاشخانێکی ڕۆشنبیریی باش.

گڕی جگەرەکەی مامۆستا عومەر گەیشتبووە قونکەکەی، بێ ئەوەی هەستی پێ بکات، کاتێك مژێکی دیکەی لێ دا، ئینجا هەستی بە گەرمی گڕەکەی کرد لە نێوان پەنجەکانی و تاڵییەکەی لەسەر زمانی، بەڵام نەیکوژاندەوە و گوتی:

- زۆر بە سادەیی وەڵام دەدەمەوە، نووسین تامی نەماوە. هەر بیرۆکەیەك دەتەوێ دابیرێژیت و شتێکی لەسەر بنووسیت دەبینی سەدان کەس لە پێش تۆوە لە هەموو لایەکەوە لە سەریان نووسیوە و تاووتوێیان کردووە، تڵپی تەڕیان تێدا نەهێشتۆتەوە. هەتا لە هۆلیوودیش بیرۆکەیەك نەماوە بەکار نەبرابێت، ئیدی نووسین و دووبارەبوونەوە لەپای چی و چ سوودێکی هەیە؟!

- ڕاستە، بەڵام ڕێگەی باسکردن و شێوازی تایبەتی نووسین و زمانی نووسەر و کۆمەڵێك وردەکاریی دیکە بۆنوبەرامەی خۆیان هەیە و شتێکی نوێی پێ دەبەخشن.

- لەگەڵ ئەوەشدا هەر دووبارەیە، هەزاران چیرۆکیش هەن باوك بە ناوی پاککردنەوەی شەرەف کچی خۆی کوشتووە، هەزاران چیرۆك و فیلمیش هەن دەربارەی ژنی بە مێرد کە لەگەڵ هاوڕێی پیاوەکەی دەستی تێکەڵ کردووە و خیانەتیان لێ کردووە، ملیۆنان چیرۆکی دیکەش دەربارەی کچی بچووك و منداڵ هەن کە بە بچووکی دەستدرێژی کراوەتە سەریان و لە گەورەییشدا بەدەستییەوە ناڵاندوویانە و لەوانەیە بووبنە قوربانیش. ملیۆنانی دیکەی دووبارەش لەسەر جەللاد و قوربانی و گۆڕینەوەی ڕۆڵیان لەگەڵ یەکتریدا هەن، دەربارەی خێر و شەڕ، ناشیرینی و جوانی، دەوڵەمەندی و هەژاری، دەربارەی ململانێی مرۆڤ لەگەڵ ویژدانی خۆی، یان ململانێی مرۆڤ لەگەڵ دڕندەکانی ناخی خۆی، ملیاران ڕۆمان و چیرۆکیش هەن شتێك نەماوە لە ژیاندا هەزاران جار ئەوان تاووتوێیان نەکردبێت و ئاماژەیان پێی نەدابێت، ئەرێ ئەمە بێزارکەر و وەڕسکەر نییە؟!

- ئیدی لە دوای ئەمڕۆوە شتێك لەسەر ئەو باسە نانووسرێت.

- بەڵێ، بەڵکوو یاداشتەکانی خۆی دەنووسێتەوە و ئەو ڕووداوانەی لە ژیانیشیدا ڕوویان داوە تۆمار دەکات، خۆ ئەمانەش هەر ڕووداوی دووبارە و هاوشێوەن ڕۆژگار زۆری لێ خواردوون و خواردوونەتەوە، بەر لەویش هەزاران کەسی تر ژیاوە و لەوانەشە سەدان چیرۆکیشی لەسەر نووسرابێت. وەلێ ئەو بەرهەمانەیان هەر بە مولکی هەست و یادەوەرییەکانیان دەمێنێتەوە و هەر بۆ خۆیانیش لە ئەلبوومی وێنەکانیاندا شانازی پێوە دەکەن، هەر کەسێکیش دەیەوێت خەڵکی وەڕس و بێزار بکات، با بچێت لە کتێبێکدا بۆ خۆی چاپیان بکات.

- شتێکی دیکە بڵێ هاوڕێ. من هەرگیز بەمە باوەڕ ناکەم. تەنها بۆنی کتێب و دەستلێدانی کاغەزەکانییە کە هیچ خوێنەرێك توانای بەرگەگرتنی نییە، هەتا ئەگەر ڕووداوەکانیشی دووبارە و سێبارەش بن.

مامۆستا عومەر بە خێرایی وەکوو پاشگەزبوونەوەیەك لە قسەکەی خۆی گوتی:

- ڕاست دەفەرمووی ئیبراهیم، من لە خۆڕا قسە دەکەم. لەوانەیە مرۆڤ دەستبەرداری هەموو شتێك ببێت تەنها کتێب نەبێت، فەیلەسووفێك هەیە گوتوویەتی: "ژووری بێ کتێب، وەکوو جەستەی بێ ڕۆح وایە"، یەکێکی دیکەش هەر دەربارەی کتێب گوتوویەتی: "کتێب باشترین هاوڕێیە".

ڕەحمانیش بۆ ئەوەی بیگەڕێنێتەوە ناو بابەتەکە ئەویش هەڵی دایە و گوتی:

- ئەی دوای ئەوە چی؟! با بگەڕێینەوە بۆ بابەتەکەی خۆمان. لە وەرزی ڕەهێڵە و بەفر و بۆران و زریان گەیشتینەوە ڕۆست، هەموو ئەمانە دەزانم... خۆ منیش لەگەڵتان بووم و کچە

بەفرینەکەم بینی، یان ئەوەت لە یاد کردووە. ئێستا چەند تامەزرۆم چیرۆکەکەی بزانم. ڕاستە ئێوە لە کاتی خۆیدا بە شێوەیەکی سەرپێیانە باستان کرد. هەرچەندە چیرۆکەکەی لە چیرۆکی ئەو گوندنشینانە جیاواز نییە کە لەبەر هەر هۆیەك بێت ناوبانگیان زڕاوە و کەسوکاریان بەوپەڕی دڕندەییەوە سزایان داون. گوێم لە چیرۆکی کچێك بوو کەسوکاری بە درەختێکەوە بەستابوویانەوە و توند شەتەکیان دابوو. پاشان باوکی لووتی و گوێیشی بڕی بوو و لەو چۆلییە بۆ گورگ و دڕندە کێوییەکانی بەجێ هێشتبوو. چەند تامەزرۆم ئەو گوندنشینانە بە درەختێکەوە ببەستمەوە، تاکوو گورگ لەتوپەتیان بکات.

- دەتەوێ چی دەربارەی بزانیت؟!

- ئەوەی تۆ لەو کۆمەڵەیەوە بیستت کە ڕێوییەکەیان دەرخوارد داین.

عومەر دەیویست پێچوپەنایەك بکات و ڕەحمان بێزارو وەڕس بکات:

- ئای ڕێوی. بە ڕاستی خواردنێکی بەلەزەت بوو دوای ئەو برسێتی و ماندووبوونەی هەر بە تەواوی شەکەتی کردبووین، ئەی گۆشتاوەکەی بۆ ناڵێیت...؟! بەە بەە لەو گۆشتاوە، هەر باس ناکرێت، بەو مەرجەی سەیری ناو مەنجەڵەکە نەکەیت و سەر و کەللە و کەڵبەکانی نەبینیت، کە کتومت لە سەری تانجی دەچێت.

ڕەحمان پرتەوبۆڵەیەکی کرد و ڕووی خۆی مۆن و گرژ کردەوە:

- من چیم لە گۆشتاوی ڕێوی سندان کوشتی داوە.

ئەوەنـدە مـاوە بلێـی سـوێربوو، یـان بـێ خـوێ بـوو، لیمۆیـان گووشیبووە ناوی یان نا، کارییەکە هیندی بوو یان ئەفریقی!

ئیبـراهیم لە کاتێکـدا چـایەکەی دەدایە دەسـت ڕەحمـانەوە گوتی:

- ئیدی ئەوە مامۆستا عومەرە عومەر. پێشەکی و بەرکوڵی باسەکەت پێشکەش دەکـات، پـێش ئەوەی بچێـتە نـاو کرۆکـی بابەتەکەوە.

- بۆ پێشەکییەکە کێشەیەکی ئەوتـۆ نیـیە، بەڵام دەربـارەی کچە بەفرینەکەی دۆزیمانەوە، نەك دەربارەی گۆشـتاوی ڕێـوییە تەڕەماشەکە.

دەسـتەکە ئەو کـاتە کـچە بەفرینەکەیـان دۆزیـیەوە کاتێـك بارەگـاکەی خۆیانیـان لە کۆسـتا بەجـێ هێشـت و لە گەڕێکـی سـووڕانەوەی دەڤەرەکەدا بـوون و بەرەو چیـای حەسارۆسـت دەڕۆیشـتن، بە کـورتی ئەو کـاتەی مـنەی شـوێنی بارەگـایەکی تازەیـان دەکـرد لە نـاوچەکە، تـا دواتـر بارەگـاکەی خۆیـان لە ڕۆست دانا. ئەو کاتە دەستەکە تازە ڕووی لە شـاخ کردبوو. لە ڕێـگەی خۆیـدا بە چەنـدین گونـدی دوورەدەسـت و دابـڕاو لە هەموو شارستانییەتێکدا تێدەپەڕین. بەڵام بە هیچ جۆرێك بیریـان لەوە نەکردبووەوە کە ئەو گوندنشینە باش و دڵپاکـانە، گـورگی دڕندەش لەناویاندا خۆی حەشار دابێت و لە دەروونیـدا خـووی خەراپ و بەهای سەخت و دڵڕەقـانەی تێـدا چێنـدرابێت، کە لە هەموو هەستێکی مرۆڤایەتی بەدەر و دوور بێـت. ئەو پێشـمەرگە تازانە بێئاگا بـوون لەوەی کە دەمـێکە ئەو چیـا و دەشـتودەرە بە نەهامەتی و کارەسات و دەرد و بەڵا دووگیـانن. تـا ئەو کـاتەی تیایدا ژیان و لەگەڵ کـار و کـردەوە و هەڵسـوکەوتیاندا تـێکەڵ

بوون، ئەو کاتە ژیان تەواوی ئەو ڕاستییانەی بۆ دەرخستن و سەری گەنیوی چاڵەکەی بۆ هەڵدانەوە، هەرچی کار و کردەوە و هەڵوێستی خەراپەکاری و گەمژەییە بۆی ئاشکرا کردن. لە لایەکی دیکەشەوە چیاکان لە خودی خۆیاندا دڕندە و ترسناکن، دڕندەن بە بەفر و زریان و باهۆزەکانیانەوە، نەخاسمە کاتێک لە ژیان دادەبڕێن. کاتێک ئەم دەستەیە بەرەو چیا و دۆڵەکانی حەسارۆست هەنگاوی نا، هەموو گوندەکانی سەر ڕێگەیان چۆل و وێرانە بوون، ماڵەکانیان خاپوور کرابوون، ڕژێم بە ئەنقەست ئەو ناوچەیەی وا کاول و وێرانە و چۆلوهۆل کردبوو. بە جۆرێک ئەستەم بوو مرۆڤ بتوانێت لەو هەموو گوندە ڕووخێنراوەدا هەرچەندی بگەڕێت و بسووڕێت لا دیوارێك بە پێوە ببینێت، ئاخر پیاوانی دەسەڵات تەڕ و وشکی ئەو دەڤەرەیان ئاگر دابوو، کانیاویان پڕ کردبوونەوە و دار گوێز و چنار و هەرچی ڕەز و باخیان هەبوو بڕیبوونییەوە و سووتاندبوونی. لەو کاتەدا بەفر هەموو شتێکی داپۆشیبوو، بە جۆرێک هەموو شتەکانی دەوروبەریان و پشت ئەوانیشەوە هاوشێوەی یەکتری بوون، هەتا چاو بڕ کات و ئەودیوی چاوبڕکردنیشەوە هەر سپی و سپی دەچوونەوە، دەستەکە لەناو ئەو هەموو سپیاتییەدا ون بوون، بۆیە سووربوون لەسەر ڕێکردن بە یەك ئاراستە ئەویش بەرەو بەرزترین لوتکە لە زنجیرە چیای حەسارۆست. سەرماکە تەنگی پێ هەڵچنیبوون. هەرچەندەش کات زیاتر تێدەپەڕی و ڕێکردنەکەشیان درێژتر دەبووەوە، ئەوان زیاتر شەکەت و ماندووتر دەبوون و لە پەلوپۆ دەکەوتن، وەلێ کۆڵیان نەدەدا. ئاژەڵە کێوییەکان بە برسێتی و لەبەر ئەو ساردی و سەرما تواناپڕووکێنە، خۆیان لە ئەشکەوت و کونەکانیان

حەشـــار دابـــوو، هەتـــا ئاژەڵەکـــانیش دەیـــانزانی برسـێتی لەم سەرماوســـۆڵەیە باشـــترە. دەســـتەکە تەواو هەســـتیان بەو بەڵا و تەنگژەیە کردبوو کە تێی کەوتوون، گەیشتبوونە نیوەی ڕێگـا، تـازە گەڕانەوە بـۆ بارەگـای کۆسـتا کە ئەوان لێـیەوە هـاتبوون مەحاڵ بوو. بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەشیان ڕێگەی نۆ کاتژمێریان لەبەردەمـــدا بـــوو، جـــا وەرە ڕێـــگە ون بکەیـــت و بەنـــاو سەهۆڵبەندانیشدا تا ئەژنۆ و زیاتریش لە بەفرێ بچەقیـت، هەر بە ڕاسـتی کـوڕم دەوێـت نەڕووخێـت و بەوپەڕی ورەبەرزی و بە بێدەنگییەوە هەنگاو بهاوێت، ئاخر ئەوان وێڕای ونکردنی ڕێـگە، زریان و سەرماکە دەست و قاچ و سەری لـووتی دەچزانـدنەوە. پۆشاکی بەریان هەر لە کڵاو و جامانێکەیانەوە بگـرە تـا دەگـاتە پـێڵاوەکەی پێیـان بەسـتبووی، نە دەسـکێش و پەنـجەوانە و نە گۆرەوییەکی ئەستوور کە دەسـت و پێیەکانیـان گەرم بکـاتەوە، جـــووڵەی بەردەوام و ڕێکردنیـــان، تـــۆزە گەرمـــاییەکی پـــێ دەبەخشـین، ئەگەرنـا ڕەق دەبـوونەوە، کەواتە هەر ڕاوەسـتان و پشـــوودانێك، زەنگـــی مەرگە و لە هەر ئانوســـاتێکدا بـــێ لـــێ دەدرێـــت، شـــەکەتی و برسـێتییش پـــرزەی لەبەر بڕیبـــوون، بە ناچـاری لە شـوێنی خۆیـان ئیسـتێکیان کـرد؛ بەمـلا و بەولای خۆیاندا ڕووانییان و سـەرنجی وردیـان دا، تـا چاوبڕکـات سـپی دەچێتەوە، دەشتودەر و شاخ و هەتا ئاسـمانیش سـپی سـپی. ئەی چی بکەن؟!" کەس نازانێت! کەواتە هیچ چارەیەکیان نییە تەنهـا ڕێکـردن و بەرەوپێشـچوون نەبێـت، چـونکە بە دڵنیـاییەوە هەر ڕاوەسـتانێك دەیانکـاتە پـارچەیەك بەفـر. لە دوورەوە گونـدێکی کـــاول و وێرانیـــان بە دی کـــرد، ئەوەی یەکەم جـــار کـــاولە دێـیەکەی بە دی کـرد و ئەو مـوژدەیەی پێ بەخشـین، گـوتی:

"دەربازمان بوو! ئەوانی تر بەو قسەیە شاگەشکە بوون و هەر کەسە و لە شوێنی خۆی ڕاوەستا، وەك ئەوەی باوەڕ بەو قسەیە نەکەن، یان هەستی پرسیارێکی هەستیار لە ناخی زۆربەیاندا وروووژا، دەبێ چۆن دەربازیان بووبێت... چی بووە؟ کە هەمووان لە دۆخەکە گەیشتن، یەکێکیان گوتی: بە کۆنە داروپەردووی ژێر ئەو کەلاوانە ئاگرێك دەکەینەوە، وای لە ئاگر، تەنها ئاگرە دەبێتە مایەی فریادڕەسی ئەم پۆلە پارتیزانە، یەکێکیان بیری لەوە دەکردەوە خەریکە ناهەقی خەڵکانێك نەگرم، ئەگەر ئاگر بپەرستن، ئاخر لە هەلومەرجی وادا، تەنها ئاگرە لە مەرگی مسۆگەر ڕزگارت دەکات و ژیانێکی تازەت پێ دەبەخشێتەوە، یەکێکی دیکەیان هاواری کرد: ئاگر ئاگر، دەی زوو ئاگرێك بکەنەوە، وای چەندە پێویستیمان بە گەرمییەك هەیە، جووڵە بخاتەوە بەر جەستەی ساردوسڕمان. لە کاتێکدا ئەوان بە ئومێدی گەیشتن بەو کەلاوەیە هەنگاویان دەنا، بەڵایەکی تر پێشی پێ گرتن، بەسەر ڕووبارێکی بچووکدا کەوتن، هەرچەندە بچووك بوو، بەڵام پەڕینەوە لێی جۆرێك بوو لە مەحاڵ، هاژەی دەهات، کەفوکوڵی ئاوەکەی هەترەشی مرۆڤی دەبرد، تیژ تیژ خۆی بەمبەر و بەوبەری کەنارەکەدا دەدا و خوڕەی دەهات، کەلاوەکەش لەوبەری ئاوەکەوە بانگی دەکردن. هەندێکیان لە پەڕینەوە و گەیشتن بە کەلاوەکە نائومێد لە شوێنی خۆیاندا ڕەق ڕاوەستان. زۆر جار ڕێککەوت ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت و مەحاڵ دەکاتە واقیعی حاڵ، بەو ناوەدا کەوتنە پایدۆزی دۆزینەوەی دارێکی گەورە، تاکوو پردێکی لێ دروست بکەن و بەسەریدا بپەڕنەوە، خۆیان و بەختیان ئەو شوێنەی ئەوانی لێ بوون دارێکی بڕاوی زۆری لێ بوو، پێ دەچوو لە کاتی ڕاگواستنی

گوندەکان، ڕژێم ئەو هەموو دار و درەختەی بڕیبێتەوە، کۆنە کاریتەیەکی گەورە و درێژیان دۆزییەوە، بەڵام کاریتە چ کاریتەیەك؟! درێژ و قورس، کاتێك هەوڵی هەڵگرتنیان دا، ڕێك لە پارچە سەهۆڵێکی درێژ دەچوو، سارد سارد، دەستی تەزاندن، ئیدی بە ناچاری فوویان لەناو لەپیان دەکرد و دەیانگوشی، یان دەستیان دەکردە ژێر هەنگڵ و ناو باخەڵیانەوە، تاکوو لەو جەستە ساردوسڕەیانەوە تۆزە گەرمایيەك ببەخشنە دەستوپەنجەکانیان.

سەرما و ماندوێتی و بێئومێدی و برسێتی و شکست، پێنج بەڵای گەورە بوون و هەرچی هەوەس و خۆشی هەبوو لە ناخیاندا هەڵیانپڕووکاندبوون و دڵەڕاوکێ و نائارامییان بە هەست و مێشکیان بەخشیبوو، بەمەش جڵەوی دەسەڵاتیان بەسەر مێشکیان لەدەست دابوو، بە بچووکترین شت تووڕە دەبوون و هاواریان دەکرد و جنێویان دەدا. وا باشتر بوو بەسەر خۆیاندا زاڵ بن و ورە و ئازایەتییان لەدەست نەدەن و زیاتر خۆڕاگر بن و بەرەو خواری خوارەوە دانەڕووخێن، ئەگەرنا مەرگ پەی پێ بردوون و هەستیشی پێ کردوون، هاکا پەلاماری دان، دۆخەکە هی ئەو تووڕە و توندییە نەبوو، هەلومەرجەکە ترسناکە و وایان لێ دەخوازێت پەیوەندی و ڕایەڵەی نێوانیان تۆکمەتر بکەن و کۆڵ نەدەن. زاهیر وەك ئەوەی لە ژیانیدا جگەرەی نەکێشابێت و سینگی لرخەی نەیەت و وەك ئەوەی لە پڕێکا هێز و وزە و توانای تەقیبێتەوە، باوەشی بە کاریتە گەورەکەدا کرد و لە شوێنی خۆی کەمێك جوولاندی، دارەکە وا بە زەوییەوە نووسابوو، وەك ئەوەی ڕەگی بە زەویدا ڕۆ چووبێتە خوارەوە و سەرەڕای بڕینەوە و دوورخستنەوەی لە ڕەگوڕیشەکەی، کەچی وەکوو ئاشقێك باوەشی بە زەویدا کردبێت ئامادە نەبوو

دەستبەرداری دوورکەوتنەوە بێت لەو خاکەی تێیدا چەکەرە و باڵای کردووە و بۆتە ئەم کاریتە زل و زەبەللاحەی وا ئەمان بە دەستییەوە دادوبێدادیانە، وەلێ بە بینینی ئەو هەوڵەی زاهیر ئەوانی تریش جۆشوخرۆشێکی وایان سەند، هەرگیز لەو ساتەوەختەدا چاوەڕوانی ئەوەیان لە خۆیان نەدەکرد. بە هەر شەشیان دارەکەیان جووڵاند و بەرزیان کردەوە و توانییان پردێکی پێ دروست بکەن، یەك لە دوای یەك بەسەریدا پەڕینەوە و ڕوویان کردە گوندە ڕووخاوەکە، لەوێ یەکسەر دەستیان بە کۆکردنەوەی داری ژێر بەفر و دیوارە ڕووخاوەکان کرد، وەها شەکەت و ماندوو بووبوون، تواناییان لەبەر بڕابوو، جا وەرە بەو شەکەتییە بتوانە ئاگر لەو دارە تەڕانە بەربدە. ئاگربەردان لەو دارە تەڕ و بەفراوییانە بە لایانەوە بووبووە پرسێکی مەحاڵ، بۆیە شاتەشات و جنێودان و قسەی ڕەق دەستی پێ کردەوە. هەتا جنێویان بە خوداش دەدا. واتە لەو هەلومەرجە دژوارەدا دانیان بە بوونیدا نا! لە کۆتاییدا بە شێوەیەکی خۆڕسکانە دانیان بە بوونی خودادا نا، ئەگەرنا بۆچی جنێو بە شتێك دەدەن، ئەگەر بوونی نەبێت؟! هەرچەندە زۆربەشیان وا خۆیان نمایش دەکرد کە پرسی باوەڕبوونیان بە خودا تێپەڕاندبێت، واتە باوەڕکردن بە خودا... دوای ئەوەی هەموو ڕقە بارگاوییەکانی خۆیان بەو جنێوانە بەتاڵ کردەوە، کە مرۆڤ شەرم لە باسکردنیان دەکات، بەوەندەشەوە نەوەستان دەستیان بە پاڕانەوە لە خوا کرد و چاویان بڕیبووە ئاسمان: "خوای ئازیز تکایە یارمەتیمان بدە، ئەگەرنا ئەم بەڵایە دەمانبەستێت. ئەی خوای بەزەیی ئارامیمان پێ ببەخشە". بەڵام خوا دەمێك بوو دەستی لێ شوشتبوون. بەرانبەر دار و چیلکە و

پووشوپەڵاشـە تەڕەکە چۆکیـان دادا و هـیچ جووڵەیەکیـان پـێ نەدەکـرا، ئەوەنـدە چاویـان بـڕییە ئاسـمان و ئاسـمانیش هـیچ وەڵامێکـی نەدانەوە، لەوەش نائومێـد بـوون و ئـاڵای سـپیی خۆبەدەستەوەدانیان بۆ سرووشـتی سـەخت و دژوار هەڵبـڕی. بە ناچاری بە بەختی خۆیان ڕازی بـوون، هەڵـبەتە هـیچ چارێکیـان نییە و سەرماکە دەیانبەستێت و دەیانکوژێت... ئەمە چ مەرگێکی بەدبەختانەیە؟ ئادەم هاواری کرد: "نەفرەت لەم لە بیرچـوونەوەیە! ئەها بیرم کەوتەوە... دۆزیمەوە... دۆزیمەوە، ئەوەم دۆزیـیەوە کە یارمەتیی هەڵکردنی ئاگرەکەمان دەدات!"

چاویان ئەبڵەق بوو، بە سەرسامییەوە پێکەنینیـان بە قسـەکانی دەهات. وەلـێ لەو دۆخە دژوارەدا کـێ توانـای پێکەنینـی هەیە، ئەوەی دەیانخاتە خەندە و پێکەنین و دڵخۆشـیان دەکـات، تەنهـا ئاگرێکە و هاڵاوی گەرماییەکەی گەرم گەرمیان بکاتەوە، بەڵام ئەوان لە کوێ و ئەو ئاگرە گەرمە لە کوێ؟ بۆیە بە پەرۆشییەوە پرسییان: "چۆن؟ چییە؟!"

کەس باوەڕی نەدەکرد! ئاخر ناهەق نەبوون، چـونکە ژیانیـان پەیوەست بوو بە نیـوە پێلاوێکـی لاسـتیك! ئەو پـارچە پـێڵاوەی ئادەم بۆ ئەم مەبەسـتە لەنـاو کۆڵەپشتەکەیدا هەڵیگرتبـوو. وەلـێ برسـێتی و شـەکەتی و سەرماوسـۆڵە ڕێـگەی بیرکردنەوەیـان شێواندبوو و یادگەیانیشـی شـل و کـول و کڵۆم دابـوو. نیـوەی پـێڵاوەکەی بـڕی، بە پەرۆشـەوە هاواریـان کـرد: "هەمـووی بسووتێنە، بۆچی تا ئێستا بێدەنگ بوویـت؟! چـۆن ئاگـات لەمە نەمابوو؟!"

گـوتی: "گرنـگ ئەوەیە ئێسـتا وەبیـرم هـاتەوە، ئەم پـارچەیە

بەش دەکات و پارچەکەی دیکەش کاتێکی تر بە کەڵکمان دێت".

ئاگرێکی کز خەریك بوو ناخی شاد دەکردن، پاشان بەفرەکە لەسەر دارەکان توایەوە، هێدی هێدی ئاگرەکە گەش بوو، جۆشی سەند و بەرزتر بووەوە، گەرماییەکی ئەوتۆی پێ بەخشین، مەحاڵە هەرگیز لە یادی بکەن، ئاخر هەر ڕێك ژیانی بۆ گەڕاندنەوە. دوای ئەوەی تەواو خۆیان گەرم کردەوە و پشوویان دا و هەر یەکە و چایەك و پارچە نانێکیان خوارد، دەستیان بە ڕۆیشتن کردەوە. هەرچەندە ئارەزووی مانەوەی زیاتریان دەکرد لە دەوری ئاگرەکە و خواردنی پارچە نانێکی دیکەش، بەڵام حەز و ئارەزوو شتێکە و واقیع و ناچاری و ئەو ژیانەی تێیدا دەژین شتێکی دیکەیە. مانەوەی زیاتر لە بەرژەوەندییاندا نییە. تەوەزەلیان دەکات و وزەیان دەبات و ساردیان دەکاتەوە، برسێتیش سەرلەنوێ چڕنۆك لە گەدەیان گیر دەکاتەوە و هەراسانیان دەکات، ئاخر ئەوان هەمیشە برسین، هەتا ئەو کاتەی نانیش دەخۆن هەر برسین. کەواتە ناچارن بکەونە ڕێ، بەو جۆرە دەستیان بە جووڵە کردەوە و بە قەدپاڵەکەدا بەرەو لوتکە سەرکەشەکە هەڵزنان. بۆ ئەمەش هەرچی وزە و توانایان هەبوو کۆیان کردەوە، تاکوو لەگەڵ شاخە نەفرەتییەکە کە لە سەرووی هەورەکەشەوەیە ململانێ بکەن و کۆڵ نەدەن. ترسی گەورەیان ئەوەبوو نەبادا پێیان لەسەر کۆنەچاڵێك، یان ئاودڕێکی گەورە و قووڵ دابنێن کە بەفر دایپۆشیبێت هەڵیانبلووشێت و کۆتاییان پێ بهێنێت، یان ئەگەر لە ژێریان دابڕووخێت و هەرەس بهێنێت، بەفرەکە لە باشترین شوێن کە ئاسان بێت پێیدا بڕۆن دەگەیشتە ئاستی سینگیان، بۆیە بە نۆرە

هەوڵی شکاندن و بڕینی بەفرەکەیان دەدا، تا گەیشتنە لوتکەیەك لە لوتکە سەرکەشەکان، ئەو لوتکەیەی زریان و بەفر و نەهامەتی داپۆشیبوو، ڕەقبوونەوەی مرۆڤەکان لەوێدا لە ئانوساتدا بوو، هەرگیز بەزەیی بە هیچدا نەدەهاتەوە، شەویش خەریك بوو باڵ بەسەر ناوچەکەدا بکێشێت. بەڵام هێشتا دونیا ڕوونە و بینین ئاسانە، چونکە بەفر تاریکی ڕاو دەنێت و ئاسمان و زەوی دەکاتە یەك پارچە سپێتییەکی زەردباوی هەڵبزڕکاو، یان ئەوان لە ئەنجامی برسێتی وای دەبینن. لەو لوتکە ڕووتەنەدا، کە هێشتا بەو وزە و توانا کەمەی هەیانبوو لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون، بەفرەکەش هەتا شان و سینگیان، قەدپاڵ و لوتکەی داپۆشیبوو، لەسەر ڕێگەکەیان پارچەیەکی سپی گەورەیان بینی، سەرەتا وا هەستیان کرد گاشە بەردێکە و بەفر داپۆشیوە، نزیکەی بستێك خۆیان لێی لادا و لە ڕۆیشتن و شکاندنی بەفرەکە بەردەوام بوون، شانی یەکێکیان بەر شتێکی ڕەق کەوت، کە لە لایەکی بارستاییە سپییەکەوە دەرچووبوو، سەرنجی دا و لێی ورد بووەوە، خۆیشی نەیزانی بۆچی لەو چرکەساتەدا ئەو سەرنجەی ئاڕاستە کرد؟ هەر ئەوەتە و توانی ڕەنگێکی نەخشێنراو ببینێت، هەموویان لە دەوری ڕاوەستان، ئەوان خۆیشیان نەیاندەزانی بۆچی وا بە پەرۆشەوە سەرنجی ئەو شتە دەدەن! لە کاتێکدا شەکەتی و برسێتی و سەرما خەریکە پرزەیان لێ دەبڕێت. خۆ لەوانەیە حەزی زانینی شتێکی شاراوە بوویێت، کە جار هەیە وا لە مرۆڤ دەکات ناچار بێت لەوەی گوێی لێ بگرێت و بە قسەی بکات، هەتا لە هەلومەرجێکی وەکوو ئەوەی ئەمانیشی تێدان.

بەفرەکەیان لەسەر ئەو بارستاییەی سەر ڕێگەکە لادا و

ڕۆشنایی لایتەکانی دەستیان سەرسام و هەراسانی کردن، وای چییان بینی و چۆن شۆك بوون؟! ڕوخسارێکی ئادەمیزادانەی کچێك بەبێ لووت و بەبێ گوێ. گومانیان نەبوو لەوەی دەبێ گورگ ئەم کارە دڕندانەیەی ئەنجام دابێت، کاتێك نەیتوانیوە جەستەی بخوات، تەنها قەمپاڵی لەو شوێنە نەرمانە داوە کە بە قەد دەموچاو و کەللەسەری کیژۆڵە بەفراوییەکەوە بوون، وەکوو لووت و گوێچکە و... تاد. بەڵام دەبێ چی ئەم کچەی هێنابێتە ئێرە؟ دەبێ خەڵکی کامە گوند بێت؟ لە کەیەوە وا لێرە بەفر بەستاویەتی و هەر بە تەواوی بۆتە کچی بەفر؟ ئەمەو دەیان پرسیاری دیکە وەکوو مێشە گزگزە بە مێشکیاندا گیزەگیزی بوو. ئەم لوتکەیە لە وڵاتدا بەرزترینیانە و هەرگیز بەفری لێ ناتوێتەوە. خۆ لەوانەیە ئەم ئافرەتە چەندین ساڵی دووروودرێژ بێت لێرە بووبێتە کچی بەفر. دەبێ چ چیرۆکێکی هەبێت؟ ئایا دەبێ تەنها خۆی بێت، یان کەسانی دیکەش لێرە لەژێر بەفرەکەدا نێژراون؟ پرسیارێکی زۆر بە خەیاڵیاندا دەهات و مێشکی دەرزیئاژن دەکردن، لەو کاتەی ئەوان هەموویان بێدەنگ و بێ ئەوەی یەك وشەش دەربڕن. ئەو دۆخەی ئەوانی تێدابوون، هی ئەوە نەبوو لەناو خۆیاندا گفتوگۆ و مشتومڕی لەسەر بکەن، هەر ئەوەتە و هێز و تواناشیان لەبەر مابوو. ئەوان بە هەموو هێزی خۆیانەوە لە هەوڵی ئەوەدان بە زیندوویی بمێننەوە و بەفرەکە وەکوو ئەم کچە نەیانبەستێت. دڵنیابوون لەوەی یەك خولەکی دیکە ڕاوەستان لەوێدا دەیانبەستێت. بۆیە بە شەکەتییەوە کەوتنەوە ڕێگە، بەو هیوایەی گەرمییەك بە جەستەی شەکەتیان ببەخشن. ساردییەکە لێرە وەکوو ساردیی ئەو دۆڵە نییە کە ئاگرەکەیان لێی کردەوە، لەوێ ساردییەکە لە چاو ئێرەوە

گەرمی دەبەخشی، نەك ساردی و سەرما، بە بەراورد لەگەڵ ساردییەکەی. لەوەش دڵنیابوون کە جلوبەرگەکانی بەریان شتێك نییە جگە لە پارچە پەڕۆیەکی شڕ و کۆن، تەنها شوێنە هەستیارەکانیان دادەپۆشێت، وەلێ توانای گەرمکردنەوەیانی نییە. هەتا بوێریی ئەوەشیان تێدا نەمابوو دەست لە ئاسنی ساردی چەکەکانیشیان بدەن لە ترسی ئەوەی نەبادا دەستیان بە ئاسنە ساردەکەیەوە بنووسێت. هەڵبەتە هەموو شتێك کۆتایی هەیە. کەچی لە بەختی ئەوان، ئەو لوتکەیەش کۆتایی نەبوو، لە سەرووی ئەو لوتکەیەوە لوتکەی دیکە بەرەو ئاسمان هەڵکشابوو. بە دیوی دیکەی شاخەکەدا دەستیان بە شۆڕبوونەوە کرد. ئیدی کاتژمێر کاتژمێری دیکەی بەدوای خۆیدا پەلکێش دەکرد و میلەکەی لەگەڵ هەنگاوەکانی ئەواندا لە چرکەچرکی خۆی نەدەکەوت، ئەوانیش لە ڕۆیشتن بەردەوام بوون، تا کازیوەی بەیان. دۆڵێك بەرەو دۆڵێکی دیکە شۆڕی دەکردنەوە، لە یەکێك لەو دۆڵانە بارەگای هێزێکی کوردییان دۆزییەوە، یان ڕوونتر بەسەر بارەگای هێزێکی دیکەی بەرهەڵستکاردا کەوتن، کە لەو ناوچەیە و لە پەناگەیەکدا بارەگایەکی بچووکیان چێ کردبوو، ژمارەیان لە دە کەس زیاتر نەبوو. ئەو ژوورەی تێیدا دەژیان، بە زۆر بەشی خۆیانی دەکرد. دۆزینەوەی ئەو بارەگایە بۆ ئەوان موژدەیەکی خۆش بوو، ئاخر ئەوان شەکەت و برسی و سەرمابردەڵە، دەست و لاق و هەتا هەست و هۆشیش تەزیو، هەردوولا دۆستایەتییەکیان وێکڕا هەبوو، بۆیە دەستەکە بە متمانەوە خۆیان گەیاندە دەوراندەوری زۆپا دارینەکە و خەڕ چوونە ناو خەوێکی قووڵەوە و تا چێشتەنگاوێکی درەنگی ئەو ڕۆژە بە ئاگا نەهاتن. لەو کاتەدا ڕەحمان چیرۆکی کچە

بەفرینەکەی لە یاد کردبوو، هیچ کاتێك پایدۆز و بەدواداچوونی بۆ هەواڵ و زانینی هۆکارەکەی نەکردبوو. وەلێ ئەوەی ئێستا وەبیری هێنایەوە هاوسەرگیریی خوشکە دووانەکەی بوو لە پیاوە شێتەکە. هەرکاتێکیش بۆ ئەو مەبەستە پرسیارێکی لە مامۆستا عومەر بکردبووایە، ئیدی ئەوانی تر وەڵامی وایان دەدایەوە، هیچ پەیوەندیی بە پرسیارەکەیەوە نەبێت، بە ئەنقەستیش وایان دەکرد و مەبەستیشیان شەرفرۆشتن و تووڕەکردنی ڕەحمان بوو.

ئیبراهیم کە چایەکەی دەدایە دەستیان گوتی:

- چای بەبێ حیکایەت و مشتومڕ و چەلەحانێ هەر تامی نییە.

ڕەحمان فڕێکی لە چایەکەی دا و گوتی:

- دەمێکە دەمەوێ شتێك دەربارەی کچە بەفرینەکە بزانم.

عومەر چاوی لە ئاگرەکە بڕیبوو گوتی:

- ئێستا بۆتی باس دەکەم.

ڕەحمان هێشتا لاسارییەکە بەری نەدابوو، وا خۆی نیشان دەدا گوایە گوێی ناداتێ. بۆ ئەوەی دەرفەتێك بە مامۆستا عومەر نەدات وەڕس و بێزاری بکات، ئەگەرنا لە ناخی خۆیدا زۆری چێژ لەوە وەردەگرت کە دەیبیستێت، بۆیە گوتی:

- ڕاستە من ئارەزووی زانینی چیرۆك و بەسەرهاتەکەی دەکەم، بەڵام کارەکەش ئەوەندە گرنگ و جێگەی بایەخ نییە، بۆیە درێژەی مەدەرێ و شێر و ڕێویشمان بۆ مەهێنەوە و ڕاستەوخۆ بچۆ ناو بابەتەکەتەوە، هیچ ئەملا و ئەولا مەکە.

- نازانم ئەم کێشەیە چۆن چارەسەر بکەین؟! تۆ دەتەوێ بە کورتی بیزانیت و ئەویش دەیەوێ درێژەی بداتێ.

ئیبراهیم بە پەرۆشەوە وای گوت و خۆیشی پەرۆشی بیستنی گێڕانەوەی چیرۆکەکە بوو، وێڕای ئەوەی هەموو شتێکی دەربارەی چیرۆکەکە دەزانی، بەڵام وا خۆی نیشان نەدەدا کە هیچ نازانێت. چونکە زانینی زمانی کوردی وای لێ کردبوو بەرانبەرەکەی تێبگەیەنێت و لەو قسەوباسانەش تێبگات کە لە نێوان خەڵکیدا دەکرێن. بەڵام پەرۆشی و حەزی بۆ بیستنی چیرۆکەکە، بە هۆی ئەو گۆشەگیری و دوورەپەرێزییەوە بوو کە ئەوانی تێ کەوتبوون و بە ناچاری تێیدا دەژیان و وایان لێ هاتبوو گێڕانەوەی هەر چیرۆك و بەسەرهاتێك، ئامرازێك بێت بۆ خۆسەرقاڵکردن و کاتبەسەربردنیان، ئەو دەردەسەری و نەهامەتی و ئاستەنگانەی کە دەهاتنە سەر ڕێیان، باشترین چیرۆك بوون بۆ ئەوەی کاتی خۆیانی پێ بکوژن، بەمەش خۆشی و بەختەوەری پێ دەبەخشین و زیاتر دەیخرۆشاندن.

ڕەحمان جارێکی دیکە بە تەوسەوە گوتی:

- پێم وایە گوێ لە چیرۆکێك لە چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەوە دەگرین، دەی مامۆستا عومەر، یان باشتر وایە بڵێم مامۆستا شەهرەزاد فەرموو حیکایەتەکەمان بۆ تەواو بکە، ئەگەرنا قورقوڕاگەت دەگرم و سەرت دەپەڕێنم.

ئیبراهیم بزەیەکی کرد و مامۆستا عومەر گوتی:

- باشە هاوڕێ باشە تووڕە مەبە، ئێستا تەواوی چیرۆکەکەت بۆ دەگێڕمەوە: ئەو دوانیوەڕۆیەی کە وزە و تواناکمان بۆ گەڕابووەوە و جلەکانیشمان تەواو وشك بووبوونەوە،

هەمووومـان لە ژووری ئەو بـرادەرانە دانیشـتبووین و پشـوویەکی باشمان دابوو، ئەوەمان بۆ دەگێڕانەوە کە چۆن دەستەکە دوێنێکە توانیـویەتی بەو زریـانە ئەو شـاخ و دۆڵە پڕاوپـڕ لە مەترسـیانە ببڕێـــت و بە ســـەلامەتی بـــگەنە ئێـــرە. ئەوان ســـەیریان بە سەرکێشییەکەمان دەهـات، بە تـایبەتی کاتێـك سـەرنجیان دەدایە جلوبەرگە سادەکەی بەرمان، ئاخر ئەوان باش دەیـانزانی کە ئەو جلوبەرگە هی ئەوە نییە لەم سەرماوسۆڵەیە بمانپارێزێت، جگە لە پێڵاوە لاستیکە تەنـك و کورتەکانمـان، کە ئەگەر بێـت و پـێ لەسـەر دڕکێکـی بچـووکیش دابنێـین، دووبەدەر دەبێـت و بە پێماندا ڕادەچێت!

ڕەحمان قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- پـێم باشـە بـۆ گێـڕانەوەی و گەیانـدنت بەو خـواردنە چەورەی کە بە خێرایـی دروسـتیان کـرد ڕێتوێنیـت بـکەم، دە فەرموو وا گەیشتینە ئەو شوێنەی هەموومـان هەر یەکە و بەشـی خۆمان لە گۆشتی ڕێوییە نەفرەتییەکە خوارد و ئێـوەش دەسـتتان بە قسـە کـردەوە کە دەربـارەی هەمـوو شـتێك بـوو، بەڵام مـن هیچتان لێ تێنەگەیشتم. ئاخر خۆ هەتا ئەگەر زمـانی کـوردییش بزانم، توانـای تێگەیشـتنی ئەوەم نەدەبـوو کە ئێـوە دەتـانگوت و دەتانگێڕایەوە. نەك تەنهـا مـن، بەڵکـوو هەتـا لەوانەیە بەشـێك لە خۆتـانیش لێتـان تێـنەگەن. لەبەر ئەوەی ئەوەنـدە بە خێرایـی و پەلەپەل دەدوێـن، هەر دەڵێـی لە شـەڕێکی دەسـتەویەخەدان و توانای ئیستێکتان نییە بۆ ئەوەی کەمێك پشوو بدەن و لەسـەرخۆ بدوێن، ماڵتـان ئـاوابێ هەر دەڵێـی ڕسـتی بیکەیسـیە و ڕستە لە دوای ڕستە لە زارتان دێتە دەرەوە، بە ئامـان و زەمـان ناوبڕێـك نـادەنە نێـوان ڕسـتەکان، هەتـا بـۆ هەناسـەدانێکیش. نـازانم ئێـوە کاتێك قسە دەکەن بە کوێ هەناسە وەردەگرن!

پێکەنینەکەی ئیبراهیم دەنگی دایەوە و مامۆستا عومەر گوتی:

- لەم لایەنەوە من هاوڕام. هەموویان وا دەدوێن و ناوبڕێك ناخەنە نێوان ڕستەکانەوە، هەتا من خۆم زۆربەی کاتەکان لێیان تێناگەم. ئێستاش گوێ بۆ ئارەزووەکەت دەگرم و ڕاستەوخۆ و بەبێ ئەملا و ئەولا دەیگێڕمەوە، بەڵام نەکەی دواتر پرسیاری هیچ شتێکم لێ بکەیت، باش گوێ بگرە و لێم حاڵی بە.

ڕەحمان لە کاتێکدا خەریك بوو دیق بکات و لە پێستەکەی خۆی بێتە دەرێ، گوتی:

- ڕازیم.

عومەر ڕاستەوخۆ گوتی:

- ئەو کاتە دەربارەی کچە بەفرینەکە پرسیارم لێ کردن، گوتیان ئەوە کچێکی بێئابڕوو بوو، کەسوکارەکەی کردیانە پەند بۆ کچانی تر! تەواو کۆتایی هات.

بێدەنگی باڵی بە سەر هەرسێکیاندا کێشا، ڕەحمان بە نۆرە چاوی پرسیاری بڕیبووە هەردووکیان و سەیری دەکردن، دایانە قاقای پێکەنین و ئیبراهیم گوتی:

- ئای لەوە خۆ تۆ یەکجاری کابرات خستە کێشەوە.

عومەر گوتی:

- دەمرێ ئەگەر نەپرسێت، بەڵام وەڵامی نادەمەوە.

ڕەحمان ڕووی گرژ کرد و گوتی:

- ئەوە چییە، واتا یان کاتژمێرێک دەربارەی شتێک دەدوێی کە هیچ پەیوەندیی بە کچە بەفرینەکەوە نەبێت، یان لە دوو وشەدا کورتی دەکەیتەوە؟ هەی عەمری خۆت و چیرۆکیشت نەمێنێت، باشە تۆ پێت چۆنە ئەوە من هەر نامەوێ گوێ لە هیچ شتێك بگرم، تۆش دەمری ئەگەر چیرۆك و بەسەرهاتەکەی نەگێڕیتەوە. ئێستا پرسەکە بە تەواوی ڕوون و ئاشکرایە. ئەو جووتیارە کاڵفامانە لەسەر ئەو لوتکەیە کوشتوویانە و پاشان گەڕاونەتەوە گوندەکەی خۆیان و نانی ئێوارەیان خواردووە و بە ئاسوودەییەوە نووستوون، وەك ئەوەی هیچ شتێك ڕووی نەدابێت، هە، وایە؟!

عومەر گوتی:

- ڕاستە چیرۆکەکە ڕێك وایە، بەڵام هەرگیز مێشکت ئارام نابێت ئەگەر تەواوی وردەکاری چیرۆکەکەت گوێ لێ نەبێت. منیش بڕیارم داوە لەمەودوا هیچ شتێکت بۆ نەگێڕمەوە.

ئیبراهیم گوتی:

- ئەرێ ئەوە چیتانە؟! ئێوە چیرۆك دەگێڕنەوە یان شەڕ و قڕەقڕ دەکەن؟!

عومەر زەردەخەنەیەکی ڕووخۆشانەی کرد و گوتی:

- بە چاوی تۆ ڕەحمان بە شێوازێکی وا بۆتی دەگێڕمەوە، هەر بە تەواوی ئاسوودەت بکات.

## بەشی دەیەم

ڕەحمان ڕووی لە ئیبراهیم کرد و گوتی:

- بینیت؟! ئەی نەمگوت دەمرێ ئەگەر چیرۆکی کچەکە نەگێڕیتەوە.

ئیبراهیم جارێکی تر عومەری بۆ نووسین هاندایەوە، کەچی ئەو هەستی بە جۆشوخرۆشی ئاخاوتن دەکرد:

- بینووسەوە عومەر بینووسەوە، دەقێکی دانسقەیە، دەست هەموو کەس ناکەوێت، ئەگەر لەجیاتیی تۆ بوومایە چیرۆکەکەم دەنووسییەوە و لە خەیاڵدان و هەستی خۆشمەوە هەندێك ڕتووش و مشتومالّم دەکرد، بە ڕاستی زیاتر سەرنجڕاکێش دەبوو.

ڕەحمانیش خۆی بۆ نەگیرا و ئەمەی خستە سەر قسەکانی ئیبراهیم و گوتی:

- ڕۆژێك لە کتێبێکدا بڵاوی دەکاتەوە و ئینجا هەموو گۆی زەوی دەگەڕێت و کۆڕ و کۆبوونەوەی بۆ دەبەستێت... ..ههههههه

مامۆستا عومەر چێژی لەو بایەخدانەیان وەردەگرت:

- لە ڕووی ئەوەی وەکوو چیرۆکێکی کورت بڵاوی بکەمەوە، لەوانەیە ئەنجامی بدەم، با کاتی خۆی بێت، لە ڕووی ئەوەی دەمرم ئەگەر ئێستا نەیگێڕمەوە، ئەوەیان ڕاست نییە، بەڵکوو من زیاتر حەز ناکەم وەڕس و بێزارت بکەم ڕەحمان،

چونکە هەست دەکەم زیاتر لە ئاستی خۆی بێزارم کردی، بە تایبەتی کاتێك دەبینم خوێن بە شادەمارەکانی لاملتدا دێت و دەچێت و خەریکە فوارە دەکات!

ئیبراهیم بە ڕوویەکی خۆشەوە بە ڕەحمانی گوت:

- لە بەختی خۆمان چیرۆکی کچە بەفرینەکە نازانیت، ئەگەرنا دوێنێکە یەخەی براکەیت دەگرت و کێشەیەکت دەنایەوە، هەراوهوریا و زایەڵە و دەنگەدەنگێکی وا زەماوەندەکەت لێ دەکردن بە قوزەلقورت.

عومەر بە پێکەنین و گاڵتەجاڕییەوە:

- تۆ بیر بکەوە، چەند دیمەنێکی جوان دەبوو، کاتێك براکەی دەهات تاکوو تەوقەی لەگەڵدا بکات، کەچی ئەم مشتەکۆڵەیەکی لە شەویلاگەی دەدا و پشتاوپشت دەیخستە سەر زەوی و خوێن بە باڵایدا دەهاتەخوارێ. ئیدی لەو ناوەدا دەبوو بە هەرایەك سەگ ساحێبی خۆی نەناسێتەوە، بە ڕاستی دەبووە دیمەنێکی سینەمایی سەرنجڕاکێش!

ڕەحمان بێ ئەوەی بیخاتە سەر خۆی و وای نیشان دا کە گوێی پێ نادات، بۆیە گوتی:

- ئەو جووتیارانە بە لای منەوە گرنگ نین، تەنانەت بایەخ بەو دونیایەشیان نادەم کە تێیدا دەژین، بەڵام کام لەوانەی تەوقەیان لەگەڵ کردین برای بوو؟

ئیبراهیم گوتی:

- ئەو گەنجەی شەرواڵێکی سەوزی لەبەردا بوو.

ڕەحمان چاوەکانی ئەبلەق بوون و گوتی:

- مەبەستت گەنجەکەی ئەو گوندەیە کە ئەشکەوتەکەی لەبەردەمدایە؟!

- ڕێك خۆیەتی.

عومەریش وای گوت، ڕەحمانیش ڕوخساری سوور هەڵگەڕا:

- ئەو گەنجەی بەر لە چالاکییەکە نانمان لە ماڵیان خوارد؟

عومەر پێکەنی و گوتی:

- گۆشتی ئەو کەوە چاوەڕوانکراوەی کە بووە بەشی من و سعوود. ئای ئەگەر دەزانن ئێمە ئەو کاتە چەند پێکەنین؟! زانیمان ئێوە ماڵەکەتان هەڵە کردووە.

ڕەحمان هاواری کرد و دڵی کەوتە لێدان و شپرزە بوو.

- چ کەوێك و چ نەفرەتییەك باس دەکەیت! ناکا مەبەستت ئەوە بێت کە ئەوەی دوێنێ شووی بەو شێتە کرد، خوشکی ئەو بەڕەڵڵایە بوو؟!

ئیبراهیم بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

- ئەوە چیتە ڕەحمان؟! بۆچی وا هەڵچووی؟!

ڕەحمان هاواری بەسەردا کردن و گوتی:

- هەڵچوون؟! کورە هاوڕێ من خەریکە دەمرم... دەتەقم و شەق دەبەم، ئاخر من ئەو کاتە بینیم. نا نا، مەگەر خوشکێکی دیکەی هەبێت، ئەوە نابێت ئەو بێت.

- هیچ خوشکی دیکەی نییە. ئەوە دووانەی کچە بەفرینەکە بوو.

-    نەفرەت... هەزار نەفرەت! چۆن دوێنێکە ئاگام لێی نەبوو! بە دڵنیاییەوە چ زوو بێت یان درەنگ هەر دەگەڕێمەوە لای. لە پێناویدا شەڕ لەگەڵ هەموو گوندەکە دەکەم. مەحاڵە، هەر دەبێ لە دەستی ئەو شێتەی ڕزگار بکەم.

مامۆستا عومەر گوتی:

-    چییە ڕەحمان دەڵێی دەیناسی؟

ئیبراهیم بە سەرسوڕمانەوە وەڵامی دایەوە:

-    هەر دەڵێی خۆشت دەوێ؟!

ڕەحمان بە هەڵچوون و دەنگێکی لەرزۆك و ڕوخسارێکی شێواوەوە:

-    دەمزانی ڕۆژێك شوو بە گەنجێکی گوندەکەی دەکات. هەرچەندە هیچ کەسێك شایانی جوانی و شۆخوشەنگییەکەی نییە، ئاخر ئەو مرۆڤی ئاسایی نییە، فریشتەیە فریشتە، نا نا تۆ بڵێ خودایەکە و شایانی پەرستنە، نەك مرۆڤەکان گڵاوی بکەن. خۆزگەم دەخواست گەنجێکی خۆش بوێت و بەبێ ئەو هەڵنەکات، ئەویش هەمان خۆشەویستیی بەرانبەری هەبێت و شەیدای بێت و هێندەی هەموو ڕۆژەکانی شادی و بەختەوەری پێ ببەخشێت... بەڵام هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات بیدەنە ئەو شێتە، هۆیەکەی هەرچییەك بووبێت.

ئیبراهیم دیسان:

-    ڕەحمان تۆ خۆشت دەوێ؟!

ڕەحمان هێشتا هەڵچوونەکەی لە کەفوکوڵدایە و دانەمرکاوەتەوە و لە قسەکانیرا دیارە:

- من تەنها یەك جارم بینیوە، وەلێ بۆ هەتاهەتایە عاشقی بووم. ئای چەند خۆزگەم دەخواست جووتیارێکی گوندەکەیان بوومایە، یان زمانەکەیم بزانیبووایە. زمانەکەیشی کێشە نەبوو، ئاخر لە پێناوی چاوەکانیدا ئامادە بووم بە یەك مانگ فێری زمانەکەیشی ببم. وێڕای ئەو هەموو کاریگەرییەی لە ناخمدا بەجێی هێشت، کەچی لە یادەوەریی خۆمدا سڕیبوومەوە، لەبەر هیچ نا، چونکە منیش شایانی ئەو نەبووم، ئاخر ئەو خودایە و منیش ئادەمیزاد. ئێستا هەست دەکەم کەس شایانی نییە جگە لە خۆم... ئەگەر دەمزانی چی چاوەڕوانی دەکات، دەمهێنا و ئاهەنگێکی هاوسەرگیریی وام بۆ ساز دەدا لە گوندەکەی وێنەی نەبووایە، کورە تۆ بلێی لە هەموو دونیا دەگمەن بووایە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستم لێی نەدەدا، هەرگیز دەستم بۆی نەدەبرد، تا ئەو کاتەی لەوە دڵنیا دەبووم کە ئەویش هەمان خۆشەویستیی بۆ من هەیە، بەڵێ خۆشەویستییەك هاوشێوەی خۆشەویستییەکەی لەیلا بۆ مەجنوون، ناوەڵا بلێی خۆشەویستییەکەی شیرین بۆ فەرهاد.

- ئەی چی دەبوو ئەگەر خۆشی نەویستبای؟

عومەر وای گوت و ئیبراهیمیش هەڵیدایە:

- ئەوە کچە لادێییە، هاوسەرەکەی خۆش دەوێت، هەتا ئەگەر ئەویش ئەمی خۆش نەوێت.

ڕەحمان گوتی:

- جگە لە خۆشەویستی و عەشقەکەی بە هیچ شتێکی دیکە ڕازی نابم.

مامۆستا عومەر تارماییی بزەیەك بە سەر لێوەکانییەوە بوو و گوتی:

- جا چیت دەکرد، ئەگەر تەنها وەکوو مێردێك خۆشی بویستبای، ئاخر گوندییەکان لەسەر ئەوە ڕاهاتوون.

- لە خۆمیش ڕزگارم دەکرد، دەبوومە ڕاسپێر و جێبەجێکاری فەرمانەکانی، لە هەموو نالەباری و پیسییەکانی دەوروبەری دەمپاراست.

مامۆستا عومەر ئاوڕێکی لە ئیبراهیم دایەوە و گوتی:

- ئەمە لە کوێوە هاتووە؟! لە مەریخەوە؟!

ئیبراهیم بە زەردەخەنەیەکەوە:

- هەرزەکارە... وازی لێ بێنە.

ڕەحمان بە پرتەوبۆڵەوە:

- قەیناکا، با بیرکردنەوەی من بیرکردنەوەی هەرزەکارێکی بە هەڵپە و پڕ لە جۆشوخرۆش بێت. بەڵام دەبینن ئەم هەرزەکارە چی دەکات.

دوای ئەو هەڵچوونەی ڕەحمان، چەند ساتێکی درێژی بێدەنگی تێپەڕی، ئارەزوویەکی زۆری گوێلێبوونی چیرۆکەکەی کرد، هەتا ئەگەر مامۆستا عومەر ئەوەندە وردەکاریی بێزارکەریش بڵێ کە هیچ پەیوەندییان بە چیرۆکەکەوەش نەبێت، ئەو ئامادەیە هەموو ئەندامانی جەستەی بۆ بکاتە گوێ و بە بێدەنگی و ئارامییەوە گوێی بۆ شل بکات.

لەسەرخۆ و بە دەنگێکی لەرزۆك و شکاوەوە گوتی:

- چیرۆکی خوشکەکەی چییە؟ تۆ هیچت دەربارەی نەگوت.

عومەر بە سەرلەقاندنەوە وەك خەفەتێك بۆی:

- به ڕاستی خوشکەکەی چیرۆکێکی دڵتەزێنی هەیە. جووتیارەکان زۆریان لە بارەیەوە گوتووە. هەرچەندە زێدەڕۆییش لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەکەن. بەڵام زۆر بە ئاسانی دەتوانی ڕاستییەکەت بۆ دەربکەویت.

ڕەحمان بە منگەمنگ و پەرۆشییەوە:

- ئەی ڕاستییەکە چۆنە؟

عومەر سێرە نیگای چاوی لە شوێنێکی دیکە وێڵ بوو، گوتی:

- پارەکە یەکێك لە گوندەکان، ئاهەنگێکی زەماوەندیان وەکوو ئەوەی دوێنێکە ساز دابوو، بەڵام ناتوانین بەراوردی زەماوەندە چارەڕەشەکەی دوێنێ بەوەی ئەوێ بکەین. چونکە زاوای ئەوێ کوڕی ئاغا بوو، کە نیوەی زەوییەکانی ناوچەکەی لەژێر دەستدا بوو، ئینجا تۆ بیری لێ بکەرەوە بزانە چ ئاهەنگ و زەماوەندێك بووە، ناوچەکەی ئاغا نزیکەی دوو ڕۆژەڕێ لەو گوندەوە دوور بوو کە ئەشکەوتەکە لە دەروازەکەیدایە. ئەوانەی بۆ زەماوەندەکەش بانگهێشت کرابوون ئەوەندە زۆر بوون گوندەکە بەو گەورەییەی خۆیەوە هەڵینەدەگرتن و جێیان نەدەبووەوە، زۆربەی ئەوانەی بانگهێشت کرابوون، هەمان شەو ناچار بوون بگەڕێنەوە گوندەکانی خۆیان کە نزیکەی دوو بۆ سێ کاتژمێر لەوێوە دووربوون، تاکوو ئەو پاڵەپەستۆیە لەسەر گوندەکە کەم بکەنەوە. زاواش گەنجێك بوو شانازی بە خۆیەوە دەکرد، لە حەڤدە بەهارەی تەمەنیدا بوو. پیرە ئاغای باوکیش بێ سێ و دوو، تەواوی ئارەزووەکانی کوڕەکەی جێبەجێ دەکرد، وەك ئەوەی فەرمان بن. لەبەر ئەوەی تاقە کوڕی چوار هاوسەرگیری و تاقانەی ناو ژمارەیەکی زۆری خوشکەکانی

بوو، بە کورتی لە چوار ژن، ئەوە کوڕە تاقانەی ئاغا بـوو. ئەو گەنجە کاتێك بە هەر هۆیەکەوە بووبێت بەو گونـدەدا تێپەڕیـوە کە ئەشکەوتەکەی لە دەروازەدایە، لەوێ بە ڕێکـکەوت چـاوی بە کچەکە کەوتووە، ئەوەش ئەو کاتەی کـچە خـۆی لە ئەسـپە بەهێـزەکەی لاداوە کاتێـك خەریـك بـووە ملـی لـێ بنێـت، لەو چرکەساتەدا جوانییە دڵڕفێنەکەی ناخی هەژانـدووە، دووانـیش لە هاوڕێکانی یاوەرییـان کـردووە و هێنـدەی نەخایانـدووە هەواڵـی کچەکەیان بۆ هێناوە، ئەویش زۆر کاتی خۆی بە فیڕۆ نەداوە و لە پڕێکـا نیـازی دڵـی خـۆی بـۆ ژنهێنـان بە بـاوکی گوتـووە، باوکیشی لە خۆشیاندا زەردەخەنەیەکـی بـۆ کـردووە و ڕێگەی لەوە نەگرتـووە خزمـایەتی لەگەڵ جووتیارێکـدا بکـات، لەگەڵ خۆیـدا بیـری کـردۆتەوە بەوەی: "ئەم هاوسـەرگیرییە تەنهـا بـۆ کاتبەسەربردنە و هێنـدە نابـات لای لاوان دادەمرکێتەوە، دواتـر لەگەڵ هەندێك موڵك و ماڵ بۆ ماڵی باوانی دەنێرینەوە".

هەموو شتێك بە خێرایـی ڕووی دا. پیـرە ئاغـا پیاوماقووڵ و ڕیشســپیی گونــدەکانی دەوروبەری و هەنــدێك لە ســەرۆك جاشەکانیشــی کــۆ کردبــووەوە، چــونکە ئەوان بەرژەوەنــدییان لەگەڵ یەکتری کۆتایی نایێت، ئەوان هەردوولا لە ئـاڵوگۆڕێکی سـوود و قـازانجی بەردەوامـدان، گـرنگیش نیـیە کـێ دەبێـتە قوربانیی مامەڵە و سەوداکەیان. ئاغا ئەم تـاکتیکەی لەگەڵ هێـزە بەرهەڵسـتکارەکانیش بەکـار دەهێنـا. ئەو دەیزانـی چـۆن دڵـی هەمـووان ڕازی دەکـات و وایـان لـێ دەکـات وا بە ئاسـانی دەســتبەرداری خزمەتگوزارییەکــانی نەبــن. هەتــا زەماوەنــدی کوڕەکەیشی خزمان و دۆستانی هەردوولای لە خۆ گرت. پیرە ئاغـا پیـاوێکی زۆرزان و تەڵەکەبـاز، دونیادیـدە و زیـرەك و پـڕ ئەزموون، ئەو دەمێك بـوو فێـرە لەوەڕی هەردوو لای جـۆگەکە

بووبوو، شایانی ئەوەبوو پلەیەکی سیاسیی هەستیار وەربگرێت.

کچەیان هێنا، کچ چ کچ؟! پەرییە و لەسەر زەوییدایە، فریشتەیە و لە ئاسمانەوە لەگەڵ تەزرە باریوە، هێشتا لە پازدە بەهاری تەمەنیدایە. جوانییەکەی شان لە مانگی چواردە دەدا و لەویش جوانتر دەدرەوشێتەوە. هەڵپەڕکێ و گۆرانیی گوندی پڕ کرد، ڕمبەی دەهۆڵەکە لێدانی دڵی ڕادەگرت، زوڕناکەش بۆ ساتێك ڕاوەستانی نەبوو. خەڵکیش هەموویان بە جلوبەرگی جوان و ئاڵووالاوە شاییان دەکرد و هەڵدەپەڕین، وەك ئەوەی جەژنێکی گەورەی نیشتمانی بێت و هەمووان بە ئەرکی خۆیانی بزانن بەشداری تێدا بکەن، هەتا ئەگەر حەزیشیان لێی نەبێت و ئارەزوویشی نەکەن. دایکی کچەکەش لە خۆشییان دەگریا و باوەڕی بەوە نەدەکرد کە دەیبینی. باوکی زاواش بە سەری بەرزەوە بەناو خەڵکیدا دەهات و دەچوو و لە هەموو لایەکەوە پیرۆزبایی لێ دەکرا، حەز و چاوی گەنجانیش وەکوو نوقڵ و گەزۆ خوشکە دووانەکەیان حەپەلووش دەکرد، هەموویان خەونیان بە خەندەیەکی و بەدەستهێنانی دەبینی، ئەو کاتە براکەشیان تێکسمڕاو و ڕوومەتەکانی سوورهەڵگەڕابوون و ئومێدێکی زۆری لەسەر ئەم هاوسەرگیرییە هەڵچنیبوو، لە ساتەوەختی یەکەمەوە نەخشەسازی بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لە کچانی ئاغا کردبوو، تا بیکاتە هاوسەری خۆی. بەمەش خانەوادەکەی لەگەڵ خانەوادەی ئاغا دەبنە خزم و ڕەگوڕیشە و بنەچەی خۆی توور هەڵدەدات، کە شتێکی ئەوتۆی تێدا نییە لەناو خەڵکی مایەی سەربەرزییان بێت. ئەمە گرێبەستێکە و ڕۆژێك لە ڕۆژان خەونی پێوە نەبینیبوو، وەلێ وا خەریکە بێ خەوبینین بەسەر دەستکەوتێکی گرانبەهادا دەکەوێت.

دوای ئەوەی بووکێ بەرەو ژووری بووك و زاوایی برا،

هێنـدەی نەبـرد زاوا بـۆی چـووە ژووریّ، بـووکێ لە شـەرمان گۆناکانی سوور هەڵگەڕابوون، سـەری نەوی کردبـوو، خەریـك بوو ئازایی ئەوەی تێدا نەبێت سەیری ڕوخساری زاوا بکات.

زاوا تـارای بـووکێنی لەسـەر سـەری بـووکێ لادا، تـاکوو سەرنجی ئەو ڕوخسارە فریشتەییەی بدات، بە هێواشی چەناگەی گـرت و ڕووی بەرز کـردەوە. لە چاوەکانیـدا بەختەوەرییەکـی بێئەنـــدازەی بەرەو جیهـــانێکی ئەفســـووناوی و خەیـــاڵاوی هەڵگرتبوو. بە ترسـەوە سـەرنجی لە ڕوخسـاریدا. یەکەم جـاری بوو وا لە نزیکەوە بیبینێت. ڕوخسارێکی جوان و خۆشەویستانەی هەبوو، هەستی بەختەوەری و دڵنیایی زیـاتری پـێ بەخشـی. ئەو دۆشـــەگ و لـــێفە پەمـــۆ ڕەنگاڕەنگـــانەی جێیەکەیـــان کە هەردووکیـانی لە ئـامێز دەگـرت لە پشـتییانەوە بە نەرمونیـانی ڕاخرابوو، پێخەف چ پێخەف؟! هەر دەتگوت پێخەفـی پادشـا و میرەکانە، ڕەنگەکان وەك ئەوەی بەسـەر هەورێکـدا ڕاکشابن و تیشکی خۆر بە ئاوی زێڕ نەخشاندبنی. بووکێ لەسەر ئەو جێگە نەرمونیانە ڕاکشابوو، زاوا بـۆی نووشـتایەوە، لێـوی لە لێوەکـانی نزیـك خسـتەوە. مـاچێکی گەرموگـوڕ و بەتـام و بێکۆتـایی، هەرچی بەفری سەر لوتکە بەرزەکانی هەسـتی هەبـوو هەمـووی تاوانەوە. هەردوو جەستە شۆخوشەنگەکە تێك ئـاڵان، جێگـاکە بە هێواشـی کەوتە لەرزە، ئینجـا لەرزینـی بەهێزتـر و هەژێنێکـی بەهێز و بەهێزتر. ترپەترپ و زریکە و هەناسەبڕکێ باڵی بەسەردا کێشـان، وەك ئەوەی جریـوەی چـۆلەکە بێـت و هەنـدێك جـار تـــێکەڵ بە ئـــاه و حەســـرەتەکانیان بێـــت، هەتـــا گڕکـــانی کڵپەســـەندووی زاوا دامرکـــایەوە، بەڵام نەکـــوژایەوە، حەز و ئارەزووەکانی هەموو چرکەساتێك دەردەکەوتنەوە، بـووکێش بە تەواوی خـۆی دابـووە دەسـتەوە و بە تـام و چێـژەوە لەسـەر

گازەرای پشت ڕاکشابوو، وەك ئەوەی ئاگای لێ نەبێت چی ڕوو دەدات. ئاخر ئەو لە خەونێکی جوان و ئەرخەوانی و سەرسامیی بێسنووردا بوو. ئەویش هێشتا گڕکانی ناخی دانەمرکابووەوە و نەکوژابووەوە، هەمدیسان لە نێوان ئاخ و ئۆفی گەیشتن بە لوتکەی چێژ و خۆشیدا بوون، زاوا بەسەر ڕان و سینگییەوە کینگلی دەدا و دەیگەوزاند، جار جارە هەڵوەستەیەکی دەکرد و مۆڵەتی هەڵکێشانی هەناسەیەکی دەدا، تاکوو لێدانی دڵی کپ ببێتەوە. وا هەستی دەکرد خەریکە ترپەی دڵی هەردووکیان ئاوێتەی یەکتری دەبن، بەڵام هێندەی نەخایاند گەنجەکە هاتەوە سەر خۆی و بە سەرنجەکانی کەوتە پشکنینی جەستەی بووکێ و ئەو چاڵاوەی پێش تۆزێك لێی دابوو. چاوەکانی ئەبڵەق بوون، ترپەی دڵی زیاتر بوو، وەکوو دەنگی دەهۆڵی گوندەکە لێی دەدا. سەیرە! بیرەکەی وشکەو چاڵەکەی بێ ئاوە، وا دیارە پاراو نەبووە! چی بکات؟ ئاخر ئەوە کارەساتە. سەرلەنوێ پەلاماری بووکێی دایەوە و باوەشی پێدا کرد و هەر زوو لە گڕکانی تەقیوی زاواوە هەستی بە بەختەوەری و خۆشییەك کرد. پیاوەکە ئەم جارەیان بەهێز و چەمووشی و دڕییەوە دەستی بە هەڵکەندنی بیرەکە کردەوە. ئەو بە دوای شتێکدا وێڵ و سەرگەردانە و لە خەمی دۆزینەوەیدایە، ئەمیش لەناو تام و چێژ و خۆشیی بێئەندازەی زیاتر و زیاتردا گڕ دەگرێت، هەتا هاوارێکی چەپێندراوی پڕ لە چێژ ژوورەکەی پڕکرد و دەنگی دایەوە. بەوپەڕی بەختەوەری و ڕەزامەندییەوە خاو بووەوە و شەبەنگی بزەیەکی شەرمنانە لێوەکانی نەخشاند. گەنجەکە بۆ ساتێکیش مۆڵەتی پێ نەدا، جارێکی دیکەش بە شڵەژاوی کەوتەوە پشکنینی بیرەکە! بیرێکی وشك، چاڵاوێکی بێ ئاو، هێشتا پاراو نەبووە.

ڕووی بەرزکردەوە و بە دەنگێکی خنکاو و پچڕپچڕەوە گوتی: "ئەوە چییە خوێنم نەبینی؟!" بووکێ هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. تێنەگەیشت لەوەی مەبەستێتی. بۆیە سەرلەنوێ گوتییەوە: "خوێن دەرنەچووا" بووکێ وا پێ دەچوو لەوە تێنەگات کە زاوا مەبەستی بوو، بۆیە پرسی: "چ خوێنێك؟!" گوتی: "خوێنی تۆ!" منگەمنگێکی بۆ کرد، وەك ئەوەی گوێی لە گاڵتەیەك بێت: "بۆچی دەتەوێ خوێنم بڕوا؟!" لە کاتێکدا لێوەکانی تەتەڵەی دەکرد گوتی: "بۆ ئەوەی بیسەلمێنی پاکیزەیت و ئابڕوومەندیت!"

کچەکە ڕاپەڕی و جەستەی و ئەمسلا و ئەولای جلوبەرگەکانی کۆ کردەوە و بە لەرزینەوە گوتی: "من خاوەن ئابڕووم و پاکیزەشم." لەو کاتەی هەر چۆنێك بێت جلوبەرگەکانی لەبەر دەکرد، بە تووڕەییەوە هاواری بەسەردا کرد: "کەواتە کوا خوێنەکە؟!" کچە بەستەزمانەکە لە ترسان هەڵدەلەرزی و بە هەنسکدانەوە گوتی: "من ئابڕوومەند و پاکژم. سوێند بە هەموو پیرۆزییەکان من پاکژم و کەس دەستی لێ نەداوم". گەنجەکە بە دانەجیڕەوە دووبارە هاواری بەسەردا کرد، وەك ئەوەی مۆتەکەی خوێن سواری سەری بووبێت: "پاکژ و پاکیزەیی، ئەی کەواتە کوا خوێنەکە! کوا خوێنەکە، خوێن خوێن؟!" وەك ئەوەی خوێن بەری چاوی گرتبێت، بە تووڕەیی و سەرلێشێواوییەوە وەکوو شێت دەرچووە دەرەوە، کچە بەستەزمانەکە درکی بەوە کرد کە چ چارەنووسێك چاوەڕێی دەکات و چ قوڕێکی بۆ گێراوەتەوە.

ئیدی غەڵبەغەڵب و دەنگەدەنگ و قسەی نەشیاو تەواوی گوندەکەی گرتەوە، دەهۆڵەکە لە لێدان کەوت و زوڕناکەش زیڕەی نەما، پیرەژنەکان لە کچەکە چوونە ژوورەوە تاکوو لە

ڕاستیی دۆخەکە بزانن و نهێنییەکە ئاشکرا بکەن.

لێرەدا ڕەحمان مامۆستا عومەری لە گێڕانەوەی چیرۆکەکە ڕاگرت و گوتی:

- هەموو ئەو وەسفەی کردت جوان و سەرنجڕاکێش بوون و شایانی ئەوەن بکرێنە چیرۆك، نەخاسمە دیمەنی جووتبوونەکەیان و زریکە و هانەسەبڕکێی سەرجێیەکەیان، چونکە چیرۆك بەبێ جووتبوون و سەرجێیی وشکوبرینگ دەبێت و شایانی خوێندنەوە و گوێگرتن نابێت و شتێك ناهێنێت. وەلێ بەهەرحاڵ خۆ ئەو لە تەنیشت جێیەکەیانەوە نەبووە، تا بە وردی هەموو شتێکمان بۆ باس بکات. گوێی لە گەنجەکەش نەبووە کە بووکێی بەبێ ئابڕوویی تاوانبار کردبێت، واتە ڕاستییەکەمان پێ بڵێ و شتی زیادە و درۆی مێشك و خەیاڵی خۆتمان ناوێت.

ئیبراهیم بە ڕووخۆشییەوە گوتی:

- ئەوەی دەیڵێ نە خەیاڵە و نە درۆش، ئەی بووك و زاوا لەوە زیاتر چی دەکەن؟! باشە ئەو بەوەندە ئیستی کرد کە جێیەکەیان کەوتبووە جریوەجریو، خۆ ئەگەر من بمگێڕابووایەوە وا باسی جێگەکەیانم دەکرد کە لە ژێریان تێك بشکێت و هەردووکیان لەوپەڕی چێژ و خۆشیدا لەسەری بکەونە خوارەوە.

مامۆستا عومەر وەڵامی دایەوە:

- ڕاستە خەیاڵی من وەکوو چیرۆکێك گرێچنی بۆ ڕووداوەکان کرد، وەلێ ئەوەی باسم کرد ڕاستییەکی تەواو تەواوە. چونکە کوڕەکە ئەوەی بە باوکی گوت کە ڕووی دابوو. پیرەژنەکانیش کچەکەیان هێنابووە قسە و پشکنیبووشیان. ئەو بەستەزمانە بەوپەڕی بێتاوانییەوە گوتبووی من نازانم چی

ڕووی داوە؟! ئەو لە ناکاو هاواری کرد: "کوانێ خوێن؟!" بەستەزمانە بە توندی ڕەنگی هەڵدەبزڕکا و نەیدەزانی لە دەوروبەری چی ڕوو دەدات. هەر بە ڕاستی نەزانییە... نەزانی لە هەموو شتێك. ئاخر ئەو نەیدەزانی خوێن چ پەیوەندییەکی بە پاکیزەیی و ئابڕووەوە هەیە. هەڵبەتە خەڵکی ئەم گفتوگۆیەیان دەگوتەوە.

ڕەحمان گوتی:

- هەتا جریوە و زیکەزیکی جێگاکەشیان؟

- بەڵێ، هەتا جریوە و زیکەزیکی جێگەکەشیان. ڕاستە ناکرێ یەکێکیان -بووك و زاوا- بێن و باسی جێگەکە بکەن کە چۆن لە ژێریان جریواندوویەتی و زیکەزیکی کردووە. بەڵام من ئەوەت بۆ دووپات دەکەمەوە کە جێگەکە لە ژێریان جریواندوویەتی و زیکەزیکی کردووە. لەبەر ئەوەی گەنجەکە دوای هاوسەرگیرییەکەی ڕقی لە سیسەمی نووستنەکەیشی دەبووەوە، بۆیە بەخشییە خوشکەکانی. یەکێکیان وەریگرت و بردی، یەکێکی دیکەشیان حەزی لێ بوو بە دەستی بهێنێت. بۆیە ئەوەی دەستی بەسەردا گرتبوو لە بەردەم دەستە خوشکەکانیدا گوتی: "خەمی لێ مەخۆن، هەر بە ڕاستی دەکەوێتە زیکەزیك ئەگەر لە سەری ئەمدیو و ئەودیو بکەیت".

ڕەحمان بە ڕاستگۆیی و خەیاڵ فراوانی مامۆستا عومەر و توانای لە دارشتن و گرێچنیی ڕووداوەکان و گونجاندن و پێکەوەگرێدانیان سەرسام بوو و بە هەناسەسوارییەوە گوتی:

- خۆ ئەگەر کارەکە وا بێت، بە هەر دە پەنجە گەواهی ئەوەت بۆ دەدەم کە کەسێکی بەهرەمەندی. زۆر حەز دەکەم گوێ لە قسەکانت بگرم. تۆ زۆر درۆت نەکرد، یان با بڵێین

لەسەر حیسابی ڕاستییەکان جڵەوی خەیاڵت شل نەکرد. بەڵکوو لە واقیعەوە شتە پەرشوبڵاوەکانت لێرە و لەوێ کۆ کردەوە و دارشتنێکی هاوسەنگ و قەشەنگت بۆ دارشتوون.

ئیبراهیم گوتی:

- ئۆخەی ئێستا دڵم ئیسراحەتی کرد، لە کۆتاییدا ڕێککەوتن و وازتان لەو دەمەقاڵێ و شەڕە دەنووکە هێنا؟!

- ئاخری مامۆستا عومەر بردییەوە... دەی چیرۆکەکە تەواو بکە، من دڵنیام لە گێڕانەوەی و لێرە بەدواوە بۆ یەك وشەش دەمم ناکەمەوە، باشە.

لە دوای ئەو قسانە ڕەحمان دەستی لەسەر زاری دانا، وەکوو ئاماژەیەك بۆ ئەوەی چی دیکە دەمەقالێ و شەڕە دەنووکی لەگەڵدا ناکات.

مامۆستا عومەر لە ئەنجامی ئەو ستایشکردنە هەستی بە شادییەکی زۆر کرد و دەستی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە کردەوە و گوتی:

- ئاغا لە دیوەخانەکەی خۆی لە بەردەم پیاوماقوڵان و خەڵکی لەگەڵ باوکی کچە کۆ بووەوە، دوای ئەوەی ڕاستیی کارەکە لە لایەن پیرەژنەکانیشەوە پشتڕاست کرایەوە و دوای پشکنینی ئەو هەشبەسەرە، پشکنینی چی؟! خۆ ئەوان نە ئامێری پشکنینیان هەیە و نە پزیکیشن، تەنها یەك دوو دڵۆپە خوێنە و هیچی ترا ئیدی ئاغا بە باوك و کوڕەکەی گوت: "ئێمە بەرانبەرتان کەمتەرخەم نەبووین، ئێوەش مافی خۆمان بدەنەوە". باوکی کچە بە سەرشۆڕی کە خەریك بوو چاوی لە زەوی بەرز نەدەکردەوە، گوتی: "لە بەرچاوی ئێوە سەری دەبڕم بۆ ئەوەی ببێتە پەندا" ئاغا بێ منەتانە گوتی: "لە گوندەکەی خۆم

ڕشتنی خوێنم ناوێ، مافەکەمان ئەو کاتە پێ دەگات کە ئەو ڕووڕەشەی کچت ببەیت و بڕۆیت!"

برای کچە بە هۆی هەڵچوونی زۆرەوە هەڵدەلەرزی و بە دەنگێکی پچڕپچڕ: "بەڵام دەبێ من بزانم کێ ئەو کارەی لەگەڵ کردووین و وا سەری شۆڕ کردین و لە قوڕێی نا، هەر دەبێ بزانم و سزای خۆی وەربگرێت". ئاغا بە دەنگێکی بەرز و ئاغایانەوە گوتی: "بە دیار منەوە پاڵەوانێتیی خۆت مەنوێنە، ئەم کارە پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەیە، ئینجا ڕووی لە پیاوماقووڵانی گوندەکەی کرد: ڕاستە هەر لە خوداوە تۆوی سادەییمان تێدا چاندراوە و گەورەیی بەسەر کەسدا ناکەم، چونکە هیچ کەسێك گەورە نییە، تەنها خوا نەبێت، بەوە ڕازی بووم کوڕە تاقانەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ کچێك بکات، بێ ئەوەی پرسیار لە بنەچە و بنەماڵەکەیان بکەم، بەڵام سەبارەت بە شەرەف و ئابڕوو هەرگیز دەستی لێ هەڵناگرم". لێرە و لەوێ دەنگە دەنگ بەرز بووەوە: "تۆ هەمیشە سەرت بە بەرزی دەمێنێتەوە ئاغا". "شەرەف و ئابڕووی گوندەکە لە ئابڕوو و شەرەفی تۆدایە و بە تەمای خودا پارێزراوە".

کەژاوەی تێکشکاو و خەمباری کچەکە بە ڕەنگی هەڵبزڕکاو و ڕۆیشتنێکی کۆستکەوتووانەوە لە گوند دەرچوون و ژمارەیان لە بیست کەسێك زیاتر دەبوون، لە دوای خۆیانەوە هێسترەکانیان ڕادەکێشا. زۆربەی ئافرەتەکان بەسەر پشتی ئاژەڵەکانەوە بوون. لە ناویشیاندا هی وا هەبوو لە ئەنجامی خەمی زۆرەوە سەری خۆی لە قوڕ نابوو. کەژاوەکە بە تێکشکاوی و سەرشۆڕی و بێدەنگییەوە ڕێی دەکرد، هیچ دەنگەدەنگێك نەدەبیسترا. کەس قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد، کچەکەشیان بە سەرپۆشێکی ڕەش داپۆشیبوو وەکوو دەربڕینێك بۆ

ئابڕووتکانەکەی و ئەو بەڵایەی بەسەری هێناون و لەدەستدانی شــەڕەف و ئابڕوویـــان. ئەویـــش لەبەر شـــەرمەزاری و ئەو سەرسامییەی لە ئەنجامی ئەو دۆخەی بەسەری هـاتبوو تووشـی شۆك بووبوو و دۆش دامابوو، خەریـك بـوو عەقڵی لە دەسـت بدات و نەیدەزانی چی لە دەوروبەری ڕوو دەدات. خۆ لەوانەیە مەرگ و ژیـان بەلایەوە وەکـوو یەك بـن. ئـاخر ئەو پـێش مـاوەیەکی کـورت لە لـوتکەی بەختـەوەری و خۆشـیدا بـوو، کەچی لە چاوتروکانێکـدا، کۆتـایی بە هەمـوو شـتێك هـات و گەیشـتۆتە لـوتکەی خەمبـاری و بەدبەختـی و دەردەسـەری و تێکشـکانەوە، شـەرمەزاری دەیکوژێـت و خەڵکـیش بە ڕق و قینەوە شـوێنی کەوتـوون. دایکـی دوای ڕۆژێـك لە ڕێکـردن هەوڵـی زۆری دا بزانێـت کـێ دەسـتی بـۆ بـردووە و ئـابڕووی تکانـــدووە. کەچـــی هیچـــی دەســـت نەکەوت. خوشـــکە دووانەکەیشی بە گریانێکی تاڵ و فیغانەوە سوێندی دونیـای بـۆ خواردن کە هیچ کەسێك لە ژیانی خوشکەکەیدا نییە و دڵنیاشـە کەس دەستی بۆ نەبردووە. پاشان گەیشتنە لوتکەی ئەو چیایەی کە بەفـــر داپۆشـــیبوو. وەرز هـــاوینە و دۆڵەکەش گەرم، ڕووبارەکەش خوڕەی دێت و لە هەندێك شـوێنیش بە هێواشـی دەڕوات و دار و درەخـتە بەردارەکـان و مێرگـی سـەوز و ڕەشـماڵی پەرشـوبڵاوی ئەو نـاوە و شـوانەکانیش لە هەمـوو کەندولەنـد و قەدپـاڵێکی نـاوچەکەدا ئاژەڵەکانیـان دەلەوەڕێـنن. قەدپاڵێك بەرەو دۆڵەکە پێچ دەکاتەوە و یەکێکی دیکەش بەرەو لوتکە بەرز دەبێتەوە کە بەفر داپۆشیوە و ئامادە نییە بە درێژایـی ساڵ بتوێتەوە و لوتکە جـێ بهێڵێـت. کەژاوەکە بـوونە دووبەش؛ هەندێك لە پیاوان لەگەڵ ژنان ڕێگەی قەدپاڵی دۆڵەکەیان گرت و ڕوویـان لە گونـدەکە کـرد، هەنـدێکی دیکەیـان ڕێـگەی قەدپاڵەکەی دیکەیان گرتەبەر!

خوشکە دووانەکەی، خۆی بە سەر قاچی باوکیدا دا و ماچی کرد و تکای لێ کرد و لێی پاڕایەوە لە خوشکەکەی ببورێت، کەچی باوکی لەجیاتیی بەزەیی بەر شەقی دا. ئەم جارەیان کەوتە سەر پێی براکەی، کەچی تووڕەیی ئەو لە گڕکانی ناخی باوکی زیاتر و بەجۆشتر بوو. ئەو بۆ لەدەستدان و لەکەداربوونی ئابڕووی ناگرییێت، بەڵکوو بۆ لە دەستدانی ئەو گرێبەستی تەمەنەی نێوانیان داد و فیغانێتی کە لە ژێری ژێرەوە بەرەو ئاسمانی دەبرد، ئەگەر بەردەوام بووایە. ئیدی سەرنجی خەماوی و تێکشکاوی هەردوو خوشکە دووانەکە بەوپەڕی ڕووخاوی و خەم و ناسۆرەوە هەر لە دوورەوە ئاوێزانی یەکتر بوون و دواتر وەکوو دوو جەمسەری ئاڕاستە پێچەوانەوە ملیان کەچ کرد و خۆیان دایە دەستەوە، چی بکەن، مەلێکیش نین لە شەقەی باڵ بدەن و پێکەوە سەرهەڵبگرن و ڕوو لە ئاسمان و شوێنێکی دیکە بکەن، وەلێ ناچارن و هیچ دەسەڵاتێکیان نییە، هەر یەکەیان بەرەو ئەو چارەنووسەی چاوەڕێیان دەکات، تاڵ تاڵ، تاڵە دەزووی پەیوەندیی ڕۆحیی نێوانیان لەگەڵ دوورکەوتنەوەی جەستەیان وەکوو لاستیك کشی دەهات و ئامادە نەبوون بپچڕێن و دەستبەرداری یەکتر ببن، ئاخر ئەوان چۆن دەتوانن دەستبەرداری یەکتر بن، ئەوان پێکەوە خولقاون و پێکەوە چاویان بۆ دونیا کردووەتەوە و چۆن دەبێ ئێستا لەیەکتری دابڕێن؟! وەلێ لە هەمبەر عەقڵی پاشڤەڕۆ و بەستەڵەکی مێشکە ژەنگاوییەکان، دەبێ مرۆڤ چ دەسەڵاتێکی هەبێت، بە تایبەتی کچێکی بەدبەختی وەکوو ئەم، کە لەوانەیە چارەنووسی لە خوشکە دووانەکەی باشتر و خۆشتر نەبێت.

لەوێ لە لوتکەی مەرگ، بایەکە دەیلووراند و بەفرەکەی بە سەروچاوی مرۆڤەکاندا دەدا. هەورێکی ڕەشیش، ڕەشتر لە دڵی

دڵڕەشەکان، باڵی بەسەردا کێشابوون و هەناسەی لێ دەبڕین و دەیخنکاندن، وەك ئەوەی بیەوێت ڕۆحیان بکێشێت. سرووشتی سەخت و دژواریش بەوپەڕی توانا و بێبەزەییانە و بە هێزەوە بەشداری لە ڕیشەهەڵکێشان و دەربازبوونی دڕندەیی مرۆڤبوون لە شوێنی خۆی دەکرد. کچە نەشمیلەکە کەمێك بە ئاگا هاتەوە. براکەی بینی ڕەنگی هەڵبزڕکاوە و چاوەکانی دەرپۆقیون و بە ڕقەوە بەفرەکە هەڵدەکەنێت، تا گەیاندییە زەوییەکە. دارێکی ئەستووری سەر چەماوەی لێ چەقاند، درێژییەکەی نزیکەی باڵێك دەبوو، پێشتر بۆ ئەم مەبەستە و ئەم ساتەوەختە لە درەختێکی تەڕی ئەو قەدپاڵە بڕیبووی و ئامادەی کردبوو. باوکیشی بە گرژ و مۆنییەوە لە تەنیشتییەوە ڕاوەستابوو. پەتێکی بەدەستەوە بوو کە پێشتر کەس ئەو پەتەی بە دەستەوە نەبینیبوو، گەنجێکی دیکەی خەڵکی گوندەکەیان لەگەڵدا بوو کە هاوڕێی براکەی بوو، یان بە خزمایەتی دەگەیشتەوە کچەکە، لەوانەیە حەزی زانین یان سادیزمی نێریتی وای لێ کردبێت لەگەڵیان بێت و بەشداری بکات و ڕووداوەکە بە چاوی خۆی ببینێت و چێژی لێ وەربگرێت.

ڕەحمان وەکوو گڕکان لە ناخەوە دەکوڵا و بە چاوی پڕ لە فرمێسك و هەڵچوونەوە گوتی:

- مەیموونن مەیموون!

مامۆستا عومەر قسەکانی دەست پێ کردەوە و شێوازی دەنگیشی بە هۆی کاریگەری و قێزەونی ڕووداوەکەوە کەمێك کز بووبوو:

- دوو کەسی دیکەشیان لەگەڵدا بوو، یەکێکیان خزمی دایکی کچە بوو، واتە خاڵوانی بوو، نزیکەی سی ساڵێك تەمەنی

بوو، ئەوەی دیکەش هیچ خزمایەتی و پەیوەندییەکی لەگەڵیان نەبوو، وەلێ فێڵبازێکە و کڵاو لەسەر هەموویان دەنێت. کچەیان لەسەر پشتی هێسترەکە هێنایە خوارەوە. دیسانەوە پرسیاری ئەوەیان لێ کردەوە کە کێ ئەو کارەی لەگەڵدا کردووە؟! بەڵام ئەو فریشتە جوانە ڕوخساری باوکی بینی خەریك بوو هەناسەی سوار دەبوو، سەرماکە خەریك بوو بیبەستێت، ئەویش چی لەبەر ئەو سەرما بێئەندازەیە و چی لە ترسان و چی لە داخان، وەکوو "بی"ی ناو ئاو هەڵدەلەرزی و گوتی: "باوکە گیان... توخوا ئاگات لە خۆت بێت بەم سەرمایە نەخۆش دەکەویت!" هەوڵی دا بە چمکی سەرقۆڵەکەی دەموچاوی بسڕێت، کەچی دەستی گرت و بۆ پشتەوە بایدا، تا ئەو کاتەش ئەو فریشتەیە لە نیوەی هۆشی خۆیدا بوو، بەبێ هیچ بەرگرییەك گوێڕایەڵیان بوو. وەك ئەوەی ئەم سرووشتە سەختە تا ئەو ساتەوەختە توانای کوشتنی مرۆڤایەتی لە ناخیدا نەبێت. هەردوو دەستیان لە پشتەوە بەستەوە، لە بەردەم دارە چەقێنراوەکە دایاننا، پاشان پەتە زیادەکەیان بە دارەکەوە بەستەوە. ئەوەتانێ تێنوێتیی ئادەمییەکان بۆ خوێن پاساوی نەزۆکی خۆی دەدۆزێتەوە و لەوێ لەو لوتکەیەدا خەریکە دەتەقێتەوە، ئەم فریشتەیە دەکەنە قوربانی ئەو خوای نەزانی و دواکەوتنەی کە دەیپەرستن. براکەی "ئەو پاڵەوانەی شکۆی خۆی وەردەگرێتەوە" لووتی خوشکەکەی بە توندی گرت و دڕندەکانیش لە دەوروبەری دەخوولانەوە و بە چێژەوە هەڵەکەسەمایان بوو، تا بزانن چۆن لووتی ئەو فریشتەیە لە ڕوخساری جیا دەکاتەوە، کچەکە چاوەکانی کردەوە، لە دوێنێ شەوی بووکێنییە شوومەکەیەوە بۆ یەکەم جارێتی بە تەواوی بە ئاگابێتەوە، دەمی چەقۆکە بە دەستی براکەیەوە دەبریسکایەوە، لەو ترس و تۆقینەیدا هاواری کرد: "ئەوە من چیم بەسەر دێت؟! خەریکن چیم لێ دەکەن؟! بەزەییتان پێمدا بێتەوە". خوێنێکی

زۆر لە لووتی نەچۆڕا، تەنها چەند دڵۆپێکی کەم نەبێت ڕژایە سەر دەم و چەناگەی. شێوەی دەنگیشی گۆڕا، وەك ئەوەی دەنگەکە لە قورگییەوە دەرنەچێت، ئیدی هاوار و باوکەڕۆی کچەکە و تۆقینی لەوەی ڕوو دەدات شاخەکەی پڕ کردبوو، ئا ئاوەتا گوێیەکیشیان گەیاندە لووتە براوەکەی و ئەویشیان بڕی، چەقۆکە لە دەستی براکەی کەوتە خوارەوە، باوکی بە تووڕەیی و ڕقەوە هەڵیگرتەوە و گوێچکەکەی دیکەی کچەکەی گرت و ئەویشی بەوپەڕی دڕندەییەوە بڕی. کچەکە هاواری دەکرد و بە توندی خۆی ڕادەپسکاند قیژە و فیغانی گەیشتبووە کەشکەڵانی فەلەك، وەلێ فریادڕەسێك نەبوو لە دەستی ئەو دڕندانە ڕزگاری بکات. خوێنێکی زۆر فوارەی کرد و دڵۆپەکانی بەسەر بەفرە سپییەکەدا پەرشوبڵاو بوونەوە و تابلۆیەکی پڕ لە شەرمەزارییان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا تۆمار کرد، لە پڕێکا وازی لە گریان و هاوار هێنا و بێدەنگ بوو. چاوی هەڵبڕی و بە بێدەنگی سەیری ڕوخساری دەکردن، لە دانیشتنەکەیشی ڕاست بووەوە، بینیانی بە بێدەنگی چاویان بڕیوەتە ڕوخساری و چاویان زەق بووەتەوە، وەك ئەوەی بەو دیمەنەی ئاسوودە و خۆشنوود بن. نازانم چ نەفرەت و چ بیرۆکەیەکی ڕیسوا و تۆکراو لەو ساتەوەختە قێزەونە بە مێشکیاندا دەخولایەوە، کاتێك بەو شێوازە دڕندانەیە چێژیان لە ڕوخسارێکی شێواوی پەرییەك وەردەگرت! ڕوخساری کێش، ڕوخساری کچ و جگەرگۆشەی خۆیان، ئەوەش نازانم دەبێ کچێك لە شێوەی ئەو و بەو حاڵەوە، بیر لە چی بکاتەوە و خەیاڵی بۆ کوێ بڕوات کە ئەوەندە دەستەپاچە و بێدەسەڵات و تۆقیو بێت. منیش تا ئێستا نازانم چۆن بیرۆکەیەکی وا گەمژانە لە مێشکی مرۆڤێکی گەمژەوە دەردەچێت و دەگۆڕێت بۆ دابونەریتێك و نەوە دوای نەوە بۆیان دەمێنێتەوە، هەموو توانای دڕندانە و نەزانانەی خۆیان کە

سرووشــت لە ناخیانــدا چانــدوویەتی تەرخــان دەکەن لە پێنــاو مشتومالکردن و بەهێزکردنەوەی ئەم خوو و نەریتە گەمژانەیە.

کچەکە بەو دۆخەوە چاوی لە ڕوخساری کەسوکاری، باشتر وایە بڵێــین جەللادەکــانی بڕیبــوو، ئەوانــیش بەو قێزەونــی و سـادیزمەی خۆیـانەوە چێژیـان لە لەتـوپەتکردنی گۆشـتەکەی و ئەندامانی جەستەی دەبینی. کاتێکیش دێو و درنـجەکەی ناخیـان ئاسوودە بوو، ئیدی ڕاوەسـتان و پشـتیان تـێ کـرد و هەنگـاو بە هەنگــاو بــێ ئەوەی ئـاوڕ لە دوای خۆیـان بـدەنەوە لێـی دوور دەکەوتنەوە. کچەکەش لە شێوەی دانیشتن و بەچۆکداهاتنەکەی خۆی بە بەستراوەیی مابووەوە و تەماشای دەکـردن و لێـی دوور دەکەوتنەوە، هەتا بە تەواوی لە بەرچاوی ون بوون.

ئیبــراهیم سـەری ڕاوەشـاند و هەناسـەیەکی پـڕ لە ناسـۆری هەڵکێشا و گوتی:

- ئەوە چ ئـازار و ئەشـکەنجە و ئەندێشـە و ترسـێکە ئەو بەستەزمانە چەشتوویەتی، هەتا ڕەق بووەتەوە و گیـانی لەدەسـت داوە؟ کچێـك لە شـێوەی گـوڵ، لە هەڕەتـی لاویـدا، جـوان و شۆخ، چالاك و وریا، لەو سەرماوسۆڵە توانـاپڕووکێنە بە تەنهـا و بە دەســت و پــێ بەســتراوەیی لەو چــۆڵەوانییە و بەو ڕوخســارە شـێوێندراوەوە بەجـێ دەهێڵـدرێت و بەفـر بەر شـەق و زلـلەی دەدات و چەند ئەندامێکی جەستەی بە لەتکراوی و لە بەرچاوی لەسەر زەوی توورِ هەڵدەدرێت و فڕێ دەدرێتە بەردەمـی، ئەوە دەبێ چ ویژدانێـك بێـت، هەتـا مەرگ لەسـەرخۆ بـۆی دێـت و هەناسە و جووڵەی تێدا دەبڕێت و دەیکوژێت.

ڕەحمان بە ڕوخسارێکی شەکەتەوە گوتی:

- مردن باشترە لە ژیان لەگەڵ ئەو هەرچیوپەرچییانە، دەبێ

ئەو کچە چەند ئازاری خۆی دابێت، پێش ئەوەی بمرێت، بە تایبەتییش کاتێك کەسوکارەکەی جەللادی بن.

مامۆستا عومەر گوتی:

- ئا بە ڕاست، ئێستا ئیبراهیم ئەوەی وەبیر هێنامەوە کاتێك باسی ئەوەی کرد دەبێ ئەو کچە بەدەست و پێ بەستراوی لەسەر ئەو زەوییە ساردە و بەشێك لە ئەندامانی جەستەی بە بڕدراوی و فڕێدراوی بە بەرچاوییەوە بێت، شتێك هەیە لە یادم چوو بیگێڕمەوە، ئەوەش ئەوەیە براکەی لووتە بڕاوەکەی و هەردوو پارچە گوێچکەکەی کۆ کردەوە و کردییە ناو دەستەسڕێك و خستییە گیرفانییەوە، لە دووڕیانەکەی قەدپاڵی لای دۆڵەکە لەوانەی تر جوودا بووەوە و گەڕایەوە بۆ گوندەکەی ئاغا و بۆ ڕۆژی دواتر گەیشتە ئەوێ. چووە ناو دیوەخانی ئاغاوە و کوڕی بەنازی ئاغاش لەگەڵ ژمارەیەك لە پیاوماقووڵان و ڕیشسپیانی گوند لە دیوەخان دانیشتبوون. برای کچەکە سەری بەرز کردەوە، بە ڕوخسارێکی هەڵبزڕکاوەوە کە بە ئاشکرا بە سەرنجەکانیشییەوە دیار بوون، دەستی بە قسان کرد و گوتی: "وەك ئەوەی باوکم بەڵێنی پێ دابووی، تۆڵەی خۆمان ناکەینەوە هەتا لە خاکی ئێوە دەرنەچین. ئەوەتا بەرلەوەی بگەینەوە گوندەکەی خۆمان، تاوانبارەکە باجی هەڵەی خۆی وەرگرت. ئێمە خانەوادەیەکین هەرگیز سەرشۆڕی و ڕیسوایی قەبووڵ ناکەین و لەگەڵ تاواندا ناژین". پاشان دەستەسڕەکەی دەرکرد و ئەوەی لە ناویدا بوو خستییە بەردەمی ئامادەبووان، ئیدی لە هەموو لایەکەوە دەربڕینی جۆراوجۆر دەبیسترا. ئاغا گوتی: "لا حول ولا قوە الا باللە". یەکێکی دیکە گوتی: "خودایە لە گوناهەکانی هەموومان خۆشبە" گوێی لە دەنگێك بوو دەیگوت: "ئابڕوو و شکۆداریتان پارێزراوەو شەرەفیشتان

هەروا پـارێزراوە". دەنگێکـی دیـکە گـوتی: "انـا لـلە وانـا الـیە راجعون". پاشان گەنجەکە مۆڵەتی لە ئاغا وەرگرت و ڕاستەوخۆ ڕووی وەرگێڕا بەرەو گوندەکەی خـۆی گەڕایەوە. پشـوودان و مێوانداری لای ئاغای نەویست. هەرچەندە ئاغاش داوای مـانەوە و مێوانداری لێی نەکرد. گەنجەکە لەوەدا هەستی بە سووکایەتی کرد و پێی وابوو ئەوەی خوشکەکەی پێـوەی لکانـدن هەتاهەتـا بەدوایانەوە دەبێت و یەخەیـان بەر نـادات، هەرچییەکـیش بـکەن تازە لەگەڵ ئەو کەسانەدا یەکسان نابن کە ئابڕوویان پیس نەبووە و لەکەی تێنەکەوتووە. خەڵکیش ئەگەر ڕووبەڕوو پێیـان نەڵـێن، ئەوا بە دڵنیـاییەوە لە پشـتیانەوە و لە پاشـملە دەیڵـێن، دوای یەك دوو ڕۆژ گەیشــتەوە گونــدەکەی خۆیــان و بینــی ڕوخســاری خەڵکـی خەمبـار و گـرژ بـوون، خەمەکەیـان بـۆ خوشـکەکەی نەبـوو، بەڵکـوو بـۆ دایکـی بـوو، چـونکە بەرگەی ئەو کۆسـتە گەورەیەی نەگرتبوو. ئاخر ئەو ئـافرەتێکی نەخـۆش و لەڕولاواز بوو، بە دەست نەخۆشییەکەوە دەینالاند کەس نەیـدەزانی چیـیە، هەر کە بینـی پیـاوەکەی بەو جـۆرە گەڕایەوە، ئیـدی بەرگەی نەگرت و کەوتە سەر زەوی، هەڵیانگرتە سەر جێگەکەی خۆی و بەو شێوەیە مایەوەو خەم و ناسۆر ناخیـان ونجڕونجـڕ دەکـرد، ئەوەتانێ پێش ئەوەی کوڕەکەی بگەڕێتەوە بە چەند کاتژمێرێك پێشـتر گیـانی لەدەسـت دا و مـرد و خەمـی کـچەکەی بـردە گۆڕەوە. دواتـر دەیـانگوت ژنێـك هەبـووە لەگەڵ پیـاوەکەی لە یەکێك لە شارە بچووکەکانی ناوچە شـاخاوییەکان ژیـاوە، دوای دابڕانێکی زۆر لە کەسوکاری هاتووەتەوە و سەردانیان دەکـات، ئەو ئافرەتە هاوڕێیەکی نزیکی کچە بەفرینەکە بـووە. هەرچەنـدە ژنەکە نزیکەی پێنج ساڵ لەو گەورەتر بوو، تووشـی شـۆك بـوو کاتێك ئەوەی بیست کە بەسەر هاوڕێی منداڵیدا هاتووە. باوك و برای کچە کوژراوەکە زۆر پەرۆش بوون بۆ ئەوەی بـزانن کـێ

ئەو تـاوانەی ئەنجـام داوە و ناوبـانگی زڕانـدوون! هەوڵیـان دا لەگەڵ ژنەکە قسە بکەن، بەڵکوو سەرەداوێکیان دەست بکەوێت و شتێك لەو نهێنییە بزانن و ناوی تاوانبارەکەیان پێ بڵێـت. بەڵام ژنەکە بە گریانەوە سوێندی بۆ خـواردن کە کچەکەیـان پـاك و بێگەرد بووەو لە ژیانیدا هیچ پیاوێك دەستی لـێ نەداوە، هەمـوو چیرۆکەکە ئەوەبوو: کاتێك کچەکە گەیشتبووە تەمەنی باڵقبوون. ڕاچڵەکـی بـوو کاتێـك لە ناکـاو خـۆی بینیبـوو خـوێنی لـێ دەچۆڕێت و تووشی خوێن بەربوون هاتووە. ئەویش هاوشێوەی کچە هاوتەمەنەکانی لەو بارەیەوە هیچی نەزانیوە. لە حاڵەتی وادا شـەرم و تـرس بەسـەر کچـدا زاڵ دەبێـت، بە تـایبەتیش کە پرسـەکە پەیوەسـت بێـت بەو بەشـە هەسـتیارەوە کە کـۆمەڵگە کۆڵەگەکـانی ژیـانی لەسـەری بونیـاد دەنـێن! بـۆیە ئەویـش نەیتوانیبوو لای کەس باسی بکات و شەرمی کردبوو. کاتێکیش خـوێنەکەی زیـاتر بووبـوو، پەمـۆیەکی زۆری خستبووە نێـوان ڕانەکـانییەوە، کە لە سـەرینەکەی دەریکردبـوو، بەو ئومێـدەی کارەکە چارەسەر بکات، بەڵام ترس و تۆقینەکەی ڕانەوەستابوو، هەتـا هـاوڕێکەی لەوە ئاگـادار کردبـووەوە کە بەدەسـتییەوە دەناڵێنێت. وا پێ دەچێ لە ئەنجامی ئەو هەمـوو پەمۆ و پـارچە پەڕۆیـانەی بەکـاری هێنـاوە پەردەی کچێنـی دڕابێـت. تەنـانەت هاوڕێکەیشـی کە چەنـد سـاڵێك لەویـش گەورەتـر بـوو، بەڵام ئەویش هیچ شـتێکی دەربـارەی پەردەی کچێنـی و پـاکیزەیی و ئەوەی پەیوەسـتە بەو بـابەتەوە لەو کـاتەدا نەزانیـوە. بەڵام لە خوێنەکەی دڵنیای کردووەتەوە، کە شتێکی ئەوتۆ نییە، تەنـانەت جارێکیان بە نهێنی لە دەرکردنی ئەو هەموو پەمۆیەی خستبوویە ناو زێیەکەیەوە یارمەتیشی دابوو. ئەوەی فێر کردبوو کە چۆن بە دانانی پـارچە پەمـۆیەك لەسـەر پـارچە پەڕۆیەك و دانـانی لەژێـر دەرپێـوە، کێشـەکە چارەسـەر دەبێـت. هەر کـاتێکیش بە هـۆی

دڵۆپە خوێنەکانەوە پەمۆکە و پەڕۆکە خووسان، بە پارچەیەکی دیکە بیانگۆڕێت. ئەم ڕووداوە چەند ساڵێك پێش ئێستا لەگەڵیدا ڕووی دابوو، هەتا ئەوەیان لە یادیش نەمابوو، وێڕای ئەوەی ئەم چیرۆکە بەڵگە بوو بۆ پاکیزەیی و ئەستۆپاکی و بێگەردیی کچەکەیان، کەچی باوك و کوڕەکەی ڕازی نەبوون باوەڕ بەوە بکەن. لەوانەشە خۆزگەی ئەوەیان نەخواستبێت کە ڕاستە، تاکوو تاوانی پەلەکردن و گومانیان نەکەوێتە ئەستۆ، لە ترسی تووڕەیی خوا.

ڕەحمان بە بێزارییەوە:

- واتە ئێستا خوایەکەیان دڵخۆشە بەوەی ئەنجامیان داوە، ئەگەر ئەو تاوانبار بێت بەپێی تێڕوانینی ئەوان؟ ئەی خوایە چەند خوێن بە ناوی تۆوە ڕژاوە. ئەرێ کاتی ئەوە نەهاتووە ویژدانی ئەو خوایە بە ئاگا بێت و لە خەوی غەفڵەتی خۆی ڕابێت و بە بەندە باوەڕدارەکانی خۆی بڵێت، ئێ دەبەسسە، هەرچی و پەرچێتیتان ناوبانگی پیس کردووم و زیاد لە پێویستیش ڕیسوای کردووم.

ئیبراهیم بە قێزلێبوونەوە هەستی بەوە کرد و گوتی:

- ئەمە حاڵی دونیایە لێرە و لە هەموو جیهانی ئیسلامی.

مامۆستا عومەر ئەوەیشی بۆ زیاد کرد:

- ئەمانە پێویستییان بە دووسەد ساڵی دیکەش هەیە، بەرلەوەی لەو کولتوورەی ڕابردوویان دەربازیان بێت.

ڕەحمان لە بەدبەختیی خۆی هەستی بە هەناسەبڕکێ دەکرد و گوتی:

- لە سەر ئەم بنەمایە خۆیان لە باری گرانی خوشکە

دووانەکەیان دەربـاز کـرد، کە هـیچ کەسـێك ئامـادە نەبـوو هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات ئەم شێتە نەبێت.

مامۆستا عومەر بە پێکەنینەوە گوتی:

- ئەشهەد و حەق بە تۆیە ڕەحمان، ئـاخر ئەگەر زمـانەکە فێر ببوویتایە، هەر زوو لە هەموو شتێك تێدەگەیشـتی و دەتزانـی چی ڕووی داوە و چی ڕوو دەدات. چونکە جووتیاران شـتێکی دیکەیان نییە، جگە لە باسکردنی ئەم جۆرە کاروبارانە.

- ئەی دەربارەی ئەو شێتە چی دەڵێـی، مەبەسـتم هـۆبییە؟ خۆ زمانەکەش دەزانێت، کەچی ئاگـای لە چیرۆکـی ئەو کـچە نەبـووە، ئەگەرنـا پێـی دەگـوتم. خـۆ ئەگەر بە چیرۆکەکەیشـی زانیبێت و پێـی نەگـوتبم، ئەوا گەمژەییەکـی گەورەی بەرانـبەرم ئەنجام داوە! دوای ئەوەی بینیمی وێڵ و سەرگەردانم بە دوایدا.

ئیبراهیم بە کەمێك کراوەییەوە گوتی:

- هـۆبی زۆر بە کەمـی لەگەڵمانـدایە. لەوانەیە دەرفەتـی زانینی ئەم چیرۆکەی بۆ نەڕەخسابێت. بۆیە نابێ گلەیی لە کەس بکەیت، تاکەکەس گلەیی لێ بکرێـت خـۆتی. زۆربەی ئەوانەی لەگەڵمان بوون، دەمێکە چیرۆکی خوشکەکەیان زانیوە. جگە لە پرسی هاوسـەرگیریی ئەو شـۆخە نەبێـت لەو شـێتە. ئەمەیـان بـۆ ئـێمەش لە ناکـاو بـوو. لەوانەیە زۆر بە پەلە ڕووی دابێـت، یـان لەبەر هۆیەك لە هۆیەکان بە نهێنی مابێتەوە.

- ئـای بە دۆزەخ بـن. نێـوان مـن و قیـبلەکەم، تەنهـا دوو هەنگاو بوو پێش ئەوەی چالاکییەکە ئەنجـام بـدەین و نەمتـوانی لەو شێتە و لەو کەسوکارە بەرەڵلایەی بیپارێزم و دەربازی بکەم. ئێسـتا چـی بـکەم؟! وای لە بەدبەختـی و وای لە گەمـژەییم. ئەو هۆبییە گەمژەیەش دڵنیام شتێکی دەربارەی ئەمە نەزانیـوە، دڵنیـام

شتێکی دەربارەی هاوسەرگیرییەکەی نەزانیوە، ئەگەرنا ئەو کاتە پێی نەدەگوتم: "باوکی بە کەمتر لە بیست هەزار دیناری سویسری بە شووی نادات".

بە دۆزەخ... ئاخر شوو بە شێتێك بکات؟ هەر بە ڕاستی ئەگەر ئەوەم بزانیبووایە لێیانم دەسەند، خۆ ئەو کاتەش لە سەرنجەکانیدا شتێك هەبوو، وەلێ من لێی تێنەگەیشتم، لەوانەیە چاوەکانی بە چاوەکانمی گوتبێت: تکایە لەو چارەنووسەی چاوەڕوانم دەکات ڕزگارم بکە. دەڵێن چاوەکان لە ڕێگەی سەرنجدانی یەکترییەوە دەدوێن و پێکەوە گفتوگۆ دەکەن، چونکە چاو وەکوو پێکەنین و گریان زمانێکی جیهانییە و هەمووان وەکوو موزیك لێی تێدەگەن. سوێند بە هەموو ئەهریمەکان و دێو و خێوەکان، چاوەکانی داوای یارمەتییان لێ دەکردم... ئای چ گەمژەیەك بووم، چ زوو بێ و چ درەنگ دەگەڕێمەوە بۆ لای، دەبینن چۆن ئازادی دەکەم و تۆڵەی خۆی و خوشکەکەیشی دەکەمەوە.

- کەسوکارەکەی دەکوژێت و دەیهێنێت؟!

مامۆستا عومەر وای گوت و لەگەڵ ئیبراهیم پێکەوە دایانە قاقای پێکەنین!

# بەشی یازدەیەم

بارەگـای ناوزەنـگ هەمـوو مافیاکـانی سیاسـەتی لە خـۆ دەگرت. بازرگان و قاچاخچییەکانی چەك، بازرگانانی بیروباوەڕ، جاش و بەکرێگیـراو، تیرۆریسـت، قاچـاخچی کـاڵاو کەلـوپەل، شانبەشانی ئەوانەش؛ نیشتمانپەروەران، ڕۆشـنبیران، خوێنـدەواران، مـرۆڤە بـاش و دڵسـۆزەکان، کەسـانی سـادە و گەمـژە، نەزان و نەخوێنـدەوار، زۆربەشـیان لە ڕیـزی حـزبە دێرینەکـان، یـان ڕێکخراوگەلێك بوون کە تازە دامەزرابوون و شتێکی ئەوتۆشیان دەربارەیـان نەدەزانـی، هەر هەمووشـیان ئەو دۆڵە قایمەیـان کردبووە پەناگە و شوێنی حەوانەوە و تێیـدا جێگیـر بووبـوون و ئەو دۆڵە بـۆ هەمـووان باوەشـێکی گەرم و ئاسـوودە بـوو، بەڵام بازرگانانی بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆژیا، لە هەموویـان نەفرەتلێکراوتـر بـوون، فێڵیـان لە جیهـان کردبـوو، بەوەی پرسـێکیان هەیە و خاوەنی ئەو پرسەشیان لە پێناویـدا خسـتبووەگەڕ، زۆربەشـیان لە هەرزەکارە خوێنگەرمەکـان بـوون، ئەوانەی ڕێـك لە کـۆیلەیەك دەچـوون، هیـوای ئـازادی بخوازێـت، بەمەش کەوتبـوونە داوی تەونـی جاڵجـاڵۆکەی سیاسـییەکانەوە، ئەوانـیش بێبەزەییـانە دوا دڵۆپی خوێنیان دەمژین، بـێ ئەوەی و بەرلەوەی دەسـتیان بگـاتە هیچ شتێك لەو خواسـت و ئومێـدانەی هیـوای بەدەسـتهێنانی بـۆ دەخوازن.

سـەرکردەی ئەو پێکهـاتە جیـاوازانە، هەنـدێك کـات لێـرە دەمێننەوە و پاشان بە نۆرە بۆ وڵاتانی دراوسـێ گەشـت دەکەن، لەوێـوەش بـۆ سەرانسـەری جیهـان، بـۆ ئامـادەبوون لە کـۆڕ و

کۆبوونەوە، یان گرێبەستی نهێنی و دیاریکراو. بەمەش ژیانیان پڕ بوو لە چێژ و خۆشی، سوور بوون لەسەر ئەوەی زۆرترین کات و درێژترین ماوە لە پێگەکانی خۆیاندا بمێننەوە، ئەم خۆهەڵواسینەش بە پلە و پایەوە دەبووە مایەی چنینی هەرچی بە خەیاڵیاندا دەهات لە پیلانگێڕی و خەراپەکاری دژی یەکتری.

زۆربەی ئەو ڕێکخراوانە، بارەگای پەلێکیان بۆ مێوانداری لە دەروازەی دۆڵەکەدا هەبوو، ئەوان پەلێکی خزمەتگوزار بوون و پێشوازیی مێوانەکانیان دەکرد و شوێنی مانەوە و حەسانەوە و خواردنیان بۆ مێوانەکانیان دابین دەکرد، تا ئەو کاتەی ئەوەیان تەواو دەکرد کە لە پێناویدا هاتوون. یەکێك لەو پەلانەش بارەگاکەی لە لێواری ڕووبارەکە دامەزراندبوو. دار گوێزێکی گەورە و زەبەلاحیش سێبەری لێ دەکردن و لق و گەڵاکانی بەملا و بەولادا پەلیان هاویشتبوو، وەك ئەوەی بیەوێت زۆرترین ڕووبەری زەوی لە ئامێز بگرێت، لەو ڕۆژانەدا ڕێژگەی ئاوەکە لە ڕێژەی ئاسایی خۆی بەرزتر بووبووەوە، شەپۆلەکانی بە شێوەیەکی سەرشێتانە و تووڕە بەرەو خوار شۆڕ دەبوونەوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بتوانێت لە بەرانبەریدا ڕابوەستێت و خۆی ڕابگرێت، هەتا ستوونی پردەکەشی لە ژێرەوە هەڵتەکاندو پارچە تەختەکانیشی پەرتوبڵاو کردەوە، لە هەردوو لای ڕووبارەکەدا جگە لە پەتێك بەولاوە هیچی تر نەمایەوە، کە ئەویش سۆندەیەکی پلاستیکی پێوە هەڵواسرابوو ئاوی خاوێنی لە کانیاوەکەوە بۆ بارەگای پەلەکە دەگواستەوە کە لەوبەری ڕووبارەکەوە بوو.

مێوانەکانی پەلەکە لێرە و لەوێ ڕاکشابوون و لەسەرخۆ و بە بێزارییەوە دەجووڵانەوە، کۆمەڵە چەکدارێك هاتن، شەکەت و ماندوو، پێ دەچوو چەند ڕۆژێك بێت بەڕێوە بن و ڕێیەکی

درێژیان بڕیبێت، بە دوای پردێکدا دەگەڕان، تاکوو بەسەریدا بپەڕنە ئەوبەرەوە، باسی دەراوێکیان دەکرد کە نزیکەی بیست خولەکێك لەوێوە دوور، کە لەوێوە بپەڕنە دیوی دووەم.

یەکێك لە مێوانە تازەکان هەوڵی دا ڕووبەڕووی ڕووبارەکە ببێتەوە و هەر بە پێ بەناویدا تێبپەڕێت و بچێتە ئەوبەرەوە، بەڵام بە خێرایی گەڕایەوە و پەشیمان بووەوە، ئاخر ڕێکردنی بیست خولەك باشترە لە ململانێیەکی دۆڕاو. بەڵام یەکێکیان کە ناوی عیسا بوو، بڕیاری دا نەگەڕێتەوە.

بانگیان کرد:

- دەی دەرچۆ، ڕووبارەکە ئەمڕۆ شێت بووە، تۆ عاقڵ بە.

بە پێکەنینێکی متمانەبەخۆبوونەوە وا وەڵامی دانەوە:

- تەنها چەند خولەکێکە و دەبینن گەیشتوومەتە ئەوبەرەوە، عیسا لە بەردەم تەوژم و شەپۆلی ئاوەکە ڕاناوەستێت.

ئەو جەستەیەکی بەهێزی هەبوو، باڵابەرز، وەکوو سوورەچنارە بە تەمەنەکان، دەموچاو و چەناگە پان. دەستەکانی ڕێك لە چەکوچ و کوتەکی ئاسنگەر دەچوون، لە ڕادەبەدەر متمانەی بە خۆی هەبوو، بەو بەهێزییەی خۆیەوە دەینازی، ئەو هێز و وزە زۆرەی وایان لێ کرد بڕیاری ئەو ڕووبەڕووبوونەوە و زۆرانبازییە لەگەڵ ڕووبارەکەدا بدات، ئەو پەتەی ئەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکەی پێکەوە بەستبووەوە زیاتر هاندەری بوو بۆ ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە، ئەوەتا ئێستا عیسا دەستی لە پەتەکە گیر کردووە و بە شێوەیەکی ئاسایی و بێ ئەوەی خۆی ماندوو بکات چەند هەنگاوێك دەهاوێژێت، چونکە لەوێ شەپۆلی ئاوەکە هێمن و لەسەرخۆ بوو، ئەمەش زیاتر وای لێ کرد بەرەو قووڵایی شەپۆلەکان هەنگاو بنێت.

عیسا شانی ڕاتەکاند، تاکوو کۆڵەپشتەکەی ڕێك بخاتەوە، چونکە لار بووبووەوە، هەنگاوێکی پتەوی هاویشت و پێی لە لووتبەرزیی ڕووبارەکە نا کە شەپۆلەکانی شێتانە و تووڕە بوون. بە شکۆمەندییەوە سەری بەرز کردەوە، پاشان چەمایەوە، ڕێك وەکوو چەمانەوەی سوارچاکان، کاتێك سڵاو لە ئامادەبووان دەکەن و پێشبڕکێیەکە قەبووڵ دەکەن، ئەویش بزەیەکی کرد و لە بزەکەیدا سووکایەتییەکی زۆری بە دۆخەکە لە خۆ گرتبوو، لە ناکاو شەپۆلی ئاوەکە تەکانێکی پێ دا خەریك بوو بەدەمدا بیخات، بەڵام لە کاتی گونجاودا قاچەکانی کردەوە و لە بەهێزیی پاڵنانی دژەکەی کەم کردەوە و خۆی ڕاگرت، ژێر ئاوەکە لووس و قەوزە گرتبووی و بەردەکانیش شلوخاو بوون و لەبەر بەهێزیی ئاوەکە بەریەکتری دەکەوتن و دەنگێکی لە شێوەی قرچەقرچی پەنجە ئەستوورەکانی دەبیستران، ئەمەش وای کرد عیسا هێواشتر بجووڵێتەوە بێ ئەوەی قاچەکانی لەسەر زەوی بەرز بکاتەوە، ئاخر بە تەنها قاچێکەوە توانای ڕاوەستانی لەسەر زەوی مەحاڵ دەبێت و تەوژمی ئاوەکە ڕایدەماڵێت، بۆیە زۆر بە زەحمەت قاچەکەی دیکەی بۆ ڕادەکێشرا و بەرەو پێشەوە پاڵی پێوە دەنا، تاکوو لە هێڵی ڕاستەڕێیەکە لا نەدات، هەموو ئەوانەی لەژێر دارگوێزە گەورەکە کۆ بووبوونەوە، دوای ئەوەی بە کەللەڕەقییەکەیان زانی، هاواریان بۆ کرد کە ئاگادار بێت:

- بگەڕێوە کاکە بگەڕێوە...! تەوژم و شەپۆلی ئاوەکە ماندووت دەکات، توانای بەرگەگرتنی ناوەڕاستی ڕووبارەکەت نییە.

گوێی بە قسەکانیان نەدا، بەڵکوو هەنگاوێکی دیکەیشی نا، شەکەتی و شپرزەیی لە هەنگاوەکانیڕا دیار بوون، لەو کاتەدا پەتەکە بەو گرانییەی خۆیەوە شل بووەوە و ئاوەکە هەتا شانی بەرز بووەوە.

- لاسار مەبە، بگەڕێوە تۆ چ پیاوێکی کەللەڕەقی، دەڵێی شێتی؟

دیسانەوە بانگیان کردەوە کە ئاگادار بێت، کەچی ئەو زیاتر سەرسەختیی نواند و سوور بوو لەسەر ئەو گرەوەی لەگەڵ خۆیدا کردبووی، ئەو متمانەی تەواوی بە توانای خۆی هەبوو کە باسکی ئەو شەپۆلانە دەشکێنێت و بەسەریاندا زاڵ دەبێت. هەنگاوەکانی دواتری هەڕەمەکی بوون، لەبەر ئەوەی مێشک و هزری بەرەو لای ئەوانە ڕۆیشت کە کۆ بووبوونەوە و لە هەموو لایەکەوە سەرنجی ئەویان دەدا، هەستی کرد وشەکانیان پڕن لە سووکایەتیپێکردن، بۆیە هەستی بە ڕیسوابوونی لووتبەرزییەکەی خۆی کرد.

بە دەنگێکی هەڕەشەئامێزانەوە هاواری کرد:

- بەسە... ئەو هاوارکردنەتان لە چی؟! مادام بڕیارم داوە، تازە ڕاناوەستم، هیچ کەسێك ڕامناگرێت، پێش ئەوەی کۆتایی بەوە بێنم کە دەستم پێ کردووە، یان کۆتایی بە خۆم دێنم. گوێتان لێ بوو؟! یان کۆتایی بە خۆم!

ئینجا هەنگاوێکی شێتانەی هاویشت و پێی لەسەر دڵی ڕووبارەکە نا. ئاوەکە چەپۆکێکی پێدا کێشا، شلەژا و کۆڵەپشتەکەی و چەکە هەڵواسراوەکەی ملی بەلادا هاتن.

دیسانەوە هاواریان بۆ کرد:

- چەك و کۆڵەپشتەکەت فڕێدە.

- خۆت دەربازکە، ئەو لاسارییە بەسە.

ئەم جارەیان وەڵامی کەسی نەدایەوە، کۆڵەپشت و چەکەکەیشی فڕێ نەدا.

وای چ چرکەساتێکی دژوار و ئەستەم بوو: "تۆ بڵێی بتوانێت تا کۆتایی بەرگە بگرێت؟". پرسیاریان لە خۆیان دەکرد و کەسیش بوێریی ئەوەی نەبوو سەرکێشییەکی وا بکات و خۆی بکوتێتە ناو شەڕێکی واوە، کە ئەنجامەکەی لەبەرچاوان ڕوون و ڕەوان بێت.

لەناو خۆیاندا کەوتنە ورتەورت:

- ئەو تاشەبەردە لووسانەی لەگەڵ شەپۆلەکاندا خلۆر دەبنەوە و بەریەکتری دەکەون، لاقەکانی دەشکێنن.

- توانای گەڕانەوەشی نییە. ناچارە بەرەو پێش بڕوات.

- بەو مەرجەی ئەو چەك و کەلوپەلانەی هەڵیگرتووە فڕێ بدات.

- وای کە لاسار و سەرشێتە.

- ئەوە چ دۆخێکە، تەماشای دەکەین و ناشتوانین لە پێناویدا شتێك بکەین. ئەها خەریکە هێزی نامێنێت.

دوای ئەوەی هەستیان کرد خەریکە ماندوێتی لە پەلوپۆی دەخات و لووتبەرزییەکەی تووشی دەکات، ئەو توانایەی لەناو ئاوەکەدا بەخشیویەتی، وای لێ کردووە سووربوون و شێلگیرییەکەی لە دەست بدات، کەچی کەسێکی کەللەڕەقە و بە قسەی کەسیان ناکات، ناچار دەستیان کردە هاندانی.

- دەی بەهێز بە، باش خۆت بگرە. ئەوە چ هێزێکە تۆ هەتە.

- کۆڵ مەدە، ئەوەندەت نەماوە، تەنها چەند هەنگاوێکە و لە شەپۆلە بەهێزەکە دوور دەکەویتەوە و دەربازت دەبێت.

- کۆڵ مەدە، کۆڵ مەدە، ئەوە چ خۆڕاگرییەکە؟!

عیسا هەنگاوێکی دیکەی بەرەو مەرگ هاویشت، زۆربەی گومانەکان بۆ ئەوە دەچوون، کە پێی هەڵخلیسکاوە و کەوتۆتە ناو چاڵێکی بچووکەوە، بۆیە نقوم بوو و شەپۆلی ئاوەکە لەگەڵ خۆیدا لوولی دا و کەوتە ڕاوەشاندنی دەستەکانی و هەوڵدان بۆ دەربازکردنی ڕۆحی خۆی، کەوتە شەپەشەپ و هەناسەدان و هەڵمژینی هەواکە، بەڵام لەو چرکەساتەدا هەواکە و ئاوەکەی پێکەوە قووت دا و چوونە سییەکانییەوە، کەوتە کۆخەکۆخ. زیاتر شڵەژا و هێزی خۆی لەدەست دا و خەریك بوو پەتەکەی لە دەست شل دەبووەوە، تاکوو دەستی بە تەواوی شل بوو، هێزی لەبەر نەما، بەڵام پەتەکەی هەر بەر نەدەدا، ڕێك وەکوو پارچە ئاڵایەك لە هەوادا بشەکێتەوە، بەو شێوەیە لەسەر ئاوەکە دەشەکایەوە.

ئیدی ژیانی کەوتە بەر هەڕەشەیەکی مسۆگەرەوە و دەربازبوونی مەحاڵە.

کێ ئەو پەتە ببڕێت ژیانی دەرباز دەکات و شەپۆلەکە بەرەو کەنارەکەی ئەمبەری دەهێنێتەوە. بەڵام کوا کێ ئەو عەقڵەی هەیە و لەو چرکەساتە سەخت و ترسناکەدا کێ زاخی ئەوە دەکات؟ ئەوا گریمان یەکێك بیریشی لەوە کردەوە، ئەی چۆن لەوە دڵنیابێت کە پەتەکەی لە دەست بەر نابێت؟ دەڵێن ئەوەی خەریك بێ بخنکێت دەست بە تەڵە پووشێکیشەوە دەگرێت، ئەی چی دەبێت ئەگەر کەسە خنکاوەکە دەست لەو تەڵە پووشە بەر بدات؟ ئەو کاتە هەمووان گلەیی دەکەن و دەڵێن: "فلانە کەس بە گەمژەیی خۆی کوشتی، خۆ ئەگەر پەتەکە نەپسابووایە ئێستا کابرا لە ناوماندا سپوساغ و زیندوو دەبوو".

عیسا بۆ ماوەیەکی کەم بەم جۆرە بەردەوام بوو، هەتا پەتەکە لە دەستی ترازا و شەپۆلە سەرشێتەکان قووتیان دا و بۆ هەتاهەتایە لێیانی ون کرد.

حەپەسان و سەرسوڕمان باڵی بە سەر ڕوخساری ئەو خەڵکەدا کێشا. باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەدەکرد. هەموو شتێك بە خێرایی ڕووی دا، هەستیان بە هیچ نەکرد، تەنها ئەوە نەبێت کە خۆیان دەبینی بە کەناری ڕووبارەکەدا بە نائومێدی بەرەو خوار ڕادەکەن و چاو دەگێڕن. دواتر زۆربەیان گەڕانەوە، تەنها چەند کەسێکیان نەبێت بەردەوام بوون و بە ئومێدی ئەوەی بەڵکوو تەرمەکەی لە نێوان تاشەبەردەکانی ئەو پێچاوپێچانەدا گیر ببێت، کە شەپۆلەکان لەوێدا کەمێك هێمن دەبنەوە.

بەرلەوەی بە تەواوی نائومێدی لە دۆزینەوەی تەرمەکەی عیسا چۆکیان پێ دابدات و بگەڕێنە دواوە، لە یەکێك لە بزنەڕێیەکانی قەدپاڵەکە، پیرە هێسترێکیان بینی پێویستیی بە یارمەتیدان بوو بۆ ڕۆیشتن. چونکە بە ئارەزووی خۆی ڕێی دەکرد و بەلادا دەهات، وەك ئەوەی خاوەنەکەی لەو ئەرکەی پێی سپاردبوو بەخشیبێتی و وازی لێی هێنابێت، ئاخر هەتا لە ڕوخساریشیدا ئەو ڕەزامەندی و ڕووخۆشییە دەبینرا. چەند چرکەساتێکی دواتر لە پشتییەوە مامۆستا عومەر و ئەوانەی دیکە دەرکەوتن کە بە زۆر هەنگاوەکانی خۆیان بەدوای خۆیاندا ڕادەکێشا و ماندوێتی لە پەلوپۆی خستبوون.

دوای ئەوەی عومەر لێیان نزیك کەوتەوە ڕاوەستا، سڵاوی لێ کردن و بە هەناسەبڕکێوە لێی پرسین:

- چەندی تر ماوە تا بگەینە بارەگای ناوزەنگ؟

دیمەنی ئەو پێشمەرگە زامدارانەی چاوێکیان بە کەتانی

سپی پێچرابوو سەرنجی ڕاکێشان و بە ئاگای هێنانەوە، ڕاستەوخۆ ناسیاننەوە، ئەو چالاکی و زامداربوونەیان لە گوند و شاخەکاندا بەناوبانگی کردبوون، دەنگدانەوەی چالاکییەکەیان، وەکوو ڕووناکی بە ئاسماندا تەشەنەی کردبوو و بڵاو بووبووەوە.

یەکێکیان بە دەنگی بەرز هاواری کرد، بێ ئەوەی پرسیاریان لێ بکات:

- وا بزانم ئێوە ئەوانەن بەشداریتان لە چالاکییەکەی مۆلگەی لوتکە بەرزەکەدا کرد. وایە؟

ئیبراهیم بزەیەکی کرد و وەڵامی دانەوە:

- ئێمە لە ڕۆستەوە هاتووین.

ئیدی بە گەرمی تەوقەیان لەگەڵ دەکردن و بە گیانێکی دۆستانەوە دەستیان لە شانیان دەدا:

- گوێمان لە چالاکییەکەتان بوو، ئافەرین... دەستتان خۆش بێت.

یەکێکی دیکەیان بە خێرایی ئەمەی بۆ زیاد کرد:

- هیوادارم زامەکەتان زۆر سەخت نەبێت.

یەکێکی دیکەیان:

- هیچ کەسێك نەما لە گوندەکان باسی ئێوەی نەکردبێت، تا وای لێ هاتووە گوندنشینەکان وەکوو نموونە باسی ئازاییەکەتان دەکەن، بۆیە زۆر پەرۆش بووین بۆ زانینی وردەکارییەکانی شەڕەکە و ئەوانەی بەشدارییان تێدا کردووە.

ڕەحمان لەژێر لێوەوە:

- لێمانگەڕێن با سەرەتا هەناسەیەك بدەین. جگە لەوەش

خۆ ئێوە وەڵامی پرسیارەکەتان نەدایەوە. چەندی ترمان ماوە بگەینە بارەگا؟ ئێمە سێ شەو و ڕۆژە بەڕێوەین.

- شتێکی ئەوتۆتان نەماوە.

- ئیبراهیم گوێت لێ بوو؟ ئەمە پێنجەم کەسە لە ماوەی دوو کاتژمێردا لە ڕێگە دەیانبینین و دەڵێن ئەوەندەی نەماوە بۆ بارەگا. ئەوە چییە دەڵێی خەڵکی توانای گوتنی ڕاستییان نەماوە. ئەرێ تۆ دڵنیای لە قسەکەت یان شۆخی دەکەیت؟ من دەترسم ئەمەش وەك هاویشتنی دارە عەرەبییەکە بێت.

عومەر گوتی:

- لێرەش وەکوو پێنج دەقەکەی کاکی کوردەیە.

ئیبراهیم گوتی:

- مەودا لێرە بە کات پێوانە دەکرێت، وەك ئەوەی لە ئاسمانی دەرەکی بین، خۆزگە مەزەندەی مەوداکانیشیان ڕاست بووایە.

پاشان ئەوەی بۆ زیاد کرد و دەستی بە ڕۆیشتن کردەوە:

- دەنگوباسی ئێوە چییە؟

ڕەحمان قسەکەی پێ بڕی و دایە بەر پرسیار و ئاخاوتن:

- تۆ حەقت چییە بە هەواڵی ئەمانەوە؟ با پرسیاری گرنگتریان لێ بکەین.

پاشان دەستی خوراند و گوتی:

- بازاڕەکەتان لە کوێیە؟ بیستوومانە لێرە بازاڕێکتان هەیە؟ نازانم چی پێ دەڵێن.

یەکێکیان گوتی:

- فرۆشگا؟

ڕەحمان جارێکی دیکە بە پەلە گوتی:

- بەڵێ، ڕێك فرۆشگای پێ دەڵێن، وەك پێیان گوتین. ئەرێ ڕاستە لەوێ کەباب هەیە؟ پێم بڵێن ئەوە کەبابی ڕاستەقینەیە؟ بە چەندی دەفرۆشن؟ من تەنها سێ دینارم هەیە، ئەو سێ دینارە بەش دەکات؟ ئەی بۆ بیبسیەکەی چی بکەم؟ بە شووشە دەیفرۆشن یان بە پاکەت؟ دەمەوێ هەندێك بۆ ڕۆست بنێرم. تۆ بڵێی کەسێك هەبێت لێرەوە بۆ ئەوێ بڕوات؟ ڕایانسپاردووم هەر کاتێك بیبسی بخۆمەوە یادیان بکەمەوە. ئاخ، ئەی مینۆ؟ ئەرێ تۆ دەزانیت مینۆ چییە؟ جۆرێکە لە نوقڵ بە کاکاو. نوقڵێکی زۆر خۆشەو لە هەمان کاتیشدا هەرزانە. شێوەیەکی سێگۆشەی بچووکی هەیە، بە تایبەتیش لە ئێران دروستی دەکەن. وا دیارە تۆ نازانی چییە. وەبیرتی دێنمەوە. تۆ قەت لە گەشتی قوتابخانە نەچوویت بۆ یەکێك لە شارەکانی نزیك سنووری ئێران؟ ئەگەر بە منداڵی چوویت بۆ ئەوێ، هەر دەبێ بێتەوە یادت. هەموو دوکانەکان پڕن لەو نوقڵە، ئەو کاتە بڕێکی زۆرمان دەکڕی و لە هەر شوێنێك بۆمان بڕەخسابووایە دەمانشاردەوە، چونکە پۆلیس لە خاڵەکانی پشکنین، کڕینی مینۆیان قەدەغە کردبوو، لەبەر ئەوەی پێم وایە بە کاڵای قاچاغیان دادەنا. هەتا دەگەیشتینە سەیتەرەکانی پشکنین هەموویمان دەخوارد. ئاخر جارێکیان پۆلیسێك زللەیەکی لە بناگوێی قوتابییەك دا تەنها لەبەر ئەوەی مینۆی لا دۆزیبووەوە، زرینگانەوەی دەنگی ئەو زللەیە بە درێژایی ژیانی لێی جیا نەدەبووەوە، چونکە دواتر هەموو جار دەیگوت: "لەو کاتەوەی ئەو پۆلیسە ئەو زللەیەی لێ داوم گوێم دەزرنگێتەوە". دەی واز

له مینۆکه بهێنه، وا دیاره کاتی خۆی له گەشتی قوتابخانەدا نەچوویت بۆ ئەو شارانە، ئەگەرنا بە دڵنیاییەوە دەهاتەوە یادت. ئیبراهیم بڕوانە خاوەنی ئەو کامێرایە، چۆن بنێشت دەجوێت! دەبێ لە کوێ هێنابێتی؟ هەڵبەتە لە فرۆشگاکە! وای چەند خۆشە. ڕووی کردە کابراو گوتی: ئەرێ دانەیەکم دەدەیتێ؟ تۆ کەسێکی باش دیاریت، دەی پیاوەتییەکەت تەواو بکە و بە کامێراکەت وێنەیەکیشم لەگەڵ بنێشتەکە بگرە، بەڵام وێنەیەکی وەستایانە بێت، واتە زیاتر بایەخ بە بنێشتەکە بدە وەك لە ڕوخساری من، ئاخر ڕوخساری من شایانی ئەوە نییە لە وێنەدا دەربکەوێت، بە تایبەتی لەگەڵ ئەم چاوەدا. ئەرێ ئێوە دەزانن؟ من دەزانم لەم چرکەساتەدا چی لە ناخی ئیبراهیمدا دەخولێتەوە، ئەو بیر لەوە دەکاتەوە تۆ بڵێی لە فرۆشگاکە پسکێت بە کرێم بفرۆشن. زیاتر لە ساڵ و نیوێکە خەونی پێوە دەبینێت، لەبەر ئەوەی بۆی سووتاوە، ڕاستە قەبەیی جەستەی لەگەڵ ئەوەی باسی دەکەم وێك نایەتەوە و ناگونجێت، بەڵکوو وا دەردەکەوێت کە تەنها بورغی و سەموونە دەخوات و هیچی تر، وەك ئەوەی ئاسنگەرەکان کاتێك باسی کەسێکی تەندروست و لەشساغ بکەن، بە شۆخیکردنەوە وا بە یەکتری دەڵێن، بەڵام ئەمەیان قسەی پووچ و فێلکردنە و هیچی تر.

ئینجا مشتێکی هێواشی دایە سەر شانی ئەوەی لە تەنیشتییەوە ڕاوەستابوو و گوتی:

- ئەی تۆ بۆچی وا بێدەنگیت؟ دەی وەڵام بدەرەوە.

پیاوەکە زەردەخەنەیەکی جوانی بۆ کرد و گوتی:

- دەرفەتێکم پێ ببەخشە تاکوو وەڵامت بدەمەوە؟ لەسەر خۆت یەك یەك.

ئیبراهیم دایە قاقای پێکەنین و تەنها بەوەندەی بیری لە خواردنەکانی ناو فرۆشگاکە کردبووەوە لیك بە لا لغاوەیدا دەهاتە خوارێ و گوتی:

- وا پێ دەچێت کاکەشین تووشی پەتای پرسیارکردنی کردبێت. بە خۆشی ئەو بخۆرەوە و هیوای ئارامگرتنیش بۆ خۆی و ئەوانە بخوازە کە لەگەڵیدان.

خاوەنی کامێراکە بە ڕەحمانی گوت:

- کەباب دەخۆیت و بیبسیش دەخۆیتەوە و لە هەردووکیشیان بێزار دەبیت. فرۆشگا هەموو شتێکی لێیە، بە ئارەزووی خۆت حەز لە چی دەکەیت هەیە.

ڕەحمان بە دڵخۆشییەوە گوتی:

- وای چ نیعمەتێکە. کورە ئێوە لە بەهەشتدا دەژین بەهەشت، دوو ساڵە ئێمە جگە لەو ژاژییە قوزەلقورتە هیچی ترمان نەخواردووە. خۆ ئەگەر ورگمان هەڵبدڕن جگە لە بۆنی گەنیوی ژاژیی نەفرەتی و قێزهێنەرەوە هیچی تری تێدا نادۆزنەوە.

پاشان ڕووی بە لای ئیبراهیمدا وەرگێڕا و گوتی:

- بارەگا یان دەبێ وابێت، یان نەبێ باشترە، دەی، با پەلە بکەین، خۆ ئەگەر فڕۆکەکان فرۆشگاکە بۆردومان بکەن، ئەوا دەرفەتێکی دیکەی وەکوو ئەمەمان بۆ نارەخسێتەوە و تامی کەبابیش ناکەین.

- لە هیچ مەترسێ. ئێمە لە ناوچەی ڕۆست نین. فڕۆکەکان بۆ ئێرە نایەن.

هەنگاوەکانیان لەسەرخۆ دەهاویشت و باسی هەموو شتێکیان

دەکرد. پاشان عیسایان وەبیرهاتەوە کە پێش کەمێك خنکا، ئیدی تەواوی چیرۆکەکەیان لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕانەوە.

ئیبراهیم دەستەکانی بەناو یەکتریدا کێشا و بە داخەوە گوتی:

- هەر بەم ئاسانییە لە دەستتان دا؟ بە ڕاستی زیانێکی گەورە و کارەساتێکی گورچکبڕە، گیانی مرۆڤێك وا بە ئاسانی و بەبەرچاوتانەوە لە دەست بچێت!

مامۆستا عومەر ئەمەی بۆ زیاد کرد:

- کەواتە نابێ بۆ مەرگی ئادەم ئەوەندە خەمبار بین.

خاوەنی کامێراکە پرسی:

- ئادەم کێیە؟

مامۆستا عومەر سەرلەنوێ هەڵی دایە و گوتی:

- ئەو کاتەی پەلاماری مۆڵگەی دوژمنمان دا لەدەستمان دا و شەهید بوو.

- ئا... گوێمان لە هەواڵەکەی بوو. کەواتە ناوی ئادەم بوو.

یەکێکی دیکەیان پرسی:

- شەهیدبوونەکەی چۆن بوو؟

ئیبراهیم دەستی پێ کردەوە و گوتی:

- یەکێکیان لە نزیکەوە ئاگای لە شەهیدبوونەکەی هەبوو، ئەو گێڕایەوە کە لە کاتی پەلاماردانەکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە لە بازبازێندا بووە و ئۆقرەی نەبووە، تەنها بۆ ئەوەی ئامانجەکەی بپێکێت، ئەوەش بە سوودوەگرتن لەو

دەستڕێژە چڕەی کە ئێمە لە سەربازەکانمان دەکرد. وەك دەزانن کاتێـــك دەســـتڕێژ لە ژوورێـــك دەکرێـــت، ئەوانەی لەنـــاو ژوورەکەدان نەك نـاتوانن سـەریان بەرز بـکەنەوە، بەڵکـوو هەتـا ناتوانن نارنجۆکەکانیشیان بە جوانی بهاوێژن، هەر بۆیە ئەوانـیش بە شێوەیەکی هەڕەمەکی نارنجۆکەکانیان ئاڕاستە دەکردین. پێم وایە ئادەم ویسـتبووی هێرشـیان بکـاتە سـەر، یـان نـارنجۆکێکی دەستییان لە پەنجەرەکەوە بۆ بهاوێژێت، لەوانەیە ئەمەیان تەواوتر بێت، لەبەر ئەوەی نەیتوانیبوو پەلاماری ناو ژوورەکە بدات، یـان هەتـا بگـاتە نزیکـی دەرگـاکەش، لەبەر ئەوەی گوللەکانمـان لە هەموو لایەکەوە دەیپێکان، بەڵام بە داخەوە بەخت یاوەری نەبوو لە جێبەجێکردنی پلانەکەی. پـارچەی یەکێـك لەو نارنجۆکـانەی بەر پەرژینی مۆڵگەکە کەوتبوون، زامداری کرد و بە ناچاری بە لارەلارە خۆی بەسەر لوولەی چەکەکەیدا دا، ئیدی بەو جۆرە.

ئیبـــراهیم ئەم دیـــمەنەی بە نوانـــدن دەگێـــڕایەوە، لـــوولەی چەکەکەی بەدەستەوە گرتبوو، ئەمەیشی بۆ زیاد کرد:

- ئەوانەی بینیبوویـان بەم جـۆرە بـۆ ئێمەیـان گێـڕایەوە، هەڵبەتە دکتۆرەکە هاوکاریی کردبوو، بەڵام دکتۆرەکە چـی لەو برینانەی بکات و چۆنیان چارەسەر بکات؟! ئاخر جەستەی ڕێك وەکـوو بێژینگـی لـێ هـاتبوو، وەك ئەوەی دکتـۆرەکە گـوتی، سەرەتا چاوەکـانی کردبـووەوە و پاشـان بە پەرۆشـییەوە سـەیری ئاسمانی کردبوو، وەك ئەوەی بـۆ دواجـار چێـژ لە جـوانییەکەی وەربگرێت، هەوڵی ئەوەی دابوو شتێك بڵێت، هەندێك قسەی بە تێکەڵ و پێکەڵی کردبوو، کەس لێی تێنەگەیشـتبوو، دکتـۆرەکە

هەنـدێکی لـێ چنیبـووەوە: "دەمـرم، کـاتێکی خـۆش بـۆ ئێـوە". هەستی بەوە کردبوو کە دوا ساتەکانی ژیانی نزیکە. دوای چەند سـاتێکی کەم لەو کارەسـاتەی تووشـی بووبـوو، بە دەنگێکـی خنکاوەوە گوتبووی: "لە هەڵەکانم ببورن!" خەندەیەکی جـوان و کـــراوە ڕوخســـاری داپۆشـــی بـــوو... وای چ مەزنـــی و شـــکۆمەندییەکە. ئەو دەیزانـــی دوای چەنـــد خولەکێـــك یـــان چـــرکەیەك مەرگ پەلـــی دەگرێـــت و دەیبـــات، بـــۆیە داوای لێبوردنی هەڵەکانی لە هاوڕێکانی کردبـوو، کە لەوانەیە ڕۆژێـك لە ڕۆژان بەرانبەر کەسانی تر ئەنجامی دابێت و دڵی ڕەنجانـدبن. خۆ هەر دەبێت لە ژیانیـدا هەنـدێك هەڵەی هەر ئەنجام دابێـت، ئەمە بەرئەنجامگیرییەکی بلیمەتانە نیـیە، بەڵکـوو هەمووـمان هەڵە دەکەین، هەتا لەگەڵ خۆشەویسترین کەسی ناو دڵیشـمان، بەڵام سەیرم بە کەسێك دێت کە باوەڕی بە دووبارە زیندووبوونەوەش نییە لە دونیـاکەی دیـکە، کەچـی بـاوەڕی وایە جـارێکی تـر بە دیداری ئەوانەی هەڵە و تاوانی بەرانبەر کردوون شاد دەبێتەوە و لەسـەر هەر هەڵەیەك ئەگەر سـووکە گـاڵتەیەکیش بووبێـت و لە ئەنجـامی دا هەسـتی کەسـێکی تیـا ڕەنجـا بێـت، سـزای خـۆی وەردەگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا بیر لەوە دەکاتەوە کە هەر کاتێك یادیان کردەوە، بیبورن و بە دڵێکی سپییەوە باسی بکەن.

ئیبـراهیم بـۆ چرکەسـاتێك بێـدەنگ بـوو، بیـری لە شـتێك دەکردەوە و ڕوخساریشی سەرسامییەکی پێوە دیـار بـوو. پاشـان گوتی:

- گوێم بۆ بگرن، دوای چەند چـرکەیەك دەمرێـت و بـۆ

هەتاهەتایەش دەمرێت، جەستە و هەست و نەستی بە یەکجاری دەمرن، دەبێ جیهانمان و بیرکردنەوەو هەستەکانمان چ بایەخێکیان هەبێت؟ بە لای ئەویشەوە چ بایەخێکی هەیە ئەگەر یەکێك لە هەڵەکانی ببورێت یان نەبورێت؟ من ناتوانم وێنای ئەوە بکەم کە لەو چرکەساتە یەکلاییکەرەوەیەدا چ شتێك دەروونی مرۆڤ شپرزە دەکات لە ژیانی. لەو چرکەساتە یەکلاییکەرەوەیەی دەکەوێتە نێوان تاڵە لەرزۆکێکی زۆر شلەژاو و شەپرێو. لەو چرکەساتەی نهێنیی بوون دەدۆزێتەوە و ئاشکرای دەکات، "نهێنیی ئەو بوونەی کە بۆ هیچ کەسێك خۆی ئاشکرا ناکات، تەنها بۆ ئەوانە نەبێت کە ژیانیان وەکوو نرخێك دەبەخشن" نازانم کێ ئەم دەستەواژەیەی گوتووە.

مامۆستا عومەر گوتی:

- ئەگەر گومانم درۆم لەگەڵ نەکات، "گۆتە"ی فەیلەسووفە کە دەڵێت: "پێویستە خۆمان لە ژیان دابڕین بۆ ئەوەی بگەینە نهێنیی بوون".

ئیبراهیم بیرۆکەکەی بۆ تەواوکرد و گوتی:

- پێ دەچێ وا بێت، دەستەواژەکە زۆر ئاشکرایە، من ناتوانم وێنای ئەو چرکەساتە شڵۆقەی تەمەنی مرۆڤ بکەم کە دەمێنێتەوە. لەبەر ئەوەی زۆر بە سادەیی دەیڵێم بە دۆخی وادا تێنەپەڕیوم، هیچ یەکێك لە ئێوەش بەو چرکەساتەدا تێنەپەڕیوە. وا هەست دەکەم دەستی بە گێڕانەوەی مەتەڵەکان کردووە، لەوانەیە بە وڕێنەی دابنێن... لە ڕاستیدا بیرۆکەکان لەو ڕۆژەوە لە مێشکمدا بەریەك دەکەون، چەندین شەوم بە ڕێ کرد و هەر

بیـرم لەوە دەکـردەوە، کە پێشـتر بە هەنـدم وەرنەگرتبـوو، دان بەوەدا دەنـێم کە تـا ئێسـتاش بیـری لـێ دەکەمەوەو نـاگەمە ئەنجـامێکی قـایلکەر. ئێـوە بڵـێن: ئەو جەسـتە نغـرۆ بـووە چ بایەخێکی هەیە کە بە هیچ شـێوەیەك لە شـێوەکان بـاوەڕی بەوە نییە جارێکی دیکە زیندوو ببێتەوە. چ گرنگییەکـی هەیە ئەگەر خەڵکی بە خێر یان بە شەڕ باسی بکەن؟ ئایا ئەو داوای لێبوردن دەکـات لەو کـاتەی بە گـوێپێنەدانەوە دەمرێـت، یـان لە نـاخی خۆیـدا بـاوەڕی بە خـودا هێنـاوە؟ لەو کـاتەدا هـیچ مەتەڵێکـی سەرسوڕهێنەر نامێنێتەوە، ئەو کاتە کارەکە وەکـوو هەر مرۆڤێـك دەبێـــت کە دەیەوێ گەشـــت بکـــات و داوای لێبـــوردن لە هاوڕێکانی دەکات لە هەر هەڵەیەك بەرانبەریان ئەنجامی دابێت.

ڕەحمان گوتی:

- تـۆ بەو شیکارییەت ڕێـگەت بە هەمـوو ئەوانە داوە کە باوەڕیان بە نەمری نییە، قێزەونترین هەڵە ئەنجام بدەن، کە بگـاتە لوتکەی تاوانکـاری، بەرانـبەر ئەوانـی تـر، یـان بەرانـبەر هەمـوو کـۆمەڵگە، پاشـان لە بەرچـاوان ون دەبێـت و جـارێکی دیـکە دەرنـاکەوێتەوە. ئەم جـۆرە لەگەڵ ئەوەدا جیـاوازی نیـیە کە دەمرێت و جارێکی دیـکە چاوی بەوانە نـاکەوێتەوە کە هەڵەی بەرانـبەر کـردوون. کەواتە ئەم جـۆرەی دیکەیـان ئەم جیهـانەی ئێمە و بیرکـردنەوەو هەسـتەکانمان چ گرنگییەکـی بە لایـانەوە هەیە، کە ئیدی ئەو بۆ هەتاهەتایە دەڕوات و لێمان ون دەبێـت؟ بە لای ئەوەوە چ گرنگـی و بـایەخێکی هەیە ئەگەر یەکێـك لە تاوانەکـانی ببوورێـت، یـان نەبورێـت؟ وەك ئەوەی یەکێـك بە

تەواوی دەمرێت. لەوەش زیاتر، خۆ ئەو باوەڕی بە ژیانەوەی ئەو دونیا نییە، هەتا پەیوەستیش نیيە بەوەی کۆمەڵگە قسەی ڕەق و ناخۆشی پێ دەڵێن یان نا، بەڵکوو ئەوە پەیوەستە بە ناخی خودی خۆیەوە، بەوەی مرۆڤ لە ناخی خۆیدا دەیڵێت.

ئیبراهیم هەردوو دەستی ڕاوەشاند و گوتی:

- بەڵام ئەو مرۆڤەی دەربارەی دەدوێیت و لە ناخیدا دەژیت، خۆ ئەویش بە مردنی ئەو دەمرێت، ئەویش هەر باوەڕی بە زیندووبوونەوەیەکی دیکە نییە، کەواتە پرسیارەکە بە بەردەوامی دەمێنێتەوە. ئەوەش ئەوەیە بە لای ئەو جەستەیەی دەڕوات چ بایەخ و گرنگییەکی هەیە، ئەو مرۆڤەی لە جەستەیەکی نغرۆش دەژی، یان ڕاستتر ئەو جەستەیەی دەخرێتە ژێر خاکەوەو دادەپۆشرێت و کۆتایی پێ دێت، چ بایەخێکی هەیە کە چی پێ دەگوترێت و پێناگوترێت لەو دەنگەدەنگ و هەرایەی هەیە؟

ڕەحمان گوتی:

- ئەو مرۆڤەی لە ناخماندایە ئەوە ویژدانە، ئەوەش ڕەنگدانەوەیەکی پیرۆزی هەستە پاك و بێگەردەکانی دەروونی مرۆڤە، هەڵبەتە ئەم هەستانەش بە نەمانی جەستەی مرۆڤ نامێنن و لەناو دەچن، وەلێ هەتا دوا چرکەساتەکانی مردنی جەستە، ویژدان هەر خاوەنداریتی دەکات و دەمێنێتەوە. چونکە لەو کاتەدا عەقڵ ڕەنگدانەوەی ئەو شتانە دەبێت کە ویژدان دەیخاتە ئەستۆی، تەنها مەگەر کەسەکە ویژدانی نەبێت، ئەو کاتە ئەم جیهانەی ئێمەو بیروبۆچوون و هەستەکانمانیشی بەلاوە گرنگ

نابێت، نە لەو ساتەوەختەی دەمرێت و نە دواتریش. لە ناکاو بیرۆکەیەك لە مێشکمدا چەخماخەی دا، دەتوانم پشتگیری بۆچوونەکەمی پێ بکەم: تۆ لە شوێنێکی دیاریکراو دادەنێم و چەند پرسیارێکت لێ دەکەم، بەڵام ڕاشکاوانە وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە... گریمان تۆ لە یەکێك لە بەندیخانەکانی فاشیزم زیندانیت و چاوەڕوانی جێبەجێکردنی بڕیاری لە سێدارەدان دەکەیت، هەڵبەتە ئەو فەرمانەش تەنها بە هۆی مرۆڤایەتییەوەیە و هیچی تر، واتە هیچ تاوانێکت ئەنجام نەداوە. تۆ ئەو کاتەش وەکوو ئێستا باوەڕت پتەو و چەسپاو بوو بەوەی هەرگیز جارێکی دیکە زیندوو نابیتەوە، واتە دڵت هیچ ترسێکی تێدا نییە لە سزای ئەو دونیا، چونکە خوایەك نییە کە دوای مردن لەسەر هەر تاوانێك لە ژیانتدا ئەنجامت داوە سزات بدات، یان هەر تاوانێك ئێستا ئەنجامی بدەیت. شتێکی ئاساییە ئەو کاتە چاوەڕوانی هیچ شتێك ناکەیت کە کۆمەڵگە بەو هەراوزەنا و قسە و قسەڵۆکەی هەیانە بتوروووژێنن و ئازارت بدەن، لەبەر ئەوەی گوتت: جەستەی مردوو چ باکی بەوەیە خەڵکی بە خێر باسی دەکەن، یان بە شەڕ؟ بەهەرحاڵ... ئەوە جەللادەکانن وا دێن و پێت ڕادەگەیەنن کە دوای نیو کاتژمێریتر لەگەڵ کچە منداڵێکی دە ساڵان لە سێدارەتان دەدەن، من بە ئەنقەست ئەو تەمەنەم بۆ منداڵەکە داناوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر بڵێم بیست ساڵان، لەوانەیە ئەو شوێنەی تۆی لێ دادەنێم کەمێك پەسەند بێت، بەهەرحاڵ فاشیزم گوێ بە تەمەن و مێژوو و ڕووداوەکانی ئێستا نادات و گەواهی ئەوە دەدەم کە بۆ ساتێکیش لە کوشتنی هەتا منداڵانی ناو بێشکەش سڵ ناکەنەوە. ئێستا جەللادەکان لە

ژوورێکـــدا لەگەڵ منـــداڵە بچـــووکەکە جێیانهێشـــتوویت و دەرگاکەیان لەسەر داخستوون و خۆیانیش لێیانداو ڕۆیشتوون و بەبێ هیچ بێزاری و تووڕەیەکیش پێیان گوتی: "ئەو کچە بۆ تۆ، هەرچۆنێکـت دەوێـت بـۆ خـۆت لەگەڵـی ڕابـوێرە، دوای نیـو کـاتژمێریتر پـێکەوە دەمـرن". بـا گریمـانەی ئەوە بکەیـن کە تـۆ دوای ڕاگەیاندنی بڕیارەکەش لە بارێکی سرووشـتیدا بوویـت و هەتا دڵخۆشیش دیار بوویـت، مەبەسـتم ئەوەیە کە تـۆ لە ڕووی دەروونیـــیەوە ئامـــادەی بـــۆ ئەنجامـــدانی جووتبـــوون... ئێســـتا پرسیارێکت لێ دەکەم، بەڵام ڕاستگۆیانە وەڵامـم بـدەرەوە: ئایـا دەستدرێژی دەکەیتە سەری یـان نـا؟ لەگەڵ ئەوەی ئەو منـداڵەو کچێکی زۆر جوانیشە، هەرچەندە هەندێك کەس ئەو تاوانە بەبێ بوونی دۆخێکی واش کە تۆی تێدایت ئەنجام دەدەن.

ئیبراهیم بەبێ دوودڵی گوتی:

- هەڵبەتە نەخێر.

ڕەحمان بە خێرایی گوتی:

- بۆچی؟ ئاخر ئێـوە دوای نیـو کـاتژمێر پـێکەوە دەمـرن، دوای مـردنیش کەس لەسـەر ئەوە لێپێچـینەوەت لەگەڵ ناکـات، لەبەر ئەوەی دەبنەوە هیچ، تۆش باوەڕێکی پتەوت بەوە هەیە.

ئیبـــراهیم هەڵـــی دایە، وەك ئەوەی وەڵامـــی مەتەڵەکەی دۆزیبێـتەوە کە وای لە ئـادەم کـرد داوای لێبـوزدن بکـات، لە کاتێکدا باوەڕی بە زیندووبوونەوەیەکی تر نەبوو:

- هەڵبەتە ئەوە ویژدان بووە ویژدان.

ڕەحمانیش هەڵی دایە:

- بەڵێ، بەڵێ ویژدان، چونکە هەتا دوا ساتەکانی ژیانیش بە مولکی خۆی دادەنێت. هەندێك هەن دەڵێن: ئەگەر ترسی ئەو دونیا و ئاگری دۆزەخ نەبێت، ئەوا خەراپەکاری و گەندەڵی سەرانسەری گۆی زەوی دادەگرن و خەڵکیش یەکتر دەکوژن، یان لە ڕاستیدا من ئەم دەستەواژەیەم لە ڕۆمانێکدا خوێندۆتەوە.

ڕەحمان بە پێکەنینەوە ئەمەی بۆ زیاد کرد:

- ئەمڕۆ قسەکانمان پڕ بوون لە فەلسەفە، هاوکاریم بکە بەوەی کێ ئەم قسەیەی کردووە، وای دابنێ دۆستۆیڤسکی بوو، ئەرێ وا نییە؟ ئەمەش لەسەر زمانی ئیڤان کرمازۆف گوتی. وەبیرم هاتەوە، ڕێك وای گوت: "هیچ چاکییەك لە ئارادا نییە مادام نەمری بوونی نییە"... لێی گەڕێ، دەربڕینەکەم بەڵگەیەکی ناتەواو بوو، بەڵام بۆ هەمان دەرئەنجاممان دەبەن. بەهەرحاڵ من پێم وایە ئەم قسانە ڕاست نین، لەبەر ئەوەی ئاگری دۆزەخ و لەگەڵیشیدا ئاگری زەویش هەموویان ناتوانن یەك کەس لە ئەنجامدانی خەراپەکاری بگەڕێننەوە، ئەگەر ویژدانێکی زیندووی نەبێت، باشترین و گەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەمە، بیرۆکەی دۆزەخ تا ئێستاش هەیە و لە ناخ و مێشکی زۆربەی هەرە زۆری خەڵکیش چەسپیوە، بەڵام تۆ تەماشاکە ژیانیان چۆن بەڕێوە دەچێت، خۆت بڕیار لەسەر ئەوە بدە، لەگەڵ ئەوەی باوەڕیان بە سزای دوای مردنیشیان هەیە، وەلێ ببینە چۆن پەلاماری تەڕ و وشك دەدەن و دەست لە هیچ ناپارێزن!

ڕەحمان قسەکەی پێ بڕی و لە ناکاو هاواری کرد:

- دەی پێم ناڵێیت کەی دەگەینە ئەو بارەگا شوومە؟

خاوەن کامێراکە پێکەنی و گوتی:

- هاویشتنی دارێك و هیچی تر.

ئیبراهیم بزەیەکی کرد و وەڵامی دایەوە:

- هەڵبەتە ئەو دارە بە تۆپی هاوەن هاوێژرا بێت... ها!

یەکێکی دیکەیانیش بە پەنجەی دۆشاومژەی ئاماژەی بۆ پێشەوە کرد و گوتی:

- دوای ئەو پێچەیە بارەگای پەلی مێوانەکان دەبینی، بەڵام هەتا دەگەینە ئەوێ دەمەوێ لێت بپرسم: پێم بڵێ دوژمن تەرمەکەی ئادەمیان شێواندبوو یان نا. چونکە گوێمان لە گوندنشینەکان بوو وایان دەگوت.

ئیبراهیم بە هەناسەیەکی قووڵەوە گوتی:

- دواتر وردەکاری تەواوی ئەمەمان پێگەیشت. کە لە بەرەبەیانیی ڕۆژی دووەمدا، کاتێك سوپا و جاش بە ژمارەیەکی بێئەندازە و زۆر کە لە ژماردن نەیەن لە هەموو لایەکەوە هێرش دێنن. هەواڵگری سەربازیش چەند ئەفسەرێکی مۆڵگەکانی دەوروبەری ئەو مۆڵگە سەربازییەی دەستی بەسەرداگیرا بە تۆمەتی نەرمی نواندن و دەست تێکەڵکردن لەگەڵمان دەستگیر دەکەن، لە سۆنگەی ئەوەی ئەو مۆڵگەیەیان بۆردومان نەکردبوو کە ئێمە دەستمان بەسەریداگرتبوو، هەروەها بە هۆی ئەوەی گوایە هێڵی پاشەکشێمانیشیان وەکوو پێویست بۆردومان

نەکــردووە و لەوەدا کەمتەرخەمییــان نوانــدووە، هەتــا دوای دەستگیرکردنی ئەو ئەفسەرانەش لەگەڵ خۆمدا دەربارەی ئاماژە سەوزەکان پرسیم کە لە یەکێك لە مۆڵگەکانەوە دەردەچوو - ڕەحمان دێتەوە یادت؟- گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە ئەو ئاماژانە جــگە لەوەی پێمانیــان دەگــوت: "بە ســەلامەتی تێبــپەڕن و لێمانگەڕێن بنووین"، شتێکی تر نەبوون.

پاشان سووکەبزەیەکی کرد و دیسانەوە گوتی:

- زۆربەی ئەفسەری مۆڵگە سەربازییەکان بوێری ئەوەیان تێــدا نەبــوو گێچەڵمــان پــێ بــکەن، نــاوە نــاوەش لە ڕێــگەی شوانەکانەوە نامەی زارەکیمان پێ دەگەیشت و پێیان دەگــوتین: "ئێمە ڕێگەتان لێ ناگرین و پەیوەندیمان پێتانەوە نابێت، ئەگەر ئێــوە هێرشــی لە ناکاومــان نەکەنە ســەر". بــۆ نیازپــاکی خۆیــان ئەوەشیان بۆ زیاد دەکــرد: کە لە ڕۆژی ئەوەنــدەو لە کــاتژمێری ئەوەنــدە بە ڕۆژی ڕوونــاك ئێوەمــان بینــی و لەژێــر لــوولەی تۆپەکانماندا بوون، بەڵام ڕێگەمان لێ نەگرتن و هەتــا ســەرووی خۆشــمان ئاگــادار نەکــردەوە کە کــۆپتەر بنێــرێتە ســەرتان. خــۆ ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژانیش مۆڵگەیەك ڕێــگەی پــێ گــرتن، ئەوا ئێمە بەرپرسیار نین، چونکە ئێمە تەنها باســی خۆمــان دەکەیــن و دەسەڵاتمان بەسەر ئەوانەی دیکەدا ناشکێت.

- ئایا بە تەواوی لە قسەکانیان ڕاستگۆ بوون؟

ئیبراهیم بە متمانەوە وەڵامی دایەوە و بەملا و بەولادا ئاوڕی دەدایەوە وەك ئەوەی بە دوای شتێکدا بگەڕێت، ڕاستتر بە دوای ئەو هێسترەدا چاوی دەگێڕا کە وازیان لێی هێنابوو بە ئارەزووی

خۆی ڕێ بکات. لەو کاتەی هێشتا چاوی بەملا و بەولادا دەگێڕا گوتی:

- بێگومان، ئەو قسەیە ڕاست بوو. چونکە زۆربەی ئەو بەستەزمانانە هیچ شتێکیان لەم ململانێیەدا دەست نەدەکەوت، بەدبەختی فڕێی دابوونە نێوان دوو ئاگرەوە، ئەگەر ڕێگری لە ئێمە بکەن، حاڵیان وەکوو حاڵی ئەو مۆڵگەیەی لێ دێت کە دەستمان بەسەرداگرت، ئەگەر ڕێگریشمان لێ نەکەن دەکەونە بەر ئاگری ڕژێمێکی دڕندە و هاروهاج. هەڵبەتە ئەم جۆرە شتانە بە شاراوەیی نامێننەوە، بە عەقڵی کێدا دەچێت شوانێك یان جووتیارێك قسەیەك بگوازێتەوە و بە نهێنی بمێنێتەوە؟ ئەمە لە مەحاڵیش مەحاڵترە... چەند خەمبار بووم بەوەی بەسەر ئەو بەستەزمانانەدا هات، بە تایبەتی ئەو سەربازە هەژارانە.

ڕەحمان بێ ئەوەی قسەی ئیبراهیم ببڕێت، لەبەرخۆیەوە دەیگوت:

- بە دۆزەخ! هەموویان زۆڵ و حەرامزادەن!

بەڵام ئیبراهیم لەسەر قسەکانی خۆی بەردەوام بوو، وەك ئەوەی پشتگیری قسەکانی ڕەحمان بکات، بۆیە گوتی:

- من دان بەوەدا دەنێم کە لەناو ئەو ئەفسەرانە، کەسانی جەللاد و دڕندەشیان تێدابوو، کە شایانی مردن بوون بێ ئەوەی دڵت پێیان بسووتێ.

خاوەنی کامێراکە گوتی:

- ئەی دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

ئیبراهیم بە هەناسەبڕکێ و بە پچڕپچڕی گوتی:

- بۆیان گێڕاینەوە کە یەکێك لەو جەللادانە عەقڵی خۆی لە دەست داوە و بە پێلەقە بەر بووبووە وێزەی تەرمەکەی ئادەم و هەوڵی پلیشاندنەوەی دابوو، پاشان بە نێزەکەی جەستەی کونکون کردبوو و بە دەنگێکی سەرشێتانەوە هاواری کردبوو: نابێ ئەم زۆڵە بنێژرێت و بخرێتە ژێر خۆڵەوە، هەتا بە ئاگای نەهێنمەوە و سەرلەنوێ نەیکوژمەوە.

ڕەحمان بە نیگەرانی و دڵتەنگییەوە گوێی گرتبوو، ڕوخساری پەشۆکابوو، وەك ئەوەی لە ڕێگەی خەیاڵییەوە وێنای ئەو ڕۆژە بکاتەوە کە شەکەتی کردبوو و خەوی لێ زڕاندبوو.

بەرلەوەی ئیبراهیم گێڕانەوەکەی تەواو بکات، هەر هەموویان گەیشتنە پەلی مێوانداری.

## بەشی دوازدەیەم

لە پشت پەلی مێوانداریبەوە دۆڵێکی تەنگەبەر و دووردرێژ هەبوو، لە نێوان دوو چیای بەرزدا گیری خواردبوو. دۆڵەکە کەمێك بەرز دەبێتەوە ئەگەر مرۆڤ زیاتر بە قووڵاییدا ڕۆ بچێتە خوارەوە، تەنگەبەرێکی وا پڕ لە درەخت و تاشەبەردی گەورە گەورە، خەمۆکی و نیگەرانی دەپەستنە دەروونی مرۆڤەوە، بە تایبەتی کاتێك خۆر ماڵئاوایی لەم دیوی زەوی دەکات و باروبنەی خۆی دەپێچێتەوە و تاریکایی ڕاوی ڕووناکی دەکات، لەو دۆڵە تەنگەبەرە پڕ لە هەڵبەز و دابەزەدا، لە ڕووبەرێکی بچووك چەند ژوورێکی هاکەزایی سەریان پێکەوەناوە و کۆمەڵە بەرهەڵستکارێکی ڕژێم خۆیان تێیاندا پەنا داوە. ئەو بۆ ئەوەی خوێن بە شادەمارەکانی جەستەیدا بێت و بچێت و لە جووڵە نەکەوێت، لە پیاسەکردن لە سەربانی ژوورەکان ڕاهاتبوو و خووی پێوە گرتبوو. جگە لەو سەربانە تەختە، تەنانەت چەند مەترە زەوییەکی تەخت و ڕێك نەدەدۆزرایەوە مرۆڤ پیاسەیەکی تێدا بکات، لە هەموو لایەکیشەوە کانیاوی بچووك بچووك تەقیبوونەوە و لە دۆڵە تەنگەبەرەکەدا ڕووبارێکی بچووکی پڕ لە قوڕاویان دروست کردبوو.

دروستکردنی ژوورەکانی ئێرەش لە ڕووی بونیادنان و تەلارسازییەوە، لەو ژوورانە باشتر نەبوون کە دەستەکەی ڕۆست

تێـدا دەحەوانەوە، تەنهـا ڕووی ناوەوەیـان نەبێـت، جیاوازییـان هەبوو. چونکە ئەوانەی ئێـرە دیـوار و بنمیچەکانیـان بە نـایلۆن و زەویـیەکەی بە پەتـوو و دۆشـەکی ئیسـفەنجی ئەسـتوورو نەرم لەسـەر چیـنە نایلۆنێـک کە لە زەویـیە شـێدارەکەی جـوودا دەکـردنەوە داپۆشـرابوون، بەمەش لەو شـێی تەڕی و سـەرما کوشندەیەی دەپاراستن، کە ماسولکە گرژ دەکاتەوە، ئەو شێ و سەرمایەی بە قووڵایی ئێسکدا ڕۆ دەچێتە خوارەوە و تووشـی هەزار و یەك نەخۆشـیت دەکـات. شـەوانیش کـاتێکی تەرخانکراویان بۆ گڵـۆپی کارەبـایی دانـابوو کە تەزووەکەی لە موەلیدەیەکی بچووکەوە وەردەگرت، ئەویش بە بەنـزین کـاری دەکرد.

لێرە ژیان ساردوسڕ بوو، تفەنگەکان بە بنمیچی ژوورەکـانی نووسـتنەوە هەڵواسـرابوون، یـان لەژێـر درەختەکـان بەوپەڕی پشـتگوێخراوییەوە فـڕێ درابـوون، وەك هەر کـاڵایەکی پشتگوێخراوی تر، جەنگاوەران زیاتر لە گەشتیار دەچوون، وەك لەوەی پێشمەرگە بن، بەبێ چەك دەهـاتن و دەچوون، ماوەی دووروودرێژیان دەبڕی و تەنها داردەستێکیان بە دەستەوە بوو وەك ئەوەی شوان بن. زۆریش قسەیان دەکرد، ژیانیان تەنها بوو بووە ئاخاوتن و مشتومڕ و گفتوگۆ. هەستیان بە برسـێتی و تێنـوێتی نەدەکـرد و هیـوای نووسـتنیان نەدەخواسـت، چـونکە هەمـوو ڕۆژێکیان هەر نووستن و پشوو بوو، بەڵکوو هەتا لە نووسـتوون و دانیشـتنیش بێـزار بووبـوون، تـا وایـان لـێ هـاتبوو دەنگـی پرخەپرخیش وەڕس و بێزاری دەکردن، نەك وەك ئەو پێشمەرگە شەکەت و ماندووانەی خواخوایانە چرکەساتێك لە پەنا بەردێك،

یان درەختێکدا، ڕێك وەکوو مردوو ڕاکشێن و هیچ هێزێك نەبێت بە ئاگایان بهێنێتەوە، تەنها چرپەی مەترسی نەبێت لەوپەڕی بێدەنگیدا.

هەموو شتێك لێرە نامۆ و جیاوازە! هەموو شتێك.

لەو خانووەی کەوتبووە نێوان بارەگای پەلی مێوانداری و ئەم بارەگایە، پزیشکێك چاوی ڕەحمانی دەپشکنی، ئەویش لە ناکاو پرسیاری لێ کرد:

- ئەرێ بە ڕاست تۆ پزیشکی پسپۆڕی چاویت؟

دکتۆرەکە لە مەترسیی ناوەڕۆکی مەبەستەکەی ڕەحمان تێگەیشت، دڵنیای کردەوە و گوتی:

- زۆر سادەیە و شتێکی وا نییە. پارچەکە بە قووڵی گلێنەکەی کون نەکردووە و نەسمیوە، دەرهێنانی زەحمەتییەکی وای ناوێت، کێشەکە لە دوای چارەسەرکردنەکە دێت، چونکە برینەکە پێویستیی بە بڕێکی زۆری قەترەی تایبەتی چاوە.

پاشان ئاوڕی لەو پیاوە دایەوە کە لە نزیکییەوە ڕاوەستابوو، لە دەوروبەری شەست ساڵاندا بوو، وەك ئەوەی دەرمانسازی نۆڕینگە بێت، داوودەرمانەکانی لەناو تەختانجەی قەد دیوارەکە ڕیز کردبوو، دیار بوو لە کاغەزەکەی بەردەستی شتێکی دەنووسی، ڕوویەکی خۆشی هەبوو، لێبوردەییەکی وای تێدا بە دی دەکرا بە دەگمەن مرۆڤ ئەو لێبوردەییەی دەبێت. دکتۆرەکە پێی گوت:

- پێم وایە دەتوانی کێشەی کەمی قەترەکان لای

برادەرانی مام جەمال چارەسەر بکەیت.

دەرمانسازەکە بزەیەکی کرد و سەری بە شێوەیەکی ئەرێنی ڕاوەشاند، بێ ئەوەی واز لە نووسینەکەی بهێنێت، دوای ئەوەی لە تۆمارکردنی ئەوەی دەینووسی کۆتایی هات، کاغەزەکانیشی لەگەڵ دەرمانەکانی ناو تەختانجەکە دانا، بۆ چەند ساتێك لەگەڵیان دانیشت، باسی هەندێك شتی کرد کە پەیوەستبوو بە چارەسەرییەکەوە، بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات، ڕووی لە بارەگاکەی مام جەمال کرد کە چەند دۆڵ و چیایەکیش لێیانەوە دووربوو. ڕەحمان لەبەرخۆیەوە دەیگوت: "چەندین جار لەگەڵ چەکدارانی ئەو مام جەماڵە شەڕمان کردووە و سەنگەرمان لەیەکتر گرتووە و کورە کاکە لە یەکتریشمان کوشتووە، کەچی ئێستاش وا لای ئەوەوە داوودەرمانی چارەسەرم بۆ دێنن... بە ڕاستی یارییەکی قێزەون و ناشیرینە!".

دکتۆر هەناسەیەکی هەڵکێشا و ئاماژەی بۆ ناوەڕاستی ژوورەکە کرد کە جێگەیەك لەسەر زەوییەکە ڕاخرابوو، گوتی:

- لێرە درێژ بە، با پارچەکە دەربهێنم.

داوای لە یاریدەدەرەکەیشی کرد، کە گەنجێکی بیست ساڵان دەبوو، کەرەستەکان ئامادە بکات، هەر هەموو شتەکانیش بریتی بوون لە دەرزییەکی دوورینەوەی ئاسایی پێست و لایتێکی دەستی و قەترەی چاو و هەندێك کەتان و پەمۆ و مقەسێك. هاوسەری دکتۆرەکەش هاتە یارمەتیدانی کە ئەویش ئەزموونی لە بواری پزیشکی سرووشتیدا هەبوو.

ڕەحمان لەسەر زەوی ڕاکشا و لەسەرخۆ گوتی:

- با چاوەڕێی دەرمانسازەکە بکەین، نەبادا داوودەرمانی دەست نەکەوێت.

دکتۆرەکە بە متمانەوە جەختی کردەوە:

- لە هیچ مەترسێ، داوودەرمانەکە دەهێنێت، نەخۆشخانەکەی مام جەمال هەموو شتێکی تێدایە.

نۆڕینەگەکەی دکتۆر بریتی بوو لە دوو ژوور لەناو یەکتری، بچووکەکەی لە نۆ مەتری چوارگۆشە زیاتر نەدەبوو، لەوێ چارەسەری نەخۆشەکان دەکرا. هەر کەسێك بڕۆیشتبوایەتە ناو ئەو ژوورە، بۆنی داوودەرمان و پاککەرەوەکان گێژی دەکرد، سەیرە چۆن مرۆڤ بۆ ماوەی درێژ لەگەڵ ئەم بۆنە ناسرووشتیانەدا دەژین، بەڵام وا پێ دەچێ دکتۆرەکان بە بۆنی دەرمان نەبێت دڵیان دانەکەوێت و ئاسوودە نەبن، لەوانەشە ژیانیان بەبێ ئەوە ڕاستەڕێ نەبێت و ئۆقرەش نەگرن. کەرەستە پزیشکییەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لە گۆشەیەکی ڕووناکی نزیك پەنجەرەکە بە جوانی ڕیز کرابوون، ئەو پەنجەرەیەی لە نیو مەتر زیاتر نەدەبوو، لە جیاتی شووشە بە نایلۆنی ڕوون و ئەستوور لە سەرەوەی بە بزمار بە دیوارەکەوە قایم کرابوو، بە جۆرێك هەتا باوبۆرانیش کاریگەری نەکاتە سەر، لە دەوروبەری پەنجەرەکەش لە ژوورەوە بە تەختە دار چەند تاقێکیان بە ڕێکی دروست کردبوو، داوودەرمان و پێداویستییە پزیشکییەکانی دیکەیان لەسەر ڕیز کردبوو، بەڵام شوێنی نووستنی دکتۆر و هاوسەرەکەی ڕاستەوخۆ لە گۆشەیەکی بەرانبەر بوو. هاوسەرەکەی لە تەمەنی سی ساڵاندا

بوو، کەمە سیمایەکی منداڵانە بە ڕوخسارییەوە دیار بوو، وای لێ کردبوو لە تەمەنی خۆی بچووکتر دەربکەوێت، وا پێ دەچوو دکتۆر زۆری خۆش بوێت و ئەو ڕێزەی پێ ببەخشێت کە شایانییەتی. ڕوخسار و بەژن و باڵا و دیمەنێکی جوان و شێوەیەکی بەرچاو و لەبەردڵانی هەبوو، بەڵام دکتۆر کەسێکی ڕەشتاڵە و نیمچە باڵابەرز، هێڵەکانی دەموچاوی وایان دەردەخست کە دڵڕەق و بێبەزەیی بێت، وەلێ ئەگەر دڵڕەقیش بێت، ئەوا لە دڵڕەقیی دکتۆرێکی بە ئەزموون زیاتر نییە کاتێک برینێك دەبینێت خوێنی لێ دەچۆڕێت، ناچارە لە بەرانبەریدا دڵڕەقانە بۆ چارەسەرکردنی، بە نەرمونیانییەوە دەستبەکار بێت، کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ، بە دەستی خۆت نەبوو، هەر کاتێك گوێت لە قسەکانی دەگرت، هەستت بە ئاسوودەیی دەکرد، بە شێوەیەکی گشتی کەسایەتییەکی هاوسەنگ و سەنگینی هەبوو.

بەڵام ژووری دووەم لە بیست مەترێك زیاتر نەبوو. ئەو نەخۆشانەی تێدا دەنووستن و دەمانەوە کە پێویستییان بە چاودێریی تایبەت هەبوو. کاتێك ڕەحمان هاتە ئەوێ هیچ بریندار و نەخۆشێکی لێ نەبوو، تاکوو پێویستیی بەو چاودێرییە بێت، نیمچە بەتاڵ بوو، هەرچەندە یاریدەدەری دکتۆر و دەرمانسازەکەش وەکوو شوێنێکی هەمیشەیی خۆیان بەکاریان دەهێنا و لێی دەمانەوە.

هەرسێکیان دەوری ڕەحمانیان دا، یاریدەدەرەکە تیشکی لایتەکەی لە چاوە پێکراوەکەی ڕەحمان دا، دکتۆریش خەریکی کردنەوەی پێڵووی چاوی بوو، چونکە بە بەردەوامی دەیپرووکاند و هەر کە دڵۆپی بەنجەکەی لێ نزیك دەخستەوە، ئەو چاوی دەنووقاند و بە زۆری زۆرداریش نەیدەکردەوە، ئاخر

ڕەحمان پێی وابوو سۆندەی قەترە دەچێتە ناو گلێنەکەیەوە.

دکتۆر بە شێوازێکی لۆمەکارانەوە گوتی:

- ئاااااا، ئەوە چیتە؟ بۆچی چاوت وا دەپرووکێنی؟ خۆ هێشتا دەستم پێ نەکردووە.

پاشان تۆپێکی ئاوی ڕوون و ساردی هێنایە خوارەوە و بریسکەی ڕووناکی گڵۆپەکەی لەگەڵدا بوو، هەر کە بەر گلێنەی چاوی کەوت، لەبەر ساردییەکەی ڕاچڵەکی و توانای بەسەر پرووکانی چاویدا نەما، دکتۆر بە هەمان شێوەی پێشوو گوتی:

- ئاااااا، ئەوە چییە؟ دڵۆپە دەرمانێکی ئاساییە و هیچی تر... هەست بە ئازار دەکەیت؟

ڕەحمان بە نابەدڵییەوە گوتی:

- نەخێر.

پاشان دکتۆر دڵۆپێکی دیکەی تێ کرد، دوای چەند ساتێکی کەم، دەستی بە نەشتەرگەری و گەڕان و هەڵکۆڵینی چاوی کرد، دەرزییەکەی وەکوو ڕمێکی بریسکەدار بە تیشکی لایتەکە لە بینایی نزیکخستەوە، وای کرد هەموو ماسولکەکانی دەموچاوی ڕەحمان بە توندی گرژ ببنەوە و بشڵەژێن. دکتۆر ئاخێکی هەڵکێشا و بە جۆرێك لە بێزارییەوە گوتی:

- تکایە چاوت مەپرووکێنە. کەمێك یارمەتیم بدە، بۆ خۆت باشترە، ئەگەر بەم جۆرە بکەیت ناتوانم هیچ بکەم. تەماشای یەك خاڵێکی دیاریکراو بکە، هەوڵدە سەرنجت بگریتە گڵۆپی لایتەکە، بیستوومە تۆ لە گوللە ناگەڕێیتەوە، کەچی ئێستا

دەبینم لەبەردەستم لە ترسان هەڵدەلەرزیت؟!

دکتۆر ئەم قسانەی وەکوو هاندانێك بە گوێی ڕەحماندا دەدا.

ڕەحمان بە شڵەژاوییەوە لەژێر لێوەوە گوتی:

- ئاخر تیشکی لایتەکە ئازارم دەدات، ناتوانم.

- ئاخروماخری ناویێ، تکایە هەوڵ بدە، دەمار و ماسولکەکانی چاوت خاو بکەیتەوە، ماسولکەکان بە توندی دەوری پارچەکەیان داوە، دەترسم لەگەڵ جووڵەیەك ماسولکەیەکت زیانی بەر بکەوێت، ئەوکاتە بۆ ڕیش هاتی سمێڵیشی لەسەر دادەنێیت، نەڵێی دکتۆر پێی نەگوتم.

ماندوێتی بە خێرایی ڕەحمانی شەکەت کرد و گوتی:

- ئاخر ماندوو بووم. بە دەست خۆم نییە.

دکتۆر دیسانەوە گوتی:

- تۆ بەو شاخوداخەدا هەڵدەگەڕێیت ماندوو نابیت، ئێستا بۆ خۆت لەسەر گازەرای پشت ڕاکشاویت، دەڵێی ماندوو بووم، ناوەڵا بڵێ دەترسێم، حەیف! تکایە کەمێك تەماشاکە... چاوت ببڕە بنمیچەکە.

هەر کە دەستی پێ کرد، پێڵووی چاوی ڕەحمان دەستی بە پرووکان و لەرزین کردەوە و ماسولکەکانی ڕوخسار و ناوچەوانی گرژبوونەوە.

ڕەحمان شەکەتی و بێزارییەکی زۆری پێوە دیار بوو بە نائومێدییەکی بێئەندازەوە گوتی:

- ناتوانم، باوەڕم پێ بکەن ناتوانم... وازم لێ بێنن. نامەوێ دەریبکەم.

دکتۆر بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- لێگەڕێ با بڕێك دڵۆپە بەنجی دیکە بکەمە چاوتەوە، بەڵکوو یارمەتیت بدات و بتوانی خۆت ڕابگریت.

تازە چەند خولەکێك تیپەڕیبوو، دکتۆر زۆر لەسەرخۆ گوتی:

- ها چی دەڵێی ئێستا دەست پێ بکەین؟

سەرلەنوێ بەسەر دەموچاوی ڕەحماندا نووشتایەوە، بەوپەڕی وردی و لێزانییەوە دەستی بە کارەکەی کردەوە، وێڕای ئەوەی بە درێژایی کات دەستەکانی دەلەرزین، ڕەحمان هەستی بە هەناسەی گەرمی هەرسێکیان دەکرد کە بەر دەموچاوی دەکەوتن، هەناسەی تەنگ بوو، سینگی بە توندی دەستی بە هەڵبەزودابەز کرد، دکتۆریش سەرزەنشتی کرد و داوای ئەوەی لێ کرد کەمێك خۆڕاگر بێت و ئەوەندە نەجوولێتەوە، ئەگەرنا لەوانەیە لەدەست دەرچێت و بۆ هەتاهەتایەتوانای بینینی نەمێنێت. ڕەحمان لە ترسی لەدەستدانی چاوی هەناسەی لە خۆی بڕی، بەڵام زۆر بەو خۆڕاگرییەی نەمایەوە. بە توندی دەستی بە هەناسەدان کردەوە، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ هەناسەی خۆی ڕابگرێتەوە. بەڵام لە ئەنجامی هەڵچوونەکەی و ئەو ترسەی ناخی، دەموچاوی خوێنی تێ زا و ڕەنگی گۆڕا و لێدانی دڵی زیاتر بوو، وەك ئەوەی لەگەڵ کات لە پێشبڕکێدا بێت. بەم شێوەیە بەردەوام هەوڵ و تەقەلالای دەدا و بە ئارامگیرییەکی ئازاربەخشیشەوە هەوڵی دەدا خۆی ڕابگرێت، تاکوو دکتۆر

کارەکەی تەواو دەکات، دەرزییەکەی دکتۆریش بە شێوەیەکی بەهێــز پــارچە جێگیــرەکەی نــاو چــاوی ڕادەمــاڵی و لەگەڵ ماســولکەکانی چــاوی لە زۆرانبــازییەکی ترســناکدا بــوون، ماسولکەکان زۆر بە توندی پارچە ئاسنەکەی ناوچاویان گەمارۆ دابــوو، دکتــۆریش بە دەرزیــیەکەی دەســتی ســەنگەری لــێ گرتبوون و لە بەرانبەریاندا کۆڵی نەدەدا. تا حاڵ گەیشتە ئەوەی ڕەحمان گوێی لە دەنگی خشەخش و کرەی شتێك بـوو لەنـاو چاوی، ئەو هەستی بەو خشەخشە دەکرد وەك ئەوەی شتێك بەر شووشـەیەکی لـووس بکەوێـت. کـاتەکە هێنـدەی ڕۆژگـارێکی درێژ بەسەر هەموویاندا تێپەڕی، دکتۆر بە دەنگێکی شـەکەت و پچڕپچڕەوە هاواری کرد:

- ئــۆخەی... ئەوەتــا لە کۆتاییــدا دەرچــوو... وای چ پارچەیەکی نەعلەتی بوو... بە ڕاستی ماندووی کردین.

وەلێ یاریدەدەرەکەی بێئومێدی کردەوە کاتێك بە دەنگێکی پڕ لە متمانەوە گوتی:

- هێشتا پارچەیەکی دیکە لەناو گلێنەی چاویدا ماوە.

- لە کوێ؟

- ڕێك لەو شوێنەی ڕەحمان هەستی بە خشەخشەکە کرد، وا پێ دەچێ وردوخاش بووبێت.

دکتۆر چاوی لە شوێنی پارچەکە نزیکتر خستەوە و وردتـر کەوتە گەڕان بە دوای ئەو پارچەیەی ماوەتەوە، گوتی:

- پێم وا نییە هیچی تێـدا مابێـت، تـۆ دڵنیایـت؟ مـن هـیچ شتێك نابینم.

لەو کـاتەدا دەرمانسـازەکە بە هەناسـەبڕکێوە لە ئەرکەکەی گەڕایەوەو ئەو مەودا دوورودرێژەی بە مـاوەیەکی کەم بڕیـوو، دەموچاوی خۆی سـڕییەوە کە گەرمـای خـۆرەکە بردبـووی و ئارەقی لێ دەچۆڕا. دوای ئەوەی پشوویەکی دا، ئەویش هاتە ناو بـازنەی چارەسـەرییەکە و بە وردی سـەیری گلێـنەی چـاوی ڕەحمانی کرد.

هاوسەری دکتۆرەکە کە لە پشتی دکتۆرەوە سەیری دەکرد گوتی:

- ئەوەتا لەناو گلێـنەکەدایە. مـن لێـرەوە دەیبیـنم، ئەی تـۆ چۆن نایبینیت و ئەوەندەش لێیەوە نزیکیت؟

دوای ئەم دڵنیـابوونە تەواوەی کە لە هاوسـەرەکەیەوە پێـی گـوترا، دکتـۆر هـیچ گومانێـك، یـان بەرهەڵسـتکارییەکی نەمـا! دیسـانەوە سـەرلەنوێ دەسـتی بە هەڵکـۆڵینی شـوێنی پـارچە لەتوپەتەکە کردەوە، بێ ئەوەی ببینێتەوە. دوای مـاوەیەکی بـاش هاوسەرەکەی هاواری کرد:

- ئەوە دەرچـوو... ئەوەتـانێ... ئەو بەشـەی مـابووەوەش دەرچوو. بۆ زیاتر دڵنیابوونیش هەشت چاو پێکەوە تەماشای نـاو چاویـان دەکـرد، کە لەوانەیە شـتێك بەجـێ مابێـت، ئیـدی دەنگەکان بە دوای یەکتریدا گوتیان:

- هیچ شتێك نەماوە.

دکتۆر دوای ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا گوتی:

- ئێستا تەواو، تەنها ئەوەندە ئارام بگرە، تا قەترەکانی تـێ دەکەم و دەیبەسـتمەوە. نەکەی بیکەیـتەوە، یـان دەسـتی لـێ

بدەیت، هەتا کاتی بەکارهێنانی دەرمانەکە.

هەروەهـا نەکەی هەتـا دوو ڕۆژی تـر بهێڵـی ڕوونـاکی بەربکەوێت.

کاتێك دکتۆر ویستی قەترەی تێ بکات، ڕەحمـان هێنـدەی نەمابوو لە هۆش خۆی بچێت، هەرچۆنێك بوو گوتی:

- دکتۆر کەمێك ڕاوەستە... دەمەوێ سەیرێکی بکەم.

کاتێك تەماشای ئاوێنەی کرد، ڕاچڵەکینێك ڕاچڵەکی، ڕێك وەك ئەسـپێکی تۆقیـو، لە شـوێنی خـۆی ڕەش هەڵـگەڕا و تەزوویەکـی سـارد سـەرتاپای جەسـتەی گـرتەوە، بە دەنگێکـی لەرزۆکەوە هاواری کرد:

- ئەوە چییە بۆ خاتری شەیتان؟ ئەوە چیت کردووە؟

دکتۆر بە هێمنی و متمانەیەکی تەواوە وەڵامی دایەوە:

- هەرگیز... هیچ شتێکی خەراپ ڕووی نەداوە. تەنها دوو ڕۆژەو چـاوت وەکـوو خـۆی لـێ دێـتەوە. ئەوە لە ئەنجـامی نەشتەرگەرییەکەیە و هیچی تر، ئەگەر مەبەستت چـاڵەکەیە ئەوە لە ئەنجـامی کـاریگەریی پـارچەکەیە و پـڕ دەبێـتەوە، ڕەنـگە سپییەکەشی کاتییەو لە ئەنجامی سڕین و بەرکەوتـنەوە وای لـێ هـاتووە، ئەویـش چەنـد ڕۆژێکـی دیـکە چـاك دەبێـتەوە، تەنهـا ئاگات لێی بێت بەر ڕووناکی نەکەوێت.

ڕەحمان سەرلەنوێ لە ئاوێنە سەیری چاوی خۆی کـردەوە، بە هـۆی سـەرنجی ئەوانەی دەوروبەری هەسـتی بە شـەرمەزاری کرد، ڕەنگی تەواو هەڵبزڕکابوو، ڕوخسارێکی دیکەی بینـی کە هیچ لە ڕوخساری پێشووی خۆی نەدەچوو، لە کاتێکدا لەوپەڕی

گرژو مۆنیدا بوو لە دڵی خۆیدا گوتی: "بۆ خاتری ئاسمان چیتان لێ کردووم؟ ئەمە چاوی من نییە! ئەم دەموچاوەش هی من نییە". ڕەنگی بیلبیلەی چاوی لە جیاتی نێرگزی لە شوێنی پارچەکە، گۆڕاوە بۆ سپییەکی ساف و ڕوون و دەوروبەریشی ڕەنگی تەمومژ و هەڵمی لە خۆ گرتبوو، هەر ئەوەتە و بە ئاستەم ڕەنگە سرووشتییەکەی خۆی مابووەوە.

ئەو بە دەروونی تێکشکاو و ڕوخسارێکی خەماوییەوە گوتی:

- کوێر! تازە کوێر بووم، وای لەم بەدبەختییە.

لەسەر ئەو جێگەیەی بۆی تەرخان کرابوو بە خەمباری و نائومێدییەوە ڕاکشا، دەیویست یەك وشەش نەڵێت. باوەڕی بەوە نەدەکرد کە پێش چرکەساتێك بینیبووی، پێی وابوو خەون دەبینێت، بیری کردەوە: "خۆزگە مۆتەکەیەك بووایە... ئاخ ئەگەر لەم خەوە ترسناکە بە ئاگا دەهاتم، بەڵکوو هەر دەبێ هەستم و لێی بە ئاگا بێم".

دەستی لە ڕوخسار و چاوی خۆی دەدا و بە وڕێنەوە دەیگوت: "نەخێر، من خەون نابینم، من بە ئاگام، ئەمە ڕاستییە، نەك مۆتەکەیەکی بەسەرچوو، بەڵکوو ناچارم چارەنووسی خۆمم پێ قەبووڵ بێت". بە قووڵی هەناسە دەدات و لەبەر خۆیەوە منگەمنگییە: "نەخێر ئەوە چارەنووس نەبوو، من زۆر بەزەییم بە خۆمدا دێتەوە، وای کە گوناهم، من بوومە قۆچی قوربانییەکی شووم لە کۆمەڵگەیەك نەزانی تیایدا نموونەی نییە، من و قەلەڕەشکە لە شوومیدا یەکسانین، خەڵکی ڕقیان لێم دەبێتەوە و لێم دەڕەوێنەوە، وەکوو چۆن لە بیستنی قیڕەی قەلەڕەشکە تووڕە

دەبن و دەڕەوێنەوە. هەر کەسێك سبەینێ تەماشام بکات! وەکوو قەلەڕەشکەکە نەفرەتم دەکات. گەمژەیی و گەوجی ئەم گەلە لە خواری خوارەوەی سووکی و ڕیسوایی و داڕووخاندایە. من ئێستا یان بە دیاریکراوی لە ئایندەدا، دەستم بەر ئەم پڕوپووچییە دەکەوێت، وەکوو چۆن دەست لە هەر شتێکی ئاسایی دەدەم، هەر کەسێك تەماشام بکات نەفرەت لە شەیتان دەکات، بە تایبەتی خاوەن دوکانە دەجاڵەکان، ئاخر ئەوان دەڵێن: ئەمە چ ڕۆژێکی شوومە وا بەیانی باشمان لێ دەکات، چییە هەموو خەڵکی مردوون تا بەم نەفرەتییە دەست بە بەیانییەکی نوێ بکەینەوە؟ خەڵکی ئەم وڵاتە نەفرەت لێکراوە وام لێ دەکەن هەست بە شەرمەزاری لە خودی خۆم بکەم. وا باشترە بۆ هەتاهەتایە بڕۆم و سەری خۆم هەڵبگرم. بە ڕاستی وڵاتێکی دواکەوتووە. ڕەوڕەوەی ڕۆژگار لێرەدا پاشەوپاشە. هەموو گەلانی دونیا پێش دەکەون، کەچی ئەم گەلە بەو هەموو نەزانی و گەمژەییەیەوە بەختەوەرە و شانازی پێوە دەکات و هەر مێشیشیان مێوان نییە. بەدبەختیی نەزانییەکەیان هەموویانی پیس و قێزەون کردووە و باوەڕ ناکەم کەسێك لێی دەربازی بێت، هەتا دەستەبژێر و بیرمەندەکانیشی".

پاشان خەیاڵی بە لای ئەو کچە شۆخوشەنگەدا چوو، کە بە جوانییە ئەفسووناوییەکەی سەرسامی کردبوو و شۆخییەکەی لەو گوندەی کە ئەشکەوتەکەی لە دەروازەدایە ئاوێتەی خۆی و لە ناخیشەوە شەیدای کردبوو. دەستی بە شرۆڤەکردنی تێڕامانەکانی کرد بەرلەوەی بەرەو ئەنجامدانی چالاکییەکە هەنگاو بنێن، خەیاڵی بۆ ئەوە چوو، تکای لێ بکات شتێك لە پێناویدا ئەنجام

بدات، ئەو بانگی دەکرد تاکوو لەو شێتەی دەستی بەسەردا گرتووە ڕزگاری بکات. ڕەحمان لەبەر خۆیەوە گوتی: "چۆن ئاگام لەوە نەبوو... ئاخر چۆن؟". ئینجا دوای هەناسە هەڵکێشانێکی قووڵ لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەوە چ قوڕبەسەری و نەهامەتییەکە لە دەستی شێتێك ڕزگاری بکەم و بیخەمە بەر دەستی کوێرێك. وای چ نەشمیلەیەکی بەدبەختە، چەند دڵم پێی دەسووتێت".

بەڵام تەلیسم و جادووی کچەکە وای لێ کرد بەرەو جیهانی دەرەوەی زەوی هەڵوەدا بێت و لەگەڵیدا بە ئاسماندا تەی بێت و پێکەوە لە شەقەی باڵی خۆشەویستی بدەن، جادووی کچە نەشیملەکە وای لێ کردبوو بۆ چەند ساتێك ئەو دەردو بەڵایەی تووشی هاتووە لە بیر بکات، لە خەیاڵیدا شەیدای کردبوو، ئامێزی پێدا دەکرد و ئەویش بە هەمانشێوە لە باوەشی دەگرت. بەڵێنی وەفاداری و دڵسۆزییان بە یەکتری دەدا و هیچ ڕۆژگارێکی سەختیش نەیدەتوانی لە یەکتریان دابڕێت و هەرچیش ڕوو بدات، توانای لەیەکترکردنی ئەوانی نییە. بەڵێنی دا لە هەموو ئەهریمەنەکانی سەر ڕووی زەوی و دۆزەخی بپارێزێت. سوێندی خوارد لە پێناویدا بە گژ هەموو دونیادا بچێت و بۆ دەربازکردنی ئەو خۆی بخاتە ناو ئاگرەوە... با ئاگر ئەو بسووتێنێت... وەکوو پەروانە باڵەکانیشی هەڵکڕووزێنێت و هەڵیپڕووکێنێت... لەسەر زەوی بیسڕێتەوە و نەیهێڵێت و نغرۆی بکات، گرنگ ئەوەیە ئەو ئازار نەچێژێت، هەست بە شادی و

بەختەوەری بکات. ئاخر بەختەوەری ئەو، مایەی لە بیرکردنی ئازارە دەروونی و جەستەییەکانی ئەمە، خۆشەویستی ئەو هەتوانی سارێژکردنی زام و سووتانەکانی ئەمە.

ڕۆمانسیەت چەندە جوانە و لەویش جوانتر قوربانیدانی خۆشەویستی و پاڵەوانەکانیەتی. خۆشەویستەکەی لە جەنگەڵستانێکی ترسناکدایە و لە پڕ دڕندەیەك... دێو و درنج و خێوێکی ترسناکی لێ پەیدا دەبێت، خۆشەویستەکەی لە بەرانبەری ڕادەوەستێت و دەیپارێزێ، سینگی دەردەپەڕێنێت و هێرش دەکاتە سەر دڕندەکەو دڵنیایە لەوەی پارچە پارچەش دەبێت، یان خۆشەویستەکەی لەناو ئاگرێکی بڵێسەداردایە و هاوار دەکات، ئەویش پەتوویەك تەڕ دەکات و بە ڕاکردن خۆی بەناو بڵێسەی ئاگرەکەدا دەکات و گڕەکە پەلاماری دەدات، کەچی ئەو تەنها بیر لەو دەکاتەوە، تەنها ئەو و بەس، پەتووەکەی لێ دەئاڵێنێت و دەیخاتە سەر شانی و بەرەو شەقامەکە هەڵیدەگرێت و ئاگریش لە نووکی پێیەوە تا تەوقی سەری بەرز دەبێتەوە و بڵێسە دەکات، وەلێ ئەو گوێی پێ نادات، لەو چرکەساتەدا خۆشەویستەکەی پەتووەکە لە خۆی دەکاتەوە بۆ ئەوەی ئاگری جەستەی خۆشەویستە فریادڕەسەکەی بکوژێنێتەوە، خەڵکیش دەوریان داون و یارمەتییان دەدەن و چەپڵە بۆ ئەو پاڵەوانە عاشقە لێ دەدەن کە قوربانیدان و دڵسۆزی لە خۆشویستنەکەیدا سەرڕێژە و بەوپەڕی بوێری و جوانیشەوە لە خۆیدا بەرجەستەی کردووە.

هێنـده نابـات خەیـاڵە ڕۆمانسـییەکانی ڕەحمـان دەپچـڕێن و دەڕەوێنەوە و وردوخاشیش دەبن، ڕوخساری خەمبار و مرومۆچ و دڕدۆنگ دەبێتەوە، ئاخر ئەو خۆشەویستە فریادڕەسـەی کە لە پێناویدا خۆی فڕێ دایە ناو بڵێسەی ئـاگرەوە لەگەڵیـدا یەکسـان نییە؟ ئەرێ ئەوە خۆپەرستی نییە، ئەگەر داوای خۆشەویستی لـێ بکات بەبێ لەبەرچاوگرتنی قەبارەی ئەو قوربانیدانەی پێشکەشـی کردووە؟ جا بۆچی ئەو چاکەکەی تەواو نەکات، مادام ئەوەنـدە گەمژەیە و کاری قوربانیدانەکەی کۆتایی پێ نەهێنێت و ئەوەش بسەلمێنێت کە هیچ خۆپەرستییەك لە خۆشەویستییەکەیدا نییـە و چۆکی بۆ دابدات و بڵێت: "بـڕۆ ئەی خۆشەویسـتە نەشـمیلەکەم ئازاد بە و بۆ خۆت بژی، ئاخر من بەم دۆخەمەوە ناتوانم شادی و بەختەوەرییت پێ ببەخشم و دڵخۆشت بـکەم". ئیـدی دەڕوات و بۆ هەتاهەتایە لە ژیـانی ون دەبێـت. بەڵام بـۆ دەبـێ ناشیرینی لەگەڵ جوانیـدا ڕاستەڕی نەبـن؟ لە منداڵیمـدا فیلمـی کـارتۆنیم بینیــوە میرزادەیەکــی ناشــیرین لەگەڵ کیژۆڵەیەکــی جــوان و نەشمیلانەدا بوون، میرزادەکە لەبەر ناشیرینی خۆی ڕای دەکـرد، بەڵام لە ئەنجامدا جوانیی سەر کەوت و باوەشی بە ناشیرینەکەدا کـرد. ئەی چـی بە فیلمـی کـچە جـوانەکە و دڕنـدەکە دەڵـێن؟ مەبەستم فیلمی (حەسناو وەحشەکەیە). ئاخ هەمـوو فەیلەسـووف و نووسـەرەکان لایەنگیـری جـوانی دەکەن و وای لـێ دەکەن لەگەڵ ناشـیرینیدا بگونجێـت و بسـازێت... وەلـێ درۆیە درۆ... بەلـێ درۆیە. هەرگیـز جـوانی لەگەڵ ناشـیرینیدا ناژێـت. ئەوەی خۆشم دەویست هەرگیـز لەمڕۆ بە دواوە ئامـادە نیـیە لەگەڵمـدا بژێت، وای لە بەدبەختی و نەگبەتیم.

دوای زریان و تۆفانێك له بیرۆكه و پرسیاركردن له هەست و نەستی خـۆی، كه دۆخه دەروونیـیه دژوارەكەی لەو كـاتەدا بەسەریدا سەپاندبووی، وای لێ كردبـوو لەبەر خـۆیەوە بۆڵەبـۆڵ بكات و بڵێت: "خۆزگه ژیانم لەناو مۆڵگه سەربازییەكه كۆتـایی بهـاتبووایه. ئـاخر بەم شـێوەیه مەرگ له ژیـان خۆشـتره. پاشـان مستێكی بەسەری خۆیدا كێشا و گـوتی: "ئەرێ ئەم هەراوزەنـاو ژاوەژاوه كۆتاییەكی نییه؟!"

# بەشی سێزدەیەم

ماوەیەکی کورت تێپەڕیبوو، بڕیاری گواستنەوەی ئەو بارەگایە درا و سەرقاڵی خۆشەتەکدان بوون، ئەوانەی لەوێدا بوون خەریکی کۆکردنەوە و ڕێکخستنی کەلوپەلەکانیان بوون، بە مەبەستی جێهێشتنی ئەو دۆڵە قایم و سەختە. شوێنەکە بە هۆی زۆری جووڵە و هاموشۆوە زیندوو بووبووەوە. ئەوەتانێ چەکەکان بەسەر شانیانەوەن، دوای ئەوەی لەو ماوەیەی تێپەڕی لەگەڵ چەك هەڵنەگرتندا ڕاهاتبوون، فیشەکدانەکان لە ناوقەدیان توند توند شەتەك دەدرێن و سکیان لە ژێرییەوە گرژ دەبێتەوە، جەمەدانییە ڕەشەکانیش بە شێوەی کوردانە سەری داپۆشیون و بەمەش ئەو جلوبەرگ و پۆشاکە تەواو لەگەڵ کەشوهەواو بارودۆخی سرووشتی ناوچەکەدا دەگونجێت. کۆمەڵێکی کەم بە شێوەیەکی کاتی لێرە ماونەتەوە بۆ ڕێکخستنی هەندێك ئیشوکار کە خراوەتە ئەستۆیان و دوای ئەنجامدانی ئەو کارانەیان ئەوانیش دەگەنەوە هاوڕێکانیان. ڕەحمان لەناو ئەو کۆمەڵە کەسەدا بوو کە لەوێ مابوونەوە و بەرپرسیارێتیی گواستنەوەی سەرجەم پێداویستییەکان و هەموو چەك و جبەخانەکەی خرابووە ئەستۆ، دوای ئەوەی بارەگاکەی بە هەموو کەلوپەلەکانییەوە وەرگرت، هەتا بە وەرگرتنی ئەو ژوورە سادە و بچووکەی تەنیشت جبەخانەکەوە، کە هەندێك کەلوپەل و چەکی تێکچوو و پەککەوتە و سادەی تێدابوو، یەکێك نەزانێ دەبێ ئەوە چ جبەخانەیەك بێت و چ چەك و تەقەمەنییەکی لە خۆ گرتبێت! ئەوەی تێیدابوو و نەبوو، چەکوچێکی بچووك و مەورەدێك و پلایسێك و یەك دوو سپانە و هەندێك وردە شتیتری لەم شێوەیە.

هەرچەنــدە ڕەحمــان لە خەمــی گەڕانەوەیــدا بــوو بــۆ لای دەستەکەی ڕۆست، ئاخر لێرە بێزاری مرۆڤ دەکوژێت و لە پەلوپۆی دەخات و لەگەڵ خۆیدا هەڵیدەپرووکێنێت، بەڵام ئەو چی بکات کە دکتۆر ماوەیەکە لێرە هێشتوویەتییەوە، تاکوو سەرپەرشــتی چــاکبوونەوەی چــاوی بکــات، کــاتێکیش ئەو چالاکییەی ئەنجامیان دابوو ناوبانگێکی زۆری دەرکردبوو، داوایان لێ کرد لە ئێزگەکەوە کە ڕۆژانە لە کاتی دیاریکراودا پەخشی خۆی دەست پێ دەکرد، باسی وردەکارییەکانی ئەو چالاکییەیان بۆ بکات. ئەو ئێزگەیەش جگە لە چەند ئامێرێکی سادە و بچووك بەولاوە شتێکی تر نەبوو، هەروەها توانایەکی دیاریکراویشی هەبوو، بەڵام دواتر پەرەیان پێی دا و مەودای پەخشەکەیان فراوانتر کرد تا گەیشتە ئەوپەڕی باشووری وڵات و ڕژێم هەزار و یەك حیسابی بۆ بکات. بەمەش دەستیدایە تەشویش خستنەسەر شەپۆلەکانی، تا وای لێهات خەڵکی بە زەحمەت لە هەندێك هەواڵ و زانیاریی تێبگەن.

زۆری پێ نەچوو کەسێکیان بە ناوی ئەبو شامیل ناردە دوای ڕەحمان. کە لەگەڵ ژمارەیەك پیاوی بەساڵاچوو دادەنیشت و باسی شتێکی بۆ دەکردن. ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییەی هەموو ئەو خاوەن بڕیارانەی ئەوێی کۆ دەکردەوە و پێی دەناسرانەوە، ئەو سادەیی و خاکیبوونە بێ سنوورەیان بوو. ئەوەندە چاکی و باشییان تێدابوو مرۆڤ بە هەڵسوکەوتیان سەرسام دەبوو. بەڵام دیمەن و ڕوخساریان بە شێوەیەکی گشتی، لە دیــمەن و ڕوخســاری سەوزەفرۆشــێکی بــازاڕی میللــی تێــنەدەپەڕی، کە پڕاوپــڕ و تەژیــیە لە مــرۆڤ و مــێش و هەراوزەناشیان مێشــك کــاس دەکەن. بەڵام ئەمە لەســەر ئەبــو شامیل پیادە و پەیڕەو ناکرێت، کە سەنگێکی گەورەی بۆ

دیمەن و ڕوخساری خۆی دادەنا. ئاخر ئەو پێشتر لە سوپای ڕژێم ئەفسەر بوو. بایەخدانیش بە ڕێکی جلوبەرگ و بەژن و باڵا یەکێك بوو لە کارە سەرەتاییەکانی سەربازی، کە لێبوردنی نییە هەتا دەبێتە نەریتێك لە ژیان و لەسەری ڕادێت. سەرباری ئەوەی ئەوی لە پیرەکانی تر جوودا دەکردەوە، زۆر بە کەمی دەربارەی خۆی و دەستکەوت و کارەکانی دەدوا. لەو بوارەدا زۆر کڕ و بێدەنگ بوو، بەڵام وێڕای ئەوە مرۆڤ دەیتوانی مەزەندەی ئەوە بکات کە هەموو ئەوانەی مرۆڤی باش و بێفیز و خاکیین و خەمی گەلەکەیان لە ناخی خۆیاندا هەڵگرتووە و لە پێناویدا تێدەکۆشن، چەند هێڵێکی سووریان کێشاوە و ڕێگە نادەن هیچ کەسێك بیانبەزێنێت، هەر کەسێکیش ئەو کارە نەشیاوە بکات، ئەوا دانی لێ چیڕ دەکەنەوە و بەرانبەری دەبنە کەسی خەراپ، بەڵکوو هەتا ئامادەیی ئەوەیان تێدایە ئەگەر ئەوەیان بۆ بڕەخسێت، هەموو ئەوانەی دەوروبەریشیان قڕ بکەن، ئەگەر یەکێکیان بیەوێت سووکایەتی بە پێگە و ئەو مێژووەیان بکات کە شانازیی پێوە دەکەن و بەوپەڕی باوەڕیانەوە پێوەی دەنازن، تا ئەو ئاستەی ڕۆژێك لە ڕۆژان لە خستنەڕووی ئەو ژیانەی ڕابردوویان بێزار نابن، لەو دەربەدەری و ئازار و ئەشکەنجەیەی بە دوای ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی دەسەڵاتەوە بەسەریاندا سەپێنرابوو. لە هەر شوێنێکیش بن، پێشمەرگەکان دەوریان لێ دەدەن و گوێ لە گفتوگۆکانیان دەگرن کە پڕە لە خۆستایشکردنی ئەوتۆ، هەندێك جار دەگاتە ئاستی گەوجی و قێزلێبوونەوەش. بۆیە هیچ خەمێکی دیکەیان نەبوو، جگە لەوەی لە دەوری کۆ ببنەوە و پێشبڕکێ لەسەر ڕازیکردن و ماستاوکردن و خزمەتکردنی بکەن، تاکوو سۆزی ڕابکێشن و هەمان ڕێچکەی ئەو بگرنەبەر. هەر خۆیشی ئەو دانیشتن و کۆڕە شەوانانەی ڕێك دەخست و پێشمەرگەکانی لە

دەوری خۆی کۆ دەکرەوە، بۆیە پیرە پێی لە هەر شوێنێك دابنابووایە و دابنیشتبووایە ئیدی لێی کۆ دەبوونەوە و ئەویش هەرچی لەناو کوڵەپشتەکەی بوو لە سەربوردە و ڕووداوە کۆنەکان کە ڕۆژگارێکی زۆری بەسەردا تێپەڕی بوو بۆ دەگێڕانەوە، هەتا زۆربەی پێشمەرگەکان زیاتر لە جارێك گوێیان لە وتەکانی بووبوو. بەڵکوو هەتا هەندێکیان پێشەکییەکەیان بە تەواوی ئەزبەر کردبوو. بۆیە لێرە و لەوێ بێزارییان پێوە دیار دەبوو، لەجیاتیی حەپەسان و پرتەوبۆڵە و منگەمنگ و سەرسامبوونیان کە بەر گوێی کەسە نەرجسی و خۆپەرست و لەخۆباییەکان دەکەوت و قسەکەی بۆ دەگێڕانەوە، کەسانی دیکەش هەبوون ڕێگەیان بە خۆیان دابوو، ببنە چاودێر بەسەر زاریانەوە لەوەی دەیلێن، هەتا بایەخیان دابووە ئەو کەسانەی خۆبەخشانە لە ناخیاندا چەکی شەڕانگێزی دەتەقێنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا دەگوترێت ئەو پیرانە ئەرکێکی زۆر گران و زەحمەتیان خستبووە ئەستۆی خۆیان کە مرۆڤ بە خەیاڵیشیدا نەیەت. ڕاستە خەڵکی دەڵێن بێسەروبەرەیی ئەو پیرانە و بێتواناییان لە ئاست تێگەیشتنی ڕووداوەکان بووە، هەر لە سەرەتای هاتنە ناو سیاسەتییشەوە تاکوو ئێستا، هۆی ئەو دەرد و بەڵایەیە کە بە درێژایی چەندین دەیە تووشی وڵات هاتووە. کەچی ئێستا هەوڵی ئەوە دەدەن شتێکی گرنگ ئەنجام بدەن و لەناو سەرکردەی هێزە چەکدارەکانی شاخ ناو و ناوبانگی خۆیان بقۆزنەوە. ئەوەتانێ هەوڵی یەکخستنی هەموو هێزەکان دەدات لە بەرەیەك، تاکوو پێکەوە ڕووی چەکەکانیان ئاراستەی دەسەڵات بکەن. هەندێك جاریش کێشە و ململانێی نێوان دەستە شەڕکەرەکان چارەسەر دەکەن، لە پێکهێنانی بەرەیەکی بەرفراوانیشدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، بەڵام لە ڕاکێشانی هەموو هێزەکان بۆ ناوی شکستیان خوارد، چونکە مام جەمال

ئامادە نەبوو لەگەڵ مەحموود بورهانیی دژیدا لە یەك بەرەدا بە یەکتر بگەن و کۆ ببنەوە. ئەمەش وای لەو پیرە پیاوانە کرد بەرەی دووەم پێك بهێنن و لایەنەکان بگرێتە خۆی. هەر ئەو پیرانەش بوونە ڕایەڵەی یەکخستن و لەیەکترتێگەیشتنی هەردوو بەرەکە.

بەڵام ئەبو شامیل سەرکردایەتیی هەموو مەڵبەندە شەڕکەرەکانی سەر بەو پیرانەی دەکرد و لە نزیکەی شەست ساڵیی تەمەنیدا بوو، چوست و چالاك، بەڵکوو هەتا چالاکی و جووڵانەوەکانی لە زۆرێك لەو جەنگاوەرانە باشتر بوو کە تەمەنیان لە دەوروبەری بیست ساڵانیشدا بوو، هەوڵ و کۆششی زۆریشی دەدا، تاکوو هێز و توانای جەستەیی خۆی دەربخات، لە ڕۆیشتندا بە جۆرێك بزنەڕێیەکانی دەبڕی ڕۆژێك لە ڕۆژان نەدەبووە مایەی پەکخستن و خاوکردنەوەی ڕۆیشتنی لاوان، یان کۆسپ بخاتە بەردەمیان، ئەوەشیان دەگوت کە پلە و بەرپرسیارێتیی زۆری لە حکوومەتی پێشوو وەرگرتووە. هەروەها جارێکیش هەوڵی تیرۆرکردنی دراوە، کە بۆتە مایەی گیانلەدەستدانی هاوسەرەکەی کە دوو کوڕ و سێ کچی لە دوای خۆی بەجێ هێشت. کەس نازانێ چۆن دەژین و لە کوێش دەژین؟ وەك ئەوەی بڵاو بووبووەوە، هەموویان یان هەندێکیان لە وڵاتێکی دۆستدا ژیانێکی ئارام و ئاسوودە دەژین. ئەبو شامیل بەرلەوەی قەڵەمڕەویی چەکدارەکانی لە شاخەکان زیاتر ببێت، زۆر بە وڵاتاندا دەگەڕا، لەگەڵ ئەوانەی لە دەستی دەسەڵات ڕایانکردبوو کۆ دەبووەوە، بە دوای ئەوانەدا دەگەڕا کە جۆشوخرۆشی تێکۆشانیان هەبوو، تاکوو پەل و بارەگا و بەتالیۆن و لقی چەکدارەکانی پێ زیاتر و فراوانتر بکات. وێڕای ئەوەی شەڕی پێشمەرگانە لە شاخ پشت بە شێوازی (لێدە و

ڕاکە) دەبەستێت. کەچی ئەمە ڕێگەی لە ئەبو شامیل نەگرتبوو کە خەون بە پێکهێنانی سوپایەکی ڕێکوپێك ببینێت هاوشێوەی سوپای ڕژێم. ئەو ئەفسەرانە فەرماندەییان بکەن کە لە دەرەوەی وڵات خولی سەربازییان دەکرد و دواتر بۆ وەرگرتنی بەرپرسیاریتیی هێزە پارتیزانەکان دەگەڕانەوە بۆ شاخەکانی کوردستان. بەڵکوو لەوانەیە لە خەونەکانیدا بیری لەوەش کردبێتەوە قەڵەمڕەویی ئەو سوپایە بە هەماهەنگی و بە چوونە ناو بەرەیەك یان هاوپەیمانێتییەك لەگەڵ جەنگاوەرانی مام جەمال فراوانتر بکات، چونکە مام جەمال دەسەڵاتەکانی لەگەڵ کۆمەڵەکەی مەحموود بورهانی دابەش کردبوو. بەڵام ئەگەر ئەو خەون و خولیا و خواستە لە چرکەساتێکی شەیدایی ژیانیشیدا بە هزری ئەبو شامیلیشدا بێت، وەلێ پێشوەختە شکستی بۆ نووسراوە. لەبەر ئەوەی ئەو دڕدۆنگی و ناکۆکییەی نێوان هەردوولایان بە جۆرێکە ئاشتکردنەوە و ڕاستکردنەوەیان جۆرێکە لە مەحاڵ. ئاخر ئەو درز و ناکۆکییەی نێوانیان لە لایەن ئەو دەوڵەتانەوە ختووکە دەدرێت و بەرنامەڕێژیی بۆ دەکرێت کە کوردستانیان بەسەردا دابەش کراوە. مەحموود بورهانی کوڕی مەلا مورتەزا بورهانییە، کە دەیان ساڵە ناو و ناوبانگ و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شار و گوند و شاخەکاندا باڵادەستە و هەتا بۆتە هێمایەکیش بۆ هەموو کوردان. ئەو دەسەڵاتە مەزنەی مەلا مورتەزا لە کاتی خۆیدا ئەو وڵاتە زلهێز و مەزنانەشیان بێزار و وەڕس کردبوو کە نیشتمانی کوردانیان دابەش کردبوو و بەخشیبوویانە وڵاتانی دراوسێ. کەواتە هەر دەبێت ئەو دەسەڵاتە لاواز و پەرشوبڵاو بکرێت، بەڵکوو وای لێ بکرێت ئاگای لە ئامانجە ڕزگاریخوازییەکەی نەمێنێت و خەم و خولیای یەکەم و کۆتایی ببێتە پارێزگاریکردن لە مانەوەی خۆی، نەك دامەزراندنی نیشتمانێك بۆ کوردان. ئەوەتا مام جەمال ئەو ڕۆڵە دەبینێت و ئەو

پرۆژەیە جێبەجێ دەکات. ئەو جەماڵە گەنجە، بەرلەوەی نازناوی مامی پێوە بلکێت، یەکێك بوو لە لایەنگرانی مەلا مورتەزا، کاتێك گەیشتە هەژدە ساڵی، توانی بگاتە ئاستی سەرکردایەتی و کەسیش نەیدەزانی چۆن؟! لەوانەیە ئەو گەنجە خوێنگەرمە بووبێتە جێگەی سەرنجی ئەوانەی سەرکردە دروست دەکەن و دەشیانپارێزن. ئەوە گەمەی گەورەکانە، دروستکردنی سەرکردە لەو وڵاتانە لەوپەڕی ئاسانیدایە. ئەو سەرکردە دروستکراوانە لە نمایشکارێکی شانۆیی بۆیان زیاتر نین، بە ئاشکرا ختووکەی خەونی خەڵکی دەدەن و لەژێرەوە و لە ژوورە تاریکەکانیشدا ڕۆڵی دیکەیان پێ دەسپێردرێت و خەون و خواستی خاوەنەکانیان و بەخشێنەری ناز و نیعمەتەکانیان دەهێننە دی. ئەوەتانێ جارێکی تر مام جەمال یەکڕیزی کوردان تێك دەدات، ئەو یەکڕیزییەی خەریکە وڵاتانی دراوسێ وەڕس و بێزار دەکات، نەبادا کوردانی وڵاتەکانی ئەوانیش هەمان ڕێگە بگرنەبەر و چاو لەمان بکەن. ڕاستە وا دەردەکەوێت کە مام جەمال کۆمەڵەکەی خۆی بە بیانووی دووبارە زیندووکردنەوەی بزووتنەوەی چەکداری دامەزراندووە، کە ماوەیەك ئاشبەتاڵی پێ کرا و بە هۆی ڕێککەوتنێکی ئاشتیشەوە -کە لە ڕاستیدا ڕێککەوتنی خۆبەدەستەوەدان بوو- خودی سەرکردەکەیشی واژۆی کردبوو، هەرچی چەك و جبەخانەی ئەو بزووتنەوەیە هەبوو ڕادەستی حکوومەت کرابووەوە. بەڵام ئەوەی شاراوە بوو و لەژێر پەردەوە وڵاتانی دراوسێ فەرمانەکانی خۆیان لە وڵاتە زلهێزەکانەوە وەردەگرت، لە ترسی ئەوەی نەبادا ڕۆژێك ئەو ڕێککەوتننامەیە شکست بهێنێت، بۆیە بە ئەنقەست ئەو ماوە ئاشتییەیان قۆستەوە، تاکوو هێزێکی هاوتەریب لەگەڵ هێزەکەی مەلا مورتەزا ساز و ئامادە بکەن و پشتگیری و بەهێزی بکەن و هەموو پێداویستییەکانیشی بۆ دابین بکەن، هەتا ئەگەر جارێکی

دیــکە مەلا مــورتەزا گەڕایەوە و دەســتی بە هەڵگرتنــی چەك کردەوە، بە چاوی خـۆی ببینێت گۆڕەپانەکە بە هێـزی دیـکە ســیخناخ و ســەرقاڵ و پــڕ کــراوەتەوە و لە ســەرکردایەتیی بزووتنەوە چەکدارییەکەدا ململانێ و ڕکەبەرایەتی دەکـات و لە بەرانبەریشیدا ڕووبەڕووی دەوەستێتەوە، بەمەش بۆ وڵاتان سووك و ئاسـان دەبێـت هەر کاتێـك هەسـت بەو پێویسـتییە بـکەن و بیانەوێ فتیلی شەڕی ناوخۆ دابگیرسێننەوە، بە ئاسـانی ئەو کـارە ئەنجام بدەن، بەمەش بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکە خـۆی خـۆی هەڵدەلووشێت و خۆی قووت دەدات.

دوای چەند ساڵێکی کەم، "مەلا مـورتەزا بورهـانی" کـۆچی دوایـی کـرد و سـەرکردایەتییەکەی بـۆ کـوڕەکەی مەحمـوود بورهانی بەجێ هێشت کە لەسـەر هەمـان ڕێبـازی بـاوکی بـوو، جۆشوخرۆشە گەنجێکەی وای لـێ کردبـوو گۆمـاوە گەنیـوەکە بشڵەقێنێت و جارێکی دیکە هەوڵـی جووڵانـدنی بـزووتنەوەکەی بداتەوە و خۆی بونیاد بنێتەوە و بکەوێتەوە سەر پێ و دەسەڵاتی خۆی سەرلەنوێ بسـەپێنێتەوە –هەڵـبەتە ئەمەش بەبـێ ئاگـاداری وڵاتە زلهێزەکـان و وڵاتــانی دەوروبەر نەبــوو-، دڕدۆنگــی و دوژمنــایەتیی نێــوانی و نێـوان مــام جەمــال بەردەوام بــوو، بـۆ ڕۆژێکیش هێور نەبووبـووەوە، هەتـا پیرەکـانی دوێنـێش ئەوانەی لەگەڵ ڕژێم لە هاوپەیمانیدا بوون و ڕژێم غەدری لـێ کـردن و پاشـقولی دان و لە ناکـاو لەگەڵ لایەنگرانیـان ڕوویـان لە شـاخ کردەوە چەنـدین جـار بـکەونە نێوانیـان و هەوڵـی ڕاگرتنـی ئەو براکــوژییەی نێوانیــان بــدەن. بەو ئومێـد و ئامــانجەی لــوولەی تفەنگی هەموویان ئاڕاستەی دەسەڵات بکرێت. لەوانەشە ئەم بارە دژوارە، خەونەکـانی ئەبـو شـامیلی لە دامەزرانـدنی لەشـکرێکی بێشومار لە هەموو هێزە چەکدارەکانی شاخ بۆ هەتاهەتایە بخـاتە

ژێر گڵەوە، بەمەش لە ناخەوە دەسووتا بۆ لەدەستدانی ئامانجێکی وا کە ئیدی هێنانەدیی جۆرێك دەبێت لە مەحاڵ. چونکە مام جەمال جگە لە بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی وەك دەڵێن باوکی خۆیشی ناناسێت و هاوڕێیەتی نازانێت، خۆ ئەگەر وا پێویست بکات بۆ لێدانی هێزەکانی دیکە بە نهێنی لەگەڵ ڕژێمیش هاوکاری بکات، بۆ ساتێکیش دوودڵ نابێت و ئیستێکیش ناکات، دەمودەست بڕیار دەدات و پاشقولی هەموو هاوڕێکانی دەوروبەری دەدات، ڕێك لەو کاتەی دەستیشی لەناو دەستیاندایە. ئاخر پاکی و بێگەردی و متمانە لای ئەم جۆرە کەسانە زۆر لەوە هەرزانترە کە هەر بیریشی لێ بکەنەوە.

ئەبو شامیل زێدەباری خواست و ئاواتە ڕانەگەیەندراوەکانی، هەندێك مەترسییش لەوانەی لە دەوروبەریدان دەشارێتەوە، ئیدی هۆیەکەی هەرچییەك بێت و ئێمە نایزانین، لەوانەشە بارێکی دەروونی بێت و بە زۆری لای ئەوانە ببێتە مۆتەکەیەك کە دەکەونە بەر هەوڵی تیرۆرکردن، بەمەش گومان لە نزیکترین کەسی خۆیان دەکەن و متمانەیان بە هیچ کەسێکی دەوروبەری خۆیان نامێنێت، ئیدی بە دوای کەسانی وادا دەگەڕێن کە جێگەی متمانە و پشتپێبەستن بن، بۆ ئەمەش پرسیار لەم و لەو دەکەن، بە وردەکارییەکانی ژیانی ڕابردوو و ئێستایاندا ڕۆدەچنە خوارێ، ئەوەتانێ ڕەحمان یەکێکە لەو گەنجانەی کە شەیدای بیرۆکەیەك دەبن و دەروێشئاسا حاڵی پێوە دەگرن، ئیدی بێ بیرکردنەوە ئامادەن لە پێناویدا گیانی خۆیان ببەخشن. هەڵبەتە ئەم جۆرە کەسە پەرۆشانە دەکەونە بەر سێرەنیگای هاوشێوەکانی ئەبو شامیل کە خواستی دامەزراندنی سوپایەکە لە خودی پێشمەرگەکان، نەخاسمە ئەوانەی ئەزموونی شەڕکردنیان هەیە. بەمەش وابەستەیی و گوێڕایەڵیی کوێرانەیان لە ڕێگەی زانین و

ئاشـــکراکردنی مەیـــل و ئارەزووەکانیـــان و خوێنـــدنەوەی بیرۆکەکانیان مسۆگەر و دابین دەکات. ئەبو شامیل دەیزانی ڕەحمان وێڕای بچووکیی تەمەنی زیندانی کراوە و زۆریش ئەشکەنجەی چەشتووە. بەشداری چەندین شەڕیشی کردووە و چەندین جاریش لە مەرگ نزیك بۆتەوە و بە ڕێککەوت دەرباز بووە، لەبەر هیچ نا، تەنها لەبەر ئەوەی شانازی بەخۆیەوە دەکات و ڕێگە بە کەس نادات پێی پێدا بنێت و سووکایەتیی پێوە بکات. ئەم خەسڵەتەش پیاوەکەی سەرسام کردبوو، بە تایبەتی دوای ماوەیەکی کورت زانی کە ڕەحمان بە دەست حاڵەتێکی لووتبەرزییەوە دەناڵێنێت کە لە نەخۆشییەوە نزیکە، زیاتر لە بێئەدەبی و زەوقەوە. بە جۆرێك کە ئامادە بوو یارمەتیی هەر کەسێك بدات، تەنها لە پێگەی دەسەڵاتدا نەبێت، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا دەگۆڕێت بۆ کەسێکی هەرچیوپەرچی و بێکەڵك و زمان پیس و کەسێکی سووك و چرووك. کەس نازانێت چی لە کەللەی ئەم گەنجە ڕەفتار سەیرەدایە، کاتێك لە چرکەساتێکی لە ناکاودا دەبێتە مرۆڤێکی خاوەن سەرنج و هزرئاڵۆز.

جارێکیان ڕەحمان لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانی چای ئامادە کردبوو. یەکێك لەو پیرە خاوەن دەسەڵاتانەش هاتبووە لایان دانیشتبوو، ڕەحمان چای بۆ خۆی و هاوڕێکەی تێ کردبوو. سەرنجێکی سرەواندبووە پیرەکەو بە دەنگێکی گڕو دوور لە هەموو زەوقێك وەك ئەوەی دوژمنداریيان لە نێواندا هەبێت گوتبووی: "دەتوانی بۆ خۆت چای تێبکەیت!". وێڕای ئەوەی جۆرە ڕووگیرییەك بە ڕوخساری پیرەکەوە دیار بووبوو، کە زۆرێك لەوانیتر پێشبڕکێیان لەسەر خزمەتکردنی دەکرد. کەچی لە ئاست ئەو هەڵوێستەی ڕەحماندا بێدەنگیی هەڵبژاردبوو، لە

شوێنی خۆی کەمێك جووڵابوو و پەرداخێك چای بۆ خۆی تێ کردبوو. گەڕابووەوە شوێنەکەی خۆی و لەسەرخۆی دەستی بە چاخواردنەوە کردبوو، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك پیرەکە گەیشتبووە ئەو مەبەستەی لە پێناویدا هاتبوو، بەڵام بە ئەنقەست لەوێ زیاتر مابووەوە، وا دەردەکەوت کە چاودێریی شتێك دەکات، دوای ئەوەی ڕەحمان و هاوڕێکەشی چایەکانیان تەواو دەبێت، پیرەکە لە شوێنی خۆی هەستابوو و پەرداخەکانی کۆ کردبووەوە و پەرداخێکی پڕ لە چای کردبوو و بە ڕەحمانی گوتبوو: "فەرموو". ڕەحمانیش بێ ئەوەی سەرنج لە ڕوخساری بدات پەرداخە چایەکەی لێ وەرگرتبوو، پاش چرکەساتێکی کەم خۆی بینیبووەوە خەریکی منگەمنگە، وەك ئەوەی داوای لێبوردن لەو هەڵسوکەوتەی نەختێك پێش ئێستای خۆی بکات و دەڵێت: "ئەوەی تۆ کردت لە پلەوپایەت بەرز دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر من بمکردایە لە ئاستی کەم دەکردمەوە". پیرەکە هیچی نەگوتبوو. جارێکی دیکە لەگەڵ ئەبو شامیل بەرەو خێوەتەکەی ڕۆیشتبوون کە لە شوێنێکدا بوو لە شوێنی هەمووان بەرزتر بوو. لەو کاتەدا ئەبو شامیل قاپێکی گەورەی پڕ ئاوی بەدەستەوە بوو و کاغەزێکی زۆری لێ ئاڵاندبوو، لێژایی شاخەکەش زۆر تووش بوو، ناوەناوە ڕاوەستابوو ئارەقەی ناوچەوانی خۆی بە مەچەکی کورتەکەکەی سڕی بوو، هەناسەبڕکێی گرتبوو، دەنگی هەناسەی وەك ئەوەی تووشی پەلەقاژەی مەرگ بووبێت بەو شێوەیە دەبیسترا. ئەو مەودایەی بڕیبووی ئەو هەموو شەکەتییەی نەدەویست، بەڵام وا پێ دەچوو کابرا تووشی تایەك، یان پەتایەك بووبێت و خۆی وا نیشان دابێت کەس لاوازییەکەی نەبینێت. بۆیە سەرلەنوێ هەوڵی گەڕانەوەی بۆ خێوەتەکەی دابوو، لەو کاتەدا ڕەحمان لە نزیکییەوە دەبێت و پێکەوە ڕێ دەکەن، تا دەگەنە خێوەتەکەی. ئەبو شامیل هەر زوو دەیزانی

ڕەحمان زۆر بەم جۆرە کارە هەستیارە و دەستی یارمەتی بۆ درێژ ناکات، بۆیە چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەکردبوو کە شتێکی بۆ هەڵبگرێت، هەرچەندە دۆخەکە وای دەخواست کە ئەم جۆرە ڕەفتارە بنوێنێت، کەچی ڕەحمان وێڕای ڕووگیرییەکەی، بەڵام خۆی نەبردبووە ئەو بارە و خۆی لە گێلی دابوو، لە ترسی ئەوەی نەبادا لە بەرچاوی ئەوانی تر ببێتە یەکێك لەوانەی بۆ خزمەتکردنی پیرەکە لە پێشبڕکێدان، بە مەبەستی بەدەستهێنانی سۆز و خۆشەویستی کە دەرگای پلەبەرزکردنەوەی بۆ دەکردەوە. لای خێوەتەکە ئاماژەی بۆ شوێنەکە کردبوو و پرسیاری ئەوەی لێ کردبوو: "باشە کەواتە بۆچی خێوەتەکەت لێرە هەڵداوە؟". ئەبو شامیلیش لەو کاتەی بە منگەمنگ و تەنکە زەردەخەنەیەکی ماندووش ڕوخساری داپۆشیبوو دەڵێت: "بۆ ئەوەی سەرپەرشتیی هەمووان بکەم". ڕەحمان گوتبووی: "لەگەڵ ئەوەشدا پێشمەرگەکانت وا پشتیان لێ کردۆتەوە، دەڵێی شوانی مەڕەکانن".

بەم جۆرە ئەبو شامیل لە هەندێك کاروباردا پشتی پێ دەبەست و جبەخانەکەی پێ سپاردبوو. وەلێ ڕەحمان هزر و هیوای گەڕانەوە بوو بۆ لای پەلەکەی خۆی لە ڕۆست، دوای گواستنەوەی ئەوەی لە جبەخانەکەدایە بۆ بارەگا نوێیەکەیان لە پشتئاشان، کە نزیکەی دوازدە کاتژمێر بە پێ لەوێوە دوور بوو. ئەو شوێنەکەی زۆر بە باشی پێ دەزانی. چونکە جارێکیان وا ڕێك کەوتبوو پەلەکەی ڕۆست دژی دەستەکەی مام جەمال بجەنگێت، کە غەدری لە هەندێکیان کردبوو و ڕێککەوتننامەی هاوڕێیەتیی نێوانیانی هەڵوەشاندبووەوە. ڕەحمان باش دەیزانی ئەو شوێنە تەنها بە کەڵکی پیاوانی ئازا و جەربەزە و چووست و چالاکی ئەوتۆ دێت، کە پێیان بەسەر زەوی نەکەوێت.

پشتئاشان، ناوێکی سەیر و جوانە، وەکوو ئەو سرووشتەی کە پڕاوپڕە لە جوانی و نامۆیی. لە هاوینان ڕێك بۆ ئەوە باشە بکرێتە شوێنێکی پشوودان و هاوینەهەوارێکی گەشتیاری. بە جۆرێك دار مێوەکان قەدپاڵەکەیان داپۆشیوە و بە لق و چڵی دارەکانـدا هەڵگـژاون و شـۆڕ بـوونەتەوە، بەروبـوومی دار خۆخەکـانیش لەبەر تیشـکی هەتـاوەکە وەکـوو چلچرایەکـی پرشـنگدار دەبریسـکێنەوە. پیـرە دارگـوێزە زەبەلاحەکـانیش دەوروبەری خۆیان کردۆتە سێبەرێکی سارد و فێنك و خۆش، ناوەناوەش گوێزەکانی دادەبارێنە سەر ئەوانەی لەژێریدا پاڵیان داوەتەوە، نەخاسمە لە کاتی هەڵکردنی بایەکی بەهێز. لە وەرزی زستانیشدا گوێزەکان پێکەوە لەگەڵ باران دادەبارینە سەر زەوی. لە دارستانە چڕەکەی قەدپاڵەکـانیش سـوورە چنارەکـان باڵایـان بەیەکتریدا کـردووە و بەرەو ئاسـمانێ هەڵکشاون. زەویـیەکەش لەژێـر قەدپـاڵەکەدا کەمێـك فـراوانە، کەچـی لە ناکـاو وا بەرز دەبێتەوە خەریکە سەری لە هەورەکـانی ئاسـمانێ بـدات و وردە گیایەکان هێندە بە جوانی دایپۆشیونێ، هەر دەڵێی ئاوریشمن، لەو دۆڵەدا ڕووبارێك لە شاخە بەرزەکانەوە بە خوڕ دێتە خوارەوە و کەفوکوڵ و خوڕەی قەڵبەزەی سەرنج ڕادەکێشێت، کـاتێکیش ئاوە ساردە سەهۆڵاوییەکەی بەر تاشەبەردەکانی ئەملا و ئەولای دەکەوێـت، دەبێـتە پڕووشـە و بە سـەر دار و درەخـت و گیـای هەردوو بەری ڕووبـارەکە پەرشـوبڵاو دەبێـتەوە، ئەو جۆشوخرۆشـەی کـپ نـابێتەوە تـا نەگـاتە زەویـیە تەختاییەکـان، ئاوێکە پاك و بێگەرد و سارد و کەللەتەزێن.

"پشتئاشان"، لە جوانیدا، بەهەشتێکە لە جوانی و دۆزەخێکیشە وەکوو شوێنەکەی.

ئەوان بە سەما و گۆرانییەوە بارەگاکانی خۆیان لە ناوزەنگ

چـــۆڵ کـــرد و بە هەڵـــپە خۆیـــان گەیانـــدە بەهەشـــتە چاوەڕوانکراوەکەیـان و خەنـدە و پێکەنینـیش لە ڕوخسـاریان دەباری.

دوای کۆچەکەیـان دۆڵەکە کـپ و هـێمن بـووەوە، ئیـدی ڕەحمـان دەسـتی بە پـۆلینکردنی چەك و تەقەمەنییەکـانی نـاو جبەخـانەکەی کـرد، تـاکوو بە ئاسـانی کـرداری گواسـتنەوەیان ئەنجـام بـدات، دوای ئەوەی ڕووی لە کارخـانە هەژارانەکەی دەکرد و بە کەرەستە سادە و ساکارەکانی کـاری تێـدا دەکـرد، تـاکوو لە ئەنجـامی سـەرنجدانی زۆر چـاوی دەسـتی بە ژان کردەوە. پاشان بە تەنها دادەنیشـت و لە خەیـاڵ و بیرکـردنەوەدا ڕۆ دەچووە قووڵایی شتەکان. کـاتێکیش وەختـی نـانی نیوەڕۆ دەهات، ئەو زۆر جار لە بیـری دەکـرد، خۆیشـی هۆکـارەکەی نەدەزانـــی، بـــۆیە بە ناچـــاری و لە برســـان ڕووی دەکـــردە چێشـــتخانەکە و ئەوانەی بەر لەوی گەیشـــتبوونە ئەوێ کـــاری خۆیان کردبوو، ئەویش بە نابەدڵی نانێکی بە دەستەوە دەگرت و لەو برنج و چایەی ئەگەر تۆزێکیان تێدا مابێتەوە، برسێتیی خۆی دەشکاند و گەدەی بەتـاڵی بێـدەنگ دەکـرد. ئینجـا دەگەڕایەوە کارخـانە و جبەخـانەکەی و لەوێ لەسـەر گـازەرای پشـت لێـی ڕادەکشـا و خەیـاڵ و بیرکـردنەوە بە هەزار و یەك بیرۆکەیانـدا دەدا، لەوەی چی بکات و چی نەکات؟!

# بەشی چواردەیەم

ڕۆژی دواتـــر ڕەحمـــان لە چێشـــتخانەکە گـــوێی لە دەنگەدەنگێك بوو، دەمەقاڵێکە لەگەڵ کارگێڕەکەی بارەگا بـوو، کاتێك گەیشتە ئەوێ، بینی کەسێك بە تـووڕەیی و پرتەوبـۆڵەوە لەوێ دەرچوو، کارگێڕەکەش هەڕەشەی لـێ دەکـرد و دەسـتی لێ ڕادەوەشاند. دوای چەند چـرکەیەك ئەو کەسـەی بەزمەکەی ساز کردبوو بە مرومۆچییەوە لەگەڵ ڕەحمان دانیشت و ئەویـش پێی گوت:

- پێبکەنە هاوڕێ، ئەمـڕۆ بەهـاری لەنـاو لەپـی خۆیـدا بـۆ هێناوین. باش دەزانم کە تووڕەیت و نانی سبەینانیش لەم کاتەدا نادرێت، خۆ ئەگەر منـیش کـارگێڕی بارەگـا بوومـایە هەرچـی خواردنی زیـادە هەیە فـڕێم دەدایە نـاو ڕووبـارەکە و نەمـدەدایە هەر کەسـێك درەنـگ لە خەو هەڵبسـتێت، ئـاخر یـازدەی پـێش نیوەڕۆیە. بۆ نازانی درەنگهەستان سووکایەتییە بە وەرزی بەهار؟!

ئەوەی تـر لە کاتێکـدا لەپـی دەسـتی چەپـی بەنـاو لەپـی دەستی ڕاستیدا دەکێشا و دەیگوت:

- من تووڕە نەدەبووم ئەگەر خواردنەکەیشی پـێ نەدابـام، بەڵام با بە پیاوانە پێم بڵێ، وەلێ ئەو هاوارم بەسـەردا دەکـات و بە دەنگێکی توند و لەخۆباییانەوە پێم دەڵێت: "بۆچی درەنگ لە خەو هەسـتایت؟!" گەمـژەیە وا دەزانێـت منیـان بەو سـپاردووە. دوای خولەکێـك یەکێـك لە پیرەکـان هـات و خـواردنەکەی بەدەسـتەوە بـوو بـۆی هێنـابووی و بـردیە نـاو خێوەتەکەشـەوە،

لەوەش زیاتر لەو کاتەی نانەکەی دەخوارد گوتی: ئەریّ تۆ لە ژیانتدا هەڵسوکەوتی نامۆ و سەیری وات بینیوە؟!

- من هەموو شتێك لێرە زۆر سەیر و نامۆ دەبینم. بۆ نموونە تۆ بە چاوی خۆت تەماشای ئەو سندووقە شێواوانە بکە. بە ڕاستی ئەگەر هاوڕێیانی ڕۆست ئەوهایان دەبینی، خوایان نەدەما و لە تووڕەییدا دۆ و دۆشاویان تێکەڵ دەکرد، ئاخر کەی ڕەوایە ئەم هەموو تەقەمەنییەمان هەبێت و ئاوا بە ئاسانی ژەنگ لێیان بدات و بێکەڵك بن؟! لە کاتێکدا لەویّ فڕۆکە بەسەر سەرمانەوە خەریکە چاومان دەردەکات و ئێمەش تەنها کەمە فیشەکێکمان هەیە. باوەڕ بکە ئەگەر ئەم هەموو تەقەمەنییەمان دەبوو، لەو شەڕانەی ڕابردوو هەر دەبووایە کۆپتەرێك بخەینە خوارەوە. ئاخر جارێکیان پێشمەرگەیەکمان تەنها بە دە گوللە دۆشکە، یەکێکیانی پێکا و ئەوەی لەناو کۆپتەرەکەوە دەستڕێژی لیّ دەکردین بکوژێت، تەنها بە تەقاندنی دە گوللە دۆشکە، نەك زیاتر! ئەوەش لە ترسی ئەوەی نەبادا فیشەکی تەواو بێت. دوای ئەوە گوندنشینەکان گێڕایانەوە کە: "کۆپتەرەکە لە نزیکترین شار نیشتۆتەوە و لە کار کەوتووە و سەربازەکان بە پارچە چادرێك دایانپۆشیوە. بۆ ماوەی چەندین مانگیش بەو شێوەیە ماوەتەوە. لەوانەشە دواتر پارچەپارچەیان کردبێت". ئەو کاتەی پێشمەرگەکەمان دەستڕێژی لیّ کرد و پێکای دووکەڵێکی ڕەش بەری ئاسمانی گرت و بە پەلەپرووزیّ هەڵات و ئاسمانی ناوچەکەی جیّ هێشت، فڕۆکەکانی دیکەش بە هەڵەداوان هەڵاتن، لە ترسی ئەوەی نەبادا چەکی دژە فڕۆکەی زیاترمان پیّ بێت و دڵ و دەروونیان دەربهێنین. تۆ سەرنج بدە، تەنها بە دە گوللە دۆشکە و هیچی تر! من هەست بە نیگەرانی و دڵگرانی ناکەم کاتێك فیشەکمان نەبێت، بەڵام ئەو کاتە هەست

بە شەرمەزاری دەکەم کە هەمانبێت و نەزانین چۆن بەکاری دەهێنین و پارێزگاری لێ بکەین.

کەسەکەی تر باوێشکی دەدا و بە ڕاشکاوانە و پەرۆشەوە گوتی:

- تەنها پێشمەرگە نرخ و بەهای چەك و تەقەمەنی دەزانێت، بەڵام لێرە، ئێمە جگە لە گەشتیارێك، یان شوانێك، یاخود کورە تۆ بڵێ هەتا قۆشمەچییەك بەولاوە هیچی تر نین.

ڕەحمان دەستی پێ کردەوە و درێژەی دایە قسەکانی:

- لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە دڵخۆشین بەوەی ئەو چەکە کۆنەمان بەو فیشەکە کەمانەیەوە بەدەست هێنا. ئەو ڕۆژانەی ئەو جۆرە چەکە کاریگەرە دژە فڕۆکانەمان نەبوو، ڕژێمیش بەو دەستەپاچەییەی ئێمەی دەزانی، ئەو کاتە فڕۆکەکان بوێریی ئەوەیان تێدا بوو دابەزنە سەر درەختەکان و لە پەنای تاشەبەردەکاندا بەدوامانەدا بگەڕێن. ئاخر ئەوانە هەرگیز لە ڕەگەزی مرۆڤ نین. بە ئاشکرا دەمانبینین، لەو کاتانەی مووشەکە سووتێنەر وماڵوێرانکەرەکانیان ئاراستە دەکردین، لەگەڵیدا پێمان پێدەکەنین و بە ئاگری چڕی چەکەکانیان کێومالی شاخەکانیان دەکرد، ئەوانە نارنجۆکی دەستی زۆر و بێئەندازەیان لە ئاسمانەوە بۆ دەهاوێشتین، ئەوانە هەرگیز دەستبەرداری ئەو دڕندایەتییەیان نابن و سوکنایی ناخیان نایەت، هەتا بن بەرد و دارەکانی لێ پڕ نەکەن. جگە لە کاولکاری و خوێن بەولاوە هیچی تر نابینن. چەکە سووکەکانی دەستمان کاریگەریی ئەوەیان نەبوو فڕۆکەکان بترسێنن، بەڵکوو هەتا توانای بڕینی جامی کۆپتەرەکانیشیان نەبوو. گوللەی چەکەکانی ئێمە ڕێك لە وردە بەرد دەچوو کاتێك بەر بارستایەکی زۆر

گەورەی ئاسن بکەوێت... تۆ سەرنجدە... ئەم فیشەك و تەقەمەنییانەی ئێمەش لێرە بوونەتە خۆراکی شێداری و ژەنگ، بە ڕاستی حەیفیێ!

ڕەحمان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و سەرنجی دابووە پێش خۆی، بەڵام هزر و یادگەی بەرەو دوورتر تەی بووبوو و هەنگاوی دەنا. ئینجا قسەکانی تەواو کرد و گوتی:

- ئەو فڕۆکەوانانە بە فڕۆکەکانیانەوە ئارەزووی مێوانداریيان دەکردین، زیرەکوشتیانە جەم و دەمیان نەبوو، هەر کاتێك زەوقیان هەڵبستابووایە، گەڕێك بەسەرماندا دەسووڕانەوە و مووشەك و گوللەبارانیان دەکردین، ئێمەش لە پێشوازیکردنیان ڕاهاتبووین، وێڕای سادەیی و سووکیی چەکەکانمان و کەمی فیشەك بەخێرهاتنێکی گەرممان لێ دەکردن، لەو ڕووبەڕووبوونەوانەی نێوانمان ڕۆژێك بە تەواوی وركیان لێ گرتین و بڕیاری سووتاندنیان داین، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێکی بەردەوام و لەسەر یەکتری بە مووشەك دار و بەردیان بەسەردا تاواندینەوە، ڕق و کینە و نەفرەتی خۆیان بەسەر ئەو خاکە سەوز و جوانەدا باراند. لەو شەوە ئەنگوستەچاوەدا بە بڵێسەی ئاگری مووشەکەکانیان هەرچی جوانییەك لە بەردەمیاندا هەبوو هەڵیانکرووزاند و شێواندیان، هەڵبەتە دەبێ ڕاستی بگوترێت: بە ڕاستی تابلۆیەکی جوانیشە، ئاخر لەو شەوە ئەنگوستەچاوەدا ئەو شاخە بە بەرد و دار و درەختییەوە لە تابلۆیەکی ڕۆمانسیی قەشەنگ دەچوو، ناخی مرۆڤی بە بریسکەو بڵێسە ڕەنگاڕەنگەکانی خۆش دەکرد و جۆش دەدا. بەڵام دەبێ ئەو جوانییە بۆ سبەینێ چی لەگەڵ خۆیدا بۆ هەڵگرتبین؟!

هەڵبەتە هیچ شتێك نا، جگە لە کاولکاری و ماڵوێرانی!

هەرچی لەسەر زەویدا هەبوو لەو دەوروبەرە هەموویان کردبوو بە قەرەبرووت. هەتا ئاسمانی ناوچەکەشی بەو دووکەڵە چڕ و ڕەشەی داپۆشیبوو، هێندەی نەمابوو بینەقاقای تیشکی خۆریش بگرێت و تیشکە جوانەکانی خۆر پەرشوبڵاو بکاتەوە و ڕێگەی هاتنیان لێ بگرن. بۆنی چڕەدووکەڵ و سووتانی تەڕ و وشك پێکەوە فرمێسکی لە چاوان دەچۆڕاند و بۆنکرووزی گۆشتی هەڵقرچاوی گیانلەبەرانی بێدەسەڵات و گەڵا و قەدی نەمامە سەوزەکان، کوونە لووتی دەچزاندەوە. درەختە باڵابەرزەکانیش لە حەژمەتی بڵێسەی ئەو گڕەی لە جەستەیان هەڵایسابوو بە جیاوازیی جۆرەکانیانەوە باوەشیان بە یەکتریدا دەکرد و بەو گڕەی لە باڵایان بەربووبوو لەناو یەکتریدا هەڵدەقرچان و مەراسیمی مەرگی خۆیان ساز دەدا، خۆشاوی بەری درەختە سووتاوەکانیش شلەیەکی لینج و گەرم، کتومت لە خوێنی تازە ڕژاوی شەهیدێك دەچوو. ئەو ئاژەڵانەی بەختیش یاوەریان بوو، مردن پەی بە ڕۆحی نەبردبوون، تۆقیبوون و هیچ پەناگەیەك نەیدەگرتنەخۆ، بە ناچاری و قاچ و ژێر پێی سووتاوەوە لە هەڵبەزودابەزێکی خەماویدا بوون، منداڵانی گوندە نزیکەکانیش وایان دەزانی قیامەت ڕابووە و خودا پەرژین و شوورای بۆ شاخەکان دروست کردووە و پاسەوانی بۆ داناون، تاکوو هیچ کەسێك بەملا و بەولادا ڕانەکەن. دیمەنی ئەو منداڵەش کە بە دیار لاشەی کۆترە پەڕوباڵ هەڵکرووزاوەکەیەوە دەگریا، گریانێکی وا هەموو مرۆڤایەتی دەخستە ژێر پرسیارەوە. ئەو منداڵە ناخ سووتاوە بە حەسرەتەوە لەبەرخۆیەوە دەیگوت: "ئاخر ئەمە باڵندەیەکە دەبێ چ تاوانێکی ئەنجام دابێت، بۆچی خودا بەو جۆرە ئاگری تێ بەرداوە؟ وا پێ دەچێ خوداش جیاوازی لە نێوان ستەمکار و ستەملێکراو نەکات". لەوانەیە ئەو کەسەی وا دەڵێت، بە ناچاری و لە ترسان داوای لێبووردنیش لە

خوا بکات، چونکه وەك دەڵێن خودا هەتا ئاگاداری نیازی ناخ و دڵی مرۆڤەکانیشە، وەك داپیرە بەتەمەنەکان دەیلێن، کاتێك چیرۆکەکانمان بۆ دەگێڕنەوە.

ئەوەی لەگەڵ ڕەحمان دانیشتبوو بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

- بۆ...؟! ناوچەکەتان ئەوەندە مەترسیدارە؟! باشە، ئەی پەرچەکرداری دانیشتوانی گوندەکان چی بوو؟!

کاتێك ئاگر لەگەڵ بایەکەدا هەڵی کرد، هەندێك لە جووتیاران هاواریان دەکرد: "با ئەم شاخە نەفرەتییە بەجێ بهێڵین و خۆمان دەرباز بکەین، ئاخر ئەم ئاگرە هیچمان بۆ ناهێڵێتەوە و تەڕ و وشك پێکەوە سووتماك دەکات". هەندێکی دیکە هاواریان دەکرد و ڕوویان لەوانە بوو خەریکی ڕۆیشتن بوون: "بگەڕێنەوە خاکەکەمان بۆ دەمێنێتەوە، ئاگرەکە تەنها گژوگیا و دار و درەختەکان لەناو دەبات، خاك پیرۆزە نابێ بەجێی بهێڵین".

فڕۆکەکانیش بە ئاسمانەوە دێن و دەڕۆن، تا هەرچییەکیان لە هەناودا هەڵگرتووە بەسەر سەرمانیدا بیارێنن. دوای بەتاڵکردنی ئەو بۆمبایانەی هەڵیانگرتووە دەچنەوە لای باوە گەورەیان و پۆلە فڕۆکەیەکی دیکەی زیاتر تینوو بە خوێن لەوانەی پێشوو دێن و دەردەکەونەوە. شەپۆلی هەناردەکردنی نێوان فەرماندە و پۆلە فڕۆکەکەیمان لە ڕێگەی ڕادیۆیەکی ئاسایی شەپۆلی کورتەوە گوێ لێ دەبوو، گوێمان لێ بوو فەرماندەکەیان بە هەست و سۆزێکی سادیزمانەی پڕ لە جۆشەوە بانگی پۆلە فڕۆکەوانەکەی دەکات: "پێم گوتن یەك بستە خاکی سەوز مەهێڵنەوە. هەموو شتێك بسووتێنن. هەرچی مەڕوماڵاتیش هەیە بکەنە قەرەبرووت، ڕەشماڵەکانیان بەسەردا بسووتێنن، هەر جووڵەیەکتان بینی لە جووڵەی بخەن، نامەوێ لێرە زیندەوەرێك بە زیندوویی بمێنێتەوە.

هەموویان بکوژن و قڕیان بکەن، هەتا زیندەوەرەکان و دار و درەخت و گژوگیاش".

- هەر بە ڕاستی ئەمانە تینووی خوێنن و تێر نابن و نابن.

ئەوەی لەگەڵی دانیشتبوو بە ناولەپی دەستی ڕاستی پەنجەکانی دەستی چەپی یەك لە دوای یەکتر دەتەقاند و قرچەی لێوە دەهێنان، هەمان گەمەی بە پەنجەکانی دەستەکەی دیکەشی دەکرد.

ڕەحمان پرتەوبۆڵەیەکی لێوە هات و لە قرچەقرچی پەنجەکانی هەستی بە بێزاری دەکرد، لەگەڵ ئەوەی خۆیشی دەستی بە هەمان پەنجەتەقاندن کردەوە و لەبەرخۆیەوە گوتی:

- ئاخر ئەوانە نەخۆشن نەخۆش... نا نا شێتن شێت! هەڵبەتە ئەوانە لەژێر کاریگەریی مادە هۆشبەرەکاندان. گرنگ ئەوەیە دوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك ئاگرەکە دادەمرکێتەوە و هێمنی باڵ بەسەر ناوچەکەدا دەکێشێتەوە، درەختە گەورەکانیش بوونەتە کۆمەڵێك داری سووتاو و خۆڵەمێش و ڕەژوو، کاتێك شاخەکان بەرگی ڕەشی ماتەم دەپۆشن، دیمەنێکی ناخ هەژێنی ئەوتۆ دێتە ئاراوە، لە ناخەوە مرۆڤ دادەڕووخێنێت، ڕێك تابلۆیەکی تراژیدیای پڕ لە مەرگ و کارەسات.

هاوڕێکەی ڕەحمان سەری بادا و ئەویش بە منگەمنگەوە گوتی:

- بە ڕاستی ئەوەی گوتت لە شوێنی خۆیدا بوو.

ڕەحمان بە جۆش و جۆرێك لە شانازیشەوە لە گێڕانەوەی ئەوەی پەلەکەی ڕۆست تووشی هاتبوون دەگێڕایەوە.

لەو کاتەی ئەوەی لەگەڵی دانیشتبوو، تیلەی سەرنجی لەو

هەموو چەکە لەکارکەوتووە گرتبوو، لە ڕەحمانی پرسی:

- ئەرێ بە ڕاست تۆ توانای چاککردنەوەی ئەم هەموو چەکەت هەیە؟!

ڕەحمانیش سەرنجێکی چەکەکانی دا و بە نابەدڵی و بێزارییەوە گوتی:

- هەڵبەتە نەخێر... ئەوەی بە من دەکرێت ئەوەیە هەندێکیان دەکەمە پارچەی یەدەك و لەو چەکانەی دەبەستم کە زیانیان بەر نەکەوتووە، واتە هەندێکیان دەکەمە قوربانی هەندێکی دیکەیان.

هاوڕێکەی گوتی:

- `واتە وەکوو ئەو پزیشکەی گورچیلەیەکی تێکچوو بە گورچیلەیەکی دروست دەگۆڕێت؟!

ڕەحمان بە پێکەنینەوە گوتی:

- ڕێك وایە، ئەمە نەخۆشخانەی منە و ئەو چەکانەش نەخۆشەکانم. من ئێستا کاری پزیشکیی تفەنگ دەکەم.

ꕤꕤꕤꕤꕤꕤꕤꕤ

هاوڕێکەی دوای ئەوەی ماوەیەکی باش بە قەدپاڵی خەیاڵدا ڕۆچووبووە خوارێ، پرسیاری کردەوە:

- ئەرێ بە ڕاست مرۆڤ دەتوانێ نەمرێت؟!

- ئەوە چۆن دەبێت؟! لەم کاتەدا ئەو پرسیارەت لە کوێوە هێنا؟!

- مەبەستم ئەوەیە هەر کاتێك ئەندامێکی جەستەی پەکی کەوت بە ئەندامێکی ساغی دیکەی بگۆڕنەوە.

ڕەحمان ئەو پرسیارەی بە دڵ بوو، گوتی:

- لەوانەیە تەمەنی مرۆڤ درێژ بکاتەوە، بەڵام لە کۆتاییدا هەر دەبێ بمرێت.

- بۆچی دەمرێ مادام ئەندامەکانی جەستەی تەندروستن؟

- لەبەر ئەوەی هەندێك ئەندام هەیە ناکرێ بگۆڕدرێت؟

- لەوانەیە ئەمڕۆکە نەتوانین بیانگۆڕین، بەڵام نەوەکانی داهاتوو لەوانەیە بتوانن ئەوە بکەن، ئایا مرۆڤ هەتاهەتا دەتوانێ بژیێت؟

- باوەڕ ناکەم... لەبەر ئەوەی ئەو ئەندامانەی دەشیانگۆڕێت پەکیان دەکەوێت و بە تێپەڕبوونی کات پیر دەبن و دەمرن.

- ئەوە دەزانم، بەڵام مەبەستم ئەوە بوو مرۆڤ دەتوانێت هەر کاتێك ئەندامەکانی جەستەی پەکیان کەوت بیانگۆڕێت.

- لەوانەیە، بەڵام ئەی چی لە عەقڵ دەکەیت... عەقڵیش بە تێپەڕبوونی کات پیر دەبێت و دەمرێت، بەمەش هەموو ئەندامانی جەستە لەگەڵیدا دەمرن.

- کەواتە عەقڵیش دەگۆڕین. هەرچەندە ئەگەر لە ئێستادا کرداری گۆڕینی عەقڵ لەوپەڕی ئاڵۆزی و مەحاڵدا بێت، لەوانەیە لە ئاییندەیەکی دووردا ببێتە شتێکی زۆر ئاسایی.

- ئەمە نابێت.

- لە ئاییندەدا دەبێت.

ڕەحمان گوتی:

- مەبەستم مەحاڵبوونی گۆڕینەکە نییە، چونکە تەکنیکی

زۆر پەرەسەندوو هەن، لەوانەیە لە ئایندەدا کاری موعجیزە ئەنجام بدەن. بەڵام گۆڕینی مێشك، ئەمەیان زۆر ئەستەم و قورسە، چونکە کەسەکە دەمرێت و ئیدی تەواو.

- بۆچی دەمرێت ئەگەر کرداری گۆڕینەکە سەرکەوتوو بوو؟

- لەبەر ئەوەی مرۆڤە نوێیەکە، دوای گۆڕینی مێشکی، مرۆڤە کۆنەکە نامێنێت و دەبێتە مرۆڤێکی تازە. چونکە ئەوە جەستە نییە کەسایەتیی مرۆڤ دەستنیشان دەکات، بەڵکوو خەیاڵێتی.

- ئەوە چۆن دەبێ! ئایا دەبێتە کەسێکی دیکە؟

ڕەحمان بە شێوازێکی کۆمیدیانە، دەرفەتێکی فراوانی بۆ مێشکی ڕەخساند، تاکوو لە هزر و خەیاڵان ڕۆ بچێت و هەر بەو خەیاڵەوە گوتی:

- تۆ بیر لەوە بکەوە، گریمان خێزان و خانەوادەی هەردووکمان گوێبیستی ئەوەبوون، لە یەکێك لە شەڕەکان برینداربووین، هەردوولایان بە هەڵەداوان ڕوویان لە شاخ و نەخۆشخانەکە کرد و خۆیان گەیاندە لامان، لەوئ ئانوساتەدا دکتۆر سەرقاڵی ئەنجامدانی نەشتەرگەری مێشك بوو بۆ هەردووکمان. هەڵبەتە لە نەخۆشخانە دەبێتە هەراوهوریایەك سەگ ساحێبی خۆی ناناسێتەوە، ئەندامانی خێزانی هەردوولامان لە پەرۆشییان بۆ ئێمە دەیانەوێ بێنە ژووری نەشتەرگەرییەوە، دکتۆریش لە بەر پەرۆشیی گیانی ئێمە و هەستیاریی دۆخەکە و نەشتەرگەییەکە و دەستێوەردانی خزمان تووڕە و بێزار دەبێت و وەکوو فیشەکەشێتە بە ئاسماندا دەچێت، مشار و چەقۆ و پێداویستییەکانی دیکەی نەشتەرگەری دەداتە لاوە و ڕوو لە

خێزانەکانمـان دەکـات و بە هێمنیـیەوە ئامۆژگارییـان دەکـات، بەوەی کەمێك ئارامی بنوێنن و کارەکەی لێ تێك نەدەن، نەبادا بیری پەرتوبڵاو بێت و لە نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو نەبێت. ئامۆژگاری و پێشنیاریان بۆ دەکات بچنە لای پەلی مێوانخانەکە و لەوێ ئەگەر هەبوو ژەمەنانێك بخۆن و کەمە پشوویەك بـدەن، تـاکوو نەشـتەرگەرییەکە تەواو دەبێـت، ئەنـدامانی خێزانـی هەردوولاشمان بەوە ڕازی دەبـن و ڕوو لە مێوانخـانەکە دەکەن، دکتـۆریش دەگەڕێـتەوە سـەر کـارەکەی و هاوسـەرەکەی و دەرمانسـازەکەش یـارمەتیی دەدەن، خـۆ ئەگەر پێویسـتیی بە یـارمەتیی زیـاتر هەبـوو، ئەوا داوای هاوکـاری و یـارمەتی لە چێشتلێنەری مێوانخانەکەش دەکات، چونکە نزیکترین کەسە لە نەخۆشخانەکەوە. ئا ئەوەتانێ دکتۆر بە هەر هۆیەك لە هۆیەکـان مێشکی منی دەرهێناوە و داویەتییە دەست دەرمانسازەکە، تـاکوو لەسـەر تەختـانجەی ژوورەکەی دایبنێـت. لە هەمـان کاتیشـدا کەللەسـەری تـۆی کـردۆتەوە و مێشـکی تۆیشـی دەرهێنـاوە و داویەتییە دەست دەرمانسازەکە، تاکوو ئەوەی تـۆش لە تەنیشت ئەوەی مـنەوە دابنێـت، بەڵام دەرمانسـازەکە لە بیـری دەچێـت ناومـان لەسـەر مێشـکمان بنووسێت. کـاتێکیش کـاتی ژەمـی نـانخواردنی نیـوەڕۆ دێـت و گوێیـان لە کـارگێڕیی پەلـی مێوانخـانەکە دەبێـت، کە بە دەنگـی بڵنـد هـاوار دەکـات و هەڕەشـەی ئەوە دەکـات و دەڵـێ: هەر کەسـێك لە کـاتی نانخواردن دوا بکەوێت دوایی بەشی نامێنێت و گلەیی نەکات، ئۆباڵی خۆی بە ملی خۆی. ئیدی دکتـۆر و تیمـی کـارەکەی هەموو پێکەوە بە خێرایـی ڕوو لە نـانخواردن دەکەن. لە کـاتی گەڕانەوەشیان هەر یەکە و پەرداخە چای خۆی بە دەسـتەوەیە و دەگەڕێنەوە سـەر کارەکەیـان و کەللەسـەرە بەتاڵەکـان خـاوێن دەکەنەوە، دکتـۆر داوا لە دەرمانسـازەکە دەکـات مێشـکی منـی

بداتێ، لەبەر ئەوەی دەرمانسازەکە لە بیری چووبوو ناومان لە سەریان بنووسێت، هەڵەیەکی گەورە دەکات و مێشکی تۆی دەداتێ. دکتۆریش بێ سێ و دوو دەیخاتە ناو کەللەسەری منەوە، کاتێك دکتۆر بە ئارەقەی ڕەش و شینەوە لە کارەکەی تەواو دەبێت، دەموچاوی خۆی دەسڕێت و ئۆخەیەك دەکات، ئینجا ڕاستەوخۆ داوا لە دەرمانسازەکە دەکات بە هێمنی ئەو مێشکەی لەسەر تاقەکە ماوەتەوە بیداتێ، کە گوایە مێشکی تۆیە، وەلێ لە ڕاستیدا ئەمەیان مێشکی منە. دکتۆر تا ئەو کاتە هەتا ڕێگەی بە هاوسەرەکەشی نەدابوو دەست لە نەشتەرگەییەکەی وەربدات، بەڵکوو هەتا دەرفەتی ئەوەی نەدابوو پەنجەکانیشی بەر مێشکمان بکەوێت... هەڵبەتە تۆ باش دەزانیت، ئەم جۆرە نەشتەرگەرییانە زۆر هەستیارن، دیارە دوای ئەوەی دکتۆر مێشکی من وەردەگرێت و بە ئاسپایی دەیخاتە ناو کەللەسەری تۆوە.

لە ڕۆژی دواتر، کاتێك کەسوکارەکانمان لە بەردەم دەرگای نەخۆشخانە لە چاوەڕوانیدا بوون، دکتۆر بە زەردەخەنەیەکەوە چووە لایان و مژدەی سەرکەوتنی نەشتەرگەییەکەی پێ دان و پێی گوتن: ئێستا ئەوان دێنە لاتان، تاکوو سڵاوتان لێ بکەن، تکامان وایە نەرمونیان و ڕووخۆش بن لەگەڵیان، چونکە هێشتا برینەکانیان ساڕێژ نەبووەتەوە. ئەی دوای ئەوە چی ڕووی دا؟ ئێستا پێت دەڵێم چی ڕوویدا!

باوکی هەردووکمان باوەشیان بۆ کردبووینەوە، تاکوو لە ئامێزمان بگرن، ئەوان ڕوو لە ئێمە و ئێمەش ڕوو لەوان بە باوەشکردنەوەوە هەنگاومان دەنا، لە بەر پەرۆشیی زۆرمان من و تۆ سەرنجی ڕوخساری یەکتریمان نەدا، ئەگەرنا کارەکەمان ئاشکرا دەکرد. هەر کە گەیشتینە لایان لەناو سەرسامیی

هەمواندا من باوەشم بە باوکی تۆ و تۆش باوەشت بە باوکی مندا کرد. تۆ بووبوویتە من و منیش بووبوومە تۆ. سەیرە! لەو چرکەساتەدا دکتۆر پەی بە هەڵە کوشندەکەی خۆی برد کە تێی کەوتووە. پاشان ئاوێنەی بۆ هێناین تاکوو سەرنجی ڕوخساری خۆمان بدەین، وای چ کارەساتێکی گەورە بوو، کاتێك ڕوخساری خۆم بینی هی خۆم نەبوو؟! بە پەرۆشەوە سەرنجی تۆم دەدا، چی ببینم ئەوە جەستەی خۆمە و لەبەردەممدایە و لە خودی خۆم جوودا بۆتەوە. ئەو کاتە هەستم بەوە کرد کە جەستەی تۆ خەریکە دەمپێچێتەوە و لوولم دەدات، دڵنیام تۆش هەمان هەستت هەیە، هەڵبەتە تۆش هەستت بەوە کردووە کاتێك سەرنجت لە جەستەی خۆت داوە کە لە خودی خۆت جوودابووەتەوە، جەستەی منیش تۆی لوول داوە، ئیدی هەموومان سەرزەنشتی دەرمانسازەکەمان کرد، کە دەبووایە کەمێك ئاگای لێمان بووایە و ناومانی لەسەر مێشکمان بنووسیبووایە!

کەیف و زەوقی هاوڕێکەی بەو چیرۆکە کەمێك باشتر بوو، دڵی کرایەوە، بە دەنگێکی گاڵتەئامێزانە و کەمێك شێلگیرانەوە گوتی:

- هەڵەکردن لە بواری پزیشکیدا هەیە و ڕوو دەدات، دەگێڕنەوە جارێکیان نەشتەر و مقەسێك لەناو سکی نەخۆشێکدا جێ دەمێنێت، دکتۆر ئاگای لێ نابێت و هەستی پێ ناکات، تەنها دوای دوورینەوەی سکی نەخۆشەکە نەبێت، ئەمەش لە نەخۆشخانەیەکی بەناوبانگ ڕووی دابوو.

ڕەحمانیش بە دەنگێکی شێلگیرانە و بە فیکەیەك و سەرسوڕمانەوە گوتی:

- مقەسێك و نەشتەرێك لە بیر دەكات؟!

هاوڕێكەی بۆی تەواو دەكات:

- ئەمە لە نەخۆشخانەیەكی پێشكەوتوو ڕووی دا! ئەی چی بە نەخۆشخانەكەی خۆمان دەڵێیت، كە كارگێڕەكە هەڕەشەی بێبەشكردنی خواردن لە هەر كەسێك دەكات ئەگەر لە كاتی دیاریكراوی ژەمەكە دوا بكەوێت، بە خودی دكتۆر و دەرمانسازەكەیشەوە؟!

ڕەحمان گوتی:

- بگەڕێینەوە سەر بابەتەكەی خۆمان.

هاوڕێكەی كە لە تەنیشتی دانیشتبوو بەرهەڵستی دەكرد و بە بێزارییەوە:

- كامە بابەت؟ ئایا شتێك ماوە دوای چیرۆكە كارەساتئامێزەكەت باسی بكەین. مێشكمان لەناو كەللەسەرمان دەردەكەیت و لەسەر تەختانجەی ژوورەكەی دادەنێیت و دەتەوێ دەرمانسازەكە بە خەڵووز هەر یەكە و ناوی خۆمانی لەسەر بنووسێت و ئێستاش دەڵێی بگەڕێینەوە لای بابەتەكەی خۆمان؟! واز بێنە هاوڕێ واز بێنە، ئەوە چ بابەتێكە تۆ دەستبەرداری نابیت.

ڕەحمان جارێكی تر گوتییەوە:

- یەكەم من نەمگوتووە دەرمانسازەكە بە خەڵووز ناومان لەسەر مێشكمان بنووسێت. من مەبەستم بوو بە پێنووس بینووسێت... هەر قەڵەمێك بێت، زیانی نییە، پێنووسی جاف، یان دار، بەڵام نەك بە ڕەژوو. چییە پێت وایە لە چاخە بەردینەكاندا دەژین؟! بەهەرحاڵ! ئەو بابەتەی ویستم لەبارەیەوە بدوێم،

ئەوەبوو ئایا مرۆڤ دەتوانێت بۆ هەتاهەتایە بژیێت و خۆی لە مەرگ و مردنی هەمیشەیی ڕزگار بکات؟ ئەوە پرسیاری تۆ بوو، من هێشتا وەڵامی تەواویم نەداوەتەوە.

- چ قەیدی، ئەمە بابەتێکی خۆش و سەرنجڕاکێشە، دەبێ وەڵامی تۆ چی بێ؟

- بیرۆکەیەك لە مێشکمدا برووسکەی دا و ڕێگەی ئەوەم پێ دەدات کە بڵێم بەڵێ، مرۆڤ دەتوانێت بۆ هەتاهەتایە بژیێت. ئێستا بۆت باس دەکەم چۆن؟! ئاخر دوارۆژ پەرچووی زۆری بۆ هەڵگرتووین، کە لە ئێستادا پەی بە ناوەڕۆکەکانیان نابەین.

- پێم نەڵێی گۆڕینی مێشکەکان.

ڕەحمان قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- نا نا... گۆڕینی مێشك وا لە مرۆڤ ناکات هەتاهەتایە بژیێت، لەبەر ئەوەی جەستە و مێشك زۆر نابات پیر دەبن و کۆتاییان دێت و لە کار دەکەون، خۆ ئەگەر کرداری گۆڕینی مێشك چەندین جار دووبارە بکەینەوە دوای ئەوەی پێشتر، ئەمەشیان کۆتایی دێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مێشکە نوێیەکە تەواوکەری ئەوەی پێش خۆی نابێت. لەبەر ئەوەی تازەکە کەسێك و قەوارەیەکی دیکە دەبێت و هیچ پەیوەندیی بەوەی پێش خۆیەوە نابێت. بیرۆکەکە لەوپەڕی سادەیی و ئاڵۆزیشدایە.

- دەی بیڵێ بزانم، دڵنیام واز لەم بابەتە ناهێنیت!

- تەنها تۆزێك ئارام بە... گوێ بگرە... ڕاڤە و باسی کردارێکی کیمیایی ناکەم کە لە مێشکدا ڕوو بدات و سەرجەم هەستەوەرەکان دروست بکات و ڕەفتاری کەسەکەش

دەستنیشـان بکـات، لەبەر ئەوەی نـایزانم و هیچـی لـێ تێنـاگەم. وەلــێ دەڵــێن خەمــۆکی بــریتییە لە کــارلێکی کیمیــایی و خۆشەویستی و شادیش.

- بەڵێ پێشتر دەربارەی ئەم شتانەم لە گۆڤارە زانستییەکاندا خوێندۆتەوە.

ڕەحمان دوای بێدەنگییەکی کورت هاتەوە دەنگ و دەستی بە شرۆڤەکردنی بیرۆکەکەی کردەوە:

- تۆ وا خەیاڵ بـکە مـن ملیـاردێرم، ئەو موڵـك و مـاڵەی هەمە لەبەر زۆریـیەکەی هەتـا ئـاگریش توانـای سـووتاندن و تەواوکردنی نییە، خواستی ئەوەم هەیە بۆ هەتاهەتایە بـژێم، چـی بکەم؟! بە تۆ دەڵێم... بەر لە هەر شتێك نۆڕینگەیەکی زانستی بۆ توێژینەوەی مێشك بونیاد دەنێم، ژمارەیەکی زۆر لە بلیمەتەکـانی بــواری پزیشــکی و توێکــاری تێــدا دادەمەزرێــنم، تێکــڕای تاقیکردنەوەکانیش جەخت لەسەر دوو شت بکەنەوە، تەنهـا دوو شـت، یەکەمیـان: سـڕینەوەی یـادگە لە مێشـك، سـڕینەوەیەکی تەواو. دووەم: گواسـتنەوەی یـادگە لە مێشـکێکەوە بـۆ یەکێکـی دیکە. بەم جۆرە دەتوانم بۆ هەمیشە بژێم.

- پیــاوی چــاك بە زیــاتر ڕوونــی بــکەرەوە، هێشــتا تێنەگەیشتووم.

- کاتێك تەمەنم دەگاتە پەنجا ساڵ، بە دوای گەنجێکـی جوانی بیست ساڵاندا دەگەڕێم... گرنگترین شت تیایدا سەرنجم ڕابکێشـێت شـێوە و ڕوخسـاریەتی، تـاکوو بە لە خۆباییـانە و کەشخەییەکەمەوە بە ڕێگەدا بـڕۆم و کـچە شۆخوشـەنگەکانیش عاشقم بن، نەك لەبەر سەروەت و سامانەکەم، بەڵکوو لە پێناوی شێوە و جوانییەکەم.

- ئەوە تۆ چی دەڵێیت...؟! ئەی دوای ئەوە؟!

- ئەو گەنجە قایل دەکەم بەوەی سەروەت و سامانێکی زۆری پێ دەبەخشم لە بەرانبەر ئەوەی یادگەی بسڕمەوە، هەڵبەتە گەمژەیە و بێ دوودڵی ڕازی دەبێت، ئەو نازانێت سڕینەوەی یادگەی واتە نەهێشتن و لەناوبردنی بە یەکجاری، منیش بە خۆڕایی دەست بەسەر جەستەیدا دەگرم. چ قەیدییە وا دەکەم خانەوادەکەی سوود لەو سەروەت و سامانە وەربگرن کە پێیانی دەبەخشم. ئەو گرفتە گەورەیەی لەمەدا ڕووبەڕووی من دەبێتەوە دڵشکانی ئەندامانی خێزانەکەیەتی، لەبەر ئەوەی ئەوان گۆڕانکارییەك لە شێوەیدا نابینن، بەڵام ئەو پشتگوێیان دەخات و هیچ هەست و سۆزێکی بەرانبەریان نابێت، چونکە بە شێوەیەکی زۆر سادە ئەو کاتە ئەو من دەبم، نەك خۆی. بەمەش دوای ئەوەی ئەو گرێبەستەی لەگەڵ واژۆ دەکەم، داوا لە پزیشکە بلیمەتەکانم دەکەم، هەموو یادگەی من بگوازنەوە بۆ مێشکی ئەو گەنجە قۆزەی کە دەستم بەسەر جەستەیدا گرتووە و یادگەیان بۆم سڕیوەتەوە. دوای ئەوەی کرداری نەشتەرگەریی گواستنەوەی یادگە کۆتایی دێت، هەڵدەستمە سەرپێ و بڕوای تەواوم بە جەستە تازەکەم هەیە و زۆریشی پێ سەرسام دەبم و ئەوە هەر خۆمم و خۆم و پۆزیشی پێوە لێ دەدەم، هیچ شتێکم تێدا نەگۆڕاوە، تەنها شێوەکەم نەبێت، ئێ چ قەیدی وای دابنێ جوانکاریم کردووە! زۆرێك لە خەڵکی بە تایبەتییش کەسایەتییە ناودارەکان وایان پێ خۆشە جوانکاری بکەن و شێوەی خۆیان بە جۆرێك بگۆڕن کە هیچ پەیوەندیی بە شێوە کۆنەکەیانەوە نەبێت، تەنها یادگەکە وەکوو خۆی دەمێنێتەوە، جیاوازی نێوانی من و ئەوان لەوەدایە ئەوان گەورە و پیر دەبن، وەلێ من هەرگیز وەك ئەوان نابم، چونکە هەر کە تەمەنم گەیشتە پەنجا

ساڵان، جەستەی لاوێکی قۆز و کەشخە دەکرم و مێشکی ئەو دەسڕمەوە و یادگەی خۆمی لێ دادەنێم و سەرلەنوێ دەست بە ژیانێکی گەنجانە دەکەمەوە، ئیدی بەم شێوەیە بۆ هەزاران جار ئەم کردارە دووبارە دەکەمەوە و لە هەر جەستەیەکیشدا بیست ساڵێك دەژیم و جارێکی دیکە دەچمە جەستەی گەنجێکی جوانی دیکەوە، ئەرێ پێم بڵێ ئەمە چۆن بیرۆکەیەکە؟ پێت وا نییە بیرۆکەیەکی زانستییانە و لۆژیکیانەی دۆزەخیانە بێت...؟!

- هەر بە ڕاستی بیرۆکەیەکی دۆزەخیانەیە، بەڵام تۆ بڵێی لە ئایندەدا زانایان لە گواستنەوەی یادگە لە مێشکێکەوە بۆ مێشکێکی دیکە سەرکەوتن بەدەست بهێنن؟!

- هەموو شتێك لەوانەیە ببێت... بۆ نا؟!

- ئەی ئەگەر یادگەی کەرێکیان گواستەوە بۆ مێشکی مرۆڤێك؟!

- دەی هەر لە کەرێکمان کەم بوو. خۆ لەوانەیە پێچەوانەکەی باشتر بێت، بە دڵنیاییەوە هیچ یەکێکیان هەست بە کەمترین گۆڕانکاری ناکەن کە لەسەر کەسێتییان ڕووی دابێت.

# بەشی پازدەیەم

بەهار تازە باروبنەی خۆی پێچابووەوە و هاوین لە دەستپێکیدا بوو، کاروانەکان تا دەهات لە ناوچەی پشتئاشان و ناوچەکانی دەوروبەری ئەو کۆ دەبوونەوە، زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی دەهاتن، بەڵکوو هەر هەموویان لە پیر و بەساڵاچووان و ئەوانەی خاوەن ژن و منداڵ بوون، لەگەڵ هەندێك نەوجەوان و منداڵیش، ڕۆژنامەنووسان و ڕاگەیاندکاران و هونەرمەندان و خاوەن پیشەی بوارەکانی دیکەشی لە خۆ گرتبوو، وەلێ ئەوەی لێی تێنەدەگەیشتم ئەوەبوو، هەرچەندم دەکرد نەمدەزانی دەبێ لەم شوێنە دابڕاو و دوورەدەستە ئەوانە چ سوودێکیان هەبێت؟! بە تایبەتی ئەوانەی هەتا توانای بەرگریکردنیان لە خۆیشیان نەبوو، بۆ سوێندیش ڕۆژێك لە ڕۆژان شەڕێکیان نەبینیبوو، هیچ ئەزموونێکیشیان هەتا لە خۆپاراستنیش نەبوو، تووڕەم مەکە بڵێم: هەتا یەك تەقەشیان نەکردبوو، وەك ئەوەی جەنگاوەرە پێشمەرگەکانی تر دەیانزانی، ئەوانەی خۆڕسکانە پێشبینیی مەترسییان دەکرد بەرلەوەی ڕوو بدات، چونکە گەلێ جار دەتبینین لە چاوترووکانێکدا پەرتوبڵاو دەبوونەوە و سەنگەریان دەگرت و چاوەڕوانی پێشهات و ڕووداوی لە ناکاویان دەکرد. ئەم جۆرە جەنگاوەرە خاوەن ئەزموونانە ژمارەیان لە پشتئاشان ئەوەندە نەبوو، هەتا بەشی پاسەوانی ئەو هەموو کۆمەڵە خەڵکە بکات کە لێرە و لەوێ خۆیان پەنا دابوو، ئەوانیش لەسەر هەندێك بەرزایی بە ژمارەیەکی کەمەوە لە پاسەوانیکردنی ئەوانەدا بوون کە بە ناچاری ڕوویان لەوێ کردبوو، خەم و

خولیای گەورەی ئەو خەڵکە دروستکردنی کەپرۆکەیەك بوو لە لق و گەڵا و چرووی دارەکان، تاکوو ڕۆژانی خۆیانی تێدا بەسەر ببەن، زیندەباری هەڵدانی خێوەتی گەورە و بچووك لە شوێنە جیاوازەکان و حەوانەوەیان تێیاندا.

وا پێ دەچێت ژمارەیەك لە ئەندامانی دەستەکەی ڕۆست بێرەدا تێپەڕیبن، ئەوەتانێ ژمارەیەکیان یەکسەر ڕوویان لە خێوەتەکەی ڕەحمان کردووە، کە پێش چەند ڕۆژێك دەبێ گەیشتبووە ئێرە، دوای ئەوەی هەرچی چەك و جبەخانەی هەبوو گواستبوویەوە. ئەو سەرقاڵی ئامادەکردنی چایە بوو بۆیان لەسەر پشکۆی بەردەم خێوەتەکەی. دوای ئەوە لەگەڵیان دانیشت و دکتۆرەکە بە خێرایی سەرقاڵی فڕکردنی چایەکەی بوو، وەك ئەوەی پەلەی بێت، بۆیە بە خێرایی هەستایە سەر پێ، تاکوو کارێکی دیاریکراو ئەنجام بدات، زۆربەی گومانەکان بۆ ئەوە بوو کە هەندێك داوودەرمان وەربگرێت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەم شوێنە داوای کردبوو. مام کاکیلیش یەکێك بوو لە دەستەکە، بەڵام ئەو لە ئێستادا سەرقاڵی کۆبوونەوە بوو لەگەڵ یەکێك لە پیرە باڵادەستەکانی ئەوێ دەربارەی کارێك. دەنگی قاقای پێکەنینی دەستەکەی ڕۆست لەناو خێوەتەکەی ڕەحمانەوە بەرز دەبووەوە، مامۆستا عومەر و زوهێری نانەوا و سعوودیش کاتی خۆیان بە گێڕانەوەی ئەو ڕووداو و چیرۆك و سەربوردانە سەرقاڵ کردبوو کە دوای ڕۆیشتنی ڕەحمان لەوێ ڕوویان دابوو و زۆریشیان دەدایە پاڵ قسەکانیان و بە خەیاڵ دەیانڕازاندەوە و وەك دەڵێن مشتوماڵ و ترشوخوێیەکی باشیان دەکرد. زوهێر باسی ئەو پێشمەرگەیەی دەکرد کە لە کاتی خۆشوشتندا دەبێت و لەو کاتەدا لە ناکاو کۆپتەر بەسەریاندا دەدات و ئەویش هەر بە ڕووتوقووتی و بە پێی پەتی ڕادەکات و تاخمەکەی لەناو

قەدی دەبەستێت و چەکەکەی بەرەو کۆپتەرەکان ئاراستە دەکات، کاتێك پێشمەرگەکان ئەو دیمەنە دەبینن کۆپتەرومۆپتەر لە بیر دەکەن و لە پێکەنین و قاقای بەردەوام و بێپسانەوەیان لەسەر پشت دەکەون. ئیدی قسە قسەی ڕادەکێشا و سەربوردە بە سەربوردەی دەگوت خۆت لادە هاتم. تا بابەتەکە گەیشتە سەر کەسێك کە لەگەڵیان بووە و دواتر ڕای کردووە و چۆتە ڕیزی کۆمەڵەیەکی ئیسلامییەوە کە تازە دامەزرابوون. کاتێکیش ڕەحمان هەوڵی دەدا پرسیاری ئەو شتەیان لێ بکات کە هاوسەرگیری لەگەڵ خاتوونەکەی کردبوو، ئەوان هەموویان خۆیان لە خەتی گێلی دەدا و وەڵامی پرسیارەکەیان بە لاڕێدا دەبرد و باسی شتێکی دیکەیان دەکرد، کە هیچ پەیوەندی بە پرسیارەکەی ئەمەوە نەبێت، هەرچەندە ئەوان دڵنیابوون لە چیرۆکی خۆشەویستی ڕەحمان بۆی. سعوود دەستی بە تەواوکردنی قسەکانی کردەوە و گوتی:

- ئەو کۆمەڵە ئیسلامییە تازەیە تۆوێکی پیسن و لە چیایەکاندا چاندراون!

ڕەحمان زیاتر ڕۆڵی گوێگری دەبینی لەوەی بدوێت و قسان بکات، ئاخر ئەوان چیرۆك و سەربوردەی زۆریان لە توێشەبەرە و کۆڵەپشتی یادگەیاندا هەڵگرتووە، لێگەڕێ با هەرچییەکیان هەیە بەتاڵی بکەن، دواتر خۆیان دێنە سەرباسی خاتوونەکەی.

مامۆستا عومەر گوتی:

- ئەم تۆوە ئەگەر بڵاو ببێتەوە و تەشەنە بکات، وڵات کاول و وێران دەکات.

زوهێریش دەستی بە ناو دەستی خۆیدا دەکێشا و دەیگوت:

- ئەگەر کەسێك یارمەتییان نەدات و نەیانگرێتە خۆی، هەر لە خۆیانەوە دەپووکێنەوە، چونکە خەڵکی هاوکاری و پشتگیرییان ناکەن. خەڵکی پەرۆشی ئازادین، ئەوانەش مەحاڵە ئازادی بە کەس ببەخشن.

سعوود هەڵی دایە و گوتی:

- میللەت یارمەتی ئەوان زیاتر دەدات وەك لە ئێمە... عەقڵیەتەکانیان یەکە. سەرباری ئەوەی وڵاتە زلهێزەکانیش یارمەتییان بەسەردا دەبارێنن و زەمینەسازی بۆ بەهێزبوونیان دەکەن.

- وڵاتە زلهێزەکان شەڕ لە گەڵ ئەم عەقڵبەستووانەدا دەکەن.

- تۆ هەڵەیت، وڵاتان دەست لەناو دەستی ئەوانە دەنێن کە بەرژەوەندییەکانیان دەپارێزن.

- ئاخر ئەم دواکەوتووانە چۆن بەرژەوەندیی وڵاتە زلهێزەکان بەرجەستە دەکەن و دەیپارێزن؟!

- بە دواکەوتن و کۆنەپەرستی ئەزیزم!

- بە کۆنەپەرستی؟! هههههههههههههه.

- بەڵێ، بە دواکەوتن و کۆنەپەرستی. بە ئەقڵ و هزری چەقبەستوو. دارایی و دەسەڵات و پشتگیریی عەقڵی چەقبەستوو بکە، ئەویش گەلت بۆ دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمە تاریکەکان. ئەمەش ئامانجی سەرەتا و کۆتاییانە. دەزانی ئەو وڵاتە زلهێزە بەرژەوەندیخوازانە حەزیان لەوەیە گەلان بە کۆیلەیی و ژێردەستەیی و ملکەچی ببینن و لەناو هەژاری و نائومێدی و نەداریی خۆیدا بتلێنەوە. واز لەم دونیای سەرزەمینە بهێنن بۆ بەدەستهێنانی ئەو دونیای خەیاڵاوی.

- به عەقڵی کێدا دەچێت کۆمەڵێکی بچووك و دواکەوتووی وا عەقڵی گەلێك بە تەواوی بگۆڕێت؟

- ئاخر بنەماکانی ئەم گۆڕانکارییانە لەناو گەلدا بەردەستە و پێشوەختە دابین کراوە و زەمینەکە لەبار و گونجاوە بۆیان، بەڵام ئێستا کۆتوبەند کراوە. ئەم گەلە خاوەن هزرێکی پیرۆزی ڕەوەندنشینە و سرووشت هەموو سەختییەکانی خۆی تێدا چاندوون، هەر ئەوەندە بەسە کە وڵاتان زاڵ بن بەسەریدا.

مامۆستا عومەر بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- هەموو سیناریۆکان لە وڵاتانی جیهانی سێیەم وەکوو هێلکەی پاککراو بەردەستن، تەنها تۆ فەرمان بدە و کەمێك لە گەمەکە بزانە، ئیدی هیچ حەقت بەسەردا نەبێت. ئەو ئیسلامییانە مەترسیدارترین چەکی دەستی ئەوانەن کە جڵەوەکەیان بەدەستەوەیە و بە سەریاندا زاڵن، ئاخر ئەوانە لە بۆمبی ئەتۆمی قێزەونتر و ترسناکترن. تۆ بیر لەوە بکەرەوە، ئەگەر بە سەر عەقڵی هەر یەکێکیاندا زاڵ ببن، ئەوا دەیکەنە ڕۆبۆتێکی بایۆلۆژی و ڕەشمە و لغاوەکەی لە دەستی خۆیاندا دەبێت، چۆنیان بوێت ئاوا دەیهاژۆن، ئامادەیە هەموو فەرمانەکانیان جێبەجێ بکات، ئەو وڵاتانەی ئەو ڕۆبۆتە بایۆلۆژییانە دروست دەکەن، دەتوانن بەرانبەر هەر کەسێکی ئاڕاستە بکەن کە دژی بەرژەوەندییە بازرگانییەکانیان بێت. بۆ نموونە ئەگەر ئەو بەرژەوەندییانە لەگەڵ بەرژەوەندیی وڵاتە پیشەسازییە گەورەکان ناکۆك و بەریەك بکەون، ئەوا ئەو ڕۆبۆتە قێزەونانەی لەو وڵاتانەی کە ململانێیان دەکەن، دەخەنە گەڕ و قیامەت بەرپا دەکەن، کاولکاری و ئافات و نەهامەتی و ئاژاوە بە وڵاتدا بڵاو دەکەنەوە، بەڵام کاتێك دەبنە مایەی سەرقاڵکردنیان و کۆسپ دروستکردن لە بەردەم ئەو ململانێ بازرگانییەی هەیانە، ئیدی

هەمــوو خەم و خولیایــان دەبێــتە گەڕانــدنەوەی ســەقامگیری و ئاســوودەیی بــۆ دەروونــی گەلەکانیــان. خــۆ ئەگەر ئەو وڵاتــانە بیرێــك بــکەنەوە و ببیــنن ڕاســتییەکەی لە دەرکردنــی ئەو شــانە نووستووانەی ڕۆبۆتە بــایۆلۆژییە قێزەونەکانــدایە، ئەو کــاتە وڵاتە زلهێــز و خــاوەن ســەرمایە و بازرگــانییە گەورەکــان کە خــودی خۆیــان خــاوەنی ڕۆبۆتەکــانن، ئەو گەلانە بەوە تۆمەتبــار دەکەن کە بنەما مرۆڤایەتییە واژۆکراوەکانی پەیماننامەی جنێڤ دەبەزێنن و ئەو مافەیان نابێت سزای ئەو هەموو ڕۆبۆتە ئاشتیخوازانە بدەن، کە ڕێککەوتننــامەکە دەســتەبەری مــافی ژیــانی بە شــێوەیەکی ئاشتیانە بۆ کردوون، تا ئەو کاتەی هەڵوێستی توندوتیژیان نەبێت. هەتا ئەگەر هەشیان بێت ئەوا نابێت تــاوانی ئەو ڕۆبــۆتە قێــزەونە یاخی و لەدەستدەرچووانە بە هەند وەربگیرێت کە وڵاتیان کاول و وێــران کــردووە و تــرس و تۆقانــدن بەنــاو خەڵکیــدا بــڵاو دەکەنەوە.

وڵاتە بازرگانییە زلهێزەکان لە بەرژەوەندیی خۆیاندا ئامادەن وڵاتێك خــاپوور بــکەن، ئاســاییە و مــافی مــرۆڤ لەوێــدا بــوونی نابێــت، وەلــێ ئەگەر تــاقە ڕۆبۆتێکیــان تەمــێ بکرێــت و ســزا بدرێت، بە ناوی مافی مرۆڤەوە دونیا هەڵدەگرن.

- ئەرێ بە ڕاست ئەمە بە عەقڵدا دەچێت؟!

- بەڵــێ بــۆ نــا؟! هەمــوو شــتێك دەبــێ، بەڵکــوو لەوەش مەترسیدارتر ئەوەیە ئەو ڕۆبۆتــانە زاوزێ دەکەن و زۆر دەبــن و ڕۆ دەچــنە نــاو قــووڵایی هەمــوو جــومگە هەســتیارەکانی ژیــانی کۆمەڵگەوە، کارەساتە گەورەکەش لێرەدایە.

ڕەحمان بە منگەمنگەوە گوتی:

- ئایا ئەو ڕۆبۆتە بایۆلۆژیانەی بە خێرایی گەشە دەکەن و

زۆر دەبن، نابنە مەترسی بۆ سەر ئەو وڵاتانەی دروستیان کردوون و لە ئاییندەشدا دروستی دەکەن، وێڕای ئەوەی بەسەریاندا زاڵن و بەڕێوەیشی دەبەن، جا کێ گرەو لەسەر یاخی نەبوونی ئەو ڕۆبۆتانە دەکات، ئەو کاتەی یاخیش ببن تەڕ و وشك پێکەوە دەسووتێنن.

مامۆستا عومەر گوتی:

- ئەو کاتە ئەو دەوڵەتەی دروستی کردوون لە باوەشی باوکیشیاندا بێت دەیاندۆزنەوە و هەڵیاندەپاچن و لەناویان دەبەن، لەبەر ئەوەی قێزەونی و گەلاوی دەوڵەتە دروستکەرەکانیان گوێ بە پەیماننامەی جنێف نادەن. بەڵکوو تەنها ئاماژەیەکیان ئاڕاستە دەکات بۆ بێدەنگکردنی وڵاتە ململانێکارەکانیان، نەبادا توخنی ڕۆبۆتە بایۆلۆژییەکانیان بکەون کە بۆ ئەوە دروستیان کردوون بیانکەن بە گژ ڕکەبەرەکانیاندا.

زوهێر بە قێزلێبوونەوەوە گوتی:

- نەفرەت ئەگەر ئەوە ڕوو بدات، ئێمە بە هەموو توانامانەوە لە پێناوی ئەو دوارۆژەی چاوەڕێی دەکەین و قوربانی دەدەین، کەچی ئەو بێناموسە دواکەوتووانەی وڵاتان ڕەشمەیان کردوون و پشتگیرییان دەکەن، بێن و وامان لێ بکەن بڵێین هەزار خۆزگەمان بە کفندز و دیکتاتۆریش؟!

لەو کاتەدا مام کاکیل لە بەر دەرگای خێوەتەکە دەرکەوت، بە بزەیەکەوە گوتی:

- ئەو دکتۆرە کامەیە وا ئاواتی بۆ دەخوازن و بەزەییتان پێیدا دێتەوە؟

- دکتۆر نا، من گوتم دیکتاتۆر، واته حکوومەت.

مام کاکیل گوتی:

- ئەگەر ئەو. کۆمەڵە لێمان بگەڕێن بەبێ کۆسپ و لەمپەر کاری خۆمان بکەین، واتان لێ دەکەم بەزەییتان بە حکوومەتـدا بێتەوە.

مام کاکیل دوای ئەوەی دەستی لە ملی ڕەحمان کـرد و بە خۆشەویستییەوە یەکترییـان مـاچ کـرد و دەسـتیان لەسـەر شـانی یەکتریدا، شوێنی خۆی لای هاوڕێیـان کـردەوە، گفتوگـۆیەکی سادە و خۆش لە نێوانیان دەستی پێ کرد، هەر یەکە و دەسـتیان بە گێـڕانەوەی ئەو چیـرۆك و سـەربوردە خۆشـانە کـرد کە دەیانخـاتە بـزەو پێکەنـین. ڕەحمـانیش بـۆ مێوانـداریکردنی مـام کاکیل کە دیار بـوو زۆر پەلەی بـوو، قـۆرییە چـایەکی تـازەی لێنابوو، بە جۆرێك وای لە مامۆستا عـومەر و زوهێـری نـانەواش کرد مۆڵەت بخوازن و خۆیان بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکەن، ڕەحمان زۆری حەز دەکرد پرسیاری شێتەکە و خاتوونەکەی لە مامۆسـتا عومەر بکات، بەڵام ئەو دەرفەتەی بۆ نەڕەخسا، سعوودیش تەنها چەند خولەکێك دوای ئەوان مۆڵەتی خواست و خـۆی گەیانـدە ئەوان.

ڕەحمان چایە نوێیەکەی تێ کـرد و پێشکەشـی مێـوانەکەی کرد، ئەویش هەردوو چاوی نوقاند و بە یەك فڕ ئـاودیوی کـرد و گوتی:

- ئەرێ کاکە ئەم چایەی تۆ دەڵێی ژەهرە!

ڕەحمـان دایە قاقـای پێکەنـین و بەدەم گـردانـی پشـکۆی کوانووەکەی نزیك دەرگای خێوەتەکەوە دەیگوت:

- چاوەڕێ کە، ئێستا ئاوەکەت بۆ دەکوڵێنم و بزانە پەرداخی دووەم چۆن دەبێت، ئەگەر بە دڵت نەبوو چی دەڵێی بڵێ.

دوای چەند ساتێکی کەم مام کاکیل بە چێژ و لەسەرخۆی چایەکەی فڕ دەکرد و بە ڕوویەکی خۆشەوە:

- ئەها ئە... ئێستا تەواوە کاکە.

ڕەحمان: هەی نۆشی گیانت بێت مام.

دەیویست گلۆڵەی قسان لە لوتکەوە بەرەو دۆڵێ شۆڕکاتەوە و لەگەڵ مام کەوتنە قسەو باسوخواسی ڕابردوو:

- ئەرێ مام ئێستاش وەکوو جاران هەر خەریکی ڕاوە کەویت؟

- ئەی چۆن کاکە، تۆ پێت وایە گەر تۆ لە لامان بڕۆی ئیدی من واز لە ڕاوەکەو دەهێنم؟

- کێ لە پێشمەرگەکان هاوڕێیەتیت دەکەن؟

پیرە کاکیل خۆی بەسەر ئانیشکیدا دابوو، گوتی:

- بە زۆری بە تەنها دەڕۆم، هەندێك جاریش ئەوانە لەگەڵم دێن کە ئارەزووی ڕاوەکەو دەکەن، بەڵام کاکە ئەوانیش وەکوو تۆ پەلەیانە و بێئارامن... ئاخر ڕاوکردنی کەو پێویستیی بە ئارامیی زۆرە. ئەو ئارامگرییە درێژەش لەگەڵ میزاجی ئێوەدا ناگونجێت... هەمووتان دەتانەوێ لە دووری سەد مەترێکەوە تەقەی لێ بکەن، لە ترسی ئەوە ئەگەر زیاتر لێی نزیك بکەونەوە، بفڕێت و لە دەستتان بچێت. بە خودای گەورە "هەرچەندە پێویستیش بە سوێند ناکات"، من هەرگیز تەقە لە کەو ناکەم ئەگەر لە دووری دە مەترەوە نەبێت، یەك فیشەکیش

بە خەسار نادەم. ئەگەر ڕاستیت دەوێ من مەبەستی خۆم لە ڕاوکردن هەیە، ئەوەش سوودی ئەو کەسانەیە کە بۆ ڕاوکردن هاوڕێیەتیم دەکەن. ئەرێ بە ڕاست تۆ پێشتر بیرت لە سوودی ڕاوەکەو کردۆتەوە؟ پێم وایە دەڵێیت: لە دەرچوونمان بۆ ڕاوەکەو چێژ وەردەگرین، یان پارچە گۆشتێکمان دەست دەکەوێت، بەڵام مەبەستی من هیچ یەکێك لەوانە نەبووە، مەبەستم ئەوە بووە کە ئەوەی لەگەڵمدا دێت فێرە دزەی بکەم، کە چۆن بەبێ خشپە لە شوێنی مەبەست نزیك بکەوێتەوە و ئامانجی خۆی بپێکێت، ئاخر کاکە کەو زۆر هەستیارە، خۆ ئەگەر بتوانیت لە نزیکترین مەوداوە ڕاوی بکەیت، ئەو کاتە فێری ئەوە دەبیت چۆن دزە بکەیتە بن دەست و پێی دوژمن و لە نزیکترین خاڵیان نزیك بکەویتەوە بێ ئەوەی هەستت پێ بکەن و ئاشکراش ببیت.

ڕەحمان بەم بیرۆکەیە سەرسام بوو، گوتی:

- بە ڕاستی بیرۆکەیەکی گونجاوە و باشترین مەشق و ڕاهێنانیشە بۆ دزەکردن! بۆچی پێشتر ئەمەت پێ نەگوتووم؟!

- من ئەمەم پێ نەگوتووی، چونکە دەمەوێت خۆڕسکانە فێری ببیت وەکوو شێر. کاکە تۆ ئێستا لە شاخدا دەژیت شاخ، ئاخر شاخ گەمەی پێ ناکرێت و پیاوی خۆی دەوێ، ئێستا تۆ دوور لە شارو ئاوەدانی و ژیانی خۆش دەژیت و ئەرکێکی پیرۆزت لە سەرشانە، بۆیە دەبێ تۆو بگرە هەمووماں هێز و تواناماں لە شاخەکانەوە، لە سرووشتەوە وەربگرین، باوەڕ بکە شاخەکان ئەوەندە بەخشندەن، مرۆڤ لە بەخشندەییان سەرسام دەبێت، تۆ ئەو شاخانە دەبینیت هەموویان دەستیان ڕاخستووە و هەرچیت دەوێ پێتی دەبەخشن، بەو مەرجەی بە ژیری و

بیلمەتیی خۆتەوە ئەوەیان لێ فێر بیت کە دەتەوێ و مەبەستتە بیزانیت. شاخەکان دوژمنی باوەکوشتەی مرۆڤی شلوخاو و تەوەزەلن، ئاخر شاخ حەز لە کەسێك دەکات زۆرانبازێی لەگەڵدا بکات و وا بە ئاسانی ملی بۆ نەخەوێنێت و کۆڵ نەدات، ئەگەر ئەوەت کرد، ڕێزت لێ دەگرێت و هەرچی هەیە و هەرچیشت دەوێ پێتی دەبەخشێت.

- هەر بە ڕاستی وتەکانت دوڕ و گەوهەرن مام، دەڵێی "کۆزەری چەند بتکوتن زیاترت پێیە و زیاتریش دەبەخشیت".

مام کاکیل لەو قسەوباس و سەربوردانەی مەبەستی خۆی هەبوو، لە ناکاو گوتی:

- ئێستا تۆ واز لە کەوومەو و ڕاووماو بێنە، با کەمێك بە وردتر و شێلگیرانەتر قسان بکەین.

- شێلگیرانەتر... واتە چۆن؟! مام وا هەست دەکەم لە پشت قسەکانتەوە شتێك هەیە، تۆ کەی قسەت لە من شاردۆتەوە، هەرچیت هەیە بیڵێ و لە دڵی خۆتدا مەیهێڵەوە.

- کاکە بەس شتێك، کورە تۆ بڵێ کۆمەڵە شتێك.

مام کاکیل فڕێکی دیکەی لە چایەکەی دا و لێی پرسی:

- ئەرێ پێم بڵێ، تۆ نیازی گەڕانەوەت هەیە بۆ لای دەستەکەی خۆت لە ڕۆست، یان نا؟

- مام خۆزگە بمتوانیبووایە. بیری هەمو شتێکی ئەوێ دەکەم، باوەڕ بکە خەریکە ئاو دەمبات بۆ ئەوێ، هەر دەڵێی لەسەر ئاو و ئاگرم، بەڵام پێت وایە ئەمان لێرە دەستبەردارم بن و وازم لێ بێنن؟ ئەبو شامیل هەندێك ئەرکی پێ سپاردووم، هەر

دەبێ تەواویان بکەم، بۆ تۆ پێت وایە داوای گەڕانەوەم بۆ ڕۆست لێ نەکردوون؟ وەلێ ئەوان لە ئێستادا ڕێگەم نادەن و دەستبەردارم نابن، چەند جارێك ئەو داوایەمیان ڕەت کردۆتەوە.

مام کاکیل زیاتر چووە ناو کرۆکی مەبەستەکەیەوە:

- چالاکییەکی دیکەی تازە ئەنجام دەدەم، بۆ ئەمەش وەکوو جاری پێشوو زیاتر پشت بە تۆ دەبەستم. پلانەکەم لە مێشکی خۆمدا گەلاڵە و نەخشەسازی کردووە، دوای ئەوەی پەیدۆزی ئامانجەکەم کرد، شتێکی ئەوتۆ نەماوە تەنها جێبەجێکردنی نەبێت. پێم وایە تەنها چەکەکەی تۆ چالاکییەکە لە بەرژەوەندیی خۆماندا یەکلایی دەکاتەوە، تۆ خۆت بایەخی ئەو چەکە دەزانیت کە لە شەڕەکاندا چەندە کاریگەر بووە، جگە لەوەش بایەخە هەر گەورە و کاریگەرەکەی لە توانای هەڵگر و بەکارهێنەری چەکەکەدایە، تۆش بە لای منەوە باشترین ئەو کەسەی ئەو کارە ئەنجام بدەیت.

- ئەها کەواتە تۆ بۆ ئەوە هاتوویت هەواڵی ئەوەم پێ بدەیت؟ هەر بە ڕاستی ئارەزووی بەشداریکردن لە چالاکییەکی سەربازیانە دەکەم... بەڵام...

- دەڵێی بەڵام! وا هەست دەکەم شتێك مێشکی سەرقاڵ کردووی... ئەگەر بیر لەوە دەکەیتەوە کە ڕێگەی ئەوەت نادەن و دەستبەردارت نابن، ئەوەیان بۆ من لێ بگەڕێ و بەڵێنی ئەوەیان پێ دەدەم کە دوای چالاکییەکە بە سەلامەتی بتگەڕێنمەوە بۆ ئێرە.

ڕەحمان وەڵامی دایەوە، بەڵام شەرمێك لە وەڵامەکەیدا بەدی دەکرا:

- گرفتەکە لەوەدا نییە کاکە. دەتوانی چالاکییەکە دوا بخەیت؟

مام کاکیل لە قاقای پێکەنینی دا و پرسی:

- دوای بخەم! بۆچی؟ بۆ یەك ڕۆژیش چالاکییەکە دوانـاخەم، تەنهـا مەگەر هەلـومەرجێکی لە ناکـاو ڕوو بـدات، شایانی دواخستن بێت. ئێستاش چی دەڵێیت؟

- مام کاکیل من...!

پیرە قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- تۆ چی؟! ناتەوێ بەشداری بکەیت دوای ئەوەی داوام لێ کردی و متمانەی خۆمم پێ بەخشیت؟ ئەم ڕاڕاییە بۆچی؟ پێم وابوو پەلە دەکەیت و کەلوپەلەکانت کۆ دەکەیتەوە و بەر لە من دەکەویتە ڕێ.

- خۆزگە دەمتوانی پێداویستییەکانم کۆ بکەمەوە و لەگەڵتدا بێم. بەڵام چاوم، مام کاکیل چاوم وای لێ کردووم دوودڵ بم. چاوم خیانەتی لێ کردم، بە جۆرێك تێك چووە، هەر مەپرسە، لە شەوە تاریك و ئەنگوستەچاوەکاندا هیچی پێ نابینم، تەنها تارمایی نەبێت. چاوم هۆکارە چاوم، نەك شتێکی تر.

- کاکە، تۆ یەك چاوت پێکراوە نەك هەردوو چاوت! من پێشمەرگەیەك دەناسم بە یەك چاوەوە لە شەوە تاریکەکاندا وەکوو کوندەپەپۆ چاوی تیژە و شت دەبینێت. ئەی ئەو کاتەی ئێمەت بەجێ هێشت مامۆستا عومەر دەیگوت وەکوو پڵنگ ڕێی دەکرد. وێڕای ئەوەی پارچەکە خەریك بوو چاوی

هەڵــدەکۆڵیت. خــۆ ئەگەر دەمزانـــی داواکـــارییەکەم ڕەت دەکەیتەوە هەرگیز بە وشەیەکیش زارم نەدەکردەوە.

مام کاکیل بە خەمباری و دڵشکاوییەوە لە خێوەتەکە هـاتە دەرەوە، ڕەحمان خۆی بە مەچەکی کورتەکەکەی هەڵواسـیبوو، تاکوو ڕێگەی ڕۆیشتنی لێ بگرێت و بە پاڕانەوەوە دەیگوت:

-دێم دێم... سوێندت بۆ دەخۆم دێم. تۆزێـك چاوەڕوان بە، لە هێرشکردندا لەگەڵتاندا دەبـم... مـن دەزانـم ئەگەر لەگەڵتانـدا نەیەم چیم پێ دەڵێن.

کاتێـك مـام کاکیـل گوێبیسـتی ئەو وشـانە بـوو پاشـگەز بــووەوە، بە بێــدەنگی و خەمبــاری دانیشــتەوە. کــاتێکی کەم تێپەڕیبـوو، منگەمنگێکـــی کــرد و بە ســـووکەڵەییەوە هەردوو پەرداخەکەی پـــڕ لە چـــایە کـــردەوە، پەرداخێکـــی پێشکەشـــی ڕەحمان کرد و بە سووربوونەوە پێی گوت:

- کاکە تۆ وەکوو جاری پێشوو "ئارِ. پی. جی"یەکەت پێ دەبێت.

ڕەحمان بە دەنگێکی نیمچە ڕووبەڕووبوونەوە گوتی:

- وا دەکەم.

پاشان پیرە بە دەنگێکی زۆر هێمنانەوە گوتی:

- ئەی دەربارەی چاوت چی کاکە؟

ڕەحمان بە گوێپێنەدانەوە گوتی:

- گوێی پێ نادەم!

مام کاکیل بە حەسرەتەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- کەواتە تۆ لە قسەوقسەڵۆکان دەترسی. دەزانم لەم هەلومەرجەی ئێستاماندا قسەوقسەڵۆکی ئەم و ئەو برینداركەرن. وەلێ چی بکەم، بە پلەی یەکەم چالاکییەکە پشت بە تۆ دەبەستێت، ئەوەش بە هۆی گرنگیی چەکەکەتەوە کە دۆخەکە لە بەرژەوەندیمان یەکلایی دەکاتەوە.

- ئەوە دەزانم.

- ئەمەش واتای ئەوەیە کە چالاکییەکە شکست دەهێنێت بە هۆی بێتواناییت لە مەشق و ڕاهێنان، بەڵکوو تۆ دەبیتە بارگرانی بەسەرمانەوە. شکستی چالاکییەکەش دەمانخاتە بەر ئەگەر و ئەنجامی ترسناکەوە، لەوانەیە بە زوویی هەڵوێستەکە لە بەرژەوەندیی خۆماندا یەکلایی نەکەینەوە و کاتی شەڕەکە درێژە بکێشێت، تۆش بایەخی کات لەو بارودۆخانەدا باش دەزانیت، وەك پرسی شمشێرەکەیە، نەیبڕی، دەتبڕێت، چونکە ئەگەر درێژە بکێشێت، ئەوا دوژمن پاڵپشتی بۆ دێت و لەوانەیە هێزی سوپا و جاش ئابڵوقەمان بدەن و یەك لە دوای یەك لەناومان ببەن! ڕەحمان ئایا تۆ بیرت لەوە کردۆتەوە؟ بیر..؟

پیرە ئەمەی بە زەردەخەنەیەکەوە گوت و خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە کرد، دوای ئەوەی یەك دوو جار بە توندی دەستی دایە سەرشانەکانی ڕەحمان.

ڕەحمان بۆ چرکەساتێك حەپەسا، پاشان لە دوای ئەو بە دەنگی بڵند گوتی:

- مام کاکیل تۆ منت خستە گێژاوی بیرکردنەوە و حەپەسانەوە!

مام کاکیل لە دوورەوە هاواری کرد:

- بە ئارەزووی خۆت هەڵسوکەوت بکە ڕەحمان.

دەرئەنجام ڕەحمان لە دوورەوە گوێی لە دەنگدانەوەی ئەم قسەیەی سەرەوە بوو.

# بەشی شازدەیەم

لە سەبەینێیەکی زووی خۆرەتاویدا ژمارەیەك لە پێشمەرگەکانی سەر بە پیرەکان پێنج دیلیان هێنا، لە نێویان جەللادێك و جاشێك دانیان بە تێکڕای ئەو کارە دزێوانەدا نابوو کە دژی قوربانییەکانیان کردبوویان. سیخوڕ و بەکرێگیراوێکیشیان تێدا بوو لە ڕیزی یەکێك لە پەلەکانی پیرەکاندا بۆ بەرژەوەندیی ڕژێم کاری کردبوو. ئەرکێکیان پێ سپاردبوو، هێندەی نەمابوو جێبەجێی بکات، بۆ ئەوەی گومانی ئەوانەی دەوروبەری لە خۆی دوور بخاتەوە، لە شەڕەکەدا ڕۆڵێکی بەرچاوی بینیبوو، بەمەش متمانەی دەستەکەی بەدەست هێنابوو، هەتا گەیشتبووە ئەو ئاستەی چیرۆك و بەسەرهاتیان لەسەر ئازایەتییەکەی دەگوتەوە. یەکێك لەو چالاکییانە هێرشی کردبووە سەر دووان لە دوژمنەکان کە خۆیان لە شوێنێکی قایم پەنا دابوو، کەچی ئەو بێدەنگی کردبوون و چەکەکەی لێ بەتاڵ کردبوونەوە، لە دەوروبەری بیست و شەش ساڵاندا بوو، زۆر تەڵەکەباز و ئازا بوو، باریکەڵە و سەرسەخت دیار بوو، خۆ ئەگەر هەلومەرجەکە لە دژی نەبووایە و ناسنامەکەی ئاشکرا نەکرابووایە، کەس بە نهێنییەکەی نەدەزانی، ئێستاش دوای ئەوەی نزیکەی مانگێك بەسەر دەستگیرکردنیدا تێپەڕیوە شەو و ڕۆژ نەخشەڕێژی بۆ هەڵاتن دەکات، دوای ئەوەی هەستی بەوە کردبوو خەونەکەی دێتە دی، ئەو خەونەی هەترەشی بردبوو و لە خەمی ئەوەدا بوو بە زووترین کات و لە هەر دەرفەتێکدا بێت، تێی قوچێنێت و ڕابکات، ئەم خەونەیشی ئەو کاتە بۆ

هاوڕێ زیندانییەکەی گێڕابووەوە کە بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشابوون و هەموویان لە شیرین خەودابووبوون:

-    گوێم لێ بوو باسی ئەوەیان دەکرد، کە بەندیخانەکەمان دەکەنە ژووری نووستنی هەندێکیان.

هاوڕێکەی پرسیبووی:

-    کێ ئەوەی گوتووە؟

-    ئەو کاتەی پاسەوانەکە بۆ سەرئاوی دەبردم، گوێم لێ بوو باسی ئەوەیان دەکرد.

-    ئەی چی لە ئێمە دەکەن؟ مەبەستم ئەوەیە ئێمە لە کوێ دادەنێن؟

-    گوێم لە کەمێک لە قسەکانیان بوو، دەیانگوت ژوورێکی دیکەمان لە نزیک یەکێک لە پەلەکانیان لەوبەری ڕووبارەکەوە پێ دروست دەکەن.

ڕووی هاوڕێکەی گرژ بوو و کەمە ترسێک ڕوخساری داگرت:

-    دەترسم دروستکردنی ژوورەکەیان لەسەر پشتی ئێمە و بە دەست و بازووی ئێمە بێت و... پاشان وەکوو هێمای سەربڕین دەستی نایە ملی و لە جیاتی ئەوەی بڵێت: "تەواومان دەکەن".

ئەوەی دیکەیان بە سووکایەتی و پێکەنینێکی شاراوە و تەمومژاوی و بێ گوێپێدان و بە منگەمنگەوە گوتی:

-    واز لەم بێمێشکییەت بێنە، تۆ تا ئێستاش لێیان دەترسیت؟ پێشتر پێم گوتی ئەوان هیچمان لێ ناکەن. ماوەیەکی

زۆره لەگەڵیاندا دەژیم و کرۆکی بیرکردنەوەیان دەزانم، بەڵکوو هەتا ئێستا من دەزانم چییان لە ناخدایە، زیاتر لەوەی دەربارەی ناخی خۆمی دەزانم. ئەوان هەموویان، تەنها چەند کەسێکیان نەبێت کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بە باشی مامەڵە لەگەڵ هەر کەسێکدا دەکەن، بەو مەرجەی فێڵیان لێ نەکات و غەدریان لێ نەکات. بەڵام ئەمە بەو واتایە نا کە سست و شلوخاو بن، واز لەمانە بێنە کە لێرەن. پێشمەرگە جەنگاوەرەکانیان ئەمانە نین. بە ڕاستی کاتێک هاتمە ڕیزیانەوە سەرم لێیان سووڕما، جەنگاوەری وایان هەیە شێتە لە ئازایەتی و منەتی مەرگ نازانێت، لە شەڕەکاندا ئەوەندە جەربەزە و چاونەترسن، تۆقی شەڕکەرانی حکوومەت دەبەن، دەشت و شاخ گەواهی ئەو ئازایەتییەیان بۆ دەدات، بەڵام ئەوەی سەیرە کاتێک یەکێك بە دیل دەگرن، ئەوەندە ڕێزی لێ دەگرن، کە لە باوکی نەیبینیبێت! پاشان بە دەستەبەری کوێخای ناسراوی گوندێك یان لە بەرانبەر بڕە پارەیەك ئازادی دەکەن، بەو مەرجەی دیلەکە بزانێت چۆن لەگەڵیاندا بەردەوام دەبێت!

هاوڕێکەی دوای ئەوەی بە پەرۆشییەوە گوێی لە قسەکانی گرتبوو، گوتی:

- ئاخر دۆخی ئێمە جیاوازە. من وا هەست دەکەم چارەنووسی ئێمە لەسێدارەدانە. خۆ ئەگەر واش نەبێت ئەوا ئەگەری زۆری هەیە بۆ ماوەی ساڵانێك لێرە بمێنینەوە هەتا ئازادمان بکەن.

- ئەگەر دەرفەتی هەڵاتنت بۆ بڕەخسێت، بوێری ئەوەت تیایە یان نا؟

بۆ چرکەساتێك بێدەنگ بوو، ئینجا گوتی:

- داواکارییەکی سەرنجڕاکێشە و ئەنجامەکەیشی بە ئازارە.

- کەواتە تۆ وات پێ باشترە چەند ساڵێك لێرە بمێنیتەوە کە نازانی چەندیشن، بێ ئەوەی بیر لە هەڵاتن بکەیتەوە..

- تەنها مەگەر هەڵاتنەکە مسۆگەر بێت و جارێکی تر و سەرلەنوێ نەکەومەوە بەر چنگیان.

بەکرێگیراوەکە یەکسەر گوتی:

- مسۆگەرییەکەت لە من وەربگرەو بە سەلامەتیش دەتگەیەنمە شوێنی مەبەست.

هاوڕێکەی بە حەپەسانەوە چاوەکانی کردەوە و پرسی:

- چۆن...؟!

- بەرلەوەی وەڵامت بدەمەوە دەمەوێ ئەوەت پێ بڵێم تاکە کۆسپێك ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەوەیە چۆن باوەڕ بە زیندانییەکانی دیکە بهێنین بۆ ڕاکردن؟ بۆ ئەوەی ئەوە مسۆگەر بکەین کە هیچ کەسێك نهێنییەکەمان نادرکێنێت و زیاتر لای ئەوان خۆی خۆشەویست ناکات، تاکوو ڕەزامەندییان بەدەست بهێنێت.

- واز لەوانەی دیکە بهێنە، با پێکەوە پلانەکە بە تۆکمەیی دابنەین، ئەگەر دەزانیت بە ڕاستی مسۆگەرە.

- من و تۆ بە تەنها، کارێکە لە مەحاڵەوە نزیکە. پلانەکە سەرناگرێت ئەگەر هەموومان ڕانەکەین، بەڵام دەتوانین پێکەوە خۆمانی بۆ ئامادە بکەین و لای هیچ زیندانییەکی تر نهێنییەکەمان نەدرکێنین، بە پێی تێپەڕبوونی کات بۆنی دەمیان دەکەین و سەرنجیان ڕادەکێشین، تاکوو بزانین ئامادەن یان نا... ئەگەرنا... سەرکێشی بە بوونی ترسنۆکێك ناکەین لە نێوانمان.



- باشە چۆن؟ من هاوڕام لەگەڵتدا.

- پەیمانی نێوانی من و تۆ پارێزراوە. کەسی سێیەممان لە نێواندا نییە، چونکە هیچ نهێنییەك بە نهێنیی نامێنێتەوە ئەگەر کەوتە نێوان سێ کەسەوە.

ئەوەی تر بە چپە و لایەنگیرییەوە:

- ڕاست دەڵێی، ئێستا پلانەکەتم پێ بڵێ، زۆر پەرۆشم بۆ زانینی. وا هەست دەکەم ئازادیمان لە ڕێگەی ئەو پلانەوەیە. نهێنیی نێوانمان پارێزراوە.

- کەواتە گوێم لێ بگرە و وەڵامم بدەرەوە. تۆ پێت وایە کێ زیندانەکە دروست دەکات؟

هاوڕێکەی بە بێزارییەوە وەڵامی دایەوە:

- واتە لە ئێمە بەولاوە کێیتر هەیە.

- زۆر چاکە، ئەی کێ وەستاکەیە؟

ئەوەی دیکە بە جۆرێك لە لووتبەرزی و ستایشەوە ڕایگەیاند:

- لەناوماندا هیچ کەسێك لە تۆ لێهاتووتر نییە.

- زۆر چاکە. ئێستاش دەزانی چی دەکەم؟

- لەو کاتەدا یەکێك لە زیندانییەکان کە لە شیرین خەودابوون و لەوانەیە خەونیان بە ئازادییەوە بینیبێت، خۆی وەرگێڕا و پاسەوانەکەش لە بەر دەرگا جوولەیەکی کرد و دەنگی ترپەترپێکی هێواش هات، زیندانییە پیلانگێڕەکە ئاوڕێکی بە لای سەرچاوەی دەنگەکە دایەوە و بە شڵەژاوییەوە بە گوێی ئەوەی دیکەیدا چپاند:

- دەنگت کەمێك نزم کە، ئەگەرنا بەڵایەکمان بەسەردا دەبارێت و تووشی نەفرەتییەك دەبین، هەرگیز چاوەڕێی نەبووبین.

بەکرێگیراوەکە پلانە تۆکمەکەی بە جوانی و پوختی دەگێڕایەوە:

- لەو کاتەی دەست بە دروستکردنی دیوارەکە دەکەین لەژێر یەکێك لە دیوارەکانی بەرانبەر دەرگای زیندانەکە کونێك دەهێڵمەوە کە بە دیوی چۆلەوانیدا بڕوانێت، بێ ئەوەی کەسیان هەست بەوە بکەن. کاتێکیش گەیشتمە لای ئەو کونە بە وردەبەرد و پارچەی شلوخاو پڕی دەکەمەوە، ئەو کاتەی گەیشتە ئەو ئاستەی کە مەبەستمە پردێکی درێژی بە بەردی تەخت و پان لەو بەردانەی بۆ سەر گۆڕ بەکار دەهێنرێن دادەنێم، نەبادا دیوارەکە لەبەر گرانیی خۆی داڕووخێت و ئاشکرا ببین.

پاشان بزەیەکی کرد و دوای بێدەنگییەکی کورت بە چپەوە گوتی:

- ئێستا تێگەیشتی؟ ئەمە هەموو شتەکەیە، پرسێکی زۆر گرنگیی دیکەش هەیە، ئەوەش کاتی ڕاکردنەکەمانە دەبێت لە زستاندا بێت، بە تایبەتی ئەو کاتەی بەفر دەشتودەر پڕ دەکات و هەمووان لە ترسی سەرما خۆیان لە ژوورەکانیان دەپەستن و ناوچەکەش بە تەواوی چۆل دەبێت. وا باشتریشە ماوەیەك چاوەڕێ بکەین هەتا بەفرەکە لەسەر زەوی کەڵەکە دەبێت و کونەکەش دادەپۆشێت.

هاوڕێکەی بە گوێیدا چپاند:

- ئەی چی لە "گانگرین"ەکە دەکەیت؟ ئایا بە پێخواسی

بەناو بەفرەکەدا ڕادەکەین؟ باوەڕ ناکەم توانای ئەوەمان هەبێت، یان فێڵ لە پاسەوانەکە بکەین و پێڵاوەکانمان بهێنینە ژوورەوە.

- بیرکردنەوە بۆ ئەمەیان درێژەی کێشا و گەیشتنە ئەو چارەسەرەی کە هیچ جێگرەوەیەکی نییە، ئەویش بریتی بوو لەوەی: هەندێك شڕوشیتاڵ و پارچە پەڕۆ و جلوبەرگی کۆن و دڕاو کۆدەکەینەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی ڕاکردنەکە لە پێیەکانمانی بئاڵێنین، باوەڕ ناکەم پاسەوان و هەتا هیچ کەسێکیشیان گومان لەوە بکەن کە ئێمە ئەو پارچە پەڕۆیانەمان بۆ ئەوەیە لەجیاتی پێڵاو بەکاری بهێنین. خۆ ئەگەر توانای کۆکردنەوەی پارچە پەڕۆی دڕاو و جلی کۆنەمان نەبوو، چ قەیدییە پەتوویەك لە پەتووەکان دەدڕێنین. پرسەکە بە سادەیی وەربگرە و بیر لە ئەنجامە لاوەکییەکان مەکەرەوە. کێشەی ئێمە تەنها ئەوەیە چۆن زیندانییەکانی دیکە قایل بکەین، تاکوو هیچ کەسێکیان لە کاتی ڕاکردن نهێنییەکەمان ئاشکرا نەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ زیانێك ناکەین، ئەگەر کونەکە بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە بکەین کە بۆمان دەڕەخسێت ڕابکەین.

تەنها یەك دوو هەفتەیەك تێپەڕی، ئیدی لە هەموو لایەکەوە کۆمەڵە و دەستە پەرشوبلاوەکانی ناو کەپرەکان، دەستیان بە دروستکردنی ژووری زستانە کرد. ئەوانەی هاوسەرگیرییان کردبوو تەنها ژوورێکی دوو بە دوویان دروست دەکرد و کەسیش هاوکاری نەدەکردن و خۆیان دروستیان دەکرد و نەدەچووە ناو کاری بە کۆمەڵەوە. ئەوان یەکێك لە جووتیارەکانی ناوچەکەیان بە کرێیەکی کەم دەگرت و ژوورەکەیان بۆ دروست دەکردن، بەڵام ژوورە گەورەکان، ئەوانەی جێگەی زیاتر لە بیست کەسیان لێ دەبووەوە، ئەو ژوورانە بە کاری هەرەوەزی و بە کۆمەڵ دروست دەکران.

ناوچەکە پڕ بوو بوو لە جووڵە، هەندێکیان سوورەچنارەکانیان دەبڕییەوە و هەندێکی دیکەیان بەردەکانیان لە شاخەکەوە بە شان دەهێنایە خوارەوە و لەو شوێنە کۆیان دەکردنەوە. کە ژوورەکەیان لێ دروست دەکرد. چێشتخانە و جبەخانەکەیان لە دیوی لای ڕاستی ڕووبارەکەوە دروست کرد و لای چەپیش ژووری چاککردنەوەی چەکە تێکچووەکان. بە درێژایی ئەوانیش ژووری ڕۆژنامەنووسان و ڕاگەیاندن، ئێستاش نەمزانی ئەوانە چی لەسەر ئەو پەڕانە دەنووسن و کێش دەیانخوێنێتەوە؟! بە دووری پەنجا هەنگاوێکیش ژووری پیرەکان و ژوورێکی دیکەش بۆ ئامێری بێتەل. ئەوان تەلیفۆنی سەرەتاییان هەبوو بە پاتری کاری دەکرد و لە ڕێگەی وایەرێکی باریکەوە گەیەنرابووە ژوورەکان. لەودیو ڕووبارەکە و دوور لەو هەموو خەڵکە و لە نزیک ڕووبارەکە جبەخانەکە دروست کرا، بونیادنانەکەی هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو، چونکە هەستانی ئاوی وەرزی لە ناوچەکە هەڕەشەی داڕووخان و ڕامالینی لێ دەکرد، هەروەها شێی تەڕیی شوێنەکەش بەلایەکی دیکە بوو بۆ تێکدان و شێواندنی ئەو کەرەستە و کەلوپەلانەی لە ناوی بوون، بە تایبەتی ئاسنەکان، چونکە ژەنگیان هەڵدەهێنا و بێکەڵك دەبوون، ڕەحمان ئەو کاتە بیرۆکەی دروستکردنی لەو شوێنەی بۆ کەسێکی گەمژە یان گەلا و دەگەڕاندەوە. زستان لەبەر دەرگابوو و هەڕەشەی هاتنەژوورەوەی ناوچەکەی دەکرد، بۆیە دەبێ پەلە بکەن لە کارکردن و بۆ ساتێکیش ڕانەوەستن و چاوەڕێ نەکەن، ئەگەرنا باران وەکوو سالانی پێشوو هەراسانیان دەکات، کاتێك بنکە و بارەگاکانیان دەگواستەوە، زیندانییەکان هەموو کارێکیان پێ دەکرا، تا دواجار بۆ دروستکردنی ژووری بەندیخانە بۆ خۆیان دەستیان بەتاڵ بوو، کە ژوورێکی مامناوەندی بوو نە زۆر درێژ و گەورە و نە زۆر بچووکیش،

زۆری نەخایاند دیواریان تاکوو بنمیچەکە بەرز کردەوە، زیندانییە بەکرێگیراو و پیلانگێڕەکەش بیرۆکەکەی خۆی بەوپەڕی کارزانییەوە ئەنجام دابوو، بێ ئەوەی کەس هەستی پێ بکات، ئەگەر زۆر بە وردییش سەرنجی دیوارەکە بدرابووایە کەس نەیدەزانی، ئیدی کاتی کۆکردنەوەی کاریتە و شەقڵە و گەڵا و چرووی دارەکان هات بۆ سەربانەکەی، پێشمەرگەیەك پاسەوانی دەکردن زۆر لەگەڵیان ڕووخۆش و باش بوو، بە جۆرێك بەوپەڕی ئازادی و ئارەزووی خۆیانەوە دەهاتن و دەچوون. بەڵام وێ دەچێ ئەمڕۆکە بەخت یاوەریان نەبێت، کاتێك لە بەختی ئەوان پاسەوانە باشەکەیان گۆڕا و ڕەحمان هاتە جێگەی، ئەو ڕەحمانە تووڕەوتوندەی کە هەمیشە لەگەڵیان خەراپ ڕەفتاری دەکرد، هەمیشە بە ڕوویاندا دەتەقییەوە کاتێك دەیبینی پاسەوانەکە بە نەرمونیانی مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، ئاخر ئەو ڕۆژگارێك لە زیندانەکانی ڕژێم تاڵاوی مەرگی بە گەروودا کراوەو ئازار و ئەشکەنجە نەماوە نەیچەشتبێت، تا دەرفەتی ڕاکردنی بۆ دەڕەخسێت و خۆی دەرباز دەکات.

هەر پێنج زیندانییەکە بە بینینی پاسەوانە تازەکەیان شڵەژان و بە تیلەی چاو سەرنجی یەکتریان دەدا و لەژێر لێویشەوە هەزار و یەك جنێویان دەدا، بە دوودڵییەوە لە دۆخەکەیان دەڕوانی و ئارامییان لێ هەڵگیرابوو، لەوانەیە پاسەوانە نوێیەکەیان بە ئاماژەی نهێنی لێکی دابێتەوە کە هەوڵی گرتن و کوشتنی دەدەن، بۆیە لە شوێنی خۆیەوە نەڕاندی:

- دەی بەبێ چپەچپ و پرتەوبۆڵە کاری خۆتان بکەن. دەی زوو هەڵیبگرن.

هەموویان بۆ هەڵگرتنی کاریتەیەکی گەورە و ئەستوور چەمینەوە و هەوڵیان دا بیجووڵێنن، بەڵام بە هۆی کێش و

گرانییەکەیەوە بە زەوییەکەوە نووسابوو، بۆیان نەجوولا، بۆیە هەموویان قیت بوونەوە و یەکێکیان بە پرتەوبۆڵەوە گوتی:

- ئاخر زۆر گرانە... بەم ژمارە کەسەوە توانای هەڵگرتنیمان نییە!

ڕەحمان بە ڕوخسارێکی گرژ و مۆنەوە قسەکەی پێ بڕی و هاواری بەسەردا کرد:

- هششششششش، پێم گوتن هەڵیگرن و کەستان فزە نەکات... دەی دەی خێراکەن.

جارێکی دیکەش هەوڵیان دایەوە و تیلەی چاویشیان هەر لە پاسەوانە تووڕەوتوندەکەیان بوو، وەك ئەوەی بڵێن: "ئێ خۆ تۆ بە چاوی خۆت بینیت؟ ئێمە هەوڵ دەدەین و توانای بەرزکردنەوەیمان نییە، ئاخر ئەوە لە سەرووی توانای ئێمەوەیە".

خێسەیەکی شەڕانگێزانەی بۆ کردن و گوتی:

- ئەوە بۆ وا بێزارن و دەڵێی داوەشاون، کێتان دەتانەوێ نانی سبەینێتان بهێننەوە؟ هەی زۆڵینە، هەڵیدەگرن یان نا؟!

لەژێر ئەم هەڕەشەیەدا جارێکی دیکە خۆیان دایەوە بەری و هەوڵی جوولاندنیان دایەوە. دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر توانییان کەمێك بیجوولێنن و دواتر کەمێك لە زەوییەوە بەرزی بکەنەوە، ئینجا چۆکی خۆیانی بدەنە بەر، بەم جوولەیەش شەرواڵی هەندێکیان دڕا و قاچیان ڕووشا و برینداربوو، بەڵام چاریان نییە و هەر دەبێ بیکەن، پاشان هەناسەی خۆیان ڕاگرت وەکوو ئامادەباشییەك بۆ بەرزکردنەوەی بۆ سەر شانیان، دەموچاویان بە جۆرێك سوور هەڵگەڕابوو، هەرچی خوێنی جەستەیان بوو هاتبووە ناو دەمارەکانی ڕوخساریان و لە

دەروازەیەك دەگەڕا فـیچقە بکـاتە دەرەوە و بتەقێـتەوە. پاشـان هاوارێکی تۆقێنەر و بەرزیان کردەوە، هاوارێك ڕێك لە هاواری هەڵچووی گۆریلایەك دەچوو، بەو هـاوارەش کـاریتەکە لەسـەر شـانیان جێگیـر بـوو، ماسـولکەی دەسـت و قاچەکانیـان لەبەر گرژبوونەوەیان وا ڕەق بووبوو هەر مەپرسە، خۆ ئەگەر یەکێك سەرنجی بدابوونایە پێی وابوو ئەگەر بزماری لێ دابکوتی نەچێتە ژوورەوە! ئینجـا دەسـتیان بە گواسـتنەوەی کـرد، بەڵام چـۆن ڕۆیشـتنێك و چـۆن گواسـتنەوەیەك، ڕێـك لە ڕۆیشـتنی کیسـەڵ دەچـوو، ئەوان لەم حـاڵەتی شـەکەتی و مانـدووبوونەدا بـوون، ئەوەی لە ناوەڕاستەوە کاریتەکەی هەڵگرتبوو دەستی بە گۆرانی گوتن کرد و خۆی ئاشکرا کـرد، چونکە بە ئاسـتەم شـانی بەر کاریتەکە دەکەوت و کێش و گرانییەکەی بەسـەر شـانی چوار زینـــدانییەکەی دیـــکە دابەش بووبـــوون، کە هەتـــا توانـــای هەناسەدانیان نەمابوو و نەیاندەتوانی دەمیشیان بکەنەوە..

پاسەوانەکەیان داوای لێ کردن لە شوێنی خۆیان ڕابوەستن و کاریتەکە لەسەر شـانیان فـڕێنەدەنە خـوارەوە. پاشـان داوای لە گۆرانبێژەکەیان کرد بچێ بۆ لای، ئەویش شانی خـۆی کە هەر ئەوەتە بەر کاریتەکە کەوتبوو، بە هەنگاوی شپرزە و دڵەڕاوکێوە بەرەو لای پاسەوانەکە چوو، ئەو لە خەیاڵی خـۆی وای دانـابوو زللەیەکـــی تونـــد بە بناگوێیـــدا بکێشـــێت و بە بەرچـــاوی زیندانییەکانی دیکەوە بەر شـەقی بـدات، بەڵام لەو چرکەسـاتەدا بیرۆکەیەکی "بەچێژی" بۆ هات و دەستی بە جێبەجێکردنی کرد:

- بڕۆ ئەوسەری کاریتەکە بخەرە سەرشانت.

ئەوسەری کاریتەکە لایە ئەستوور و گرانەکەی بوو، وەك لە ناوەڕاست و سەرەکەی دیکەی. پاشـان فەرمـانی بەوانەی دیـکە کرد دوو هەنگاو شانیان بەرنە پێشتر. لە کاتێکـدا ئەوان بەوپەڕی

زەحمەتییەوە داواکەیان جێبەجێ دەکرد، ئەویش بە ساردییەکەوە جگەرەیەکی دەرکرد و دایگرساند. قومێکی قوولی لێی دا و دووکەڵەکەی لەسەرخۆ لە دەمییەوە دەرکرد بێ ئەوەی قووتی بدات، دووکەڵی جگەرەکەی بە چڕی لەبەردەمیدا پەرتوبڵاو بووەوە، ئینجا بە خۆشییەکەوە گوتی:

- دەی ئێستا گۆرانی بڵێ... با هەموومان گوێمان لەو دەنگە خۆش و زوڵاڵەت بێت.

ئارەقە وەکوو تاوی باران لە دەموچاوی زیندانییەکەوە دادەباری و بەوپەڕی توانایەوە دەمی قەپات کردبوو، لێوەکانیشی وەها پەنمابوون هەر دەتگوت میزڵدانێکە و ئێستا نا ئێستا دەتەقێت و گرمەی لێوە دێت. چەند ساتێك بەم شێوەیە تێپەڕی. ئەو چاوەڕوانی ئەوەبوو هاکا هێز و توانایان نامێنێت و کاریتەکە هەر لە خۆیەوە لەسەر شانیان دەکەوێتە خوارەوە، وای دانابوو یەکتری دەشێلن، بە تایبەتی ئەوەی کۆتایی کاریتەکەی لە سەرشانبوو، بۆیە ڕەحمان هاوارێکی وای بەسەردا کردن کە ئاگادار بن! خۆیشی نەیدەزانی ئەو هاوارەی چۆن دەربڕی و ئەو هەموو هێزە ئەهریمەنانەیەی لە کوێوە هێنا کە دەنگی دایەوە، وا ڕاچڵەکین، هەترەشیان چوو، لە شوێنی خۆیان چەقین و لێ نەگەڕان کاریتە ئەستوورەکە بکەوێتە خوارەوە. پاشان لەوەی کۆتایی کاریتەکە نزیك کەوتەوە، بە دانەچیڕەوە گوتی:

- خۆ گەرووت وێران کردم، هەی سیسرکی قێزەون. ئەم جارەیان وا بکەیت لەتوپەتت دەکەم... ئێستاش دەی پەلە بکەن هەتا بڕبڕەی پشتتان نەشکاوە.

کاتێك گەیشتنە نزیك ئەو ژوورەی دروستکردنی دیوارەکەی گەیشتبووە بنمیچەکە، یەکێکیان ئاماژەی بۆ

پاسەوانەکە کرد و بە زۆر قسەکەی لە زار هاتەدەر:

- لێ...رە... دایـ... بنـ...ێین؟

پاسەوانەکە بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

- وا دیارە چێژتان لە هەڵگرتنی وەرگرتـووە و دەتـانەوێ هەر لەسەر شانتان بمێنێتەوە، ئەگەرنا بۆ دایناێین؟!

ئینجا کاریتەکەیان فڕێ دایە خوارەوە و خۆیان دا بەزەویدا، وەکوو چۆن هێستر کاتێك بـارەکەی دادەگـرن، شـلوخاو و لە پەلوپـۆ دەکەوێـت، ئەوانـیش کوتومـت وایـان لـێ هـاتبوو. پاسەوانەکە بە تووڕەییەوە هاواری بەسـەرداکردن: بەرەو دۆزەخ، نەفرەتتان لێ بێـت، هەی گـورگە هـار و بەرەڵـلا و چڕنـووك بە خوێنەکـان. هەی سـەگە خـوێڕی و گەڕوگولەکـان. لە ماسـیی گەنیو نەبێ لە هیچ ناچن، کوڕی چەپەڵـینە خـۆ ئەگەر بکەوینـە چنگتان هەر بە ساغی زینـدەبەچاڵمان دەکەن. کـوڕی نەفـرەتینە ئەوەتانێ من لێرەم. منێکـی دروسـتکراوی دەسـتی ئێـوە، ئێـوەی تۆپیـو، بەڵـێ مـن ئەفرێنـدراوی دەسـتە چەپەڵەکـان و بیـرە گەنیوەکانی ئێوەم، هەی شەیتانە سیلاوییەکان. وا باشتر بـوو بیـر بـکەنەوە بەرلەوەی دروسـتم بـکەن. وا شـیاوتر بـوو بیرێـك لە خۆتان بکەنەوە بەرلەوەی من شێت بکەن. ئێوە هیچ نین جگە لە سیسرکەیەکی پیس و بۆگەن، بەڵکوو ئێوە دار شخاتەن و هیچی تـر، کـوڕانی ئیبلـیس هەی دار شـخاتەینە، ئەوەتـانێ مـن دروستکراوی ئێوەم".

ڕەحمان بە جۆرێك دەهری بووبوو، لەو کاتەدا هیچ هێزێـك نەبوو دڵی بداتەوە و ساردی بکاتەوە، ئـاخر ئەو نـاهەقی نەبـوو، ئەو لەگەڵ هەر بیرکردنەوەیەکیـــدا تێکـــڕای ئەشـــکەنجە و ئازارەکـانی بیـر دەکەوتەوە، ئەو ئەشـکەنجانەی لە زینـدانەکانی

ڕژێمدا چەشتبووی، تاڵاوی مەرگیان بە گەروودا کردبوو، بۆیە هەر کاتێك ئەو ئازارانەی بیر دەکەوێتەوە، مرۆڤایەتی خۆی لەدەست دەدات و ڕێك دەبێتە دڕندەیەکی ترسناك.

بەرلەوەی زستان بارگەوبنەی دابنێت ژووری بەندیخانەکەیان تەواو کرد، ژیانیش بە هەمان شێوە بێزارکەر و ساردوسڕییەکەی خۆی بەردەوام بوو، شەو ڕۆژی ڕادەماڵی و ڕۆژیش شەوی بەرشەق دەدایەوە، وەکوو تۆپێکی خڕ لە خولانەوەیەکی بەردەوامدا بوون، شتێکی وروروژێنەر نەبوو، پاشان بەفربارین دەستی پێ کرد و جووڵە و ئەملا و ئەولاکردن سست بوو. وایان لێ هاتبوو شەوە بێزارکەرەکەیان بە قسەوباسی بێزارکەرتر بە ڕێ دەکرد. ناوە ناوەش هەر لەگەڵ هاتنی شەو و تاریکداهاتن هەموویان ڕوویان دەکردە ژوورە گەورەکە کە جێگەی نزیکەی چل بۆ پەنجا کەسێکی لێ دەبووەوە و بە ڕیز و شانبەشانی یەکترییەوە دادەنیشتن و دەوری یەکێك لە پیرەکانیان دەدا و ئەویش ژیاننامەی تێکۆشانی خۆی بۆ دەگێڕانەوە. ئیدی هەمووان گوێیان لێ دەگرت و باوێشکیان دەدا و کەسێکیش بوێری ئەوەی نەبوو ئەو بێزارییە دەرببڕێت، چونکە دانیشتنەکە ئارەزوومەندانە بوو. ئەوەی بە دڵی نەبێت دەتوانێ بڕوات و دانیشتنەکە بەجێ بهێڵێت. کەچی زۆربەیان ئەگەر نەڵێین هەموویان بە مەبەستی بەدەستهێنانی پەرداخە چایەکی زیادە ڕوویان لەوێ دەکرد، چونکە بە بەردەوامی لەو کاتانەدا چای ئامادە بوو. ئاخر بەدەستهێنانی پەرداخە چایەك لەو هەلومەرجە دژوار و دابڕان و گۆشەگیری و ژیانە سەخت و بێبەشە لە هەموو شتێك کە تیایدا دەژیان، زەحمەت بوو، بەڵێ زەحمەت بوو مرۆڤ بتوانێت لە بەرانبەر بەدەستهێنانی پەرداخە چایەك خۆی ڕابگرێت، ئاخر چا لە شاخ و بۆ هەندێك، هەزار

قاورمەی گۆشتی بەرخیش دەهێنێت، تا ئەو ئاستەی ئامادەب وون چەند جارێکی دیکە و بۆ دووبارەش گوێ لە قسە و بەسەرهاتی پیرەکان بگرنەوە، بەو مەرجەی پەرداخە چایەکەیان لەناو دەستدا بێت و جارجارە فڕێکی بە چێژی لێ بدەن. بەڵام دوو زیندانییەکە، ئەوانەی لە خەمی جێبەجێکردنی پیلانەکەیاندا بوون، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ترس و دڵەڕاوکێکەیان زیاتر دەبوو و چاودێریی بارینی بەفری زیاتر و کەڵەکەبوونی بوون لە بەردەم ئەو کونەی بۆ ڕاکردن ئامادەیان کردبوو. ئەوان بە نیازی ڕاکردن نین تا ئەو کاتەی بەفر بە تەواوی بەردەمی کونەکە دادەپۆشێت و لێی کەڵەکە دەبێت، خۆ ئەگەر بە ڕێککەوتیش پاسەوانێك لە دەرەوەی بەندیخانەکە و بە تەنیشت کونەکەشدا تێبپەڕێت، لەو ساتەوەختەی ئەوان دەیکەنەوە، هەست بەوە نەکات و نەیدۆزێتەوە لەبەر کەڵەکەبوونی بەفرەکە. کەواتە زیندانییەکان دەبووایە بۆ چەند ڕۆژێکی دیکەش چاوەڕوان بن، کە لەوانەیە درێژەش بکێشێت تاکوو پلانەکەیان سەربگرێت و نەکەونە تەنگژەیەکەوە. زیندانییە پیلانگێڕەکە ئارامی لێ بڕابوو، چرکە بە چرکە لە خەمی جێبەجێکردنی پلانەکەیدا بوو، ئەوەش دوای ئەوەی زیندانییەکانی دیکەشی قایل کردبوو بەوەی پێکەوە ڕابکەن. هیچ کەسێکیش گرەو لەسەر ئەوە ناکات کە ئەگەر کارەکە دوا بکەوێت باوەڕی ئەوانەی تر چی بەسەر دێت. کەواتە هەر دەبێت ئاسنەکە بە گەرمی بکوتێت -وەك دەڵێن- بۆ ئەوەی شتێکی دەستگیر بێت، بۆیە دەستی بە بیرکردنەوە کرد، ئەوەتا لە کۆتاییدا گەیشتە بیرۆکەیەکی گونجاو کە کاتەکەی پێ کورت بکاتەوە و لە جیاتی ئەوەی چاوەڕوانی بارینی بەفری زیاتر بکات و کاتێکی زۆرتری بوێت بۆ ئەوەی کونەکە بە باشی داپۆشێت، چونکە بەفر لە سەرەتای زستاندا گەلێ زۆر نییە تا مەبەستەکەی ئەو مسۆگەر بکات، بۆیە

دوای ئەوەی بیرۆکەکە لە مێشکیدا بە تەواوی هەوێن بوو، بە کەمێك ڕێز و ترسەوە داوای لە پاسەوانەکە کرد:

- کاکی برا ڕێگەم دەدەیت بەفری سەربانەکە ڕابماڵمە خـوارەوە؟ وەك دەزانـی سـەربانەکە تـازەیە و پێویستـی بە کوتانەوەی بەردەوامی خۆڵەبانەکە هەیە.

پاسەوانەکە پێڵاوەکەی پێ دا و ڕێگەیشی دا بچێتە سەربان. پاشان خاکەنازەکەی دایە دەستی و ئەویش سەرقاڵی ڕامـاڵین و فڕێدان و کەڵەکەکردنی بەفر بـوو بە ئاڕاستەی ئەو کـونەی بـۆ ڕاکردن ئامادەی کرابـوو، هەتـا بەشـێکی زۆری داپۆشـی. دوای ئەوەی لەو کارەی بووەوە، ئینجا دەسـتی بە گێڕانـی بـاگردانەکە کرد، تاکوو خۆڵی سەربانەکە بپەستێتەوە و دلۆپەی ئـاوەکە بـۆ ناوەوە ڕابگرێت. ئیدی هەموو ڕۆژێك و هەر کاتێـك بەفـر زۆر بارییبووایە و سەربانی پڕ لە بەفر بکردایە ئەو کارەی ئەنجام دەدا و زۆربەی بەفرەکەیشـی فـڕێ دەدایە شـوێنی مەبەسـت، هەتـا بەفـرەکە بەژنە زەلامێـك بەرز بـووەوە. کـاتێکیش سـاتەوەختی گونجاوی ڕاکردن هات، بە گوێی هاوڕێکانیدا چپاند:

- هەرچەندە کاتەکە کـورتتر بکەیـنەوە ئەوەنـدە بـۆ ئێمە باشتر دەبێت... چەند خولەکێـك و کـونەکە بە کراوەیـی ئامـادە دەبێت.

ئەو خـۆی لە نزیـك ئەو کـونە دەنووسـت کە بـۆ ڕاکـردن ئامـادە کرابـوو، بە ئەنقەسـتیش پەتووەکـانی لەو شـوێنە لەسـەر یەکتـری دادەنـا و کەڵەکە دەکـرد، هەتـا پاسـەوانەکانیش لەو ڕۆژەوەی ئەوان لە بەندیخانەکەدا بوون، ئەو پەتووانەیان هەر لەو شـوێنە بەسـەر یەکتـرییەوە دەبینـی، زینـدانییە پیلانگێـڕەکە لەو کارەی مەبەستی ئەوەبوو ئەگەر پاسەوانەکە لە ناکـاو لێـان بێتە ژوورەوە، یان لە دەرگاوە سەرنجییان بـدات، ئەوا بە پەتووەکـان

ئەو شـوێنە داپۆشـنەوە، بەمەش پاسـەوانەکە هەسـت بە هـیچ گۆڕانکارییەك نەکات، چونکە پەتووەکان لە شوێنی خۆیان دەبن و سەری کونەکەش دادەپۆشن.

پیلانگێڕەکە بە گوێیدا چپاندن: هەر یەکەو پێیەکانی خۆیـان بە پارچەپەڕۆ بە باشی بپێچن و خۆیان لەژێر پەتووەکانیان درێـژ بکەن و ڕابکشێن. ئیدی هەموویان بە قسەیان کرد و پێی خۆیان بە پارچەپەڕۆ بە باشی پێچا، دیسانەوە بە چپەوە پێی گوتن:

- ئەوەنـدە گەمـژە مەبـن، دەبـێ یەکێکتـان بە پێخواسـی بمێننەوە، تاکوو ئەوانی تر هەمـوو ئامـادە دەبـن، نەبـادا لە ناکـاو پاسەوانەکە بـۆ کارێـك یەکێکمـان بانـگ بکـات، چـی دەڵێـت ئەگەر پێیەکانمـان بەو جـۆرە ببینێـت و پەڕۆی تێـدا ئـاڵێنراوە؟ کاتێکیش بمانەوێ کونەکە ببڕین دەبێ بە خێرایی ئەوە بکەین و یەکێکمـان لای دەرگـاکە ڕابوەسـتێت و چـاودێری پاسـەوانەکە بکات، ئەگەر پاسەوانەکە هات، بە ئاماژەیەکی خێرا ئاگادارمـان بکاتەوە. یان بکۆخێت.

پیلانگێڕەکە هـیچ مانـدوبوونێکی لە ڕاکێشـان و دەرکردنـی بەردی نـاو کـونەکە نەدەبینـی، چـونکە هەمـوو بەردی بچـووك بچـووك و هێنـدەی مشـتێك، یـان گەورەتـر دەبـوون و زۆر وەسـتایانە پردێکـی بە بەردێکـی درێـژ و پـانیش لەسـەرییەوە کردبوو بۆ ئەوەی نەڕووخێتەوە. هەر بەردێکی ڕادەکێشا دەیدایە لاوە و لەژێـر پەتـۆکەی دەشـاردەوە کە سـەری کـونەکەی پـێ داپۆشیبوو. بەمەش نە پاسەوانەکە ئاگادار بووەوە و نە لەو دیوی بەندیخانەکەشەوە کونەکە دەبینرا، چونکە بەفر داپۆشـی بـوو و بووبووە باشترین پەنـاگەو سـەرچاوە بـۆ هەڵاتنیـان. دوای ئەوەی هەموو شتێك سـاز و ئامـادە بـوو، بە بڕوابەخۆبـوونەوە ڕووی لە هاوڕێکـانی کـرد و بە ڕوویانـدا بزەیەکـی کـرد و هانیـدان کە کـارەکە بە ئاسـانی وەربگـرن، لە ترسـی ئەوەی نەبـادا لە ناکـاو

یەکێکیان ورەی بڕووخێت و کارەکەیان لێ تێك بدات.

- باش گوێم لێ بگرن. بۆ هەر کەسێکتان پێنج چرکە هەیە کە بە کونەکەدا تێبپەڕن و بچنە دەرەوە، هیچ دەنگەدەنگێکیش ڕوو نەدات و بە تەنهاش بۆ هیچ شوێنێك یەك هەنگاو نەنێن، هەتا هەموومان دەردەچینە دەرەوە، کاتێکیش چوونە دەرەوە، پێکەوە هەرچیەکم کرد ئێوەش وا دەکەن.

نیو خولەکی نەخایاند هەموویان چوونە دەرەوەی زیندانەکە و ئازاد بوون و بەفر سەرتاپای جەستەی داپۆشیبوون، وەلێ ئەوان هیچ هەستیان پێ نەدەکرد، چونکە جەستەیان بووبووە بزوێنەرێکی گەرمایی و گڕی بۆ بەرهەم دەهێنان، لەناو ئەو سەهۆڵبەندانەدا ئارەقە لەناوچەوانیان دەچۆڕا و لێدانی دڵیان پێشبڕکێی لەگەڵ هەناسەکانیان دەکرد، هێندەی نەمابوو لە ترسان هەر یەکێکیان قاچەکانیان بدەنە دەم باوە و تێی تەقێنن، پیلانگێڕەکە تا ئەو کاتەش بە مێشکێکی ساردەوە مامەڵەی دەکرد، ترسی گەورەی ئەوەبوو نەبادا لەو چرکەساتەدا پاسەوانەکە سەرێك بە ژوورەکەدا بکات و ئاشکرا ببن. بیری کردەوە: "ئەگەر پاسەوانەکە یەك خولەك یان دووان دوای ئەوەی هەڵدێین ئاگای لێمان نەبێت، ئیدی هێز نییە ئەو قاچە هەڵاتووانەمان بگرێتەوە".

ئیدی ئەو قاچ و پێیە پێچراوانە بە پارچە پەڕۆوە، هەڵاتنێك هەڵاتن، وەکوو مووشەك دەرپەڕین. پاسەوانەکەش ئاگای لە مەحمووی بێ زەواد نەبوو، هەڵبەتە ئەویش بەو شەوە ساردە، داخۆ هزر و خەیاڵی دەست لە ملانێی کام بیرکردنەوە بووە و، ئاوێزانی کام باوەشی گەرمی دڵخوازەکەی کردووە، وا لە خەیاڵان ڕۆ چووە، هەرگیز بیر لەوە نەکاتەوە سەرنجی دڵنیایی لە مانەوەی زیندانییەکان بدات. زیندانییەکانیش هەر یەکە و لە ناخی خۆی و بە شێوازی خۆی لە پاڕانەوەدایە: "خوای نەفرەت،

خـوای کەعـبە هێـزی زیـاترم بـدەرێ. خـوای سـۆزانییەکان و گەوادەکان ڕێگەم بدە کاتی زیاتر و درێژتر ڕابکەم".

هەر یەکەیـان بە ڕێـگە و شـێوازی تـایبەتیی خۆیـان بیریـان دەکـردەوە و لە دڵـی خۆیانـدا تکـا و نزایـان بـوو، هـاوڕێی پیلانچییەکە لەگەڵ خۆیدا دەیگـوت: "چـی دەبێـت ئەگەر ئێسـتا بمانـدۆزنەوە؟ پێویسـتە لە سـەرمان هەر ڕابکەیـن و ڕابکەیـن و ڕانەوەستین ئەگەر تەقەشمان لـێ بـکەن. نەخێـر... نەخێـر، ئەگەر بمانـــدۆزنەوە ڕا نـــاکەم و لە بەردەســـتیاندا کڕنـــۆش دەبەم و دەگــــرییم و داوای بەزەیـــــی و لێخۆشـــــبوون دەکەم. لە گریانەکەشمدا ڕاستگۆ دەبم و پێیان دەڵێم ئەم نەفرەتییە وای لێ کردم ڕابکەم، ئەگەرنا مـن ڕۆژێـك لە ڕۆژان بیـرم لە ڕاکـردن، یان فێلکردن لە ئێوە نەکردۆتەوە، پێیان دەڵێم: ئێـوە مرۆڤدۆسـتن و بە مرۆڤدۆستی و خۆشەویستیی خۆتان بمبەخشن... بەڵام کـێ دەڵـێ دەمانبەخشـن؟! نەخێـر هەرگیـز بـاوەڕ نـاکەم بمانبەخشـن. ئەوەندە لەگەڵمـان سەرسـەخت و تونـدوتیژ دەبـن هەر مەپرسـە، هەتـــا ئەگەر لەســـەر چـــۆکیش کڕنۆشـــیان بـــۆ بەریـــن و لە پەشیمانیشـدا بگـرییێن و شـیوەنیش بکەیـن هەر سـوودی نابێـت. کەواتە هەر ڕاکردنەکە چارەسەرەو ڕاکـردنەکەش دەربـازبوونە". بەڕێـوەبەری پـلانەکەش لە دڵـی خۆیـدا دەیگـوت: "خـۆ ئەگەر ئێستا بماندۆزنەوە خۆم دەکوژم... بەڵام چۆن خۆم دەکوژم و بە چـی؟ مـن هـیچ شـتێکم پـێ نییە خـۆمی پـێ بکـوژم، کەواتە ناچاریـان دەکەم بمکـوژن، چـونکە هەر ڕادەکەم و ڕاناوەسـتم هەتا تەقەم لێ دەکەن و دەمکوژن... هەرگیز ڕاناوەستم و ڕێـگە نادەم جارێکی دیکە بە ساغی بمگرنەوە".

دوای مـــاوەیەك ڕاکـــردن، ئینجـــا هەســـتیان بە پێـــوەچزانی بەفرەکە و سـووتاندنە ئازاربەخشـەکەی بـن پێیـان دەکـرد، بـۆیە پیلانگێڕەکە بانگی کردن:

- بەرەو ڕووبارەکە... بەرەو ڕووبارەکە، با پێیەکانمان گەرم بکەینەوە.

بەفرەکە پێیەکانیانی شەقار شەقار کردبوو، ئاوی ڕووبارەکە کەمێك گەرمایی پێ بەخشین و ئاگری پێوەجزانی بەفرەکەی کپ کردەوە، ئیدی بەناویدا دەستیان بە ڕاکردن کرد، بەڵام لە ترسی لەدەستدانی کات، ئاوەکەیان جێ هێشت و گەڕانەوە ناو بەفرەکە و بە هەڵبەز هەڵبەز و بە لێواری ڕووبارەکەدا شۆڕبوونەوە، هەر کاتێك ئازاری بەستنی بەفرەکە دەیچزاندنەوە، ئەوان سەرلەنوێ پێیەکانیان دەخستەوە ناو ئاوەکە.

- خێراکەن خێراکەن. دەبێ پەلە بکەین، ئێستا ناوچەکە ئابلۆقە دەدەن، هەرچەند خێراتر ڕا بکەین زیاتر و باشتر، پاراستنی گیانی خۆمان مسۆگەرتر دەکەین.

دوای ماوەیەك نازانم کورت بوو یان درێژ، پاسەوانەکە بە هەڵاتنیانی زانی، ئیدی زەنگی تەلەفۆنی نێوان ژوورەکان دەستی بە لێدان کرد، پیرەکان شێت و هار بوون، ئاخر ئەم کارە ئەوپەڕی سووکایەتییە بۆیان، ڕێز و سەنگیان لای سەرکردەی هێزە هاوپەیمانەکانی دیکە ناهێڵێت. دەستیان بە هەناردەکردنی دەستە دەستەی پێشمەرگەکانیان کرد، تاکوو شوێن پێیان هەڵبگرن و بیاندۆزنەوە، بەڵام ڕووبارەکە یارمەتیی هەڵاتووەکانی دا و شوێن پێیەکانیان ون کرد. ئیدی ئاوەکەیان جێ هێشت و بە چەپ و ڕاستدا کەوتنە گەڕان و بە دوای ڕێگەیەکدا دەگەڕان بیاندۆزنەوە. هەر کە شوێن پێیەکانیان دەدۆزییەوە جارێکی دیکە ونیان دەکردەوە و دەچووەوە ناو ئاوەکە، بەمەش کاتەکەیان بە خێرایی لە دەست دا و هیچیان بە هیچ نەکرد، هەموویان ڕێك و ڕێك گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان!

## بەشی حەڤدەیەم

"پشتئاشان" ئەو گوندەی لە لاپەڕەکانی مێژوودا پەڵەیەکی شەرمی مرۆڤایەتی نایە تەوێڵی ئەوانەی خیانەتیان لە براکانیان کرد. ڕێك ناوەکەی بە خۆیەوەیە، ڕۆژگارێك ئاشەکانی کە بە ئاو کاریان کردووە، لە خزمەتی خەڵکی ناوچەکەدا بوون، تا ئێستاش کەس نازانێت کەی و چۆن ئەو گوندە بەردی بناغەی دانراوە؟ ڕێك لە چەقی نێوان گوندەکانی کاسکان و قرناقە و ڕەژیکەریان و بیانە و کۆپنگە و کانی جەنگە و شاخی کونەکۆتردایە، ڕۆژگارێك قوتابخانە و نەخۆشخانە و زۆرێك لە پێداویستییەکانی سەردەمی تێدا دابین کراوە، ڕۆژگارێکیش دەسەڵات ئەمیشی وەکوو دەستەخوشکەکانی دیکەی کاول و وێران کردووە و ڕایگواستوون.

هەندێك لە جووتیارانی گوندی پشتئاشانی کاول و وێرانکراو لە هاوینی ڕابردووەوە گەڕابوونەوە گوندەکەی خۆیان، گوندەکە لە سەرووی بارەگای پیرەکانەوە تەنها دە خولەکێك بە پێ دوور بوو. جووتیارەکان خاوەنی ڕەسەنی خاك و باغ و بێستانەکان بوون. بە درێژایی ڕۆژ سەرقاڵی کۆکردنەوەی بەری دارگوێزەکانیان بوون و بایەخیان بە درەختە بەرییەکانی دیکەشیان دەدا، بوونیان جۆرێك لە ژیانی بەو ناوچە جوان و دابڕاوە لە جیهان بەخشیبوو. ئەم ناوچەیە پێشبینیی ئەوەی لێ دەکرا لە ئایندەدا هەڵاتووەکان سوودی لێ وەربگرن و وەکوو ئەڵقەی گرێدانی نێوان ئەو گوندانەی دەکەونە ناو سنووری ئێران و گوندەکانی ئەمدیو بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی خەڵکی بەکاری بهێنن، بە تایبەتی لەو

قەیرانـانەی کە خەڵکـی بە هـۆی ئەو شـەڕە نەگریسـەی نێـوان هەردوو وڵاتەوە تووشـــی هـــاتبوون. بەڵام گرفتـــی گەورە و کۆسپی بەردەمی ئەو گرێدان و بەستنەوەیەی نێوان هەردوو دیو و گونـدەکانی هەردوو لا، ئەو شـاخە بـاڵابەرز و سـەرکەش و ترسناکە بوو کە پێیان دەگوت "قەندیل"، ئەو قەندیلەی یەکێکە لە چیایە بەرزەکانی ئێران، قەندیل سێکوچکەی سنووری ئێران و عێراق و تورکیـایە، گەیشـتنیش بە لـوتکەکەی وا ئاسـان نییە و پێویستیی بە کەرەستە و پێداویستیی خـۆی هەیە، هـیچ کەسـێك توانای گەیشتن و تێپەڕبوونی نییە، بە هۆی ئەو هەموو زریـان و بەفرە توانـاپڕووکێن و تاشـەبەرد و قەدپـاڵە تووشـانەی هەیەتـی، هەمـوو ئەمـانە وا لە مـرۆڤ دەکەن خـۆی بـداتە دەسـتەوە و پێشـبڕکێ و ململانێیەکـی پێشـینە دۆڕاو لەگەڵ سرووشـتەکەیدا نەکات. وەلێ گوندنشینەکانی دەڤەرەکە لە بەردەم سەختییەکەیدا چۆکیان دانەدەدا و لە سەرکەوتن و بڕینی ئەو شاخە سەرکەشـە دەسـتەپاچە نەبـوون، بە تـایبەتی لەو وەرزانەی کە زریـان و هەرەس و دارمـانی بەفـر هەڕەشـە لە مرۆڤەکـان دەکەن، جـگە لەوەش جووتیارەکان ڕێگەی پێچاوپێچی دیکەیان بە ناو دۆڵ و قەدپاڵەکـانەوە چـێ کردبـوو، هەرچەنـدە درێـژ و پـڕ کێشـە و دۆخەش بوو، وەلێ بۆ ئەوانەی ڕێگەکەیان دەزانی بـێ کێشـە و تا ڕادەیەك ئاسانیش بوو.

گوندنشینەکان زۆر بە جوانی لە سرووشت و مەترسییەکانی گەیشـتبوون و ڕێزیـان لە توانـا بێئەندازەکەیشـی دەگـرت، هۆکارەکانیش هەرچییەك بن، ئەوان هەرگیز ڕووبەڕووی نابنەوە.

سرووشت تـا ئێسـتاش کـپ و خامۆشـە، وەرزی زسـتان تـا ئێسـتاش لە سـەرەتادایە، ئەوانەی ڕوویـان لە دەڤەری پشتئاشـان کردبـوو خۆیـان لە ژوورەکانیـان پەسـتابوو و باوەشـیان بە

زۆپاکانیاندا کردبوو، شەوگارە دوورودرێژ و تواناپڕووکێنەکانیان بەوپەڕی بێزارییەوە بە ڕێ دەکرد و هیچ گۆڕانکاری و شتێکی نوێ لە ئارادا نەبوو. بۆیە هەستەکانیان بەر لە جەستەیان لە خەوێکی قووڵدا بوون، هەستیان بەوە نەدەکرد کە چ جوانییەك لەو سرووشتە سەرشێتەیدا خۆی مەڵاس داوەو زۆر جار دوای تووڕەبوونەکەی خەندەیەك دەکات و خۆشی بە دڵان، دەبەخشێت، هەر ئەمەش وای لە شاعیرێکی ویژدان و هەست و نەست زیندوو کردووە بڵێت:

با بچینە کوێستان بۆ گەشتی ئەو ناوە

قەندیل مەندیلی هەر فڕێ نەداوە..

ئاخر قەندیل ساڵ دوانزەی مانگ و هەر چوار وەرزەکە ئامادە نییە مەندیلە سپیەکەی سەری بۆ هێزی گەرمایی و تیشکی هەتاوی چلەی هاوینیش بێنێتە خوارەوە، وەلێ ئەو قەندیلە شێتە کاتێك دوای هێمن بوونەوەکەی تووڕەش دەبێت، لە ناخی مرۆڤە مرۆڤدۆست و تێکۆشەرەکاندا هەر جوان و جوان دەردەکەوێت، ئەمە یاسای سرووشتە و منەتی بە کەس نییە، دێت و دەڕوات، ئاهەنگ و پێکەنین ساز دەکات و قوڕیش بۆ ئازیزان دەگرێتەوە. ئەم سرووشتە شێتە دەمێکە شەمەندەفەری خۆشەویستی جێی هێشتووە، بۆیە لەسەر شۆستەی وێستگەکە بێ ئەوەی بڕوات لە چاوەڕوانیی هاتنی شەمەندەفەرێکی دیکەدایە، لەوانەیە لەم دڵتەنگییەی دەرباز بکات و بەرەو ئامێزی شوێنە خۆشەکانی بەرێت. هەر بۆیەش وا خۆی ڕازاندۆتەوە، وەك ئەوەی بۆ ئاهەنگێکی هەڵپەڕکێ لە ساز و ئامادەباشیدا بێت، ئاهەنگێك هەمووان تیایدا لەوپەڕی خۆشی و سەمادا بن. ئەوەتانێ بایەکە کڕ و مانگەکەش لە چواردەدایەو مانگەشەوەکە ناوچەکەی کردۆتە چراخان. بەفریش بریسکەی دێت و ڕەنگە

سپییەکەی ڕەنگی قاوەییەکی مەیلەو سووری جوانی پۆشیوەو مانگیش لە شەرمان کوڵمی بەفرو شاخ و دەشت و دەری سوور هەڵگەڕاندووە. تێکڕای ئەو دیمەنە جوان و قەشەنگانە ڕۆحی مردوو زیندوو دەکەنەوە و سەرلەنوێ گیانی پێ دەبەخشنەوە و هەستە نووستووەکانیش بە ئاگا دەهێننەوە. ئەمە چ سرووشتێکی سەرنجڕاکێشە، کاتێك بەهرەکانی قوڵپ دەدەن و کانیاو ئاسا دەتەقنەوە. توانایەکی داهێنانی ئەوتۆی تێدایە هیچ هونەرمەندێك تا ئێستا لە دایك نەبووە شان لە شانی داهێنانەکانی بدات، لێرەدا سرووشت تەلیسمە و تەلیسمیش سرووشت، هەردووکیشیان لە لوتکەدان. وەلێ شەمەندەفەری خۆشەویستی نائومێدی کردووە و ناخی شڵەژاندووە، مەحاڵە بۆ هەتاهەتایە بەرگەی چاوەڕوانی بگرێت، بێزاری و وەڕسبوونی دواکەوتنی خەریکە سەرلەنوێ تووڕەیی ڕۆحی بتەقێنێتەوە، خەریکە دۆ و دۆشاوێ تێکەڵ دەکات و هەرچی لە دەوروبەریدایە بەر چەپۆکانی دەدا، وەکوو چۆن ماوەیەك پێش ئێستاش ئەو ڕەنگە جوانانەی تابلۆی شاخەکانی ڕازاندبووەوە بە سەر یەکتریدادان و هەرچی گوڵ و گژوگیاو پەپوولەی باڵنەخشین هەبوون پووکاندنییەوە و باڵەکانی هەڵکرووزاندن، کەوتە ڕاوەدوونانی باڵندە و سمۆرە و کەروێشکەکان و هەر یەکە و بەلایەکدا ئاوارەی کردن، هەورێکی ساردی لە شاخەکان پێچایەوە و ئیدی تا چاو بڕ دەکات، جگە لە باهۆز و زریانی سەرشێت و کرێوەو ساردی بەولاوە شتێکی دیکە بە دی ناکرێت. لە ناکاو جوانی کۆچ دەکات و گەرماییش دادەهێزرێت و مەرگی خۆی ڕادەگەیەنێت، وەکوو چۆن هەموو زیندەوەرەکان و ئاژەڵەکان کۆچ دەکەن، کاتێك ژیان تەنگیان پێ هەڵدەچنێت، سەری خۆیان هەڵدەگرن و ئەوەی لایان دەمێنێتەوە ئەو سۆز و یادەوەریانەیە کە هەیانە. ئەوەتانێ ژیان و شاخەکان، تەنها بەو

خەلقەندە بێدەسەڵاتانە دڵتەنگ نەبوون، بەڵکوو هەتا بە دوژمنە ڕمووزنەکەی ڕەحمانیش بێزار و وەڕسە، ئەو ناحەز و دوژمنە سەرشێتەی کە هاوسەری خاتوونەکەی خوشکی کچە بەفرینەکەیە، ئیدی شاخەکان توانای لەخۆگرتنیانی نەماوە، ئەوانیش بەم وەرزە ترسناکە ڕوویان لەم دەڤەرە کردووە، بە دوای دۆزینەوەی پەناگەیەکی ئاسوودە و ئارامدا دەگەڕێن، بەڵێ، کاتێك زەوی بۆ کەسێك بەرتەسك دەبێتەوە و ناچاری دەکات مل بە داروبەردەوە بنێت، بەڵکوو ئەمە خوایە لە کۆچکردن و هەڵاتنیدا دەرگا و دەروازەیەکی لێ بکرێتەوە. خاتوونەکەش لەگەڵ کەسێك، کە تا ئێستاش ڕەحمان نایناسێت و بە سەرشێت و بەرەڵڵا دایدەنێت، بەرەو چارەنووسێکی نادیار ماڵئاوایی دەکەن و دەڕۆن و دوور دەکەونەوە، ئەو سەرشێتەی جیاوازی لە نێوان جوانی و ناشیرینی و ساردی و گەرمیدا ناکات.

تا ئێستاش ڕەحمان پێی وایە ئەو شێتە خۆشەویستەکەی لێ ڕفاندووە و بە زۆری زۆرداری هەڵیگرتووە، یان خۆی لە گێلی دەدات و بە خەیاڵ باوەڕێکی وای بە خۆی هێناوە، کە هیچ گومانێك هەڵناگرێت، کە ئەو شێتە وەکوو کۆیلە و دیلێك بۆ خۆی بردوویەتی و بۆ هەر شتێك خۆی بیەوێ ملکەچ و ناچاری دەکات، لەو سارد و سەرمایەدا وەپێشی خۆی داوە و گوێ بەوە نادات ئەم سرووشتە سەرشێت و دڕندە مرۆڤکوژە چی لە خاتوونە ناسك و تەنکەکەی دەکات. ئاخر ڕەحمان بە شێوەیەکی تیژ تێپەڕ هەواڵی ڕۆیشتنی خۆشەویستەکەی لە یەکێکیانەوە بەر بای گوێی کەوت و ڕایچڵەکاند، ڕاچڵەکاندنێك وای لێ کرد، خۆی و هەموو شتێك لە بیر بکات و دوایان بکەوێت، باجەکەیشی هەرچییەك بێت، ئامادەیە لەو ململانێ

ترسناکەی لەگەڵ ئەو سرووشتە پڕ لە باوبۆران و گێژەڵووکەیەی کە زۆر لە دوژمنەکەی شێت و گەمژەتر بیدات و گیانی خۆیشی ببەخشێت و بکاتە قوربانی، ئاخر ئەمە چ شەیدابوون و شێتی و گەمژەییەکە..؟! بڕیارێکە و داویەتی، ئەگەر لە کەشکەڵانی فەلەکیش بن، یان زەوییش قووتی دابن، هەر دەبێ بیاندۆزێتەوە و لە دەستی ڕزگاری بکات. ئەو کاتێك گوێبیستی ئەو هەواڵە بوو کە خاتوونەکەی لەگەڵ هاوسەرە شێتەکەی بە گوندی پشتئاشاندا تێپەڕیون و ڕێنیشاندەرێکیشیان بە کرێ گرتووە، تاکوو بیانگەیەنێتە گوندێکی سەر سنووری ئێران و بە ناو ئەو دۆڵە تەنگەبەرەی چیای سەرکەش و ترسناکی قەندیلدا بیانبات، ئیدی بە جۆرێك شێتگیر و هەراسان بوو، مەحاڵە وێنایەکی تەواوی بکرێت، ناخی ئاگری گرت و ئۆقرەی لێ بڕا، ئەو لە دڵی خۆیدا دەیگوت هەرگیز ئەوە نابێت، مەحاڵە مەحاڵ، مەگەر ڕێنیشاندەرەکە لە بەر هۆیەکی تایبەت ئەو سەرکێشییەی کردبێ و ئەوانی بەو شوێنەدا بردبێت، پەلەکردنەکەیشی بەو ئاڕاستەیە هەر بەو هۆیەوە بووە بەرلەوەی کەشوهەوا خەراپتر ببێت. بۆیە زیاتر لە دوو کاتژمێرێك بەولاوە لە پشتئاشان نەماونەتەوە، ئەوەش بۆ پشوودانێك و نانخواردنێك نەبێت، پاشان هەرسێکیان بەرەو ئامانجەکەیان لە ڕۆژهەڵات تێیان تەقاندبێت و ڕۆیشتبن. ئەگەرنا کام مرۆڤی عاقڵ کاری وا دەکات؟ ئاخر ئەوە جۆرێکە لە سەرشێتی و بەگژداچوونەوەی سرووشت، ئینجا چ سرووشتێك و لە چ وەرزێکیش، زستان... وای لە زستانی قەندیلێ، کە دار و بەرد و هەموو شتێکی تێدا دەبێت بە سەهۆڵ. هەرچەندە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا و دەیبرد نەدەگەیشتە هیچ دەرئەنجامێکی لۆژیکی و دڵخۆشکەر، ئەو کاتەی ڕەحمان هەواڵەکەی بیستبوو و لەگەڵ خۆیدا کەوتبووە ئەو لێکدانەوانە، نیوەی ڕۆژەکە تێپەڕیبوو. بۆیە بە جۆرێك خەم

دایگرتبوو و دڵی گوشرابوو و هەناسەی سوار بووبوو، مەحاڵە مرۆڤ توانای گێڕانەوەی هەبێت، ئاخر ئەو بەو هەواڵە هەموو شتێکی دەوروبەری خۆی لە بیر کردبوو، هەتا خودی خۆیشی، تەنها ئەو نەبێت. بۆیە لاقەکانی سەرخۆش ئاسا چەپ و ڕاستیان دەنووسی و بێئاگایانە هەنگاویان دەنا. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "هەر دەبێت شوێنپێیان هەڵبگرم و بیانگەمێ، ئاخر ئەوە تاکە دڵخواز و دڵبەر و خۆشەویستی منە، نەك هی ئەو دڕندەیە. دڵنیام ئەوان هێشتا زۆر دوور نەکەوتوونەتەوە، نێوانمان تەنها نیو ڕۆژە ڕێگایەکە بە پێ، لە پێناویدا ڕۆژ بە شەو و شەو بە ڕۆژەوە پینە دەکەم و ڕاناوەستم هەتا دەیانگەمێ، هەرگیز ڕاناوەستم و بۆ ساتێکیش پشوو نادەم، ئاخر من جاری دیکەش وام بەسەر هاتووە ڕۆژێك و دوو شەو بەبێ ڕاوەستان تەنها چەند خولەکێکی ناچاری نەبێت ڕانەوەستاوم. ئەم جارەشیان لە پێناوی ئەودا دەیکەم، قیروسیا ئەوپەڕی گیانی خۆمی لە پێناودا دەبەخشم، بەڵام ئەی چۆن پارچە نانێکم چنگ بکەوێت، ئاخر ئەوە ڕێگەی هاتونەهاتە، بەبێ پارچە نانێك و لەم سەهۆڵبەندانەدا دڵنیام لە سەرمان و لە برسان ڕەق هەڵدێم و سندانم دەگاتێ و بە ئاواتی خۆیشم ناگەم".

ئەو دەیزانی لە ڕێگەیدا دوو گوند هەن و یەکێکیان کاول و وێرانەیە و کاتی خۆی چەندماڵێکی دوو خێزانی گەورە کە هەردوولایان پەیوەندی خزمایەتییان لە نێواندا هەبووە ئاوەدانیان کردۆتەوەو تێیدا نیشتەجێ بوون، وەکوو زۆربەی گوندە شاخاوییەکان، لەوێوەش دۆڵ و قەدپاڵێکی درێژی لێ دەبێتەوە، بە دڵنیاییەوە ئێستا بەفرێکی چڕ دایپۆشیوە و ماوەی دوو کاتژمێرێك ڕێگا دەبێت، تا دەگاتە گوندێکی دیکەی کەمێك گەورەتر و دەکەوێتە لای ڕۆژئاوای ئەو ڕێگایەی ئەوان

دەیگرنەبەر. ڕەحمان بە دووری زانی ئەوان ڕووی تێ بکەن و تێیدا بمێننەوە، چونکە مانەوەیان دوایان دەخات و کاتیان لێ دەکوژێت، لە کاتێکدا ئەوان زۆریان پێویستی پێیەو نایانەوێ لە دەستی بدەن، ئاخر کەشی ئێرە وەك ئاشی نیسکە بەر و پشتی بۆ نییە، هاکا لە ناکاو گۆڕانی بەسەردا هات و زریانەکە گورگئاسا دەستی بە لوورەلوور کردەوە، ئەو کاتە کرێوەی بەفر و زریان لە پەلوپۆیان دەخات، وەلێ بۆ ئەوەی ڕەحمان بگاتە لای دووڕیانی دوو قەدپاڵەکە، پێویستیی بە نیوڕۆژە ڕێگا و بگرە زیاتریش هەیە، چونکە دەبێ بە پشت.ئەو شاخە سەرکەشەی لە پێشیدا چەقیوە بسووڕێتەوەو پێچ بداتەوە. گومانیش لەوەدا نییە کە ئێستا خاتوونەکەی و ناحەزەکەی خەریکە بە ئاسانی بگەنە سنوور، هەڵبەتە ئەمشەو لەوێدا دەمێننەوە و سبەینێکە دەست بە ڕۆیشتن دەکەنەوە. ئەوەی زۆر ڕەحمانی نیگەران کردبوو و خەیاڵدانی دەرزیئاژن دەکرد، بیستنی ئەو هەواڵە گورجکبڕە بوو کە لە ناخەوە ڕەحمانی وێران کردبوو، ئەویش ڕۆیشتنی یەکجارەکیی ئەو گەمژەیە و بەجێهێشتنی وڵاتە و گەڕانەوەی بۆ نییە، ئەمەش واتای هەڵگرتنی خاتوونەکەیەتی، کەواتە بۆ هەتاهەتایە لەوانەیە چاوی بە چاوی نەکەوێتەوە. ئەو ئاڕاستەیەی ئەوانیش ڕوویان تێ کردووە، ڕێك بەڵگەی ئەو بۆچوونەی ئەوە. لە ناخی خۆیدا هەزار و یەك لێکدانەوەی بۆ دەکرد، بە خەمێکی قوولەوە گوتی: "ئەم شێتە لەم شاخانە باشترین و جوانترین ئافرەتی سەر ڕووی زەوی بەدەست هێنا و لێی دا ڕۆیشت، ئاخر ئەو دەبەنگە خوایەکەی لێ بردم و پەرستگاکەی کوێر کردمەوە".

لەو بارەگایە کەسێك نەبوو بە ڕووی ڕەحمانی لاساردا بوەستێتەوە و ڕێگەی لێ بگرێت و لە بڕیارەکەی پاشگەزی

بکاتەوە. ئاخر ئەوان لە بنەڕەتدا هیچیان نەیاندەزانی ئەم نەگبەتە چی لە ناخیدایە و بۆچی وا دەکات؟! یان خۆ لەوانەیە وایان زانیبێت لە پشت ئەوانەوە ئەرکێکی پێ سپێردراوە و ناچارە جێبەجێی بکات. چونکە ئەوان لەگەڵ ئەو جۆرە گەشت و سەرەڕۆییانەی ڕەحمان ڕاهاتبوون. ئەو هەمیشە حەزی لەوە بوو سەرکێشی لەگەڵ ئەو سرووشتە سەخت و دژوارەدا بکات، بەو قەدوباڵا باریکەڵەیەی خۆی لەگەڵیدا بکەوێتە زۆرانبازی و هەوڵی بردنەوەی بدات. سرووشتیش بەوپەڕی خوێنساردییەوە هەڕەشەکەی پەسەند دەکرد و لە ڕووی کاتبەسەربردن و شۆخییەوە، ئەوەندە گوێی بە قەبەیی و باریکەڵەیی جەستەی بەرانبەرەکەی نەدەدا، چونکە هەردووکیان، چ زل و قەبەکە و چ باریکەڵەکەش لە بەرانبەر سەختیی ئەودا لەوپەڕی بێدەسەڵاتیدان، ئاخر ئەوە سرووشتە سرووشت، گەمەی پێ ناکرێ، سرووشتی کوێش! سرووشتی قەندیلێ... وای لەو قەندیلە ترسناکەی بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە! بە دیوێکی دیکەشدا پەناگەی لێقەوماوانە. ڕەحمان لەو چرکەساتەدا ئەو گۆرانییە کوردییە شۆڕشگێڕییەی بیر کەوتەوە کە دەڵێت:

لە قەندیلی سەربەرزەوە هەواڵت بۆ دەنێرمەوە

شەهیدبوونم شانازییە، دایە ڕەنگە نەتبینمەوە.

ئێ چ قەیدی، دەبا ئەویش شەهیدی خۆشەویستەکەی بێت و بۆ هەتاهەتایە دایکی نەیبینێتەوە و لەو قەندیلە سەربەرزەوە هەواڵی مەرگی مسۆگەری بە هەموو لایەك ڕابگات. هەڵبەتە ئەوەی سرووشت بە ڕەحمانی کرد، پێشتر بە زۆر کەسی دیکەیشی کردبوو، ڕێك وەکوو ئەو پارتیزانەی زۆرانبازیی لەگەڵ شەپۆلە ڕقاوییەکانی ڕووبارەکەدا کرد و لەگەڵ خۆیدا ڕایماڵی و نەگەڕایەوە. ئەو سرووشتە شێتەی هیچ هێزێك نییە

بـازووە بەهێزەکـانی بچەمێنێـتەوە، جـگە لە عەقـڵ و زیرەکـی و بلیمەتـی و ئـارامگری و خـۆڕاگریی مرۆڤەکـان نەبێـت. ئەو لە خەمی ئەوەدا بوو، ئەو شێتۆکەیەی کە خۆشەویستەکەی لێ برد، خۆی و ئەویش پێکەوە لەناو دەبات. ڕۆیشتنی لەم کاتە ناسکەدا هیچ ژیری و زیرەکییەکی تێدا نییە، بەڵکوو جـگە لە سەرشـێتیی مرۆڤێکی گەمژە بەولاوە کە توانای بیرکردنەوەی نەبێت، شتێکی تر نییە. ئەو کەسەی هەلومەرج و ڕۆژگارەکە وایـان کـرد ببێـتە ناحەزی ڕەحمـان، ئەو ڕەحمـانەی نایەوێـت ئەو خەیـاڵپڵاوییە لە مێشـکی خـۆی دەربکـات و بەوە ڕازی بێـت کە ئەو شـێتۆکەیە دڵخوازەکەی ڕفانـد و خەونە ئەرخەوانیـیەکەی زڕانـد و هەمـوو شـتێکی تێکوپێـك دا، هیـوا و ئاواتەکـانی هەڵپڕووکانـد و هەتـا تررووسکاییەکی کەمیشی لە ژیان بۆ نەهێشتەوە و خاتوونەکەیشی لێ دزی. ئەو هەموو خولیا و خەونانەی بە مۆتەکەیەکی ترسناك گـۆڕییەوە کە نـاخ دەهەژێنێـت و ڕۆح دەخنکێنێـت و خەو دەزڕێنێـت، ئەو مـرۆڤەی خۆشەویسـتەکەی لـێ دزی و هەڵات، ژیـانی ئەمـیش دەدزێـت و دەیبـات، ئـاخر ڕۆیشـتنی لەم وەرزە بـاوبۆران و زریـان و سـەهۆڵبەندانەدا ئەوپەڕی گەمـژەییە. وەك ئەوەی ئەو مـرۆڤە شـێتە لەنـاو کەللەسـەریدا مێشـکی ماسـییەکی هەبێـت، نـا نـا هەتـا ماسـیش لەم باشـترە، ئـاخر خـۆ ماسـیش یادگەیەکی وای هەیە لایەنی کەم بـۆ مـاوەی چەنـد چـرکەیەك هەست بە مەترسییەکان دەکات و خۆی لێیـان دوور دەخـاتەوە، وەلـێ ئەم گەمـژەیە هەرگیـز پەی بەو مەترسـیانە نابـات کە هەڕەشەی لێ دەکەن، بەڵکوو هەتا درکیشیان پـێ ناکـات. ئەمە چ بەڵایەکە تووشیان بـووە؟! لەنـاوچوونی هەموویـان بە دەسـتی ئەم گەلحۆیە دەبێت. گەمژەییەکەی هەتا پاڵی بە ڕەحمانیشەوە نا بخزێتە ناو ئەم ململانێ دۆڕاوەی کە پێشوەختە دەرئەنجـامەکەی ڕوون و ئاشـکرایە و خـۆی بـۆ سـاز و ئامـادە نەکـردووە.

زۆرانبازییەکی دۆڕاوە لەگەڵ دوژمنێکی بەهێز کە هەرگیز بەزەیی بە کەسدا نایەتەوە، دوژمن و ناحەزێك بەوەندەوە نەوەستا کە خوشکە جمکەکەی بکاتە کێلێکی بەفرینی ڕەقهەڵاتوو، دڵنیایە ئەمیش دەکاتە کێلێکی بەستوو و بێگیان لە شوێنێکی ئەم شاخە سەختە. خوشکەکەی لە چیای حەسارۆستی نەفرەتی بەفر ڕەقی کردەوە، ئەمیش لەم قەندیلە نەفرەتاویترە دەبێتە پارچەیەك لە بەفر.

ئەم دوو خاتوونە جوانکیلەیە بوونە قوربانی مێردەزمەی سرووشت و دڕندەیی نەریتە هیچ و پووچ و قێزەونەکانی خەلکی. ڕەحمان بە ڕژدی و پەرۆشییەوە گوتی: "من ڕزگارکەری تۆم و ناگەڕێمەوە، بڕیارێکە داومە و لێی پاشگەز نابمەوە، چاوەڕوان بە فریشتەکەم بۆ لات هاتم، هاتووم بۆ ئەوەی لە چنگی ئەم سرووشتە سەخت و سەرشێتەت دەربهێنم. لە چنگی ئەو دێوە ناقۆڵایەی هیچ ڕێز و سەنگێکی بۆ ناسکی و شۆخوشەنگییت دانەناوە و بەرەو ئەو چارەنووسە نادیارە پەلکێشی کردوویت ڕزگارت بکەم".

کاتێك ڕەحمان ڕووی لە لوتکەکان کرد، پارچە نانێك و کەمە ئاوێکیشی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت، سەرباری ئەو چەکەی ڕۆژێك لە ڕۆژان لە شانی نەبووەتەوە، لەگەڵ پەتوویەکی تەنکی پەلکەپیازئاسا سووك، لە شێوەی پەتێك لوولی دا و ئەمسەر و ئەوسەری پێکەوە گرێ دا و کردیە شانی ڕاستی و بەسەر سمتی چەپیدا سووڕاندییەوە و شۆڕی کردەوە. توێشووی سەفەرە و مرۆڤ ئەگەر لەو ڕێگایانە پێشتر بیرێك لە خۆی نەکاتەوە، بە دڵنیاییەوە ڕۆح دەرنابات، لە شوولەداری تەڕ و دەزووی گووشیش تۆڕێکی چنراوی ژێر پێڵاوی ناوبەفریشی بۆ خۆی دروست کرد، کە نزیکەی دوو بست درێژ و بستێکیش پان

دەبوو، ئەوەیشی خستە ژێر پێڵاوەکانی، تاکوو ڕۆیشتنی بۆ ئاسان بکات و قاچی لە بەفرەکە زۆر نەچێتە خوارەوە. سێرە نیگایەکی سرەواندە دەوروبەری خۆی و بینی لوتکە بەرزەکان یەکیان لەوەی تر سەرکەشتر خۆیان دەنوێنن، ڕەحمان ڕووی لە یەکێکیان کرد و ئاوڕێکی لەو دۆڵەش دایەوە کە بەجێی هێشت. لەو چرکەساتەدا دەبێ لە ناخی ڕەحماندا چ گڕکانێك لە کوڵاندا بێت و هاکا دەرفەتێکی دۆزییەوە و تەقییەوە، ئەوەتا ئەو بڕیارێکی مەترسیداری داوە و لێیشی پاشگەز نابێتەوە، هەرچەندە زیاتریش بە قەدپاڵەکەدا هەڵدەگەڕا و بەرزتر دەبووەوە دۆڵەکە تەسکتر و قووڵتر دەکەوتە بەر چاوی. تا ئێستاش چیایەکە لێرە بەخشندە و هێمن و ئارامە، هەتا ئەگەر ڕەحمان بە چاوێکی سووکیشەوە تەماشای بکات و هەنگاوەکانی بە متمانە و سووربوونێکی زیاترەوە بهاوێژێت کە بە هیچ جۆرێك شکست و نووچدان نەزانن. وەلێ ئەو باش پەی بەوە بردبوو کە لە چاو ئەو شاخە نەگریس و چیایە بەرز و پڕ لە ئافاتەدا، شتێك نییە جگە لە ئەسپێیەکی ورد، یان کێچێکی بزۆز، ختووکەی بەشێکی پۆشاکە سپییەکەی بدات کە ڕێك لە کفنی مردوو دەچوو، هێشتا نزیکەی کاتژمێرێك و دووانی مابوو بگاتە لوتکەی شاخەکە. لەوێشەوە دەبێ بە ئاڕاستەی ئەوەی دیکەیان هەنگاو بنێت و لەوانەیە یەکێکی دیکە و هی دیکەیشی بەدوادا بێت، بەرلەوەی بە لای دووەمی ئەو دۆڵەدا پێچ بکاتەوە کە بەرەو گوندەکەی دەبات، ئەوەی مێشکی ڕەحمانی سەرقاڵ کردبوو و وەکوو مێشە گزگزە هەراسانی کردبوو، خەمی خاتوونە جوانکیلەکەی بوو، کاتەکە بە گرانی تێدەپەڕی، ڕەحمان لەگەڵ خۆی و بە دەنگێکی بیستراو دەیگوت: "ئەرێ ئەم چیایە کۆتایی نییە؟ دەترسم ڕێگەکەم ون کردبێت، ئاخر باوەڕ ناکرێت ئەو شێتە جوانکیلەکەمی بەم شوێنە تۆقێنەرەدا

بردبێت. لەوەش سەمەرەتر بە مێشکی کەسدا ناچێت، جووتیاران لەو لوتکە ڕووتوقووتە گوندەکانیان بونیاد نابێت و ئاوەدان کردبێتەوە. ئاخر هەمیشە گوندەکان لە دۆڵ و پێدەشتەکان و لە نزیك سەرچاوەی ئاوەکاندا ئاوەدان دەکرێنەوە، بۆ ئەوەی گەرمایی و ئاسوودەییان دەست بکەوێت. هەر دەبێ ڕێگەیەکی دیکە هەبێت بیانگەیەنێتە مەبەستی خۆیان بێ سەرکێشی و ئەو هەموو شەکەتی و ماندووبوونە. هەڵبەتە ئەوان ڕێنیشاندەرێکیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە، تاکوو ڕێگەکەیان بۆ ئاسان بکات".

پەڵەهەورێکی چلکن و تەمومژاوی ڕووی تێ کردبوو. ڕەحمان خەریك بوو بەردەمی خۆی نەبینێت، تەمتومانەکە وا ئابڵوقەی دابوو، ڕێك خستبوویە ناو هەناوی خۆیەوە، بۆیە یان دەبێت بە یەك ئاڕاستەدا بڕوات، یان ئەوەتا ڕابوەستێت، تاکوو تەمومژ و هەورە چڕەکە دەڕەوێتەوە، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی لوتکە بەرزەکانەوە ئاڕاستەی ڕۆیشتنی خۆی پێ دەستنیشان بکرێت. بەڵام ڕاوەستانیش باجی خۆی دەوێ، هیچ دوور نییە ببیەستێت و ئەویش ببێتە کێلە بەفرێکی ڕەقوتەق و ساردوسڕ. ئەو دەیزانی لەو دۆڵەی پشت ئەو شاخەوە شوێنەواری وێرانە دێیەکی ڕاگواستراو هەیە، ئەمە ئەگەر ڕێگەی ڕاستی گرتبێتەبەر و وێڵ نەبووبێت، بیری لەوە کردەوە پەنای بۆ ببات و هەر کاتێك گەیشتە ئەوێ خۆی لەناو داروپەردووی دیوارە ڕووخاوەکانیدا حەشار بدات، تاکوو با و زریانەکە ئێستێك دەکەن و پشوویەك وەردەگرن کە تازە دەستیان پێ کردبوو. ئینجا ڕوو لەو گوندە بکات کە خۆشەویستەکەی پێیدا تێپەڕیوە و پشوویەکی کەمی داوە و تۆزێکیش خواردنیان وەرگرتووە، بەرلەوەی ڕوو لە سنووری ئێران بکەن. وەك دەڵێن تراکتۆرێکی کشتوکاڵیش لە گوندەکەدا هەیە و عارەبانەیەکیشی پێوەیە، زۆر جار

جووتیارەکان بۆ گواستنەوەی کەلوپەل و پێداویستییەکانیان بەو ڕێگە کشتوکاڵییە بەرتەسك و پێچاوپێچەی نێوان کەندولەندەکان بەکاریان هێناوە. خاوەنی ئەو تراکتۆرەش هەرگیز ناجوولێت ئەگەر هەلومەرجەکە لەبار و گونجاو نەبێت، چونکە ئەو سەلامەتی و ئاسوودەیی بەلاوە لە هەموو شتێك گرنگتر بوو، لە سۆنگەی ئەوەی جەنگێکی ترسناك لە نێوان هەردوولادا هەیە و زۆر جاریش خەڵکی بوونەتە قوربانی کاتی نەگونجاو، کە نەدەبووایە لەو کاتەدا لەوێ بن و بەوێدا تێبپەڕن. گرفتی بەفرەکە و کەڵەکەبوونیشی لەسەر ڕێگاکە گاڵتەی پێ نەدەکرا، وەلێ خاوەنی تراکتۆرەکە حەزی لە شێلانی بەفرەکە بوو، چونکە سەلامەتی بۆ دابین دەکرد. لەبەر ئەوەی لەو بارودۆخە بەفراوییەدا شەڕی نێوان شەڕکەرە بەدبەختەکانی هەردوولا بوونی نەدەما. ڕەحمان بۆ ئەوەی پێیەکانی گەرم بکاتەوە و هێزیان بخاتەوە بەر، پەتووەکەی لە خۆی ئالاندو لە شوێنی خۆیدا قاچەکانی بە زەویدا دەکێشا و ڕێك وەکوو ئەسپێکی چەمووش سمکۆڵانی دەکرد، ئاخر ئەگەر ئەمە چەمووشی نەبێت، دەبێ چ زاراوە و دەربڕینێك هەڵبگرێت، وا دوای ئەم خەیاڵە سەرشێتانەیەی خۆی کەوتووە، بیری لەوە کردەوە وا باشترە بە پشتبەستن بە ئاڕاستەی ڕۆژهەڵات دەست بە ڕۆیشتن بکاتەوە. وەلێ دوای دوو سەرەولێژی و پێچدانەوە، ئیدی هەموو ئاڕاستەکانی تێکەڵ کرد و چیتر توانای دیاریکردنی شوێن و ئاڕاستەی خۆی نەما، چیتر نەیزانی لە کوێی شاخەکەدایە و ڕوو لە کوێش بکات. ئەوەی هاتەوەیاد کە پێشتر یەك جار لەگەڵ دەستەکەی ڕۆستەم بەم شاخەدا ڕۆیشتوون و قەدپاڵەکانیان کوتیوەتەوە، ئەو کاتە وەرز هاوین و قەدپاڵەکان ڕوون و لوتکە و ئەستێرەکانیش بەرەو ئامانجی خۆیان ڕێنوێنییان دەکردن، جگە لە بوونی ڕێنیشاندەرێك کە بست بە بستی ڕێگاکە شارەزا بوو،

بە هۆی هاموشۆی بەردەوامی بەوێدا و هیچ پێویستیی بە ئەستێرە و هەتـا سـەرنجدانی لوتکەکـانیش نەدەکـرد بـۆ دۆزینـەوەی ئاراستەکەی. ئێستا ئیدی ڕوخساری شاخەکەش دیار نەما و هیچ شتێکیش بە دی ناکرێت کە مایەی دەستنیشانکردنی شوێنەکەی بێت. جا ئەگەر لە شوێنی خۆیدا وەکوو هێستره چەمووشـەکە سـمکۆڵان بکـات، ئەوا بەفـرەکە دەیبەسـتێت و لە پەلوپـۆی دەخات، بۆیە ناچارە ڕێ بکـات و بـۆ سـاتێکیش ڕانەوەستێت، وەلێ بۆ کوێ و بۆ کام لا؟ ئاخر ئەو بەم کەشە بەفراوی و بەو چاوەوە جگە لە یەك مەتر بەولاوە زیاتر پێشی خۆی نابینێت، کە ئەویش بە تەمومژی قەدپاڵەکە داپۆشراوە، هیچی لە بەردەمدا نییە تەنهـا سـەرکەوتن بەرەو سـەرەوە نەبێـت، بەڵام هەڵوەستەیەکی کـرد، ئـاخر لەسـەر ئەو لـوتکەیەش جـگە لە زریـان و بەفـر و سـەرمایەکی توانـاپڕووکێن چـی دەبینێـت و چـی دەسـت دەکەوێت، جگە لەوەی بە دۆڵەکەدا بەرەو خوار شۆڕ ببێتەوە و لە کـوێ کۆتـایی هـات بـا بێـت، بـۆیە ئاراسـتەی گـۆڕی و بە ئاگاییەکی زۆرەوە بە لێژاییەکەدا شۆڕ بـووەوە، ترسـی گەورەی لەوە بـوو کە ئەو شـۆڕبوونەوەیە بیبـاتەوە ئەو شـوێنەی لێـیەوە هەنگاوی ناوە، ئەوەتانێ هەرچەندە سەد هەنگاوێك بەرەو خـوار شـۆڕدەبێتە خـوارەوە، زیـاتر دەوروبەری ڕوونـاکتر دەبێـت و تەمومژەکە دەڕەوێتەوە و ئاستی بینینی زیاتر و زیاتر دەبێـت، تـا خەریکە هەموو نیشانە و شتەکان وەکـوو خـۆی دەبینێـت. ئینجا بێ گوێدانە ئەو تەمومژەی بەرەو ڕووی دێـت، هەنگـاوی بەرەو ڕۆژهەڵات نـا، نەبـادا ڕێـگەکەی لـێ ونبێـت. دوو کـاتژمێری ڕەبەقی لە دابەزیـن بەهەدەر دا و بڕیـاری ئەوەی دا بە دۆڵەکەدا ڕێ بکات و کەمێك بەرەو سەرووتری بەرێـت، تـا دەیگەیەنێتە پـێچەیەك و بەرەو پشـتی چیـایەکەی دەبـات، لەوێ ڕووبارێـك هەبـوو دەڕژایە دۆڵێکـی دیـکەوە، ڕەحمـان بڕیـاری دا بە

پێچەوانەی ڕێڕەوی ئاوەکە ڕێ بکات و هەنگاو بنێت، تا تاریکایی داهات، بەڵام ئەو ڕانەوەستا و هەر بەردەوام بوو، دواتر هەندێك نیشانەی دۆزیەوە و ئاڕاستە و ڕێگەی دروستی هەڵبژارد، گوندێکی ڕاگواستراو و وێرانی قەدپاڵێك بوو کە دواتر دەبووە دوو قەدپاڵ، وەلێ بارینی ئەو بەفرە هەموو کەلاوەکانی داپۆشیبوون، ئاسمانیش هەڕەشەی زریانە بەفرێکی ترسناکی دەکرد.

ڕەحمان کەمێك لە گوندەکە دوورکەوتەوە، تا گەیشتە ڕووبەر و پانتاییەکی کەمێك کراوە، لە گۆڕستان دەچوو، پێی خلیسکا و کەوتە ناو چاڵێکەوە کە نزیکەی مەترێك دەبوو و بەفر داپۆشی بوو، ئازاری بەر نەکەوت، بە خێرایی هەستایەوە و هەنگاوەکانی بە دوای خۆیدا پەلکێش دەکرد، هێشتا سێ کاتژمێر زیاتر ڕێگەی لە بەردەم ماوە، بە شەکەتی و ماندوێتی بیبڕێت. بەڵام بایەکی سەرشێت و سارد هەڵی کرد و کەوتە لوورەلوور و هەڕەشە، وەك ئەوەی سرووشت ئەو شوێنەی هەڵبژاردبێت، کە ڕەحمانی دژبەری زۆرانبازێی لەگەڵ دەکات، دوای چەند خولەکێك بۆی دەرکەوت کە زۆرانبازێکە هاوسەنگ نییە، نەخاسمە شەکەتی دایڕووخاندبوو، بۆیە بڕیاری گەڕانەوەی دا بۆ پەنای ئەو داروپەردووە ڕووخاوەی گوندەکە. ڕەحمان هەڵات و هەر کە گەیشتەوە گۆڕستانەکە خۆی کوتایە ناو ئەو چاڵەی پێشتر پێی خزیبووە ناوییەوە، بۆ ئەوەی خۆی لە بەرکەوتنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بایە ساردەکە لا بدات کە هەڕەشەی لەناوچوونی لێ دەکرد. دوای ئەوەی پەتووەکەی لە خۆی ئاڵاند، ئینجا تیای دانیشت، زریانەکە تا دەهات زیاتر هاروهاج و خێراتر دەبوو، کڵۆبەفر تەقڵەی بە کڵۆبەفر لێ دەدا،

هەتا بە تەواوی ڕەحمانی داپۆشی و شتێکی ئەوتۆی لێ دیار نەما. ئەو لە سەرمان هەڵدەلەرزی، وەلێ هەرچەندە سەرمای بێت باشترە لەوەی ڕووبەڕووی زریانەکە ببێتەوە، لەبەر ئەوەی گومانی لەوەدا نەبوو کە دەیبەستێت. دوای چەند کاتژمێرێك ئیدی ڕەحمان هەستی بە هیچ نەدەکرد، تا دەهات جەستەی سڕتر دەبوو، هەستی بەوە کرد ئیدی ئەمە کۆتاییەتی و مەحاڵە لەم نەهامەتییە دەربازی ببێت. بە جووڵەیەکی سست و بە هەزار حاڵ توانیێ دەستی بخاتە گیرفانییەوە. پارچە نانەکەی دەرکرد و بە ددانەچەقێوە دەستی بە کرۆشتنی کرد. بەو ئومێدەی ئەو پارچە نانە تۆزێك وزەی پێ ببەخشێت، دوای ئەوەی گەرمایی جەستەی بە تەواوی لەدەست دابوو، ئومێدی ئەوتۆ نەمابوو. بەهەرحاڵێك بوو سێ بەشی پارچە نانەکەی خوارد، هێشتا بەشەکەی دیکەی لە نێوان هەردوو شەویلاگەی بوو، چیتر ئاگای لە خۆی نەما و بوورایەوە.

لە سبەینێی ڕۆژی دوایی، نزیکەی کاتژمێر نۆ، بایەکە چەند کاتژمێرێك بوو ڕاوەستابوو، هەورەکە لە ئاسماندا چین لەسەر چین کەڵەکە بووبوون، تەمومژەکە لەسەر زەوی زۆر چڕ بوو، ئیدی هێواش هێواش دەستی بە لەرزین کرد. وێڕای ئەوەی زریانە بەفراوییەکە کۆتایی هاتبوو، کەچی هێشتا سەرماکە ئەوەندە بەهێز بوو، بێ بەزەییانە بە مۆخی ئێسقانەکاندا ڕۆ دەچووە خوارێ. لەو کاتەدا دوو گوندنشین گەیشتنە ئەو شوێنە و هەر یەکە و قاپووتێکی دروستکراوی لوایێ بەرخیان بەسەر شانی خۆیاندا دابوو، نە سەرما کاری تێ دەکردن و نە ئاویش ئەو توانایەی هەبوو بیانسمێت و بگاتە دیوی ناوەوەیان، دیار بوو ئاڕاستەی ئەو دووانەش هەمان ئاڕاستەی ڕۆیشتنی ڕەحمان بوو،

وا پـێ دەچـوو خەڵکـی ئەو گونـدە بـن کە نـزیکەی دوو کاتژمێرێك لە دووریانی دوو قەدپاڵەکەوە دوور بن، لەو کـاتەی ئەوان بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕۆیشـتن لەنـاو گۆڕسـتانی گونـدە ڕاگوازراو و چۆلەکە شتێك سەرنجی ڕاکێشـان و ئیستێکی پێ کـردن، کەمێـك ڕاوەسـتان و بە دیـقەتەوە تەماشـای ئەو شـتە سەرنجڕاکێشـەیان کـرد. بەڵکـوو هەنگـاو هەنگـاو لێـی نزیـك کەوتنەوە و دڵنیابوون لەوەی ڕێوییەك دەگرن کە سەرماوسۆڵەکە سـڕی کردبێـت و لە پەلوپـۆی خسـتبێت و تـۆزە نـووزە و جووڵەیەکی تێدا مابێت، بە لای خەڵکی گوندە شـاخاوییەکانەوە گۆشتی ڕێوی یەکێکە لە گۆشـتە باشـەکان. بەڵام ئەوەی لەژێـر بەفـرەکەوە دەرکەوت گومـانەکەی ڕەوانـدنەوە. کە بە لایـانەوە جۆرێك بـوو لە مەحـاڵ، هەتـا لە سـەرەتادا باوەڕیـان بە چـاوی خۆیان نەدەکرد لەوەی دەیبیـنن. بە جۆرێـك لە شـوێنی خۆیـان حەپەسان و هەترەشیان چوو، لە ترسی ئەوەی بینییان هەتا توانای هیچ جووڵەیەکیشیان نەما. ئـاخر ئەوەی ئەوان بینییـان ڕێـوییەکی سەرمابردەڵە نەبوو، بەڵکوو ئەوان بە چاوی خۆیان مردوویەکیـان بینی لە گۆڕەکەیەوە هەڵدەستێتەوە و دێتە دەرەوە. دەموچاوی بە بەفر داپۆشراوە و شتێکیش لە نێوان شەویلاگەی بەفر بەستاویتی. ئەو شـتەی لەنـاو دەمیـدا بەفـر بەسـتابووی و لەگەڵ ڕوخسـارە داپۆشـراوەکەی بە بەفـر زیـاتر شـێوەکەی تـۆقێنەرتر کردبـوو. جووڵە هێواشەکەی ئەو تەرمەی دەمودەست لە گۆڕەکەوە هـاتە دەرەوە و هەستانەوەی بە قورسـی و پەتـووە بەسـتووەکەی سـەر جلوبەرگەکانی و ئەو بەفرەی سەرتاپای جەستەی داپۆشـی بـوو، ئەو بوونەوەرەی کە نـاوی ڕەحمـان بـوو، شێوەی مردوویەکـی ڕاسـتەقینەی وەرگرتبـوو، وەك ئەوانەی لە گۆڕەکانیـان دێـنە

دەرەوە، یان ئەوانەی ناوی زۆمبیان لێ نراوە. ڕەحمان پێی وابوو دوو تارمایی بینیوە، چونکە ئەو توانای ئاخاوتنی نەمابوو، بەڵام بە زەحـــمەت هەســـتایەوە و ملیشـــی بە هـــۆی ســـەرما تواناپڕووکێنەکەوە خواروخێچ و ڕەق بووبوو. دەستی بۆ دوو گوندنشـــینە تارمـــاییەکە درێژکـــرد، وەك ئەوەی داوای یارمەتییەکیان لێ بکات، چەند هەنگاوێك بە زەحمەت بەرەو ڕوویان ڕۆیشت و دەنگێکی نزم و خنکاوی لێوە دەهات کە هیچ واتایەکی نەبوو، گوندنشینەکان وەها نەتۆقیبوون خۆشەوە بێـت، هاواریـان لـێ هەسـتا و هەر یەکە و بە لایەك و بەبـێ ڕاوەستان تێیان تەقاند و هەڵاتن، ڕەحمان کەوتە سەر زەوی، وەلێ دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر توانی هەڵبستێتەوە و بەرەو دۆڵەکە هەنگـاو بنێـت و پـارچە نـانەکەی هێشـتا لە نێـوان شەویلاگەکانی و ناو دەمی بە بەستراوی مابووەوە. ئەو نازانێت چەند کاتی ویستووە تـا گەیشتۆتە ڕووبـارەکە کە دەڕژێتە نـاو دۆڵەکەوە. ئاوی ڕووبـار وێـڕای ساردییەکەی، وەلـێ لە هەوای دەرەوە گەرمتـرە. ڕەحمـان خـۆی کوتـایە نـاو ئـاوەکەوە، قووڵاییەکەی دەگەیشتە نزیکەی سمتی، هەستی بە گەرمـاییەکی چێـژبەخش کـرد، لەسـەر چـۆکی دانیشـت و ئـاوەکە گەیشـتە سینگی، هێندە گەرماییەکەی چێژبەخش بوو، بۆیە خۆی نقـومی ئـاوەکە کـرد و لە تەوقـی سـەرییەوە تـا نـووکی پێـی بەو ئـاوە شلەتێنە تەڕکـرد، شـلەتێنی چـی خـۆ ئـاوەکەش هەر تۆزێـك لە بەفـرەکە گەرمتـرە، بەڵام لە چـاو ئەو سـەهۆڵبەندانەی ڕەحمـان تێیدا دەژیا، ئاوەکە شـلەتێن دیـار بـوو، هەر بەو ئـاوەش پـارچە نانەکەی دەمیشی تەڕبوو، دەستی بە جوینی کرد و دواتر قووتی دا. پاش کەمێك لە ئاوەکە هاتەدەرەوە و بە پێچەوانەی ڕێـڕەوی

ئاوەکە بەسەر بەفرەکەدا کەوتەوە ڕێگا، سەرتاپای جەستەی ئاوی لێ دەچۆڕا، جلوبەرگەکانی بەری هێندە ئاویان هەڵگرتبوو تەواو گران بووبوون. ئەم جارەشیان مەرگ پەی بە ڕۆحی نەبرد و نەبووە شەهیدی خاتوونە چاوگەشەکەی، کەواتە ئەگەر گیانیشی ببەخشێت، هەر دەبێ بە ئاواتی خۆی بگات. هەستی بەوە کرد ڕووبارەکە لە زەوی و زریانەکەش بەبەزەییترە، وەکوو بیی ناو ئاو هەڵدەلەرزی، ناچاربوو جارێکی تر خۆی بخاتەوە ناو ئاوەکە. لەگەڵ خۆیدا دەیگوت: "ئاخر ڕەحمان، چی ناچاری کردبووی وا خۆت تووشی ئەم شێتییە بکەیت، ئەوە چ کیژێکی بەدبەختە لە چنگی شێتێك دەربازی ببێت و بکەوێتەوە چنگی کەسێکی لەو شێت و وێتتر. ئەوە چ چارەنووسێکی شوومە چاوەڕوانی ئەو خاتوونە قوربانییە دەکات". ڕەحمان لەناو ڕووبارەکە هاتەدەرەوە و هەر منگەمنگی بوو، تا دەهات لەرزین و دانەچۆقەکەی زیاتر دەبوو: "هەر دەبێ لە دەستی دەربازی بکەم... ئەمە هەموو شتەکەیە. ناچاری ئەوەی ناکەم کە حەزی لێ نەکات، ئاخر فریشتەیەکە و دەبێ پاسەوانی بکەم و لە هەموو دڕندە و ئەهریمەکانی بپارێزم. لە سۆنگەی ئەوەی خۆشی ویستووم، منیش بە درێژایی تەمەن بۆی دەژیم و بۆیشی دەمرم. هەموو داخوازییەکانی بۆ دابین دەکەم و شەونخوونی بۆ ئاسوودەیی دەچێژم. وای خۆشەویستی چەندە جوانە، لە هەمان کاتیشدا چەندە ئازاربەخشە، تاکە شتێکە شایانی ئەوە بێت مرۆڤ لە پێناویدا ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە بچێژێت".

کات زۆر بە سەختی و ئازارەوە تێدەپەڕی. هەرچەندە سەرماکە زیاتر پەلاماری دەدا و هەستی بەوە دەکرد خەریکە بیبەستێ، سەرلەنوێ بۆ چەند خولەکێك دەگەڕایەوە ناو

ڕووبارەکە. پاشان دەهاتە دەرەوەو دەستی بە ڕۆیشتن دەکردەوە، تا لە ناکاو بۆی دەرکەوت هەستەکانی بەئاگا هاتنەوە و کەوتنەوە کار. بۆنی شتێك هەستی بۆنکردنی بزواند، هەستێکی ڕاگرت ئەوە بایەکەیە، بەڵێ بایەکەیە لەگەڵ خۆیدا بۆنوبەرامەی داری سووتاوی بۆ هێنا و کونە لووتی چزاندەوە. بۆنێك لە کۆتاییدا ئاواتەکەی دەهێنێتە دی. وای لە بۆنی داری سووتاو چی لە مرۆڤی سەرمابردەڵە دەکات، ئەم جۆرە بۆنوبەرامانە یادەوەرییەکانی منداڵیمان وەبیر دەهێننەوە، وێڕای دژواری و سەختییەکانیان. ڕەحمان بۆنی نانی تەنووری لە گوندەکان هاتەوە یاد، ئەو بۆنوبەرامەیە تێکەڵ بوو بە بۆنی نانی تەنوور کە ئارەزوو و حەزی خواردن دەکاتەوە و برسێتی دەورووژێنێت. شارە بچکۆلانەکەی و گەڕەکە میللییە هەژارنشینەکانی بیرخستەوە، بۆنی دووکەڵ بە لای ئەوەوە جاران شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، نەخاسمە لە کۆتایی هەموو هەفتەیەك. کە بەزمی خۆشۆرین دەستی پێ دەکرد، خێزانە هەژارەکان لە زۆربەی گەڕەکەکاندا داریان بۆ گەرمکردنی ئاوی خۆشۆرین بەکار دەهێنا کە ڕیزیان دەبەست و یەك لە دوای یەك خۆیان دەشوشت. گەرماوی ماڵانی جاران لە کوورەیەك پێك دەهات و ئاگریان تێ بەر دەدا و زەویی گەرماوەکە و مەنجەڵە گەورە پڕ ئاوەکەش گەرم دەبوو و بۆڕییە ئاوێکیشی بەقەدەوە بوو، لە ژێریشیدا حەوزێکی بچووك هەبوو، لە سەرەوەیشی بەلووعەیەکی دیکەی ئاوی ساردیش هەبوو، لە کوورەکەوە دووکەڵکێشێك بۆ دەرکردنی دووکەڵەکە بۆ دەرەوەی گەرماوەکە بەکار دەهێنرا و دووکەڵەکەی بە سەروچاوی دانیشتوانی شاردا دەکرد. ئەم شێوازە سەرەتاییە بۆ ماوەی

چەندین ساڵی دووورودرێژ بەردەوام بوو، هەتا پەرەمێزی نەوتی بۆ گەرمکردنی مەنجەڵە گەورەکان و گەرمکردنی زەویی گەرماوەکە هاتە کایەوە. وێڕای ئەوەی پەرەمێزە نەوتییەکان بە خێرایی لە شارەکاندا بڵاو بوونەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا توانای نەهێشتنی بۆنی داری سووتاوی لە مێشکی خەڵکی نەڕەواندەوە. ئەوەتانێ ڕەحمانیش یادی ئەو ڕۆژانە دەکاتەوە و وزەیەك بە جەستەی سڕ و تەڕ و شەکەتی دەبەخشێت و بە ئاڕاستەی بۆنی دارە سووتاوەکە هەنگاو دەنێت. دوای زیاتر لە نیو کاتژمێر لە دوورەوە خانۆچکەیەکی بچکۆلانەی تا ڕادەیەك دابڕاو و دوورەدەست لە گوندەکەوە بە دی کرد، دووکەڵکێشەکەی دووکەڵی بەرەو ئاسمان ڕادەکێشا و پەرتوبڵاوی دەکردەوە، بە زەحمەت بەناو بەفرەکەدا ڕێی دەکرد هەنگاوی دەنا، ئاخر ناهەقی نەبوو، ئەو وێڕای ماندووبوونەکەی، بەفرەکەش هەتا چۆکی هاتبوو، ڕووی لە خانووە بچووکەکە کرد، لە نزیکییەوە بینی لەسەر بەفرەکە شوێنەوار و جێپێی ئاژەڵ دیار بوو کە پێ دەچوو جەنگێکیان لەو شوێنەدا بەرپا کردبێت. ئەوەی بە لایەوە مایەی سەرسووڕمان بوو گوێی لە هیچ سەگوەڕێك نەبوو، چونکە سەگگەل کاتێك هەستی کەسێکی نامۆ بکەن، دەنگی وەڕینیان دەگاتە دوورترین شوێن.

ڕەحمان هەستی بە زیادبوونی لێدانی دڵی دەکرد. هەناسەی بڕی و بە وریاییەوە سەرنجی دەوروبەری خۆی دا، تفەنگەکەی خستە ناو دەستی و خۆی بۆ هەر پێشهاتێکی لە ناکاو و نەخوازراو ئامادە کرد، گەیشتە خانۆچکەکە و دوو جار بە قۆنداغی تفەنگەکەی لە دەرگای خانووەکەی دا کە لە تەنەکە دروست کرابوو، لەناو ژوورەکە وە دەنگێك بە هاوارەوە وەڵامی

دایەوە، وەك ئەوەی یەکێك ئاژەڵێك دەربکات. لەژێر دەرگاکەوەش چاڵێك هەبوو، سەگێك دەیتوانی پێیدا بچێتە ژوورەوە. دارێك کە سەرێکی بە ئاگرەوە بوو یەك دوو جار لەژێر دەرگاکەوە دەردەکەوت و دەگەڕایەوە ژوورەوە.

ڕەحمان بە زمانێکی کوردی کرچوکاڵ بانگی کرد:

- من دۆستم... دەرگاکە بکەنەوە پێویستیم بە هاوکاریتانە.

دوای چرکەساتێك دەرگاکە کەمێك کرایەوە، بە پەلە ڕوخساری گەنجێکی لێوە دەرکەوت، بە شڵەژاوییەوە گوتی:

- دەی... وەرە ژوورەوە.

بواری پێ نەدا، دەستی ڕاکێشا بۆ ژوورەوە و دەرگاکەی داخستەوە، پاشان گوتی:

- چۆن هاتیت بۆ ئێرە؟

ڕەحمان هیچ وەڵامی نەدایەوە، بەڵکوو گوێی لە هیچ نەبوو، یەکسەر ڕووی لە ئاگری زۆپا دارینەکە کرد، کە بە هۆی زۆر بەکارهێنانەوە لە هەموو لایەکەوە قوپابووەوە، دەیویست لە ئامێزی بگرێت، بەو پشکۆ و گڕ و بڵێسەیەوە بەسەر جەستەی خۆیدا بکات و بە چێژ و خۆشییەوە بڵێت: ئای کە دۆزەخ خۆشە. زۆری نەبرد هەڵم لە تەواوی جلوبەرگەکانی هەڵدەستا و هەستی بە خۆشییەك دەکرد کە هەرگیز پێشتر خەونی پێوە نەبینیبوو، سڕبوونێکی سەیر بە خێرایی سەرتاپای جەستەی داگرت، چاوەکانی گران بوون، هێندەی نەمابوو هەر بە پێوە لە

بەردەم زۆپاکەدا خەو بیباتەوە. لە کۆتاییدا بە نیمچە هۆشێکەوە گوتی:

- چی ڕووی داوە؟

بۆ یەکەم جار سەرنجی دەوروبەری خۆی دا، بینی شوێنەکە پڕ لە سواڵەی وشکەوەبووی پووشوپەڵاشە، دیارە ئالیکی هەڵگیراوی مێگەلی یەکێك لە گوندنشینەکانە. زەوییەکەش بە کایەکی زەردباو داپۆشرابوو. پەنجەرە بچووکەکان بە بەرد گیرابوون و بە قوڕیش سواخ درابوون، لەوانەیە ئەم خانۆچکەیە هی یەکێکیان بووبێت و لەبەر هۆیەك لە هۆیەکان پشتگوێ خرابێت و وەکوو کادانێك بەکار هێنرابێت.

بەڵام گەنجەکە وەڵامی نەدایەوە، بەڵکوو پرسیاری لێ کرد:

- ئایا ڕێنیشاندەرەکە تۆی بۆ لای ئێمە ناردووە؟

ڕەحمانیش بە پرسیارەوە ڕووی تێ کرد:

- کامە ڕێنیشاندەر؟

- ئەو ڕێنیشاندەرەی لەگەڵمان بوو، بۆ تۆ لە گوندەکەوە نەهاتوویت؟

- نەخێر لە گوندەکەوە نەهاتووم، بۆ لێرە چی ڕوو دەدات؟

- ئەی کەواتە لە کوێوە هاتوویت؟

گەنجەکە ڕەنگی هەڵبزڕکا، بەڵام پەی بەوە برد کە ئەوەی قسەی لەگەڵ دەکات کوردی نازانێت، ئەمەش کەمێك ئارامی پێ بەخشی. کەچی ڕەحمان بە دەنگێکی نزم و بە زمانی دایکی

وەك ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسە بکات پێی دەڵێت:

- بە دۆزەخ بیت... ئایا پرسیار بە پرسیار وەڵام دەدەیتەوە؟

لەگەڵ خۆیدا بە منگەمنگەوە گوتی: "وا هەست دەکەم شتێکی نامۆ لە ئارادایە".

گەنجەکە بە زمانی ڕەحمان و بە شێوەیەکی پاك و بێگەرد لەگەڵیدا کەوتە قسەکردن و گوتی:

- کەواتە تۆ عەرەبیت؟

ڕەحمان هەستی بە ڕووگیری کرد لەوەی گوێی لێ بوو، لە هەمان کاتیشدا هەستی بە خۆشی کرد، بەوەی ئەوەی لەگەڵیدا قسان دەکات زمانی عەرەبی دەزانێت. ئاخر ناحەقی نەبوو بە دەگمەن نەبێت گوندنشینەکان زمانەکەی نازانن، لەبەر ئەوەی لە گۆشەگیری و دوورییەکی تەواوی شاردا دەژین. بەڵام خێرا خۆشییەکەی ڕەوییەوە و بیری کردەوە: "چی دەبێت ئەگەر ئەوەی قسەی لەگەڵ دەکات جاشێکی بەکرێگراو بێت... ئەوا ناوم دەدات و لێرە چارەنووسم لە دەست دەدەم!" گەنجەکە لێی پرسی:

- تۆ لە کام مەڵبەندی؟

ڕەحمان بیری لەوە کردەوە کە وەڵامی نەداتەوە هەتا بە تەواوی لە ناسنامەکەی دڵنیا دەبێت، پرسیارەکەی پشتگوێ خست و گوتی:

- ئەوە لێرە چی ڕوو دەدات؟

گەنجەکە سەرێکی دارەکەی دەستی خستە ناو کونی

زۆپاکەوە، وەك ئەوەی سوور بێت لەسەر ئەوەی نەهێڵێت بکوژێتەوە و بە گەشی بمێنێتەوە:

- دوێنێ شەو خەو نەچووە چاومان، گورگ پەلاماری داین، تۆ پێم بڵێ چۆن گەیشتیتە ئێرە؟

- هیچ گورگێم نەبینیوە.

- تۆ بە تەواوی تەڕ بوویت؟

- ئەوە لەبەر ئەوەی کەوتمە ڕووبارەکەوە؟

لەو کاتەی گەنجەکە چاوەڕوانی ڕوونکردنەوەی زیاتر بوو، ڕەحمان درێژەی دایێ:

- ویستم بەسەر بەردێکی گەورەی بەستوو لە ڕووبارەکە بپەڕمەوە، پێم خلیسکا و کەوتمە ئاوەکەوە.

- کەواتە تۆ بە بەختیت... ئازارت پێ نەگەیشتووە و نەیبەستوویت.

- خۆ ئەگەر ئەم خانۆچکەیەم نەدۆزیبووایەوە هەڵبەتە دەیبەستم... ئەی چیرۆکەکەی تۆ لەگەڵ گورگەکان چییە؟ چۆن پەلاماری دایت؟

بەرلەوەی گەنجەکە باسی ئەوە بکات کە ڕووی داوە، ڕەحمان هەستی بەوە کرد کە جووڵەیەك لە نێوان دیوارەکە و سواڵەی ئالیکەکاندا هەیە کە هەتا بنمیچەکە هەڵدراوەتەوە. وا دیار بوو لەوێ کەسێك ئالیکەکەی کردۆتە پێخەف و پاڵی داوەتەوە و خۆی لە کۆنە پەتوویەکەوە لوول داوە. زۆری نەخایاند هەتا ڕەحمان ئەو کەسەی بینی. لە شوێنی خۆی

ڕاچڵەکی و توانای دەربڕینی یەك وشەشی نەما... ئای... خۆ ئەوە خـــۆیەتی... ڕووگە و پەرســـتگاکەیەتی، کە ئەو هەمـــوو دەردەســـەرییەی لە پێناویـــدا کێشـــاوە، وەکـــوو پەیکەرێکـــی دروسـتکراو لە مەڕمەڕی سـپی لە بەردەمیـدا ڕەق ڕاوەسـتا. بە باوێشـکدانەوە سـڵاوێکی سـەرپێیانەی لـێ کـرد. لە تەنیشـت هاوسـەرەکەیەوە ڕاوەسـتابوو، تـاکوو چێـژ لە تـۆزە گەرمیـەك وەربگرێت.

گەنـــجەکە بە ســـۆز و خۆشەویســـتییەکی زۆرەوە بە هاوسەرەکەی گوت:

- بۆچی هەستایت؟! تەنها کاتژمێرێکە نووستوویت؟

گوتی:

- قەیناکا، ئێستا هەست بە ئارامی دەکەم.

پیـاوەکەی ڕووی لە ڕەحمـان کـرد کە لە شـوێنی خـۆی داکوترابوو:

- ئەمە شیرینە، هاوسەر و ڕووناکیی چاوەکانمە.

ئەویش بە دەنگێکی نزم و بە زمانی کوردی بە پیاوەکەی گوت:

- مـن دەیناسـم، دێـتەوە یـادم پـێش مـاوەیەك جارێـك مێوانمان بوون. ئێستا شوێنێکی بۆ ڕێك دەخەم.

پیاوەکەی قسەکانی بـۆ ڕەحمـان کـردە عەرەبـی، لەو کـاتە ژنەکە سـەرقاڵی ڕێکخسـتنی شـوێنێك بـوو لەسـەر زەویـیەکە بە داخستنەوەی هەندێك لەو پووشوپەڵاشەی هەبـوو، لەژێـر لێـوەوە

وەك ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسە بكات:

- ئیتر لە گورگ ناترسین. میوانێکمان لەگەڵدایە تفەنگی پێیە.

هێندەی نەخایاند ڕایەخێکی بەو پووشوپەڵاشە لە دەوری زۆپاکە ڕێك خست کە بەشی هەموویانی دەکرد.

# بەشی هەژدەیەم

ئەو گەنــجەی بە زۆری زۆرداری بە سەرشــێتیان دانــابوو، نــاوی ســامان بــوو، ئەو کــوڕی پیــاوێکی قەســاب بــوو. لەنــاو براکانیــدا پێنجەمینیــان بــوو، هیچیــان لە خوێندنــدا ســەرکەوتوو نەبووبــوون، لە بەدبەختیــی باوکیــان هەتــا قۆنــاغی سەرەتاییشــیان تەواو نەکردبوو جگە لە سامان، بۆیە بە شێوەیەکی خۆکردەیی ئەوانیش بوونە قەساب و لە کارەکەیاندا یارمەتیی باوکیــان دەدا. سامان سەرباری براکانی چوار خوشکیشی هەبــوو، هەموویــان لە تەمەنــی شــووکردندا بــوون. ئەو لە ماڵێکــدا دەژیــا پیشــەیان سەربڕینی ئاژەڵ بوو، باوکیان لە سەرەتاوە ویستی ســامان فێــری پیشەکەی خۆی بکــات، بەڵام ئەو گەنــجە چــاوی بە ســەربڕینی هــیچ ئاژەڵێــک هەڵنەدەهــات و بە تەواوی لەو خــانەوادەیە جوودابوو، ڕێک پێچەوانەی براکــانی بــوو، ئەم هەڵوێستەی لای براکانی ئەویان تووشی سەرئێشــە و ســووکایەتی دەکــرد، ئەو لە یەکێــک لە شــارۆچکە بچووکەکــانی بەری ڕۆژهەڵاتــی وڵات هاتبووە ژیانەوە و گەورە بووبوو، ژمــارەی دانیشــتوانی لە چەنــد هەزار کەسێک تێناپەڕی، بۆیە خەڵکی شــار هەموویــان بە باشــی یەکترییان دەناسی. هەواڵی خەڵکی ئەوەندە زوو بە ناویاندا بــڵاو دەبووەوە و بۆ ساتێکیش دوانەدەکەوت. سامانی هاوڕێمان توانی خوێندنی دواناوەندی تەواو بکات و بچێتە یەکێک لە زانکۆکانی بەغــدا. ئەو قوتــابیی خوێنــدنی زمــانی فەرەنســی بــوو. هەر لە منداڵییەوە خۆی بە فێربوونی زمانی فەرەنسییەوە سەرقاڵ کردبوو، بە تــایبەتی لە ڕێــگەی ئەو کتێبــانەی بازاڕیــان پــڕ کــردووە و

ناونیشانیان "له ماوەی حەوت ڕۆژدا فێری فلانه زمان ببه"، ئەو هەمیشه پەنای بۆ دەبردن و وردورد وشەکانی ئەزبەر دەکردن، سەرباری پەنابردنی بۆ هەندێك کاسێتی تۆمارکراو. زۆر جار دەتبینی لەبەرخۆیەوە و به دەنگێکی نزم قسانی دەکرد و هەندێك لەو دەستەواژانەی که ئەزبەری کردبوون دووبارە دەکردەوە، ئەمەش وای لێ کردبوو بکەوێته بەر قسەوقسەلۆکی برا و هاوڕێکانی، پێکەنینیان بەو قسانە دەهات که ئەو دەیگوتنەوە. ئاخر لەو شارۆچکەیەی ئەوان زۆرینەی خەڵکی نیمچه خوێندەوار بوون، لەسەر ئەوە ڕانەدەهاتن ئەگەر خۆیان دایان نەنابێت، ئەوان هێشتا باوەڕیان به جنۆکه و خێو و دێو هەیە. هەتا بەشێك له توێژە خوێندەوارەکانیشیان، بیروباوەڕیان هاوشێوەی نەخوێندەوار و نەزانەکان بوو، تێکڕای خەڵکی ملکەچی ئایین بوون و خۆیان به بیروبۆچوونە خەیاڵییە ئایینییەکانەوە توند توند شەتەك دابوو، هەموو ئەوانەش له ترسی سزای ئەو دونیا، واته کۆمەڵگەکه به گشتی لەسەر بنەمای ترس چەکەرە و گەشەیان کردبوو، وای لێ کردبوون توانای بیرکردنەوەیان نەمێنێت و تووشی بەستەڵەکی هزر و مێشك بێن، وەلێ سامانی هاوڕێمان، هیچ بایەخی بەوە نەدەدا که ئەوان بیریان لێ دەکردەوە، زۆر جاریش ڕقی بەو عەقڵ و تێگەیشتنه پڕ شەرمەزاریانە و سەیرەیان دەهات. ئەوەتانێ به هۆی بێکارییەوە تووشی نائومێدی بووە و زۆر جار تووڕە و توند هەڵسوکەوت دەکات و خەریکه ئارامی لێ دەبڕێت. ئەو له شارە گەورەکانیش بەختی خۆی تاقی کردەوە و هەموو هەوڵ و کۆششێکی بۆ دۆزینەوەی کارێك به هەدەر چوون، تاکوو به ناچاری گەڕایەوە شارۆچکەکەی خۆی. دوای ئەوەی ئاستەنگ و سەختییەکانی ژیان زیاتر تەنگیان پێ هەڵچنی، ئیدی هەتا توانای کارکردنی لەگەڵ باوکیشی نەما، تا وای لێ هات شەقام

و چایخانەکان یەك لە یەکیان وەردەگرتەوە و بووبووە بارێکی گران بەسەر خێزانەکەیەوە، ئەوانیش لە سەرزەنشتکردنی بەوەی چەند ساڵێکە خوێندنی تەواو کردووە و خوێندنەکەی هیچ سوودێکی نەبووە، کەمتەرخەمییان نەدەکرد و هەراسانیان کردبوو. خۆ ئەگەر ئەندازیاری، یان پزیشکی بخوێندبووایە، ئێستا لە فەرمانگەیەکدا دادەمەزرا و خەڵکی ئیرەییان پێ دەبرد، وەلێ ئێستا سەرنج لە خۆی دەدا و هەڵبژاردنی زمانی فەرەنسی لە وڵاتێك کە تاکە کەسێك بەو زمانە نادوێت، بە کەڵکی هیچ نایەت، ئەمەش جەختکردنەوەیەکی ئاشکرا و بێ ئەملا و ئەولای زیاتری شێتییەکەیەتی. ئەوەندە ئەم قسەوقسەڵۆك و توانجانەی بە ڕوودا درابوو، بێزار و وەڕسی کردبوو. ئەوەتانێ ئەم جارەش وا کەسێك لە چایخانەدا دانیشتووە و ڕووی دەمی تێ کردووە و هەمان قەوانی سوواوی بۆ لێ دەداتەوە، هەڵبەتە ئەم قسانەش سامان دڵتەنگ دەکەن و هێندەی نامێنێت لە پێستی خۆی بچێتە دەرەوە، ئیدی ئەویش بێ بیرکردنەوە لە ئەنجامی قسەکانی دەڵێت: ئەم وڵاتە باشترین نموونەی هاوسەرگیری و دەستلەملانێی ماسۆشییەکان و سادیزمەکانە، واتە یەکیان چێژ لە ئازاری ئەوەی تر و ئەوەی تریش چێژ لە ئەشکەنجەدانی جەستە و ڕۆحی خۆی وەردەگرێت و ئەم کۆمەڵگەیەی هیچ بەلاوە گرنگ نییە، بەڵکوو ڕقی لێیەتی و هەتا ڕقی لەو کەسانەشە کە دەبنە هۆکاری مانەوەی وەکوو گۆماوێکی گەنیو و ڕێگە لەوەش دەگرن گۆڕانکاری بەسەردا بێت. لەو کاتەدا کەسێك لەوێ دانیشتبوو، لەوانەی ئەڵقەلەگوێی دەسەڵاتن، ئەم دەربڕینە مەترسیدارەی وا شرۆڤە کردبوو، گوایە ئەو ڕقی لە کۆمەڵگەیەکی وا کۆیلە و ملکەچە و دژی فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتێکی وا ستەمکارە. ئیدی ئەم دەستەواژە و دەربڕینانە بۆ سامان بوونە دەرد و بەڵا و بە هۆیانەوە ڕاپێچی بەندیخانە کرا و

ئـازار و ئەشـکەنجەیەکی درنـدانە و بێئەنـدازانەی چەشـت. باوکیشـی بـۆ ئەوەی لە سـۆنگەی سەرکێشـی و سەرشـێتیی کوڕەکەی، دەستی چەپەڵی سزا و زیندانیکردن نەگاتە خـۆی و ئەنـدامانی دیـکەی خێـزانەکەی، ڕووی لە هەمـوو لایەك نـا و کەوتە پاڕانەوە و دەستماچکردنی ئەم و ئەو، بەڵێنی ئەوەیشـی بە دەسەڵات دا کە بە باشترین شێوە کوڕە شـێتۆکە و کاڵفامەکەی تەمـێ دەکـات و دەیکـاتەوە کەسـێکی دڵسـۆزی حـزب و نیشـتمانەکەی، هەرچەنـدە لە قسەکانیشـیدا جاروبـار بە لای ئەو ڕاستییەشـەوە دەچـوو، لەوەی کە کـوڕەکەی گوتـوویەتی هـیچ مەبەستێکی نەبووە، چـونکە ئەو زۆر جـار قسـەی دەمـی خـۆی نازانێت، بەڵێنی ئەوەیشـی پـێ دان کە چارەسـەری بکـات، خـۆ ئەگەر پێویستیش بکات، ئەوا بە دەستی خۆی بـۆ نەخۆشـخانەی نەخۆشـییە عەقڵییەکـانی دەبـات، واتە بـۆ شـێتخانە. لەبەر ئەوەی پاسـەوانی زینـدانییەکان و بەشـێك لە بەرپرسـانی ئەویێ خەڵکـی شارە بچووکەکە بوون، ئەوانیش هەموو شتێکیان دەربـارەی تـاك بە تـاکی شـارۆچکەکەیان دەزانـی و ئاگایـان لە بێـنەوبەردە و کاڵفامیی ئەو کـوڕەش هەبـوو و گوێیشـیان لەو قسەوقسـەڵۆك و گاڵتەجاڕییـانەش بووبـوو کە دەیکـردن، بـۆیە دایـانەوە دەسـتی باوکی بەو مەرجەی خۆی بیبات و بیخاتە شێتخانەوە، ئەوەیشیان پـێ ڕاگەیانـدبوو کە ئەگەر ئەو کـارە نەکـات، ئەوا خـۆی و تەواوی ئەندامانی خانەوادەکەی تووشی سەرئێشـەی زۆر دەبـن. بۆیە ڕۆژی دواتر باوکە بەستەزمانەکەی گەڕایەوە لای بەرپرسی زیندانییەکان و کۆمەڵێك لە خزمانیشی لەگەڵـدا بـوون، سـامانیان وەرگرتەوە -لەو کاتەی لە بەندیخانەیان دەردەکرد- پێـی وابـوو بـاوکی توانیـویەتی بە واسـیتە و لە ڕێـی ئەم و ئەوەوە ئـازادی بکات و لەو ئازار و ئەشکەنجەیەی دەیچەشت ڕزگاری بکـات. بۆیە لە بەرانبەر باوکی و خانەوادەکەیدا هەسـتی بە شـەرمەزاری

دەکـــرد، بە هـــۆی ئەوەی بووبـــووە هـــۆی نیگەرانییـــان، سوپاسگوزاری باوکیشی بوو کە پێشتر بۆ جارێکیش هەستی بە سـۆز و خۆشەویسـتی باوکـانەی نەکردبـوو. ئۆتـۆمبیلەکە بە ئاڕاسـتەی بڕینـی زیـاتر لە سـەد و حەفتـا کیلـۆمەتری ڕێگـای بەغدای بـردن، سـامان هەوڵـی دەدا بزانێـت ئاڕاستەکەیان بەرەو کوێیە و بۆ کوێی دەبەن؟! بەڵام هیچ پرسیارێکی لـێ نەکـردن، تەنهـا ئەوەنـدەی دەزانـی کە دۆخەکە ترسـناکە و پێویسـت بە ئاشـکراکردنی شـتە شـاراوەکان ناکـات، ئـاخر وەك دەڵـێن: دیواریش گوێی هەیە!. هەر قسەیەکیش ئەگەر لە شوێنی خۆیدا نەبێت، نەك تەنها خۆی، بەڵکوو خانەوادەکەیشی بەرەو ماڵوێرانی دەبـات، بە تـایبەتییش کە لەو مـاوەیەدا بە هـۆی قسـەیەکی سەرزارییەوە لە زیندان مەرگی بە چاوی خۆی بینیبوو، بۆیە پێی وابوو بڕیاری بە قاچاخ دەرکردنیـان داوە، کـێ دەزانێـت؟ خـۆ لەوانەیە بڕە پـارەیەکی خەیاڵیشیان لە پێناویـدا بە هەدەر دابێـت. بۆیە لەم لایەنەوە خۆی یەکلایـی کـردەوە. دوای زیـاتر لە دوو کاتژمێر ڕۆیشتن ئۆتۆمبیلەکەیان دەرگایەکی گەورەی تێپەڕاند و هەردوو لای شەقامەکەش بە دیواری بەرز هەڵچنرابوون، سامان دەرفەتـی خوێنـدنەوەی نووسـینی سـەر تـابلۆ ڕەشـەکەی بـۆ نەڕەخسا. هەموو خەڵکیش دەیانزانی مـردن لەژێـر ئەشـکەنجە و ئازاری بەنـدیخانەکان باشـترە لە چـوونە ئەو شـوێنە تـۆقێنەرەوە، ئەوەش لە ترسـی ئەوەی لەو شـوێنەدا مـرۆڤ تووشـی دەرد و بەڵای وا دەبێـــت کە هیچیـــان لە ئەشـــکەنجە و مەرگەســـاتی بەندیخانەکان کەمتـر نییە. دوای کەمێـك سـامان تووشـی شـۆك بوو، وەك ئەوەی هەورە تریشقە لێـی دابێـت، ڕاچڵەکـی کاتێـك خـۆی بینـی وەکـوو مشـکێك کەوتـۆتە تەڵەکەوە و تـازە دەربازبوونی مەحاڵە. بە هەموو هێزی خۆی هاواری دەکرد و لە باوکی دەپاڕایەوە کە لەناو ئەو شێتانەدا بەجێـی نەهێڵن. وای لە

دڵ و ناخی ئەو چرکەساتەی باوکی چەند بە ئازار بوو، کاتێك فرمێسکی کوڕەکەی دەبینی و گوێی لە هاوار و پاڕانەوەی دەبوو، جەرگی خوێنی دەدەلاَندا وەلێ بەسەر سۆزی خۆیدا زاڵ بوو بەرانبەر قوربانییەکەی، دیمەنێکی سەختی قەسابانەی خستە سەر ڕوخساری خۆی و خۆی دایە دەستی چارەنووسێکی سەرشۆڕانەوە، بۆیە لە ناخەوە ئازاری دەچەشت و لە داخان خەریك بوو خوێن لە شادەمارەکانی ملییەوە فیچقە بکات. دوا وشـــەکانی کـــوڕەکەی لەو کـــاتەی کە دوو کەس لە کارمەنـــدەکانی ئەوێ کە ڕێـــك لە گـــای بـــنە دەچـــوون و ترسناکییەکەیان بێئەندازە بوو، کوڕەکەیان ڕاپێچ دەکرد، هاواری سامان وەکوو قامچی بەر ناخی ئەو باوکە بێدەسەڵاتە دەکەوت، کاتێك دەیگوت:

- تۆ هەرگیز باوکم نیت. ئێوە هەرگیز کەسوکاری من نین. من ناتانناسم... تف لە ئێوە. باوکەکە هەرچەند هەوڵی دەدا بەســەرخۆیدا زاڵ بێــت و لە هەمــبەر ئەو دیــمەنە تراژیــدیا و قوڕپێوانەدا خۆڕاگر بێت، کەچی خەم و ئەندێشەکانی وەکوو بەرداشــی ئــاش دەیانهــاڕی و وردوخاشــیان دەکــرد، وەلــێ نەیدەزانی چی بکات و ڕوو لە کوێ بکات، ئاخر ئەو چی بە دەســتە تــاکوو بیکــات؟ دۆخەکە ناچاریــان کــرد بە زۆری زۆرداری باوەڕ بە خۆی بهێنێت کە کارێکی دروستی کــردووە، قوربــانی بە یەکێکیــان داوە لە پێنــاوی پارێزگــاریکردن لەوانەی دیــکەی لە دەســتی ســتەمی دەســەڵات. بەم کــارەی لەوانەیە دەسەڵاتی قایــل کردبێــت بەوەی دڵسۆزە بــۆی و ئامــادەیە هەر کەسێك لە خێزانەکەی بکــاتە قوربــانی بــۆ مــانەوەی دەســەڵات، تەنهــا ئەگەر بە وشــەیەکیش بەرانــبەر دەســەڵات و حکــوومەت ناحەقییــان کردبێــت. خــۆ لەوانەیە ئەم بەختــی گەورە بووبێــت،

باوكی وا هەبووە ناچاریان كردووە بە دەستی خۆی كوڕە سەركێشەكەی بكوژێت، تەنها بۆ ئەوەی گومانی دەسەڵات لە خۆی و ئەندامانی خێزانەكەی دوور بخاتەوە و لایەنگیریی خۆی بۆ ئەو دەسەڵاتە بسەلمێنێت. ڕێكارییەكان ئەوەندەیان نەخایاند، بە خێرایی باوكەكە و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون بە هەمان ئۆتۆمبیل گەڕانەوە كە پێی هاتبوون. وەلێ سامان —وای لە سامان- هەردوو كارمەندە زل و ناقۆڵاكە بەناو ژوور و ڕێڕەو و داڵان و عەمباری گەورە و لە یەكتر جیاواز و بەرزدا ڕاپێچیان كرد، وەك ئەوەی بەرخۆلەیەك بێت و كەوتبێتە دەمی گورگەوە، گوێی لە هاوار و فیغان و دەنگەدەنگی كەسانێك بوو كە لەودیو دیوارە تاریكەكانەوە بۆ ساتێكیش بێدەنگ نەدەبوون و موچڕكیان بە سەرتاپای جەستەیدا دەهێنا. لەگەڵ خۆیدا دەیگوت: "فڕێم دەدەنە ناو یەكێك لەو هۆڵانە و لەگەڵ ئەو كەسانەی هاوار و فیغانیانە؟ لەناویاندا چی بكەم؟! چۆن هەڵسوكەوت و مامەڵەیان لەگەڵدا بكەم؟!

هەردوو گای بنە، مەبەستم دوو كارمەندە زل و ناقۆڵاكەن، درێژەیان بە هەنگاوەكانیان دا و بەرەو تەلارێكی دوور لە دەروازەی نەخۆشخانەكە پەلكێشیان دەكرد، وەلێ هەر لەناو ئەو دارودیوارە بوو، ئینجا بە ڕێڕەوێكدا بەرەو ژوورێكیان برد، گەورەیی و شكۆداری پێوە دیار بوو. وا پێ دەچوو بەڕێوەبەری نەخۆشخانەكە بێت، نەخۆشخانەی چی تۆ بڵێ شێتخانەكە! بەرلەوەی بیگەنێ هەنگاوەكانیان خێراتر كرد و سامانیش وەكوو بێچووە چۆلەكە بە دەستیانەوە حەپەسابوو و بە بێدەنگی و بێ ئەوەی هیچ بەرهەڵستكارییەك بكات لەگەڵیاندا هەنگاوی خێرای دەنا. وەك ئەوەی لە نزیكیانەوە شتێك ڕوو بدات، سامان دەیزانی هەر شەڕێك لەگەڵ ئەمانە، شەڕی خۆتڕێنە و تەنها سووكایەتی

و ئازاری بەر دەکەوێت. بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە بێ ئەوەی سەری لەسەر پەڕە کاغەزەکەی بەردەمی هەڵبڕێت و خۆی ماندوو بکات، هەر بە نووکە ئاماژەیەك بە دەستی هەردوو کارمەندەکەی لە کۆڵی خۆی کردەوە، ئەو پیاوێکی تا ڕادەیەك بەساڵاچوو بوو، قژێکی سپی و لووسی هەبوو، پێ دەچوو ڕۆژگارێکی دوور نیوەی قژی هەڵوەراندبێت. ڕوخسارێکی نیمچە لاوازی هەبوو، دیمەنێکی ناڕەسەنانە باڵی بەسەر ڕوخساریدا کێشابوو، وەك ئەوەی هەمیشە بڵێت: "ئەمە شانشینی منە و هەموو ئەوانەی لێرەشن کۆیلەی منن، جگە لەوە شا بە سەپانی خۆم نازانم، ئەوەندە لووتبەرز و لەخۆبایی دیار بوو". کەمە بێزارییەکیش نقوورچەی دەدا، تاکە کەسێکی ئەو فەرمانگەیەش نەبوو سەرچاوەکەی بزانێت، هەتا خۆیشی لەم ساتەوەختەدا لەوانەیە هۆکاری ئەو بێزاری و وەڕسبوونەی بە دروستی نەزانێت، ئیدی هەردوو کارمەندەکە دەمودەست بێ ئەوەی ورتەیان لێوە بێت، ئەوێیان بەجێ هێشت و بە ناو کووچە و ڕێڕەوی نیمچە تاریکی فەرمانگەکەدا پشتەملی سامانیان گرتبوو، بەرخئاسا وەپێشی خۆیان دابوو، فەرمانگە چ فەرمانگە؟! کاکە فەرمانگەی چی؟! ئێرە شێتخانەیە شێتخانە! سوێندتان لەسەرم نییە، ئەگەر کەسێکی بلیمەت و پەیتوولیش پەلکێشی ئێرە بکەن، لە کون فەیەکونێکا هەرچی تەختەی مێشکی هەیە لەکاری دەخەن و شێتی دەکەن، یاخوا کەس نەکەوێتە بەردەستیان، ئەمانە دڕندەیەکن و لە پێستی مرۆڤدا، داخۆ چەند کەسی بلیمەتی ئەم وڵاتەیان لەوێ بە زەبری کێبڵ و کارەبا و جۆرەها ئامرازی ئەشکەنجەدانی دیکە هەر بە ڕاستی شێت کردبێت. ئەوان لە ڕاپێچکردنی سامان بەردەوام بوون، لە پڕ دەنگی هاوارێك لە دەرەوەی تەلارەکە ئیستێکی خێرای پێ کردن و سامانیش بەستەزمانیش بە دەستیانەوە ڕەتلێکی بەرەو

پشتەوەدا، هێندەی نەمابوو لەگەڵ ئەوەی پشتەملی گرتبوو، تامپۆنێکی ترسناك بکەن و بەریەك بکەون و سەر و سینگ و دەموچاوی یەکتری بقوپێننەوە، تا دەهات دەنگەکان بەرزتر هاواریان دەکرد: "ئاگر ئاگر... لە هۆڵی نەخۆشە ترسناکەکان کەوتۆتەوە... فریاکەون". بە خێرایی یەکێکیان پەلاماری سامانی دا و فڕێی دایە ناو یەکێك لەو ژوورانەی بە بەردەمیدا تێپەڕین و دەرگاکەی لەسەر داخست. ئینجا خۆیان بە ڕاکردن بەرەو شوێنی ئاگرەکە چوون. ژوورەکە نیمچە تاریك بوو، پەنجەرەیەکی چکۆلانەی لێ بوو لە نیو مەتر دووجا زیاتر نەدەبوو، لای سەرەوەی بە بنمیچەکەوە لکێندرابوو، بە سێ شیشی ژەنگرتوو داخرابوو، ڕووبەری ژوورەکەش بە پانی دەرگاکە و دوو مەتریش درێژی بوو، تەنەکەیەکیشی لێ بوو پیسایی و پاشەڕۆی تێدابوو و بۆنی گەنیوی مرۆڤی دەخنکاند. مێشومەگەز بە دەورییەوە گیزەگیزیان بوو، تەنەکەیەکی دیکەی پڕ لە شلەی بۆگەنی کەس نەیدەزانی لە کەنگێوە پڕ بووە، ئەویش لە نزیکییەوە دانرابوو، کەس نەیدەزانی ئەو شلەیە ئاوە یان میز؟ کەشەوهەوای ژوورەکەش قرچەی گەرمایەك بوو نەبێتەوە، ڕێك لە گڕکانی نانەواخانەیەك دەچوو لە چلەی هاویندا جۆشی سەندبێت. لەو ژوورەدا نە پارچە دۆشەکێك، یان هەتا حەسیرێك و شڕە ڕایەخێکیشی لێ نەبوو لەسەری دابنیشێت، تێنوێتی ناو هەناو و گەرووی دەسووتاند، هەناسەبڕکێی وێ کەوتبوو، وەلێ هاندەری گەورەی ناخە شکاوەکەی، گیانی شکۆمەندی و دەروونی بەرزی بوو، ئایا دەبێ بەم جۆرە سووکایەتی پێ بکرێت و ئازادی و ژیانی لێ زەوت بکرێت، وەك مێروویەکی بێکەڵك مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و تووڕ هەڵبدرێت و هەمووان پشتی تێ بکەن؟ پاشانیش ئەم هەموو دەرد و بەڵا و نەهامەتییە بەر شەقی بدەن؟ بۆیە

هەستکردنی بە سووکایەتی و ئابڕووبردنی لە ناخەوە وردوخاشیان دەکرد و تێکڕای ئەو سووکایەتییانەش تەنها بە هۆی دەستەواژەیەکەوە بوو بێت کە لە بارێکی دەروونیی بێزاریدا گوترابێت؟ ئەمە بە عەقڵی کێدا دەچێت دوو کارمەندی زل و زەبەللاحی وەك ئەو دووانە ئاوا پەلکێشی بکەن و بەو شێوازە سووکایەتییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، بی ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات، یان نارەزایی دەرببڕێت، یاخود هەتا جووڵەیەکیش بکات کە واتای ڕەتکردنەوە بگەیەنێت، لە کاتێکدا ئەو مرۆڤێکە شانازی بە شکۆی خۆیەوە دەکات، دیمەنەکەی کڕووزەی لە ناخەوە دەرهێنا و مرۆڤ بەزەیی پێدا دەهاتەوە. ئەو سووکایەتی و ئازار و ئەشکەنجانەی کە لە دەرەوەی ئەم شوێنە ژیانی خەڵکی هەراسان دەکەن، لە هەمبەر ئەم ساتەوەختە سەرشۆڕییەی کە خۆی بە زەلیل و دەستەپاچە دەبینێت، هێشتا هیچ نییە، ئاخر ئەو لە ئەنجامی هەستکردنی بەوەی کارمەندانی ئێرە لە ئاستێکی نزمتر لە مرۆڤی دادەنێن، ناخی وێران دەکرد و لە داخان لە ناخەوە بە کوڵ بۆ حاڵی خۆی دەگریا، خەون و خولیا و ئەندێشەکانی ئەو لە کوێ و ئەم دۆخەی ئێستای لە کوێ؟! لێرە دەتوانن هەموو شتێکی لەگەڵدا بکەن، بێ ئەوەی کەس سزای تاوانباران بدات، هەتا ئەگەر بشیکوژن و فڕێی بدەنە زێرابێکیشەوە، خۆ کەس متەقی لێوە نایەت. بەڵام ئەم خۆبەدەستەوەدانەی بۆ؟ ئەوەندەی بەس نییە کە بە زیندوێتی لە گۆڕێکیان پەستاوە؟ ئەم جێگەیە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ گۆڕدا نییە، بەڵکوو گۆڕ زۆر لێرە بەزەییانەترە، چونکە ئەوەی لە گۆڕدا بێت هەست بەوە ناکات لە چیدایە، ئەرێ تۆ بڵێی کەسێك هەبێت ئەم هەموو ئەشکەنجەیە بچێژێت و حەز بە مانەوە و بەردەوامبوون لە ژیان بکات؟ ئایا لەم ژیانەی ئێستا ئەوی تێدا دەژی،ترووسکایەك لە هیوا و

ئومێـد، ئەگەر زۆر کـزیش بێـت نیـیە بـۆ ئەوەی پێـی بەردەوام بێت؟ ئەم شوێنە زۆر لە مردن دژوارترە، مەگەر تەنهـا شـێتەکان بەرگەی بگرن. خۆزگە هەر بە ڕاستی شێت دەبوو، وەلـێ لەبەر ئەوەی شێت نییە، بۆیە وەکـوو ئـاوی سـەر ئـاگر بلـق دەدات و پەیتا پەیتا خەریکە لەناو دەچێت و کۆتـایی دێـت، بـۆیە لەگەڵ خۆیدا بڕیاری دا هەر دەبێت ئەم شوێنە جێ بهێڵێت، نەك تەنهـا بە جەستەی، بەڵکوو بە عەقـڵ و هەستیشـی. ئـاخر هەر کەسـێك هاتبێتە ئەم شوێنە دەربازی نەبووە، مەگەر پەرجوویەك دەربـازی کردبێت. هەر کەسێکیش لێرە بە پەرچوو دەربازی بوو‌بێت، ئەوا جارێکی تـر لەنـاو کـۆمەڵگە پێویسـتیی بە کەسـانێکی تـر هەیە، تاکوو وا لە خەڵکی و کۆمەڵگە بکەن، وەکوو کەسێکی ئاسایی پەسەندی بکەنەوە و سـووکایەتی پێـوە نەکەن و ئـازاری نەدەن. ئـاخر ئەم وڵاتە، وڵاتێکـی ئەوروپـایی نیـیە. ئێـرە وڵاتـێکە لە وڵاتەکـانی جیهـانی سـێیەم، خـۆتیش نازانیـت دەرد و بەڵا لە چ ئانوساتێکدا پڕت پێدا دەکات و لە مرۆڤبوون داتدەشۆرێت، ئەم وڵاتە زەڕەیەك مرۆڤدۆسـتیی تێـدا نەمـاوە، بەزەیـی و لـۆژیکی دروستیشی تێدا نغرۆ بووە، ڕاستییەکان سـەراوبن و سـیخوڕی و گـوێ لە مسـتی و درۆش، بڕیـار لەسـەر عاقڵـداری و شـێتیی مرۆڤەکان دەدەن.

سامان باش دەیزانی ئیدی نەك تەنها لەنـاو خەڵکـی، بەڵکـوو هەتـا لەنـاو خـزمە نزیکەکـانی خۆیشـی جـێگەی نـابێتەوە. بـۆیە نەفرەتـی ئەم شـوێنە بـۆ هەتاهەتـایە دەبێـتە لەکەیەك و بەدوایەوە دەبێـت و پێـوەی دەلکێـت، ناچـارە دەبـێ بـۆ ئەوپەڕی زەوی ڕابکـات و بە جۆرێـك خـۆی ون بکـات، کە هـیچ کەسـێك نەیناسـێتەوە، بەڵکـوو وا باشـە، ئەگەر بکـرێ هەر زەویـش جـێ بهێڵێت، لەم شوێنە دەربچێت و تەنهـا جەسـتەی تێیـدا بهێڵێـتەوە،

ئاخر مردن باشتره لەم مەرگەساتەی تێیدایە، تەنها ئەو بۆنە گەنیوەی ناو تەنەکەکە بەسە بۆ ئەوەی بیر لە لەناوبردنی ژیانی خۆی بکاتەوە، بەڵام چۆن دەتوانێ خۆی بکوژێت؟ ئەو پێویستیی بە شتێکی تیژە تاکوو شادەماری دەستی پێ ببڕێت، یان هەر پەتێك خۆی پێ بخنکێنێت، کات بە ئازارێکی زۆرەوە تێدەپەڕی، ڕێك دەتگوت گالیسکەیەکی پاچکە شکاوە و کیسەڵئاسا هەنگاو دەنێت، شەو بە بارێکی زۆر گرانەوە بارگەی خست، نە خۆی خنکاند و نە شادەماری دەستیشی بڕی. تا ئێستاش خۆی کرووشکە کردووە و دەستەکانی لە لاقەکانی ئاڵاندووە، ناوچەوانیشی خستۆتە سەر چۆکە پێکەوەلکاوەکانی. دەنگی نووزە و ناڵەیەکی کز لە شوێنێکەوە بەر گوێ دەکەوێت، وەلێ هەرچەندە هەست ڕادەگرێت، نازانێت ئەو نووزەیە لە کوێوە دێت، جارجارەش دەنگی قاقای پێکەنینێك هەرچی تارمایی بێدەنگی هەیە دەڕەوێنێتەوە و لە ناکاویش دەبڕێت و نامێنێت. وەك ئەوەی ئەم شوێنە هیچی لێ نەبێت جگە لە خێو و دێو و درنج و تارمایی. چەند ساتێکی بەسەردا تێپەڕی، گوێی لە دەنگی فیشکەیەك بوو لە شوێنی خۆیدا وشکی کرد، لەوانەیە مارێکی ژەهراوی بێت و لەم کەشە وشك و برینگەدا دزەی کردبێتە ناو بەندیخانەکەوە، وێڕای ترس و تۆقینەکەی لەژێر لێوەوە گوتی: "خۆزگە بە پێوەدانێکی خێرا، مارەکە کۆتایی بە ژیانم دەهێنا، دەی ماری دوژمنی هەموو گیانلەبەران، تاقە دۆستەکەی من، چاکەیەکم لەگەڵدا بکە و ددانە ژەهراوییەکانت لە جەستەم بچەقێنە، هەرچی ژەهری کوشندەت هەیە لە جەستەمدا بەتاڵ بکە، وای ئەگەر ئەوەم لەگەڵدا بکەیت، قەت لە چاکەت دەرناچم". ڕۆژێکی تەواو تێپەڕی و ئەو هەر لەو حاڵەتەی خۆی بەبێ جووڵە دانیشتبوو، تاکوو هەستی بە ڕەقبوونی هەموو ئەندامانی جەستەی کرد، هەتا

توانای جووڵاندنی دەستەکانی و درێژکردنی قاچەکانی نەبوو، ئازارێکی دژوار وەکوو ئەو مارە کینگڵی پێ دەدا، کە بڕیار بوو بێت و کەچی نەهات و لەم قەیرانە تواناپڕووکێنەی ڕزگار نەکرد، لەبەرخۆیەوە گوتی: "ئەرێ بە ڕاست ئەو دوو کارمەندە بۆ کوێ چوون؟ بۆچی نەهاتنەوە بۆ لام؟! تۆ بڵێی لە بیریان کردبم؟ خۆ ئەگەر ئاژەڵیش بوومایە لە بیریان نەدەکردم! تا بە پارچە نانێك و قومە ئاوێك ئاگری ناخمیان دابمرکاندبووایەوە، دەبێ چی بکەم، وا تینوێتی خەریکە ئاگر لە هەناوم بەر دەدات! نازانم لەو شلە بۆگەنەی ناو تەنەکەکە بخۆمەوە، یان نا؟!"

ئەمڕۆکە زۆر لە دوێنێکە وشك و برینگتر بوو. پێویستی بە شنەبایەك بوو، هەتا ئەگەر گڕەیەکی گەرمیش بێت، هەوڵی دا هەستێت، وەلێ هەموو جەستەی داهێزرابوو، دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر ئینجا توانی لەسەر قاچەکانی بوەستێت، کەمێك بەرچاوی ڕوون بووەوە، تەواوی سەرنجی خۆی کۆکردەوە و لەو شوێنە بچووکە کەوتە پایدۆزی مارەکە و هەوڵی دۆزینەوەی دەدا، وەلێ هەر نەیدۆزییەوە، ئایا هەر بە ڕاستی ئەوە فیشکەی مار بوو، یان ئەو وا هەستی کرد؟! لە تەنەکەکە نزیك کەوتەوە، بە دوو دەستی لەرزۆکەوە گرتی، لە لووتی نزیکی خستەوە، بۆنەکەی ئێجگار قێزەون بوو، وەك ئەوەی تێکەڵەیەك بێت لە میز و ئاو، لە شوێنی خۆی داینایەوە، هێڵنجی هاتێ و خەریك بوو بڕشێتەوە، ئاخر ئەو ناو هەناوی بەتاڵ بوو. وەك ئەوەی لەو چرکەساتەدا بەئاگا هاتبێتەوە، ئینجا بۆی دەرکەوت، ئەوە چەند ڕۆژێکە خواردن بە گەروویدا نەچۆتە خوارەوە، ئەوەی زیاتریش ئازاری دڵ و دەروونی دا و لە ناخەوە هەراسانی کرد و وای لێ کرد دڵی بە خۆی بسووتێت، ئەوەبوو کاتێك باوکی بۆ ئێرەی هێنا هیچ خواردنێکی لەگەڵ

خۆیدا بۆ نەهێنا بیخوات. دەبێ ئەو باوکە چ بۆچوونێکی هەبوویێت؟ تۆ بڵێی وا بیری کردبێتەوە کوڕەکەی لە مێوانخانەیەکی پێنج ئەستێرە نیشتەجێ دەبێت و هەر ئێستا لە چێشتخانە پڕ لە بۆنوبەرامەکەی دەرچۆتە دەرەوەو هەرچی خواردنی خۆشە نۆشی کردووە؟ ئاخر خۆ دەیتوانی لە نزیك هەر چێشتخانەیەك داوا لە شوفێرەکە بکات ڕابوەستێت و خواردنێکی بۆ بهێنێت تاکوو گەدەی خۆی پێ بڕ بکات. خۆ هیچ کەسێکیان ڕێگرییان نەدەکرد ئەگەر ژەمە خواردنێکی پێ بدابوونایە. کەچی وا پێ دەچێ ئەو باوکە وای پێ باشتر بوویێت کوڕەکەی برسی بکات و لە گیرفانی خۆیشی هەموو ئەوانەی دیکە تێر بکات، ئەی بۆ نەیکرد؟! ئەمەیان وەڵامەکەی لای باوکە داماوەکەیەتی!

لە دەرگاکە کونێکی چوارگۆشە هەبوو لە بستێك زیاتر نەبوو، سامان دەستی پێوە گرت و دەموچاوی خۆی خستە ناوییەوە، بیری کردەوە بانگ بکات، بەڵکوو یەکێك گوێی لە دەنگی بێت، بەڵام لە ئەنجامەکەی ترسا، باشە ئەو لە چی بترسێت؟ ئایا ئازار و ئەشکەنجە لەوەش زیاتر هەیە کە ئێستا ئەوی تێدایە؟ ئایا کەسێك هەیە بزانێت واتای ئەوە چییە کە مرۆڤ تینووی بێت؟ پاشان لە ناکاو تووڕەییەکەی تەقییەوە، بە توندی دەستی بە هاوار و ڕاوەشاندنی دەرگاکە کرد، وەلێ لە ناکاو بێدەنگ بوو، هەستی کرد دەرگاکە دانەخراوە، کەواتە لەو کاتەوەی دوو کارمەندەکە ڕۆیشتوون دەرگاکە کراوە بووە. بە هۆی ژەنگەکەیەوە ئاگایان لەوە نەبووە کە قفڵی دەرگاکە تەواو نەچۆتە شوێنی خۆی و کلۆم نەدراوە. بە وریاییەوە سەری درێژ کردە دەرەوەی دەرگاکە، ڕێڕەوێکی درێژی بینی، نەیدەزانی بەرەو کوێ دەڕوات، وەك ئەوەی بۆ جاری یەکەم بیبینێت!

بڕیاری دا پێیدا تێپەڕێت، ترسی گەورەی لەوە بوو، نەبادا شتێکی ترسناك، یان کارمەندێکی تووڕە ببینێت و ڕقی خۆی لێ بەتاڵ بکاتەوە، بە خێرایی و لەسەر نووکی پێی هەنگاوی دەنا، نەبادا دەنگی پێی کەسێك ئاگادار بکاتەوە و ئاشکرای بکات و بکەوێتە ناو گێژاوێکەوە دەربازبوونی نەبێت، بە بەردەم دەرگای زۆر ژووری چەپ و ڕاستدا تێپەڕی، زۆربەیان دانەخرابوون، وەك ئەوەی بەتاڵ بن، بەرلەوەی بگاتە کۆتایی ڕاڕەو و داڵانەکە، گوێی لە دەنگی هەنگاوی پێ و ئاخاوتنی کەسانێك بوو لێی نزیك دەکەوتنەوە، بە خێرایی گەڕایەوە دواوە و خۆی کوتایە ژوورێکی دانەخراوەوە، ژوورەکە گەورەبوو و زیاتر لە بیست مەتری دووجا دەبوو، پڕ بوو لە کەلوپەلی جۆراوجۆر کە زۆربەیان شکابوون، وەکوو تەختی دانیشتن و مێز و تەنکیی ئاو و شتی جیاوازی دیکە، لەو ژوورەش پەنجەرەیەك ڕێك وەکوو پەنجەرەی گۆڕەکەی پێشووی، ببورن مەبەستم ژوورە گەنیوەکەی پێشووی، بە بنمیچی ژوورەکە وە لکابوو، بەڵام بە قەد درێژایی دیوارەکە درێژ بوو، وا پێ دەچوو ئەو دوو کەسەی بوونە هۆی خۆحەشاردانی سامان، گەیشتبنە پشت دیوارەکە، سامان سەرکەوتە سەر ئەو کەلوپەلە کەڵەکەبوو و شکاوانەی ناو ژوورەکە و بە هێواشی سەری بەرزکردەوە و لە پەنجەرەکەوە تەماشای ئەوانی کرد خەریکی ئاخاوتن بوون. دیمەنی هەردووکیان لە کرێکاری تەلارسازی دەچوو و هەردووکیان ڕوویان لە چۆلەوانییەك کردبوو کە بەرەو شوێنێکی دووری دەبردن، بە دار و درەختی کورت و بە بەرزیی مەترێك یان زیاتری تێدا ڕووابوو، لە دووری نزیکەی چارەکە کاتژمێرێکی پیادەڕۆییش شەقامێکی گشتی هەبوو، ئۆتۆمبیل لە هەردوو لایەوە هاتوچۆیان دەکرد، تیشکی خۆرەکەش لە جامی ئۆتۆمبیلەکانەوە دەبریسکانەوە و بە خێرایی لە چاویان دەدا.

سامان له خۆشیی ئەوەی بە چاوی خۆی بینی دڵی لەناو سینەیدا کەوتە کوتەکوت، ئەمە هەل و دەرفەتێکە و هەرگیز دووبارە نابێتەوە، نابێ کاتی زیاتر بە فیڕۆ بدات، بۆیە بێ ئەوەی زیاتر بیر بکاتەوە بڕیاری دا بەدوای ئەو دوو کەسەدا بڕوات کە لە پێش ئەویەوە دەرچوونە دەرەوە، ئیدی ئەویش لە حەشارگەکەی دەرچووە دەرەوە و بە خێرایی بە ڕاڕەوەکە و داڵانەکەدا هەنگاوی خێرای دەنا، تا گەیشتە کۆتاییەکەی، لەوێ ئیستێکی کرد و سەری دەرکردە دەرەوە و بە ئاگاییەوە سەیرێکی ئەملا و ئەولای ڕاڕەوەکەی کرد، ترسی ئەوەی هەبوو نەبادا ڕووداوێکی لە ناکاو چاوەڕوانی بکات و ڕیسەکەی لێ بکاتەوە خوری، بەڵام کەسی نەبینی، ڕاڕەوەکە بە لای چەپدا زۆر درێژ بوو، بەڵام بە لای ڕاستدا دەرگایەکی ئاسنینی لە دووری پێنج مەترێك بە دی کرد بەرەو ناوچە چۆلەکەی دەبرد کە پێش کەمێك دوو کەسەکە پێیدا تێپەڕین، بە خێرایی و بێ ئەوەی هیچ دەنگێك دەربکات، لای ڕاستی گرتەبەر و تەنها دوای چەند چرکەیەك خۆی بینییەوە وەکوو تیر لە کەوان دەربچێت، ئەویش ئەوها بە ناو دار و درەختە پەرشوبڵاوەکان و دەوەنەکاندا بۆی دەرچوو. هەرچەندەش دوورتر دەکەوتەوە زیاتر ئاوڕی لە دوای خۆی دەدایەوە و ژمارەیەکی زۆر و گەورەی تەلاری هاوشێوەی ئەو تەلارە دەبینی کە پێش کەمێك ئەوی لێ بوو، کەچی لەو لایەوە هیچ دیوار و پەرژینێکی لێ نەبوو، دەورانـدەوری شوێنەکەیان داببێت، دیارە لەم لایەوە پێویستییان پێی نییە، چونکە وا پێ دەچێت بە بڕوای ئەوان، ئەوەی بێتە ناو یەکێك لەم داڵان و هۆڵانەوە ئیدی بە سەلامەتی لێی دەرناچێت، مەگەر بە مردوویی و بۆ ناشتن بەرەو شوێنێکی دووری ببەن. خۆ ئەگەر دەرگای گۆڕەکەی، ببورن دەرگای ژوورە تەنگەبەرەکەی داخراو بووایە، هەڵبەتە ئەویش بە دەردی

ئەوانەی دیکە دەچوو و کاتێك لێی بە ئاگا دەهاتن، لاشەکەی بۆگەنی دەبوو و ئەو ناوەی پڕ دەکرد. لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو، لە شەقامی گشتی نزیك کەوتەوە، زۆر بە وردی چاودێری ناوچەکەی دەکرد و ترسی ئەوەی هەبوو نەبادا بەڵا و نەهامەتییەکی دیکە لە ناکاو یەخەی بگرن و تووشی دەردەسەرییەکی دیکەی بکەنەوە، ئەوەی نیگەرانی کردبوو، گیرفانی فەتەڕۆی دەگوت و ڕێك لە هەنبانەیەکی بەتاڵ دەچوو، نە فلسێك و نە شتێکی ئەوتۆی پێ نەبوو بیداتە کرێی ئۆتۆمبیلێك ئەگەر لەگەڵ خۆیدا هەڵیبگرێت. بۆ ماوەیەك بە لێواری شەقامەکەدا دەڕۆیشت و زوو زووش ئاوڕی بەملا و بەولادا دەدایەوە، دواتر بیری کردەوە: "چی دەبێ ئەگەر بە هەڵاتنەکەی بزانن و لە ڕێگەوبانەکان بەدوایدا بگەڕێن، چ گەمژەییەکە ئەگەر بکەوێتەوە چنگیان، وای ئەو کاتە دەبێ چ سزا و ئەشکەنجەیەك چاوەڕوانی بکەن؟!" بیرۆکەکە تۆقاندی، کەواتە وا باشترە لە شەقامەکە بپەڕێتەوە و تا بۆی دەکرێت لەو ناوچەیە دوور بکەوێتەوە. دوای نزیکەی کاتژمێرێك ڕۆیشتن، زەوییەکە بەرەو ڕووبارێکی پانوبەرین خلۆری کردەوە، کە ئەمبەر و ئەوبەری بە درەخت و دار و دەوەن داپۆشرابوو. بە پەرۆشەوە ڕووی لە ئاوەکە کرد، نەیدەزانی لە خۆشییان چی بکات، حەزی دەکرد ئاوی ڕووبارەکە هەمووی بخواتەوە، بەڵام هەر زوو فیلمی پیاوی بیابانەکەی وەبیر هاتەوە، کە خەریك بوو تینویتی لەو بیابانە وشکوبرینگەدا بیکوژێت، کاتێکیش ڕێبوارانی ڕەوەند و کۆچەری دەیدۆزنەوە، سەرەتا تەنها لێوەکانی تەڕ دەکەن و دواتر چەند دڵۆپە ئاوێکی بەزاردا دەکەن و بە تێپەڕبوونی ماوەیەکی تر چەند دڵۆپە ئاوێکی دیکەی بۆ زیاد دەکەن، تا لە کۆتاییدا پیاوەکە توانای خواردنەوەی ئاوی دەبێت و لە مردن ڕزگاری دەبێت و تینویتی دەشکێت، هەڵبەتە

خواردنەوەی ئاو بە سکی بەتاڵ و گەدەی گڕگرتوو لە تینووان، مەترسییەکەی یەکسانە لەگەڵ وشکبوون، سامان بە زەحمەت توانی بەرگەی ئارەزووی ئاوخواردنەوە بگرێت، سەرەتا ئاوەکەی لە دەمی وەردەدا و فڕێی دەدایەوە سەر زەوی، لەبەر ئەوەی تەواوی جەستەی بە هۆی ئارەقکردن و خوێنی وشکەوەبوو، جلەکانی پیس کردبوو، بۆیە بە هێواشی چووە ناو ئاوەکە و دەستی بە شوشتنی جلەکانی کرد، هەر کە هەستی بە نزیك بوونەوەی کەسێك بکردبووایە بە خێرایی خۆی لەناو دار و دەوەنەکان دەشاردەوە، ئەو نەیدەزانی کە ئەوە ڕووباری سیروانە، بیری لەوە کردەوە ڕۆیشتن بە پێچەوانەی ئاڕاستەی ئاوەکە بەرەو باکووری دەباتەوە و لەگەڵ ڕۆیشتنی ئاوەکەش بەرەو باشوور، بۆیە بڕیاری دا بە کەناری ڕووبارەکەدا بەرەو باکوور هەڵبکشێت. ڕۆیشتنەکەی لەسەرخۆو بە ئاگاییەوە بوو، سەرنجی هیچ کەسێکی لەوانە ڕانەدەکێشا کە بە لایاندا تێدەپەڕی، ماوەی پێنج ڕۆژی بەردەوام بەو شێوەیە ڕێی کرد، کێڵگە کشتوکاڵییەکان لە مرۆڤەکان چاوتێرتر بوون لەو میوە و سەوزەیەی هەیانبوو خۆی تێر دەکرد و لەو بەڵایەی تووشی هاتبوو خۆی بە براوە دەزانی، وەلێ خۆی لە گوندەکان بە دوور دەگرت، چونکە سەگەکانیان دڕن و حەز لە چارەی خەڵکی نامۆ و ڕێبواران ناکەن، هەر کە ڕێککەوتی شوێنێکی ئاسوودە و ئارام و بێ مەترسیشی بکردایە و دار و درەخت دایپۆشیبووایە، شەوەکەی لێ بەسەر دەبرد. هەر کە ڕۆژیش هەڵدەهات دەستی بە ڕۆیشتن دەکردەوە. دوای چەندین شەو و ڕۆژو ڕۆیشتنێکی زۆر، سەرنجی دا ماڵەکان بە پانتایی بینینی ئەو پەرشوبڵاو بووبوون، هێواش هێواش لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو، کاتێك بە خۆی زانی هەموو لایەکی خانوو و ماڵە، کەواتە گەیشتۆتە شارێکی گەورە و لەناو خەڵکەکەیدا ونبوو، وا

هەستی دەکرد ئەو شارە دەناسێتەوە، یان بە شەقامە سەرەکییەکەیدا تێپەڕیوە کاتێك بۆ بۆ بەغدا چووە، بەڵکوو هەتا ئەوەیشی بە بیر هاتەوە کە بێرەدا بردوویانە بۆ شێتخانە. ئەمە ڕێك شاری باقووبەیە. ئێستا شوێنی خۆی لەسەر نەخشە و گۆی زەوی زانی و دەتوانێ ئاڕاستەی خۆی دەستنیشان بکات، لەو شارەدا هاوڕێیەکی هەبوو، بەڵام ناونیشانەکەی نەدەزانی. وای چ ڕێککەوتێك دەبوو ئەگەر بە دیداری شادبووایە؟! هەرچی کێشەی هەیە چارەسەر دەبوو. بیری لەوە دەکردەوە: "ئەگەر ڕێککەوت ئەوەم لەگەڵ بکات و بیبینم، بڕە پارەیەکی لێ قەرز دەکەم و بەو پارەیە خۆم دەگەیەنمە شاخەکانی کوردستان، لەوێ دەتوانم بۆ هەتاهەتایە خۆم بشارمەوە و کەسیش دەستی پێم نەگات. نا نا بەر لە هەر شتێك داوای پیاڵە چایەکی لێ دەکەم، ئینجا پیاڵەیەك چییە تۆ بڵێ دووان، کوڕە بڵێ قۆرییە چایەکی تەواو و پارچە نانێك، وای بۆ پارچە نانێکی گەرم، ناوەڵا بڵێ دە نانی تەواو".

لەو کاتەی ئەو لەگەڵ خەونە سادە و ئەرخەوانییەکانیدا دەستلەملانێ بوون، لە دوورەوە چەند سەربازێکی کڵاوسووری بە دی کرد، خەریك بوو دڵی لە لێدان بکەوێت، ئاخر ئەو هیچ شتێکی پێ نییە کەسایەتی و ناسنامەی بسەلمێنێت. ئەو ئینزیباتە سەربازییانەش خەڵکی ڕادەگرن و وردبینی لە ناسنامەکانیان دەکەن، خاوەن بەختیش ئەو کەسەیە لە چنگیان دەربازی دەبێت. وای لەو بەڵایە! ئاخر دوای ئەو هەموو ئازار و ئەندێشەیەی چەشتوویەتی، ئێستا جارێکی تر بکەوێتەوە دەستیان و هەمان ڕیسوایی ببینێتەوە و ئینجا ڕاپێچی بەرەکانی شەڕی بکەن و لەوێ بکوژرێت؟! لە باشترین حاڵەتەکانیدا تووشی ئەو چارەنووسە دەبێت، هەتا ئەگەر کەسایەتی و ناسنامە

ڕاستەقینەکەی خۆیشی بشارێتەوە، چونکە بەڵاکە گەورەتر دەبێت ئەگەر ناسنامەی ڕاستەقینەی بزانن. بۆیە خۆی لەوان لادا و ئاڕاستەیەکی دیکەی بەرەو باخەکان وەرگرت و بەسەر دیوارە نزمە قوڕینەکەیدا ئاودیو بوو و خۆی دەربازکرد، لەناو گژوگیا و دار و درەختەکانیدا خۆی شاردەوە، چش لەوەی با سەگە دڕەکان لەتوپەتی بکەن، بەڵام نەکەوێتە دەستی ئەو جەللادانە، کەمێك لە دووریی پەرژینە قوڕینەکە ژوورێکی لە قوڕ دروستکراوی بە دی کرد، خۆی کوتایە ناوییەوە و بە وردی سەیری دەوروبەری کرد، لە ترسی شتێکی نادیار، بنمیچی ژوورە نزمەکە لە قەدی دار و گەڵای دارخورماکان دروست کرابوو، لە ناوەڕاستیدا دار ستوونێکی ئەستوور بەرز بووبووەوە، چەند قەرتاڵەیەکی دروستکراویش لە لق و گەڵای خورما بە قەد ستوونەکەوە هەڵواسرابوون، ناو ژوورەکە پڕ بوو لە کۆمەڵە خورما و تا بنمیچەکە بەسەر یەکتریدا هەڵدرابوونەوە، بە هۆی قرچەی گەرماکە، خورماکە تەواو ترشابوو، بۆنێکی سەرخۆشکەرانەی بە دەوروبەری خۆی دەبەخشی. هەر کەسێك بچێتە ناو ژوورەکە ڕاستەوخۆ تەختانجەیەکی پان کە بە دیوارەکەوە چەسپێندراوە سەرنجی ڕادەکێشێت، هەرچی کەلوپەل و پێداویستیی کرێکارانی کشتوکاڵە لەسەری دانراون، سەرباری چەند دۆلکە پلاستیکێکی دوو لیتری. سامان بۆ چەند ساتێك لە پشت دەرگای ژوورەکە ڕاوەستا، بە وردی سەرنجێکی تەواوی شوێنەکەی دا، کپ و خامۆش هیچ مەترسییەك لە ئارادا نەبوو، ماندوێتی و شەکەتی و ترس و دڵەڕاوکێی چەند ڕۆژەی، هەرچی وزەی جەستەی هەبوو سووتاندبوو، بۆیە ئارەزوویەکی زۆری چووە خورماکە لەجیاتیی میوە و سەوزەوات کە چەند ڕۆژێك بوو لە کێڵگە کشتوکاڵییەکان گەدەی خۆی پێ خامۆش دەکردەوە. بۆیە

ئەوەندە خورمای خوارد کە بەشی وزەی دوو ڕۆژی تەواوی جەستەی بکات، پاشان سەرتاپای جەستەی خاو بووەوە، بە هۆی بۆنی سەرخۆشکەر و خواردنی ئەو هەموو خورما ترشاوەوە، هەستی بە خەوێکی قوووڵ کرد، توانای بەرگەگرتنی نەما، ژوورەکەش نیمچە تاریك بوو، ئیدی خۆیدایە دەست خەوێکی قووڵەوە کە تا ئێوارەی خایاند، وەلێ سەگوەڕی ناو باخ و بێستانەکانی دەوروبەری بە ئاگایان هێنایەوە. سامان لە شوێنی خۆی ڕاچڵەکی، ئاخر ئەو سەگانە ئەوەندە دڕن، ڕێك لە گورگ دەچن. بۆیە هەر دەبێ لەو شوێنە دەربچێت و لەو ناوە دوور بکەوێتەوە. سەربازە کڵاوسوورەکانیش لەو کاتانەدا شەقامەکان چۆڵ دەکەن و تاکوتەرا نەبێت کەسیان نامێننەوە، ئەوانیش ماندوێتی و شەکەتی بێزاریان دەکات و توانای گێچەڵکردنیان بە ڕێبواران و خەڵکی نامێنێت، هەتا ئەگەر تووشیشیان بین. لەگەڵ خۆیدا بڕیاری ئەوەی دا زۆر لەم شارەدا نەمێنێتەوە، بەرەو باکوور و بە پێچەوانەی ئاڕاستەی ئاوەکەوە بڕوات، سبەینێش خۆر لای خۆرهەڵاتییەوە هەڵدێت و ئەویش بەرەو پێش هەنگاو دەنێت، ئەو باشی دەزانی کە ڕۆژهەڵاتی وڵات لەناو گرکانی شەڕێکی خوێناویدایە، بۆیە بە هیچ شێوەیەك نابێ هەڵە بکات و ئاڕاستەی خۆی بگۆڕێت. بەرلەوەی لەوێ دەربچێت، دەستی دایە قەرتاڵەیەك و هەندێك خورمای تێهاویشت و یەك دوو دۆلکەی بەتاڵیشی کردە ناوی، چاودێرییەکی وردی دەوروبەری خۆی دەکرد، بە ئاگادارییەکی تەواوە دەرگای ژوورەکەی کردەوە و بە هەنگاوی شڵەژاوانە و لەرزۆکەوە بەرەو نزمترین شوێنی پەرژینەکە ڕۆیشت، هەر کە گەیشتە ئەودیوی پەرژینەکە، هەستی بەوە کرد کە ئیدی گیانی هاتۆتەوە بەر، تا ئەو کاتەش سەگوەڕەکە لە دوورەوە دەهات، لە قووڵایی باخ و بێستانەکانەوە دەهاتن و بە خێرایی لێی نزیك

دەکەوتنەوە، بۆیە بەوپەڕی توانای خۆیەوە ڕووە و ماڵەکان تێی تەقاند، خۆی کوتایە ناو کۆڵانە تەنگەبەرەکانییەوە و نەیدەزانی بەرەو کوێی دەبەن، بەمەش ڕووبارەکە و باکووریشی ون کرد. ئەی چی بکات؟! ڕێبوارێك ڕابگرێت و پرسیاری ڕووبارەکە و ئاڕاستەی باکووری لێ بکات؟ ئەم پرسیارە گومان دروست دەکات، ئەویش پێویستی بە وروووژاندنی ئەو جۆرە گومانانە نییە. کەواتە با پرسیاری پردەکە بکات، ئەم پرسیارە هیچ گومانێك ناورووژێنێت، هەموو ڕێبوارێکی نەشارەزای شار پرسیاری دەکەن، لەوێوەش بە پێچەوانەی ئاڕاستەی ئاوەکە بەرەو باکوور مل بنێت.

دوای کەمێك زەحمەتی، سامان پردەکەی دۆزییەوە، ئێستا زیاتر لە سێ سەد کیلۆمەتری ماوە تا بگاتە شاخەکان و لەوێ ئارام و ئاسوودە بێت، ئەو کاتێك منداڵ بوو، چەندین جار سەردانی شاخەکانی کردبوو، تا ئێستاش ئەو یادەوەرییانەی لە بیر ماوە کاتێك لەگەڵ کەسوکاریدا سەردانی هەندێك خێزانیان دەکرد کە خزمیان بوون. ئیدی بەرەو لای ئەوان دەچێت. ئەم گەشتەی وا سووك و ئاسان نەبوو، ژیانی لەسەر دەستی خۆی دانابوو، لە هەر چرکەساتێك و هەر هەنگاوێکیدا مۆتەکەی مەرگ چاوشارکێی لەگەڵدا دەکرد، تا لە ساتەوەختی وادا دەگەیشتە نائومێدییەکی وا لە مەرگی نزیك دەخستەوە، بۆیە چۆلەوانییە پڕ لە مەترسییەکەی بەجێ دەهێشت و پەنای دەبردە بەر ڕێگە سەرەکییەکان، دەستی لە ئۆتۆمبیلە بارهەڵگرەکان بەرز دەکردەوە بەو ئومێدەی لەگەڵ خۆیاندا هەڵیگرن و کەمێك ئەو ڕێگەو ژیانە دۆزەخییەی لێ کەم بکەنەوە. لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "لە ناو ئۆتۆمبیلی بارهەڵگریش مەرگ چاوەڕێم دەکات، وەك ئەوەی لە چۆلەوانییەکە، پرسەکە تەنها پەیوەستە بە

کەمە بەختێکەوە و هیچی تر". بەڵام تۆ بڵێی ئەو بەختە یاوەری بێت و بەدەمییەوە پێبکەنێت و جارێکی دیکە هیوا و ئارامی پێ بەخشێتەوە؟ ئەدی کاتێك گەیشتە خاڵی پشکنینی سەر شەقامە گشتییەکان و زاڵگەکان چی بکات؟ ئەو هێشتا لەو وڕێنەیەی خۆیدا بوو کاتێکی زانی داوای لەو شوفێرە کرد کە لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرتبوو، چەند کیلۆمەترێك دوور لە خاڵی پشکنینەکە دایبەزێنێت، ئەم داوایەی بوێری و نائومێدییەکی زۆریشی تێدا بوو، ئاخر ئەمە وا لە شوفێرەکە دەکات باوەڕ بە حاڵی خۆی نەکات، چونکە هەندێك جار ماندوێتی وا لە مرۆڤ دەکات بەبێ هیچ بەرگرییەك مەرگ پەسەند بکات، چونکە لەو مردنەدا دەربازبوونی خۆی دەبینێت. شوفێرەکە پرسیاری هۆی دابەزینی لێ نەکرد، وێڕای ئەوەی هەستی بەوە کرد ئێستا ئەو بەڵایەکی لەناو ئۆتۆمبیلەکەیدا هەڵگرتووە و لەوانەیە تووشی سەرئێشەیەکی گەورەی بکات، هەنووکە ژیانی سامان بە دەستی ئەو شوفێرەیە، دەتوانێت ڕادەستی یەکەم خاڵی پشکنینی بکات کە پێیدا تێپەڕ دەبن، بۆ ئەوەی خۆی لە لێپرسینەوە دەرباز بکات، وەلێ بە هۆی ئەو پیاوەتییەی هەیەتی، پێش ئەوەی بگەنە خاڵی پشکنین دایدەبەزێنێت، تاکوو تەگبیرێکی حاڵی خۆی بکات. بەمە خۆیشی لەو تەنگژەیە دەرباز دەکات. شوفێرەکە لە دەوروبەری تەمەنی پەنجا ساڵی دەبوو، ڕەشتاڵەیەك بوو، دەموچاوی چرچولۆچی داپۆشیبوو و لە پیاوێکی پیر دەچوو، دوای ماوەیەك لە بێدەنگی کە نزیکەی کاتژمێرێك دەبوو، لە ناکاو گوتی:

- منیش سێ کوڕم لە بەرەکانی جەنگدا بوون. تەرمی دووانیان پێ دامەوە و ئێستا چارەنووسی سێیەمیان نازانم! چەند ئاواتەخوازم دەرفەتێکی بۆ هەڵبکەوێت و ڕابکات، تاکوو ژیانی

خۆی دەرباز بکات، گرنگ نییە بەلامەوە بۆ کوێ دەڕوات و چۆن دەژێت؟ گرنگ ئەوەیە لای من ئەو سەلامەت بێت و لە ژیاندا بێت. ئێمە لەم شەڕەدا هیچ بەرژەوەندییەکمان نییە.

وەك ئەوەی شوفێرەکە بەم قسانەی سامان دڵنیا بکاتەوە کە ترسی لێی نەبێت.

سامانیش بە منگەمنگێك و ئاخ هەڵکێشانێکەوە گوتی:

- مامی بەڕێزم بۆ کوڕەکانت هەست بە خەم دەکەم.

شوفێرەکە دوای خەیاڵ ڕۆیشتنێکی زۆر و بێدەنگی گوتی:

- کوڕی خۆم تۆ بۆ کوێ دەچیت؟ دەتوانم لە خاڵی پشکنین نەجاتت بدەم، من شوێنی شاراوەم لە ئۆتۆمبیلەکەمدا هەیە، کەس ناتوانێت بیدۆزێتەوە. بەرلەوەی بگەینە خاڵی پشکنین تێیدا ڕابکشێ و دوای پێنج خولەك لە تێپەڕبوون وەرەوە ئێرە دابنیشە. من ئەمە لە پێناوی کوڕەکەمدا دەکەم، کە لەوانەیە بە هەمان دۆخی تۆدا تێپەڕ ببێت.

سامان بە کەمە شڵەژان و ڕاڕایی و بە منگەمنگێکەوە گوتی:

- مامی بەڕێزم باوەڕم پێ بکە حاڵی من تەواو جیاوازە، ئەوەی من دەمەوێ پێش ئەوەی بگەینە خاڵی پشکنینەکە بە چەند کیلۆمەترێك دامبەزێنە و خۆم تەگبیری حاڵی خۆم دەکەم.

شوفێرەکە لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: "مافی خۆیەتی متمانە بە کەس نەکات، ئێمە لە ڕۆژگارێکدا دەژین، پیاوەتی و چاکەی تێدا مردووە. پاشان بە دەنگێکی نزم گوتی:

- چۆنت پێ باشە وا بکە. کەواتە دوای نیو کاتژمێر دەبێ داببەزیت.

جارێکی دیکە بێدەنگی شوێنەکەی تەنییەوە، تەنها دەنگی بزوێنەری ئۆتۆمبیلەکە دەهات. دوای نیو کاتژمێرەکە، ڕاڕایی و دڵەڕاوکێ باڵی بەسەر ناخ و ڕوخساری ساماندا کێشا، هەتا شوفێرەکەش هەستی بەو دڵەڕاوکێیەی کرد. ئەوەتا ئەو ئۆتۆمبیلەکە لە تەنیشت شەقامەکەوە ڕادەگرێت و بە پەنجەی بەرەو ئاسۆ ئاماژە دەکات:

- تەماشای ئەو خانووە بکە دەڵێی شخاتەیە، ئەوە خاڵی پشکنینە، ئاگات لە خۆت بێت.

سامان دوودڵییەکی زۆری پێوە دیار بوو، ئاخر جارێکی دیکە بە پێ ڕۆیشتن، لەوانەیە پێویستی بە دە ڕۆژە ڕێ بێت، نازانێت تینوێتی دەیکوژێت، یان برسێتی. یاخود دەبێتە خۆراکی گورگە برسییەکان. دەرگای ئۆتۆمبیلەکەی کردەوە و دابەزی، بەرلەوەی شوفێرەکە دەست بە جووڵە بکاتەوە. سامان بە پەلە هاواری کرد:

- مامە مامە... مامە گیان، لەگەڵ خۆتدا بمبە، یاخوا لەگەڵ کوڕەکانت بەیەکتر بگەنەوە.

وەك ئەوەی شوفێرەکە چاوەڕێی ئەو داوایە بکات، بە پەرۆشەوە دابەزی و بە دەوری ئۆتۆمبیلەکەی سووڕایەوە و سندووقێکی یەدەگی کردەوە و شوێنی خۆشاردنەوەکە دەرکەوت، کە لە شێوەی سندووقێکی تەنگ و درێژ بوو، پڕ بوو لە تەختەدار، یەك یەك تەختەدارەکانی ڕاکێشا و فڕێی دایە ناو سندووقە گەورەکەوە. ئینجا داوای لە سامان کرد لە شوێنی تەختە دارەکان خۆی درێژ بکات. پاشان دەرگاکەی داخستەوە

و بە بورغی و سەمووڵەیەك قایمی کردەوە، سامان لە ژوورەوە بە زۆر هەناسەی دەدا، شوفێرەکە هاتەوە شوێنی خۆی و بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدات، دەستی بە ڕۆیشتن کردەوە و خێراییەکەیشی زیاتر کرد، ئەو شوێنەی سامان خۆی تێدا حەشاردابوو گڕی گرتبوو ئەوەندە گەرم بوو، بەڵام خێرایی ئۆتۆمبیلەکە لە درزێکەوە فێنکاییەکی پێ دەبەخشی، کاتێك سامان هەستی کرد بایەکە کەم دەبێت و خێرایی ئۆتۆمبیلەکەش هێواشتر دەبێتەوە، دڵنیا بوو کە ئیدی گەیشتوونەتە خاڵی پشکنینەکە، بەڵام ئۆتۆمبیلەکە ڕانەوەستا، بەڵکوو خێراییەکەی کەم کردەوە، پاسەوانەکەش بە خێرایی ئاماژەی بە شوفێرەکە کرد لە ڕۆیشتن بەردەوام بێت و ڕانەوەستێت، بە پەلە تەنها چەند قسەیەکیان لەگەڵ یەکتردا گۆڕییەوە. دیارە شوفێرەکە دەناسن و زۆر بێرەدا تێپەڕ دەبێت. بەو جۆرە سەرلەنوێ دەستی بە خێرایی کردەوە تا بە تەواوی ماوەیەکی باش دوور کەوتەوە و دڵنیابوو لەوەی کەس چاودێرییان ناکات، ئینجا ئۆتۆمبیلەکەی لە تەنیشت ڕێگاکە ڕاگرت و دەستی بە کردنەوەی بورغی و سەمووڵەکە کردەوە کە سندووقەکەی پێ داخستبوو، جارجارەش تەماشایەکی ئەملا و ئەولای خۆی دەکرد، ڕێگاکە تەواو چۆل بوو، لەو ساتەوەختەدا هیچ ئۆتۆمبیلێك دیار نەبوو، قاچەکانی سامانی گرت و ڕایکێشایە دەرەوەی حەشارگەکەی، پاشان سندووقەکەی وەکوو خۆی داخستەوە، فرمێسکەکانی چاوی سامان لە خۆشییان و بە هۆی کاریگەربوونی ئەو چاکە و پیاوەتییەی کە ئەو پێشکەشی کردبوو، خەریك بوو داباریێن. ئۆتۆمبیلەکە دەستی بە ڕۆیشتن کردەوە و ڕێگەیەکی زۆری بۆ

سامان کورت کردەوە، بۆیە سامان بیری لەوە کردەوە کە شەرمە نهێنی و دۆخی نالەباری خۆی بۆ ئەم پیاوە باشە نەدرکێنێت، دوای ئەوەی ئەو هەموو چاکەیەی لە پێناویدا کرد، نەخاسمە هەوڵی ئەوەی نەدا پرسیاری هۆکاری دۆخەکەی لێ بپرسێت و ئاشکرای بکات، بەڵام سامان سوور بوو لەسەر ئەوەی پرسی بردنی بۆ شێتخانەکە باس نەکات. تەنها چیرۆکێکی بۆ خۆی داتاشی بەوەی لە زینداندا مەرگی بە چاوی خۆی بینیوە، ئیدی شوفێرەکە سەرزەنشتی زۆری کرد بۆ ئەو خەم و ناسۆرەی تووشی کەسوکاری کردووە و بە دەنگێکی لەسەرخۆ و پتەوەوە گوتی:

- کوڕی خۆم ئایا دەزانی چ خەم و ئازارێکت بەخشیوەتە دایك و باوکت، بە هۆی ئەو قسە سەرشێتانەیەت؟ تۆ نازانی ئێستا ئەوان بە هۆی تۆوە چەند ئازار دەچێژن. ئایا هیچ عاقڵێك هەیە لە چایخانە و بە بەرچاوی ئەو هەموو حەشاماتەوە قسەیەکی وا بکات؟ بۆ تۆ نازانی هەتا دیواریش گوێی هەیە و گوێی لە هەموو شتێك دەبێت؟ نا کوڕم من هەرگیز لەگەڵ ئەو کردارەتدا نیم. دەبووایە تۆ لەوە ژیر و زیرەکتر بیت.

سامان لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە: "وای چ کارەساتێك دەبوو ئەگەر زمانم خوار بڕۆیشتبووایە و باسی ڕووداوی شێتخانەکەیشم بۆی بکردبووایە، هەر بە جارێك بە شێتی دادەنام، خۆ لەوانەشە مامەڵەکردنی لەگەڵمدا بگۆڕیبووایە". جا بۆ ئەوەی ئەو گومانە لە خۆی دوور بخاتەوە کە خۆشی پێدا نایەت و حەزی لێ ناکات، گوتی:

- ئەوە هەڵەیەك بوو کردم، بۆم بووە وانەیەك و هەتا لە ژیاندام لە یادی نەکەم. مامە گیان زۆر پەشیمانم لەو قسەیەم. وەلێ ئەوەی تۆ لەگەڵ من ئەنجامت دا، مەگەر تەنها خوا پاداشتی چاکەکەت بداتەوە. لە ناخی دڵمەوە هیواخوازم کە گەڕایتەوە کوڕەکەت لە ماڵەوە لە چاوەڕوانیتدا بێت.

ئەو هیواخواستنەی سامان لە شادبوونەوەی شوفێرەکە بە دیداری کوڕەکەی، خەم و خۆشی پێکەوە لە ناخیدا گڕیان سەند و لە سۆنگەی ئەو پەرۆشی و هاتنەدیی ئەو ئاواتەی کە چاوەڕوانیەتی بێتە دی، بڕیاری دا چاکەکەی لەگەڵ ئەو گەنجە تا کۆتایی بەردەوام بێت، وازی لێ نەهێنێت هەتا دەیگەیەنێتە ئەو ئامانجەی کە لە پێناویدا ئەو سەرکێشییەی کردووە و ئەو شوێنەی کە لێیەوە بەرەو ئاسوودەیی و ئارامی دەڕوات، جگە لەوەش هەتا بڕە پارەیەك و پارچە نانێکیشی پێ دا، بەڵکوو خوای گەورە کەسێکی بۆ تەرخان بکات و بە سەلامەتی بگاتە شوێنێکی ئارام و ئاسوودەیی. وەلێ پیاوەکە گەڕایەوە ماڵەوە، بەڵام بە دیداری کوڕەکەی شاد نەبووەوە، هەتا هەواڵێکی دڵخۆشکەریشی گوێ لێ نەبوو. ئاخر هیواخواستن شتێکە و واقیعیش شتێکی دیکە، بەڵام سامان گەیشتە ئامانجی خۆی و لای خزمەکانی لە گوندێکی خنجیلانە کە لەوانەیە ڕۆژگارێك بێت ببێتە شارۆچکەیەکی بچووك، ڕووداوێکی ناخۆش لە چاوەڕوانیدا بوو، بینی خزمەکانی ڕووی نادەنێ و هەواڵی شێتبوونەکەی گەیشتۆتە ئەمانیش، بەرلەوەی ڕوو لەمان بکات و بیر لەوە بکاتەوە، بۆیە هەر لە سەرەتاوە لە ژوورێکی تایبەتدا دایانبڕی و گۆشەگیریان کرد و نەیدەتوانی نە کەس ببینێت و نە

کەسـیش ببینێـت و کەسـیش لەگەڵیـدا بـدوێت. ئەوەش بەو بیانووەی ئەگەر خەڵکـی بە نهێنییەکەی بـزانن، ئەوا هەڵوێسـتیان بەرانبەری خەراپ و توند دەبێت. خۆ ئەگەر بیزانیبا حاڵەتەکە وایە، هەرگیز وا خۆی سووك نەدەکـرد و شـکۆمەندی خۆیشـی لەدەسـت نەدەدا. ئـاخر مـامەڵەکردنی خزمەکـانی بەو شـێوەیە، هەرگیز شـایانی کەسـایەتی ئەو نەبـوو، ئەوان بە چاوی شـێتەوە سەیریان دەکرد و بە زەحمەت لەگەڵیدا دەدوان، تا حاڵ گەیشتە ئەوەی بیریـان لەوە کـردەوە شـەوانە قـاچی بە قەرەوێـڵەکەیەوە ببەستنەوە. ئەو کاتە ئیدی سامان ئـۆقرەی بـڕا و لێیـان ڕاپەڕی و بڕیاری دا بەجێیان بهێڵێت. بەڵام دواتـر کەوتـنە پـاڕانەوە لێـی و هێوریان کردەوە کە لێیان تووڕە نەبێت. مادام هەر بڕیـاری داوە بەجێیـان بهێڵێـت بـا سـبەی بەیـانی بێـت، نەك بەم شـەوە ئەنگوستەچاوە.

ئەو شەوە ئەو خێزانە چاویان نەچووە خەو، نەبـادا بەو شـەوە بڕوات و ڕوو لە شوێنێکی نادیار بکات، کەچی ئەو بە جۆرێـك مێشکی ڕۆیبوو خەریك بوو لە داخان و لەگەڵ فرمێسـکەکانیدا بخنکێـت، لە سـبەینێی ڕۆژی دواتـر، دوای نـانی بەیـانی هێسـترێکیان بە کـرێ بـۆی گـرت، تـاکوو دوو ڕۆژە ڕێـگەی بەرزونزمـی پـێ ببڕێـت، تـا دەیگەیەنێـتە لای ئەو پیرەژنەی کە خزمایەتیان لەگەڵیدا هەبوو، پیرەژنەکە بە گەرمی پێشـوازی لـێ کـرد و بە سـۆز و خۆشەویسـتییەوە لە ئـامێزی گـرت. ئەوەی هاتەوە یاد جـوانترینی ئەو کـوڕانە بـوو کە خـۆی سەرپەرشـتیی لەدایکبوونی کردبوون، سۆز و خۆشەویسـتییەکی وای بەسـەردا بارانـد هەرگیـز پێشـتر خەونیشـی پێـوە نەبینیبـوو، ئیـدی لەوێ

ئاسوودە بوو و ئەو ژنە وەکوو کوڕی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، ئەو وەکوو ئەوانەی دیکە سەیری نەدەکرد، بەڵکوو بوونی ئەو فەرامۆشی بوو بۆی و بڕیاری دا یەکێك لە کچەکانی گوندەکەشیان بۆی بهێنێت، وێڕای ئەو دەنگۆیەی کە گوندنشینەکان باسی دەکەن و ئاماژەی پێ دەدەن. سامان بڕیاری دا ماوەیەك لە لای بمێنێتەوە و دواتر تەگبیری حاڵی خۆی بکات و بەرەو دەرەوەی وڵات بڕوات و لەوێ ژیانێکی جیاواز دەست پێ بکاتەوە.

## بەشی نۆزدەیەم

لە ڕاستیدا سامان هەستی بە کەمێك ترس کرد کاتێك لە کادانەکە ڕەحمانی بینی، چونکە وای زانی یەکێکە لە دەستەکەی نزیك مام جەمال، بەڵام ترسەکەی ڕەویەوە کاتێك زانی ڕەحمان عەرەبە، بۆیە ڕوخساری گەشایەوە و گوتی:

- کەواتە تۆ لە دەستەکەی مام کاکیلیت؟

ڕەحمان سەیری بە قسەکەی هات و پرسی:

- چۆن زانیت؟!

سامان بە بزە و خەندەیەکی زیاترەوە گوتی:

- وا پێ دەچێت زۆر ماندوو بیت و پێویستیت بە کەمێك خەو بێت.

ڕەحمان دووبارە گوتی:

- بەڵێ زۆر ماندووم، بەڵام چۆن زانیت من لە دەستەکەی مام کاکیلم؟

- چییە بۆ وا زوو لە بیرت کرد؟ لەبەر ئەوەی شیرینی هاوسەرم ئێستا پێی گوتم دەتناسێت و ئێوارانێکیان لەماڵیان نانتان خواردووە، ئەی قسەکانیم بۆت نەکردە عەرەبی، ئەی ئەمە مانای ئەوە نییە کە تۆ ماندوویت و توانای وەبیرهاتنەوەی شتەکانت نییە؟

- ڕاست دەکەیت. خەریکە بۆ تۆزە خەوێك کوێر دەبم،

ئەوەنـدەم خەو دێـت. جـگە لەوەش هەمـوو ئەوانەی لە دەسـت ستەم و زۆرداری دەسەڵاتی بەعس ڕایـانکردووە لە دەسـتەکەی مام کاکیلن. ئەی بەسەرهاتتان لەگەڵ گورگدا چییە؟

- چیرۆکەکە ئەوەیە کە شەوی ڕابردوو ڕەوە گـورگێکی برسی هێرشیان کردە سەر گوندەکە، ئەوانە بەر لە دوو کـاتژمێر هێرشیان کردە سەر ئێمەش. بەڵام لوورەلووریان بە درێژایی شەو نەبڕاوەتەوە.

سڕبوون و باوێشکدان بە خێراییەکی بێ ئەنـدازە جەسـتەی ڕەحمـانی داگـرت، تـا وای لـێ هـات بە کـزی دەنگـی سـامان ببیستێت، وەك ئـەوەی لە ئاسـۆوە دەنگـی بێـت، پاشـان سـەری قورس بوو و ملی تواناى هەڵگرتنی کەللەسـەری نەمـا و هێـدی هێدی نووشتایەوە، تاکوو چەناگەی گەیشتە سەر سینگی، هەر بە دانیشتنەوە خەو بردییەوە، وەلێ بە هەردوو دەستی تونـد ئـامێزی بە چەکەکەیدا کردبوو. زۆر بە زەحمەت سەری بەرز کردەوە و بە زۆر چاوی بۆ کرایەوە، ڕوخسارە منداڵییە هێمنەکەی سـامانی کەوتە بەر چاو، کە خەندەیەکی دڵنیایی و پـڕ لە ئاسـوودەیی و ئارامی بۆ کـرد، نەخاسـمە کاتێـك هەسـتی بە دەسـتەکانی کـرد لەسەر شانین و بۆ درێژبوونی یـارمەتیی دەدەن. ڕەحمـان گـوێی لێ بوو پێی گوت:

- پشتت بکە زۆپاکە... وای خوایە تـۆ چ تەڕبوونێـك تەڕ بوویت؟

شیرین گوتی:

- پەتوویەکی پێدادەم؟

سامان گوتی:

- وا باشتره هیچی پێدا نەدەین، بەڵکوو جلەکانی وشك دەبنەوە.

ئەوان سەرقاڵی ڕەحمان بوون، گوێیان لە دەنگی ڕێنیشاندەرەکەیان بوو بانگیان دەکات و لە دەرگاش دەدات، سامان دەرگاکەی لێ کردەوە و هێنایە ژوورەوە، پیاوەکە توێشووبەرەیەکی پڕ لە نانی تیری و جەڕەیەك ئاو و کیسەیەك ژاژیشی پێبوو. لە بن پشتوێنەکەی ناوقەدیشییەوە کیسەیەکی بچووکی دەرهێنا، مشتێك گەڵا چای و نەختێك شەکری قەندی پارچە پارچەی بچووك و کەمە شەکرێکی وردیش، هەر کە گەیشتە ژوورەوە ئەو شتانەی لە گوندەکەوە لەگەڵ خۆی هێنابوونی دایە دەستی شیرینی شۆخوشەنگەوە و دەستەکانی بەناو یەکدا دەهێنا و لە نزیك ئاگرەکەوە دانیشت و گوتی:

- ئەوە چییە خاتوون قۆری چایەکە لەسەر ئاگرەکە نابینم. دەی زووکە چایەکم بۆ لێبنێ، تا پەرداخێك بخۆمەوە و بگەڕێمەوە لای کەسوکارەکەم، چونکە زۆر پەلەمە. کارەکەی من تا ئێرە لەگەڵ ئێوە تەواو بوو. دوای ئەوەی ماوەیەك پشوو دەدەن، قەدپاڵی بەردەم دەرگاکە بگرنەبەر و بە شوێن پێی مندا وەرن کە لەسەر بەفرەکە دیارە، دەتانگەیەنێتە گوندەکە و لەوێوە گەشتەکەتان بەرەو ئێران تەواو دەکەن. چونکە خاوەنی تراکتۆرەکە سبەی دوای نیوەڕۆ دەڕوات.

پاشان ڕێنیشاندەرەکە سەرنجی ڕەحمانی دا و گوتی:

- ئەو پیاوە نووستووە کێیە؟

سامان وەڵامی دایەوە:

- دۆستێکی ناوچەکەی خۆمانە.

- لێرە چی دەکات؟!

ڕێنیشاندەرەکە وای گوت و سامانیش وەڵامی دایەوە:

- ئەوان هەمیشە لە جووڵەدان و لە شوێنێك نامێننەوە.

ڕێنیشاندەرەکە ڕەحمانی پشتگوێ خست کە لە خەوێکی قووڵدا بوو، دەستی بە زێدەڕۆیی کرد لە گێڕانەوەی ئەوەی تووشی بووە:

- ڕاستە لە هاتنم بۆ لاتان دواکەوتم. چی بکەم؟! بەدەستی خۆم نەبوو. کارێکی باشتان کرد، لێرە مانەوە لەجیاتیی ئەوەی بێن بۆ گوندەکە، بە دڵنیاییەوە ئەگەر ئێوەم لەگەڵ بووایە گورگەکان لەتوپەتیان دەکردن. تەنها بەخت دەربازی کردم، چونکە ئەو کاتەی ئێوەم بەجێ هێشت و بەرەو گوندەکە ڕۆیشتم و دوای ڕۆیشتنی نزیکەی پێنج خولەکێك، سەرنجی لای ڕاستەم دا، بینیم گورگێك خۆی بۆ مەلاس داوم، ئینجا چ گورگێك؟! هەر هێستریك بوو بۆ خۆی ئەوەندە گەورەبوو! هێستری چی؟! تۆ بڵێ فیل! بە دوو چاوی بریسکەدارەوە، نازانم چۆن لە سەرەتاوە هەستم پێی نەکردبوو، بە تایبەتیش مانگەشەوەکە ئەو ناوەی تەواو ڕووناك کردبووەوە.

خاتوونەکە لە ترسان چاوەکانی ئەبڵەق بوون، کەچی سامان پێکەنی و هەستی بە خۆشییەك کرد لە سادەیی ئەو جووتیارە و گەمژەییەکەی، بەڵکوو هەتا بەزەیی بە هاوسەرەکەیشیدا هاتەوە، چونکە ڕوخساری وەکوو ڕوخساری منداڵێکی تۆقیو گۆڕا کە گوێبیستی چیرۆکێك لە چیرۆکەکانی جنۆکە و خێوەکان دەبن، دەستی لەسەر شانەکانی دانا و پێکەوە لە نزیك زۆپاکە دانیشتن، لە پاڵیدا هەستی بە گەرمایی ئاگرەکە و چێژ و خۆشییەکی دڵنیایی کرد، ڕێنیشاندەرەکە درێژەی بە قسەکانی دا:

- نێوان من و گورگەکە تەنها چەند هەنگاوێکی کەم بوو. لە دووریی سەد هەنگاوێکیش دارگوێزە تاقانەکە هەبوو، بە ژێریدا تێدەپەڕن کاتێك دەچن بۆ گوندەکە. من تەماشام دەکرد و ئەویش تەماشای دەکرد.

سامان بە شێوازێکی شۆخی ئامێزەوە دیسان لێی پرسییەوە:

- تەماشای کێی دەکرد؟

ڕێنیشاندەرەکە وەڵام دەداتەوە و دەڵێت:

- هەڵبەتە تەماشای دارگوێزەکە.

- بۆچی؟

ڕێنیشاندەرەکە بە گومانەوە گوتی:

- لە کوێ بزانم؟! بڕۆ لێی بپرسە!

کاتێك سامان هەستی کرد ڕێنیشاندەرەکە لە پرسیارەکانی دڵتەنگ بووە، بە خەندەیەکەوە ئەمەی خستە سەر قسەکانی:

- باشە، دەی قەیناکا، ئەی دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

ڕێنیشاندەرەکە وەڵامی دایەوە:

- بەرەو دارەکە ڕام کرد، بە تایبەتی دوای ئەوەی چەند گورگێکی دیکەشم بینی لای ڕاستەوە بە ڕاکردن بەرەو لای من دەهاتن، لە بەختی خۆم گورگەکانی دیکە هەندێك لێمەوە دوور بوون، بەڵام ئەو گورگەی لە نزیکمەوە بوو کەوتە دوام، من ڕاکە و ئەویش ڕاکە، من ڕام دەکرد و ئەویش ڕای دەکرد...!

سامان بۆی تەواو کرد، نەبادا ئەو دەستەواژەیە دووبارە و سێبارە بکاتەوە:

- بەڵێ بەڵێ تۆ ڕات دەکرد و ئەویش ڕای دەکرد تا گەیشتنە دارە گەورەکە و بە بازدانێکی گەورە سەرکەوتیتە سەری.

ڕێنیشاندەرەکە بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

- چۆن زانیت؟ تۆ لێرەوە چاودێریت دەکردم؟

- نەخێر لێرەوە چاودێریم نەدەکردی. بەڵام ئەوە نییە تا ئێستا زیندوویت، بە دڵنیاییەوە سەرکەوتوویتە سەر دارەکە. ئەو گورگە فیلەتەنەی دوو هەنگاوێك لێتەوە دوور بوو، نە توانی بتگرێت و نە توانیشی سەر بکەوێتە سەر دارەکە.

- وەك ئەوەی باوەڕ بەوە ناکەی کە دەیڵێم؟!

- نا نا... چۆن شتی وا نییە، بە دڵنیاییەوە باوەڕت پێ دەکەم، بەڵام کەمێك لەسەرخۆ بۆم باس بکە.

- پێت وایە ئەوەی گوتم زێدەڕۆیی تێدایە؟

- زێدەڕۆیی نا، بەڵام شتێکی کەم لەوە.

ڕێنیشاندەرەکە جارێکی تر بێ ئەوەی گوێ بداتە توانجەکانی سامان گوتی:

- هەتا ڕۆژی دواتر لەسەر درەختەکە مامەوە. ڕەوە گورگەکە پەلاماری ڕانە بزنی گوندەکەیان دا و زیانێکی زۆریان لێ دان. هەندێکیان بۆ ژێر ئەو دارە هێنا کە من لەسەری بووم. لەوێ لەتوپەتیان کردن، دوای ئەوەی تێر بوون، وازیان لە من هێنا و ڕۆیشتن، ئەو کاتە منیش لە دارەکە دابەزیم و گەڕامەوە گوندەکە. جووتیارەکان گوتیان: بەفر و برسێتیی گورگەکانی ناچار کردبوو بێنە خوارەوە و پەلاماری گوندەکە بدەن بۆ گەڕان بە دوای خۆراکدا. جووتیارەکان لە ماڵەکانی

خۆیـان دا، خۆیـان حەشـار دابـوو و پەنـجەرەی ماڵەکانیـان بە هەمـوو شـتێك داخسـتبوو کە دەسـتیان پـێ ڕاگەیشـتبوو، پشـتی دەرگاکانیشیان بە هەموو شـتێکی گـران تونـد و قـایم کردبـوو، جەنگێکـی درنـدانەو ناهاوسـەنگ بـوو، یەکەم قوربانییەکـانیش سەگەکان بـوون، هەر هەموویـان کوشـتن، مەڕوماڵاتەکـانیش لە گەورەکانی خۆیاندا تۆقیبوون و بە هەموو لایەکدا ڕایان دەکرد و هەر کـون و پەناگەیەکیـان دەسـت کەوتبـوو خۆیانیـان تێـدا حەشار دابوو. گرفتی گەورە ئەوەبوو خەڵکی گوندەکە چەکیان نەبوو، ئەوەی هەشیان بوو تەنها تاپڕی ڕاوکـردن بـوو، ئەوانـیش بێ فیشەك، زۆر دەمێك بوو بەکاریشیان نەهێنابوو، بۆیە زۆربەیان ژەنگ لێی دابوون، بەهەرحاڵ هەر ئەوەندە خواردنەشم بۆ پەیدا کرا بۆتانی بهێنم، زۆریش پێویسـتە بگەڕێـمەوە مـاڵەوە، چـونکە هەواڵی ڕۆژی حەشر لەناو گوندەکاندا بڵاو بووەتەوە، گوایە بەم زووانە ڕۆژی کۆتایی دەست پێ دەکات. مـن هەر ئێسـتا دەبـێ بگەڕێمەوە بۆ گوندەکەم.

سـامان پرسـیاری لـێ کـرد و دوودڵـیش بە ڕوخسـارییەوە دیار بوو:

- چی ڕوو دەدات؟! ئایا هەردوولایان سـوپاکەیان بـۆ ئەم ناوچەیە کۆ کردۆتەوە؟

- نەخێر ئەوە نییە... جەنگـی نێـوان ئەو دوو وڵاتە لە بیـر بکە، ئەوە بەرانبەر ئەو شتەی بەسەرمان دێت هەر هیچ نییە.

- سەیرە! ئەی دەبێ چی هەبێت لە جەنگیش خەراپتر؟!

- ڕۆژی حەشر بەڕێوەیە، خەڵکی لە نزیـك ئەو گونـدەی دراوسێمان مردوویـان بینیـوە لە گۆڕەکانیـانەوە دەرچـوون، ئەوە ڕۆژی قیامەتە. لێرە گورگ هێرش دەکاتە سەر گوند و لەوێـش

مردووەکان زیندوو دەبنەوە تاکوو بیانخۆن. ئەڵلاهو ئەکبەر... خوایە لە گوناهی خۆم و کەسوکارەکەشم خۆش بە.

بە لای خەڵکی گوندەکانەوە خۆش بوو، ئەگەر هەموویشیان نەبێت، خەڵکی شۆك بکەن بە کارێك کە ئەوانیش بەشدارییان لە بەدەستهێنانیدا نەبووبێت، واتە تەنها ئەو هەواڵە دەگوازنەوە کە لە یەکێکەوە گوێبیستی بوون، کەچی دەبینی لە ساتەوەختێکی نامۆدا بەوپەڕی توانایانەوە هەست بە بایەخی ئەو شتە دەکەن بە مەبەستی سەرقاڵکردنی خەڵکی بۆ زانینی شتێك، یان گواستنەوەی هەواڵێك. بۆیە ئەو جۆرە کەسە لە باسەکە دەردەچن و زێدەڕۆیی لە خستنەڕووی ئاخاوتنەکانیشیان دەکەن، بە تایبەتییش هەر کاتێك سەرسامی و شۆکبوون لە ڕوخساری گوێگرانیاندا ببینرێت. کەچی سامانی هاوڕێمان ئەو چێژ و خۆشییەی لە ڕێنیشاندەرەکە سەندەوە کە دەیویست لە ڕێگەی باسکردن و گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە هەڵبەستراوە پێی دڵخۆش بێت، چونکە کاتێك بینی ڕوخساری سامان نەگۆڕا و تووشی شۆك نەبوو، یان زۆری بۆ شل نەکرد، بەڵکوو پێکەنینێکی پچڕپچڕی بۆ کرد و ڕێنیشاندەرەکەش لە ئەنجامی کاریگەریی ئەوەدا دەیەوێ بڕوات بێ ئەوەی زیاتر چاوەڕێ بکات و پەرداخێکی دیکەی چایەش بخواتەوە، کە شیرین لەسەر پشکۆو ڕەژووەکە ئامادەی کردبوو.

سامان گوتی:

- ئێستا مەڕۆ، ئەی چی لە گورگەکان دەکەیت؟! بە تایبەتی گورگە فیلەتەنەکە؟!

- دەزانم تۆ باوەڕت نەکردووە، تۆ خەڵکی شاریت و لە گوندی ناو چیاوچۆڵە دابڕاو و دوورەدەستەکان نەژیاویت... تۆ

ئەگەر لێرە بژیایتایە شتی سەیروسەمەرەت دەبینی.

سامان بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

- بۆ پێت وایە خەڵکی شارەکان جیاوازن؟ لەوێش مەرگەسات و شتی سەیرترمان بینیوە، شارەکانیش لە گوندە دوورەدەست و دابڕاوەکان جیاوازتر نین، جگە لە تەلار و خانووەکانیان نەبێت، کەچی عەقڵ و هۆشی خەڵکەکە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ عەقڵ و هۆشی خەڵکی ئێرە نییە، بەڵام چاوەڕێ بکە چایەکەمان لەگەڵ بخۆرەوە.

جووتیارە ڕێنیشاندەرەکە هیچ شتێك لە قسەکانی تێنەگەیشت، بەڵام هەستی بە جۆرە وەڕسبوون و بێزاری و جۆرە سووکایەتییەك کرد، بۆیە وای پێ باشتر بوو بڕوات و گوتی:

- وا پێ دەچێ چایەکەتان کاتێکی زۆرم بە فیڕۆ بدات، دەبێ ئێستا بڕۆم بۆ ئەوەی بۆ ئێوارە بگەمەوە گوندەکەم.

سامان دیسان گوتییەوە:

- ئەی دەربارەی گورگەکان چی؟! دەترسم شتێکت لێ بکەن.

ڕێنیشاندەرەکە بە بڕوابەخۆبوونەوە گوتی:

- گورگەکان تێر بوون، ئەگەر لە ڕێگە بشمبینن مەترسیان نییە.

سامان لەگەڵ خۆیدا کەوتە منگەمنگ و بە حەسرەتەوە گوتی: "تۆ لەمەیان ڕاستت کرد. گورگەکان بەبێ هۆ کەس ناخۆن، تاوانیشیان نییە کە بەو جۆرە خولقاون جگە لە گۆشت هیچی تر ناخۆن". ئینجا گوتی:

- کاکە چاوەڕێکە، ئەی لەو مردووانە ناترسیت کە لە گۆڕەکانیانەوە دەرچوونەتە دەرەوە؟

- بەڵێ دەترسم، بەڵام خێزانەکەم لەوێیە دەبێ دەربازی بکەم، خوا فریادڕەسە.

- بەڵام تۆ ئەم هەواڵانە لە کوێ دێنیت؟

کاتێك ئەم دەستەواژەیەی دوایی گوت، ڕێنیشاندەرەکە ماوەیەك ڕۆیشتبوو و کەمێك دوور کەوتبووەوە. ئیدی سامان کەوتە ناو گێژاوی سەرسامی و بیرکردنەوە لەوەی چۆن هەواڵەکان لە نێوان گوندەکاندا بەم خێراییە دەگوازرێنەوە و دەمادەم دەکەن، ئاخر خۆ هیچ ئامرازێکی پەیوەندیکردن و گواستنەوە لە نێوانیاندا نییە، هەندێکیش هەر بۆ شۆخی دەڵێن هەواڵەکان بەرلەوەی ڕوو بدەن لە نێوان گوندەکاندا دەگوازرێنەوە.

شیرین بە جلوبەرگە ڕەنگاوڕەنگ و پڕ نەخش و نیگارەکانییەوە ماوەیەکی کەم بوو لە بەردەم زۆپاکە بە بێدەنگی دانیشتبوو، کاتێك دانیشتنەکەی درێژەی کێشا، سامانیش شانیدا بە شانییەوە و بە قەد یەکەوە دانیشتن و چپاندییە گوێچکەیەوە:

- بۆچی ئەم بێدەنگییە؟ بیر لە چی دەکەیتەوە؟

شیرین بە دەنگێکی نزمەوە گوتی:

- من دەترسێم.

- مەترسێ. هەمووی یەك دوو ڕۆژێکی ترە و لە سنوور ئاودیو دەبین بەرەو ئێران. ئەبوجگارەش نامانگاتێ، تەنانەت نازانێت ئێمە لە کوێین و بۆ کوێش دەچین؟!

- من لە ئەبوجگارە ناترسێم.

- کەواتە لە کێ؟ گورگەکان، هەر ترسی ناوێ، ئەوان لە کوێوە هاتن، گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان.

شیرین لەو کاتەی تفی قووت دەدا گوتی:

- لەو مردووانە دەترسم کە لە گۆڕەکانیانەوە دەرچوونەتە دەرەوە.

سامان دەستی بە قاقای پێکەنینێکی پچڕپچڕ کرد، هەندێك لەو ترس و دڵەڕاوکێیەی ناخی شیرینی ڕەواندەوە.

- ئەوە چییە دەڵێی باوەڕت بە قسەکانی ئەو گەمژەیە کرد؟ ئەوە یەکەم درۆزنە. هاوشێوەی هەندێك لە گوندنشینەکانی تر زێدەڕۆیی لە هەموو شتێکدا دەکات. دەزانی ژیان لەم گوندە دابڕاو و دوورەدەستانە لای خەڵکی خەیاڵی فراوانی ئەوتۆیان خولقاندووە باشترین نووسەر پێویستی پێیانە و ناتوانێ بیانگاتێ. وەلێ خەیاڵێکی هەڕەمەکیانە، نازانم چۆن بۆتی باس بکەم، ئەوەی سەیر و جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە هەموو ئەوانەی لە گوندەکان گوێیان لەو خەیاڵپڵاوییانە دەبێت کە بۆیان دەگێڕدرێتەوە و سووریش دەزانن درۆیە و ڕاست نییە، کەچی وێڕای ئەوەش هەر باوەڕی پێ دەکەن و بە هەندێك ترشوخوێ پێوەکردنەوە دەماودەم بڵاوی دەکەنەوە و لایان دەبێتە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر، خۆ لەوانەیە بۆ ورووژاندنیش بێت، چونکە لەم گۆشەگیری و دابڕان و دوورەدەستییەدا ورووژاندن بۆ جووڵاندن و شڵەقاندنی گۆماوە گەنیوەکەی دەروونی خەڵکی پێویستە، بگرە هەر زۆریش پێویستە.

شیرین زۆر لە قسەکانی تێنەگەیشت، بەڵام ئەوەندەی گوت کە لەگەڵ پەیبردنی بە وشەو دەستەواژەکان وێك دێنەوە، بۆیە گوتی:

- ئێمە ئاوی ڕاوەستاومان نییە، کانیاوەکانمان شەو و ڕۆژ ئاویان لەبەر دەڕوات و ڕاناوەستێت.

سامان زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و دەستی کردە ناو دەستی و بۆ دڵنیاکردنەوەی گوتی:

- خەمی هیچت نەبێت، لە تێکڕای ئەو شتانەت دەپارێزم کە لێیان دەترسیت و بیریان لێ دەکەیتەوە.

ئەویش پێی گوت:

- گومانم لەوەدا نییە، تۆ سەرچاوەی دڵنیایی و ئارامیمی، نەخاسمە دوای ئەوەی لەگەڵ گورگەکان جەنگایت و پاراستمت، ئەمە دووەمین جارە لە دەست ستەمی ڕۆژگار دەمپارێزیت.

ئەو قسەیەی شیرین لە ناخی ساماندا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو، هەستی بە شکۆمەندی کرد.

بۆیە نەیتوانی خۆشییەکەی ناخی بشارێتەوە و گوتی:

- من بە مەرگ و لەناوچوونی خۆم ئامادەم بۆ پاراستنت، گیانم دەکەمە قوربانی تۆ، بەڵکوو من سوپاسگوزاری تۆم، ئەگەر تۆ نەبوویتایە توانای سەرکەوتنم بەسەر گورگەکاندا نەدەبوو.

شیرین بە ناسکی و جۆرە نازێکەوە گوتی:

- نامەوێ لە پێناوی مندا سەرکێشی بە ژیانی خۆتەوە بکەیت. ئاخر من بەبێ تۆ هیچ شتێك نیم.

شیرین دوای ئەوەی لە نزیکەوە زیاتر سامانی ناسی و لە ڕەوشت و ئاکار و کەسایەتییەکەی دڵنیابوو، خۆشەویستییەکی

ڕاستگۆیانە خۆشی دەویست. ئاخر ئەو پیاوەی بە لای جووتیارە نەزانەکانەوە مایەی گاڵتەجاڕی و بە سەرشێت و ڕەفتاری سەیر ناویان دەبرد، کەسێکی زۆر وریا و ژیر بوو، بەڵام جووتیاران تا کۆتایی بە کەسێکی خەراپیان دادەنا، تا ئەو ئاستەی گاڵتەیان بە قسەکانی دەهات، چونکە نەیاندەزانی چی دەڵێت و لێی تێنەدەگەیشتن و لەو جلوبەرگەیشی کە ئەوان پێی ڕانەهاتبوون بیپۆشن سەیریان دەهات، هەتا شەرم و شکۆکەشیان بە نائومێدی و باشییەکەیشیان بە لاوازی و بێدەسەڵاتی و هیوا و تێڕامانەکانیشیان بە سەرشێتی و لێبووردەییەکەیشیان بە ترسنۆکی دەدایە قەڵەم، بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە ئەو پیاوە، مرۆڤێکی هەست ناسکە و کەسایەتیی خۆی خۆش دەوێت و زۆر ئازا و بوێرە و تێکۆشەرێکیشە لە جۆرێکی تایبەت، ڕۆشنبیرێکە هەرگیز بە ڕۆشنبیرییەکەی خۆیەوە نانازێت. سامان لە ژیانیدا تووشی گرفتی زۆر بووبوو و بۆ هەر گرفتێکیشی ڕێگەچارەیەکی گونجاوی دەدۆزییەوە، ئەو کاتەی هاوسەرگیریی لەگەڵ شیرینیش کرد، گەورەترین کێشەی ئەوەبوو چۆن باوەڕ بە شیرین بهێنێت کە شێت نییە؟! تەنها دوای چەند کاتژمێرێکی کەم بە هەڵسوکەوتی باش و ژیری و مرۆڤدۆستانە و ڕەوشتبەرزانەی خۆی توانی ئەو ترس و دڵەڕاوکێیە لە دەروونیدا بە یەکجاری بڕەوێنێتەوە و دواتریش نەیهێڵێت، بەڵکوو وای لێ کردبوو جگە لە دەنگی ئەو بە دەنگی کەس ئۆقرە نەگرێت و ئارام و ئاسوودە نەبێت. هەتا لە یەکەم شەوی بووك و زاوایەتییان کە هێشتا دەهۆڵ و زوڕناکە لە دەرەوەی ماڵەکەیان گرمەی دەهات، دوای ئەوەی پەڕۆی بووکێنی بە دەستەوە بوو و نیشانەی پاکیزەیی کچەکەی پیشان دەدا، دوور لە هاوسەرەکەی دانیشت و سەری سووڕمابوو چۆن گومانی ناخی هاوسەرەکەی بە سۆز و خۆشەویستی بگۆڕێت،

کچەکە لەسەر پێخەفەکەی بە خەم و ناسۆرەوە دانیشتبوو. لەگەڵ خۆی لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدا بوو: "ئاخ ئەگەر وازیان لەو دەهۆڵ و زورنایە دەهێنا و لێ دەگەڕان بە حاڵی خۆمانەوە دانیشین، هیچم نەدەویست". بەڵام هەیهات! ئەوانە چۆن واز لەو بەزم و ڕەزمەی خۆیان دەهێنن؟! بەرلەوەی زاوا بێتە دەرەوە و مووژدەی بەزاوابوونی خۆی بە هەمووان ڕابگەیەنێت و پێشوازی لە پیرۆزبایی و توانجە بێماناکانیشان بکات، کە ئەمەیان نەریتێکە و دەربازبوون لێی کارێکی ئەستەمە و بگرە جۆرێکیشە لە مەحاڵ، ئەو لە هاوسەرەکەی نزیك کەوتەوە، وا خۆی نیشان دا کە ئاگای لە هیچ نییە، بە گوێچکەیدا چرپاند:

- تا ئێستاش دەترسێیت و و شڵەژاویت؟! چییە دەڵێی تا هەنووکەش لە من دڵنیا نیت؟ پێم گوتی لێم مەترسێ من کەسێکی بێوەیم وەکوو چۆلەکە و باڵندەکان، خۆ ئەگەر مەرگی من ئاسوودەیی و ئارامی بۆ دەروونت دێنێت، بەڵێن بێ ئامادەم هەر ئێستا خۆم بکەمە قوربانت و خۆم بکوژم. دەزانم ئەوەی بیری لێ دەکەیتەوە شتێکە و ڕاستییش شتێکی تر. بەڵام دڵنیابە کێشەکە تەنها حاڵینەبوونە و هیچی تر. ئەوەی هەیە ئەوەیە خەڵکی لە من تێناگەن، ئەوان ناتوانن وەکوو من بن و منیش ناتوانم وەکوو ئەوان بم، هیوادارم متمانەم پێ بکەیت، بە مێردی خۆتم دامەنێ، بەڵکوو بە خزمەتکارێکی خۆتم دابنێ، ڕازیم و فەرمانەکانت جێبەجێ دەکەم. تکات لێ دەکەم ڕێگەم بدە تەنها جارێك وا هەست بکەم کە لێم ناترسیت... تکایە!

شیرین کەمێك چاوە شڵەژاوەکانی بەرز کردەوە و هەر بە سەرلەقاندنەوە ئاماژەیەکی ئەرێنی بۆ کرد.

سامان پێی گوت:

- ئێستا ناچارم دەربچمە دەرەوە بۆ لای ئەوانەی ئاهەنگ دەگێڕن، هەندێك پتوپیرەژن دێنە لات، بایەخیان پێ مەدە و هیچ قسەیەکیان لەگەڵ مەکە، بە تایبەتییش پرسی پەڕۆ و خوێتەکە. هەر کە ئەوان هاتنە دەرەوە، یەکسەر دێمەوە لات و خواردنیشت بۆ دەهێنم. دەزانم ئێستا زۆرت برسییە، دەزانم ماوەی چەندین کاتژمێرە بە لای نانخواردندا نەچوویت، قەیناکا، بایەخ بە هیچ مەدە، تەنها کەمێك بەرگە بگرە و هیچی تر.

جارێکی دیکە شیرین بە وریاییەوە سەرنجی دایە و بە سەریشی ئاماژەیەکی ئەرێنی دیکەی بۆ کردەوە. هەر کە سامان دەرچووە دەرەوەی ماڵەکە، هەرچی کوڕوکاڵی ئەوێ بوو لێی کۆبوونەوە و دەستیان بە پیرۆزبایی و توانجدان و قسەی حەلەقومەلەق کرد، ئەویش بە دەمیانەوە بزەی دەکرد و هیچ وەڵامی نەدەدانەوە، هەتا یەکێك لە گەنجەکان سنووری خۆی بەزاند و قسەیەکی کرد لە ناخەوە ئازاری دا، دوای ئەوەی پیرۆزبایی لێ کرد، بە بەرچاوی هەمووانەوە گوتی:

- ئەگەر پێویستیت بە یارمەتی هەبوو، بانگم بکە من لەجیاتیی تۆ کارەکە ئەنجام دەدەم.

سامان بە جۆرێك لەو قسەیە تووڕە و نیگەران بوو، سوورهەڵگەڕا و وەڵامی دایەوە:

- جا تۆ ئەو پیاوەی کاری وا ئەنجام بدەیت؟

ئەوەی تر لە جۆری دەنگی سامان جۆرە بەڵێنێکی شەڕخوازانەی بە دی کرد، لەگەڵ ئەوەشدا گوێی نەدایە و دیسانەوە گوتی:

- تاقیم بکەرەوە، ئەوجا بە چاوی خۆت دەبینی.

سامان شەڕ لە چاوەکانی دەباری و گوتی:

- لە پێش هەمووان پێت دەڵێمەوە، ئەگەر پیاوی وەرە و پیاوەتی خۆت بسەلمێنە، ئەگەر نەیەیت هەرگیز پیاو نیت.

ئەم قسەیە لە بەرانبەر هەمووان گەنجەکەی خستە دۆخێکی دژوارەوە و وای لێ کرد، نەتوانێت وا بە ئاسانی لێی دەرباز بێت، چونکە چاك دەیزانی مەحاڵە بچێتە ژوورەوە، نەك لەبەر ئەوەی دابونەریت ڕێگەی ئەو کارە قێزەونە نادەن، بەڵکوو ئەو باش دەیزانی بەو کارەی پاساوێکی تەواو دەداتە دەستی سامان بۆ ئەوەی بیکوژێت و کەسیش بەرپەرچی نەداتەوە و هەتا گلەییشی لێ نەکەن. خۆ ئەگەر نەشچێت، ئەوا لە بەرچاوی هەمووان پیاوەتی خۆی لە دەست دەدات کە بە لای جووتیارانەوە بەردی بناغەی شکۆمەندی و سەربەرزییە. سامان بەم هەڵوێستەی شکۆی ئەو کوڕە جووتیارەی کردە پەڕۆی بێنوێژ و چیتر ئەو کوڕە لەناو خەڵکی و هاوڕێکانیدا توانای سەربەرزکردنەوەی نەما.

کاتێکی زۆری نەخایاند ئاهەنگگێڕەکان پەرتەیان لێ کرد و هەر یەکە و بۆماڵی خۆیان گەڕانەوە، ژنەکانیش لای بووکەخان هاتنە دەرەوە، سامانیش گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی و سینییەکی پڕ لە خواردنی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، کاتێك چووە ژوورەوە سینییەکەی لەسەر زەوییەکە دانا و لەسەر زۆپاکە دەستی بە گەرمکردنەوەی یەك بە یەکی ئەو قاپانە کرد کە خواردنەکانیان تێدا بوو، بووکەخانیش کە لە برسان دەتلایەوە و بە بێدەنگی سەیری دەکرد و ترس و دڵەڕاوکێکەی ڕەویبووەوە و ڕوخساری گەشتر بووبوو. پاشان داوای لێ کرد بێت و لە نزیکییەوە دابنیشێت، بە کەمێك شەرمەوە داواکەی جێبەجێ کرد، هەر کە دانیشتە سەر ڕایەخەکە، ئەو پارچە گۆشتێکی

هەڵگرت و ویستی بیداتە هاوسەرەکەی، کاتێك ویستی گۆشتەکەی لەدەست وەربگرێت، بە خۆشەویستییەوە پێی گوت:

- نەخێر، دەبێ بە دەستی من بیخۆیت. من لە ئێستاوە لە خزمەتتدام، لەم دونیایە هیچ شتێك بە لای منەوە گرنگ نییە، تەنها شەونخوونی بۆ ئاسوودەیی تۆ نەبێت.

ئافرەتە گوندنشینەکان فێری ئەوە نەبوون پیاوەکانیان خزمەتیان بکەن، ئەمەش تووشی حەپەسانی کرد، ئاخر پیاو دەبێ پیاو بێت و خۆی بۆ هیچ کەسێك دانەنەوێنێتەوە، بە تایبەتی بۆ هاوسەرەکەی، لەبەر ئەوەی دەبێ ژن خزمەتی پیاو بکات و شەونخوونی بۆ ئارامی و ئاسوودەیی بکێشێت، نەك بە پێچەوانەوە، چونکە ئەو سەرچاوەی ئارامی و ئاسوودەییەتی لەناو خەڵکیدا، ئیدی ئەمە یاسا و کولتووری باوکسالارییە و هەر دەبێ وا بێت، کەچی ئەم پیاوە پێچەوانەی هەموو پیاوانی دیکەیە و ئامادەیە خزمەتی بکات، ئەوە دەبێ چ پیاوەتییەك بێت، کاتێك پیاو لەماڵەوە ڕۆڵی ژن بگێڕێت و خزمەتی بکات و بۆ ئاسوودەیی شەونخوونی بچێژێت؟ ئەی کەواتە ئەو چی بۆ دەمێنێتەوە؟ خۆزگە ئێستا لەجیاتیی ئەو سۆز و خۆشەویستییەی لێی دەدا و بەسەریدا هاواری دەکرد، تاکوو هەست بە ئازایەتی و پیاوەتی بکات.

ئاخر ژنە جووتیارەکان حەز لە پیاوی دڵڕەق و سەرسەخت دەکەن، توندوتیژی و سەرسەختی کۆڵەگەکانی ماڵ دادەمەزرێنن و تۆکمە و پتەوی دەکەن: "ئایا دەبێ خەڵکی شار هەموویان هاوشێوەی ئەم، ئاوا موونەرم بن، یان ئەو هەر بە ڕاستی شێتۆکە و کاڵفامە؟". شیرین بەو جۆرە بیری دەکردەوە و هەر بە نهێنی ئەمەیشی بۆ زیاد دەکرد: "بەهەرحاڵ، ئەوەی گرنگە، ئیدی ئەو جێگەی ترس نییە".

پەیوەنـدیی لەگەڵ شـیرین بە نەرمونیـانی و پـڕ لە سـۆز و خۆشەویستییەوە درێژەی کێشا بێ ئەوەی بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ دەستیشی لێ بدات، شیرینیش وێڕای ئەوەی لە ناخەوە پەرۆشـی ئەوە بوو پیاوەکەی توندوتیژ و ئازا بێت، تاکوو لەگەڵیدا هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی بکات، وەلێ سامان ناچاری کرد، سۆزە بێئەندازەکەی خۆش بوێت و هەر بە ڕاستی سەرنجی ڕابکێشێت، هەستیش بە بوون و بەهاکەیشی بکـات، بەڵام خـۆزگەی ئەوەی دەخواســت کە لە بەرچــاوی خەڵکــی وا نەکــات، نەبــادا لە بەرچاویان بکەوێت و وای دابنێن کە ماڵەکەی پیاوێکی تێدا نییە پشتی پێ ببەسترێت، بەمەش هەر کەسێك بێت و بـڕوات خـۆی بـۆ مەلاس بـدات و بەبـێ شــەرمانە و کەســێکیش نەبێــت بیـانگێڕێتەوە، لەبەر ئەوەی کـچەکە لە هەنگـوین شـیرینتر و لە جوانیش جوانتر بوو، بەتام و سازگارییەکەیشی عەقڵ لە مێشکی پیــاودا ناهێڵێــت، ئەمەش وای کــرد مێشــومەگەز لە دەوری مــاڵەکەی کـۆ بکـاتەوە. ئەوەتـانێ ئەبوجگـارە لەگەڵ دووان لە پاسەوانەکانی لە دەرگای ماڵەکەیان دەدەن، تاکوو ببـنە مێـوانی، سامان بە گەرمییەوە پێشوازی لێ کردن و ڕێزێکی زۆری لێنان، بەڵام بە درێژایی کات وا هەستی دەکـرد کە ئەبوجگـارە ئەوی پشــتگوێ خســتووە و بە تــیلەی چــاوە چڵێســەکانی ڕاوی شـۆخەکەی دەکـات، وەلـێ ئەو تەنـانەت ڕوویشـی بـۆ بەرز نەدەکردەوە و سامانیش لە خزمەتکردنیـان بەردەوام بـوو. ترسـی گەورەی شــیرین ئەوەبــوو باشــیی هاوســەرەکەی بقــۆزنەوە و مێوانەکـان بە کەسـێکی شـلوخاو و گێلـۆکەی دابنـێن، بەوەی لەگەڵ پیاوەتیـدا ناگونجێـت، بەمەش بـیکەنە خـۆراکی خۆیـان، کـاتێکیش ئەبوجگـارە بە بیـانووی بەسـەرکردنەوەی ئەنـدامانی دیکەی دەستەکەی کە بەناو گوندەکەدا دابەش بووبوون، داوای لە پاسەوانەکانی کرد بچنە دەرەوە، شیرین لە نـاخەوە ڕاچڵەکـی

و ترسەکەی زیاتر بوو و دەستی لەسەر دڵی خۆی دانابوو، هەر کە پاسەوانەکانی چەکەکانیان هەڵگرت و لە ماڵەکە چوونە دەرەوە، ئەبوجگارە یەکسەر داوای لە سامان کرد بچێت لە دوکانی گوندەکەیان پاکەتێك جگەرەی بۆ بکڕێت، بەم داوایە سامان وەك ئەوەی هەورەتریشقە لێیدابێت ڕاچڵەکی و بیری لەوە کردەوە کە پێشوازییەکەی و خزمەتکردنیان وەکوو مێوان، ئەمەیان شتێکە و لە شکۆی مرۆڤ کەم ناکەنەوە و ئەوە مێواندۆستی و بەخشندەییە، وەلێ کاتێك وەکوو منداڵێکی خزمەتکار مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، ئەمەیان هەرگیز مایەی قەبووڵ کردن نییە. بە تایبەتییش کاتێك هەستی بەوە کرد چی لە مێشکی ئەبوجگارەدا دەخولێتەوە و نیازی پاك نییە و چاوی بڕیوەتە هاوسەرەکەی، ئەوەی زیاتر لەوە دڵنیای کردەوە ئەو هەموو دەنگۆ و چیرۆکانە بوو کە هەموو کەس دەربارەی ئەم پیاوە دەیانزانی و دەماودەم بۆ یەکترییان دەگێڕایەوە کە چ شەرواڵپیسێکە، خۆ لەوانەیە ئێستا لاوانی گوند لە بەردەم ماڵی سامان خۆیان مەڵاس دابێت و دڵنیابن لەوەی پاش کەمێکی تر سامان لە ماڵەکەی خۆی دێتە دەرەوەو ژنەکەی بەرەو چارەنووسێکی نادیار لەگەڵ ئەبوجگارەدا بەجێ دەهێڵێت، لەو کاتەدا ئەبوجگارە دەستی بۆ سامان درێژ کرد، تاکوو نرخی پاکەتە جگەرەکەی بداتێ، وای لەو کاتەدا شیرین تووشی چ دڵەکوتەیەك بوو کاتێك بینی سامان زەردەخەنەیەکی زۆری بۆ کرد و هەستایە سەر پێ و پێڵاوەکانیشی کردە پێ، خەریك بوو بتۆقێت، ئەوەی شیرین لێی دەترسا، لەوانەیە پاش کەمێکی دیکە ڕوو بدات، ئەو کاتە زانی هاوسەرە باش و نەرمونیانەکەی کە ئەو هەموو سۆز و خۆشەویستییەی پێشکەش کردووە، شتێك نییە جگە لە شێت و گەمژەیەك. ئاخر چ پیاوێکی عاقڵ ئامادەیە بەو ئاسانییە هاوسەرەکەی بۆ کەسێکی بەدڕەوشت و دزێوی وا

بدۆڕێنێت، تەنها مەگەر هەر بە ڕاستی شێت بێ، ئا ئەوەتا سامان بە کردەیی شێتییەکەی خۆی دووپات دەکاتەوە، بەڵام نەك وەك ئەوەی هاوسەرەکەی بیری لێ کردبووەوە، چونکە سامان لە چرکەساتێکدا پەلاماری ئەبوجگارەی دا و دەمانچەکەی لە قەد قایشەکەی ناوقەدی دەرهێنا و زۆر بە خێرایی میلی دەمانچەکەی ڕاکێشا و نایە ژێر چەناگەی ئەبوجگارە، کە لە شوێنی خۆی ڕاچڵەکی و چاوەڕوانی ئەو ڕووداوە لە ناکاوەی نەدەکرد، سامان بە دانەجیڕە و بە هەڕەشەیەکی ترسناکەوە گوتی:

- ئەی تۆ گوێت لە شێتیی من نەبووە؟ ئێستا وەها ڕیسوات دەکەم هەرچی سام و شکۆت هەیە لەم ناوچەیەدا نەمێنێت! ئێستا دەردەکەوێت کێ بەدڕەوشت و گەمژەیە و کێش پیاوە؟!

ئەوەتانێ شیرین بەو هەڵوێستە لە ناکاوەی پیاوەکەی بە حەپەساوییەوە ڕەق ڕاوەستاوە و باوەڕ بەوە ناکات کە دەیبینێت. پاشان ڕاستەوخۆ لە بۆچوونەکانی پەشیمان بووەوە و چۆکی دادا و سەرنجی لەو پیاوە نەرمونیان و پڕ بەزەییەی خۆی گرت کە دەریایەك بوو لە سۆز و خۆشەویستی، ئەدی چۆن وا لە ناکاو بووە ئەو دڕندە بە هەڵمەتە و وای لەو دوژمنە ناحەزەی کرد بەو هەموو پلەوپایە و دەسەلاتەی کە بەدەستی هێنابوو بە هۆی نزیکیی لە مام جەماڵەوە؟! لە پڕێکا بیکاتە جرجێکی تۆقیو، ئەو دەیزانی بۆچی هاوسەرەکەی بۆ وا هەڵچوو و بۆچی ئەو کارەی کرد، لەو چرکەساتەوە خۆشی ویست و پیاوەتی و ئاسوودەیی تێیدا بە دی کرد. سامان یەخەی ئەبوجگارەی گرت و بە پێخواسی لە ماڵەکەی بردییە دەرەوە و لە گۆڕەپانی گوندەکە ڕایگرت، تێکڕای خەڵکی گوند بەو دیمەنە شۆك بووبوون، نەیاندەزانی بەرانبەر ئەو هەڵوێستە چی بکەن! چەکدارەکانیشی

نەیانـدەزانی چـۆن بەرپرسـەکەیان ڕزگـار بـکەن، سـامان بە دەنگێکی بڵند و پڕ لە نەعرەتەوە بە سەر ئەبوجگارەدا نەڕاندی:

- بەو سەگە گەڕوگـولانەت بڵێ هەر ئێستا لە گونـدەکە بچنە دەرەوە و ملی خۆیان بشکێنن، ئەگەرنا مێشـکت بە گـوللە دەپـژێنم، بەڵام تـۆ ئەمـڕۆ بە میوانـداری لای مـن دەمێنیـتەوە. گوێبگرن، هەتا پێنج دەژمێرم، بەڵێن بێ ئەگەر یەك کەسیشـیان لەم نـاوە ببیـنم، مێشـکی بۆگەنـت لەسـەر زەوی پەرشـوبڵاو دەکەمەوە.

دەستی بە ژماردن کرد. خەڵکی گوندەکەش بە ژن و پیاو و گەورە و بچووکەوە لە دەوریـان کـۆ بووبـوونەوە، بە وریـایی و دڵسـوتانەوە سـەیری ئەبوجگارەیـان دەکـرد، ئەوەش لە ترسـی ئەوەی نەبادا دواتر تۆڵەیان لێ بکاتەوە. بەڵکوو هەتا هەنـدێکیان -بگرە زۆربەیان- خۆزگەی ئەوەیان دەخواست کۆتـاییەکەی بە دەست ئەو شێتە بێت، کە لەوپەڕی تووڕەییدا بوو و دەمودەست کۆتایی پێ بهێنێت. ژنەکەیشی بە سەرێکی بڵند و شکۆمەندی و دڵێکـــی پـــڕ لە خۆشـــی و خەمەوە ســـەیری پیـــاوەکەی و خەڵکەکەیشی دەکرد، خۆشـی و شـکۆمەندی لەوەی پیـاوەکەی ئەنجامی داوە و خەمـیش بـۆ ئەوەی لە ڕۆژانـی دواتـر دەبێ چ بەڵا و نەهامەتییەك چاوەڕوانیان بکات. بەڵام هەر خەراپییەك ڕوو بدات لە بەرانبەر ئەوەی پیاوەکەی بەدەستی هێناوە، هیچ نییە، لە کۆتاییدا هاوسەرێکی بەدەست هێناوە و کارێکی کردووە هەموو پیاوانی گوندەکە دەسـەڵاتی ئەوەیـان نیـیە بـیکەن، کەواتە چـی دەبێ با ببێ. ئەو لە ماڵەوە کەسێکی بەسۆز و دڵنەرم و بەخشندە و لە دەرەوەشـدا دڕنـدەیەکی چڕنـووك بە خـوێن، ئەو خەونـی بەوەوە دەبینـی کاتێـك بە سـۆز و خۆشەویسـتییەوە تەماشـای دەکـرد. یەکێـك لە چەکـدارانی ئەبـو جـگەرە لەگەڵ خۆیـدا

دەیگوت: "دڵنیابووم ڕۆژێك كەسێكی بە غیرەتت لێ قیت دەبێتەوە و ئابڕووت دەبات، دە بیخۆ دەی، ئاخر ئابڕووی خەڵكی بەلاشەیە، تۆ وا سووكایەتی پێ بكەیت؟"، "ئاخر بە دەگمەن نەبێ كوا شتی وا لای كەسانی شۆڕشگێڕ هەیە؟!". یەكێكی دیكەشیان لە ناخەوە ڕووداوەكەی پێ خۆش بوو، بەڵام لە ترسی بەرپرسەكەی و چەكدارانی دیكە نەیدەوێرا ئەو خۆشییەی دەرببڕێت، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ئۆخەی خۆ ئیدی دەستەكەمان لەو پیسییە پاك دەبێتەوە".

ئەبوجگارە ناچار بوو ئەو سووكایەتییە قەبووڵ بكات، بۆیە هاواری كرد و بە ئەندامانی دەستەكەی گوت گوندەكە چۆڵ بكەن و بگەڕێنەوە بارەگاكەی خۆیان، دیارە لە سۆنگەی ئەوەی ماوەیەك بوو ناوبانگی ئەبوجگارە لە گوندەكان زڕابوو و هەندێك لە چەكدارەكانیشی لە نێوان خۆیاندا ئەو سووكایەتیكردنەی بەرپرسەكەیان بە ئابڕووی خەڵكی ڕەت دەكردەوە و لە ناخیشەوە پێیان ناخۆش بوو، بەڵام هیچیان پێ نەدەكرا بیكەن، بۆیە بە خێرایی و بێ ئەوەی لەگەڵ سامان بكەونە مرخێش و پاڕانەوە و خۆیان سەرقاڵ بكەن و هەوڵی چارەسەركردنی كێشەكە بدەن، وەكوو پاساو و بیانوویەكیش بۆ جێبەجێكردنی فەرمانی گەورەكەیان و لە خۆشەویستی و گوێڕایەڵیان بۆ ئەو ناچارن گوندەكە چۆڵ بكەن، بەڵام یەكێكیان ئەگەر هەر بۆ ڕازیكردنی بەرپرسەكەشیان بێت، ڕووی كردە سامان و گوتی: "باش گوێ بگرە، پەنجەیەكی بە خوێن بێت، لەتوپەتت دەكەین، ئێستا ئێمە بڕیاری بەرپرسەكەمان جێبەجێ دەكەین، ئەگەرنا ئامادە نین گوندەكە بەجێ بهێڵین، دڵنیابە ئەمەشت لێ بەسەر ناچێت. سامان بەسەریاندا نەڕاندییەوە و گوتی: دە پیاون ئێوە بە قسەی من مەكەن، ئەوجا بزانن چی ڕوو دەدات! یەكێكی دیكەیان گوتی:

برادەرینە ئەو کابرایە شێتە، تازە کار لە کار ترازاوە، نەبادا دەست بوەشێنێت و هەڕەشەکەی جێبەجێ بکات، وا چاکە بە قسەی بکەین و بڕۆین. ئەبوجگارە لەو چرکەساتەدا خۆزگەی دەخواست یەکێك لە ئەندامانی دەستەکەی دزە بکات و خۆی لە پەنایەکی نزیك مەلاس بدات و لە هەر دەرفەتێکدا بێت بە گوللەیەك مێشکی سامان بپژێنێت. کەچی هیچ یەکێك لە ئەنـدامانی دەسـتەکەی ئەو کارەیـان نەکـرد و هەموویـان بە بێـدەنگی پاشەکشـەیان کـرد و سـەرۆکەکەیان لەگەڵ چارەنووسێکی نادیـار و پڕاوپـڕ لە شـەرمەزاری و دۆڕاویـیەوە بەجێ هێشت. ئاخر سەرسـەرێتی و بەدڕەوشـتیی مـرۆڤ هەرچەندێك و هەرچۆنێك بێت، بەڵام سنوورێك هەیە نابێـت لە گوندەکاندا ببەزێندرێت، ئەگەرنا خەڵکی لە نزیکترین دەرفەتـدا لێـی هەڵـدەگەڕێنەوە و شکسـتی پـێ دەهێـنن. نە مەلا و نە کوێخای گوندەکەش هیچ کامیان بۆ دانوستان لەگەڵ سامان و چارەسـەرکردنی کێشـەکە ورتەیـان لێـوە نەهـات و لایەنگیـری کەسیان نەکرد، چونکە لایەنگیریکردنی سامان تووشی بەڵایەکی گەورەی دەکردن و ئەوانیش خۆیان لە بەڵای وا دوور دەگـرن، دەستێوەردانیشـیان لە بەرژەوەنـدیی ئەبوجگـارە، ڕێـك بارتەقـای پشـتگیری و ئەسـتۆپاکیی هەڵسـوکەوتە خەراپەکەی بـوو، بـۆیە کوێخا و مەلا ئەگەر کارێکی وا بکەن، ئەوا پیاوەتیی خۆیـان و گوندەکە و تەواوی دانیشتوانەکەی دەکەنە دیاری بۆ ئەبوجگارە و هاوشێوەکانی و دواتر بەزەیی بە ئابڕووی کەسیاندا نـایەتەوە، ئاخر ئەو ستەمکارێکی دەگمەن بوو. جگە لەوەش خۆ ئەو شێتە گوێ لە کەس ناگرێت و گوێ بە کەسیش نـادات، هەرچەنـدە پلەوپایەکەیشی گەورە بێت، بەڵکوو هەتا سەنگ و کێشـیش بـۆ کەس دانانێت، ئەو هەندێك قسـە دەکـات کەس لێـی تێناگـات، کوێخای گوندیش هەروا بیری دەکردەوە.

سامان دوژمنەکەی لە یەخەیەوە ڕاکێشا و بە شەقلێدان فڕێی دایەوە ماڵەکەی خۆی و بە هەڕەشەکردن بە دەمانچەکەی دەستییەوە پێی ڕاگەیاند ئەگەر یەك جوولە بکات تەواوی فیشەکەکانی لە مێشکیدا بەتاڵ دەکات. لە ماڵەوەش پشتوێنی دوژمنەکەی کردەوە کە حەوت هەشت مەترێك دەبوو و هەر بەو پشتوێنەی خۆی بەستییەوە و چیتر توانای جووڵەیشی نەما. لە بەختی سامان مام کاکیل و دەستەکەی لەو ناوچەیە لە سووڕانەوەدا بوون، کاتێکیش هەواڵی ڕووداوەکەیان پێ گەیشت. بەپەلە کەوتنە ڕێگە بۆ ئەوەی هیچ کات بە فیڕۆ نەدەن و بەسەر دۆخەکەدا زاڵ بن، بەرلەوەی زیاتر تەشەنە بکات، خۆیان گەیاندە ئەوێ، کاتێك مەلا و کوێخای گوندەکە بینیانیان بە گەرمی پێشوازییان لێ کردن و زۆریش دڵخۆش بوون بەوەی ئیدی چارەسەرکردنی کێشەکە لە دەستی خودی بەرپرسی دەستەی پێشمەرگەکاندایە، ئەو بەرپرسەی کەسێکی سەنگین و دونیادیدەیە، لای زۆربەی خەڵکیش خۆشەویستە و قسەی یەکە و نابێ بە دووان. سامان هەندێك لە دەستەکەی مام کاکیلی دەناسی و جارێك لە ماڵەکەی خۆی مێوانداریی کردبوون، سەریشی لەوە سووڕمابوو کە هەندێکیان خاوەن بڕوانامەن و هەندێکی دیکەشیان خوێندنی باڵاشیان تەواو کردووە، جگە لەوەی ژمارەیەکیشیان لە دەرەوەی وڵات خوێندبوویان و بڕوانامەی بەرزیشیان هێنابووەوە و گەڕابوونەوە بۆ خەبات دژی دەسەڵات. ئەو کاتە سامان هەستی بەوە کردبوو کە زمانێکی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە و دەتوانن پێی بدوێن و لە یەکتر حاڵی بن، نەك وەکوو پێشمەرگەی هەندێك لایەنی دیکە کە زۆربەیان ڕۆڵەی گوندەکان بوون و هەتا خوێندەواریشیان نەبوو، جگە لە زمانەکەی خۆیان هیچ زمانێکی دیکە نازانن.

مام کاکیل له دەرگای ماڵی سامانی دا و مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی لێ وەرگرتن. کاتێك سامان لە هاتنی ئەوان ئاگادار بووەوە هەستی بە ئاسوودەیی کرد، چونکه جار نا جارێك هەستی بەوە دەکرد کە ژیانی خۆی و هاوسەرەکەی تووشی مەترسییەکی گەورە کردووە، نەشیدەزانی دۆخەکە بەرەو کوێیان دەبات، هەر چۆنێك بێت ئەو تاکە پیاوێکە و ڕووبەڕووی کۆمەڵێکی تەواوی چەکدار بۆتەوە، هەڵبەتە ئایندەی ئەو هەڵەشەیی و هەڵوێستەی باش نابێت. بیری لەوەش دەکردەوە، کە دەبووایە زیرەکانە و دانایانەتر مامەڵەی لەگەڵ ڕووداوەکەدا بکردایە بێ ئەوەی دۆخەکە بەرەو ئەم ئاڕاستەیە ببات، لە هەمان کاتیشدا سازش لەسەر ئابڕووی خۆی نەکات و شکۆی خۆیشی نەدۆڕێنێت و ملیش کەچ نەکات و خۆیشی نەچەمێنێتەوە. ئاخر خۆ هەر دەبوو هاوسەرەکەی بپارێزێت، بەڵام هیچ ڕێگەیەکی دیکەی تاقی نەکردەوە کەمتر بێت لەو سەرشێتییەی ئەنجامی دا. بە ناچاری ئەوەیشی دەگوت: "تازە چی دەبێ با ببێت، گوێ بە هیچ نادەم".

مام کاکیل و سێ لە پێشمەرگەکانی هاتنە ئەو ژوورەی کە ئەبوجگارەی لێ بەسترابووەوە، بە یەك وشەش لەگەڵ دیلە شەتەکدراوەکە قسەیان نەکرد، تەواو پشتگوێیان خست، وەك ئەوەی هەر لەوێش نەبێت، کاتێکیش ئەبوجگارە ویستی بدوێت، وەڵامیان نەدایەوە و دیسانەوە گوێیان پێ نەدا. بەمە ئەبوجگارە سەرباری ئەو سووکایەتییەی پێی کرابوو، هەستی بە سووکایەتییەکی قورستر کرد و ورتەی لە دەم نەهاتەدەرەوە و بێدەنگ بوو. شەویلاگەکانی لە تووڕەیی و سووکایەتیپێکردندا

ڕەق بووبوون، بۆیە سەری نزم کردبوو، نەیدەزانی سەرنجی کامەیان بدات. نەخاسمە مام کاکیل کە بە یەك وشەش لە بارەیەوە لەگەڵ سامان هیچی نەگوت و بایەخیشی پێ نەدا.

مام کاکیل دوای ئەوەی هەندێك دانیشت و لەگەڵ سامان دەربارەی هەندێك کاروباری سەرپێیی قسەیان کرد، کە بریتی بوو لە هەواڵپرسین و زانینی هەواڵی کەسوکاری و دەبێ چۆن بن و بارودۆخی شارەکەیان دەبێ چۆن بێت؟ پاشان مام کاکیل سەیری قۆرییە چایەکەی کرد و گوتی:

- ئەرێ بە پەرداخە چایەك میواندارییمان ناکەن؟

ئیدی سامان و هاوسەرەکەی ڕووگیر بوون و شەرم دایگرتن لەو کەمتەرخەمییەی نواندبوویان. هاوسەرە شۆخەکەی بە خێرایی هەستا و کترییەکەی هەڵگرت و گوتی:

- هەر ئێستا چایەکی نوێتان بۆ لێ دەنێمەوە تکایە بمانبورن.

سامان پاساوی هێنایەوە و گوتی:

- زۆر داوای لێبوردن دەکەم، بۆ ئەم بێئاگاییەمان، بەهەرحاڵ ئێوە خۆتان خاوەن ماڵ و ئێمەش مێوانتانین.

مام کاکیل ڕاستەوخۆ گوتی:

- پێویستی بە چای نوێ ناکات، ئەگەر کەمێك لە قۆرییەکە ماوەتەوە، کەمێك ئاوی گەرمی تێ بکە و تەواو، کچی خۆم، خۆت ماندوو مەکە، ئێمە پەلەمانە و دەبێ بڕۆین.

دوای نزیکەی پێنج خولەکێك مام کاکیل و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون تەواوی چای ناو قۆریەکەیان خواردەوە، ئینجا مام کاکیل ڕاستەوخۆ ڕووی لە ئەبوجگارە کرد و گوتی:

- تۆ گوێ بگرە... بوون و مانەوەت لە ناوچەکە دەبێتە مایەی شەرمەزاری بۆ هەموومان، ئاخر لە ڕیزی تێکۆشەراندا چۆن ڕەفتاری وا دەکرێت؟ بۆیە دەبێ لێرە بڕۆیت و هەرگیز بۆی نەگەڕێیتەوە، خۆ ئەگەر بگەڕێیتەوە ئەوە خوێنت حەڵاڵ دەبێ، ئێستا تێگەیشتیت یان نا؟!

ئەبوجگارە لە داخان چاوەکانی دەرپۆقیبوون و بە نیمچە هەڕەشەیەکەوە گوتی:

- تۆ هەڵەیەکی گەورە دەکەیت، من جگە لە مام جەمال گوێ بە کەس نادەم. ئەگەر ئەمە بکەیت، ئەوا دەستەکەم بە دەستبەستراوی نامێننەوە.

مام کاکیل پەنجەی بۆ ڕاداشت و گوتی:

- کەواتە مادام وای لێ هات، ئەوا دەبێ لە ماوەی تەنها دوو ڕۆژدا دەستەکەشت بارەگاکەیان چۆل بکەن و لەم ناوە نەمێنن، ئەگەرنا دەبێ ڕووبەڕوومان بینەوە.

ئاوڕی لە یەکێك لەو پێشمەرگانەی لەگەڵیدا بوون دایەوە و پێی گوت:

- یەکێك لە پێشمەرگەکان لەگەڵ خۆت ببە و بڕۆن بۆ بارەگاکەیان و ئەم فەرمانەی منیان پێ ڕابگەیەنن. ئەبوجگارەش بەرن و لە دەرەوەی ئەم ناوچەیە بەرەڵلای بکەن، ئەگەر بیریشی لە گەڕانەوە کردەوە بیکوژن.

دووان لەو پێشمەرگانەی لەگەڵیدابوون هەستانە سەر پێ و دەست و قاچی ئەبوجگارەیان کردەوە و دایانە پێش خۆیان، ئەو بە جۆرێك هەڵچووبوو، لە داخان دڵی کوتەکوتی بوو، بە ئاشکرا هەستت بە لێدانی دڵی دەکرد، بە چاوێکی شەڕانگێزانەوە سەیری پیاوە پیرەکەی کرد، بەڵام ئەو هەر گوێیشی نەدایێ.

مام کاکیل کەمێکی دیکە لەوێ مایەوە و لەسەر خۆی و بە بێدەنگی چایەکەی خواردەوە و کەمێکیش خەیاڵ بردییەوە، کەچی لە ناکاو گوتی:

- پێم بڵێ مەزەندەی چ مەترسییەك لە هەڵوێستەکەت دەکەیت؟

سامان گوتی:

- من دەزانم بوومە هۆی کێشەیەکی گەورە، بە ڕاستی من زۆر داوای لێبوردن دەکەم...

مام کاکیل قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- داوای لێبوردن مەکە، تۆ هیچ هەڵەیەکت نەکردووە، هەر دەبووایە ئەوەت بکردبووایە کە کردت و دەستت خۆش بێت، تۆ نموونەیەکی دەبێ پیاوانی گوندەکە لە تۆوە فێری ئەوە بن، چیتر ڕێگە بە کەس نەدەن ڕیسوا و سووك و چرووکیان بکات... من تەنها پرسیاری ئەوەم لێ کردیت، لە ڕۆژانی داهاتوو چی دەکەیت و بە نیازی چیت؟ ئەبوجگارە بێدەنگ نابێت. تۆش ئامانجێکی دیار و بەرچاوی ئەندامانی دەستەکەی ئەویت. من پێم وایە مانەوەت لێرە مەترسی بۆ سەر خۆت و

خێزانەکەت دەبێ. ڕاستە ئێمە ناچاریان دەکەین ناوچەکە چۆڵ بکەن، بەڵام ئەم شاخانە ئەوەندە فراوانن، زۆر بە ئاسانی یەکێکیان دەتوانێ بۆسەیەکت بۆ دابنێتەوە و بتکوژێت، ئەوانە حیزفرسەتن، چونکە پێشتریش کاری لەم شێوەیەیان کردووە و ئێمە هەرگیز متمانەیان پێ ناکەین، پشتی خۆمانیان لێ ناکەین.

سامان بە دەنگێکی لەسەرخۆ و هێمنەوە گوتی:

- تۆ چ ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکم دەکەیت؟

مام کاکیل ناوچەوانی خۆی خوراند و گوتی:

- دڵنیام چ درەنگ بێت و چ زوو، دەستی ستەمکاریت پێ دەگا. من پێم باشە بۆ ماوەیەك لە سایەی ئێمەدا بمێنیتەوە، تاکوو شوێنێك بۆ ژیانی خۆت دابین دەکەیت، کە کەس نەزانێت.

- هەر لە سەرەتاوەش پێشبینیی ئەوەم کردبوو، بەڵام لەوەی ڕووی دا ناچار بووم بیکەم. وا پێ دەچێ زەوی بۆ من بەرتەسك بووبێتەوە. ئاخر من هەتا ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ شارەکەشم، ئەگەر ڕاستیت دەوێ من بۆ ئەوە نەخولقاوم لە گوندێکی دوورەدەستی شاخاوی وەك ئێرە بژیم، بە ڕاشکاوی من دەمێکە بیرم لەوە کردۆتەوە ئێرە بەجێ بهێڵم و بەرەو ئێران بڕۆم، لەوێوەش بۆ هەر وڵاتێکی دیکە کە بتوانم داوای پەنابەری لێ بکەم و ئاواتەکانی خۆم بهێنمە دی. ئێستاش من زیاتر لەسەر هێنانەدیی ئەو بیرۆکەیەم سوورم، ئەمە نەك لەبەر ئەوەی ئەبوجگارە هەڕەشە لە ژیانم دەکات، بەڵکوو بە دوای

سەقامگیرییەکدا دەگەڕێم بۆ خۆم و هاوسەرەکەم.

مام کاکیل دوای هەناسەهەڵکێشانێکی قووڵ گوتی:

- باشترین بیرۆکەیە، کەواتە هەر لە ئێستاوە دەست بە جێبەجێکردنی بیرۆکەکەت بکە، بەڵام بە نهێنییەکی تەواو، کەس نەزانێت و لای کەسیش باسی مەکە، بۆ ئەوەی هیچ یەکێك لە پیاوانی سەر بە ئەبوجگارە دوات نەکەون.

## بەشی بیستەم

ڕەحمـان کەمێـك لە خەو هەسـتا، مـاوەیەکیش بە نـیمچە خەوتنێکەوە هەر ئەمدیو و ئەو دیوی دەکرد. بەڵام کاتێك بۆنی چـای کـرد، خـۆی بـۆ نەگیـرا و لە شـوێنی خـۆی دانیشـت، بەرلەوەی ئەو هیچ بڵێت، سامان لێی پرسی:

- خێرا هەستایت! پشووت دا؟

ڕەحمان گوتی:

- هێشتا ماندووم و پێویستیم بە خەوە، بەڵام کێ بەرگەی بۆنی چای دەگرێت؟

- وا پێ دەچێ برسیشت بێت؟

ڕەحمان بە دەنگێکی نزم:

- خەریکە لە برسان دەمرم.

سامان بە چاوتێرییەکەوە گوتی:

- ئێمە تـا ئێسـتا نـانی سـبەینێمان نەخـواردووە، بـا بـزانین هاوسەرەکەم چیمان بۆ ئامادە دەکات؟

شیرین بە زمانی کوردی وەڵامی دایەوە:

- ئەوە لەسـەر ئەو کـابرایە ڕاوەسـتاوە، بـزانم چـی لەنـاو کیسەکەدا بۆ هێناوین.

ســـــامان بەو وەڵامەی شـــــیرین حەپەســـــا، وەك ئەوەی

تێگەیشتبێت کە ڕەحمان چی گوت. لە نزیك زۆپاکەوە دانیشت، هەر کە ئەوەی ناو کیسەکەی بینی دەستی بە قاقای پێکەنین کرد، پێکەنینەکەی زۆر لە دەنگی بولبولێکی خۆشخوان لە گوێچکەیان خۆشتر بوو، ڕەحمان بە بزەیەکەوە سەیری هەردووکیانی کرد، هاوسەرەکەیشی بە هەمان شێوە ڕوخساری گەشایەوە و پرسی:

- چی؟!

شیرین بە زمانی کوردی گوتی:

- هیچ شتێك لە کیسەکەدا نییە جگە لە ژاژی.

سامان بە پێکەنینەکەی سەیری هات و گوتی:

- ئینجا ئەوە چی تێدایە؟!

هێشتا ڕوخساری زەردەخەنەی لێ دەباری و بە پێکەنینەوە گوتی:

- ئاخر مێوانەکەمان حەز لە خواردنی ناکات، ئەگەر بزانێت شێت دەبێ.

سامان ئاوڕێکی بە لای ڕەحمان دایەوە و زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و ئەوەی هاوسەرەکەی گوتبووی بۆ ڕەحمانی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، ڕەحمان سەری سوڕما و لەناو زەردەخەنە شڵەژاوەکەیەوە گوتی:

- ئەو چۆن دەزانێت من حەز لە چارەی ژاژی ناکەم؟!

شیرین بە شێوەزارێکی عەرەبیی دروست وەڵامی دایەوە:

- خۆم گوێم لێت بوو وات گوت، ئەو کاتەی پێش ماوەیەك لای ئێمە مێوان بوون.

ڕەحمان خەریك بوو لە ئەنجامی بیستنی ئەو قسە لە ناکاوە لە شوێنی خۆیدا هەڵبەزێتەوە، هەستکردنێکی تێکەڵ بە خۆشی و شەرم و شڵەژانی لا دروست بوو. سامانیش حەپەسا و سەیری بەوە هات هاوسەرەکەی چۆن بەو شارەزاییە بە زمانی عەرەبی قسە دەکات، بۆیە هەردووکیان بە یەك دەنگ هاواریان کرد:

- تۆ بە عەرەبی قسە دەکەیت؟!

شیرین بە شۆخی و گاڵتەیەکەوە گوتی:

- بەڵێ دەیزانم... بۆ... چی لەوەدا هەیە؟!

سامان چاوی لەسەر ڕوخساری دانەگرت و گوتی:

- ئاخر پێشتر نەمدەزانی... چۆن بەو شارەزاییە فێری بوویت؟

شیرین بەوپەڕی شادی و بەختەوەرییەوە گوتی:

- ئەو کاتەی حکوومەت بۆ شارەکانی باشوور ڕایگواستین، من هێشتا بچووك بووم، چەند ساڵێکی کەمە گەڕاوینەتەوە شاخ، هەتا ئەو گوندەی کە تێیدا نیشتەجێین، گوندی خۆمان نییە، ئەوەی خۆمان وێران کرا و لەگەڵ زەویدا تەخت کرا.

ڕەحمان بە سەرلەقاندنەوە گوتی:

- هەست بە شەرمەزاری دەکەم لەو سەختییەی بەسەرتان هاتووە.

ئەو بە دڵدانەوەی گوتی:

- تۆ بۆچی هەست بە شەرمەزاری دەکەیت؟ تاوانی تۆ چییە؟!

سامان:

- تۆش وەکوو ئەو و منیش قوربانییەکین، لە هەموو نیشتمان و نەتەوەکاندا کەسانی شەڕانگێز هەن و ناژێن، تەنها لەسەر خەم و ئازار و مەرگی ئەوانەی دیکە نەبێت، کەسانی باشی دیکەش هەن، لە پێناو خەڵکانی دیکەدا خەم دەخۆن و دەبنە قوربانی. پێکەنە ِبرام، ئەوەی بە یەك چاو سەیری نێوانی تۆ و ئەوان دەکات وەکوو ئەوان شەڕانگێزە، ئەمە لە مێشکی خۆت دابنێ.

ڕەحمان سەری بەرزکردەوە و بە شیرینی گوت:

- لەو قسانە تێگەیشتیت کە لە نێوان من و هاوڕێکەمدا گوتمان، ئەو کاتەی لە ماڵتان بووین؟

شیرین زەردەخەنەیەکی توانجئامێزانەی بۆ کرد و بە شۆخییەوە گوتی:

- هەموومان لە قسەکانتان تێگەیشتین.

ڕەحمان هاواری لێ هەستا:

- وای وای لەو شەرمەزارییەی هەستی پێ دەکەم... زۆر داوای لێبوردن دەکەم لە هەر وشەیەك ئەو کاتە گوتبێتمان.

شیرین کە هێشتا لە گاڵتە و شۆخیی خۆی نەکەوتبوو گوتی:

- داوای لێبوردن مەکە، من ئێستاش دڵخۆشم بەوەی تۆ دەربارەی من گوتت. بەڵام باوکم و براکەم بە زۆر توانییان بە سەر تووڕەیی خۆیاندا زاڵ بىن و هەردووکیان تۆیان خۆش نەویست، بە تایبەتی ئەو کاتەی تۆ گوتت: کێ دەڵێ ئەو مانگە لەو پیرەیە. باوکم بۆ ماوەی دوو سێ ڕۆژ هەر دەیگوت و

دەیگوتەوە: ئەرێ من پیرم؟! ئاخر ئەو گەمژەیە چاوی نەیدەبینی کە هێشتا بەبەرمەوە ماوە؟! چونکە باوکم ئەو کاتە خۆی بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی زۆر لە خۆی منداڵتر دانابوو.

سامان بە شۆخییەکەوە گوتی:

- ها... ئەوە چییە دەبینم دڵداریشت لەگەڵ هاوسەرەکەمدا کردووە.

ڕەحمان بە خەم و شێواوی و شەرمێکەوە گوتی:

- ئاخر ئەو کاتە هاوسەری تۆ نەبوو.

- دەزگیرانی من بوو!

- بەوەم نەدەزانی ها!

سامان ئەمەی گوت و دەستی لەسەر گۆنای هاوسەرەکەی دانا:

- هەتا ئەگەر بشمزانیبووایە، کێ هەیە ئەم گوڵە جوانە ببینێت و بە شیرینترین وشە بە بەژن و باڵایدا هەڵنەدات.

- بە مەرجێك پێی لێ نەنێت و نەیڕژاکێنێت.

ڕەحمانیش ئەمەی گوت و شیرینیش دڵخۆش بوو، لەو کاتەی کیسە نانەکە و ژاژییەکەی لە نێوان هەردووکیان دادەنا و چایەکەی بۆ تێ دەکردن گوتی:

- ترسی گەورەم لەم دونیایە ئەوەبوو ڕۆژگار پێم لێ بنێت و بمڕژاکێنێت، وەلێ ئێستا هیچ ترسم نییە، ئەوەتانێ سامانی هاوسەرم فێری خۆشەویستی کردووم و دڵنیایی و خۆشی پێ بەخشیوم و بۆتە هەموو کەس و ژیانم.

ڕەحمان بە نیگەرانی و نیمچە ڕقێکەوە سەیری کیسە

ژاژییەکەی دەکرد و گوتی:

- ئەوە چییە ئەم ژاژییە بۆ هەر شوێنێك بڕۆم هەر بەدوامەوەیە و وازم لێ ناهێنێت؟

شیرین بە دەنگێکی پڕ لە بەزەیی و سۆزەوە گوتی:

- دەزانی خۆزگەم دەخواست لە ماڵماندا زیاتر لە ژاژی هەبووایە تا ئەو کاتەی مێوانمان بوون پێشکەشتانم بکردبووایە. دڵنیام لەو کاتەوەی ڕووتان لە شاخ کردووە خواردنێکی واتان نەخواردووە بەها و تامێکی ئەوتۆی هەبێت. بە تایبەتی کە ئێوە خەڵکی شارن و دەستبەرداری ئەو خۆشییانەی بوون کە لەسەری ڕاهاتبوون و ڕووتان لەم دەشتودەر و چۆلەوانییە کردووە، بۆ سەرخستنی حەق.

دوای سووکە گفتوگۆیەك و لە کاتی چاخواردنەوە و خواردنی ژاژی بەو سبەینێی ساڵحانە، ڕەحمان هەستی بە حەپەسان و شەرمەزاری کرد، ئاخر ئەو خۆی بەوە دادەنا کە هەندێك ڕۆشنبیرە و شتێك لە ڕۆشنبیری دەزانێت و کەمێکیش پەی بە ژیان دەبات و درکی پێ دەکات، کە وای لێ دەکات شانازی بەو کەمە زانستەوە بکات کە هەیەتی، کەچی کاتێك لەگەڵ ساماندا کەوتە گفتوگۆ، خۆی وا بینی، جگە لە گەنجێکی هەڵپەکاری بێ زانست هیچی تر نییە. ئەو هاتووە تاکوو خوداکەی لەم شێتە بسێنێتەوە، کەچی دەبینێت شێتی چی؟ پیاوێکی ئەوتۆیە بە دەگمەن لە ژیانیدا ڕێککەوتی مرۆڤێکی وای کردووە، گەیشتە ئەو باوەڕەی کە ئەو ئافرەتە سەنگینەش ئەوەندە دڵخۆش و بەختەوەرە لەگەڵیدا، ئامادەیە بیکاتە خوای خۆی و بیپەرستێت. ئەوەندەی خۆش دەوێت، هێندەی توانای خۆشەویستیی هەموو ژنێك، خۆشەویستییەکەیشی

قەدەرێکی نووسراو نەبوو، وەك ئەوەی ژنە جووتیارەکان تەنها لەبەر ئەوە پیاوەکانیان خۆش دەویست چونکە مێردیان بوون. بەڵام ئەم لەبەر ئەوە خۆشی دەوێت، چونکە شایانی ئەو خۆشەویستییەیە، لەبەر ئەوەی توانی بچێتە ناخی هەستەکانییەوە و بە ڕاستییش سۆز و خۆشەویستیی بخرۆشێنێت. تا ڕادەیەکی زۆریش کوڕێکی قیت و قۆزە، سەرباری ئەوەش زۆر ژیر و زیرەك و دانایە و گەنجانی دیکە ئیرەیی بەو زیرەکییەی دەبەن.

ڕەحمان بە تەواوی هەستی کرد بوونی ئەو لە نێوانیان هیچ سوودێکی نییە، چونکە مانەوەی ئەو لەگەڵیان ساتەوەختە جوان و خۆشەکانیان هەڵدەبزڕکێنێت و دەیڕاکێنێت کە ئەوان تێیدا دەژین، ڕاستە ئەو ڕووگە و پەرستگاکەی خۆی لەدەست دا، بەڵام ئەوەی توانی دڵی بباتەوە و بیکاتە بەشێك لە خۆی، ئەوە شایانییەتی و پیرۆزی یەك بن، نە ملشکاندن جێگەی دەبێتەوە و نە ڕق و کینەش، دەبێ وەکوو سوارچاکە خانەدانەکان ئەو چارەنووسە پەسەند بکات. بێدەنگییەکی درێژ و زۆر باڵی بەسەردا کێشان. شیرین جارێك بە چڵە دارەکەی دەستی یاری بە پشکۆی سۆبەکە دەکرد و جارناجارێکیش چای بۆ تێ دەکردن و بیری لە زۆر شت دەکردەوە، ئەوانیش بە شێوەیەکی خۆکردەییانە چایەکەیان وەردەگرت و دەخواردەوە و ڕوخساریان لە تابلۆیەك دەچوو، مرۆڤەکانی ناوی خەیاڵ باڵی بەسەردا کێشابن و بیرکردنەوەیەکی قووڵ سەرقاڵی کردبن. ڕەحمان لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "وای چەند گەمژە بووم، چ کەسێکی گەوج و نەزان بووم". سامانیش بە دوودڵی و شڵەژاوییەوە بیری لەوە دەکردەوە کە: "وای دەزانی ئەو کەسەم کە خەڵکی باسیان کردووم، ئەو هاوسەرەکەشم دەناسێت، خۆ لەوانەشە لە پێناوی ئەودا هاتبێت!"

شیرین دوای ئەوەی هەستی بە دوودڵیی مێردەکەی کرد، بە پرسیارەوە بیری کردەوە: "ئەی خوایە دەبێ چی لە ناخیاندا بخولێتەوە؟!"

دوا جار، ڕەحمان لەو کاتەی زەردەخەنەیەك سەر ڕوخساری داگرتبوو، گوتی:

- دەزانن، من لە کاتی ئاهەنگی هاوسەرگیرییەکەتان بەوێدا تێپەڕیم، بەڵام لەو کاتەدا زۆر پەلەم بوو و بە تەنهاش نەبووم، تەنها کەمێك لەوێ ماینەوە و گوندەکەمان بەجێ هێشت؟

ئینجا دەستی کردە گیرفانییەوە دینارێکی تەڕی دەرکرد و گوتی:

- جگە لەم دینارە تەڕە هیچی تر شك نابەم، ئەمەش دەکەمە دیاریی هاوسەرگیریتان.

سامان ڕێگەی لە وەرگرتنی پارەکە گرت، وێڕای پێویستیی زۆری بۆ هەر بڕە پارەیەك، بەڵام ڕەحمان سوور بوو لەسەر ئەوەی وەریبگرێت و گوتی:

- ئەگەر لێمی وەرنەگرن فڕێی دەدەمە ناو زۆپاکەوە... دەستی درێژکردەوە و گوتی: جارێکی تر هاوسەرگیرییەکەتان پیرۆز دەکەمەوە. بە ڕاستی هەڵبژاردنێکی چاکت کردووە، تۆ شۆخترین کچی گوندەکانت هەڵبژاردووە، تۆش هاوسەرگیریت لەگەڵ باشترین پیاودا کردووە، پیرۆزی یەکتربن و لەگەڵ یەکتریدا پیر و خەڕۆ بن.

لێرەدا ئەو دڵەڕاوکێیەی سەر ڕوخساری بووك و زاواکە ڕەوییەوە و جۆرێك لە دەروونپاکی جێگەی گرتەوە.

سامان لەو کاتەی دەستی بۆ شیرین درێژ دەکرد و دینارەکەی دەدایێ گوتی:

- ئەم دینارە بۆ خۆت، بە ئارەزووی خۆت خەرجی بکە.

وەریگرت و لە چاوەکانیشیدا شەرمێك بە دی دەکرا.

پاشان بە هۆی چەند جارێکی لێدانی دەرگاکەوە بازێکی دا و هاواری کرد:

- گورگەکان.

شیرین خۆی بە دیوارەکەوە نووساند و ڕەحمانیش پەلاماری چەکەکەی دا و ئامادەی هەر پێشهاتێك بوو، لەو کاتەدا گوێیان لە دەنگێك بوو هاواری دەکرد:

- ئەرێ ئەو دەرگایەم لێ ناکەنەوە. من خاوەنی تراکتۆرەکەم.

سامان کەمێك درزی دەرگاکەی کردەوە و کاتێك جگە لەو کەسێکی دیکەی نەبینی، بوێریی ئەوەی هەبوو دەرگاکە بکاتەوە و دڵی بە ڕەحمان و چەکەکەی خۆش بوو، خاوەنی تراکتۆرەکە بێ ئەوەی بێتە ژوورەوە گوتی:

- هاتووم بۆ ئەوەی پێت بڵێم سبەی دوای نیوەڕۆ دەردەچم، نەك ئەمڕۆ. بۆیە داوای لێبوردن دەکەم، کارەکە بە دەست من نییە، بۆیە تکایە لەگەڵمدا وەرن و لە ماڵەوە مێوانداریتان دەکەم.

سامان هەستی بە جۆرە شڵەژان و دڵەڕاوکێیەك کرد، بۆیە کەمێك زمانی گیرا و گوتی:

- سوپاست دەکەین بۆ ئەوەی پێت ڕاگەیاندین. بەڵام بۆ

مێواندارییەکە داوای لێبوردن دەکەم، هەرچەندە دەزانم ئەوە بۆ من شیاو نییە کە دەیڵێم، وەلێ خۆزگە کەمێك نان و شەکر و چایت بۆ دەهێناین، سوپاسگوزار دەبووین.

خاوەنی تراکتۆرەکە گوتی:

- ئەوەی پێویستتانە بۆتانی دەنێرم. بەڵام ئەگەر ڕای خۆتان گۆڕی ئەوە دەرگای ماڵەکەم کراوەیە بۆتان و بەخێر بێن.

سامان کە هێشتا هەستی بە کەمێك دوودڵی و ڕاڕایی دەکرد گوتی:

- سوپاسی مێوانداربیەکەت دەکەین،.سبەی دوای نیوەڕۆ بە دیداری یەکتر دەگەین.

خاوەنی تراکتۆرەکە لە کوێوە هاتبوو گەڕایەوە شوێنی خۆی، سامان چاودێری کرد تا خەریك بوو بگاتەوە گوندەکەی، پاشان بە وریاییەوە دەرچووە دەرەوە و دەوروبەری ئەو ژوورەی پشکنی کە تێیدا بوون، هەڵبەتە ڕەحمانیشی لەگەڵدا بوو، سەرنجیان لە هەموو ئاراستەکان دەدا بێ ئەوەی بزانێت لێرە چی ڕوو دەدات، پاشان گەڕانەوە بۆ ژوورەکە و دەرگاکەیان توند لەسەر خۆیان داخست و لە نزیك زۆپاکەوە دانیشتن و چێژیان لە گەرمایی ئاگرەکەی وەردەگرت، بە تایبەتی ڕەحمان هێشتا جلوبەرگەکانی تەڕن و سەرمابردەڵە بووە و سەرماکە بە مۆخی ئێسکەکانیدا ڕۆ چۆتە خوارێ.

چەند چرکەساتێکی بێدەنگی تێپەڕین، بەرلەوەی ڕەحمان بپرسێت:

- داوای لێبوردن دەکەم، بە هۆی ماندووبوونمەوە بیرم

لای قسەکانت نەبوو، حیکایەتی ئێوە لەگەڵ گورگەکان چی بوو؟ بۆچی سووریت لەسەر مانەوەت لەم ژووورە چۆلە؟ باشتر نەبوو مێوانداریی ئەو پیاوەتان پەسەند بکردبووایە؟

ئیدی سامان دەستی بە گێڕانەوەی ئەوە کرد کە بەسەریان هاتبوو، هەستێکی زۆری دڵنیایی و ئاسوودەییشی بۆ گەڕابووەوە بە هۆی بوونی ڕەحمان و چەکەکەی، بۆیە گوتی:

- ڕێنیشاندەرێکمان لەگەڵ بوو، وا بڕیار بوو بمانگەیەنێتە لای خاوەن تراکتۆرەکە، ئەوەی ئێستا بینیت، گوندەکەیان هەر هێندەی هاویشتنی بەردێك لێمانەوە دوورە، وەلێ پێم باشتر بوو لێرە چاوەڕوان بین، ئیدی ئەویش بەجێی هێشتین و ڕۆیشت، تاکوو خواردنمان بۆ بهێنێت و لە خاوەن تراکتۆرەکەش بپرسێت و بزانێت چ کاتێك بۆ ئێران دەڕوات، چونکە ئێمەش نیازی ئەوێمان هەیە، بەهەرحاڵ ڕێنیشاندەرەکە ڕۆیشت و نەگەڕایەوە. پێمان وابوو ڕۆیشتووە بۆ ئەوەی پشوویەك بدات و نانێك بخوات، خۆ لەوانەیە ویستبێتیشی بێتەوە لامان بەڵام لەو کاتەدا گورگ هێرشی کردبێتە سەر گوندەکە، ئیدی ئێمەش لێرە بە درێژایی شەو گوێمان لە لوورەی گورگ و حەپەی سەگ بوو، هەتا نزیکی کازیوە ئینجا نە لوورەی گورگ ما و نە سەگوەڕیش، لەوانەیە ئەوەندەیان گۆشتی بزن خواردبێت، کوڵی برسێتیی خۆیان دامرکاندبێتەوە و ئێستا لە پشوودا بن، بەرلەوەی تۆ بێیت بە نزیکەی دوو کاتژمێرێك ویستم بچمە دەرەوەی ژوورەکە هەندێك داری کەڵەکەکراوی بەردەم ژوورەکە بهێنم و لێنەگەڕێم ئاگری زۆپاکە خامۆش بێت و بکوژێتەوە، ژمارەیەکی کەم لە گورگەکان چەند هەنگاوێك لە دەرگای ژوورەکەوە دوور بوون، ئەوەی بە لامەوە سەیر بوو، ئەوەندە بێدەنگ بوون، نازانم چۆن هەستمان بە بوونیان نەکردبوو، چونکە یەك جووڵەشیان لێوە نەدەهات، یەکێکیان لە ناکاو

هەڵمەتی بۆ هێنام، ئەوەندە کتوپڕ بوو، زۆر ترساندمی، چونکە چاوەڕێی شتی وا نەبووم، منیش بە جووڵەیەکی خێرا و سەیر ڕووم لە دەرگا نیمچەکراوەی ژوورەکە کرد، تاکوو خۆم لە پاڵی بپارێزم، کاتێك ویستم دەرگاکە دابخەم، نیوەی جەستەی گورگەکە لە نێوان دەرگاکە و دیوارەکە گیری خوارد، لەو کاتەدا شیرین بەو پووشوپەڵاشە خەریکی ڕێکخستنی شوێنی خەوتن بوو، کاتێك هاوارم بۆی کرد کە خۆی بە شتێك بپارێزێت، وا هەستم کرد تووشی شۆك بوو لە ترسی ئەوەی ڕووی دا و لە شوێنی خۆیدا وشك بوو، بەڵام زوو هاتەوە سەرخۆی و فریام کەوت و یارمەتی دام... هاوسەرەکەم مەزنە مەزن، زۆر شانازی پێوە دەکەم، دەستی دایە کوڵە دارێك و پەلاماری سەری گورگەکەی دا کە لە نێوان دەرگاکە و دیوارەکە گیری خواردبوو، گورگێکی دیکەش لەژێر دەرگاکەوە خەریکی هاتنەژوورەوە بوو، منیش بێ ڕاوەستان بە شەق بەربوومە سەر کەللە و لمۆزی و هاوارم بۆ شیرین کرد: پارچە دارێکم بداتێ، دارەکەی دامێ و بەربوومە سەر و گوێلاکی گورگەکە، تاکوو سەری خۆی لە نێوان دەرگا و دیوارەکە کێشایەوە و بە نووسکەنووسك ڕای کرد، منیش لە کۆتاییدا دەرفەتم بۆ ڕەخسا دەرگاکە دابخەم و بە هەموو هێزی خۆم پاڵی پێوە بنێم، لە ترسی ئەوەی نەبادا بە هۆی خۆپێداکێشانی گورگەکان دەرگاکە لە بنەوە هەڵتەکێت و بێنە ژوورەوە، چونکە گورگەکان کە خۆیان بە دەرگاکەدا دەدا، کە وەك دەبینی لە تەنەکە دروست کراوە و بەرگەی هیچ ناگرێت، دەنگی شەقەشەقی دەرگاکە ترسی ئەوەی پێ دەبەخشیم، نەبادا بەرگەی ئەو خۆپێداکێشانەی گورگەکان نەگرێت و لە بنڕا هەڵتەکێت، لەو کاتەدا شیرین کولکەدارێکی دیکەی لەناو سۆبەکەوە ڕاکێشا کە سەرێکی ئاگری گرتبوو، ئیدی لای گرەکەی نایە سەروچاوی ئەو گورگەی لەژێر دەرگاکەوە

دەیویست بێتە ژوورەوە، لەو چرکەساتەدا دارەکەم لە شیرین وەرگرت و بەوپەڕی توانای خۆمەوە پەستامە ناو دەمی گورگەکەوە، لە تاو گەرمیی ئاگرەکە زۆر بە ئازارەوە قووڕاندی و بە ترسەوە خۆی و ئەو گورگانەی لەگەڵیشی بوون هەڵاتن و دوور کەوتنەوە، ئەویش بەشی خۆی لە پشکۆی ئاگرەکە بەر کەوت بەرلەوەی بمانکاتە نێچیرێکی چەوری خۆی و گورگە هاوڕێکانی، ئای چ ژیانێکی سەختە، ڕاستە ئاژەڵێکی دڕندە و بێبارە و کەڵبەکانی ترسناکن، بەڵام چۆن ناخم ڕێگەی پێ دام بەو جۆرە داغی بکەم، دڵنیام ئێستا ئازار دەچێژێت، لەوانەیە ئازارەکەشی درێژە بکێشێت، هیچ بژاردەیەکی دیکەم نەبوو، دوای چرکەساتێکی ترس و دڵەڕاوکێ و دوای ئەوەی دەرگا و پەنجەرە و هەموو کون و کەلەبەرێکمان داخست کە ترسی هاتنەژوورەوە و دزەکردنی گورگەکانی لێ دەکرا، بە ترسەوە کەمێك پشوومان دا، بە تایبەتیش دوای ئەوەی سەری چەند دارێکی دیکەمان خستە ناو ئاگرەکەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی گورگەکان ئەگەر هێرشیان هێنایەوە سەرمان، من چەند بە بەختم، ئەگەر شیرینم لەگەڵ نەبووایە گورگ لەتوپەتی دەکردم.

شیرین بە شەرمێکەوە گوتی:

- ئەگەر لەگەڵ تۆدا هەستم بە دڵنیایی و ئارامی نەکردبووایە دوای ئەو شەڕە، یەك چرکەش خەو نەدەچووە چاوەکانم، لە پشتەوە باوەشی پێ داکرد و بە نازەوە دەستی لەسەر شانەکانی دانا و گوێی لە چپەی دەنگی سامان بوو گوتی:

- تۆ ئازایت، ئای چەندم خۆش دەوێیت خوایە!

ڕەحمان بە تیلەی چاوی خێسەیەکی بۆ کردن، هەستی بەوە

کرد، بوونی لەوێ کارێکی جوان نییە و پێویستە بڕوات و بەجێیان بهێڵێت، ئەو چایەی لەناو پەرداخەکەی مابووەوە بە یەك فڕ هەڵیقوڕاند و هەستایە سەر پێ و گوتی:

- سوپاس بۆ مێوانداریتان، ئێستا دەبێ بڕۆم.

سامانیش هەستایە سەر پێ و گوتی:

- چییە دەڵێی کارێکت هەیە وا پەلەتە؟ چاوەڕوان بە هەتا جلوبەرگەکەت وشك دەبنەوە.

- نەخێر پەلەم نییە، بەڵام هەست دەکەم مانەوەم لێرە پێویست ناکات، نامەوێ ببمە بارگرانی بەسەر هیچ کەسێکەوە!

- ئینجا کێ دەڵێ تۆ بارگرانییت بە سەرمانەوە؟

وەك ئەوەی سامان گوتی، شیرینیش ئەوەی بۆ زیاد کرد:

- زیاتر هەست بە دڵنیایی و ئاسوودەیی دەکەین، ئەگەر لەگەڵمان بمێنیتەوە، بە لایەنی کەمەوە چەکێکت پێیە و کەسیش نازانێت چی چاوەڕێمان دەکات.

ڕەحمان گوتی:

- وا تێگەیشتم کە بوونی من لەگەڵتان بێزارتان دەکات؟

سامان بە نیگەرانییەوە قۆڵی ڕەحمانی گرت و گوتی:

- هەرگیز برا، بەڵکوو ئێمە پێویستیمان بە مانەوەی تۆیە لەگەڵمان، دانیشە و جلوبەرگەکانی خۆت وشك بکەرەوە.

ئینجا دوو کوڵەداری هەڵگرت و فڕێی دایە ناو سۆبەکەوە، لەو کاتەدا شیرین گوتی:

- چای دیکەتان بۆ ئامادە دەکەم.

ڕەحمان هەستی بە جۆرە ئاسوودەیەك کرد و گوتی:

- ئەی لە گەڕانەوەی گورگەکان ناترسن؟

شیرین خەریکی کۆکردنەوەی پشکۆکان بوو لە بەردەم زۆپاکە، گوتی:

- هەڵبەتە لێیان دەترسین، وای ئەگەر دەتبینی چۆن هێرشیان دەهێنا...؟! ئەی خوایە چەند ترسناك بوون.

- کەواتە بۆ ناچنە گوندەکە، خۆ خاوەن تراکتۆرەکە بانگهێشتی کردن.

سامان گوتی:

- هۆکاری خۆم هەیە، وام پێ باشترە ئەمشەو لێرە بمێنمەوە، سبەی پێش نیوەڕۆ دەچینە گوندەکە، ئەگەر ڕاستیت دەوێ، هەرگیز بیرم لە بەجێهێشتنی ئەو گوندە نەدەکردەوە کە تێیدا هاوسەرگیریم کرد، ئەگەر لەوێ تووشی ئەو کێشە گەورەیە نەبوومایە. ڕاستە من بیرم لە ڕۆیشتن بۆ دەرەوەی وڵات کردبووەوە، بەڵام نەك لە ئێستادا، بەهەرحاڵ، ئایا دەزانی؟ ئێستا زۆر هەست بە ئاسوودەیی دەکەم، لەبەر ئەوەی سەر بە دەستەکەی مام کاکیلیت. هەرگیز ئەو پشتگیرییەتانم لە یاد ناچێت کە لەو کارەساتەی بەسەرمدا هات نواندتان. دەمەوێ باش بزانیت کە من لە چ گرفتێکدام، بۆیە ئەگەر دەتەوێ بەجێمان بهێڵیت و خۆت تووشی کێشە نەکەیت، ئەوا ئازادیت و بژاردەکە لای خۆتە و هەر کاتێك بتەوێت دەتوانی بڕۆیت.

ڕەحمان بە منگەمنگێکەوە دەیویست یادگەی خۆی بۆ ڕووداوێکی وا بگەڕێنێتەوە:

- لەوانەیە گوێبیستی ڕووداوێکی وا بووبم، بەڵام لە

هەموو شتەکە تێنەگەیشتووم، ئەوەم زانیوە کێشەیەك لە نێوان دەستەکەی ڕۆست و دەستەکەی مام جەمالدا ڕووی داوە، بۆیە بە ناچاری ناوچەکەیان بەجێ هێشتووە و ڕۆیشتوون.

سامان قسەی بە ڕەحمان بڕی و گوتی: من هۆکاری ئەو ناکۆکییە بووم و خۆمیش لایەنێکی بووم، بۆیە دەترسێم یەکێك لەوانەی نزیکی مام جەمال دوامان کەوتبێت، یان یەکێکیان لە گوندەکە خۆیان بۆ مەڵاس دابین.

- ئەی بۆچی یەکێك لە دەستەکەی مام کاکیل بۆ ئێرە لەگەڵت نەهاتووە.

- لە ڕاستیدا مام کاکیل پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم، وەلێ من ڕەتم کردەوە و ڕازی نەبووم، نەبادا دەرچوونمان سەرنجی کەسێکیان ڕابکێشێت. بە تایبەتی لەسەر ئەوە ڕێك کەوتین کە دەنگۆیەکی وا لەناو جووتیاران و خەڵکی گوندەکە بڵاو بکەینەوە کە ئێمە لە مێوانداری و لەژێر سایەی مام کاکیلداین.

ڕەحمان گوتی:

- هەر لە بەر ئەمەش کەس لە کۆمەڵەکەی مام جەمال دواتان ناکەوێت، کاتێك بە تەنها کۆچ دەکەن و دەڕۆن، چونکە مەحاڵە مام کاکیل بەبێ دابینکردنی پاراستنتان ڕێگەی ڕۆیشتنتان بدات.

- ڕێك وابوو.

- زۆر چاکە، پلانێکی باشە.

شیرین گوتی:

- کاتێك ئەمڕۆکە تۆ هاتی، پێم وابوو مام کاکیل تۆی بە شوێنماندا ناردووە.

ڕەحمان گوتی:

- هەرگیز کەس منی بە شوێنتاندا نەناردووە، هەتا لەو کاتەوەی من تووشی ئەو برینەی چاوم بووم لە ئەنجامی هێرشەکەی سەر مۆڵگە سەربازییەکەی ئەو شەوەی کە ئێوە لە ماڵی خۆتان میوانداریتان کردین، من لە دەستەکەی مام کاکیل دابڕاوم.

شیرین بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

- من دەمزانی ئێوە دەچن بۆ شەڕ، هەتا باوك و براکەمیش ئەوەیان دەزانی.

ڕەحمان بە ناوچەوانی خۆیدا کێشا و گوتی:

- ئەوەشتان زانی؟!

- لە ڕێگەی قسەکانتانەوە زانیمان.

- چۆن؟ خۆ ئێمە باسی چالاکییەکەمان نەکرد؟

شیرینی شۆخوشەنگ گوتی: وەك ئەوەی قسەکانی ئەو ئێوارەیەتانم هەمووی ئەزبەر کردبێت:

- هاوڕێکەت پێی گوتی. ئەمڕۆکە کێشە و ئاریشەیەکی زۆر و تەقوتۆقمان هەیە.

ڕەحمان دیسانەوە گوتی:

- ئافەرین ئافەرین... تۆ مانای تەقوتۆقیش دەزانیت، ئەو وشەیە تەنها فەڵەستینییەکان بەکاری دەهێنن.

شیرین گوتی:

- هەمووتان بەکاری دەهێنن.

- چۆن مەبەستی ئێمەت زانی؟!

- مەبەستەکە لە دەربڕینەکەتانەوە دیارە... بەڵام ئێمە نهێنییەکەمان پاراست.

ڕەحمان لاجانگی خۆی خوراند و گوتی:

- بۆ ئەمە دەبێ هەزار جار سوپاستان بکەین.

- تەنها لەبەر ئەوەی ڕژێممان لێ ئاگادار نەکردنەوە؟! ئاخر خۆ هەموو گوندنشینەکان هاوکاریی ڕژێم ناکەن، بەهەرحاڵ جاشەکان ناسراون و ئێمە هەموومان خۆمان لە شەڕ و گێچەڵەکانیان لا دەدەین، چونکە ئەو جاش و بەکرێگیراوانە جگە لە پارە هیچ هاوڕێیەکی دیکەیان نییە.

ڕەحمان بە سەربادانەوە گوتی:

- ڕاست دەفەرمووی. بەڵام تۆ پێم بڵێ چۆن بوونە لایەنێکی کێشەی نێوان دەستەکەی مام کاکیل و ئەوەی نزیک لە مام جەماڵە؟

سامان دەستی بە گێڕانەوەی هەموو چیرۆکەکە کردەوە، هەتا بچووکترین دیمەنیشی لە دەست نەدەدا، ڕەحمان پڕ بە هەردوو گوێچکەکانی گوێی بۆ شل کردبوو و وەکوو لایەنگیرییەك سەری بۆ دەلەقاند، لە کۆتاییدا ئاوڕێکی بۆ لای شیرین دایەوە و گوتی:

- ئەوەی پیاوەکەت کردوویەتی، مایەی سەربەرزییە، دەبێ تۆ شانازیی پێوە بکەیت.

سامان بە شەرمەوە سەری دانەواند، پاشان گوتی:

- ئێستا کە چیرۆکەکەمان و ئەو مەترسیانەشت زانی کە چاوەڕوانمان دەکات، بژاردەی خۆتە دەتەوێ بڕۆیت، یان لامان بمێنیتەوە. چونکە لێتی ناشارمەوە ترسی ئەوەم هەیە لە هەر

چرکەساتێکدا یەکێك لە پیاوەکانی مام جەمال بەدوامانەوە بن، خۆ ئەگەر ترسی شیرینم نەبووایە، منەتیانم نەدەزانی.

ڕەحمان گوتی:

- من دەزانم دەستی مام جەمال درێژە و ستەمکاریشە، لە پشتەوە دەستی خۆی دەوەشێنێت، چەندین جار لەگەڵ ئێمە و خەلکانی دیکەشیان کردووە، بە دەستێك تەوقەی لەگەڵ دەکردین و هەر کە یەك دوو هەنگاو لێیان دوور دەکەوتینەوە بە دەستڕێژی گوللەیان ساردیان دەکردینەوە، بەڵام گوێ مەدەرێ، من هەتا سبەینێش لەگەڵتان دەمێنمەوە و ناگەڕێمەوە هەتا دەبینم ئەو تراکتۆرەی ئێوە دەبات لە پێچەپێچەکانی ڕێگاکە لە چاوان ون دەبێت، بەڵام لەوێ چۆن تەگبیری حاڵی خۆتان دەکەن؟ چۆن دەژین؟

- لە ڕاستیدا لە ئێران زۆر نامێنینەوە، بە دڵنیاییەوە لە سەرەتاوە بارودۆخمان باش نابێت، بەڵام کارێك هەر دەدۆزمەوە، بۆ ئەوەی پارەی پێویست پەیدا بکەم، کە بەشی ڕۆیشتنمان بۆ فەرەنسا بکات. پێویستە مەحاڵ ئەنجام بدەم بۆ ئەوەی بگەمە ئامانجی خۆم.

ڕەحمان بە سەرسامییەوە گوتی:

- بۆ فەرەنسا بە تایبەتی؟ لەوێ ژیان ئەستەم و گرانە.

- لەبەر ئەوەی زمانی فەرەنسی دەزانم، لە زانکۆ فێری بووم.

ڕەحمان زیاتر سەرسام بوو و چاوەکانی ئەبڵەق بوون:

- کەواتە تۆ دەرچووی زانکۆشی! لە دڵی خۆمدا

دەمگوت ئاخاوتنی تۆ لەگەڵ گوندنشینەکان جوودایە.

سامان گوتی:

- هەر لەبەر ئەو هۆیەش لەگەڵ کۆمەڵەکەی مام کاکیل بوومە دۆست و هاوڕێ، لەبەر ئەوەی ئەوانیش هەموویان خاوەن بڕوانامەن، لەم ماوەیەی دوایی زوو زوو سەردانیان دەکردم، مشتومڕ و گفتوگۆی زۆر و بێئەندازە و بێکۆتایی لە نێوانماندا دەهاتنە ئاراوە... ئاخر زمانێکی هاوبەش لە نێوانماندا هەبوو، وێڕای جیاوازیی بۆچوون و باری سەرنجمان.

- بەڵێ، قسەکەت ئاشکرایە، جیاوازییەکانیش نابێ ببنە مایەی تێکدانی دۆستایەتی... باشە کەواتە بۆ لەگەڵیاندا نەمایتەوە، هەتا هاوسەرەکەتیش دەتوانێ چەك هەڵبگرێت و ببێتە پێشمەرگە... زۆر پێشمەرگەی ژنمان هەیە لەگەڵ هاوسەرەکانیان چەکیان هەڵگرتووە.

- لەبەر ئەوەی باوەڕم بەوە نییە کە ئەنجامی دەدەن، ئەو کارانەی دەیکەن هیچ ئامانجێکی نییە، وێڕای ڕێزم بۆ ماندووبوونیان.

ڕەحمان لە کاتێکدا هەرچی وشە و قسەی هەرزەکارانە و هەڵپەکارانەی لە مێشك و کەللەسەریدا هەبوو بە جۆشوخرۆشەوە دەریدەبڕی و گوتی:

- ئێمە لە جیهانێکی ڕەشدا دەژین، ئەوەش لە میانی ئەو خاڵە سپییانەی بە خوێنی خۆمان لە پێناوی نەوەکانی ئایندەدا دروستی دەکەین و دەیبەخشین.

سامان زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و گوتی:

- ئەو دەربڕینەت زۆر جوانە، ئێوە هەمووتان ئەو جۆرە

دەستەواژانە دەردەبڕن. پاشان قاقایەکی کرد و چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و بەبێ ڕق و کینەوە گوتی:

- هەر بە ڕاستی خۆشتانم دەوێ.

ڕەحمان گوتی:

- تەنها خۆشەویستیت بەس نییە، کەواتە لەگەڵماندا بمێنەوە، ئێمە پێویستیمان بە خەڵکی وەکوو تۆیە.

- بۆچی؟

سامان ئەو پرسیارەی لێ کرد و ڕەحمانیش وەڵامی دایەوە:

- لە پێناوی دوارۆژ، لە پێناوی نەوەکان.

لێرەدا سامان خۆی بۆ نەگیرا و بەوپەڕی هێزییەوە دایەوە قاقای پێکەنین و گوتی:

- لێرەدا بمێنمەوە لە پێناوی ئایندە و دوارۆژی نەوەکان؟!

پاشان بێدەنگییەکی درێژ باڵی بەسەرداکێشان، سەرنجێکی پڕ بەزەییانەی سرەواندە ڕەحمان، لەو کاتەی ئەو پەرداخە چایەی کە شیرین ئامادەی کردبوو دەیدایە دەستی و بە دەنگێکی هێمن و سازگارەوە لێی پرسی:

- پێم وایە زۆر کەستان لەگەڵدایە ماڵ و منداڵەکانی بەجێ هێشتووە و هاتۆتە ڕیزی ئێوە و ڕووی لە شاخ کردووە؟

ڕەحمان بە خێرایی وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ... هەڵبەتە هەن.

سامان قسەکەی تەواو کرد و گوتی:

- بە دڵنیاییەوە هەندێکیان توانای داراییشیان باشە و

منداڵەکانیشیان برسی نابن، هەندێکیشیان هیچیان نییە و منداڵەکانیان بە دەست برسێتییەوە دەناڵێنن.

ڕەحمان بە شانازییەوە گوتی:

- ڕاستە، ئەدی ئەو باوکانە پاڵەوان نین؟ ئایا لای باوك لە منداڵ ئازیزتر هەیە، کەچی دەیانکەنە قوربانی و دێنە ڕیزی ئێمەوە بۆ لێدانی دەسەڵات؟

سامان بێدەنگ بوو، بیری لەوە دەکردەوە چۆن مێشکی مرۆڤ بەو جۆرە دەشورێتەوە! بیرکردنەوەی ئەو خەڵکە تەواو هاوشێوەی یەکترین.

کاتێك بێدەنگییەکەی سامان درێژەی کێشا، ڕەحمان گوتی:

- ئایا جێگەی شانازی نییە نەوەکانی داهاتوو پەیکەری یادگاری بۆ ئەو پیاوە خۆبەختکەرانە دروست بکەن؟

سامان دەمودەست وەڵامی دایەوە:

- نەخێر، ئەو باوکانە شایانی پەیکەری یادگاری نین، بەڵکو هەتا ئەگەر دەسەڵاتیش بگرنە دەست، شایانی وەرگرتن و هەڵگرتنی هیچ بەرپرسیارێتییەکیش نین، لەبەر ئەوەی شایانی ئەوە نین.

- پیاوی باش بە قسەیەکی دیکە بکە!

سامان ئەمەی گوت و دڵیشی بە توندی دەگوشرا:

- ئاخر چۆن پشت بە باوکێکی تێکۆشەر دەبەسترێت، کە بیر لە بەختەوەری و خۆشی نەوەکانی داهاتوو بکاتەوەو ئایندەی چاوەڕوانکراویان بۆ بونیاد بنێت، کەچی ئەو لە ڕاستیدا هیچ شتێکی لێ نەزانێت، منداڵەکەی لەوپەڕی پەرۆشیدا بەجێ

هێشتبێت، منداڵەکەی حەز بکات وشەی بابە بەکار بهێنێت و گوێی لە وەڵامی باوکی ببێت، کەچی نە گوێی لە دەنگی دەبێت و نە هەرگیز خۆیشی دەبینێت؟ ئاخر پێم نالێی چۆن پەیکەری یادگاری بۆ باوکی لەو جۆرە دروست دەکرێت؟ ئایا ئەمە ئەوپەڕی دڵڕەقی نییە، هەتا ئەگەر ڕۆڵەکەیشی تێربێت و برسی نەبێت؟ ئەی دەبێ ڕات بەرانبەر ئەو باوکە چی بێت کە منداڵەکانی بۆ هەژاری و نەداری بەجێ دەهێڵێت و پارووە نانێك نەبێ بیخۆن و بەو حاڵەوە بەجێیان بهێڵێت لە برسان سکی خۆیان هەڵبگوشن، ئەویش بە خۆی پێبکەنێت و لە پێناوی نەوەکانی ئایندەی خۆشگوزەراندا تێ بکۆشێت؟ ئەوە چ گەوجی و گەمژەییەکە کە خەڵکی خۆی لەگەڵیدا دەگونجێنێت. چ مێشك شوشتنەوەیەکە تووشی دەبن و بەری دەکەون؟ باوکێکی لەم جۆرە چۆن بوێریی ئەوەی هەیە بەرپرسیارێتی وەربگرێت و کار بۆ بەرژەوەندیی خەڵکی و کچان و کوڕانی خەڵکی بکات و لە بنەڕەتیشدا منداڵەکانی خۆی بۆ دەردەسەری و دەربەدەری واز لێ هێنابێت؟ تۆ دەتەوێ باوەڕ بەو جۆرە باوکە بکەم چاکەی بۆ خەڵکی هەبێت، دوای ئەوەی ماڵ و منداڵەکەی خۆی ئازار و ئەشکەنجە دابێت؟! هەرگیز شتی وا بە مێشك و ویژدانیشمدا ناچێت.

پێ دەچوو ڕەحمان بیری ڕۆیشتبێت، بۆیە هیچ وەڵامێکی نەبوو. سامان هەستی بە ئازاری دەروونی دەکرد و فرمێسکی چاوەکانیشی دەدرەوشانەوە، گوتی:

- ئەو کاتەی فڕێیان دامە زیندانەوە، لەوێ دیمەنێکم بە چاوەکانی خۆم بینی، بۆیە هەتا من لە ژیاندا بم ئەو دیمەنەم لە یاد ناچێتەوە. لەو کاتەی لە ژێرزەمینێکی نیمچە تاریك بە زنجیر بە دیوارەکەوە بەسترابوومەوە، کە بریتی بوو لە ژوورێکی

گەورەی بێ پەنجەرە، تەنها بە گڵۆپێکی کز ڕووناکیان کردبووەوە، لێدان و ئەشکەنجەیەکی وایان دابووم بورابوومەوە و ئاگام لە خۆم نەمابوو، بۆیە بە شلوخاوی بە دیوارەکەوە شۆڕ بووبوومەوە و قاچەکانم توانای هەڵگرتنی جەستەمیان نەمابوو، نازانم چەند بەو حاڵەوە تێپەڕیبوو، کاتێك بە ئاگاهاتمەوە، لە ترسی ئەوەی نەبادا تووشی ئەشکەنجە و سزادانی زیاتر ببمەوە، وا خۆم دەردەخست کە هێشتا هۆشم نەهاتۆتەوە سەرخۆم. لەو ژێرزەمینە دۆزەخییە بێدەنگییەکی ترسناك باڵی بەسەردا کێشابووم. بەڵام بە دزییەوە، سەرنجم دا بووە ئافرەتێکی نزیکەی بیست ساڵان کە لەولامەوە لەسەر زەوی و لەژێر پێی گەنجێك خۆی گرمۆڵە کردبوو، پێ دەچوو هاوسەری بێت و لە هەمان تەمەنی هاوسەرەکەیدا بوو، ئەویش وەکوو من بە زنجیرێك بە دیوارەوە بەسترابووەوە. کاتێك جەللادەکان هاتن ئافرەتەکە دەستی بە جنێودان و هوتافکێشان کرد: بژی گەل! پیاوەکەیشی بە هەمان شێوە. ژێرزەمینەکەیان پڕ کردبوو لە هوتافکێشان و جنێودان و هاتوهاوار. جەللادەکان چاوەڕوانی ئەوە بوون بێدەنگ بن و واز لە هوتافکێشان بهێنن. دوای ئەوە قوڕگیان نووسا و گەروویان وشك بوو، ئینجا بێدەنگ بوون، یەکێك لە جەللادەکان قاقایەکی گاڵتەجاڕیانەی کرد و بە بێزارییەکەوە پێی گوتن: "ئەم پەڕانە واژۆ بکەن و ملی خۆتان بشکێنن. ئەگەر جارێکی تر بێنەوە ئێرە ئەم جارە وەکوو دوو تەرمی مردوو لێرە دەردەچن".

ئێمە هەموو دەمانزانی ئەو پەڕانە تەنها بەڵێندانی ئەوە بوو کە چیتر دژی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا کار نەکەن، ئەگەرنا سزاکەیان مەرگ دەبێت. بەڵام ئەو دوو هاوسەرە گەمژەیە ڕەتیان کردەوە لەسەر بەڵێننامەکە واژۆ بکەن، هەرچەندە ئەگەر وەکوو

تاکتیکێکیش بێت بۆ هەڵاتن و خۆدەربازکردنیان. جارێکی تر دەستیان بە هوتافکێشان کردەوە، جەللادەکان وازیان لێ هێنان و جێیان هێشتن. پاشان کاتەکە ئەوەندە بە قورسی تێدەپەڕی مرۆڤ نەیدەزانی درێژییەکەی چەندە. کاتێکی وا درێژ، هەر ڕۆژگارێك بوو بۆ خۆی و نەدەبڕایەوە. جەللادەکان جارێکی تر هاتنەوە ژێرزەمینەکە، یەکێکیان دۆشەکێکی ئیسفەنجی کۆن و شڕۆڵی هەڵگرتبوو و فڕێی دایە سەر زەوی، دوای چەند چرکەیەك ژنەکەیان خستە سەر دۆشەکە شڕۆڵەکە و ڕایانکێشا، ئەویش جارێکی دیکە دەستی بە هاوار و جنێودان و هوتافکێشان کردەوە، بژی گەل...! پیاوەکەیشی هەمان هەڵوێستی نواند، لە کاتێکدا هێشتا بە دیوارەکەوە بەسترابووەوە. پاشان جەللادەکان دوای ئەوەی جلوبەرگی ژنەکەیان دڕاند، یەك یەك دەستدرێژییان کردە سەری و لاقەیان کرد، بە ڕاستی دیمەنێکی قێزەون و مایەی هێڵنجدان و ڕشانەوە بوو. دوای ئەوەی هەموویان لاقەیان کرد، ئینجا لە تەنیشت پیاوەکەی بە ڕووت و قووتی بەستیانەوە، دوای ئەوە دیمەنێکی ملیۆن جار دژوارتر ڕووی دا، هەتا جەللاد و قوربانیش لە ئەنجامیدا شایانی نەفرەتکردن بوون، گوێمان لە هاوار و گریانی منداڵێك بوو، هێندەی نەخایاند منداڵەکەیان هێنا، وا پێ دەچوو لە تەمەنی چوار پێنج مانگان بێت، منداڵەکە گریانێکی وا دەگریا، وەك دەڵێین بەردی دەتاواندەوە، هەر بەو گریانەوە بۆ ماوەی نیو خولەکێك لە سینگی دایکیان نزیکخستەوە، بەڵام ئەو دایك و باوکە سەرشێتە مێشك داشۆراوانە، دەستیان بە جنێودان و هاوار و هوتافکێشان کردەوە، جەللادەکانیش چێژیان لەو دیمەنە ناشیرین و قێزەونە وەردەگرت.

سامان قسەکەی بڕی و لەژێر هەژموونی کاریگەرییەکی

دژوارەوە بێـدەنگ بـوو، دەسـتی بە ئاخـاوتن نەکـردەوە، هەتـا ڕەحمان لێی پرسی:

- دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

لێرەدا سامان داڕووخا و لێوی تەتەڵەی دەکرد و چاوەکـانی پڕ بوون لە فرمێسك، دەیویست پڕ بە ناخی بگرییێـت، بەڵام زۆر بە زەحمەت توانی خـۆی ڕابگرێـت، هاوسـەرەکەی لە باوەشـی گرت، ڕەحمان سەری داخست، سـامان بە دەنگێکـی خنکـاو و هەناسەیەکی پچڕپچڕەوە گوتی:

- جەللادەکـــان هەردوو قـــاچی منـــداڵەکەیان گـــرت و هەڵیانتلیشان و کردیانە دوو پارچە...!

لەم کاتەدا شیرین ڕەنگـی هەڵبزڕکـا، سامان سـەری خسـتە باوەشی خۆی، ماچێکی کرد و ڕوومەتی بە سینگییەوە نووسـاند. بەڵام ڕەحمان خۆی بۆ ڕاگیرا و بە بێدەنگی مایەوە.

دوای ئەوەی سامان خەم و ئازارەکـانی بەو چیـرۆکە بەتـاڵ کردەوە، بە دەنگێکی هێمنەوە گوتی:

- خەبـات و تێکۆشـان ئەوەیە بـزانین چـۆن ڕۆڵەکانمـان دەپارێزین، نەك چۆن بیانکەینە قوربانی، مـن دڵنیـام زۆرێـك لەو باوکـانە شـانازی بەوەوە دەکەن کە ڕۆڵەکانیـان لە پێنـاوی... لە پێنـاوی... کـردۆتە قوربـانی... تفـوو لەو جـۆرە خەبـاتە و لەو نیشتمانەش. دایکێکی فەڵەستینیم بینی شانازی بەوەوە دەکـرد کە ڕۆڵەکـانی بە دینـامێتەوە خۆیـان لەنـاو ژمـارەیەك لە دوژمنانیـان تەقاندۆتەوە، بەڵکوو هەتا دەیگوت واز لە منـداڵبوون ناهێنێـت و گەورەیان دەکات و هەموو ڕۆڵەکانی دەنێرێـت، تـاکوو خۆیـان بتەقێنـــنەوە و دوژمنـــی زیـــاتر بکـــوژن. ئەوە چ کولتـــوور و ڕۆشنبیرییەکی مەرگە تێیدا دەژیـن، ئەوە چ پرسێکی پیـرۆزە وا

شـایانی ئەوە بێـت دایکێـك قوربـانی بە ڕۆڵەکەی بـدات لە پێناویدا؟ هەرچەندە ئەگەر نرخی شۆڕشی هەژاران زیادبوونی برسێتیی ڕۆڵەکانیان بێت لەسەر ئەو برسێتییەی تێیدا دەژین، یان لە شـەقامەکاندا سـەرگەردانیان دەکـات بـۆ بەدەسـتهێنانی پارووەنانێکی کەم و مەمرەومەژی، کە پێشتر باوکیان بەرلەوەی بەجێیان بهێڵێت و ڕوو بکاتە خەبات و تێکۆشـان لە شاخ بۆی دابین دەکـردن. مـن ئەم ئـامرازە ڕەت دەکەمەوە هەرچەنـدە مەبەستەکەیشی مەزن و پیرۆز بێت، خەباتی ڕاستەقینە ئەوەیە کە بـاوك ئەو دەرد و بەڵایـانە دوور بخـاتەوە کە چـاوەڕوانی ڕۆڵەکانی دەکەن، هەمیشە بەسەر سەریانەوە بێت و لە هەژاری و نەداری بیانپارێزێت. دایکیش هەمیشە لەگەڵ منداڵەکانیدا بێت و سۆز و خۆشەویستی و کەمێك لەو خۆراکەیان پێ ببەخشێت کە باوك دابینـی کـردووە، ئایا ئەوە خەبـات نییە بـاوك ڕێگە لە دەربەدەربوونی منداڵەکانی بگرێت؟ یان خەباتێك نییە جگە لەوەی دایـك منـداڵەکانی بـۆ مەرگ و لەنـاوچوون بنێرێـت لە پێنـاوی ئاینـدەی نەوەکـان... هـا، دواڕۆژی نەوەکـان! ئەوە چ قێزەونییەکە ماسۆشیبوونەکەیان بۆیـانی دەهێنێت. دەك بە دۆزەخ بن، ئەوانە چ مرۆڤێکن و لە چ قوڕێك دروست کراون؟ مـن دەمەوێ لە یەك کاتدا هەم جەلـلاد و هەم قوربـانییش دادگـایی بکەم، نەك تەنها جەللادەکە، بەڵکوو دەمەوێ قوربانییەکە بەر لە جەللادەکە دادگایی بکەم، شۆڕشگێڕ بەر لە دەسەڵات دادگـایی بکەم...

تۆ تەماشای ناشیرینیی ئەو قوربانییە تێکۆشەرە بکە. من باسـی تێکۆشەرانی ژن دەکەم نەك تێکۆشەرانی پیاو. خۆی دەبێـت ژن نەرمونیانتر و هەست ناسکتر بێت لە پیـاو. باسی جەللادەکـانیش دەکەم، کاری ئەوانیش هێندە قێزەون و ترسناکە نەبێتەوە، بەڵام

تۆ بیر لەو دیمەنە واقعیـیە بـکەرەوە کە ڕووی دا... بە دڵنیـاییەوە بێژ لە خودی خۆت و خەباتی لەو جۆرەش دەکەیتەوە، خەبـاتی چی، بڵێ ئەو شێتییە. کاتێـك گەلـی ئێـران دژی شـا ڕاسـان و ڕاپەڕین، زرێپۆشەکان هاتنە ناو بازاڕ و ناو خەڵکـی، تێکۆشـەرە ژنەکـان چییـان کـرد بـۆ ڕاگرتنـی زرێپۆشـەکان؟ یەکێکیـان منداڵەکەی فڕێ دایە ژێر زنجیری تانکەکە، کاتێك زرێپۆشـەکە منداڵەکەی پان کـردەوە، شـوفێرەکە لە زرێپۆشـەکەی دابەزی و بەسەرخۆیدا کێشا و بەو تاوانەی ئەنجامی دابـوو ئە و دیـمەنەی بینی وەکوو شێت هەڵات و ڕۆیشت، ئەو شێتییە جۆشوخرۆشـی تێکۆشەرە ژنەکانی دیکەی زیاتر کـرد و ئەوانـیش منـداڵەکانیان فڕێ دایە ژێر زنجیـری زرێپۆشـەکانەوە، بەمەش توانییـان بە هەر نرخێك بێ زرێپۆشەکان ڕابگرن؟ ئەمە چ داڕووخـانێکی بەهـای مرۆڤایەتییە ئەو دایکە جەلـلادە شـێتانەی لێـوە هـاتن. جـا ئەگەر دایك بەو جۆرە منداڵەکەی بکوژێت و فڕێی بداتە ژێر زنجیری زرێپۆش و تانکەوە، ئەی کەواتە جەللادەکان چـی بـکەن؟! ئەو دایکە چۆن دەبێ لە ژیاندا بمێنێت کە بە چاوی خۆی ببینێت و بە گوێی خۆیشی گوێی لە هاوار و ئازاری کۆرپەکەی بێت کە بەو جـۆرە دەهاڕدرێـت و پـان دەکـرێتەوە، تاوانبـاریش خـودی خـۆی بێـت؟! نـازانم چـۆن شـێت نابێـت؟! دەبینـی ئێسـتا لەنـاو هاوڕێکانیدا بە سەربەرزی و شـکۆمەندییەوە دانیشـتووە، چـونکە کـوڕە ئـازیزەکەی نـاخی جـگەری خـۆی لە پێنـاوی نیشـتماندا بەخشیوە. هەی هەزار نەفرەت لەو نیشتمانە. ئێسـتاش لەم جەنـگە زیانبەخشـەدا کە خەڵکـی وەکـوو ئـاش دەهاڕێـت و بەرداشـی ئاشەکەش لە هاڕینی خەڵکی دیـکە بەردەوامە لە نێـوان هەردوو وڵات، دڵنیام دوا تنۆکی پیـرۆزی لە قەوارەی مرۆڤـدا تکـاوە و نەماوە.

ئاخر تۆ سەرنج بدە، هێزێکی ئێرانی بەرهەڵستکار هەن شانبەشانی دیکتاتۆرەکەی ئێمە دژی وڵاتەکەی خۆیان دەجەنگن، لەگەڵ جەللادەکانی ئێمەدا هاتن و بە گەڵابەیەکی گەورەی پڕ لە خەلکی سڤیل و ژن و منداڵ و پیاو، نازانم لە کوێوەیان هێنابوون و لە کوێش کۆیان کردبوونەوە، چاڵێکی گەورەیان بە شۆفەڵ بۆ لێدان و هەر لە دوورەوە گەڵابەکە هێواش هێواش بەرەو دواوە کشایەوە، هاوار و گریان و ڕۆڕۆی ژن و منداڵ و ئەو خەڵکە دەشتودەری پڕ کردبوو، بەرلەوەی گەڵابەکە بگاتە سەر چاڵەکە منداڵێکی نزیکەی هەشت ساڵان کەوتە تەنیشت گەڵابەکەوە، شوفێرەکە عارەبانەی گەڵابە پڕ لە مرۆڤەکانی بەرز کردەوە و یەك لە دوای یەك دەکەوتنە ناو چاڵەکەوە، هاوار و فیغانیان بەری ئاسمانی گرتبوو، جەللادەکانیش لە دەوری چاڵەکە کۆ بووبوونەوە و بە شانازییەوە سەرنجی دیمەنەکەیان دەدا، لەو کاتەدا یەکێك لە ژنە جەللادە نیمچە قەڵەوەکان کە بەرگێکی سەربازیی زەیتوونی لەبەردابوو بە ڕاکردن بۆ لای منداڵە هەشت ساڵانەکە ڕۆیی، بۆ منداڵەکە چەمایەوە کە لەو کاتەدا وێڕای ئەو گریان و هاتوهاوارە ئەو دۆش دامابوو و بە بێدەنگی سەیری ئەو دیمەنە تۆقێنەرەی دەکرد و ترس و دڵەڕاوکێ باڵی بەسەر ڕوخساریدا کێشابوو، ئەو ژنە جەللادە لەجیاتیی ئەوەی لە باوەشی بگرێت و بە سینگییەوەی بنووسێنێت و دڵۆپە فرمێسکێکی بۆ بڕژێنێت و بیپارێزێت، یان لە سەرووی خۆی بۆی بپارێتەوە کە وازی لێ بێنن، بەڵکوو دەست و قاچی گرت و لەژێر ئۆتۆمبیلەکەی دەرهێنا، بە هەناسەبڕکێ بەرەو چاڵەکە ڕای کرد و منداڵەکەی فڕێ دایە ناوییەوە، دەمودەست شۆفەڵەکان دەستیان بە پڕکردنەوەی چاڵەکە و زیندەبەچاڵکردنی ئەو هەموو مرۆڤە کرد و لە ماوەیەکی کەمدا ئەو خەڵکە بە هاوار و پاڕانەوە و

باوکەڕۆیـان بـۆ هەتاهەتـایە خـرانە ژێـر خـۆڵەوە و زینـدەبەچاڵ کران.

ئەو ژنە بەرگ زەیتـوونییە لە وڵاتەکەی خـۆی بە قوربـانی دادەنێـت و لە هەمـان کاتیشـدا لێـرە خـۆی بە قارەمـان و بەرهەڵستکارێکی تێکۆشەر دەزانێت. ئەوەش لە ڕوانگەی ئەوەی قوربانیی یاخی بوو بەپێی ئەو پێوەرانە لێرە دەبێتە تێکۆشـەرێکی قارەمـان... ئەو وڵاتـانە چەنـد شـایانی نەفرەتلێکـردن و ئەو گەلانەش چەندە شایانی نەفرەتن کە بەو جۆرە ڕەفتار دەکەن؟! ئایا پێت وایە دیکتاتۆرێتییەکانی ئەو وڵاتانە لە هیچەوە هاتوون و سەریان هەڵـداوە؟! ئەو هەمـوو دیکتـاتۆرانە ڕەنـگ و دەنـگ و ڕەفتـار و هەڵسـوکەوتیان هەرچیـیەك و هەرچۆنێـك بـووبن، لە هـیچەوە نەهـاتوون، بەڵکـوو لە خـودی ئەو گەلە بەدبەختـانەوە خولقاون و سەریان هەڵداوە و دەسەڵاتیان گرتـۆتە دەسـت، مـن ئەم جۆرە گەلە ڕەت دەکەمەوە و توانای ژیانکردنیشم لەگەڵیان نییە، بۆیە دەڕۆم و سەری خـۆم هەڵـدەگرم، دەزانـی بـۆ؟! پێـت دەڵێم: لەبەر ئەوەی ئەم خاکە بۆ دروستکردنی مرۆڤە جەلـلاد و بکوژەکان دروست کراوە، ئەم خاك و زەوییە بۆ ئەوە دروسـت کراون مرۆڤ بـکەنە پاشـماوەی مـرۆڤ، ئینجـا مرۆڤکـوژ، یـان کوژراو و قوربانییان لێ دروست بکەن، منـیش لێـرەدا بمێـنمەوە یان دەبمە بکوژ، یان کوژراو، کەواتە نامەوێ هیچ کامێکیان بم.

ڕەحمان بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت و بێـدەنگیی هەڵبژارد. ئاخر دەبێ بەرانبەر ئەو ڕاسـتییانەی کە لەگەڵ خـودی خۆیدا باش دەیانزانێت چی بکات و چی بڵێت؟! بە تـایبەتی کە خۆیشی تاڵاوی مەرگ و ئەشـکەنجە و ئـازاری لە زیندانەکانـدا بە گەروودا کرابێت، لەسەر هیچیش نا، تەنها لەسەر دوو وشەی ناڕەزایی. پاشـان لە مێشـکیدا یـادەوەرییەك وریـای کـردەوە، کە

هێشتا تازە بوو و مۆتەکەیەکی ترسناك و لە ناخی مرۆڤدا خەم و خەفەت و مەرگ و لە نـاوچوون دێنێـتە ئـاراوە و جەختـیش لەسـەر قسـەکەی سـامان دەکـاتەوە، بەوەی ئەم وڵاتە بـۆ ئەوە دروست کراوە مرۆڤەکان بگۆڕێت و بیانکاتە بکـوژ و جەلـلاد، یان قوربانی و کوژراو.

ناخی ڕەحمان ناخێکی پاك و بێگەرد و جـوان بـوو، وەکـوو ناخی منداڵێکی ڕووخۆش. عاشقێك بوو لەگەڵ خۆشەویسـتی و ژیاندا دەتـوایەوە و حەزی لە جـوانی بـوو. پـاك و بـێگەرد و بە بەزەیی و باش بوو. ئەو خەسڵەتانەش بەس بوون بۆ ئەوەی بیبەنە دەباغخانەی مرۆڤەکان و پێستی لە جەستە دابماڵن و شێواندنێکی وا ترسناك و تـۆقێنەر بیشـێوێنن، هەر نەبێـتەوە، بە چـاوی خـۆی سەیر و سەرنجی وڵاتێك بدات پڕاوپڕ لە هـاوار و هەر هـاوار و داد و فیغـان، هــاوار و بێــدادییەکی بێکۆتــایی تــاکوو واز لە وردوخاشــکردن و وێرانکردنــی بهێــنن. بەڵام پێکەنینەکەیــان و گاڵتەجاڕییان بە ئـازار و خەمەکـانی، تـاکە وەڵامـی هەمیشـەییان بوو... جەستە لەڕولاواز و کپ و بێدەنگەکەیشی هەڵگری ئـازار و ئەشکەنجەکانیان بوو، بەمەش ئازاری کاولکـاری بـاڵی بەسـەر هەموو شتێکدا کێشا... هەموو شـتێك... بەسـەر هەسـت و نەسـتە ناسکەکانی و بەسەر خۆشەویستی و خۆشییەکانی، خەم و گریان و ئەندێشەکانی، بەسەر دەنگ و ڕەنگ و جۆشوخرۆشی، بەسەر بێــزاری و پێکەنینەکــانی، بەســەر منــداڵێتی و هەرزەکــاری و گەنجێتــی، بەســەر هەمــوو جیهــانە شــێتانە بــۆگەن و ســەخت و دژوارەکەی. پاشــان ماســولکەکانی جەســتەی خــاو بــوونەوە و کێشــی زیــادی کــرد، تــا وای لــێ هــات توانــای جووڵانــدنی بەشێکیشی لە جەستەی نەمێنێت. تەم و تارماییەکی خۆڵەمێشی و

تۆزاوی چاوی داپۆشی، کەللەسەری پڕ بوون لە دەنگێك نزیك لە دەنگی تەقوهوڕی مەنجەڵ و قازان، تا وای لێ هات وەك ئەوەی بخزێتە ناو قووڵایی زەوییەکی لماوییەوە، یان زەلکاوێکی قوڕاوی قووتی بدات و هێدی هێدی بەرەو قووڵایی و ناخی زەوی ببات، مەرگیش بە خێرایی هەڵبکوتێتە سەری و نقومی بکات و بە هێواشی و لەسەرخۆ بخنکێت و بمرێت. پاشان دەنگی پێکەنینەکانیان دەگۆڕێت بۆ دەنگی ترس و تۆقین و لەگەڵ لێدانەکانی دڵی تێکدەقژێن: "چەندە کات تێپەڕیوە؟" بیر دەکاتەوە و لەگەڵ خۆیدا دەپرسێت... کات بوونی نییە. لێدانەکانی کاتژمێرەکە ڕادەوەستێت لە کاتی شۆڕبوونەوە بۆ ناو بازنەی شێواندنی مرۆڤایەتی. مۆتەکە تۆقێنەرەکان! ترس، ژان، ئەشکەنجە دەبنە پاشای شوێنەکە و باڵی بەسەردا دەکێشن: "من لە کوێی ئەم جیهانە تاریك و قێزەونەدام؟ من جگە لە بووکەڵەیەکی فڕێدراوی ژێرزەمینێکی شێدار و تاریك و توون بەولاوە شتێکی تر نیم، لەوێ کات بوونی نییە، شەو لە ناوەڕاستی ڕۆژدا تاریك و ئەنگوستەچاو، نە ئەستێرە دەیڕازێنێتەوە و نە مانگ. کات ڕاوەستاوە، ژیان سەرەوخوار ڕێ دەکات، هەموو شتێك سەراوبن و ئاوەژوو بۆتەوە، مرۆڤەکان بە ئاوەژوویی لە دایك دەبن! بە گەورەیی دێنە دونیاوە. پاشان بچووك و بچووك و هەر بچووکتر دەبنەوە، تاکوو وەکوو مرۆڤ لە بەرچاوان ون دەبن و نامێنن! جەستەشیان هەر گەورە و گەورە و گەورەتر دەبێت. ئەو جەلـلادانە هەر بە گەورەیی لەدایك بوون، دایکیان بە گەورەیی هێنایانییە دونیاوە، ئەو کاتەی هێشتا منداڵ بوون و خەندە و پاکژییان لێ دەباری، بە تێپەڕبوونی ساڵەکانیش منداڵ بوونەوە و جەستەشیان گەورە و

گەورە و گەورەتر دەبوون، ددانەکانیشیان گۆڕان و بوون بە کەڵبەی تیژ و خوێنمژین، خەندە منداڵانەیی و جوان و پاك و بێگەرد و نەرمونیانییەکەیان هێدی هێدی ون بوون و هیچ شتێك شوێنی نەگرتنەوە، نە خەندە و نە گرژومۆنیش. نە خەم و نە خۆشیش. مێشکی منداڵە بچووکە گەورەکە نەما و سڕایەوە و هیچ شتێك شوێنی نەگرتەوە. ئاخ... ئاخ و دیسانەوە هەر ئاخ، ئاخ لەم سرووشتە، دەبێ چی هەبێت و چیشی بەسەر هاتبێت؟ ئایا شێت بوو، یان منم شێت بووم و هۆشم نەماوە؟! ئایا ڕاستە هەموو شتێك ئاوەژوو بۆتەوە و سەراوژێر ڕێدەکات و دەڕوات؟ بەڵام ئەی خوایە نەفرەت، سۆزانییە ئازارچەشتووەکان، کێ دەڵێ ئەو زۆڵانە بە منداڵێتی لەدایك بوون و لەگەڵ خۆیاندا خەندەی جوان و پاك و بێگەردیان هەڵگرتبوو؟! خۆ لەوانەیە هەر لە بنەڕەتدا مرۆڤ نەبووبن، ئەوانە ئەهریمەنن ئەهریمەن بە ماسکی مرۆڤەوە. لەوانەیە دایکیان بە کەڵبەی تیژەوە ئەوانی بووبێت، کاتێکیش بۆ ژیان شیریان پێدان، گازیان لە مەمکی دایکیان گرتبێت و لەوانەشە هەر خواردبێتیان و ڕۆچووبنە ناو جەستەکانیشیانەوە، بەوپەڕی بێبەزەییانەوە دڵیشیان خواردوون، ژیانیان لەو سکانەوە مژی کە ئەوانی هێنایە بوون. ئەوانە ئەهریمەنی شێتن و وایان لە مرۆڤ کردووە ببێتە بووکەڵە بۆیان و یاری و گەمەی پێ بکەن. فڕێی بدەنە سەر زەوی و بە پێیەکانیان بیانپلیشێننەوە و بەوپەڕی گەمژەیی و گاڵتەجاڕییەکی دۆڕاوەوە پێیان پێبکەنن. ئەوان بووکەڵەی زۆریان هەیە، گەمەی لەگەڵ بکەن و کاتی پێ بەسەر ببەن، ئەگەر یەکێکیانیش شکا، فڕێی دەدەنە ناو خۆڵ و خاشاکەوە و ئۆتۆمبیلی زبڵەکەش دێت و پاککەرەوەکان هەڵیدەگرن و فڕێی دەدەنە کەناری شار و

دانەیەکی تر بۆ خۆیان دێنن. ئەگەر هیچیان دەست نەکەوت، ئەوا لە هەر مرۆڤێك بێ دانەیەك دروست دەکەن و پاشان وردوخاشی دەکەنەوە. ئەگەر هەموو بووکەڵەکانیشیان شکا و لەناو چوون، ئەوا هەندێك لە خۆیان دەکەنە بووکەڵە و پاشان وردوخاشیان دەکەن، ئەوەش سەربوردەی ژیانیان و یاسای مانەوەیانە. وای لەو ترسناکییە، وای وای! ئایا ژیان بەو جۆرە دەبێت؟! ئایا دەبێ ژیانی بوونەوەرێك تەنها لەسەر ژیانی بوونەوەرێکی دیکە بێت؟ ئەرێ هۆ کوڕی ماسییە بۆگەنەکان...! ئەرێ هەر بە ڕاستی ژیان ئاوەژوو بووەتەوە و بە پێچەوانەوە ڕێ دەکات؟!

# بەشی بیست و یەکەم

سێ کاتژمێر تێپەڕیوە لەو کاتەوەی ڕێنیشاندەرە لادێییەکە ماڵئاوایی لە سامانی هاوڕێمان کردووە و گەڕاوەتەوە بۆ گوندەکەی خۆی "پشتئاشان"، بەڵام بە هۆیەك لە هۆیەکانەوە لە ڕێگەی خۆی لای داوە و بەو ئاراستەیەدا ڕۆیشتووە کە داروپەردووی گوندە ڕووخاوەکەی لێیە و ئاراستەیەکی دیکەی گرتووە، تاکوو بیگەیەنێتە گوندی ئەو جووتیارەی ڕەحمانی بینی لە گۆڕەکەی هاتە دەرەوە. ڕۆیشتنی ڕێنیشاندەرەکە نزیك بوو لە گورگەلۆقە و دواتریش ڕاکردن. بە هەموو لایەکدا دەیڕوانی و لەگەڵ هەر هەنگاوێکیشیدا تا دەهات ترس و تۆقینێکی زیاتر ڕوخساری دادەگرت. کەس نەیدەزانی گورگ هۆی دڵەڕاوکێکەیەتی، یان چیرۆکی لە گۆڕ دەرچوونی مردووەکان. لەوانەشە هەردوو چیرۆکەکە بن. لە چرکەساتێکی لە ناکاو لە دوورەوە هەندێك کەسی بە دی کرد شێوەیان ئاسایی نەبوو، جلوبەرگەکانیان لە کۆنەپەڕۆ و شیتاڵ دەچوون، ریشیان ڕەش و درێژ، قژیان گف و دەگەیشتە خوار شانیشیانەوە، تەنکە تەمومژێك تا ئێستا نیمچە داپۆشینێك، داپۆشیون، پێویستیی بە کات هەیە بۆ ئەوەی بڕەوێتەوە و بەرچاوی ڕوونتر ببێتەوە. جلوبەرگەکانیان بە بەفرێکی پەڕەکراوی وەکوو پەمۆی نەرم داپۆشراوە، وا پێ دەچێت لەژێر درەختێك دانیشتبن و لە ناکاو لەسەر لقوپۆپی درەختەکەوە

سمۆرەیەك بەفری سەر دارەکەی بەردابێتەوە سەریان، بۆیە بەپەلە هەستابێتن و بە هێواشــی دەســتیان بە ڕۆیشــتن کــردبێتەوە، ئاخر ئەوان زۆر ماندوو و نەخۆش و برسیش دیارن، یـان وەك ئەوەی لە ڕێگەیەکی زۆر دوورەوە هـاتبن و تـا ئاستێکی وا مانـدووی کردبن، توانای لادانــی ئەو بەفرەیـان لە ســەروگوێلاکی خۆیـان نەبێت کە لە درەختەکەوە کەوتـۆتە ســەریان، یـاخود ئەوان هەر خۆیـــان وان و گـــوێ بە هـــیچ شـــتێك نـــادەن و ســـەنگ و بەهایەکیش بۆ هیچ شتێك دانـانێن، بە تـایبەتی ئەم ژیـانە کە بە لای ئەوانەوە واتـــا و بـــایەخێکی ئەوتـــۆی نیـــیە، ئەوان لە هەر شـوێنێك بـن ڕەشـماڵی خۆیـان هەڵـدەدەن و لێـی ڕادەکشـێن و دەخەون، بە ســکی برســییەوە بە ســەر ئەم بەفــرە چــڕەدا ڕێ دەکەن، هەتا قاچەکانیـان توانـای ڕاکێشـانیانی هەبێـت، هەر ڕێ دەکەن و دەڕۆن. "ئەوانە بێگومان مردوون". ڕێنیشاندەرەکە دوای ئەوەی لێیان دڵنیا بوو وەکوو تیر لە کەوان دەرچێت، ئاوا بـۆی دەرچــوو، دوای ڕۆیشــتن و تێپەڕبــوونی مــاوەیەکی بــاش ئەو گوندەی بینی کە بۆی دەچوو. لە دوورەوە وا دەردەکەوت کە چۆلوهۆلە و هیچ کەسێك تیایدا هاتۆچۆ ناکات و جووڵەی تێدا نییە. وێڕای ئەوەی دووکەڵی لوولەی زۆپاکـانی دەبینــی وەکــوو هەورێکی خۆڵەمێشی لە مزگەوتەکەو دوو ماڵی دیـکەوە بەسـەر ئاسمانی گوندەکەدا پەرتوبڵاو دەبوونەوە، ئەوەتا ئێستا وا گــوێی لە حەپەی سەگەکانە، چاك دەیزانی کە هۆکاری ئەو ســەگوەڕە هــاتنی ئەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا بیــری لەوە دەکــردەوە کە لەوانەیە ســەرچاوەی ئەو ســەگوەڕە مــردووە زینــدووەکان بــن. گوندنشـــینەکانیش تـــرس و دڵـــەڕاوکێ دەیتۆقانـــدن کاتێـــك

گوێیـــان لە دەنگی سەگەکانیان دەبـوو و وایـان دەزانـی ئیـدی ئەوە مردووەکانن و زیندووبوونەتەوە و بۆ لایان دێن، گوندنشینە ڕێنیشاندەرەکە، دەستی بە بانگەبانگی خەڵکی گوندەکە کرد بـۆ ئەوەی لە پەلاماری سەگەکانیان بیپارێزن کە لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دەدا و ئەو هەوڵی دوورخستنەوەیان لە خـۆی دەدا و بە دارە درێژەکەی دەستی لە خۆی پاسی دەکـردن، لەو کـاتەدا گەیشتبووە بەر دەمـی یەکێـك لەماڵەکـان، گەنجێـك لە مـاڵەکە هاتە دەرەوە و بە سـەر سـەگەکاندا هـاواری کـرد و بەر تـۆپەڵە بەفری دان، بەڵام بەرلەوەی تۆپەڵە بەفرەکانیان بگاتێ و ئازاریان بــدات هەر لە ڕێــوە تۆپەڵەکـــان لە هەوادا هەڵدەوەشـــانەوە، گەنجەکە ڕێنیشاندەرەکەی بردە ژوورەوە. ئەو گەنـجە زاواکەی بـوو کە مــاوەی چەنــد مانگێــك بــوو هاوســەرگیری لەگەڵ کچەکەی کردبوو، باوکەکەش لەو کـاتەوە تەنهـا جارێکی تـر ســەردانی کــچەکەی کردبــوو، ئەو ســەردانەش تـا ڕادەیەك ماوەیەکی باشـی بەسـەردا تێپەڕیـوە. ئـاخر ئەو ڕێنیشـاندەرە خـۆ کەسـێکی پیـر و بەسـاڵاچوو نەبـوو، بەڵکـوو هێشـتا تەمەنـی نەگەیشتبووە چل ساڵیش، ئەو کاتێك هاوسەرگیری کـرد هێشـتا تەمەنـی پـازدە بەهـاری تێنەپەڕانـدبوو، لەو کـاتەوە نیـو دەسـتە منداڵیان هێنـابووە دونیـاوە، ئیـدی بەو شـێوەیە بەردەوام بووبـوو، تاکوو هاوسەرەکەی توانای منداڵخستنەوەی نەمابوو. ئەم پیاوە بۆ کارێك ڕووی لێرە کردووە و دەیەوێ زاواکەی لەگەڵ خۆی لە کارێکدا بەشداری پێ بکات، ڕێنیشاندەرەکە پێی وابوو خەریکە گرێبەستی تەمەن بەدەست دەهێنێت، ئەگەر ڕۆژی دوایـی بەرپـا نەبێـت و کۆتـایی بە دونیـا نەیەت و خـوا بـۆ ڕۆژی لێپێچـینەوە

بانگیان نەکات. بەمەش گرێبەستەکە لە دەست دەچێت و هەر لە بنەڕەتەوە لەناو دەچێت.

لە یەکەم بینینی کچەکەی کە خەریك بوو دەستی ماچ دەکرد، پێی گوت:

- هاتووم لە بارودۆخت دڵنیابم و لە نزیکەوە بتبینم، دوای ئەوەی هەواڵی شوومی ئەو مردووانەمان بیست کە بە ڕێگەدا دەڕۆن، ئەوە لە ڕۆژی حەشر دەچێ، خەڵکی گوندەکە بۆ کوێ چوون؟

زاوا گەنجەکەی گوتی:

- لە مزگەوتن نوێژ دەکەن... جگە لە نوێژکردن و پاڕانەوە و پەرستنی خودا بەولاوە هیچ شتێك دەربازمان ناکات و ئەو مردووانەمان لە کۆڵ ناکاتەوە. من فەرمانی مەلای گوندەکەم پێیە بۆ بردنی هاوسەرەکەم بۆ ئەو شوێنەی کە ژن و منداڵەکانی لێ کۆ دەبنەوە.

باوکەکە پرسی:

- بە تەنها لەگەڵ منداڵەکان؟

- نەخێر، کەسانێك هەن پاسەوانییان دەکەن.

- نابێ تۆ هاوسەرەکەت بەجێ بهێڵیت، لەگەڵیدا بمێنەوە.

- بەجێی ناهێڵم. منیش لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبم کە دەیانپارێزین و پاسەوانییان دەکەین.

- کەواتە با بڕۆین، من دەچمە لای ئەوانەی لە مزگەوتن، چونکە وا دیارە خودا فەرمانەکەی لەسەرمان دواخستووەو هێشتا ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە نەهاتووە، دەمەوێ دەربارەی

بابەتێك قسەت لەگەڵ بکەم، کە لەوانەیە بۆ هەردووکمان داهات و قازانجێکی باشی تێدا بێت و بەشی چەندین ساڵمان بکات، بەڵام ئاگادار بە ها، ئەمە نهێنییەکە ئەگەر نەیپارێزیت لەوانەیە سەرمان تێدا بچێت و ئەنجامەکەی بۆ هەردووکمان خەراپ بێت و لەوانەیە ماڵوێرانیش ببین.

هەرسێکیان دەرچوون و بەمەلا و بەولای خۆیاندا دەیانڕەوانی لە ترسی ئەوەی نەبادا مردووەکان پەلاماریان بدەن. ڕوویان لە مزگەوتی گوندەکە کرد، دەنگی نوێژکەران بەرز دەبووەوە و لە دەرەوە گوێت لە دەنگیان دەبوو، ڕێنیشاندەرەکە ڕاستەوخۆ بۆ لایان چوو، دەرکەوتنی لە ناکاوی بووە هۆی شڵەژان و دڵەڕاوکێی زیاتری ئەوانەی لەوێ کۆ بووبوونەوە، بەڵام بە خێرایی هێور بوونەوە و پرسیاربارانیان کرد، ئەویش بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە وەڵامی دەدانەوە و جڵەوی خەیاڵ و وردە درۆشی بۆ وەڵام و گێڕانەوەکانی شل کردبوو، لەناو ئەو هەواڵ و دەربڕین و قسانەی پێی گوتن، ئەو لە ڕێگە تووشی مردووەکان بووە و هەموویان بە ئاڕاستەکانی لای ڕۆژهەڵات بەرەو ئێران ڕۆیشتوون و هەتا بەرەو گوندەکەی ئەویش، هەندێکیشیان بە ئاڕاستەی ئەمدا هاتوون و لەوانەیە بەم زووانە بگەنە جێ، ئەوەیشی گوت کە شێوە و ڕوخساریان تۆقێنەرە، دوای ئەوەی هەموویان بێدەنگ بووبوون و سەرتاپای جەستەیان کردبووە گوێچکە و بە هەموو توانایانەوە گوێیان لە ڕێنیشاندەرەکە گرتبوو، یەکێکیان هاواری کرد و گوتی:

- من ئەمەم پێ گوتن، ئاخر من بە چاوی خۆم ئەوانم بینی لە گۆڕەکەیانەوە دەهاتنە دەرەوە، پێویستە ئێوە باوەڕم پێ بکەن.

مەلای گوندەکە گوتی:

- کوڕی خۆم ئێمە بە درۆت ناخەینەوە و گومانیشمان لە قسەکانت نییە، ئەگەرنا لێرە کۆ نەدەبووینەوە و کوڕەکەی خۆم بۆ لای خواناسان نەدەنارد بۆ ئەوەی لەم بەڵایەدا ڕێنوێنی و یارمەتیمان بدەن، خودا ئێمەی خۆش دەوێت، ئەوەتا لە بەختی ئێمە خەڵکی خواپەرست و ئایینداری ماوەی چەند ڕۆژێکە ڕوویان لە ناوچەکەمان کردووە و نزای سەلامەتیمان بۆ دەکەن، کوڕەکەی منیش یەکێکە لەوان و هەتا بڵێی لێی ڕازی و سەربەرزم کە هەموو ژیانی خۆی بۆ خزمەتی خەڵکی تەرخان کردووە و دونیا و خۆشییەکانی داوەتە لاوە و خۆی بۆ بەدەستهێنانی ڕۆژی دوایی ساز و ئامادە کردووە، لەوەش دڵنیای کردمەوە، کە ئەوان نێوەندگیریی نێوان خەڵکی و ئاسمان دەکەن، هەتا مردووەکانیش لە بەردەمیاندا کڕنۆش دەبەن و چۆک دادەدەن و لای خوا داوای لێبوردن و نزایان بۆ دەکەن.

ڕێنیشاندەرەکە جارێکی تر دەستی بە قسان کردەوە و هەواڵی ئەو گوندەی پێ ڕاگەیاندن کە لەسەر سنوور تووشی هێرشی گورگەکان بووە، بە جۆرێك باسی دەکرد و جڵەوی خەیاڵ و ئاخاوتنی شل کردبوو، هەر مەپرسە، وا شوولی لێ هەڵماڵیبوو، هێز نەبوو خۆی لە قەرەی بدات، درۆ بە درۆی دەگوت ڕێم بکە تا جێت بکەم، تا گەیشتە ئەوەی بڵێت نیوەی پیاوەکانی گوندەکە گورگ لەتوپەتی کردوون و خواردوویانن، ئامادەبووانیش کە نزیکەی پازدە کەسێك دەبوون بە هەموو دەنگیان هاواریان دەکرد و لە خوا دەپاڕانەوەو (ئەڵڵاهو ئەکبەر) بەری ئاسمانی گرتبوو و داوای ئەوەیان لە خوا دەکرد لەو بەڵایە دووریان بخاتەوە و بیانپارێزێت.

هەستانەوەی مردووەکان شتێك نییە، جگە لە ئاماژەیەك بۆ ئەوەی ڕۆژی کۆتایی نزیك بۆتەوە و مردووەکان و

زینـــدووەکان پـــێکەوە لە بەردەم خـــوادا دەوەســـتن و هـــیچ تکاکارێکیشیان نییە، تەنها ئەو نوێژ و چاکە و خێرانە نەبێت کە ئەنجامیان داوە و بۆ خۆیان کۆیان کردۆتەوە. هەندێکیان تێدابوو گومانی لەوە هەبوو کارە باشەکانی بەسەر خەراپەکانیدا زاڵ بن، وەك ئەوەی هەر ئێستا لەو ڕاستییە بە ئاگـا هاتبێـت و پێشـتر ڕۆژێك لە ڕۆژان حیسابی بۆ نەکردبێت، بۆیە ڕووی گـرژ و مرومـــۆچ و بێـــدەنگ و تاســـەبار لە ترســـان ڕەنگـــی زەرد هەڵبزڕکابوو. خۆ لەوانەیە لەو ئانوساتەدا خانەکانی مێشکی لە بیرکـــردنەوە ڕاوەســـتابن و یـــادگەی بە تەواوی ســـڕدرابێتەوە، ئەوەندە شپرزە و نابووت دەهاتە بەرچاو، یەکێکیان دەیگوت: هەی قوڕ بەسەر ئەوەی گوناهبارە، دەبێ لەو دونیا چی لێ بکەن؟! یەکێکی دیکە بەوە دڵخۆش بوو کە تا ئەو کاتە زیندووە، کەواتە پێویستە بەرلەوەی کات تێپەڕێت و بڕوات، وەك دەڵێن هیچ شتێکیش لە زیکر و خوداپەرستی و نوێژکردن بۆ بەدەستهێنان و مسۆگەرکردنی ئەو دونیا باشتر نییە و دەرفەتە و دەبێ شتێك بۆ ئەو دونیای کۆ بکاتەوە! پێم نالێن چی وای کرد ئێوەی خواناس و موسڵمان، ئێوەی خاوەن چاکە و کاری باش وا لە خوداپەرستی دوا بکەون، دەی زوو کەن کات درەنگە و هەر نەبێ فریای تۆبەیەك و شادە ئیمانێکی بە حەق بکەون.

ئەو پیاوە لە شوێنی خۆی هەستا و بە هەموو توانای خۆیەوە هاواری کرد و هەتا لە توانایدابوو وشەکەی درێژکردەوە "حەیییییییی"، ئیدی چەند کەسێکی دیکەش چوونە پاڵی، پاشان هەموو ئەوانەی لە مزگەوتەکە بوون، دەستیان پێ کرد و سەر و جەستەیان بە لای ڕاست و بە لای چەپدا ڕادەوەشاند و هەموو پێکەوە هاواریان دەکرد و دەیانگوت "اللە حی"، "اللە

حی"یـــان دووبـــاره و ســـێیاره دەکـــردەوە، هێـــدی هێـــدی جۆشوخرۆش زیاتر چووە ڕۆحیانەوە، تـا ئەو ئاسـتەی زۆربەیـان حـاڵ بیانگرێـت و هەسـت بەوانەی دەوروبەری خۆیـان نەکەن، وای لە بەختەوەریی ئەو کەسانەی لەو هەموو گەمژەییەدا دەژین و وای لە سـەختی و ئـازاری ئەو مرۆڤـانەی کـاتی خۆیـان لە هۆشـمەندی و بیرکـردنەوە بەسـەر دەبەن. ئەو ژیـانەی دەژیـن خۆڕسکی و سادەیە، نە هیچ بیرۆکەیەك دەچێتە مێشکیانەوە و نە هیچ فەلسەفەیەك ژیانیان ئاڵۆز و شێواوتر دەکات. هەموو شـتێك لای ئەوان بە سادەیی و خۆکردەیی و سرووشـتی و شـێوازێکی گونجاو بەڕێوە دەچێت، وەکوو ترپە و ڕەزم و نەزم و جووڵەی نەریتە ئایینییەکانیان.

کـــاتێکی زۆر تێـــپەڕی، کەچـــی ئەو خەڵـــکە لە نەریـــتە ئایینییەکەی خۆیان و نوێژکردن و سەڵاواتلێدان ڕانەوەستان، هەتا یەکێـــك لە کەســـە گەورەکانیـــان بە دەنگێـــك کە لە دەنگـــی هەموویان گەورەتر بوو گوتی:

- تەنها خواپەرستی بەس نییە، دەبێ قوربانییەکیش وەکوو قوربانی و پاڕانەوە و نزاکردن بۆ خوا پێشکەش بکەین.

هەمـــووان لە جـــووڵە و حەی ئەڵـــلای خۆیـــان کەوتـــن و بێدەنگ بوون، یەکێکیان گوتی:

- دەبا مەڕوماڵاتی بۆ سەر ببڕین.

ئەوەی دەیویست چـاکەی زیـاتری دەسـت بکەوێـت و بە ڕوویەکـی سـوور و سـەرێکی بەرزەوە بچێـتە دیـداری خـودا، یەکسەر هاواری کرد:

- من دوو بزن دەکەمە قوربانی لە ڕایی خوا.

مەلای گوندەکەش بۆ ئەوەی پارێزگاری لە شکۆی خۆی بکات گوتی:

- منیش پێنج بزن دەکەمە قوربانی لە ڕایی خوا، بۆ ئەوەی ڕۆژانی داهاتوومان تایبەت بێت بە خوداپەرستی.

لەو کاتەدا کابرایەك کە باش مەلای دەناسی لەگەڵ خۆیدا سەرقاڵی شرۆڤەکردنی هەڵوێستی مەلا بوو، پێی سەیر بوو، مەلا ئەو خەنجەرە کولە لە خۆی بدات و بە یەکجار پێنج بزن بکاتە قوربانی، هەرچەندی دەکرد باوەڕی نەبوو مەلا ئەو کارە بکات، چونکە مەلاکان بە زۆری هەر وەردەگرن و نابەخشن، خێرە لەو کاتەدا وا ڕووخاوە، پێ دەچێ ئەویش هەر بە تەواوی باوەڕی بەوە هاتبێت کە ئیدی ئەوە ڕۆژی کۆتاییە و وا باشە ئەویش خێرێك بکات.

پاشان دەنگێکیان لە دەرەوەی مزگەوتەکە گوێ لێ بوو، هاواری دەکرد:

- دەروێشەکان گەیشتن... دەروێشەکان گەیشتن.

ئیدی هەموویان پاڵیان بەیەکترییەوە دەنا بۆ پێشوازیکردنیان و مەلای گوندەکەش لە پێشی هەموویانەوە بوو. کاتێك دەروێشەکان بینییان خەڵکی گوندەکە بە پیرییانەوە هاتن. دەستیان بە نمایشی دەروێشانە و خوداپەرستانەی خۆیان کرد، بە جۆرێکی وا بەهێز ناوی خوایان دەهێنا و "ئەڵلاهو ئەکبەر"یان دەکرد، دەنگی دەدایەوە، هەموو پێکەوە دەفیان دەژەنی و هەرچەندەش لە مزگەوتەکە نزیکتر دەکەوتنەوە دەنگی لێدانی دەفەکانیان و نزا و پاڕانەوەی خوداپەرستیی خۆیان بەرزتر و پڕ جۆشوخرۆشتر دەکرد، بە جۆرێك دڵی دەتۆقاند. بە شێوەیەکی بازنەیی دەستیان بە جووڵاندنی سەریان کرد، بۆ ئەمەش

مەبەستیان پەرشوبڵاوکردنی قژە درێژەکانیان بوو، ژن و منداڵانی گوند کە خۆیـان لە ماڵەکـان پەسـتابوو هـاتنە دەرەوە و چـوونە سەربانەکان و دەسـتی منـداڵەکانیان تونـد گرتبـوو، نەوجەوان و هەرزەکارەکانیش تێکەڵـی خەڵـکەکە بـوون، ئەوانەی لە دەوری دەروێشەکان کۆ بووبوونەوە چەند هەنگاوێك کشانە دواوە و لە بەردەم مـزگەوتەکە ئەڵقەیەکیـان بە دەوریانـدا دروسـت کـرد، یەکێك لە دەروێشەکان شمشێرەکەی لە کـاڵانەکەی دەرهێنـا و دەیویست بیچەقێنێتە قەبـرغەی ڕاسـتییەوە، لەگەڵ بەرزبـوونەوەی زیــاتری دەنگــی ئەڵلاهــوئەکبەری خــۆی و ژەنینــی دەفــی دەروێشـەکان شـیرەکەی لە سـکی خـۆی ڕاکـرد و لەو دیـوەوە دەرچـوو، ئەو دیـمەنە و جۆشوخرۆشـی دەروێشـەکان ترسـی خستبووە دڵی ئامادەبووانەوە، بەرەو ڕووی خەڵکەکە دەڕۆیشـت و شوێنی شمشێرەکەی بە هەمووان نیشان دەدا کە چۆن لەملاوە لە سکی ڕاچووە و لەودیوی سکییەوە دەرچووە، ئیـدی تەواوی ئامادەبووان، ئەوانەی لە دەوری دەروێشەکاندا بـوون دەسـتیان بە گـۆرانییە ئایینییەکـانی خۆیـان کـرد و ئەوانـیش لەگەڵ تـرپە و ڕەزمی دەفەکان دەستیان بە زیکر و سەربادان کرد، دەنگی پیرە دەروێشێکی کورتەبنە بۆ ئەوەی سەرنج و ئاگایی ئامادەبووان بۆ لای خـۆی پەلکـێش بکـات، بە "ئەڵلاهـو ئەکـبەر" سـەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاو مشتە بەردێکی پیشانی ئاپۆرای خەڵکەکە دەدا و یەك یەك بەردەکـانی دەخستە نـاو دەمـی کە تەنهـا چەنـد ددانێکـی کەمـی تێـدا مـابوو، بەردەکـانی بەدوای یەکتریدا قـووت دەدا، کـوڕی مەلای گونـدەکەش کە ئەویـش چووبووە پێڕی دەروێشەکانەوە، دەستی دایە خەنجەرێکی تیـژ و خسـتییە نـاو دەمـی و لە ڕوومەتییەوە دەریکـردە دەرەوە. ئیـدی دەستی بە جووڵەی هیستریایانە کرد و بە ناو خەڵکی گوندەکەدا دەخووڵایەوە و ئەوەی پیشانی خەڵکەکە دەدا کە ئەنجامی داوە.

بەمەش منداڵان پێی سەرسام دەبوون و گەورەکانیش شانازییان پێوەی دەکرد، بە تایبەتی باوکی کە زیاتر بە جووڵەکانی کوڕەکەی جۆشی سەندبوو و سینگی خۆی دەردەپەڕاند و لەناو خەڵکیدا خۆی بە شکۆدارتر دەهاتە بەر چاو، پێی وابوو ئەوەی کوڕەکەی ئەنجامی داوە کارێکی لە ڕادەبەدەر گرنگە و لە وێنەی نییە و لەناو خەڵکیشدا سەری بەرزتر و شکۆ و سام و دەسەڵاتی زیاتر دەکات. لە ناوەڕاستی بازنەکەش یەکێك لەو دەروێشانە لەسەر چۆك دانیشت و نووکی خەنجەرێکی لەسەر تەوقی سەری خۆی چەقاندبوو، یەکێکیش لە پشتییەوە ڕاوەستابوو و بەردێکی هێندەی مشتێك لەناو دەستیدا بوو و پەیتاپەیتا خەنجەرەکەی دادەکوتی، وەك ئەوەی مێغنجیر، یان سنگێك لە زەوی دابکوتێت، هەتا تەواو خەنجەرەکە لەناو کەللەسەری دەروێشە گەنجەکەدا نقوم و جێگیر بوو. هەمان دەروێش درێژەی بەو کارەی دا و بەناو خەڵکیدا دەسووڕایەوە و هەر سێ خەنجەرە چەقیوەکەی تەپڵی سەری بە ئامادەبووان نیشان دەدا کە چۆن لە ئێسکی کەللەسەریدا چوونەتە خوارەوە. چەند گەنجێکیش ژمارەیەك بزنیان هێنا و لە بەرپێی دەروێشەکاندا سەریان بڕین، پاشان بزنە سەربڕاوەکانیان بە درەختێکەوە هەڵواسی و کەوڵیان کردن، هەندێك گەنجی دیکەش داریان دەهێنا و لەناو بازنەی خەڵکەکە و دەروێشە حالگرتووەکان کەڵەکەیان کردن، نەوتێکی زۆریان پێدا کرد، هێندەی نەبرد بڵێسەی ئاگر ڕووناکی دایە دەوروبەری و ڕوخسار و چاوەکانی دەوروبەری دەبریسکانەوە، یەك یەك دەروێشەکان دەفەکانیان لە ئاگرەکە نزیك دەخستەوە و دەستیان بە دەفژەنین دەکردەوە و خۆشتر دەنگی دەدایەوە. گەنجەکانیش تا دەهات جۆشوخرۆشیان زیاتر دەبوو و جوانتر دەفەکانیان دەژەنی، گەنجێکیش هەبوو هاوڕێی کوڕی مەلای گوندەکە

بوو، له بەردەم گەورەی دەرویشەکان لەسەر چۆك نووشتایەوە، تاکوو "تەریـقەت"ی پێ ببەخشێت و توانـای بەرگەگرتنـی ئەو ئێش و ئازارەی هەبێت، بەمە ئەویش دەبێتە دەرویشێك وەکـوو ئەوان، هەتا ئەگەر لەگەڵیشیاندا بە گوندەکاندا نەگەڕێت. شێخی دەرویشـەکان بە دەسـتی سـەری گەنـجەکەی گـرت و بە منگەمنگەوە شتێکی نادیاری گـوت. لەنـاو پەرداخێکـی بچـووك کەمێك ئاو هەبـوو، دایە دەستی و داوای لە گەنـجەکە کـرد بە یەك قـوم فـڕی بکـات. گەنـجەکە یەکسـەر هەسـتی کـرد بـۆتە شتێکی دیکە و توانـایەکی بێئەنـدازەی لە بەرگەگرتنـی ئـازار و ژان هەیە. ئەمە حـاڵەتێکی زۆر ئـاڵۆز و دژوارە و لە ئەنجـامی باوەڕی ڕەها بەوەی دەرویشـەکان دەیـکەن، لەو کـاتەدا سـەری خۆی گرتبوو و ئەو ئاوەی خـواردییەوە پیـرۆزی کـرد، ئەوەش دوای ئەوەی وێردە پیرۆزەکانی بەسـەردا خوێنـد، توانـایەکی لە ڕادەبەدەر و نائاسـایی پێ بەخشـی و بە سەرانسـەری جەسـتە و ڕۆحیـدا بـڵاو بـووەوە و تەشـەنەی کـرد. گەنـجەکە لە نێـوان هەموویانـدا تووشـی هیسـتریا بـوو و بە جـووڵەی خێـراوە ئەمسەروئەوسەری دەکرد، هەمـوو خەڵکـی گونـدەکە سـەرنجی ئەویـان دەدا و لێـی ورد دەبـوونەوە و دەیانویسـت خۆیـان ئەو پەرچـووە ببیـنن کە چـاوەڕوانی بـوون. گەنـجەکە گەیشـتە حاڵەتێکی دەروونیـی ئەوتـۆ، هەسـتکردنی بە دەوروبەری خـۆی لەدەسـت دا، تەنهـا یەك ڕووداو نەبێـت، کە دەیویسـت لە ڕێـگەیەوە توانـا لە ڕادەبەدەرەکـانی خـۆی بسـەلمێنێت کە هەر ئێسـتا بەدەسـتی هێنـابوون. شـێخی دەرویشـەکانیش زیـاتر دەیوروووژاند و هانی دەدا، تاکوو زیاتر و زیاتر تووشی هیسـتریا بێـت، ئیـدی کـاتی تـاقیکردنەوەکەیە. لە بەردەم ئەو جەمـاوەرە شڵەژاو و تۆقیوە، خەنجەرێکی تیژی ڕاکێشا و دەمی کـردەوە و بەوپەڕی خرۆشـانەوە دەیویسـت تواناکـانی خـۆی لە بەردەم

هەمووان دەربخات و نمایش بکات. شێخی دەروێشەکان خەنجەرەکەی هێواش هێواش لەناو دەمی دەچەقاند و دەیویست لە ڕوومەتییەوە دەری بکاتە دەرەوە، بەمەش خەنجەرەکە و ڕوومەتی گەنجەکە وەکوو ڕەشماڵ و ستوونیان لێ هات، هێندەی نەبرد نووکی خەنجەرەکە لە گوپییەوە هاتە دەرەوە و تەنها دڵۆپە خوێنێکی کەمی لێ هات و هیچی تر، ئیدی گەنجە خرۆشاوەکە بە ناو خەڵکیدا دەهات و دەچوو، تاکوو خەڵکی بە سەرسامی و چاوی ئەبەڵقەوە لێی بڕوانن، کە چۆن لە پڕێکا ئەم کوڕە بووە گەنجێکی وا بە توانا. ئیدی ئەم هاوار و لووره لوور و دەفژەنینە هەتا پاشنیوەڕۆیەکی درەنگی خایاند، بەشێك لە ئافرەتانیش ئامادەکردنی خواردنیان بۆ هەموو خەڵکی ئاوایی گرتە ئەستۆ و کوانووی لە بەرد دروستکراویان ئامادە کرد و مەنجەڵی گەورەیان لە ماڵی مەلاوە هێنا، گەنجێکیش فەردەیەك گەورەی ساوەری هێنا، کە هەمیشە جووتیاران لەجیاتیی برنج وەکوو خواردنێکی دیار و ناسراو بەکاری دەهێنن و بە جۆرەها شێوەش لێی دەنێن، ئیدی زۆربەی ژنان سەرقاڵی ئامادەکردنی خوان و ژەمێکی خۆش بوون.

دەروێشەکانیش گۆڕەپانەکەیان چۆڵ کرد و چوونە ناو مزگەوتەکە، لەوێش ئەڵقەیەکیان سازدا و ماوەیەك خەریکی حاڵگرتن و دەفژەنین بوون، دوای ماندووبوونێکی زۆر ئیدی ئەوانیش هێور بوونەوە و ئەو هەڵچوون و جۆشوخرۆشەی هەیانبوو دامرکایەوە، ئیدی قسە قسەی ڕادەکێشا و ورەی خەڵکەکەش تا ڕادەیەکی زۆر بەرز بووەوە، گوایە بە هاتنی ئەو خواناس و پیاوچاکانە، ئیدی مردووە زیندووەکان بوێریی ئەوە ناکەن ڕوو بکەنە گوندەکەیان و لەوانەشە لە ترسان جارێکی تر گەڕابێتنەوە ناو گۆڕەکانیان. خۆ لەوانەشە خودا دوای ئەم هەموو

زیکـر و دەفـژەنین و پـاڕانەوەی ئەم خواناسـانە ڕۆژی حەشـری دواخستبێت. پاش مـاوەیەك خـواردنەکە کـوڵا و لەسـەر سـینیی گەورە گەورەی پـڕ لە سـاوەری کـوڵاو و گۆشـت پێشکەشـی ئامادەبووان کران و ئەوانیش دەستە دەستە لە دەوری سـینییەکان کۆبـوونەوە و بە سـکی برسـی و چێژێکـی زۆرەوە دەسـتیان بە خـواردن کـرد و ئەوەی لە بەردەمیـان مـایەوە تەنهـا کـۆمەڵە ئێسقانێکی ڕووتوقووت بوو، بـوونی دەروێشـەکان لە گونـدەکە، دڵنیـایی و ئاسـوودەیی بـۆ هەمـووان گەڕانـدەوە بە ژن و منداڵیشەوە، سەرباری ئەوە ئازایەتی و بـوێرییەکی زۆریشـی پـێ بەخشین کە هەرگیز چاوەڕوانیـان نەدەکـرد، دوای ئەوەی وەهـا نائومێد و تۆقیبوون هەراسانیان لێ هەڵگیرابوو، بە جۆرێـك هەتـا دەیانویسـت بە چـاوی خۆیـان مـردووە زینـدووەکان ببیـنن بـێ ئەوەی سڵیان لێ بکەنەوە، چونکە لە خەیـاڵی ئەوەدا بـوون کە ئەگەر بـێن، ناچـارن لە دەروازەی گونـدەکەدا بـۆ هێـزی دەروێشـەکان چـۆك دابـدەن، لەبەر ئەوەی لای خـودا بۆیـان پاڕاونەتەوە و نێوەندگیرییان بۆ کردوون. هێـدی هێـدی ژیـان و ئارامی باڵی بەسەر خەڵکی گوندەکەدا کێشایەوە، تا ئەو ئاستەی ئاژەڵەکانیان لە گەوڕەکانیان بۆ لەوەڕاندن دەرکـردە دەوروبەری گوند کە برسێتی شپرزەی کردبوون و بەفرەکەیان بۆ لادەدان و هەر کە پووشـوپەڵاش و پنچکێـك دەربکەوتـایە، ئاژەڵەکـان لە برسان پەلاماریان دەدا و لە ڕەگەوە هەڵیاندەکێشا و شـوێنەکەیان جـێ نەدەهێشـت هەتـا بە تەواوی خـاکەکەی دەردەکەوت و تەڵەپووشـێکی تێـدا نەدەمـا. ئیـدی ڕێنیشـاندەرەکە بڕیـاری دا بگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی "پشتئاشان"، بەرلەوەی شەودا بێـت، وێـڕای تکـا و پـاڕانەوەی کـچەکەی بـۆ ئەوەی ئەمشـەویش لە لایان بمێنێتەوە، بەڵام ئەو سـوور بـوو لەسـەر ڕۆیشـتن و بەڵێنـی ئەوەی پێ دا کە دوای چەند ڕۆژێکی کەم دێتەوە بۆ سەردانی،

وەلێ لە ناکاو، مەگەر تەنها خۆی هۆیەکەی زانیبێت لە بڕیارەکەی پاشگەز بووەوە، خۆ لەوانەیە لە ترسی ئەوە بوبێت کە بەرلەوەی بگاتەوە گوندەکەی خۆی شەوی بەسەردا دێت. یان بە هۆی خەیاڵە سەرشێتەکانی لەوەی ئەگەر بڕوات لەوانەیە تووشی مردووە زیندووەکان ببێت و پەلاماری بدەن، ئەو باش دەیزانی کە ئەوەی بینیی تەنها دەروێشەکان بوون و هیچی تر، یان لەوانەیە بیری لەو مەترسییە کردبێتەوە کە بکەوێتە بەر پەلاماری ڕەوە گورگێك و لەتوپەتی بکەن. کەمە ترسێکی پێوە دیار بوو، کاتێك بیری لە خێزانەکەی کردەوە، کە ئەگەر گوندەکەی بکەوێتە بەر هێرشی گورگەکان، وەك ئەوەی لەو گوندەی ئەولا ڕووی دا حاڵیان باش نابێت، بەڵام دڵی خۆی بەوە دایەوە کە جووتیارانی ئەوێ خێزانەکەی دەپارێزن، بۆیە هیچ پێویست بە دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوە ناکات. جگە لەوەی پێشمەرگەی پیرەکانیش، ئەگەر گورگەکان هێرش بکەنە سەر گوندەکە، یەك یەك گورگەکان دەپێکن و ڕاویان دەکەن، چونکە بارەگاکانیان بەو ناوەدا پەرشوبڵاو بوونەتەوە، بەمەش دەروونی ئارام بووەوە و بە لایەوە ئاسایی بوو ئەگەر ئەو شەوە لای کچەکەی بمێنێتەوە.

ئەم جووتیارە ڕێنیشاندەرە، لەو کەسانە بوو گیانیان لەسەر لەپی دەستیان دانابوو، هەمیشە بەملا و بەولادا لە هەڵپەدا بوو و هاوشێوەی جووتیارانی دیکە، ژیانێکی پڕ لە ئاستەنگ و زەحمەتی دەژیا، بەڵام بۆچی تەنها ئەم بەو جۆرە گیانی لەسەر لەپی دەستی بوو، خۆ هەمووان هەر ژیانێکی کولەمەرگی دەژیان؟ ئەو چی کردبوو وا بەو جۆرە ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە؟ وێڕای ئەوەی کە برسێتی بەو جۆرە بە ڕوخسارییەوە دیار نەبوو، وەك ئەوەی بە ڕوخساری ئەوانەی

دیکەوە بە دی دەکرا و سیسەڵەی کردبوون. هەتا هەندێك جار دەیگوت: "من لە دووری دە ڕۆژە ڕێگاوە بۆنی نان دەکەم و ڕانەهاتووم هەتا پارووبەکیش لە دەست خۆم بدەم". بەڵام چۆن لەو دوورەوە بۆنی پارچە نانێك دەکات، دەتوانی بڵێیت ئەوە کەس نەیدەزانی جگە لە خۆی نەبێت، چونکە سەرچاوەی ژیانی بووە، ئەو زۆر ڕژدبوو لەسەر پاراستنی نهێنیی کردنەوەی ئەو دەرگایەی کە لێیەوە پاروونانێکی دەست دەکەوێت. هەتا خەڵکیش سەنگ و ڕێزێکیان بۆ دادەنا، وێڕای ئەوەی جیاوازییەکی ئەوتۆی نە لە شێوە و لە گوزەرانیش لەگەڵ ئەوانەی دیکەدا نەبوو، بەڵام ئەو سەنگ و پێگەیەی لە میانی ئەو یارمەتی و دەستبارە داراییانەوە بەدەست هێنابوو، کە پێشکەشی خەڵکی دەکرد، هەر کاتێك پەنایان بۆ بهێنابووایە، خوویەکی سەیری هەبوو داوای کەسی ڕەت نەدەکردەوە. وێڕای ئەوەی یارمەتییەکانی بۆیان زۆر نەبوو، وەلێ ئەو دڵنیابوو لەوەی کە ئەو کەسە توانای گەڕاندنەوەی ئەو قەرز و یارمەتییەی نییە کە بیداتەوە، ئەو پەی بەوە بردبوو کە ئیدی ئەو کەسەی ئەو یارمەتی داوە بە درێژایی ژیان خۆی بە قەرزباری دەزانێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئاکارێکی مرۆڤدۆستانەی هەبوو، هەرگیز ئەو چاوخوارییەی ئەوانی نەدەقۆستەوە و لە بری ئەوە داوای کاری بێگاری و شتی وای لێ نەدەکردن، وەك ئەوەی شێخ و دەرەبەگ و ئاغاکان دەیانکرد، تەنانەت ئەو جووتیارانەی ئەو هاوکاری و یارمەتیشی دابوون، بە ئاواتی ئەوەوە بوون ڕۆژێك لە ڕۆژان کارێکی پێیان بکەوێت و داوایان لێ بکات، ئەوانیش لە بەرانبەر ئەو قەرزەی کە لە ئەستۆیانە بە خۆشییەوە کارەکەی بۆ ئەنجام بدەن، بەڵام هەرگیز هەتا ڕۆژێك لە ڕۆژان بیری لەوەش نەکردبووەوە. بۆیە لەناو خەڵکی ناوچەکە و لای گەورە و بچووك پێگە و کەسایەتیی دیار و بەرچاوی

خۆی هەبوو. هەتا زۆر جار بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان جووتیارەکان پەنایان بۆ دەبرد، تاکوو بۆیان چارەسەر بکات کە بە هۆکـــاری جۆراوجـــۆرەوە ڕوویـــان دەدا، هەر کە ئامۆژگارییەکیشی دەکردن، لە ناواخنیدا واتای خۆی هەبوو و دەتبینی کێشەکە چارەسەر کراوە و دڵەکانیش بەرانبەر یەکتری گەردیان تێدا نەماوە. هەندێك جاریش ئەگەر کێشەکە پارە بووایە، ئەوا لە گیرفانی خۆی بڕە پارەیەکی دەبەخشی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە و ئاشتکردنەوەی هەردوو لا، بۆیە هەمیشە ئەوانەی کێشەیان هەبوو کاتێك لای دەردەچوون ڕەزامەند و دڵخۆش دەبوون. ئەوەی سەیر بوو کەسێك بوێری ئەوەی نەبوو پێی بڵێت ئەرێ کاکە تۆ سەرچاوەی ئەو داهاتەت لە کوێوەیە، لە کاتێکدا هەر وەکوو ئێمە دەژیت و هیچت لە ئێمە زیاتر نییە. بەهەرحاڵ جووتیار پەیوەندیی بەم جۆرە پرسیارانەوە نییە، بە تایبەتی ئەوان دەزانن کە "خوا بژێوی هەر کەسێك دابین دەکات ئەگەر بیەوێ بەبێ هیچ حیسابێك". کەواتە دەبێ ڕێز لە ویستی خودا بگرن و خۆیان لە کاروباری ئەویش هەڵنەقورتێنن، کە هەڵبەتە ژیری و دانایەکی تێدایە، جگە لە خۆی کەس پەی پێ نابات و درکی پێ ناکات.

ئەو جووتیارە ڕێنیشاندەرە زیندەڕۆیی لە قسەکانیدا دەکرد و ئەمەش وای لە جووتیارانی دیکە دەکرد بە ئاخاوتنەکانی سەرسام بن و چێژ و خۆشی لە دانیشتنەکانیدا وەربگرن و لە کەسایەتیشیدا جۆرە بوێری و ئازایەتییەك بە دی بکەن کە تاکی گوندنشین هەمیشە شانازی بەو ئازایەتییەوە دەکات. ئەو هەمیشە شتێکی لە جووتیارەکان دەقاچییەوە ئەگەر کەم و سادە و بێکەڵکیش بووبێت بە لای ئەوانەوە، بەڵام بۆ ئەم زۆر پێویست و بەهایەکی گەورەی هەبوو، بەدەستهێنانی ئەو

خزمەتگوزارییانەش بە جۆرێك بوو ئەوانەی دیکە هەستی پێ نەکەن. زۆربەی ئەو خزمەتگوزارییانە تەنها قسەوقسەلۆك بوون و شتێکی ئەوتۆیان تێدا نەبوو، بەڵام بۆ ئەو سەرمایەی بژێویەکەی بوو، ئاخر ئەو جووتیارە بەکرێگیراو بوو، لە بەرژەوەندیی لایەنێکدا کاری دەکرد و لە کاتی تەنگانەشدا دەیانپاراست، ماوەماوەش یەکێك چاوی پێ دەکەوت و تێکڕای ئەو زانیارییانەی لێ وەردەگرت، هەرچەندە بێکەڵکیش بوونایە. ئەوەتا ئەو لە کۆتایی هاوینی ڕابردووەوە داوای لێکراوە هەموو شتێك دەربارەی ئەو کەسانە بزانێت کە ڕوو دەکەنە ناوچەکە، ژمارەیان چەندە؟ چەکەکانیان چین و چۆنن؟ بارەگاکانیان، فیشەك و ئازووقەیان، ژوورەکانیان، گەورەکانیان و بچووکەکانیان و هەتا نەخۆشەکانیشیان و باسی چی و چیش دەکەن؟ بۆ کوێ دەڕۆن و دێن؟ هەموو زانیاری و وردەکارییەك دەربارەیان. وەلێ ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو، کەسێکی وەك ئەم پیاوە کە هەموو شتێکی دەزانی، چۆن سامانی نەناسییەوە؟! چۆن هەڵەیەکی وا گەورەی کرد و خۆی و شیرینی هاوسەری گەیاندە سنووری ئێران؟ سامان چۆن توانی کەسێتیی ڕاستەقینەی خۆی لێ بشارێتەوە؟ بەڵام هەڵبەتە هەموو شتێکی دەزانی، ئەگەر بۆ تەنها ڕۆژێکیش لە گوندەکەی بمابایەتەوە. لەوانەیە ئەوەی خزمەتی سامانی کردبێت، ئەوە بووبێت هەتا بواری پشوودانیشی پێ نەدەدان، چونکە ئەو نەخشەی ڕۆیشتنی بۆ گوندی کچەکەی داڕشتبوو. لە سۆنگەی ئەوەی کەشەکەش هانی دواکەوتنی نەدەدا، بۆیە ئەو تەنها بیری لە گەیاندنی ئەو ڕێبوارە و ژنەکەی کردبووەوە بۆ سەر سنوور و لەوێوەش بەرەو لای کچەکەی با بداتەوە، چونکە زۆر پێویستیی بە زاواکەی بوو تاکوو لە کارێکدا بەشداری پێ بکات، کە بەر لە مانگێك و لە سەردانی یەکەمیدا بۆ لای لە سەری

ڕێککەوتبوون، هەتا زاواکەیشی بەوپەڕی نائارامییەوە چاوەڕوانی هــاتنی دەکــرد، ویــڕای ئەوەی بــارودۆخی گونــدەکە تەواو شڵەژابوو، بەڵام ئەو توانی کاتێك بقۆزێتەوە و هەندێك نهێنی بە زاواکەی بڵێـت و داوای ئەوەی لــێ بکــات کە خــۆی ســاز و ئامادە بکـات بـۆ قۆسـتنەوەی دەرفەتەکە، هەر کە کـاتی هـات. هەتا خودی جووتیارە ڕێنیشاندەرەکەش نەیدەزانی چ ڕووداوێك چاوەڕوانیــان دەکــات، تەنهــا ئەو پاداشــتە زۆرە نەبێــت کە لە ئاینــدەدا وەریــدەگرن. بەڵام کەی و چـۆن و بـۆچی؟ وەڵامـی ئەوەی نەدەزانی.

لە بەرەبەیانی ڕۆژی دواتردا جووتیارە ڕێنیشـاندەرەکە بەرەو گوندەکەی خۆی گەڕایەوە و بۆ نیوەڕۆکەی گەیشتەوە گوندی "پشتئاشــــان". هاوســــەرەکەی وەکــــوو پیشــــەی هەمــــوو ژنە گوندنشـینەکان پێشـوازی لـێ کـرد و هەمـوو پێداویسـتییەکانی پشوودانی بۆ دابین کرد، تاکوو ئەو مانـدوێتی و شـەکەتییەی لە جەستەیدایە بڕەوێتەوە و نەمێنێت. بەرلەوەی لە هەواڵـی خـۆی و کچەکەیــان بپرســێت، هەر لە بەر دەرگــاوە هاوســەرەکەی بە گوێیدا چرپاند کە براکەی لە دوێنێ ئێوارەوە مێوانە لایان، برای هاوســەرەکەی لەســەر ڕایەخەکە پــاڵی دابــووەوە و ســەرینێکی کوردەوارییانەیشی نابووە بـن شـانی خـۆی. پەرداخە چـایەکی بە دەستەوە بوو، تەنها فڕێکی تێدا مابووەوە، لە بەردەمـی و لەسـەر زۆپـا داریـنەکەش قـۆرییە چـایەکە قیـت دانرابـوو. کەمێـك لە شوێنەکەی خۆی جوولایەوە، تـاکوو پەرداخەکەی پـڕ لە چـای بکاتەوە، بەڵام زاواکەی بینی هـاتە ژوورەوە، بـۆیە پەرداخەکەی دانـا و هەســتایە ســەر پــێ و بە خۆشەویسـتییەوە باوەشــی بە زاواکەیدا کرد و دەستی نایە سەرشانی، لە ژوورەکەی دیکەوە گــوێی لە دەنگەدەنــگ و زریقــوزاقی منــداڵەکانی بــوو، لەســەر

دۆشـــەکە ئیســـفەنجەکان هەڵـــدەپەڕین و یارییـــان دەکـــرد، گەورەکەیان نزیکەی سیانزە ساڵان و بچووکەکەشیان هێشتا سێ ساڵی تەواو نەکردبوو، ژوورەکەیـان گەرموگـوڕ بـوو، خـۆی و هاوسەرەکەیشی هەر لەو ژوورەدا دەنووستن.

مێوانەکە دەرفەتی دانیشتنی نەدا و هەر بە پێوە لێی پرسی:

- کابرات گەیاندە کوێ؟

ئەو مەزەنـــدەی وا بـــوو کە لەوانەیە خوشـــکەکەی ئەو هەواڵەی پـــێ دابێـــت، بـــۆیە بە کەمێـــك ئـــارامی و دوور لە سەرسامییەوە گوتی:

- ئێستا کەس ناتوانێت مەزەندەی ئەوە بکات گەیشتوونەتە کوێ، لە دوێنێکەوە ڕۆیشتوون.

- ئەها... واتە گەیشتۆتە ئێران و لە قەرەبـاڵغیی شـارەکانیدا ون بووە؟

- بێگومان.

- کەواتە تۆ نەیتدەناسی. باشە، بەڵام نهێنییـەکە بـۆ خـۆت بێت. ئەوەی تۆ لەگەڵی ڕۆیشتی و دەربازت کرد، ئەوە داواکراو بوو. ئەو کەسە بوو کە خزمەکەی مام جەمالی ڕیسـوا کردبـوو، خۆت ئەو چیرۆکە دەزانی.

ڕێنیشاندەرەکە دەستی کێشا بە ناوچەوانی خۆی دا و گوتی:

- تۆ سـەیرکە، پەککـوووف! کـوڕە خـۆ بە کەسـایەتیی تایبەتی خۆی فێڵی لێ کردم، چۆن ئاگام لەوە نەبوو؟

- دەزانی دەستەکە بەدوایەوە بوون، بەڵام دەربازی بوو؟!

کاتێك خوشکەکەی هاتە ژوورەوە، ئەوان قسەکەیان بڕی،

ئەویش یەك دوو سەرینی كوردەوارییانەی دیكەی بۆ هێنان و یەكیانی دایە دەست پیاوەكەی، تاكوو بە ئارامی دابنیشێت و لەسەری پاڵ بداتەوە، دوای ئەو گەشت و ماندووبوونە درێژەی چەشتبووی، ئینجا ژوورەكەی جێ هێشت و ڕۆیشت نانی نیوەڕۆ ئامادە بكات.

خاڵی منداڵەكانی قسەكەی تەواو كرد كە پێشتر بە هۆی هاتنی خوشكەكەی بڕیبووی:

- لە ڕاستیدا بە شێك لەوانەی بەدوایەوە بوون، بوونە كۆسپ لەوەی دەستگیر نەكرێت، وێڕای ئەو خەڵاتە گەورەیەی بەدەستیان دەهێنا ئەگەر بیانگرتبوایە، لەبەر ئەوەی زۆربەیان لەو ڕەفتار و هەڵوێستانەی خزمەكەی مام جەمال دەیكرد ناڕازی بوون و نەشیاندەوێرا ناڕەزایی دەرببڕن. ئەی چیت دەكرد ئەگەر ئەو داواكراوەت بناسیبوایەوە؟

ڕێنیشاندەرەكە كەمێك بێدەنگ بوو و داما، چی بڵێت... وەلێ لە كۆتاییدا بە منگەمنگێكەوە گوتی:

- ئەو هەر دەبووایە وا بكات و بەرگری لە نامووسی خۆی بكات... بەڵام، دەبێ بەرگەی ئەنجامی كارەكەی خۆیشی بگرێت.

- واتە دەتگرت و خەڵاتەكەشت وەردەگرت؟

- مەسەلەكە كەمێك ئاڵۆز و گرانە، ئاخر ئەو لەژێر سایەی مام كاكیلدا بوو، هەرگیز نامەوێ خۆم لەو گرفتانە بئاڵێنم و خۆم تووشی بێنەوبەردەی لابەلا بكەم، جگە لەوەش دەستەكەی مام كاكیل سەر بەمانەی ئێرەن. ئەی تۆ چیت دەكرد ئەگەر بكەوتایەتە دەستت؟

- كارەكە لەسەر بڕی خەڵاتەكە ڕادەوەستا... بەڵام ئەو

کاتەش هەستم بە قیزەونی خۆم دەکرد، ئاخر پیاوەکە بەرگری لە شەرەف و ئابرووی خۆی کردبوو.

دیسانەوە ڕێنیشاندەرەکە پرسییەوە:

- منیش وەکوو ڕێبوارێك مامەڵەم لەگەڵیدا دەکرد، پیاوەکە هەڵەی نەکردووە، ئابروو گرانبەهایە، باوەڕ ناکەم بمدایەتە دەست مەرگی خۆیەوە، نا نا هەرگیز ئەوەم نەدەکرد ئەگەر هەزار دیناریشی پێ بدامایە. پیاو دەبێ بایی ئەوەندە پیاوەتی تێدا بێت، کە نامەردی قەبووڵ نەکات. ئەوەی ئەو کابرایە کردی ئەوپەڕی نامەردی بوو، ئەوەی ئەو کوڕەش کردی ئەوپەڕی جوامێری و ئازایەتی بوو.

- کەواتە بەردێکی لەسەر دانێ. نامانەوێ لەگەڵ گەورەکاندا تووشی گرفت بین، پرسەکە لە بیر بکە، وەك ئەوەی شتێك ڕووی نەدابێت... ئەرێ بە ڕاست پێش چەند ڕۆژێك کەسێکم بۆ لات ناردبوو.

ڕێنیشاندەرەکە یەکسەر گوتی:

- بەڵێ بەڵێ، منیش بەپێی توانای خۆم کارم تیای کردووە، لەگەڵ ئەوەی نازانم ئەو هەموو شتە بۆچی؟

- ئەوەی پێویستە لەسەرت جێبەجێی بکە و ئینجا پرسیار لە پشکی خۆت بکە و بزانە چەندت دەست دەکەوێت.

- ئەوەی تا ئێستا لێی حاڵی نەبووم، بۆچی بارکردن؟!

- ئێستامان نەگوتووە، تەنها ئامادەی بارکردن بەو هیچی تر، ئەمە هەموو شتێکە. لەوانەیە بەم زووانە ڕووداوی گەورە ڕوو بدات. بەڵام کەی و چییە و تایبەتە بە چ شتێك، ئەوەیان نازانم؟! دەڵێن هەتا خودی مام جەمال بایەخی بەم پرسە داوە و بەدواداچوونی بۆ دەکات.

ڕێنیشاندەرەکە بیری بە هەزار لادا دەهات و دەچوو و چاوی بڕیبووە خاڵێکی پێش خۆی. برای ژنەکەی دوای کەمێك بێدەنگی پرسی:

- پێم بڵێ پاداشتی ڕێنماییکردنی ڕێبوارەکە باش بوو؟

- بەڵێ بەڵێ باش بوو، هەروا دەبێت خوا نەیبڕێ.

تۆ برای هاوسەرەکەمی، نهێنییەکت لا دەدرکێنم... گوێ بگرە... دەزانی ئەو کوڕە سووکایەتی پێ کردم؟ هەرچەندە مەبەستیشی سووکایەتیکردن نەبوو، بەڵکوو گاڵتەی بە قسەکانم دەهات، نەك لە سەنگ و بەهای من کەم بکاتەوە. بەڵکوو لەوانەیە ئەو هەر بۆ خۆشکردنی دۆخەکە ئەوەی گوتبێت، یان وەکوو جۆرێك لە نەهێشتنی کرێیەکە، یان پتەوکردنی هاوڕێیەتیی نێوانمان، هەرچەندە جارێکی دیکە یەکتری نابینینەوە، یان نازانم قسەکانی لەگەڵ من بۆ وا نامۆ بوون... پێم وایە ئەو هەر بە ڕاستی شێت بوو، ئەگەرنا بۆچی وا بە سووکی قسەی لەگەڵ دەکردم... دان بە شتێکدا دەنێم، ئەو شێتە شایانی یارمەتیدانی من نەبوو، بەهەرحاڵێك بووایە نەدەبوو یارمەتیی بدەم. ئەرکی من کۆکردنەوەی زانیارییەکان و گوێگرتنە لە خشپەی پێی مێروولەیەك و هەر کەس و ڕێبوارێك بێت و بچێت، هەرگیز نەدەبوو بوار بۆ شێتێکی وا بڕەخسێنم کە بە کەسایەتیی خۆی فریوم بدات، لە یەکەم چرکەساتەوە کە بینیم ناسیمەوە، بەڵام نهێنییەکەم شاردەوە، بەڵکوو هەتا نەمهێشت لە گوندەکە بمێنێتەوە و هەتا لە دانیشتنیش لەوێدا درێژە بکێشێت، بیانووی ئەوەم هێنایەوە کە دەبێ بە زووترین کات بڕۆم لەبەر ئەوەی کاتم کەمە و توانای چاوەڕوانیم نییە. ناسیم و ڕێزی ئەو پیاوەتی و بوێرییەیم گرت کە بۆ هاوسەرەکەی هەیبوو، بەڵام

سووکایەتیکردنی بە قسەکانم وام لێ دەکەن لەو یارمەتیدانەم پەشیمان ببمەوە.

برای هاوسەرەکەی گوتی:

- دەی قەیناکا پەشیمان مەبەوە. تۆ یارمەتیی پیاوەتی و بوێرییەکەیت داوە کە داکۆکی لە ژنەکەی کردووە، ئەمەش بەسە، ئەگەر ئەوەی بزانیبووایە ڕێزی لێ دەگرتی و سووکایەتی بە قسەکانت نەدەکرد، هەرچەندە ناشزانم ئێوە باسی چیتان کردووە.

ڕێنیشاندەرەکە دوودڵی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو گوتی:

- هەڵبەتە زانیویەتی، دەبێ ئێستا پەنجەی پەشیمانی بگەزێت... بەو کەسەم گوت کە دەستەبەری بردن و دەرکردنی بۆ ئێران دەکرد، هەر کە گەیشتە ئێران کە پێی بڵێت: "ڕێنیشاندەرەکە نامەیەك بە ناوی تۆوە دەنووسێت و تیایدا سڵاو لە ئەبوجگارە دەکات".

دیسانەوە بە هاتنی هاوسەرەکەی بۆ ئامادەکردنی خوانەکە، هەردووکیان بێدەنگ بوون. ئیدی منداڵەکانیش هاتنە ژوورەوە و باوەشیان لە باوکیان دا و بە تەواوی قسەکانیان گۆڕانی بەسەردا هات و کەوتنە باسی کاروباری خێزانی و گشتی.

دوای نانخواردنی نیوەڕۆ و چای خواردنەوە، میوانەکە بڕیاری دا بچێت بۆ گوندی ئاشقوولکە، بەڵام داوای لە زاواکەی کرد ماوەی نیو کاتژمێرێك لەگەڵیدا بڕوات، وا پێ دەچوو بیەوێت دەربارەی شتێك قسەی لەگەڵدا بکات.

## بەشی بیست و دووەم

وەکوو زانیمان گەشتەکەی سامان بۆ ڕۆژی دواتر دواکەوت، ناچار لەو ژوورە بچووکە مانەوە، دوای ئەوەی میواندارىی خاوەن تراکتۆرەکەی ڕەت کردەوە، بەڵام پیاوەکە پێش نیوەڕۆ دوو گەنجی گوندەکەی نارده لایان و هەندێك پەتووی نیوداشتی بۆ ناردن، لەگەڵ دەبەیەك شیر و مەنجەڵێکی مسی بچووك کە هەندێك ساوەری تێدابوو لەگەڵ نەختێك کەره و پریاسکەیەك کە هەندێك نانی تێدابوو، لەگەڵ شەکر و چایش، ئەو خواردنە بە لای ئەوانەوە ژەمێکی بەتام بوو، لەو برسێتییەی ئەوانی تێدا بوون، بە یەك ژەم هەموویان خوارد و هیچیان تێدا نەهێشتەوە، بەرەبەری ئێوارەش هەردوو گەنجەکە هاتنەوە و هەندێك خواردنی دیکەیان بۆ هێنابوون، جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە سبەینێ پێش ڕۆژئاوابوون بۆ ڕۆیشتن ئامادە بن و دوا نەکەون. ئیدی سامان و ڕەحمان دەستیان بە کۆکردنەوەی داری وشك کرد بۆ ئەوەی ئەو شەوە بەشی خۆگەرمکردنەوەیان بکات، لەبەر ئەوەی هیچ تەورێکیان پێ نەبوو داری گەورەی پێ پارچەپارچە بکەن، بۆیە هەرچی کۆلکەداری ئەو دەوروبەرە هەبوو لە دەوری زۆپاکە خڕیان کردەوە، لە دەرەوەی دەرگای ژوورەکەش داری گەورەی زۆریان کۆ کردەوە کە بە کەڵکی زۆپاکە نەدەهات، کاتێکیش تاریك داهات ئاگریان لە بەشێك لەو دارە بەردا، لە ترسی هاتنەوەی گورگەکان، ناوەناوەش سەرێکیان لە ئاگرەکە دەدا و داری گەورەی دیکەیان دەخستە سەری و لێ نەدەگەڕان

خـامۆش بێـت و ببێـتە خـۆڵەمێش. ئەو پـارچە دارانەی لەگەڵ سووتانیان بچووك دەبوونەوە و بە کەڵکـی نـاو زۆپـاکەی ئەمـان دەهاتن، لایەکیان دەگرت و دەیانهێنایە ژوورەوە و لە زۆپاکەیان دەپەستا، گوندنشینەکانیش ئەو شەوە هەمـان شـتیان کـرد، داری گەورەیـــان لە بەردەم گەوڕی ئاژەڵەکانیـــان و دەروازەی گونـدەکەیان کـۆ کـردەوە، کاتێـك هەسـتیان کـرد لـوورەی گورگەکان نزیك دەبێتەوە، ئاگریـان لە دارەکە بەر دا و بەمەش ئارامی و ئاسوودەییان بۆ خۆیان و ئاژەڵەکانیان مسۆگەر و دابین کرد و گورگەکـانیش بـوێری نزیـك کەوتنەوەیـان لە ئـاگرەکە نەبـوو، بـۆیە بە نائومێـدی دەگەڕانەوە و لە شـوێنێکی دیـکە بە دوای خۆراکی خۆیاندا دەگەڕان، تاکوو ورگی خۆیانی پێ تێر بکەن.

لە ژوورەکەش، دیارە بەخت هەرسێکیانی بەبێ چاوەڕوانی کۆ کردبووەوە، لەو کاتەی شـیرین نـاو ژوورەکە و شـوێنەکەی ڕێك دەخست، لەژێـر سـواڵە و باوەشـە پووشوپەڵاشـەکاندا دوو کیسەی بچووکی گوێزی بینییەوە، کە بە دڵنیاییەوە ئەوە خاوەنی ژوورەکە بۆ ئەم زستانە لەوێ هەڵیگرتووە.

سامان بە خۆشییەوە گوتی:

- ئەم گوێزە نازدارە لە کاتی خۆیدا هات، بەشی خۆمانی لێ دەخۆین، سبەینێش پرسیاری خـاوەنەکەی دەکەیـن، تـاکوو پارەی گوێزەکەی بدەینێ.

شیرین یەکسەر هاتە دەنگ و گوتی:

- ئەوە نابێـت، گـوێزەکەی بخـۆین و سووکایەتیشـی پـێ بکەین!

سامان بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

- ئەوە چۆن؟!

شیرین گوتی:

- ئەوە شەرمە، خاوەنەکەی ئامادە نییە نرخەکەی وەربگرێت، ئەوەی لەسەرمانە خاوەنەکەی بدۆزینەوە و سوپاسی بکەین، گوندنشینان وێڕای هەژاری و نەداری و دەستکورتییان بەڵام چاوتێرن.

پاشان خەندەیەکی کرد، چ خەندەیەك هەر ڕێك کازیوە و بەرەبەیانێك بوو لە جوانی، ئەم جارەیان ڕووی لە ڕەحمان کرد و گوتی:

- خۆ ئەو کاتە جگە لەو ژاژییە نەفرەتییە وەکوو خۆت وای پێ دەڵێی، ئەگەر شتێکی دیکەمان هەبووایە، هەرگیز ڕەزیلیمان نەدەکرد، بەڵام چی بکەین لەگەڵ هەژاری و دەستکورتی هیچ ناگوترێت!

ڕەحمان بە جۆرێك لە سەرزەنشتکردنی ویژدانەوە گوتی:

- کەس گومانی لەوەدا نییە، هەتا ئێمەش شەرممان دەکرد بەشداریی لە خواردنی منداڵی گوندنشینەکان بکەین، ئەو قسانەی ئەو کاتەش لەگەڵ هاوڕێکەم کردم، تەنها قسەی پووچ و بێمانا بوون و نازانم چۆن وا پەلکێشیان کردم. هەندێك جار مرۆڤ شتی وای لە دەم دەردەچێت زۆر بێبایەخە و هەر هیچیش نییە، بەڵام بێ ئەوەی مەبەستێکی هەبێت لەوەی دەیڵێت، لەوانەیە لەبەر ئەو دۆخە نائاساییە بێت کە تێیدا دەژین.

شیرین لە ناکاو پرسی:

- ئەرێ بە ڕاست تۆ ڕەحمانە مار نیت؟!

ڕەحمان بە سەرسامییەوە دووبارەی کردەوە:

- ڕەحمانە مار! مەبەستت چییە؟!

سامان لەجیاتیی ئەو وەڵامی دایەوە:

- مەبەستی ڕەحمانی مارە.

ڕەحمان ئەم جارەش بە سەرسامییەوە وەڵامی دایەوە:

- ڕەحمانە ماری چی؟! ئەوە یەکەم جارە گوێم لەو نازناوە دەبێت!

شیرین گوتی:

- هەموو گوندنشینەکان بەو نازناوە دەتناسن.

- بۆچی؟

- دەڵێن جارێك مارێکی گەورە قووتی داوی و بە قەممە سکی مارەکەت هەڵدڕیوە و هاتوویتەتە دەرەوە، هەروەها دەشڵێن دواتر مارەکەشت خواردووە.

سامان لە قاقای پێکەنینی دا و ڕەحمانیش لە سەرسامی دەمی بەشەوە بووبوو، دواتر سەر و دەستی پێکەوە ڕاوەشاند و گوتی:

- من نازانم ئێوە ئەم قسە سەیرانە لە کوێوە دەهێنن؟!

شیرین دیسان پرسییەوە:

- کەواتە تۆ مار قووتی نەداویت؟

- هەڵبەتە نەخێر، ئەگەرنا ئێستا لەگەڵ ئێوەدا نەدەبووم.

سامان بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

- خەیاڵێکی فراوانیان هەیە.

شیرین جارێکی دیکەش پرسییەوە:

- ئەی مارەکەشت نەخوارد؟

- بەڵێ، خواردم بەڵام مارێکی بچووك بوو.

سامان بە سەرسوڕمانەوە هاواری کرد:

- مارت خوارد؟!

- بەڵێ، ئەوە چی تێدایە؟ خۆ هیچ جیاوازی لەگەڵ گۆشتی ماسی نییە، دڵیشی هەر کتومت دڵی چۆلەکەیە.

سامان بە بێدەنگی و سەرسامییەوە سەرنجی دەدا، ڕەحمان وەکوو ڕوونکردنەوەیەك گوتی:

- دەزانم هەندێکتان ئەم کارە بە کارێکی کێویانە و نەزانانە دادەنێن و بە لاتانەوە پێویستیش نییە. بەڵام بە لای منەوە کارێکی پێویست بوو.

- چۆن؟

سامان پرسی، ڕەحمانیش وەڵامی دایەوە و ڕۆ چووە ناو گێڕانەوە و شرۆڤەکردنی دۆخەکە، وەك ئەوەی مامۆستا عومەر دەیکرد، کاتێك باسی شتێکی دەکرد:

- هەمیشە حەزم لێ بوو بە تەنها بۆ ڕاو بچم و ئەو ئەشکەوتە تاریك و پەناوپەسێوی شاخانە بەسەر بکەمەوە کە تا ئێستا پێی مرۆڤ بەریان نەکەوتووە، بۆ خۆم چێژ لەو جۆرە دەرچوونانە وەردەگرم و ئەوە وەکوو ڕێکردن نییە بە قەدپاڵی ئاسایی کە هەمیشە گوندنشینەکانیش پێیدا هامۆشۆ دەکەن، چونکە سەرکێشی و ڕووداوی لە ناکاوی وای تێدا ڕوو دەدات کە نە پێشتر چاوەڕوانیان بوویت و نە پێشبینیشت کردوون،

ئەوەش تەنها لەو شوێنە چۆل و دوورەدەستانە ڕوو دەدەن، چونکە ئەو شوێنە چۆلانە پڕن لە پێشهاتی سەیر. جارێکیان لە ڕۆژێکی گەرمی هاویندا بە شوێنێکدا ڕۆیشتم هەمووی پووشوپەڵاش بوو، گەیشتمە شوێنێك پووشوپەڵاشێکی زۆری لێ ڕووابوو هێندەی پشتوێنەی زەلامێك، لە شێوە و ڕەنگدا بە پووشوپەڵاشی گوڵەگەنم دەچوو، بەهەرحاڵ، دوا هەنگاوم بەرەو پێش دەنا، بێئاگایی خۆم لە ناکاو وەها لە خۆم هەڵدا و هەڵبەزیمەوە و بۆ دواوە کشامەوە کە لە دۆخی ئاساییدا هەرگیز توانای ئەنجامدانی بازدانی وام نییە، لە چرکەساتێکدا مارێکی گەورە لە پێشمدا قیت بووەوە پێشتر لە ژیانمدا ماری وام نەبینیبوو، لەوانەیە بە هۆی لە ناکاوییەوە بووبێت، بۆیە من لە شوێنی خۆم ڕاچڵەکیم و بە هەمان شێوە مارەکەش لە شوێنی خۆی ڕەق وەستا و ڕاچڵەکی، خۆ لەوانەیە مارەکە لە دڵی خۆیدا گوتبێتی: "ئەم گیانلەبەرە سەیرە لە ناکاو لە کوێوە بۆم دابەزی، لە کوێش؟ لەم شوێنە چۆلە؟!". لە ترسان لە شوێنی خۆم ڕەق ڕاوەستام، ئەگەر زێدەڕۆیی نەبێت تاڵە قژەکانی سەرم لە ترسان، وەکوو پەڕی سیخوڕ قیت بوونەوە. باوەڕم پێ بکەن، کە منداڵ بووین لە فیلمە کارتۆنییەکان دەمانبینی چۆن لە ترسان تاڵی قژ ڕەق ڕادەوەستێت، هەر بە ڕاستیش تاڵی قژ لە ترسێکی لە ناکاو ڕەق ڕادەوەستێت! یان دەتوانین بڵێین پێستی سەر لە ترسان دەجووڵێت و تاڵە قژەکانیش لەگەڵیدا دەجووڵێن، ڕوخساریشم وا زەرد هەڵگەڕا، خەریك بوو ڕۆحم دەربچێت، موچرکێکی نامۆ سەرتاپای جەستەی ڕاچڵەکاندم، وا دیارە دەمارەکان هەموویان پەیوەستن پێکەوە، بۆیە ئەو لەرز و هەژینە لە ناکاوە ڕوو دەدات، بەو ڕووداوە زۆر شڵەژام، لە بەختی خۆم ترسەکە وا ڕەقی کردم لە شوێنی خۆم ڕەپ ڕاوەستام و جووڵەم نەکرد، لەو چرکەساتەدا هەتا چەکەکەی شانیشم لە بیر

کرد، لەو حاڵەتانەدا لەسەر مرۆڤ پێویستە بە ئازایەتی خۆی نەنازێت، چونکە هەر جوولەیەك کە لە منەوە ڕووی بدابووایە، مارەکە وای دەزانی دەستپێکی شەڕ و بەرەنگاربوونەوەیە، هەڵبەتە ئەو لە من خێراترە و هەر ئەوەندەم دەزانی سەرم لەناو دەمیدا دەبینییەوە و بەرلەوەی برۆکانم بجووڵێنم بە دەوراندەوری جەستەم دەئاڵا و لە پەلوپۆی دەخستم. ئەمە لەگەڵ زۆرێك لەو زانایانەدا ڕووی داوە کە لە دارستانە چڕەکانی ئەفریقیادا خەریکی لێکۆڵینەوەن، کە هەندێکیان هەر بە تەواوی بە خۆیان و پێنووس و کاغەز و ئامێرەکانی دەستیانەوە بۆ هەتاهەتایە ون بوون و نەدۆزرانەوە. بەڵام مارەکەی من دڵی گەورە و لێبوردە بوو، وەك ئەوانەی ئەفریقیایان پێ نەکردم، مارەکەی من ڕقی لە ترسنۆکییەکەم بووەوە و ئامادە نەبوو شەڕ لەگەڵ کەسێك بکات لە ترسان لە شوێنی خۆی ڕەقهەڵێت و جووڵە نەکات. تەنها نزیکەی دوو مەترێك لێمەوە دوور بوو، وا خۆی بەرز کردبووەوە سەری دەگەیشتە ئاستی شانم، زوو زوو زمانی دەردەکرد و دەیبردە ژوورەوە، فیشکەیەکی وای دەکرد هێندەی دیکە دەیتۆقاندم و وشکی دەکردم، دوای چەند چرکەیەکی کەم ئاوڕێکی دواوەی دایەوە و چووەوە سەر زەوی و لە نێوان پووشوپەڵاشەکاندا خشی، ئەو پووشوپەڵاشەی لە گوڵەگەنم دەچوو، بە هۆی ڕۆیشتنی مارەکەوە دەمێك بە لای چەپ و دەمێك بە لای ڕاستدا لار دەبوونەوە، ئەو ڕۆژە ڕاوەکەم تەواو نەکرد، کە لەجیاتیی ئەوەی ڕاوچی بم، خەریك بوو ببمە نێچیر، بەرەو دواوە گەڕامەوە و تا ماوەیەکیش حەپەسابووم. وا شۆك بووبووم، ناهاتمەوە سەرخۆم، گوێم لە خشپەی هەر شتێکیش بووایە، یان هەتا بایەکەش بیجووڵاندبووایەوە، من لە ترسان هەڵدەبەزیمەوە و خەریك بوو زیق بکەم. وەك دەڵێن: هەتا لە خشپەی گوریسیش دەترسام. لەبەر ئەوەی لە شاخیش دەژیام

هەر دەبوو ئەو ترسە بشکێنم و بەسەریدا زاڵ ببم، ئەگەرنا پێشمەرگایەتی بەو ترسەوە ناکرێت کە بووبووە بەشێك لە خۆم. دوای نزیکەی هەفتەیەك گوێم لە یەکێکیان بوو مارێکی بچووکی لە بنمیچی چێشتخانەی بارەگاکەدا کوشتبوو کە نزیکەی باڵ و نیوێك دەبوو، بینیم خستوویەتییە سەر دارێك و دەیگێڕێت، داوام لێ کرد بۆم بیخاتە سەر زەوییەکە، وێڕای ئەوەی سەری پان کردبووەوە، کەچی هێشتا کینگلی دەدا، تەماشام دەکرد و بوێریی ئەوەم تێدا نەبوو دەستی لێ بدەم، لە ڕاستیدا نازانم بۆچی هەر لە منداڵییەوە ئەو ترسە دژی مار لە ناخماندا دەچێنن، پەنجەم درێژکرد، هەر کە بەر پشتی مارەکە کەوت، مارەکە لەگەڵ ئەوەی سەریشی پان کرابووەوە، کەچی خۆی لوول دا، بە خێرایی دەستم کشاندەوە و هەستم بە موچڕکێك کرد سەرتاپای جەستەی داگرتم، لە ژیانمدا دەستم بەر مار نەکەوتووە. دووبارە هەوڵم دایەوە، کارەکە درێژەی کێشا، دەمویست لە دەستلێدانی ڕابێم و لێی نەترسێم و قێزوبێزیشی لێ نەکەمەوە، لەو کاتەدا وا هەستم کرد کە کارێکی لە ڕادەبەدەر گرنگم ئەنجام داوە، کاتێك دەستم لێی دا، دەشمزانی لە هیندستان خەڵکی مار لە ماڵەکانیان بەخێو دەکەن و منداڵان لەگەڵیان یاری دەکەن و بۆ ڕاوکردنی مشك شوێنی پشیلەی گرتۆتەوە. بەڵام چی بکەین، هەر وڵاتە و کولتوور و ڕۆشنبیریی خۆی هەیە، خۆ ئەگەر منداڵە هیندییەك ببینێت وا بە پەنجە لێدانی مارێك ڕادەچڵەکێم و تۆقم دەچێ، گاڵتەی پێ دەکردم و پێم پێدەکەنی و لەوانەیە بشیگوتبایە: های تڕحێو، تۆ دەتەوێ ئازادی و ئاسوودەیی بۆ گەل بهێنیت؟! ئەمەم بە خێرایی بە خەیاڵدا هات، دواتر ئەوەم بیر کەوتەوە کە هەندێك لە گەلان گۆشتەکەیان لە گۆشتی ماسی پێ باشتر و خۆشترە. ئا ئەوەتانێ من زۆربەی ڕۆژەکانم ئەو ژاژییە نەفرەتییە

دەخۆم کە هەر بۆنی خەریکە دەمکوژێت، بۆیە لە ڕقی ئەو ژاژییە، مارەکەم گرت و پێستەکەیم داماڵی و لەسەر ئاگر برژاندم، تامی گۆشتەکەی لە گۆشتی ماسی خۆشتر بوو، برپرەکانی پشتیشی ئەوەندە لە بڕبڕەی پشتی ماسی جیاوازییان نییە، لەو کاتەوە ئیدی فێر بووم، هەر کاتێك مارێکم تووش هاتبێت، کردوومەتە ژەمە خۆراکێکی خۆش و گەدەی بەتاڵی خۆم پێ پڕ کردووە. هەرگیز ئەوەم بە خەیاڵدا نەدەهات ئەم کارەم بگاتە بەر گوێی گوندنشینەکان و ناوی ڕەحمانە مارم لێ بنێن، ئەمە تەواوی ئەو چیرۆکەیە بەبێ زیاد و کەم.

ئیدی هەرسێکیان دەستیان بە گێڕانەوە و کاویژکردنی ئەم جۆرە ئاخاوتنانە کرد، تاکوو شەو درەنگ داهات، ئەو شەوە بە لای ڕەحمانەوە یەکێك بوو لە خۆشترین و بەتامترین شەوەکانی ژیانی، یادەوەریی ئەو شەوە بۆ هەمیشە لە خەیاڵیدا بە قووڵی نەخش دەبێت و هەڵدەکۆڵدرێت و دەمێنێتەوە.

لە بەیانیی ڕۆژی دوایی، لە نزیکەی کاتژمێر دەی پێش نیوەڕۆ، دوای ئەوەی نان و چای سبەینێیان خوارد لە ژوورەکە دەرچوون و ئاگری زۆپاکەشیان بە تۆزێك بەفر کوژاندەوە، هەرسێکیان بە شوێن پێی ڕێنیشاندەرەکەی دوێنێکە بەرەو گوندەکە ڕۆیشتن کە هێشتا لەسەر بەفرەکە مابووەوە، لەو کاتەدا کەشەکە کەمێك بەرەو باشتر دەچوو، بایەکە هێمن بووبووەوە و چیتر بەفرەکەی هەڵگێر و وەرگێر نەدەکرد تا هەرچی هەیە بیسڕێتەوە و دایبپۆشێت، ئاسمانیش تا ئەو کاتە ساف و بێگەرد و شین دەچووەوە. خۆریش بە خەندە و پێکەنینەوە دەوروبەری تیشکاوێژ دەکرد، وەك ئەوەی گاڵتەی بە قسەکانی دوێنێکەی ڕێنیشاندەرەکە بێت و سوور بێت لەسەر بەدرۆخستنەوەی درۆکەی، ئاخر ئەوە ئەو درەختەیە کە ئەو ئاماژەی پێی دا،

گوایە پێیدا هەڵگژاوە و چۆتەسەری، زەوییەکەش تەخت و ڕێك ڕاکشاوە و بەفر دایپۆشیوە، نە شوێنەواری پێی گورگ و شەڕ و پەلامارەکانیان نە لەژێری و نە لە دەوروبەریشی بە دی ناکرێت و هەر بوونی نییە.

سامان بە دەست ئاماژەی بۆ درەختەکە کرد:

- شیرین بڕوانە، ئەوە ئەو درەختەیە کە ڕێنیشاندەرەکە بانگەشەی ئەوەی دەکرد، گوایە لە ترسی پەلاماری گورگەکان پێیدا هەڵگژاوە، شوێنەوارەکەی لێرە لە قەدپاڵەکە و ژێر درەختەکەدا وەکوو خۆی ماوەتەوە، ها ها ها... پاشان ئەی کوا خوێنی ئەو ئاژەڵانەی گورگەکان لەتوپەتیان کردن و هەڵیانلووشین؟

شیرین لچێکی سەرسوڕمانی هەڵهێنا و گوتی:

- لەوانەیە بەفر باریبێت و پڕی کردبێتەوە، ئەوەش شوێن پێیەکانیەتی دوای ئەوەی بۆ لای ئێمە هاتووە.

ڕەحمان بە منگەمنگەوە سەرنجی زەوییەکەی دەدا، ئەوە شوێنپێی چوون و هاتنە.

سامان لە قەدپاڵەکە لای دا و گوتی:

- واتە بەفر لەو کاتەوە نەباریوە.

شیرین پێی گوت:

- ئەی تۆ بۆ کوێ دەڕۆیت؟!

- دوو هەنگاو بۆ لای درەختەکە تاکوو گومانم لێی نەمێنێت.

شیرین جارێکی تر گوتی:

- ئەرێ ئەو کارە ئەوەندە گرنگە؟!

- نەخێر، تەنها حەزی زانینە و هیچی تر.

پاشان گەیشتە لای دارەکە و بە دەوریدا سوورایەوە، بە پێیەکانی بەفرەکەی پەرشوبڵاو کردەوە، تا بزانێت چی لەژێر بەفرەکەدا هەیە، هێندەی پێ نەچوو گەڕایەوە و گوتی:

- هەرگیز هیچ شتێك نییە!

ڕەحمان پێکەنی و گوتی:

- لە شوێنپێی گورگە فیلەتەنەکە دەگەڕێیت؟

شیرینیش پرسی:

- چۆنت زانی؟

- ئەو کاتە لە نێوان خەوتن و ئاگاییدا بووم، گوێچکەکانم هەندێك لە وشەکانی وەردەگرت، هەتا لام وابوو خەو دەبینم، هەڵبەتە خەیاڵی گوندنشینەکان من سەرسام ناکەن، چونکە من لەگەڵیان ڕاهاتووم.

- ئایا باشە یان خەراپ؟

- باشە، بە مەرجێك سنوورێك بۆ زێدەڕۆییەکانیان دابنێین.

- بە بێ زێدەڕۆیی لە باسکردنی شتەکان، هەواڵ بەهای خۆی لەدەست دەدات، خەڵکی لە سەرنجڕاکێشان چێژ وەردەگرن، لەبەر ئەوەی هەستیان دەبزوێنێت.

- ڕێنیشاندەرەکە چی دیکەی گوت؟

شیرین بە جۆرە ترسێکەوە وای گوت:

- دەڵێن کە مردووەکان لە گۆڕەکانیان هاتوونەتە دەرەوە.

- بۆ گەشت و کاتبەسەربردن دەرچوون؟

ڕەحمانیش پرسی و قاقای پێکەنینی سامانیش لە خۆشیدا لە ئاسماندا دەنگی دەدایەوە.

شیرین ئەوەیشی خستە سەر:

- ڕێنیشاندەرەکە دەیگوت ڕۆژی حەشرە.

سامان بە خۆشییەوە گوتی:

- لە شارەکەی من بە هۆی قەیرانی خۆراکەوە هەموو ڕۆژەکان ڕۆژی حەشر بوون. هەر کە خەڵکی گوێبیستی ئەوە دەبوون فلانە دوکان کارتۆنە هێلکەی بۆ هاتووە، ئیدی دەبووە ڕۆژی حەشر و هەموو خەڵکی ڕوویان تێ دەکرد و لە پێناو بەدەستهێنانی کارتۆنە هێلکەیەکدا قیامەتیان بەرپا دەکرد، دیمەنی بەیەکداهاتن و پاڵ بەیەکترییەوەنانیان ڕێك وەك ئەوەبوو قیامەت ڕابووبێت، وا پێ دەچێت ئەو مردووانەی لە گۆڕەکانیان هاتبوونە دەرەوە چووبن لەگەڵ ئەو خەڵکە بۆ بەدەستهێنانی کارتۆنە هێلکەیەك حەشر بکرێن.

شیرین گوتی:

- ئەدی چۆن ئەی ڕۆژی حەشر نییە؟

ڕەحمان گوتی:

- گریمان وا ڕۆژی حەشر هەیە. ئایا لەسەر زەوی حەشر دەکرێن، یان لە ئاسمان؟

سامان ئەوەی بۆ زیاد کرد:

- ئایا زەوی حەشرکردنی ئەو خەڵکەی پێ دەوێ؟ ئەوەی تێیدا حەشر کراوە بەسە و لێیشی زیادە، دوای دە

ساڵێکی دیکە دەبێ هەسارەیەکی دیکە بە کرێ بگرین ئەمە بەشمان ناکات.

ئەو ئاگرەی دوێنێ گوندنشینەکان کردبوویانەوە، هەمووی بووبووە خۆڵەمێش، تەنها کۆمەڵێکی گەورە نەبێت کە پاشماوەی ڕەگەدارێکی زەبەلاح بوو، پێ دەچێ توانای ڕاکێشانیان نەبووبێت، بۆیە هەر لە شوێنی خۆی ئاگریان تێبەرداوە و ئێستاش ئاگرەکەی نەماوە و خامۆش بووە و بۆتە کۆمەڵە پشکۆی گەورە گەورە و هەر کەسێك بەم ساردوسەرمایە لە دەوری کۆ بێتەوە گەرمایيەکی خۆش و بەچێژی پێ دەبەخشێت. ڕەحمان و سامان ڕاوەستان و خۆیان گەرم دەکردەوە، دوای ئەوەی سامان لەگەڵ شوفێری تراکتۆرەکە ڕێك کەوتن بۆ ڕۆیشتن، بەڵام شیرین لە یەکێك لە ماڵەکاندا مایەوە، تاکوو پشوو بدات، سامان لە کاتێکدا گەمەی بە پشکۆکان دەکرد گوتی:

- ئەزیزم ژیان بە بەردەوامی پەرە دەسێنێت، بۆیە لە سەرمان پێویستە هاوشان لەگەڵ ڕەوڕەوەی ئەم پەرەسەندنەدا ڕێ بکەین، ئێمە ئێستا لە سەردەمی ڤیدیۆدا دەژین.

ڕەحمان بە منگەمنگێکەوە ویستی بۆی ڕاست بکاتەوە و گوتی:

- مەبەستت ڤیتۆی نەتەوە یەکگرتووەکانە؟

- نەخێر، مەبەستم مافی ڤیتۆ نییە، کە وڵاتە زلهێزەکان بۆ ڕێگریکردن لە هەندێك بڕیار بەکاری دەهێنن، هاهاهاها...

- کەواتە ڤیدۆ، یان ڤیدیۆی چی؟ نازانم تۆ چۆن گوتت. پێشتر هەرگیز گوێم لە زاراوەی وا نەبووە.

- ئەمە زاراوەیەکی سیاسی نییە، ئەوە ئامێرێکی کارەبایی بچووکە، چۆن تۆ پێشتر گوێت لێی نەبووە؟

- هەرگیز... پێشتر گوێبیستی نەبووم!

- ئامێرێکە تەنها چەند مانگێکە هاتۆتە بازاڕەوە. کەواتە ئەوە داهێنانێکی نوێیە، وەکوو جادوو، شێوەکەی بریتییە لە سندووقێکی بچووك و بەرزییەکەیشی نزیکەی نیو بست دەبێت.

- ئەو ڤیدیۆیە کاری چییە؟

- هەر زۆر بە سادەیی، بە تەلەفزیۆنەوە دەبەسترێتەوە و هەر بەرنامە و فیلمێکت بە دڵ بێت دەتوانی لەسەر کاسێتێك تۆماری بکەیت و دواتر تەماشای بکەیتەوە. وەکوو ڕیکۆردەری گۆرانی.

- واو... ئایا شتی وا دەبێ؟! بێگومان تۆ شۆخی دەکەیت.

- هەرگیز شۆخی و گاڵتە ناکەم. ئەوەی دەیڵێم بە ڕاستیمە.

- لە قسەکانت وا تێدەگەم ئەگەر بمەوێ بۆ نموونە فیلمێکی جۆن واین ببینم، دەتوانم تۆماری بکەم و بۆ ڕۆژی دواتر تەماشای بکەمەوە؟

- هەڵبەتە ڕێك وایە.

- چەند جار دەتوانم ئەو فیلمە ببینمەوە؟

- هەر کاتێك بتەوێت و ئارەزووی بکەیت، ڕێك وەکوو ڕیکۆردەر کە دەتوانی بە بەردەوامی و بۆ چەندین جاریش بتەوێ گوێ لە گۆرانییەکان بگریتەوە، ئەمیش ئاوایە.

- ئەی خوایە. ئەمە چ داهێنانێکە هەتا لە خەونیشدا شتی وا نییە!

- باشە، ئەی دەتوانم خۆمی تێدا ببینم، وەك ئەوەی دەتوانم دەنگی خۆم بە ڕیکۆردەر تۆمار بکەم؟

- نەخێر... ئەمە کارێکی جیاوازە. تەنها دەتوانیت ئەوە تۆمار بکەیت کە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەوە پیشان دەدرێت، بەڵام کێ دەزانێ، لەوانەیە لە ئایندەدا بتوانن کامێرایەکیش دابهێنن، مرۆڤ لە ڕێگەیەوە بتوانێت وێنەی خۆی تۆمار بکات و ڕاستەوخۆ لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنیشەوە ببینێت. هەموو شتێك لەم دونیایەدا دەشێ ڕوو بدات، بەڵکوو ئەگەر ڕاستیت دەوێ گوێبیستی ئەوەش بووم کە کامێرایەکی واشیان داهێناوە، بەڵام هێشتا نەخراوەتە بازاڕەکانەوە و بە ئاسانی دەست ناکەوێت، هایهوو های، ئێمە لە کوێی ئەم پەرەسەندنە سەرسوڕهێنەرانەداین؟! ئەزیزم من پێم وایە ئەم وڵاتە هەرگیز پێش ناکەوێت، بۆیە ڕاشکاوانە دەڵێم ڕێز لە وڵاتێك ناگرم، کە نەتوانم سەری تێدا بەرز بکەمەوە، تەنها مەگەر ئەو کاتەی خاك و خۆڵەکەی بگۆڕێت بۆ ئۆتۆمبیل و تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ.

ڕەحمان بە گاڵتەجاڕییەکەوە گوتی:

- خۆڵ بگۆڕین بۆ ڤیدیۆ؟! هاهاها... ئێمە بە هەزار دەردەسەری لە خۆڵ کەرپووچمان دروست کرد، ئەویش هەر تۆزێك پاڵەپەستۆی بخەیتە سەر لەناو دەستت هەڵدەوەرێت.

سامان گوتی:

- بۆیە ئێمە مردووین و تازە ناگەینە ئەو دونیایەی وەکوو تیر لە کەوان دەرچووە و بەرەو پێش هەنگاو دەنێت و گەڕانەوەی بۆ نییە. خۆزگە لەم دۆخەی ئێستاشمان بمێنینەوە،

ئەوەی چاوەڕێمـان دەکـات زۆر لەمەی ئێسـتاش خەراپتـرە و ڕۆژێك دێت دەبێ خۆزگە بەم ژیانە بخوازین، وێڕای نەهامەتی و خەم و خولیاکانیشی.

- ئەرێ هاوڕێ ئەم هەموو ڕەشبینییەت لە چی؟

- ئەوە ڕەشـبینی نیـیە، بەڵکـوو ئەوە تـابلۆ و دیمەنـی ڕوخساری ژیانمانە و دڵنیام ئابڕووی ئایندەمان دەبات.

- چۆن؟

- لەبەر ئەوەی خەڵکـانێکی دۆڕاو و شکستخواردووین و لەسەر خاکێکدا دەژین لەسەر دەریـای نەوت مەلە دەکـات، کە هەموو جیهان پێویستی پێیەتی... ئێستا لە مەبەستم تێگەیشتیت؟

ڕەحمان گوتی:

- نەخێر!

سامان گوتی:

- ئەمە واتای ئەوەیە کە ئێمە هەتا دونیا دونیایە دەجەنگین و یەکتـر دەکـوژین و بە جۆرەهـا شـێوە و شـێواز لە ڕووی جەستەیی و هزریشەوە دەمرین، ئەوانەی بەرپرسـی ئێوەشـن کۆ دەبنەوە و ڕاوێژ و گفتوگۆ دەکەن و ئـاوێزانی یەکتـر دەبـن و ئاشت دەبـنەوە، دوای ئەوەی دەیـان هەزار کەس لە پیاوەکانیـان دەکوژرێن، پاشان جارێکی دیکە دەگەڕێنەوە و دوای مـاوەیەك سەرلەنوێ دەست بە ململانـێ دەکەنەوە و یەکتـر دەکـوژنەوە و دواتر ئاوێزانی یەکتر دەبنەوە و سەرلەنوێش ئاشت دەبنەوە. ئێـوە جـگە لە سـەربازی شـەترەنج بەولاوە شـتێکی تـر نـین، یاریزانەکـانیش لە لایەن فەرمـانڕەوا ڕاسـتەقینەکانەوە ڕێـگەی مانەوەیان پێ دەدرێت... ئەو فەرمانڕەوایانەش سـەر بە کەسانی

له خۆیان بەهێزتر و خاوەن دەسەڵاتترن، له کۆتایی یارییەکەدا خاوەن بەرژەوەندییە گەورەکانیش بڕیار دەدەن کام له یاریزانەکان دەبێ بیباتەوه و سەرکەوتوو بێت، چونکه براوەکه ئەوەیانه که زیاتر بەرژەوەندیی گەورەکان بەپێی پلانه داڕێژراوەکانیان دەپارێزێت.

ڕەحمان گوتی:

- ئەی دەربارەی شۆڕشی گەلان چی؟

- ئەزیزم ڕۆژ و سەردەمی شۆڕشی گەلان، یان ئەوەی جاران پێیان دەگوت شۆڕشه میللییه ڕزگاریخوازەکان که تەخت و تاراجی فەرمانڕەوایانیان دەهەژاند کۆتاییان هاتووه و بەسەر چووه، جاران گەلانی چەوساوه و ژێردەسته به دار و بەرد و شمشێر و هەتا پێڵاوەکانیشیان دەجەنگان و له شەڕێکی دەستەویەخەدا بوون، هاهاها... دەی پێم بڵێ، خاوەنی ئەو تەخت و تاراجانه چییان هەبوو، تاکوو وەڵامی ئەو ئازارانه بدەنەوه و خۆیانی پێ بپارێزن، جگه له شمشێر و چەکه سادەکانی دەستیان که زۆر جار گەل دەست بەسەر ئەوانەشدا دەگرن، ئەم جۆره شۆڕشانه لەم ڕۆژگارەدا سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، چونکه ئێستا له سەردەمی تەکنەلۆژیای هاوچەرخدا دەژین، تەکنەلۆژیایەکی ئەوتۆ، تەنها به داگرتنی دوگمەیەك دەتوانن ملیۆنان کەس لەناو ببەن و تەڕ و وشك پێکەوه بسووتێنن. وا گریمان گەلان له شۆڕشەکانیاندا سەر کەوتن و توانییان فەرمانڕەواکانیشیان بگۆڕن، ئەی ئەو کاته چی ڕوو دەدات؟ دۆخی گەلان هەر وەکوو خۆی دەمێنێتەوه، فەرمانڕەوا نوێیەکانیش یان دەکوژرێن، یاخود هەمان ڕێچکەی ئەوانەی پێش خۆیان دەگرنەوه بەر، ئەو کاته گەلی تێکۆشەر شتێك نابینێت جگه له گۆڕینی دەموچاوەکان و شێوەی فەرمانڕەواکان،

وەلێ کار و کردەوەکان هەمان تاس و هەمان حەمامن. ئەمە ڕاستییەکە لە بەرچاوی خۆتی دابنێ و هەرگیز نەکەی لە یادی بکەیت، بیکە ئەڵقە و لە گوێتی کە، تاکوو دڵنیابیت لەوەی ئەمڕۆکە دەیکەیت دەبێ سوودی هەبێت یان نا. ئایا ئێستا تێگەیشتی بۆچی من نائومێدم و دەمەوێ لەم وڵاتە بڕۆم؟

- تێگەیشتم.

سامان دیسانەوە گوتی:

- واز لەوانە بێنە، با سیاسەتی هەنووکەیی و ئەو ململانێیانەی ئێستا لە پێناوی سامانی سرووشتیدا ڕوو دەدەن لە یاد بکەین و لە ڕووی جیهانییەوە بیر لە دابەشکردنی گەلان بکەینەوە، ئێمە لە ڕوانگەی وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە جیهانی سێیەمین، ئەمەش واتای ئەوەیە بەپێی ئەو دابەشکارییە دەکەوینە بەر هەڵمەتی قڕکردن وەکوو دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەمەریکا و کەنەدا و ئوسترالیا. بە کورتییەکەی بتەوێ یان نەتەوێ مانەوە تەنها بۆ باشترینەکانە. بۆ نموونە: ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین هەسارەی زەوی، بە هۆیەك لە هۆیەکان، تەنها جێگەی دوو ملیار کەسی لێ دەبێتەوە، ئەی چی لەو هەموو ملیارە مرۆڤەی دیکە دەکەیت؟ مانەوە بۆ کێیە؟ وەڵامێکی لۆژیکیانە و هۆشمەندانەم دەوێ، نەك سۆزداریانە، دەی هەر ئێستا وەڵامێکی قایلکەرم بدەرەوە.

ڕەحمان بە منگەمنگەوە وەڵامێکی پێشتر ئامادەکراوی دایەوە کە پێشتر گوێبیستی بووبوو:

- زەوی زۆر لەوەش زیاتر هەڵدەگرێت، ئەگەر مرۆڤ شێلگیرانە هەوڵی خۆی بدات...

سامان قسەکەی پێ بڕی:

- ئـا ئەوەتـانێ تـۆ بە وەڵامـدانەوەیەکی سـۆزدارییانەوە هۆشـمەندییەکەی خـۆت تـوورِ هەڵـدەدەیت، بەم قسـانەت لە وەڵامەکە رامەکە و خۆت مەدزەوە... تێکـرای رِێـگەو پێشـنیارە لاوەکییەکانت لێ دەگـرم و پێـت دەڵـێم: گریمـانەی ئەوە بـکە، ئەگەر کارەساتی سرووشتی زەوی گرتەوە و جگە لە دوو ملیار مرۆڤ بەرگەی زیاتری نەگرت، بۆ نموونە ئەگەر سەهۆڵبەندانی هەردوو جەمسەر بتوێتەوە و سەر رِووی زەوی تووشـی بەڵایەك بـوو، یـان چـاخی سـەهۆڵبەندان گەرِیـیەوە، ئەو کـاتە هەرچـی رِووەك و گژوگیـایە لەنـاو دەچێـت و ئاژەڵەکـانیش نـامێنن و برسێتی باڵ بەسەر زەویدا دەکێشێت.

رِەحمان گوتی:

- پێم وایە ئەو کاتە تەنها ئەوانەی سرووشت دەستەبژێریان دەکات بۆ مانەوە باشترینەکان دەبن.

- ئەمە وەڵامێکی هۆشمەندا نییە... ئەمەشی بۆ زیاد دەکەم و دەڵـێم مـرۆڤ یـارمەتیی سرووشـت دەدات لە رِامـاڵین و نەهێشـتنی لاواز و بێهێزەکـان و مـانەوەی باشـترین و بەهێزترینەکان.

رِەحمان بە خۆبەدەستەوەدانەوە گوتی:

- کەواتە چی چاوەرِێی ئایندەی جیهانی سێیەم دەکات؟!

- ئایندەی چی؟! هەتا بۆ هاوشێوەکانی جیهانی سێیەمیش ئایندەیەك لە ئارادا نابێـت، کە لە ئێسـتادا بە سەرانسـەری رِووی زەویـدا بـڵاو بـوونەتەوە، رِەگەزی ئـادەمیزاد بە بێژینگـدا تێدەپەرِێت، ئەمە کارێکە و کەس رِێگەی لێ ناگرێت.

- هیچ چارەسەرێك بۆ ئەو بەڵایە نییە کە بەسەر جیهاندا دێت؟

- خۆت بە دوای چارەسەری باشتردا بگەڕێ، وا خەیاڵ بکە کە تۆ لە جیهانێکی تەواو پێشکەوتوودایت، گریمان دوای سەد ساڵ، یان زیاتر ڕووبەڕووی کارەساتێك بوونەوە. ئەگەر شوێنێك نەدۆزنەوە و پەنای بۆ نەبەن و خۆتانی لێ نەپارێزن، ئەوا هەمووتان قڕ دەبن و لەناو دەچن، پێم ناڵێیت ئەو کاتە ئێوە چی دەکەن و چی لەو هەموو تەکنەلۆژیایە دەکەن کە بە عەقڵی خۆتان دروستتان کرد و داتانهێنا، بە ڤیدیۆشەوە... زۆر بە سادەیی بەرلەوەی ئەو کارەساتە ڕوو بدات دەبێ ئێوە بە زووترین کات بەرەو شوێنێکی ئاسوودە و ئارام کۆچ بکەن. ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین ئاڕاستەکەتان بەرەو وڵاتانی جیهانی سێیەمە و سەرچاوە و دەرامەتەکانی زەویش بەشی هەمووان ناکات، ئەو کاتە بە دڵنیاییەوە گەلانی ئەو ناوچەیە قڕ دەکەن، بۆ ئەوەی لە ئایندەدا خۆتان بچنە جێگەیان. ئەم ململانێیە سرووشتییە و لەگەڵ سەرهەڵدان و پەیدابوونی گیانلەبەرەکانەوە تاکوو ئێستا بەردەوامە، کەواتە بزانە ئایندە بۆ کەسانێك نابێت کە لە کاروانی پەرەسەندن دوابکەون.

ڕەحمان لە کاتێکدا چاو و هەستی بە دوای لۆژیکەکەی ساماندا وێڵ و سەرگەردان بوو گوتی:

- وا پێ دەچێ ڕەچەڵەکی مرۆڤەکان بەبێ پەیبردن و درکپێکردن دابەش بووبن و لقیان لێ بووبێتەوە.

- وا پێ دەچێت.

- بۆچی ململانێکان بەو ڕێگە درندانە و دواکەوتووانەیە ئەنجام دەدرێن؟ جا ئەگەر پێویست بێت زەوی لە میللەتە

دواکەوتووەکـــان چـــۆل و پـــاك بکــــرێتەوە، ئەدی لایەنە مرۆڤایەتییەکە ئەوە ناسەپێنێت کە زاناکـان مـادەیەك دابهێـنن و بـیخەنە نـاو ئـاوی ڕووبارەکـان، یـان هەر خـواردنەوەیەکی تـر، یاخود جۆرە پێکوتەیەکی دیاریکراو، تاکوو کار لەسـەر زاوزێ و زۆربـوونی ئەو گەلانە بـکەن، کە ئامـادە نـین بە ئـارەزووی خۆیان باوەڕ بە ڕاگرتنی زاوزێ و ئەو زۆربوونە خێرایە بهێنن و ئەو داوایەش ڕەت بکەنەوە، ئایا وا باشتر نیـیە بۆیـان بە ڕێـگەی نامرۆڤانەی دیکە خەڵکـی بـۆ ئەوە ناچـار بـکەن، ئەو کـاتە هەر خێزانێك یەك منداڵی ببێـت و لە ئەنجـام و دوای چەنـد سـاڵێك ئەو سەدان ملیۆن مرۆڤە دەبنە تەنهـا چەنـد ملیـۆنێکی کەم بەبـێ شەڕ و جەنگ.

سامان لاجانگی خۆی دەخوراند و گوتی:

- بەهـــا مرۆڤایەتییەکـــان ئەوە قەدەغە دەکەن! هاهاهـــا... سەیرە ئەم بەها ڕەوشتیانە دەبێ چی بن؟! لەوانەیە تا ڕادەیەك بە ڕێگەیەکی مرۆڤدۆستانە ڕێگە لە ڕاماڵین و نەهێشتنی ڕەگەزێکی بێســوود لەســەر زەوی بگــرن، هەمــوو ڕۆژێکــیش بە جەنــگە نەگریســـەکانیان و پاکتـــاوکردنی نەژادی وێـــڕای دژواری و قێزەونییەکەی چاوی خۆیان لە ئاست ڕاماڵین و نەهێشتنی گەلان دەنووقێنن.

ڕەحمان گوتی:

- ئەگەر کارەکە بە دەسـتی مـن بێـت جـووتە شـەقێك لە بەها ڕەوشـتییەکان دەدەم و تووڕیـان هەڵـدەدەمە پاشـەڵەکەی و وڵاتانی جیهانی سێیەمیش ناچار دەکەم کرداری زاوزێ و منداڵ خستنەوە ڕابگرن. پێم نـاڵێن بـۆچی ژیـانی نـوێ دەخـولقێنن، لە کاتێکـدا بـوونی نەبێـت و کـار لەسـەر ئەو ئـازار و سـەختییانە

دەکەن کە چاوەڕوانیان دەکات. تەنها مەگەر عەقڵیان پەکی کەوتبێت؟ پێم وایە باشترین چارەسەری مرۆیی، دەستپێکردنی ڕاستەوخۆیە بە پەکخستنی زۆربوونیان و کەمکردنەوەی ژمارەی کەسەکان.

سامان گوتی:

- لەوانەیە بیکەن! کێ دەزانێت ڕۆژگار چی حەشار داوە؟ هەموو شتێك دەشێ بکرێت. لە ئێستاوە تا ئەو کاتە پێویستە من کۆچ بکەم و وەکوو مرۆڤ بژێم.

ڕەحمان بە جۆش و سووربوونەوە گوتی:

- لە ئێستاوە تا ئەو ڕۆژگارە، ئێمەش پێویستە بژین، بۆ ئەوەی وەکوو مرۆڤیش بژین، هەر دەبێت کۆتایی بەو دیکتاتۆرییە نەگریسە بهێنین. پاشان مستێکی بە تفەنگەکەیدا کێشا و بە هەمان جۆشوخرۆشەوە گوتی:

- هیچ شتێك کۆتایی بە دەرد و نەهامەتییەکانمان ناهێنێت تەنها ئەمە نەبێت.

- وای لەو کارەساتە... دوای ئەو هەموو مشتومڕ و گفتوگۆیە تازە وەکوو سەربازی شەترەنج دەگەڕێیتەوە شوێنی خۆت؟ هێ هێ هێ. ئای چەند ئارەزووی ئەوە دەکەم بزانم چۆن مێشك دەشۆنەوە... دەترسم ڕۆژێك بێمەوە، ژیانمان هێشتا بەرەو خەراپتر خلۆر بووبێتەوە. پاشان پرسیاری تۆ بکەم، یەکێکیان بەرەو پارچە زەوییەکم ببات و بە پەنجە ئاماژە بۆ شوێنێك بکات و بڵێ فەرموو ئەوە خۆیەتی! ئەو کاتە منیش بە دیارتەوە دۆشدابمێنم و ئەم یەکەم دیدارەمانم بێتەوە یاد و بڵێم: ژیانی تەواو نەکرد، لێیان دزی، بێ ئەوەی بتوانێت

گۆڕانکارییەکی تێدا ئەنجام بدات. ئینجا پشتت تێ بکەم و سەرلەنوێ کۆچ بکەمەوە و جارێکی تر نەگەڕێمەوە. لێرە هیچ بژاردەیەك بۆ مرۆڤ نییە، یان دەبێ بکوژ بێت یان کوژراو... جەلـلاد بێت یان قوربانی، کۆیلەیەکی سەرشۆڕ و هەموو چرکەساتێك مەرگ چاوەڕوانی بکات و ئەویش بە بێدەسەڵاتانە پەسەندی بکات و بوێریی ئەوەی نەبێت ورتەیەکی ناڕەزایی لێوە بێت، وەك ئەوەی مەرگ ئەرکێکی پیرۆز بێت و خەڵکیش بەوپەڕی سەرشۆڕی و بێبارییەوە گوێڕایەڵی بن، وەکوو چارەنووسێکی هەمیشەیی.

ڕەحمان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و هەناسەکەی دایەوە و بێدەنگ بوو.

سامان گوتی:

- وا پێ دەچێت خاوەن تراکتۆرەکە خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکات، ئەوەتانێ بەفری کەڵەکەبووی ناو عارەبانەکەی خاوێن دەکاتەوە.

- ئەگەر وا بێت هەتا کاتژمێرێکی دیکە ئینجا دەتوانێت ئامادە بێت.

ڕەحمان وای گوت و تەماشای شیرینی شۆخوشەنگی دەکرد کە لەو کاتە بۆ لایان دەهات و بوخچەیەکی بەدەستەوە بوو، وەك ئەوەی بە ڕاستی ساتەوەختی ڕۆیشتنیان هاتبێت. کاتێك گەیشتە نێوانیان، سامانی هاوسەری گوتی:

- دەچمە لای شوفێرەکە و قسەی لەگەڵ دەکەم، لێرە ڕاوەستن و خۆتان گەرم بکەنەوە، تا دێمەوە.

شیرین گوتی:

- ئەم تراکتۆرە بەستاویەتی چۆن تیای دانیشین.

سامان وەڵامی دایەوە:

- منیش بۆ ئەوە قسەی لەگەڵ دەکەم. داوای لێ دەکەم هەندێك باوەشە گژوگیا و پووشوپەڵاشی وشکەوەبووی تێدا دابنێت، یان هەر شتێکی وشك کە بتوانین لە سەری دابنیشین.

دوای ئەوەی سامان ڕۆیشت، شیرین ڕووی کردە ڕەحمان کە لە ناخەوە داڕووخابوو و هەر بە تەواوی وێڵ و سەرگەردان بووبوو، خۆیشی نەیدەزانی چی بکات!

- ئەم پریاسکەیە بۆ تۆیە، بۆ ڕێگەی گەڕانەوەت یارمەتییەکی باشت دەدات، هەندێك نان و تۆزێك ساوەری تێدایە، لەناو کاغەزێکیش کولێرەیەکی خۆماڵیم بۆ بە دۆشاوەوە کردووی، لەناو کتریی چایەکەش هەندێك شەکر و گەڵاچام بۆ داناوی.

ڕەحمان بە دەنگێکی پڕ لە شەرم و ئابڕووەوە گوتی:

- سوپاس بۆ تۆ، بەڵام وەریناگرم، لەوانەیە ئێوە خۆتان لە گەشتەکەتاندا پێویستیتان پێی بێت.

شیرین بە دەنگێکی جوانتر و خۆشتر لە موزیك وەڵامی دایەوە:

- ئێمە پێویستیمان بە نان نابێت، خۆ بە پێ ناڕۆین، ئەگەر شتێکیشمان پێویست بوو، ئەوا لە گوندەکە وەریدەگرین.

ڕەحمان توێشووبەرەکەی لە دەستی وەرگرت و سەری نەوی کرد و نەیزانی چی پێ بڵێت، چەند ساتێکی درێژ بە

بێدەنگی تێپەڕی، ڕەحمان هیوای دەخواست سامانیان لەگەڵ بووایە، پاشان شیرین بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی:

- وا بزانم ئێوە بە تەنها ناگەڕێن، هەمیشە دەستە دەستە و بە کۆمەڵ دەسووڕێنەوە.

ڕەحمان گوتی:

- ڕاستە، پێداویستییەکانی سەلامەتی و دڵنیایی وا دەخوازێت.

ڕەحمان لەو کاتەی قسەی لەگەڵ شیرین دەکرد سەرنجی نەدەدایێ، نەبادا گڕی خۆشەویستییەکی بێهودە بڵێسە بسێنێت، لە کاتێکدا ئەو ئێستا هاوسەری پیاوێکی دیکەیە و مرۆڤ ناتوانێت جگە لە ڕێز هیچی دیکەی بەرانبەر بنوێنێت، ڕەحمانیش پیاوێکی بە ئاکار و ڕەوشتە و ناکرێ وەکوو کەسێکی بێبەها لە شێوەی ئەبوجگارە وەسف بکرێت.

جارێکی تر شیرینی جوانکیلە گوتی:

- دەبینم تۆ لەم ناوە بە تەنیای.

ڕەحمان منگەمنگێکی کرد و گوتی:

- بەڵێ من بە تەنهام.

شیرین پێی گوت:

- دەگەڕێیتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە هاتبوویت، یان لەم گوندەدا دەمێنیتەوە؟

ڕەحمان سەرنجێکی خێرای بەرەو لای تراکتۆرەکە ئاراستە کرد و ئینجا خۆی بە پشکۆی ئاگرەکەوە خەریك کرد و گوتی:

- هەر کە ئێوە ڕۆیشتن منیش دەگەڕێمەوە.

شیرین بزەیەکی پڕ لە بەزەییانەی بۆ کرد و لە پڕێکا گوتی:

- کەواتە تۆ لە پێناوی مندا هاتیت؟!

ڕەحمان سەری هەڵبڕی و سەرنجێکی پڕ لە سەرسامی و خەماویانەی ئاڕاستە کرد و پاشان بۆ ئەوەی بۆچوونەکەی شیرین بە درۆ بخاتەوە گوتی:

- نەخێر لە پێناوی تۆدا نەهاتم.

ئەو ترس و شەرمەی لە ڕوخساریدا دیار بوو، درۆکەی ئاشکرا دەکرد، دیسانەوە شیرین لێی پرسییەوە:

- قەت عاشق بوویت... ئەی خۆشەویستیت تاقی کردۆتەوە؟

ڕەحمان بە دەنگێکی نزم، هەر ئەوەتە دەبیسترا گوتی:

- بەڵێ.

- ئەی خۆشەویستەکەت لە کوێیە؟

- لێرەیە... لە یەکێك لەم چیایانە.

شیرین گوتی:

- کەواتە ئەو کچە کوردێکە.

- بەڵێ.

- ئەی بۆچی هاوسەرگیری ناکەن؟!

- مرد!

- مرد؟!

- بەڵێ مرد، کوشتیان... بەڵام هەر دەبێ تۆڵەی بکەمەوە.
- تۆڵە لە کێ؟
- لەوانەی کوشتیان.
- دەیانناسیت؟
- کەسوکاری بەبێ تاوانی کوشتیان.
- بۆچی؟
- نازانم.

هەردووکیان بێدەنگییەکی درێژ باڵی بەسەرداکێشان، ئینجا شیرین کە دڵۆپە فرمێسکێکی سکاڵاکارانە لە چاویدا قەتیس مابوو و دەبریسکایەوە، گوتی:

- منیش خوشکێکی جمکم هەبوو، ئەویش مرد... کوشتیان... ئەگەر ئێستا بمابووایە خۆشی دەویستی، ئێمەی کچ لەوە زیاتر چیمان دەوێت خۆشەویستێك هەبێت هەست و سۆزێکی پڕ لە خۆشەویستانەمان پێ ببەخشێت و هیچی تر.

شیرینی شۆخ بە هەستە خۆڕسکی و هزربینییەکەی خۆی و هەستە ناسکەکەی پەی بەوە بردبوو کە ڕەحمان لە یەکەم چرکەساتیماڵی خۆیان، ئەو ئێوارانەی مێوانیان بوو خۆشی ویستووە، ئێستاش بەم سەرماوسۆڵ و سەهۆڵبەندانە لە پێناوی ئەودا هاتووە، بەڵام دوای ئەوەی تارمایی ئەو وێنە تەڵخ و هەڵەیەی لە مێشکی خۆیدا بەرانبەر هاوسەرەکەی هەیبوو، ڕەوییەوە و نەما، ئیدی لەو بڕیارەی پاشگەز بووەتەوە و بە بەشی خۆی ڕازییە بەوەی خوشکە کوژراوەکەی خۆشەویستی بێت.

لەوانەیە بەم دواییــانەش گوێبیســتی چیرۆکــی خوشــکەکەی بووبێت.

ئەوە چ زیرەکی و بلیمەتییەکە هەیەتی.

لە ڕوخساری ڕەحمانی ناخسووتاودا ئەوەی خوێنـدەوە، لەو کاتەی ترسێك دڵی دەگوشی گوتی:

- بەڵێنم پێ بدە تۆڵە لە بکوژەکانی نەکەیتەوە.

ڕەحمان بە زۆر چاوەکانی کـردەوە و دڵـۆپە فرمێسـکێك لە چاویـدا قەتـیس مـابوو، هێشـتا لەنـاو چاویـدا دەبریسـکایەوە و نەخلیسکابووە سەر ڕوخساری، دیسانەوە شۆخەژن گوتی:

- تــۆ دڵێکــی پاکــت هەیە. ڕەوشــتبەرز و خــانەدان و بەخشندەشیت. ئەگەرنا ژیانی خۆت بەجێ نەدەهێشـت و ڕووت نەدەکردە ئێرە و لە چیا نەدەژیایت. دەی... بەڵێنم پێ بـدە تـۆڵە لە بکوژەکانی نەکەیتەوە.

ڕەحمان بێدەنگ بوو، گرژی و خەم و ناسـۆر ڕوخسـاریان داپۆشی، شیرینیش هەر دووبـارەی دەکـردەوە و فرمێسـکیش لە چاوەکانی قەتیس مابوون:

- دەی بەڵێنم پێ بدە... ئێستا بەڵێنم پـێ بـدە، دەی دەسـا تـوو خۆشەویستیی ئەو کەسەی خۆشت دەویست سـوێند بخـۆ و بەڵێنم پێ بدە.

ڕەحمان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

- بەڵێن بـێ، بە حەقـی ئەوەی خۆشـم دەویسـت، بەڵێنـت دەدەمێ کە ڕێگە لە هیچ کەسێکیان نەگرم.

شـۆڕەژن هەناسـەیەکی خۆشـی و ئاسـوودەیی هەڵکێشـا.

سەرنجێکی دوووووری لە ڕوخسارە گرژ و هەڵبزڕکاوەکەی ڕەحمان دا، پاشان خەندەیەکی خەماوی بەسەر ڕوخساریدا پەخش بوو، پێی گوت:

- لە ئێستا بەدواوە تۆ بە بەشێك لە خێزانەکەم دەزانم... وەك ئەوەی خۆشەویست و هاوسەری خوشکە کوژراوەکەم بیت.

دوای نزیکەی نیو کاتژمێر، ئینجا سامان گەڕایەوە لایان، پێش ئەوەی بگاتە لایان شتێکی بۆ ڕەحمان فڕێ دا، ئەویش هەر لە ئاسمان بە خێرایی قۆستییەوە، ئەوەش شخاتەیەکی لوولدراو بوو بە پارچە نایلۆنێك. بە بزەیەکەوە بە ڕەحمانی گوت:

- ئەگەر ئەم جارە بکەویتە ناو ڕووبارەکەوە هیچ شتێك دەربازت ناکات ئەم شخاتەیە نەبێت.

لە دوورەوە دەنگی خاوەن تراکتۆرەکە هات و بانگیانی دەکرد و بەدەست ئاماژەی بۆ دەکردن، هەرسێکیان بەرەو لای ڕۆیشتن، ئەو تراکتۆرەکەی خستبووە کار، شیرین بە دەنگێکی خەماوی ماڵئاوایی لە ڕەحمان کرد و سەرنجێکی خەماوی و بە ئازار و قووڵی دایە ئەو شاخانەی لێیەوە هاتبوو و شتێك دڵی دەگوشی، شتێك نزیك بوو لە سۆز و خۆشەویستی بۆ شوێنی لەدایکبوون و ترسێکیش لە ئایندەی نادیار. کاتێك شیرین لەناو عارەبانەی تراکتۆرەکە دانیشت، ڕەحمان و سامان بە گەرمی باوەشیان بە یەکتریدا کرد، وەك ئەوەی دوو هاوڕێی گیانی بە گیانی بن و دەمێکی زۆر بێت یەکتری بناسن.

دوای ساتێکی کەم تراکتۆرەکە کەوتە ڕێ و بەمەلا و بەولادا دەهات و دەچوو، هێدی هێدی لە ڕەحمانی دوور

خستنەوە، کە لە شوێنی خۆیدا ڕەق ڕاوەستابوو بە ناخێکی پڕاوپڕ لە خەم و ناسۆر و چاوێکی فرمێسکاوی و ڕوخسارێکی خەمبارەوە سەرنجی دەدانێ، ناوەناوەش هەتا لە ڕێگە پێچاوپێچەکە لە چاو ونبوون دەستی بۆ بەرز دەکردنەوە و خوداحافیزی لێ دەکردن. لەو کاتەدا دەبێ قوڵپێکی گریانی چەندە بە سوێ لە ڕۆح و ناخی ڕەحماندا ئارەزووی دەنگدانەوەی لەو کەشە سارد و سەهۆڵبەندانەدا هەبووبێت؟!

# بەشی بیست و سێیەم

هـاوینی ڕابـردوو، بارەگاکـانی "پشتئاشـان" شـەش چەکـی سەرشانیان لە جۆری ڕۆکێتـی سـام٢ وەرگـرت. ئەو چەکەی لە ئاسماندا دوای فڕۆکە دەکەوێت و هەتا پارچەپارچەی نەکات لە کۆڵی نـابێتەوە و وازی لـێ ناهێنێت. ئەمەش بە لای ئەو گەورە چـاودێرانەی کە سووســە و پایــدۆزی گەمە خوێنـاوییەکەی جەنگـی نێـوان عێـراق و ئێرانیـان دەکـرد، هێڵێکـی سـوور و پێشهاتێکی مەترسیدار بوو، وەلێ یاریزانە بچووکەکـان مەترسیی بەدەستهێنانی ئەو چەکەیان هەست پێ نەکردبـوو، لەوەی گەورە چـاودێران لە ئەنجـامی ئەو سـنووربەزاندنەیان بێـدەنگ نـابن و گوێیان ڕادەکێشن و سزایەکی وایـان دەدەن کە حەوت پشتیان عاقڵ بکات.

لە شـوێنێکی دوور... زۆر دوور لەم چیـاوچۆلە دابـڕاوانە لە ژیان، زۆر دوورتر لە تێکـڕای ئەم دۆڵ و پێدەشـت و زەوییـانە، لەوێ لە پشـــت دەریاکـــانەوە، کە شارســـتانی هەیە و شـــارە گەورەکـــان و تەلار و باڵەخـــانە بەرزەکـــان بەرەو ئاســـمان هەڵکشـــاون، لەوێ لەو قەرەبـــاڵغییە بەردەوام و هەراوزەنـــایەی هەرگیز نابڕێتەوە. لەوێ ئەو خەڵکەی ڕۆژەکانی خۆیان بە دوای خۆشی و بەختەوەری و سەرچاوەکانی خۆشگوزەرانیدا وێڵن کە هەرگیـز کۆتـایی نـایەت و وشـك ناکـات، لەوێ پیاوێـك هەیە دەتـوانین بە کەسێکی گەنجی دابنێین، چاویلکەی گەنجێکـی بیست ساڵانی لە چاودایە، وێڕای ئەوەی خۆی لە تەمەنی سی و پێـنج سـاڵی دەبێـت. نەك وەکـوو ئەو برســی و مانـدووانەی

شاخەکان کە ڕوخساری کەسێکی بیست ساڵیان لە ڕوخساری کەسێکی تەمەن چل ساڵەی ئەوێندەرێ دەچێت، ئەوانەی لەو شارە گەورانەی پشت دەریاکانەوە دەژین. لە هەڵسوکەوتی ئەو پیاوە پێست تەڕ و ناسکە، هیچ نیشانەیەکی گەورەیی و بەرپرسیاریتی بە دی نەدەکرا، هەر کەسێك سەرنجی بدابووایە، جگە لە مرۆڤێك وەکوو هەر مرۆڤێکی دیکەی ئاسایی شتێکی نامۆی بەرچاو نەدەکەوت و بە دی نەدەکرد، مرۆڤێك سبەینانی زوو لە ماڵەکەی دێتە دەرەوە و دەچێتە سەر کارەکەی و ئێوارە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، لەگەڵ خانەوادەکەی دادەنیشێت و یاری لەگەڵ منداڵەکەی دەکات و لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی ماڵەوەی بۆ قوتابخانە یارمەتیی دەدات، هەندێك جاریش کە زوو بگەڕێتەوە ماڵەوە، بە ڕاکردن دەردەچێتە دەرەوە و لە شەقامەکە ڕا دەکات و خۆی دەگەیەنێتە نزیکترین باخچە و لەوێ هەندێك ڕادەکات و دوای ئەوەی بەشێکی زۆری وزەی زیادەی جەستەی دەسووتێنێت و ڕاکردنی نزیکەی کاتژمێرێك، ئینجا دەگەڕێتەوە ماڵەوە و کاری ئاسایی خۆی لەگەڵ خێزانەکەی دەست پێ دەکاتەوە، بەڵام ئەمڕۆ کارێك ناچاری کرد سەرلەنوێ بگەڕێتەوە بۆ سەر کارەکەی، وەلێ ئەم جارەیان نەچووە نووسینگەکەی، بەڵکوو لە یەکێك لە بارەکاندا چاوی بە بەرپرسەکەی کەوت، کە تەمەنی دەوروبەری چل ساڵان دەبوو، پێکێك شەرابیان نۆشی و بارەکەیان بەجێ هێشت، کە هێشتا دەنگی موزیك و هەراوزەنای گۆرانی و غەڵبەغەڵب تیایدا لەوپەڕیدابوو.

بەرپرسەکە بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

- ڕۆبی وەڵامم بدەرەوە، ئەگەر کەشتیەوانێك بیت و کەشتیەکەت خەریك بێ نقووم بێت، بەلەمی دەربازکردنەکانیشت بەشی تەنها چارەکێك لەو ژمارەیەی ناو

کەشتییەکەت بکات، ئەو کاتە کێ دەرباز دەکەیت؟

- تەنها لەبەر ئەوەندە بانگت کردم؟!

- نا نا... ئەمە بیرۆکەیەکە لە دیمەنی فیلمێکی سینەماییدا بینیم و سەرقاڵی کردووم.

ڕۆبی وەڵامێکی بەڵگەنەویستانەی دایەوە:

- تەنها منداڵەکان و پیرەکان. ژنەکان ناڵێم، نەبادا تووڕەیی سامینتا بورووژێت، لەبەر ئەوەی میزاجی تێك دەچێت و نارەزایی دەردەبڕێت و وای دادەنێت کە ئەوە کەمکردنەوەیە لە توانای ژن.

- واتە یەکەم جار لاواز و بێدەسەڵاتەکان؟

- ئەدی ئەوە هەنگاوێکی لۆژیکیانە نییە؟

- نەخێر.

بەرپرسەکە وا وەڵامی دایەوە، ڕۆبیش بە منگەمنگەوە گوتی:

- ئەی کەواتە چۆن؟!

- بە دوای بیرۆکەکەدا بگەڕێ، وەڵامەکەی دەدۆزیتەوە، یان هەر وازی لێ بێنە و لە بیری بکە. پرسێکی گرنگتر هەیە، وەڵامی ئەو ڕاپۆرتەی نووسیبووت و پیشانت دام، ئێستا وەڵام دراوەتەوە.

ڕۆبی بە سەرسامییەوە پرسی:

- بەم خێراییە؟!

- بەڵێ بەو خێراییە.

- ئەی وەڵامی ئەوان چییە؟

- دەستەواژەیەکی کورتە: بەو کارە گەوجانەیەتان وەڕس و بێزارمان مەکەن. دەمانەوێ کەش و ئاو و هەواکە پاك و بێگەرد بێت.

- کەواتە ئەرکەکە خراوەتە ئەستۆی ئێمە.

- بە تایبەت بۆ تۆ... بەر لە کۆتایی زستان دەمەوێ گوێم لە هەواڵی نوێ بێت.

- کەشەکە پاك و بێگەر دەبێت... بەڵام بۆچی باڵێۆزخانە لەوێ دەستەبەری ئەو کارە ناکات.

- نازانم... لەوانەیە بواری ئەوەیان نەبێت و سەرقاڵ بن.

- ورچەکە پەیوەندی بەوەوە نییە.

بەرپرسەکە ئەوەی گوت و ڕۆیشت.

- خۆت تەمبەڵ مەکە... بە خێرایی کارەکەت ئەنجام بدە، تۆ مووچە وەردەگریت، پەنا بۆ سامینتا ببە.

- ڕۆبی ڕوخسار تەڕ و ناسك هاواری کرد:

- ئەدی سامینتا پشووی وەرنەگرتووە؟

بەرپرسەکە بە بێزاری و بە دەست ئاماژەیەکی بۆ کرد و لێی دا ڕۆیشت.

بەیانیی ڕۆژی دواتر سامینتا لەگەڵ ڕۆبیی تەڕپۆش و ناسك، پێکەوە ڕۆیشتن، سامینتا ئافرەتێکی قژ زەرد بوو، ڕوخسارێکی جوانی هەبوو، وێڕای ئەوەی کەمێك مرومۆچ بوو، برۆکانیشی بە بێزاری بەیەکدیدا دەدا، لە تەمەنی سی و دووساڵیدا بوو. زمانی عەرەبی باش دەزانی. سرووشتی کارەکەی

وای لێ کردبوو وشە و دەستەواژەی وا بەکار بهێنێت کە جۆرە بەرزی و شکۆیەکیان تێدا بێت. سامینتا وەرگێڕێکی بە متمانە بوو. ئەو ئەرکی کاروباری عێراقی لە ئەستۆ بوو و گەلێ جاریش نێوەندگیریی بەڕێوەبردنی گفتوگۆکانی دەکرد. بەڵام هەرگیز لەسەر شاشە دەرنەدەکەوت و قەتیش لەگەڵ ئەوانە کۆ نەدەبووەوە کە قسەی لەگەڵ دەکردن، بەڵکوو هەموو شتەکانی لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە بوو، تۆزێك بێزاری پێوە دیار بوو، لە کاتێکدا بە کەمێك تووڕەییەوە قەپی لە سێوێك دەدا گوتی:

- ڕۆبی بەسە چیتر نووکی قەڵەمەکەت مەدەرە سەر مێزەکە.

ڕۆبی گوتی:

- دەمانەوێ ئێستا تەواو بین.

- تەواو بین؟! بۆ من کۆتوبەندم کردووی؟! دەی منیش دەمەوێ تەواو بم. من بە هۆی تۆوە مۆڵەتی پشووەکەم ڕەت کردەوە. منداڵەکەم لەگەڵ باوکی بەجێ هێشت و بۆ لای تۆ هاتم.

- من داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام تۆ هەستیاری و وردی کارەکەمان دەزانیت.

- دەی کەواتە با کۆتایی پێ بهێنین.

- نەك پێش ئەوەی سێوەکەت بخۆیت. یان دەتەوێ سێوەکەت بخۆیت و قسەش بکەیت.

- ئای ڕۆبی چەند مرۆڤ بێزار دەکەیت، من ئامادەم، ئایا هێڵی گەرم ئامادەیە؟

پاشان بە سووکەڵەییەکەوە پاشماوەی ئەو سێوەی بەدەستییەوە

بـوو فرێـی دایە نـاو سـەبەتەی زبـڵەکەوە، کە لە گۆشـەیەکی ژوورەکە دانرابوو.

ڕۆبی هاواری کرد:

- گۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆڵ.

بە پرتەوبۆڵەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- ئای کە هەوەسێکی نەشیاوت هەیە!

پـاش کەمێـك ڕۆبـی و سـامینتا لەسـەر هێڵـی گەرم بـوون، گوێیان لە دەنگێکی هێمن و لووتبەرزانە بوو:

ڕۆبـی بە زمـانێکی ئەمەریکییـانە دەسـتی بە قسـان کـرد و سامینتاش ڕاستەوخۆ قسەکانی وەردەگێڕا:

- بەیانی باش سەرۆکی بەڕێز...

بێدەنگ بوو کاتێك گوێی لە وەڵامی لایەنـی بەرانـبەر بـوو لەسـەر هـێڵەکە وەڵامـی دایەوە. پاشـان دەسـتی بە تەواوکردنـی وەرگێـڕانەکەی کـردەوە، کاتێـك تەواو دەبـوو، ئینجـا کەمێـك قسـەی دەکـرد، کاتێـك بێـدەنگ دەبـوو، سـامینتا دەسـتی بە وەرگێڕان دەکردەوە، لایەنی بەرانبەر بە دەگمەن بەدواداچوونی بۆ قسەکان هەبوو، لە کۆتاییدا سامینتا گوتی:

- هەروەهـــا ئـــاژانس زانیـــارییەکی مەترســـیداری لایە، دەربارەی باکووری وڵات، بەوەش کەشەکە خاوێن نییە، دوای ئەوەی یەکێك لە هێزەکان شەش پارچە چەکی سام٢ دوویان لە یەکێك لە ڕێکخراوە فەڵەستینییەکانەوە وەرگرتووە.

دوای گفتوگۆیەکی خێرا دەربارەی ئەو هێـز و لایەنەی ئەو

چەکەیان بەدەست هێناوە و کاریگەریی ئەو چەکە لەسەر جووڵەی فڕۆکە جەنگییەکان.

لایەنی بەرانبەر لەسەر هێڵەکە بە هێواشی و لەسەرخۆ گوتی:

- گەیشت... دەست خۆش.

هەر کە گفتوگۆ تەلەفۆنییەکە تەواو بوو و هێڵەکە داخرا، سەرۆك بە یەکێك لە ڕاوێژکارەکانی نووسینگەکەی گوت:

- بانگی سوورەم بۆ بکە، پێم وایە ئێستا ئەو لێرەیە.

وەك ئەوەی سوورە لە پشت دەرگاکەوە لە چاوەڕوانیدا بێت، دوای چرکەساتێك لە بەردەم سەرۆك ئامادە بوو. دوای سڵاو و پێشکەشکردنی گوێڕایەڵی بۆی، لەسەر تەختێکی نەرمونۆڵ دانیشت، نووسینگەی سەرۆك پانوبەرین بوو، شکۆ و گەورەیی پێوە دیار بوو، بە بڕشترین خەیاڵیش توانای وەسفکردنی نەبوو، زێدەباری جوانییەکەی، بە جۆرێکی وا نەخشەسازی بۆ کرابوو کە سام و ترس بخاتە دڵی هەر کەسێك بچێتە ژوورەوە، یەکسەر مرۆڤ هەستی بە لەناچوون و نغرۆبوونی خۆی دەکرد. ئەو هەستە هەرگیز نەدەڕەوییەوە، تەنها دوای ڕاهاتن و دانیشتنی زۆر لەو شوێنە و ڕاهاتنی چاو و سەقامگیربوونی دەروونی تیای.

کاتێك سوورە چووە ژوورەوە، کەمێك شڵەژا، وەك ئەوەی بۆ یەکەم جاری بێت دەچێتە شوێنی وا. ڕاستە نووسینگەکەی سوورەش زۆری لەو شکۆ و مەزنییە کەمتر نەبوو، بەڵام سنوورێك هەیە، ناکرێ ئەو بیبەزێنێت. چونکە گەورەیی و

قەبەیی نووسینگەی سەرۆك و كۆشك و تەلارەكانی بە جۆرێكن نابێ كەس زێدەڕۆییان بەسەردا بكات، نەبادا لەگەڵ مەزنێتیی سەرۆكدا بكەوێتە ڕكەبەری و ململانێ كە هیچ شتێك لەو بەرزتر نییە.

وا پێ دەچوو هەوەسی سەرۆك كراوە و خۆش بێت، لە پشت مێزەكەیەوە هەستا و لە بەرانبەر سوورە دانیشت، كە پاشكۆیەتی و وابەستەیی و دڵسۆزی زۆری بۆیان هەبوو. سەرۆك بە پێكەنینەوە گوتی:

- هع هع هع دوا نوكتەی ناو میللەتت گوێ لێ بووە؟
- سوورە بە زەردەخەنەیەكەوە گوتی:
- نەخێر گەورەم.

دیسانەوە سەرۆك بە پێكەنینەوە گوتی:

- هع هع هع گەل دەڵێ: سەرۆك لە سوورەی پرسی ئێستا كاتژمێر چەندە؟ سوورە وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: وەك ئەوەی خۆت دەتەوێت، هع هع هع هع.

سوورەش بە شەرمەوە پێكەنی و بەو نوكتەیە هەستی بە ڕەزامەندی كرد، لەبەر ئەوەی ئەوە ئەستۆپاكیی گەلە بۆ ئەو و نیشانەی دڵسۆزی و وابەستەبوون و گوێڕایەڵییەتی بۆ سەرۆك. ئەوەش تاكە شتێك بوو ئەوانەی لە سەرۆكەوە نزیك بوون ئاواتی بۆ بخوازن، لەبەر ئەوەی تەنها گومانێكی كەم بە وابەستە نەبوون و تەنها وشەیەكی سەرزارەكی و بێ مەبەستیش بێت،

ئەو کەسە و خانەوادەکەی بە گەورە و بچووکەوە تووشی لەناوچوون دەکات. سەرۆك لەم لایەنەوە هەرگیز شۆخی نازانێت.

جارێکیان سەرۆك لە ژوورێکی فراوان لەگەڵ وەزیرەکانی کۆ بووەوە، لە پشت تەختی دانیشتنەکەی سەرۆك و بە دووری دوو مەتر دەرگایەك هەبوو، نەمدەزانی بۆ کوێ دەڕوات. ئەو کاتە گفتوگۆکە دەربارەی جەنگ بوو، کاتێك یەکێك لە وەزیرەکان نەیزانی وابەستەیی و پاشکۆیەتیی ڕەهای خۆی بە شێوەیەکی باش بۆ سەرۆك دەرببڕێت، وێڕای ئەوەی سەرۆك باش لە پابەندبوون و ملکەچبوونیشی بۆی دڵنیابوو و هیچ تەمومژێکیش لەو دڵسۆزییەیدا نەبوو، وەلێ سەرۆك لە شوێنی خۆی هەستایە سەر پێ و داوای لە وەزیری ناوبراو کرد لەگەڵیدا بڕوات، لە دەرگای پشت تەختەکەی خۆیەوە چوونە دەرەوە، تەنها دوای چەند چرکەیەك وەزیرەکان گوێیان لە دەنگی گوللە بوو. سەرۆك گەڕایەوە لایان و لە شوێنی خۆی دانیشتەوە و هێشتا دەمانچەکەی بەدەستییەوە بوو و لە نزیکی خۆی داینا. دواتر ئەم زانیارییە دزەی کرد و ئیدی هەر کەسێك لە بەرپرسانی دیکە دیمەنەکەشی نەدیبێت، ئەو هەواڵە دەیتۆقاند و پرزەی لەبەر دەبڕی.

ئێستا سوورە هەست بە ئاسوودەییەکی ئەوتۆ دەکات باس ناکرێت، چونکە سەرۆك کەیفسازە، سەرۆك بە هێواشی گوتی:

- دەمەوێ لەگەڵ مام جەمال کۆ ببیتەوە و داوای ئەوەی لێ بکەیت گوێی پیرەکان ڕابکێشێت، پێی بڵێ دەمەوێ گوێم لە هەواڵی خۆش بێت. هع هع هع.

سووره بە هێمنی و ڕێزێکەوە پرسی:

- گەورەم ئەو یاخیبووانە چییان کردووە؟

- هەواڵی ئەوەم پێ گەیشتووە کە چەکی (سام٢)ی سەرشانیان بەدەست هێناوە.

- لە ورچی ڕووسییەوە گەورەم؟

- نەخێر. ورچەکە ئەوە ناکات... ورچەکەش وەکوو مام سام هاوڕێمانە... هع هع هع.

- کەواتە لە کێوە گەورەم؟

- لە فەڵەستینییەکانەوە.

- فەرمانتە گەورەم.

- کەواتە پێویستییان بە گوێڕاکێشان هەیە.

- هەردووکیان؟

- یەکەم جار یاخیبووەکان... حەق و حیسابی من لەگەڵ ئەو هێزە فەڵەستینییە کاتێکی تر دەبێت.

- گەورەم وای دابنێ کەشوهەواکە خاوێن و بێگەردە.

- بارەکەڵلات لێ بێ.

- مام جەمال بۆ ئەم ئەرکە ڕادەسپێرم.

- پێی بڵێ تەنها نینۆکیان بکات و دەستیان نەبڕێت، هەرچۆنێك بێت ئەوان لە خەڵکی دیکە باشترن.

- نینۆکبڕی بدەمێ گەورەم؟

- هع هع هع ئەم نوکتەیەیان بەهێزە. نینۆکبڕەکەم بە دڵە. هع هع هع، مام جەمال هەر یارمەتییەکی پێویست بوو بیدەرێ... مام جەمال شایانی هەموو چاکەیەکە. پێیشی بڵێ: عەرەب بۆ من و کوردیش بۆ خۆی. هع هع هع هع...

- فەرمانتە گەورەم.

زۆری نەخایاند، کۆپتەرەکان ڕاستەوخۆ لەگەڵ شاندێکی حکوومەت بە سەرپەرشتی سووره بەرەو لای مام جەمال هەڵفڕین و لەوێ خودی مام جەمال و گەورە یاریدەدەرانی پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردن و هیوای ئەوەیان خواست کە سەرۆك لێیان ڕازی بێت و تۆزێك سۆز و خۆشەویستیان پێ ببەخشێت. مام جەمال ئەو ئەرکەی وەکوو پێشەکییەك بۆ خۆشەویستی و متمانەپێکردن و پێگەی بەرزی لە دڵی سەرۆکدا ئەژمار کرد، پەیامێکی زارەکیشی دایە مێوانەکانی بەوەی: "با سەرۆك -خوا بیپارێزێ- دڵنیا بێت لەوەی داوای کردووە لە کات و ساتی دیاریکراودا جێبەجێ دەکرێت".

دوای گەڕانەوەی شاندی حکوومەت. مام جەمال بەرپرس و سەرکردەکانی خۆی کۆ کردەوە و لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا گوتارێکی پڕ جۆشوخرۆشانەی پێ دان و وورەی بەرز کردنەوە و لەو پلان و نەخشەسازییەی بۆ ئەو کارە کردوویانە نابێ هیچ هەڵە و کەمتەرخەمییەك ڕوو بدات و تەواوی هێزەکانی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە خستە ئامادەباشییەوە، پەیوەندیی بە جاشەکانی سەر بە ڕژێمیش کرد و داوای چەکی پەرەسەندوو و

فیشەك و پێداویستیی زۆر و جۆراوجۆری شەڕیشی لێ کردن. پاشان مام جەمال سیخوڕەکانی لە دەوروبەری بارەگای هاوڕێ پیرەکانی لە "پشتئاشان" چڕتر و زۆرتر کرد و وردترین زانیاریی لە سەریان بەدەست هێنا. کە کاتی جێبەجێکردنەکەش نزیك بووەوە، چەکدارەکانی لە لایەکی چیای قەندیلەوە دەستیان بە هێرش و پەلاماردانی سەر بارەگاکانی "پشتئاشان" کرد، ڕێگەی هەندێك لە چەکدارەکانیش بەو بارەگایەی پیرەکاندا تێدەپەڕی کە لە گوندی ڕەزگە بوون، ئەوانیش دەستەیەکی دیکەی سەر بە پیرەکان بوون لە ناوچەیەك نزیکەی شەش کاتژمێر بە پێ لە بارەگاکانی "پشتئاشان"ەوە دوور بوو و دەکەوتە لای ڕاستی چیای قەندیل کە لە سنووری ئێرانەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ناو عێراق. ئەوەی بارەگاکەی ڕەزگەی پیرەکانی لەوانەی دیکە جودا دەکردەوە پێکهاتە خێڵەکییەکەیان بوو کە یەکی خستبوون و بەهێزی کردبوون! هەموو پێشمەرگەکان لەو جووتیارانە بوون لە گوند و چیاو شارۆچکە بچووکەکانی نێوان لوتکە بەرزەکاندا لەدایك بووبوون و پابەندبوونی خۆیان بەو کەسە ئازایەی ناویان دەبەخشی کە بەرپرسیاریان بوو، بە هیچ شێوەیەکیش لە فەرمانی دەرنەدەچوون، دروشمی خۆڕسکانەی دەستەکەی ڕەزگەش تەنها ئازایەتی بوو و شوێنی کەسێکیشیان لا نەدەبووەوە کە بەرگی ترسنۆکی لەبەردا بێت، جگە لە ئازایەتی نەبێت. هێزەکانی مام جەمال دەستەدەستە و بە دوای یەکتردا ڕوویان تێ کرد، دەستەی بارەگاکەی ڕەزگە پێشوازی گەرمیان لێ کردن و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە مێوانداریيان کردن. ئیدی دەستەدەستە و بە دوای یەکتردا دەستە و هێزی دیکە دەهاتن و تێدەپەڕین، دوای

تێپەڕبوونی کات، ئەوانەی بارەگای ڕەزگە گومانیان لەو جووڵە نائاساییە پەیدا کرد، بە تایبەتی دوای ئەوەی زانییان مێوانەکانیان لە هەموو لایەکەوە پێشڕەوی دەکەن، بەمەش پێشمەرگەکانی ڕەزگە کەوتنە ئامادەباشییەوە و بە پەلە پیرەکانیان لەو جووڵە گوماناوییانە ئاگادار کردەوە، بەڵام وەڵامی پیرەکان ڕۆمانسیانە بوو و توانی بەسەر ئەو حاڵەتی ئامادەباشییەیاندا زاڵ ببێت، کاتێك لە وەڵامدا گوتبوویان: "مامەڵەی باش لەگەڵ پێشمەرگەکانی مام جەمالدا بکەن و هەموو پێداویستییەکی حەسانەوەیان بۆ دابین بکەن!"

تا ئەو کاتەی هەموو هێزەکان مۆڵیان خوارد و خواردنی باشیان دەست کەوت و حەسانەوە، ئینجا دەستیان بە غەدر و ستەمکارییەکەی خۆیان کرد، مێوانەکان لەگەڵ خانەخوێیەکانیاندا دەستەویەخە کەوتنە شەڕێکی گەرمی لە ناکاوەوە، لە ئەنجامی شەڕە دەستەویەخەکەدا خانەخوێکانی پیرەکان، ئەوانەی چەند ڕۆژ بوو لە خزمەتی ئەو سپڵانەدا بوون، بەرەو شاخەکان پاشەکشەیان کرد، بەڵام دوای ئەوەی تای تەرازووی هێز بە لای دەستەکەی مام جەمالدا شکایەوە، لەگەڵ قرمەژنی دەنگی گوللە و بڵێسەی چەکەکان و ئەو گاڵتەجارییەی ئەو ناوەی پڕ کردبوو، دەنگی یەکێك لە پێشمەرگەکانی ڕەزگە بەرز بووەوە و پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد: "ئەوەتانێ جارێکی دیکەش دەستی ستەمکاری و غەدرتان لێ وەشاندینەوە. ئەوەی ئەنجامی دەدەن، پەڵەی شەرمە بە مێژووتانەوە و هەتا دونیا دونیایە دەبێ بەو شەرمەزارییەوە بناڵێن

و بتلێنەوە، ئەوەی ئێوە کردتان کەسی تر لە دوای ئێوەوە لە ڕووی نایەت بیکات". مێوانە بەدنمەکەکانیش لە شوێنی باڵادەستیی خۆیانەوە دەیانگوت: "ئێمە غەدرمان لێ نەکردوون، بڵێن ئەوە فێڵێك بوو کردتان، ئەدی نەتانبیستووە، شەڕ فێڵ و فریودانە". ئیدی دەستڕێژی گوللەی هەردوو لا بەردەوام دەبێت. کەچی ئاگری چەکەکانی ئەو چەکدارانەی مام جەمال کە بەرەو لوتکەیەك لە لوتکەکانی قەندیل هەڵشکاون و لەناو کۆنە مۆڵگەی چۆلی سەربازەکان لە پشت گوند و پێشەوەی بارەگاکانی "پشتئاشان" خۆیان قایم کردووە، ئەو شوێنەی پێی دەڵێن "ئاشقوولکە" کە دەستەیەك لە پێشمەرگەکانی پیرەکان لەوێ گردبووبوونەوە و هەرسێ ڕەبایە سەربازییە چۆلەکەی ئەوێیان گرتبوو. وێڕای ئەوەی لێرە شەڕ گەرم بوو، کەچی پیرەکان لە هاوینەهەواری "پشتئاشان" ئەوەندە بایەخ و گوێیان پێی نەدا. هۆی سەرەکیی ئەم شلوخاویەش متمانەی ڕەهایان بوو بەوەی ئەوان دەست بۆ کۆترەکانی ئاشتی نابەن، چونکە ناکۆکییەکی ڕاستەقینەیان لەگەڵ مام جەمالدا نییە، لەبەر ئەوەی چەندین جار وەکوو فریشتە ئاشتەواییان هێناوە و ناکۆکی و ململانێی نێوانی و نێوان ناحەزەکەی مەحموود بورهانی چارەسەرکردووە و ئاشتیان کردوونەتەوە. چەندین جار لەگەڵ هەردوو لا دانیشتوون و لە سۆنگەی زۆری و لەڕادەبەدەری دۆستایەتی و هاوڕێیەتیی گەرموگوڕیان شەونخوونی و مشتومڕیان لە نێواندا کردوون، کەچی ئەو ستەم و غەدرەی ئەوان تا کۆتاییش نەگەیشتە خودی پیرەکان، بەڵکوو ئاڕاستەی

چەکـدارەکانیان بـوو کە لێـرە و لەوێ پەرتـوبڵاو بووبـوونەوە، وێڕای هەموو ئەمانەش مام جەمـال ئەوپەڕی ڕێـز و شـکۆی بـۆ پیرەکان دادەنا.

ڕۆژێکی دیکە و یەکێکی تریش تێپەڕی و چەکـدارەکانی مـام جەمـال تـا دەهـات زیـاتر خـڕ دەبـوونەوە و ژمارەیـان لەو ناوچەیە زیاتر دەبوو، پیرەکـان ئومێدی ئەوەیـان دەخواسـت کە ئەو دووره تەقـانە کۆتاییـان پـێ بێـت و هەردوو لا بگەڕێـنەوە شـوێن و جێگەوڕێگەی خۆیـان. بەڵام وا پـێ دەچـوو دۆخەکە سات لە دوای سات ئاڵۆزتر بێت، یەکێك لە پێشمەرگەکان هات و داوای خواردن و تەقەمەنیی زیاتری کرد، ئەوانیش داوایـان لە ڕەحمان کـرد کە تـاکوو ئەو کـاتە جبەخـانەکەی لە بەردەسـتدا بـوو، هەمـوو شـتێکیان بـداتێ کە پێویسـتیان پێیەتـی. ڕەحمـان حەزکردنی لە زانینی شتەکان، پاڵی پێوە نـا ڕوو لە بەرەی شـەڕ بکات، وێڕای کزیی چاوی کە وەکوو جاران تواناییـان نەمـابوو، بەڵام دوای کەمێك مشتومڕ و گفتوگۆ لەگەڵ بەرپرسـانی ئەوێ تـوانی پیرەکـان قایـل بکـات و بچێـت بـۆ بەرەی شـەڕەکە، بە پاساوی ئەوەی کە ئەو پێشتر و لە هەمان ناوچە و بەر لە ساڵ و نیوێك شەڕی لەگەڵ کردوون، بۆیە بوونی ئەو زۆر پێویسـتە بـۆ زانینـــی ئەوەی لەوێ ڕوو دەدات، بەو مەرجەی ڕۆژی دواتـــر بگەڕێـــتەوە بارەگـــا. کـــاتژمێر چـــوار و نیـــوی پاشـــنیوەڕۆ و دەوروبەری عەسـر بـوو، لەگەڵ ئەو پێشـمەرگەیەی بـۆ چەك و تەقەمەنی هاتبوو، چوونە جبەخـانەکە و بـاری هێسـترێك لەوەی داوایان کردبوو بار کرد، هەواڵدەرێکیشی لەگەڵ خۆی بـرد کە توانای کردنەوەی جوفرەی لەگەڵ ئامێری بێتەل هەبوو.

پاشـان بە نـاو ئەو تاشـەبەردانەدا بەرەو گونـدی ئاشـقولکە ڕێگەی خۆیان بڕی، ئەوەتانێ سەگەکەشیان "ئـانۆ" کە لەگەڵیـان دەژیا، لە ناکاو لە پەنای تاشـەبەردەکانەوە دەرکەوت و بە دوای هێسترەکەدا کەوتە ڕێ. هاواری بەسەردا کـرد بگەڕێتەوە، تێـی قوچانـد و هەڵات. دوای کەمێـك گەڕایەوە لایـان و دوایـان کەوتەوە. دوای ئەوەی مـاوەیەکی باشـیان بـڕی، هێسـترەکە بە هـۆی پشتگوێخسـتنەوە شـەکەت و مانـدوو بووبـوو و هێـواش هێواش خێراییەکەی کەم دەبووەوە و نەدەما، ڕەحمان هەوڵی دا خێراتـر بـڕوات، بەڵام یەك سـانتیمەتریش خێـراییەکەی زیـاتر نەکـرد. ئـانۆ ئەم دەرفەتەی قۆستەوە و ویستی سوودی خـۆی بۆیان دەربخات، بە حەپەحەپ پەلاماری هێسـترەکەی دا، ئیـدی ئەویـش پەیتاپەیتـا لەجیـاتیی ڕێکـردن خەریـك بـوو بکەوێـتە گورگەلـۆقە، هەر کاتێـك هەوڵـی ڕاوەسـتان و هێواشـبوونەوەی دەدا، ئـانۆ لە دواوە هەڵیـدەکوتایەوە سـەری و وای لـێ دەکـرد لەگەڵ ئەو هەڵـمەی لە دەم و لـووتییەوە دەردەچـوو بکەوێـتە پێشبڕکێ، تا گەیشتنە ئاشقوولکە، ئەو گونـدەی تـا ئەو کـاتەش شەڕ لە شاخەکانی دەوروبەری بەردەوام بوو. لەوێشەوە لایەکـی چیای قەندیل بە بەرزی و شـکۆمەندییەوە دەرکەوت، بـاڵایەکی بەرز و دوو شانی پانوبەرین هەتا چـاو بڕکـات دووردوور درێـژ بـــوونەتەوە. لوتکەکەیشـــی ڕێـــك لە کەللەســـەری پیـــاوێکی بەسـاڵاچوو دەچـوو، بەفـر پیـری کردبێـت و ململانـێ لەگەڵ پیرێتیدا بکـات، تـاکوو گەنجێتیـیەکەی بگەڕێنێتەوە. لە سـەرەوە لوتکەیەکی بچووکتری لە ئامێز گرتووە هەر دەڵێی جلـی سـپیی بـووکێنی پۆشـیوە. ئەویـش نەوە جـوانکیلەکەی بـوو. گیـزە و قرمەژنـی گـوللە گوێچکەیـان کەڕ دەکـرد، گـوللە تۆپەکـانیش

نوورەیـــان دەهـــات و دەتەقیـــنەوە، وەك ئەوەی ئـــاهەنگی بووکگواستنەوەیەکی گوندنشینانە بێت، شەڕەکە تا ئێستا بەردەوامە و تا دێت گڕەکەی گەرمتر دەبێت. دەنگەکانیش بەوپەڕی سەختی و شڵەژاوییەوە لە هەر سێ ڕەبایە چۆلەکەی خوار چیای قەندیلەوە دەهاتن و ئاگری شەڕەکەیان خۆشتر دەکرد.

ڕەحمان بۆ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون گوتی:

- چ بەدبەختییەکە، هەمدیسان کەوتینەوە ناو هەمان کێشە و قەیرانی پێشوو، کاتێك لە هەمان ئەو دوو شوێنەوە کەوتینەوە شەڕ... ڕەبایەکانمان بە دەستەوە بوو، بەڵام قەندیل و ڕێڕەو و پەیژە ستراتیژییەکەی دوژمن بەسەریدا زاڵ بوو، بە ڕاستی کارەساتێکی گەورەیە کەوتن و داگیرکردنی ناوچەکە لە لایەن دوژمنەوە مسۆگەرە و هیچ چارێك نییە.

هەواڵدەرەکە پرسی:

- چۆن؟!

ڕەحمان بە دڵنیاییەوە گوتی:

- ئەو سێ ڕەبایەیە زۆر خۆیان ڕاناگرن، دەبووایە پێشمەرگەکان قەندیل و پەیژە و ڕێڕەوەکانی بگرن، بۆ ئەوەی ڕێگەی گەیشتن و تێپەڕینی دوژمن نەدەن، کە وایان لێ دەکات لە دۆخێکی باڵادەستدا بن، ئەو کاتە ڕێگەی گەیشتن بەو سێ ڕەبایەیەش دەگرن، لەبەر ئەوەی لە بنەڕەتدا دەکەونە ناوچەکەمانەوە.

سەگەکانی ئاشقولکە دەستیان بە وەڕین کرد و بە ڕاکردن

بەرەو لایـــان هـــاتن، ئـــانۆش لە ترســـان بە دەوری خۆیـــدا دەخولایەوە و هەترەشی چووبوو:

- ئەوەتـانێ هەی گەمـژە، ئێسـتا بەری لاسـاری خـۆت دەچنییەوە، سەگی گوندەکە پارچەپارچەت دەکەن.

سەگەکان لە هەموو لایەکەوە دەورەیـان دان، هێسـترەکەش تۆقی و لە شوێنی خۆیدا ڕاوەستا. ڕەحمـان بە هەمـوو توانـایەوە ڕەشـمەکەی ڕادەکێشـا، بەڵام جەنەی گرتبـوو لە ترسـی حەپەی سەگەکان جووتکەی دەهاویشت. ئانۆ لەگەڵ سەگەکاندا کەوتە شەڕەوە، چونکە ئەوان بە سەگێکی نامۆیان دانـابوو کە هـاتبووە ناو گوندەکەیانەوە. دەنگیان دا و هاواریان بۆ کرد:

- بگەڕێوە و وازیان لێ بێنە، دوایێ لەتوپەتت دەکەن.

بەڵام شەڕەکە دەستی پێ کردبوو و هیچ ڕێگەیەکیش نییە بۆ ڕاگرتنی، ئەوەتـانێ تـووکی ئـانۆ پەرشـوبڵاو بـووەتەوە، خـۆ ئەگەر خەڵکـــی گونـــدەکە بە دارەکـــانی دەســـتیانەوە فریـــا نەکەوتبوونـایە و بە زۆر ســـەگەکەکانیان نەکشـاندبووایەوە و بە ڕقەوە ڕایان نەکردبووایە، دۆخی ئانۆ باش نەدەبـوو، ئەوەتـا ئـانۆ چنچکی داوەتەوە و تووکی جەستەی دەسـڕێتەوە، کە خەریـك بوو لەتوپەتی بکەن و بە زمانی برینەکانی جەستەی دەلسێتەوە.

لە گوندەکەدا چەند جووتیارێك گۆڕیـان بـۆ کوژراوەکـان هەڵدەکەنی، هەواڵدەرەکە پرسی:

- دەبێ کامیان لەناو ئەو چاڵە شێدارەدا پاڵ بدەنەوە؟!

لە بارەگـای دەسـتەکەش تەنهـا چەنـد کەسـێك مـابوونەوە پاسـەوانی شـوێنەکەیان دەکـرد، هـیچ پەیوەندییەکیشـیان لەگەڵ

ئەوانەی دەوروبەر، یان ناو ڕەبایەکان نەمابوو، کە نزیکەی کاتژمێرێك ڕێگای سەرکەوتن بوو بۆ سەر ئەو چیایەی دەیڕوانییە سەریان. سەرنجیان لە قەدپاڵەکە دا و لە ڕۆیشتنی خۆیان بەردەوام بوون، بەڵکوو قەدپاڵەکە نیشانەیەکی لێ بێت و ڕێگەی چوون بەرەو لوتکەکەیان پیشان بدات و هیچ ڕێگەیەکی دیکەی لێ نەبێتەوە و نەبێتە مایەی مەرگی مسۆگەریان. لە ڕێگەیان و لە نزیك یەکێك لەو ماڵانەی هەندێك لە گوندەکەوە دوور و دابڕاو بوو، برینداریکیان بینی لەسەر زەوی ڕاکشابوو، جووتیارەکان دەورەیان دابوو، وەکوو حەزێك سەیری کرداری چارەسەرکردنی برینەکەیان دەکرد، گوللەیەك بەر دەستی کەوتبوو و لەو دیوەوە هەڵیتەکاندبوو، کونێکی گەورەی لێ کردبوو، خوێن لێیەوە فیچقەی دەکرد.

جووتیارێك هاواری کرد:

- ئەوە یەکێکی دیکەشیان هێنا.

هەموویان بە یەك جار ئاوڕیان دایەوە و کەوتنە پایدۆزی سەرنجدان و دۆزینەوەی برینداری دووەم، کە لەناو ئەو دار و درەختانەوە دەرکەوت شاخەکەی داپۆشیبوو، لەسەر هێسترێك بوو و دوو پێشمەرگەش ئەملا و ئەولایان گرتبوو، شەکەتی و ماندووبوونێکی زۆریان پێوە دیار بوو.

- ئەوەتانێ. ڕوخساری چۆن هەڵبزڕکاو و شێواوە! زۆر بە خەراپی خوێنی لێ دەڕوات، ئەگەر ئەو خوێنەی ڕانەگیرێ دەمرێت.

گوندنشینێك پرسی:

- نابێ خوێنی بەرخێکی تێ بکەین؟

یەکێکی دیکەیان گوتی:

- پەکوف چ نەزانیت! خوێنی بەرخ چۆن دەبێت؟! دەبێ خوێنی مرۆڤ بخواتەوە.

- دۆخەکە موژدەی خێری پێوە نییە.

- هەموویان پاشەکشە دەکەن.

پاشان کۆمەڵە پێشمەرگەیەك وەك ئەوەی جەستەی چلکنی خۆیان بە زۆری زۆرداری بەسەر زەویدا ڕابکێشن و چاویان نیمچە داخراو بێت، هەموویان بە یەك شێواز بە ڕێدا دەڕۆیشتن، ڕێك وەك ئەوەی بە ڕێگەی موگناتیسی خەوێندرابێتن. هەر کە گەیشتنە بارەگا ڕێك لەسەر زەوی لێی ڕاکشان، هەتا توانای قسەکردنیشیان نەمابوو، شەکەتی و ماندوێتی تەنانەت زمانیشی لە گۆ خستبوون، چاوەڕوانی ئەوەیان بوو کەمێك پشوو بدەن، ئەوە یەکێکیانە هەر کە جەستەی گەیشتە سەر زەوی پرخەپرخی لێ بەرز بووەوە.

ڕەحمان بە بێدەنگی و حەپەساوی ڕاوەستابوو، لەگەڵ خۆیدا بیری دەکردەوە: "ئەی خوایە خۆ ئەوە پاشەکشە دەکەن، چۆن بەبێ یارمەتی و پشتگیری جێیان هێشتوون؟ ئەوانە زۆر شەکەت و ماندوون... هەر دەبێ کەمێك بنوون، دەبێ کەمێك پشوو بدەن... بەڵام چی دەبێت ئەگەر ئێستا دوژمن پەلاماری داین؟! ها، باوەڕ ناکەم ئەوان ئێستا پەلامارمان بدەن، تاریکاریی دادێت و پێکهاتەی ئەوانیش وەکوو پێکهاتەی سوپا وایە، ئەمەش واتای ئەوەیە کە ئەوان سبەی بەیانی زوو هێرش

دەکەن، هەتا ئەگەر ڕەبایەکانیشیان بۆ چۆل بکرێت. ئەی چی دەبێت ئەگەر ژمارەیەکیان وەك دەڵێن لەوێدا بمێننەوە. ئەم دەستەیە بە ژمارەیەك کە تەنها بە کەڵکی شەڕی پێشمەرگەیی دێت، شەڕی داگیرکردنی شوێنیان دەکرد، ئەبو شامیل چ هەڵەیەکی گەورەی ئەنجام داوە، پێشمەرگەکان زەوییان نییە و بارەگاکانیشیان ئەشکەوت و کونوکەلەبەری شاخەکانە. پێیدا تێناپەڕن ئەگەر لێیەوە دەست پێ نەکەن و هەنگاو نەنێن.

ڕەحمان بە دوودڵییەکی زۆرەوە بە هەواڵدەرەکەی گوت:

مەحاڵە لە ئێستا بەدواوە بتوانرێت پارێزگاری لە بارەگاکانی "پشتئاشان" بکرێت. ئەوەی ئەم پێشمەرگانە دەتوانن ئەنجامی بدەن، تەنها ئەوەندەیە بەپێی توانای خۆیان ڕێگە لە پێشڕەویی دوژمن بگرن، تاکوو بارەگاکانی دیکە بتوانن پاشەکشە بکەن، ئەگەرنا نرخەکەی زۆر گران دەبێت.

پاشان هەندێکی دیکەش گەیشتن، حاڵی ئەوانیش لەوانەی پێش خۆیان باشتر نەبوو، ئەوانیش هێندە شەکەت و ماندوو و بێزار بووبوون، توانای هیچیان نەمابوو، بەرلەوەی هۆشیان لەسەر خۆیان نەمێنێت، هەواڵدەرەکە لە یەکێکیانی پرسی:

- ئەو گۆڕانە بۆ کێن وا خەڵکی گوندەکە هەڵیدەکەنن؟

پێشمەرگە ماندووەکە بە ڕوویەکی شەکەتەوە سەرنجی دا و پاشان وەڵامی دایەوە:

- فەرماندەی دەستەکەمان.

- توو خوا پێم بڵێ کێی دیکەش؟

- نازانم، بەڵام جگە لەو شەهیدی دیکەشمان هەن،

خۆزگە دۆخەکە لەوەندەش دەوەستا و کۆتایی دەهات.

ڕەحمان بە دوودڵی و شلەژانی زیاترەوە گفتوگۆی لەگەڵ کردن:

- دەزانم ئێوە لەوپەڕی شەکەتیدان، بەڵام ئەگەر خۆتان بدەنە دەستی خەوەوە، ئەوە دڵنیابن جارێکی دیکە هەڵناستنەوە، چونکە خەوتنتان واتە مردنتان.

پاشان بەو پێشمەرگەیەی گوت کە لەگەڵیدا بوو و وای لەوەی دیکەش کرد بە ئاگاییەوە گوێی لێ بگرێت:

- باش گوێ بگرە و هەر وشەیەك کە دەیڵێم جوان ئەزبەری بکە: هەر ئێستا بگەڕێوە و بە زمانی منەوە بە ئەبو شامیل بڵێ، ئیدی لەمەودوا ئەستەمە بتوانرێت پارێزگاری لە ناوچەکە بکرێت، با ئەوانیش ئاگاداری خۆیان بن و بەوپەڕی خێراییەوە لەوێش بڕیاری پاشەکشێ بدەن، لەوەش ئاگاداریان بکەوە کە ئەو ناوچەیەی پشتیان فراوانە و لەوانەیە بەشێك لە دوژمن لە ڕێگەی زنجیرەی قەندیلەوە دزە بکەنە ئەو ناوچەیە و پشتیان لێ بگرن، ئەوەشیان بۆ بسەلمێنە کە دەنگی چەکەکانی دوژمن ئەو جووڵە و ئاڕاستەیەیانی دەردەخست. زۆربەی گومانەکانیش ئەوەن کە دەبنە هێزی پشتگیری بۆ ئەو هێزانەی دزە دەکەنە ئەو ناوچەیە. سوور بە لەوەی جەخت لەسەر ئەوە بکەیتەوە کە لە ئێستا بەدواوە پارێزگاریکردن لەو ناوچەیە سەرشێتییە.

کاتێك پەیامەکەی ڕەحمان گەیشت، پیرەکان کەوتنە ئامادەباشییەوە، دەستیان بە کۆبوونەوە کرد، تاکوو لە دۆخەکە بکۆڵنەوە، بە عەقڵی کێدا دەچێت هەموو شتێك بەجێ بهێڵن و

ئەو بارەگایانە چۆل بکەن؟ جگە لەوەش بۆ کوێ بڕۆن؟! هیچ شوێنێکیان لە پێشدا نییە بۆی بچن، جگە لە لوتکەی قەندیل، کە ئەوەش مەحاڵە و کەس نایگاتێ. ئەمە دۆڕانە و شکۆیان دەشکێنێت، بەڵام کێ دەڵێ ئەو ڕەحمانە لە قسەکانی ڕاست دەکات؟! ئایا وا باشتر نییە لە دۆخەکە تەواو دڵنیا بین، بەرلەوەی بە قسەی بکەین؟! ئەی چی دەبێت ئەگەر قسەکانی ڕاست دەرچوون؟! ئەم شێتە زۆر ژیر و وریایە لەخۆڕا قسەی وا ناکات، ئەو لە چەندین شەڕی گەورە بەشداریی کردووە، بەڵکوو هەتا لە هەمان شوێن، پێشتر لەگەڵ هێزەکانی مام جەمال کەوتۆتە شەڕەوە. پێش ماوەیەکی کورتیش ئاگاداری کردینەوە، وەك ئەوەی پێشبینیی شتێکی کردبێت، گوتی بارکردنی هەندێك لە گوندنشینەکان لە گوند و تۆپبارانی هەرەمەکی بەڵگەی ئەوەیە کە پیلانێك دژمان داڕێژراوە. بەڵکوو هەتا خودی ئەبو شامیلی بە بەرچاوی هەمووانەوە ئاگادار کردەوە و داوای ئەوەی کرد لە حاڵەتێك ئەگەر هێرشمان کرایە سەر دەبێ پەلە پەلەکانی قەندیل بگرین. نابێ ئێستا هەواڵەکەی بە هەند وەرنەگرین، ئەگەرنا تووشی کارەساتێکی گەورە دەبین و نازانین قەبارەکەی چەند دەبێت، بەڵام پیرەکان هەتا پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر نەگەیشتنە هیچ بڕیارێك. ئەو کاتە ئیدی هێرشەکە بەرەو بارەگاکان دەستی پێ کردبوو و لێی دڵنیابوون. هێندەی نەخایاند بارەگاکانی پێشەوە یەك لە دوای یەك دەشکان و داگیر دەکران و دەکەوتنە دەست دوژمن، پاشەکشێ هەرەمەکییەکانیش لە هەلاتنێك دەچوو بە هەموو لایەکدا. زۆربەی ئەوانەی لەوێش بوون هەتا توانای بەرگریکردنیان لە خۆیانیش نەبوو. بۆیە ئەوەی کوژرا کوژرا و ئەوەی بە دیلیش گیرا بە دیل گیرا. ئاڵۆزی و

هەرا و ئاژاوە هەموو پشتئاشانی گرتەوە، بارەگاکانی پیرەکان یەك لە دوای یەك لە لایەن خۆیانەوە ئاگریان تێ بەر دەدرا و هەرچی بەڵگەنامە و وێنە و ناو هەبوو هەموویان سووتاند، هەتا گەیشتە پێخەف و پەتوو و زووری ئازووقە و چێشتخانەکانیان لە ترسی ئەوەی نەبادا دوژمن لە دوای ئەوانەوە سوودیان لێ وەربگرێت.

حاڵی هێزەکانی دیکەش کە لەوێدا بوون لە پیرەکان باشتر نەبوو، ئەوانیش بە هەمان دەرد چوون و چەندین شەهید و بریندار و دیلیشیان هەبوو.

هێرشبەران لە ئێزگەکەیانەوە مژدەی سەرکەوتنی هێزەکانیان بە دوژمنە گەورەکە دەدا و نوقڵانەی ڕاونانی هێزی پیرەکان و ئەوانەی دیکەیان بە گوێی خەڵکی دادەدا... ئاخ خیانەت!

# بەشی بیست و چوارەم

لوتکەی قەندیلی سەرکەش بە دیوی ئەودیودا بووە ئاڕاستە و ڕووگە و پەناگەی خۆدەربازکردنی ئەوانەی لە ژیاندا مابوونەوە و غەدر و دەستی خیانەت و خوێناویی ئەوانەیان پێ نەگەیشتبوو کە لە ختوخۆڕایی هێرشیان کردبوونە سەر و بەو سەرماوسۆڵەی دەستپێکی ئایارەدا بەو دەردەیان بردبوون و بەناو ئەو چیاوچۆلانەدا پەرتەوازەیان کردبوون، هەر کە چەند کەسێك دەگەیشتنەوە یەك و کۆ دەبوونەوە، بەرەو ئەودیو هەنگاوی کوێرانەیان دەنا و سەرمای ئەو قەندیلە بە دەست و پەنجە و بناگوێچکە و سەرتاپای جەستەیانەوە دەچزا، بەو هیوایەی –ئەگەر لەو ساتەوەختەدا ترووسکەیەکی هیوا لە ناخیان مابێتەوە، تەنها خۆدەربازکردن بوو لە چڕنووکی خوێناویی ئەو چەکدارانەی وەکوو گورگی هار پەلاماریان دەدان و لە هیچ شتێك نەدەپرینگانەوە- تاکوو بگەنە ئەوانەی پێش خۆیان، هەندێکیش لەوان لە سۆنگەی نەشارەزایی و هەڵپەی خۆدەربازکردن لە مەرگی مسۆگەری براکانی دوێنێ و لە گەیشتنیان بە لوتکەی قەندیل ڕێگەی خۆیان ون کرد و کەسێك نەبوو ببێتە ڕێنیشاندەریان و ڕێگەی ڕزگاربوونیان نیشان بدات، بۆ هەتاهەتایە ون بوون و نەگەڕانەوە، وەك ئەوەی زەوی قووتی دابن و هەڵی لووشیبن.

وای چ مەرگەساتێکە، چ فیلمێکی تراژیدیای پڕ لە سوێیە، لەو دەستپێکی ئایارەدا، ئەوانەی لە دەستی ڕژێمێکی هاروهاج لە پەنای ئەو قەندیلەدا خۆیان داڵدە دابوو و بە هەر جۆرێك بێت

له دەربازبوونیان له چڕنووکی دڕندەکانی دەسەڵات لەوێ ئارام ئارام حەسابوونەوە، کەچی ئێستا وا له ناکاو هێرشی مەرگیان دەکرێته سەر، خۆیشیان نازانن به چ ئاڕاستەیەکدا هەڵێن و لێ نەگەڕێن دەستی ڕەشی مرۆڤکوژەکانی مام جەمالیان بگاتێ! وای چ کوێرەوەری و داڕووخانێکی بەها و ئاکاری مرۆڤایەتییە! وا لەو ساتەوەختە دژوارەدا ئەم کۆمەڵە مرۆڤە دەربازبووەی چنگی بەعس، لەناو ئەو سەهۆڵبەندانەدا، توانای خۆڕزگارکردنیان بۆ نەڕەخساوە، یەك یەك و دەستە دەستە دەکەونە بەر دەستی جەلادە چڕنووك به خوێنەکانیان، ئەو چەکدارانەی له ئێزگەکەیانەوە سات له دوای سات، بێژەرەکە دەنەڕێنێت و پەیامێکی ترسناکی گەورەکەیان به گوێچکەدا دەدات و دەڵێت: "پەرێزتان پاك بێت"، وای لەو پەرێزە پاکەی هەیانبوو! پەرێزێك خوێناوی و پڕ له شەرمەزاریی مێژوو، پەرێزێك ئەوان له کاتی دروێنەکەیاندا له دوای خۆیانەوە جێی دەهێڵن: تەنها لاشە و خوێنی بەناحەقرژاوی تێکۆشەرانێك که له دەستی دیکتاتۆر ڕایان کردووە و لێرەش بۆ دیکتاتۆر بەر گولله دەدرێنەوە، دروێنە و ڕەشەکوژیی مرۆڤە تێکۆشەر و پیر و پەککەوتەکانی ئامێزی پیرە قەندیله، وای له قەندیل دەبێ لەو ساتەدا چەندە هەورەبارانی تف و نەفرەتت لەو گەمژە چەکدارانە کردبێت که به فیتی گەورەکانیان ئەو کۆمەڵکوژییەیان لەوێندەرێ ئەنجام دا و بەفری سپیی قەندیلیان به خوێنیان ئاڵاووالاکرد؟!

ئەوانەی بەختیش یاوەریان بوو، جووتیارێك، یان شوانێك وەکوو فریادڕەس لێیان پەیدا بوون و ڕێگەی دەربازبوونیان پیشان دان و له مەرگی مسۆگەر ڕزگاریان کردن، ئەوەی به دی دەکرا خۆدەربازکردنێکی هەڕەمەکی بوو، دوورکەوتنەوە

بوو لە جەلادەکان، هەرچەندە سەرەتا ئەو ڕێنیشاندەرانە ئامادەیی ئەوەیان نەبوو ئەو کۆمەڵە تێکشکاوە لە ڕێگەی ئەو لوتکانەوە بەرەو ئێران ببەن، کە هەتا هەورەکانیش توانای هەڵگژانی بەو قەدپاڵانەدا نەبوو، وەلێ وەك دەڵێن ڕۆح شیرینە و بە دیلییش کەوتنە دەستی ئەو چەکدارانە، بۆ ئەوان دوو جار مردن بوو، بۆیە مردنیان لە سەرما پێ باشتر بوو لەوەی دەستگیر بکرێن، هەرچەندە دڵنیاش بوون سەرمای قەندیل گەمەی پێ ناکرێت و بە مسۆگەری ڕەقیان دەکاتەوە، چونکە ڕێگاکە دووورودرێژ و ڕێگەی هاتوونەهات بوو، باوەڕ ناکەم کەسێك، هێزێك، هەتا دەوڵەت و حکوومەتێکیش لە وەرزێکی وادا سەرکێشیی ئەوەی کردبێت وا کوێرانە بە گژ قەدوباڵای ئەو قەندیلەدا بچێت، ئەمەی دەکرێت، جۆرێکە لە مەحاڵ، تینووبوونێکە بە خوێن نەبێت ناشکێ و ئەوانەی خوێن و هەر خوێن بەری چاوی گرتوون، تەنها بە خوێن و مەرگی مرۆڤەکان سوکنایی دڵی ڕەشیان دێت، بەڵێ ئەوانەی لەو چرکەساتەدا ڕووی دەربازبوونیان لە قەندیل کرد، مەگەر ئەم نزا و تکایەیان کردبێت:

یا قەندیلی جوان بەرەو ڕووت هاتم<br>
لە دەستی نامەرد بدەیت نەجاتم<br>
دڵنیام پێشم سەهۆڵبەندانە<br>
وەلێ دواوەشم ئاگربارانە<br>
تاکە پەناگە و ڕزگارکەرم بە<br>
ڕێنیشاندەری دەشتودەرم بە.

ئیدی چارەنووس، چارەنووسی ڕەقبوونەوەیەکی مسۆگەر

بوو، کۆمەڵە تێکشکاوەکان ترسی ئەوەیان هەبوو ئەو دەروازە کورتەی کە دەیگەیاندنە ئێران، ئەویش لە لایەن چەکدارەکانی مام جەماڵەوە داگیر بکرێت و بۆسەی تێدا دابنێنەوە. لەبەر ئەوەی ئەوان دڵنیا بوون لەوەی مانەوەیان واتە قڕکردن و لەناوچوونی هەموویان، بە تایبەتی لە بەردەم ئەو ژمارە زۆرەی ئەوانەی ڕاوەدوویان دەنێن و ئەو چەکە پێشکەوتووانەی پێ دەچێت تازە وەریانگرتبێت و ئەو هەموو تەقەمەنییەی کۆتایی نایەت و پارسەنگی هێزی نابەرابەری هەردوو لایان. ئەوان لە ڕێگەی هەندێك ڕێبەر و ڕێنیشاندەرەوە بەرەو لوتکەکانی قەندیل لە هەڵکشاندا بوون، وەلێ چۆن هەڵکشانێك؟! ئەوان ویژدان و مرۆڤایەتیی ئەو شارەزایانەیان بە پارە کڕیبوو، ئەوانیش هەرکاتێك هەستیان بە ڕاخستنی دەستی تێکشکاوەکان دەکرد، زیاتر هەوڵی دەربازکردنیان دەدان لە پێناو بەدەستهێنانی بڕە پارەیەکی زیاتر و زۆرتر، کاتێکیش زیاتر هەستیان بە بایەخ و گرنگییان دەکرد لە لای ئەوانەی شکاندوویانن و پاشەکشێیان پێ کردوون، مەرجی دیکەیان بەسەردا دەسەپاندن، وەکوو دووریی ئەو مەودایەی دەیانبەن، بەڵکوو هەتا زیاتریش لەوە شوولیان لێ هەڵدەماڵی و بە هەنگاو حیسابی دیناریان لەگەڵ دەکردن. هەندێکیان ماوەیەك ڕێیان نیشاندان و دواتر حەقی ئەو ماوەیەیان وەرگرت کە بڕیبوویان و ئیدی وازیان لێ هێنان و گەڕانەوە. هەندێکی دیکەیان پێشوەختە پارەی ڕێگەکەیان وەردەگرت و بەرلەوەی ئەو ماوەیەش تەواو بکەن هەڵدەهاتن و ئەوانەیان لە نیوەی ڕێگە بەجێ دەهێشت، ئەوانیش بە ناچاری ڕوویان لە لوتکەکانی دەربازبوون و مەرگ دەکرد و بەوپەڕی ڕق و تووڕەییەوە نەفرەتیان دەکرد و جنێویان دەدا و ناڕەزاییان دەردەبڕی، قاچەکانیان لە ڕێگە تێك دەئاڵان و خۆشیان نەیاندەزانی بۆ کوێ دەڕۆن و ڕوو لە کوێ دەکەن، ئاخر

ئەوانەی هێرشیان دەهێنا و تینووی خوێنی پیرەکان بوون، شەڕی بە وەکالەتیان دەکرد و بۆ ئەوەش جەتمەن سەرانیان بارتەقای ڕشتنی خوێنی هەر کەسێکیان باجی خۆیان وەردەگرت!

دیمەنێک، تابلۆیەک، مەحاڵە نە مێژوو و نە مرۆڤایەتی لە لاپەڕەکانی ویژدانی خۆیاندا بیسڕنەوە -ئەگەر ویژدان تۆسقاڵێك پیرۆزیی مابێت- دیمەنی ئەو پیرەژنە خانەقینییە تێکۆشەرە بوو، کە کاتی خۆی پیاوە هەڵلاجەکەی لەسەر هەمان بیروباوەڕ لە لایەن خودی سەرۆکی خوێن و تاوانەوە، لە هەمبەر بوێری و گیانقایمیدا خوێنی کرابووە کاسەوە و گیانی بەخشیبوو، ئەوەتا هاوسەر و سێ کوڕەکەی ڕێبواری ئەو کاروانە پڕ لە تراژیدیایەی قەندیلن، لەوێ سەرۆك باوکی کوشتوون و لێرەش هاوسەر و ڕۆڵەکانی بە پاساوی شۆڕشگێڕییەوە، وا لە بەردەم هەڕەشەیەکی ترسناکی دۆستەکانی دوێنێکەدان و هەر سێ کوڕەکەی بە نۆرە دایکە پیرەکەیان بە کۆڵەوەیە و بەو قەدپاڵ و نشێوە سەهۆڵبەندانەدا، ئەوانیش لە هەوڵی خۆدەربازکردندان.

لەو تابلۆ خوێناوی و پڕاوپڕ لە چەرمەسەرییەی کە دانیشتوانی "پشتئاشان" تێیدا ژیان و بە قورسی پێیدا تێپەڕین، ئەو گوندنشینە دەرکەوتەوە کە ماوەیەك بوو سیخوڕی لەسەر هەموو شتێکی ناو بارەگای پیرەکان کردبوو بە گەورە و بچووکەوە. ئەویش هەمان ئەو ڕێنیشاندەرە بوو کە سامان و شیرینی شۆخی گەیاندە سنووری ئێران، وەکوو پێشتریش زانیمان کە لە کاتی گەڕانەوەیدا سەردانی زاواکەی کردبوو، هەر ئەو کاتیش داوای ئەوەی لێ کردبوو کە خۆی ئامادە بکات بۆ ڕووداوێکی گەورە، کە خۆیشی نەیدەزانی کەی و چۆن ڕوو دەدات؟! بەڵام هەر کە کاتی جێبەجێکردنی پیلانەکە هات، ئەو لایەنەی کاری بۆ دەکرد پێیان گوتبوو لەگەڵ خێزانەکەی گوندەکە بەجێ بهێڵێت و خۆی بگەیەنێتە ئەو هێزانەی هێرشیان دەکرد، ئەو، ئەو

زانیارییانەی لە ئاغاکانی شاردبووەوە کە پیرەکان لە بارەگاکانیان موڵـــك و مـــاڵێکی زۆریـــان حەشـــار داوە. هەڵـــبەتە لە لایەن هەندێکیانەوە دەدزرێت و دیزەبەدەرخۆنەش دەکرێت، هەروەهـا ژمارەیەك لەوانەی لە بەرژەوەندیی حکوومەت، یـان دەستەکەی مـام جەمـال کاریـان دەکـرد دزەیـان کردبـووە نـاو بارەگـای پیرەکانەوە و هەتا هەندێکیان لە پێگەی ئەوتۆدا بـوون وردتـرین زانیاری و نهێنیشیان دەزانـی. ئامـانجی هەموویشیان گەیشتن و بەدەســتهێنانی ئەو ســەروەت و ســامانە بــوو. بــۆیە لەو کــاتەدا ڕێنیشــاندەرەکە و زاواکەی و یەکێـك لە ســیخورەکانی دیــکە دەستەیەکیان بـۆ ڕاوەدوونـانی کەسـێکی دیـاریکراو پێـك هێنـا. دوای کەمێـــك مانـــدووبوون ئەو کەســـە کەوتە چنگـــی ئەو دەستەیەوە. ئەو کەسە بەستەزمانە بە قورسـی ڕێـگەی دەکـرد و لەبەر قەڵەوییەکەی توانـای ڕۆیشـتنی بە ئاسـانی نەبـوو، تەنـانەت نەیدەزانی ڕوو لە کوێ بکات، دوای ئەوەی هەمـووان بەجێیـان هێشـتبوو، ڕێـك وەکـوو پـۆڕی خـوراوی لـێ هـاتبوو، ئەو لە دەوروبەری چــل ســاڵانی تەمەنیــدا بــوو، هەمیشــە کەســێکی ڕووخۆش بوو، زۆر حەزی لە گێڕانەوەی چیرۆکـی پێکەنینـاوی بـوو، زۆریـش چێـژی لە پەرچەکـرداری ئەوانەی دەوروبەری و قاقای پێکەنینەکانیان وەردەگرت، ئەو کاتەی دەستگیریان کـرد زیاتر قەڵەو و پەنماو دەهاتە بەر چـاو، ئەمە زیـاتر دڵـی ئەوانەی ڕاوەدوویان دەنا خۆشتر کرد بوو، چونکە ئەوان توانییان دەسـت بەســەر یەکێــك لەو گەنجینــانەدا بگــرن کە پەرۆشــی بــوون، ئەوەتانێ ئەوان وا هێرشی دەکەنە سەر، وەکـوو چـۆن کەمتیـارە کێوییەکان هێرش دەکەنە سەر نێچیرەکانیان و هەر بە زینـدوێتی لەتـــوپەتی دەکەن، بەرلەوەی گیـــانی دەربچێـــت. لە هەمـــوو لایەکەوە جلـوبەرگەکەی بەریـان شـیتاڵ شـیتاڵ کـرد، هەرچـی دوگمەی هەبوو پچڕان و دڕان، ئیـدی لە خۆشـیی ئەو پـوول و پـارەیەی لای ئەو دەسـتیان کەوتبـوو و بەو نـاوەدا پەرشـوبڵاو

بووبـووەوە هەڵـدەپەڕین و هەلهەلەیـان لـێ دەدا، بەوەندەشـەوە نەوەستان پرسیاری ئەوەیان لـێ کـرد، کە ئەوانەی وەکـوو ئەو پـارە و گەنجیـنەی بارەگاکانیـان هەڵگرتـووە بەرەو کـوێ ڕۆیشتوون، بەڵام کاتێك جگە لە بێدەنگی هیچی تریان لـێ دەست نەکەوت و لەوە دڵنیابوون کە ئیدی سوودێکی بۆیان نابێت، بۆیە لەگەڵیدا کەوتنە دەستبازی و گاڵتەکردن، بردیانە لای درەختێك و توندتوند شەتەکیان دا و دەست و قاچیان کردە نیشانەی تفەنگەکانیان، ئەو پیاوە بەستەزمانە کاتێك لوولەی تفەنگەکانی بینی ڕوویان لەو کردووە، خەریك بوو زەندەقی بچێت، دواتریش گوللەی چەکەکانیان جەستەیان دابێژی و سنووریکیان بۆ ئەو ئازارەی دانا و بۆ هەتاهەتایە ئارامیان کردەوە. ئیدی بەجێیان هێشت و بەدوای کەسی دیکەدا دەگەڕان تاکوو دەستکەوت و پارەیان لێ دەست بکەوێت. ڕێك هێزی پاتاڵە و بە قەندیلەوە وەربوون، هەر دەڵێی ڕەوە کوللەن و تەڕ و وشك پێکەوە هەڵدەلووشن و دەست لە هیچ ناپارێزن، بارەگا تاڵان دەکەن و دیل دەکوژن!

کاروانێکی پڕ لە ڕێبواری سەرلێشێواوی دیکە ماوەیەکی زۆرە بەیەکدا دێن، چاوی چەکدارەکانی ناویان بە پەرۆشەوە بە دوای شتێکدا دەگەڕێ، جگە لە بەفر، هەموو جەستەیان کردبووە گوێ، بەو ئومێدەی گوێیان لە هەر نەفرەتێك بێت، جگە لە لوورەلوور و گفەگفی با، ئەو لوتکانە لە هەموو شتێکی ژیان ڕووت کرابوونەوە، تەنها مەرگ و لەناوچوون لەوێدا شاباشی قڕکردنیان بۆ پیرەکان و ئەوانی تر بە گوێچکەی سرووشتدا دەدا، وەلێ هەر نەهات و هەر نەهات فریادڕەسێ ڕزگاریان بکات.

چاوە ئەبڵەق و هەترەشچووەکان، لە سەرما خەیاڵی پەناگەیەکیان دەکرد، لە دوورەوە لادیوارێکی داڕووخاویان

دەبینی بەفر دایپۆشیوە، بە بێئاگایی و بێ بیرکردنەوە لاقەکانیان بەرەو ئەوێ پەلکێشی دەکردن، وەلێ جگە لە کەپرۆکەیەکی هاوینەی گوندنشینان، کە بنمیچەکەی داڕووخابوو و ستوونەکانی خوار بووبوونەوە، شتێکی ئەوتۆیان نەبینی.

دوژمنەکانیشیان لێرە و لەوێ بەدوایانەوە بوون و شوێن پێیان هەڵدەگرتن، ئەو جووتیارانەی بە نهێنی هاوکارییان کردبوون وەکوو ڕێنیشاندەر بەکار دەهێنا، ئەو کاروانە زۆرەی ماندوێتی شەکەتی کردبوون و خەم و ئازار و ناسۆر دایهێزراندبوون و سارد و سەرما لەتلەتیان کردبوون، لای داروپەردووی ئەو کەپرە ڕووخاوەدا کۆ بوونەوە، بەوپەڕی ماندوێتییەوە هەوڵی هەڵکێشانی ستوونە دارینەکانی بنمیچە ڕووخاوەکەیان دەدا، تاکوو لەسەر یەکتری کۆمەڵیان بکەن و بە هەموویان لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئاگرێك بەو دارانە بکەنەوە، وەلێ کەسێکیان ڕێگەی ئەو کارەی لێ گرتن، ئەو کەسەش بە ناو ئازارەکانی تەمەندا ڕۆ چووبوو، ڕوخسارێکی سادەی هەبوو، هەمیشە وەك کەسێکی ئاسایی خۆی دەنواند، لەو پیرە خاوەن دەسەڵاتانە بوو کە مام جەمال ڕێزی لێ دەگرت و بە گەورەیی تەماشای دەکرد، کەچی لەو شەوی سەهۆڵبەندان و شەختە و زوقمەدا... لەناو ئەو لادیوارە ڕووخاوە و داروپەردووی ئەو کاولەدا هیچ کەسێك لە هاوڕێیانی گوێیان لە دەنگ و فەرمانەکەی نەگرت و لە دەروونی تێکشکاویاندا تەنانەت دەنگدانەوەیەکیشی نەبوو، کردنەوەی ئاگرەکە مەترسیدار بوو، وەلێ بۆ گەرمکردنەوەی جەستەی سەرمابردەڵەیان ئاگرەکەیان کردەوە و باجەکەیشی وێڕای تووڕەبوونی پیاوە پیرەکە و دوورکەوتنەوە لێیان، بووە باشترین هێما و ئاماژە بۆ دوژمن، بۆیە بە پێدزکێ بەرەو لایان چوون و لە نزیکیانەوە بۆسەیان بۆ دانانەوە و بێ ئەوەی

کەسێکیان هەست بە بۆسەکەیان بکەن، هەستی چی؟! ئاخر چێژی گەرمی لەناو ئەو سەهۆڵبەندانەدا، هەرچی ئاگایی و وریایی هەبوو لێی دزیبوون، ترووسکە و بڵێسەی ئەو ئاگرە گەشە، هەتا بینایيشی لێڵ کردبوون، پێڵوەکانیان بەسەر یەکدیدا دەکەوتن و ئارەزووی خەوێکی خۆشیان بوو، هیچ شتێك وەئاگای نەهێنانەوە و لە دەوری ئاگرەکەی دوور نەخستنەوە، تەنها دەستڕێژ و قرمەژنی گوللەی دوژمن نەبێت کە لە ناکاو وەکوو گەواڵەی بەهار داباریيە سەریان، ئاگرەکە بووە ئاگری ئەبەدی و ڕێنیشاندانی جەللادەکان، وای لەو جەللادانەی چۆن پێیان ڕاگەیەندرابوو "پەریزتان پاك بێ!" ڕێك هەڵگری پەیامی سەرووی خۆیان بوون، دەستڕێژی گوللەیان یەك یەك بەلایدا دەخستن و هاواری لێ هەڵدەستاندن، بە هەر لایەکدا هەوڵی خۆدەربازکردنیان دەدا، بێسوود بوو، هەتا ڕووکردنە تاریکاییەکەش باوەشی بۆ نەکردنەوە و داڵدەی نەدان، کام تاریکی؟ بۆ ئەو دەشتودەرە بەفراوییە لە سپێتی هەڵکێشراوە، تاریکایی بە سرووشتەوە هێشتبوو؟ بەفر تاڵ تاڵ قژی تاریکی سپی سپی دەهۆنییەوە، تاریکایی کزولاواز، ئاستی بینینی دوژمنیشی زیاتر کردبوو، جەستەی تارمایی ئاساو و ڕاکشاوی سەر بەفرەکە زیاتر دەبوونە خۆراکی گوللەی دوژمن، تاکە چارەسەر، بەرگری لەخۆکردن بوو، دەستبردن بوو بۆ تفەنگ، گوللە بە گوللە وەڵام دەدرێتەوە، بە خێرایی دەستیان لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکانیان کەوتە جووڵە و قرمەژنی گوللەی لە ناکاویان دوژمنیان شپرزە کرد، وەلێ کوانێ گورگی چڕنووك بە خوێن وا بە ئاسانی لە کۆڵ نێچیرەکەی دەبێتەوە، ئەوانەی هێزیان تێدابوو بەرەو قووڵایی زیاتری بەفرە تۆقێنەرەکە و لوتکە بەرزەکان کە مەرگی مسۆگەری ڕەقبوونەوە چاوەڕێی دەکردن هەڵکشان و شۆڕ بوونەوە. دوژمن توندتر و دژواتر گەمارۆی

ئەوانەیـان دا کە توانـای پاشەکشـێ و هەڵاتنیـان نەبـوو، لەنـاو ئەوانیشدا پیرەکە، ئەو پیرەی پێی گوتن ئاگر سەرمان دەخـوات، گەرمایی لە بنمان دێنێت، لێ گەڕێن با بەفر سارد و ساردترمان بکاتەوە، وەلێ کەس گوێی لێ نەگرت و ئەوەتانێ ئەویشیان بە دیلی بەرەو بارەگاکانی مام جەمال پەلکێش کرد.

ئەوە چ ڕق و کینێکی بارگـاوی بە خـوێنە وا بەری چـاوی گرتوون و کەمتیارئاسا بە هەموو لایەکدا پەلامار دەدەن، هێـرش دەبەن، گاز دەگرن و چەپۆك و چڕنووك دەوەشێنن، بـۆ گیـانی کێ؟! گیانی ئەوانەی ستەمی دەسەڵات بەرەو قەندیلێی هەڵبڕین، وەلێ لە قەندیلیش هەر مەرگ و مەرگ!

ئەوانەی بە هەموو ئاڕاستەیەك و بە پەرتـوبڵاوی لە هەوڵـی خۆدەربازکردنـدا بـوون، خۆیـان کـۆ دەکـردەوە و هەوڵـی دۆزینـەوەی ونبووەکانیـان دەدا، لە ناویانـدا گەنجێکـی برینـدار، وەلێ چ گەنجێك؟! لە سەرەتای تەمەنیدا بوو، بە دژواری خوێن لە لاقی دەچۆڕا، خۆی بە شانی هاوڕێکانییەوە هەڵواسیبوو، وەك ئەوەی بیەوێت باوەشیان پێدا بکات، ئەوانیش بەسـەر بەفـرەکەدا ڕایاندەکێشا، کاتێك لە ناکاو گیزەی گوللەی دوژمن تەنگەتاوی کردن، گەنجەکە پێی گوتن:

- لێـرە وازم لـێ بێـنن و بـڕۆن، گـوێ مەدەنە ئەوەی چاوەڕێم دەکـات، مـن هەر دەمـرم هـیچ چـارەیەکم نییە، ئێـوە خۆتـان دەربـاز بـکەن، خەمـی منتـان نەبێـت، مـن هەتـا هێـز لە جەستەمدا بێت، دەجەنگم و دوا فیشەکیش دیاریی کەللەسـەری خۆم.

وەلێ ئەوان وا گۆش نەکـراون هـاوڕێی زامـداری خۆیـان تووڕ هەڵدەن و خۆیانی لێ نەبان و نامۆ بکەن، کەچـی ئەو، بـۆ

ئەوەی ئەوان نەبنە قوربانیی ئەم، غافڵگیری کردن و لوولەی تفەنگەکەی لەژێر چەناگەیەوە شریخەی کرد و لەسەر بەفرەکە ڕاکشا، چەشنی باڵندەیەکی سەربڕاو خوێنی لێ دەچۆڕا. ئەوانەی لە پاشەکشێدا بوون بەو دیمەنە شۆك بوون، وەك ئەوەی باوەڕیان بەوە نەکردبێت کە لە بەردەمیاندا ڕووی دا، لەو سەرسامی و شۆکبوونەی خۆیان بە ئاگا نەهاتنەوە، هەتا دەسترێژی گوللەی دوژمن دانەبارییە سەریان، ئیدی ئەوانیش دەستیان بە تەقە کردەوە و بەرەو سەرەوە هەڵکشان و لە دوای خۆیانەوە لاشەی گەنجەکەیان بەجێ هێشت تاکوو ببێتە ژەمێکی چەوری گورگە برسییەکان و سوکنایی دڵی گەورەخوێنڕێژەکان.

کاتێك ئەو کۆمەڵە گەیشتنە شوێنێکی ئارام و ترسیان لە ئاگری چەکی دوژمن نەما، کە بەرەو دۆڵەکان گەڕابوونەوە، لە دوورەوە کۆمەڵێکی دیکەیان بە دی کرد، لە بەرانبەریان و هاوتەریبیش بە ئاڕاستەی ئەوان بە شەکەتی ڕێ دەکەن، هەردوو کۆمەڵەکە بە گومانەوە تەماشای یەکتریان دەکرد، گومانەکان هەزار و یەك حیسابیان دەکرد و ئەنجامەکەی زەنگی مەترسی لێ دەدا، هەر لایەکیان پێیان وابوو ئەوەی بەردەمیان دوژمنە.

یەکێکیان گوتی:

- لەوانەیە ئەوانە دوژمن بن، دەبێ لێیان دوور بکەوینەوە بەرلەوەی بماندەنە بەر دەسترێژی گولله و فیشەکیشمان لە تەواوبووندایە.

یەکێکی دیکەیان بە دڵنیاییەوە گوتی:

- چەکدارەکانی مام جەمال ئەو وزە و توانایەیان نییە تا ئێرە دوامان بکەون، ئێستا ئەوان ڕووی خۆیان وەرگێڕاوە و گەڕاونەتەوە. ئەوان دەزانن کە زریان و ڕەنووی بەفر لەو لوتکە

بەرزانەوە زەنگی مەرگمان بۆ لێ دەدەن، ئیدی ئەوان بۆچی خۆیان ماندوو بکەن؟!

تا ئەو کاتەش ئانۆ سەگە بەوەفاکە لەگەڵیاندابوو، هەتا نەیاندەزانی چەند دەبێت ئەو لەگەڵیاندایە و چۆن گەیشتووە پێیان؟! ئانۆ بەوپەڕی خێراییەوە بەرەو لای کۆمەڵەکەی دیکە دەرپەڕی، بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ چپەچپ و گومانی کۆمەڵەکەی ئێرە دابنێت. لای هەمان کۆمەڵیشەوە تارماییەك بە هەموو خێراییەکەوە ڕووی لەو کرد. پاشان ڕوخساری دەرکەوت، ئەویش سەگێکی گەورە بوو ڕێك هێندەی شێرێك، تیژ وەکوو گورگ، تووکی درێژ و ڕەنگی سوور بوو، پێشمەرگەکان ناویان نابوو سوورە، بە هۆی ڕەنگی سووری تووکەکەیەوە. هەردوو سەگەکە گەیشتنە یەکتری و بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە کەوتنە گۆڕینەوەی سۆز و وەفا و ئاوێزانی یەکتربوون، بۆنی یەکترییان دەکرد، لە ڕێگەی بە یەکتر گەیشتنی ئەو دووانەوە هەردوو کۆمەڵەکە یەکتریان ناسییەوە. هەردووکیان —سوورە و ئانۆ- بە شێوەیەکی نامۆ سەرنجیان بەرەو شوێنێك ئاراستە دەکرد و خۆیان مەڵاس دەدا و گوێچکەکانیان قیت دەکردەوە، بە جۆرێك وایان لە هەمووان کرد هەست بە شتێکی نامۆ بکەن، وەلێ نەیاندەزانی چی لە ناخی ئەم دووانەدا هەیە. لە چاوتروکانێکدا سوورە وەکوو تیر لە کەوان دەرپەڕی، بەڵام ئانۆ نەڕۆیشت و لەگەڵیان کەوتە ڕێ و کاروانە تێکشکاوەکەی جێ نەهێشت، دوای تێپەڕبوونی نزیکەی دوو کاتژمێرێك ئانۆش وەکوو ڕەشەبا بەرەو دواوە گەڕایەوە و هەڵات، هێندەی نەبرد سوورە دەرکەوت و ژمارەیەك کەسی بەدوای خۆیدا هێنابوو کە هەر ئەوەتە و وزەیان لەبەر مابوو، پێ دەچوو ڕێگەیان ون کردبێت و سوورە ئەوانی دۆزیبێتەوە، سوورە ئەو شەوە فریشتەی فریادڕەس و

ڕزگارکەری هەمووان بوو! تۆ سەرنج بدە، مرۆڤەکان یەکتر دەکوژن و سەگەکانیش بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤەکان لە دوا هەوڵی خۆیاندان! بێ ئەوەی ساتێك پشوو بدات، دیسانەوە سوورە ڕووی لە لایەکی دیکە کردەوە و تێی تەقاند، ماوەیەکی زۆر لێیان دابڕا، هەمووان لە هاتنەوەی نائومێد بوون، گومانیان هەبوو کە ئیدی زۆر لێیان دوور کەوتۆتەوە و تازە ناگاتەوە پێیان، بە تایبەتی ئەوان لە هەڵگڕان بەرەو لوتکە بەردەوام بوون، وەلێ ئانۆ کە جاری یەکەم پێشوازی لە سوورە کرد، ئەم جارەیان زۆر شڵەژاو دیار بوو، هەر ئەمسەروئەوسەری دەکرد و دەیقرووسکاند و دەنووزایەوە، بۆیە هەندێکیان بەمەلا و بەولای خۆیاندا دەیانڕوانی و سەرنجیان دەدا، بەڵکوو شوێنپێیەك، نیشانەیەکیان دەست بکەوێت، بەڵام شتێکیان بەدی نەکرد، لە ناکاو ئانۆش وەکوو گوللە دەرپەڕی و لێیان دوور کەوتەوە، هەمووان بە نیگا ماندووەکانیان و بێدەنگییەوە هەتا لە چاو ون بوو سەرنجیان دایێ، پاشان ڕاوەستا، ئینجا گەڕایەوە، پێشمەرگەکان نەیاندەزانی ئانۆ لەم هاتن و چوون و ڕاکردن و ڕاوەستانە لە ناکاوانەی دەیەوێ چ پەیامێك بگەیەنێت، بۆیە بە وردی سەرنجیان دەدا و لە دەوروبەری خۆیان دەڕوانی، نەبادا ئەو شڵەژانەی ئانۆ بە هۆی هاتنی گەلەگورگێکەوە بێت، هەڵبەتە ئێستا گورگەکان لە بەرزاییەکان کۆ بوونەتەوە و بەو سارد و سەرمایە، بەوپەڕی ئارامییەوە چاوەڕوانی ژەمێکی چەور و بەتامی گۆشتی مرۆڤ دەکەن، ئاخر ئەگەر هۆکاری ئەو شڵەژانەی ئانۆ سوورە بێت، ئەی بۆچی تا ئێستا دیار نییە و وەکوو جاری پێشوو دەرناکەوێتەوە؟ لەناو گێژاوی ئەم بیرکردنەوانە و پرسیارانەدا دەستبەرداری ڕێکردن بەرەو لوتکە بوون و بێ ئەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت بەرەو لای ئانۆ چوون، تاکوو بزانن چ بەلا و نەهامەتییەکی دیکە چاوەڕێیان دەکات، کە گەیشتنە لای، دیسانەوە ئانۆ هەمان بەزمی ساز دایەوە و دەهات

و دەچوو، هێندەی نەبرد لە دوورەوە هەستیان بە هاتنی کۆمەڵە کەسێکی دیکە کرد، کە سوورە پێشڕەویی دەکردن، بەڵام چۆن پێشڕەویکردنێك؟! ئەوەی هێز و وزەیە لەبەر ئەو بەستەزمانە نەمابوو، هەرگیز بە گوتن وەسفی شەکەتیی ئەو ئاژەڵە وەفادارە ناکرێ، کە چۆن بەو شەوە سارد و سەرما و سەهۆڵبەندانە بۆتە فریشتە و یەك یەك دەستی ئەو مرۆڤە پەراگەندە و لێقەوماوانە دەگرێت و کۆیان دەکاتەوە سەریەك و لە مەرگی مسۆگەر دەربازیان دەکات، دەبێ لەو ڕاکەڕاکەی چ ئازارێکی دەروونی چەشتبێت و چەند وزەی بەخشیبێت، تا ئەو مرۆڤە تێکشکاوانە کۆ بکاتەوە سەر یەکتری، تۆ بەراوردێك لە نێوان سوورەی ئاژەڵ و مرۆڤە دڕندەکانی مام جەمالدا بکە، کە چۆن ئەو مرۆڤانەی لە دەستی ستەمکاریی ڕژێم هەڵاتوون و لەم چیاوچۆلە گیرساونەتەوە و خۆیان پەنا داوە، وا بوونەتە نێچیری ڕاوچییەکانی مام جەمال. ئەو دەستەیەش لە شەکەتیدا پرزەیان لەبەر بڕابوو، بە هەزار دەردەسەری بەناو ئەو بەفر و لیتە ساردوسڕەدا لە خەمی خۆدەربازکردن، هەر ئەوەتە و توانای جووڵاندنی قاچەکانیان هەبوو. کەواتە شڵەژان و شپرزەبوونەکەی ئانۆ بە هۆی سوورەوە بوو، نەك هاتنی گەلەگورگ. سوورەی فریشتە هەر کە ئەوانیشی گەیاندە ئەمان، ئیدی لەسەر ئەو بەفرە سارد و سەهۆڵبەندانەدا لێی ڕاکشا، ڕاکشانێك پێ دەچوو دوا ڕاکشانی ژیانی بێت لەسەر زەوی، بە هەزار حاڵ هەناسەی دەدا و کەفێکی سپی چڕ لە دەم و لووتییەوە دەردەچوو و لرخەی دەهات، ئەو تووکە درێژە سوور و جوانەی جەستەی داپۆشی بوو لە تەڕی و ناو ئەو سارد و سەرمایەدا وەکوو تاڵە دەزووی ڕێسراوی لێ هاتبوو، ئەوانەی لەوێ بوون و لە پەرۆشیی سوورەدا بوون، نیگەرانی باڵی بەسەرداکێشان، ئەوان پێیان وابوو، ئەم سوورە فریادڕەسەیان، گوللەیەکی مرۆڤە دڕندەکانی بەر کەوتووە، یان ئەوەتا لەگەڵ گەلەگورگێکدا باڵانگژێ یەکتر

بوونەتەوە و خۆی کردۆتە قوربانیی ئەمان، تا دەهات نیگەرانییان زیاتر و زیاتر دەبوو، وردتر سەرنجیان دەدایێ، چونکە پێ دەچوو دوا ساتەکانی ژیانی سوورە بێت، ئیدی سوورەی ئاژەڵی وەفادار ئەو ڕاکشانەی هەڵنەستایەوە و چووە خەوێکی قووڵەوە کە زیاتر لە مەرگ دەچوو نەك لە خەو. دوای ئەوەی سەرماکە خەریك بوو هەموو جەستەیان ژاراوی بکات و بەناو ماسولکەکانیاندا پەیتاپەیتا هەڵکشێت و داکشێت و لە پەلوپۆیان بخات، بە ناچاری بڕیاری ڕۆیشتنیان دا، ئاخر هەر ڕاوەستانێك لەناو ئەو سەهۆڵبەندانەدا مەرگێك بوو بۆ خۆی، تەنها ڕێکردن کەمێك گەرمیان دەکاتەوە، ئانۆی هاوخەمی سوورەی هاوڕەگەزی، وەکوو خولخولۆکە بە دەوریدا دەخوولایەوە و دڵی نەدەهات بەو جۆرە بەجێی بهێڵێت و خۆی بڕوات و ئەویش بە مەرگێکی هەتاهەتایی بسپێرێت، ئەو سوورەیەی کە باوەڕ ناکەم هیچ مرۆڤێك ڕۆژێك لە ڕۆژان بگاتە ئاستی بەشێکی کەم لەو ئەمەکدارییەی ئەو شەوەی ئەو ئاژەڵە لە پێناوی ئەواندا نواندی، ئەمەکدارییەك تا ئاستی قوربانیدان. ئەوان کەوتنە ڕێ و جارجارەش ئاوڕێکیان لە فریشتە فریادڕەسەکەیان دەدایەوە، تا وای لێ هات وەکوو خاڵێکی ڕەش، وەکوو ڕەشی دڵی مرۆڤە دڕندەکان، لەناو لاپەڕەیەکی سپیدا دەهاتە بەر چاو. ئیدی ئەوانەی سوورەیان لەو دۆخە دژوارەدا بەجێ هێشت هەر یەکە و لە پێناو مانەوەی خۆی ململانێی لەگەڵ سرووشتدا دەکرد و بەیەکدا دەهاتن. هەر کە دەگەیشتنە لوتکەیەك، لوتکەیەکی ساردوسڕتر و بەفراویتر و بەرزتر چاوەڕێی دەکردن. کەشەکەش لە هەوەسی خۆی نەدەکەوت، هەر ساتە و بە جۆرێك، دەمێك کپ و خامۆش، دەمێکی تر لوورەی باو زریانێك وەکوو گوورگ دەیلووراند و دڵی مرۆڤەکانی دادەخورپاند، کاروانی تێکشکاو و لێقەوماوەکانیش لەوپەڕی شەکەتی و برسێتیدا لاکەیان دەهات، هەتا هەندێکیان چاوی

چلێسی و برسێتی و شەڕخوازییان بڕیبووە ئانۆی بەستەزمانیش، بە تایبەتی ئەوانەی لە سەرەتای دەستپێکی شەڕەکەوە هیچیان نەخواردبوو. بەڵام ئەو وەك ئەوەی لە فیتەی حەرامزادەیی ئەوان تێبگات و لە نیگا و سەرنجەکانیانەوە نیازی ڕەشیان بخوێنێتەوە، لەو کاتە بەدواوە بە وریاییەوە لەگەڵیان ڕێی دەکرد و هەزار و یەك حیسابی بۆ مەبەستی گڵاویان دەکرد. بۆیە بڕیاری دا بە جۆرێك لەگەڵیان بڕوات و زۆر لێیان نزیك نەکەوێتەوە، دوای ماوەیەك یەکێکیان دوا تنۆکە توانا و وزەی جەستەی لەناو ئەو بەفرەدا بەخشی و کەوتە سەر زەوی، ئەوانەی تر کەوتنە هاندانی، تاکوو بەرانبەر ئەو سەختییە سەرشێتەی سرووشت خۆڕاگر بێت و کۆڵ نەدات، وەلێ دەنگدانەوەی وشە لەرزۆکەکانیان لای ئەو تازە هیچ واتایەك نابەخشێت، دوای ئەوەی ئاگای لەوان نەما و هەموو هەست و نەستی لە خاڵێکدا کۆ بوونەوە و وەکوو پێوەچزانی ئاگر دەیچزاندەوە، ئیدی ئەو "گانگری"یە نەفرەتییە لە نووکی پەنجەکانی پێی و دەستییەوە بەرەو تەواوی جەستەی هەڵکشا و خانە خانە دەستی بە خواردنی شانەکانی جەستەی کرد، وەکوو تەنەکەیەکی شکاو خەریك بوو سەر پەنجەکانی هەڵبتلیشێنێت، بەرئەنجامی بەستنی بەفرەکەش شەقشەقی بکات و ڕەش ڕەش هەڵیبگەڕێنێت، ئیدی تەواو خۆی دایە دەستی نائومێدییەکی بکوژ و ئازارێکی بێدەنگ و مردنێکی هێواش و لەسەرخۆوە. ڕەنگی ڕوخساری شینێکی ترسناك دایپۆشی، تەنها مەگەر مەرگ بەزەیی پێیدا بێتەوە و لەو ئازار و نەهامەتییەی ڕزگار بکات. ئەو جەستەیە بووە پارچەیەکی ڕەش و ڕەق، هەتا درندە چڕنووك بە خوێنەکانیش توانای لەتوپەتکردنیان نەما... ماڵئاوا ستەم... نەفرەت عەقڵی نەزۆکی مرۆڤەکان.

## بەشی بیست و پێنجەم

پێش قەرەوڵی ئەو هێزە تێکشکاوە گەیشتە ئێران، پەیتاپەیتا دەگەیشتن و لە دۆڵە گەرمەکاندا کۆ دەبوونەوە و بۆ ماوەیەك خێوەتیان هەڵدا، تاکوو ئەوانەی لەملا و لەولاوە ئاوارە و پەراگەندە بووبوون، ڕێگایان ون کردبوو و مەرگ پەی بە ڕۆحیان نەبردبوو و گوللەی چەکدارەکانی مام جەمال جەستەی دانەبێژابوون، لە هەموو لایەکەوە دەهاتنەوە و سەریان دەنایەوە یەك، ئەو کاتەش مەحموود بورهانی ڕێککەوتنی هاوبەشی لەگەڵ ئێراندا هەبوو، بۆیە دەسەڵاتدارانی ئەو دەڤەرە مۆڵەتی دانانی بارەگایان لەسەر خاکی ئێران بە پیرەکان بەخشی، ئەو کاتە هێزەکانی ئەوان لە شارە سنوورییەکان تراکتۆریان بۆ گواستنەوە و هاتوچۆ بەکار دەهێنا. بەو شێوەیە هێزەکانی مەحمود بورهانی پێشوازییان لە هێزە شکستخواردووەکانی پیرەکان دەکرد و وای پیشانی پاسەوانانی ئێرانی دەدا کە ئەمانە هێزی چەکدارانی خۆیەتی، چونکە ئێرانییەکان زۆر خۆشییان بە چرچچاوی پیرەکاندا نەدەهات. بەڵام ئەوان لەو بارەگایانەی دەوروبەری شارەکان، توانییان هێزە تێکشکاوەکانی خۆیان کۆ بکەنەوە و هێز و وزە و ورەیان بۆ بگەڕێننەوە، دوای ئەوەی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك میواندارییەکی باش کران. ئیدی لەوێوە دەستیان بە گەڕانەوەی هێزەکانیان کردەوە و لە نزیك سنوورەکانی تورکیا، یان لێرە و لەوێ و لە ناوچە نیمچە ئارامەکان بە پەرشوبڵاوی بارەگای بچووك بچووکیان دامەزراندەوە.

ڕەحمان لەگەڵ یەکێك لەو هێزە تێکشکاوانە بوو کە لە

میوانداریی بارەگاکانی مەحموود بورهانیدا بوون، یەکێك لە پیرەکان لەم و لەو پرسیاری ئەوی دەکرد، تا دەرئەنجام گەیشتە لای.

- زۆر باشە، لە کۆتاییدا تۆم دۆزییەوە... لەو قەرەباڵغییەدا دەمێکە بە دواتدا دەگەڕێم و پرسیارم لە هەمووان کردووە.

ڕەحمانیش بەوپەڕی ساردی و بێزاری و نائومێدییەوە گوتی:

- بەڵێ فەرموو.

پیرەکە لەسەر زەوییەکە دانیشت و بە دەنگێکی پڕ لە ئازار و خەمەوە، لەسەرخۆ دەستی بە قسان کرد، زمانی لەناو زاریدا بە شێوەیەکی میکانیکی لە هاتن و چوونێکی سەیردا بوو، وەکوو ئامێرێکی دەستکرد دەهاتە پێشەوە و دەگەڕایەوە دواوە و بەر ناوەوەی لچی خوارەوەی دەکەوت کە تەڕایی تێدا نەمابوو، دوای چەند پێکدادانێك و دەربڕینی چەند وشەیەك کەفێکی سپی تێدا دروست دەکرد، بەو حاڵەوە بە ڕەحمانی گوت:

- حەزم کرد بتبینم و پێکەوە باسی هەندێك کاروبار بکەین.

لەو ئانوساتەدا ڕەحمان تووڕە و بێدەنگ، خەریکە لە پێستی خۆی بێتەدەر و ئەوەی ناشێ پێی بکات و تەنها بە سەرنجەکانی دەیەوێ تەزرەکوتی پرسیاری بکات، وەلێ پیرە بواری نادات ورتەی لە دەم بێتە دەرێ و پێی دەڵێت:

- دەمەوێ هەندێك شت دەربارەی دۆخەکە بزانم، دڵنیام تۆ ئاگات لە زۆر شت هەیە... ئەو کاتەی تۆمان نارد بۆ ئەوێ، هەڵبەتە دوای داواکردن و سووربوونی خۆت کە بچیت بۆ ئاشقوولکە، نامەیەکمان پێ گەیشت تیایدا باسی ئەوە کرابوو کە

دۆخەکە دژوارە و دوژمن بەڕێوەیە بۆ بارەگای کاسکان، لەو کاتەدا زۆر خەمبار بووین بە چوونی تۆ بۆ ئەوێ... چونکە لە چارەنووست ترساین... بەڵام گوتمان: تۆ شایانی ئەو بەرپرسیارێتییەیت و دەتوانی لۆژیکیانە مامەڵە لەگەڵ دۆخەکەدا بکەیت!

پیرەکە لەسەرخۆ لە قسەکانی بەردەوام بوو، زمانیشی لەناو زاریدا لە هاتن و چوونێکی بەردەوامدا بەر ددانە شاش و کەمەکانی دەکەوتن و ڕێك لە کونی کوورەی کەرپووچی کۆن دەچوو.

دوای ئەوەی لە قسەکانی بووەوە، ڕەحمان گوتی:

- کاسکان و هەموو بارەگاکانی دیکە بۆ ڕۆژی دواتر شکان و داگیر کران.

پیرەکە یەکسەر:

- بەڵێ تەواوە، بۆیە دەمەوێ لە تۆوە هەندێك شت بزانم، لەبەر ئەوەی تۆ گەواهیدەرێکی ڕاستەقینە و ئامادەی ناوجەرگەی ڕووداوەکان بوویت، بۆ نموونە دەمەوێ بزانم دۆخی چەکدارەکانمان لەوێ چۆن بوو، حاڵ و ئەحواڵ و وەرەی شەڕکردنیان لە چ ئاستێکدا بوو؟ بۆیە بە تایبەت لە تۆ دەپرسم، چونکە تۆ جەنگاوەرێکی ڕاستەقینەیت و دەتوانی ئەو کاروبارانە بە زیرەکی بخەمڵێنیت و ڕاستگۆیانە ڕای خۆتمان پێ بڵێیت.

بێدەنگی باڵی بەسەرداکێشان و دیار بوو پیرەکە بیری خزابێتە قووڵایی بێدەنگییەکی تاریکەوە، کە هیچ وەڵامێکی دەست ناکەوت، جارێکی دیکە دەستی بە قسان کردەوە و ئەمەی خستەسەر قسەکانی پێشووی: دەزانم ئەو لوتکانەی

ڕۆژێـك له ڕۆژان "تـۆ" ئامـاژەت پـێ دان، ئـێمه به هەنـدمان وەرگـرت و لێکۆڵینەوەمـان دەربارەشـیان کـرد و چـووینه ئەو لوتکـانەش، هەتـا مـن خـۆم لەگەڵ هاوسـەرەکەم چـووینه سـەر یەکێـك لەو لوتکـانەش، به ڕاسـتی گرنـگ و سـتراتیژی بـوو، دەمودەست پەلێکمان له هێزەکانمان لەوێ دانا.

- بەڵام دوای چی؟! دوای ئەوەی کات تێپەڕیبـوو و کـار له کار ترازابوو، ئاخر ئەو کاتە هەمـوو لوتکەکـانی تـر له لایەن دوژمنەوە داگیر کرابـوون، جـگه لەوەش پەلێـك به تەنهـا لەنـاو هێرشێکی وا گەورەدا دەتوانێ بەرگەی چی بگرێت؟!

پیرەکه به هەمان ڕیتمـی لەسـەرخۆ گـۆکردن و قسـەکردنی لایەنگیریی قسەکانی ڕەحمـانی کـرد، لەو کـاتەدا هەر کەسـێك گــوێی له قســەکانی بــووایه وای دەزانــی ئەوەی دەدوێــت له سەرەمەرگدایه:

- قسەکانت زۆر ڕاسـتن و... و... به ڕاشـکاوییەوە دەڵـێم ئێمه پیاوی سیاسـیین نەك سـەربازی... بەڵام تـایبەت به لـوتکه و پێگه سـەربازییەکان، ئەوە هـیچ دەربارەیـان نـازانم. ئەوانـیش... هەرگیز له تایبەتمەندیی مندا نین.

ڕەحمان خـزایه نـاو بیرکردنەوەیەکـی تاریـك و ڕەشـەوە و گوێی له ونەونی دەنگـی سـەرەمەرگی پیـرەکه دەبـوو، وەکـوو قوتـابییەك شـەونخوونی مانــدووی کردبێــت و مامۆستاکەیشــی ناچاری گوێگرتنی وانەیەکی گرانی زانسته پەتییەکانی کردبێت، چاوەکانیشــی بڕیبــووە ڕوخســاری پیــاوە پیــرەکە، بــێ ئەوەی بیانپرووکێنێت، سـەرنجەکانی دوور دوور و ساردوسـڕ و مـردوو بوون. ئەو قسانەی دەهێنایەوە بیری خـۆی که له نێـوان خـۆی و ساماندا ڕووی دابـوو، هەر لەبەر خـۆیەوە گـوتی: "هەرچـی تـۆ

گوتت ڕاست دەرچوون".

پیرەکە قسەکەی پێ بڕی:

- بۆچی وا تەماشام دەکەیت؟

ئەویش منگەمنگێکی کرد و بە هێواشی پاڵێکی بە دەستی ڕەحمانەوە ناو گوتی:

- بەهەرحاڵ سوپاس بۆ خودا کە سەلامەتیت.

ڕەحمان زۆر لەو شوێنە نەمایەوە، هێندەی پێ نەچوو بڕیاری گەڕانەوەی دا بۆ لای دەستەکەی پێشووی لە چیای حەسارۆست، ئەو بارەگا و شوێنەی کە زۆری خۆش دەویست. وەکوو جاران گەڕایەوە ناو هاوڕێکانی، دکتۆر و سعوود و مامۆستا عومەر و ئەوانی تر. ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو دەستەکە هەواڵی ئەوەیان پێ گەیشت کە سوپا و جاش هێرش دەکەنە سەر ناوچەکە، ئەوانیش لە بارەگا دەرچوون و لە قەدپاڵ و لوتکە و سەر چیاکاندا کەوتنە دانانی بۆسە بۆ دوژمن، ڕەحمان و سعوود لەناو تاشەبەردەکاندا دانیشتبوون و سەرنجیان لە گوندە دوورەکان دەدا کە زۆر جاری تر ڕژێم هێرشی بۆ کردبوون، بەرلەوەی ئەم هێرشەیان بکاتە سەر. بەڵام دۆخەکە زۆر کپ و هێمن بوو، هەتا چاو بڕ کات لە ڕێگە خۆڵینە پێچاوپێچەکانی بەرچاویان هیچ کاروانێکی سەربازییان بە دی نەکرد، هێندەی نەخایاند مامۆستا عومەر هاتە لایان و پێی گوتن:

- هەواڵەکە جگە لە زێدەڕۆییەکی جووتیارانی گوندەکان و شوانەکان بەولاوە هیچی تر نەبوو، نە هێرشی جاش دیارە و نە سەربازیش... لەوانەیە بە ڕێگەکەدا کاروانێکی سەربازی بە ئاراستەی فەوجەکە هاتبێت، یان ئەوەی بەرەو شاری ڕەواندز ڕۆیشتبێت، هەتا هەواڵەکە لە زاری شوانێکەوە گەیشتبێتە

گوێچکەی جووتیارێك و گەیشتبێتە ئەمان، ترشوخوێ کرابێت و ئەنجام کاروانە کەمەکە بووبێتە سەد دانەیەك.

سعوود بە بێزارییەوە:

- بگەڕێینەوە شوێنی خۆمان، یان هەر لێرەدا بین؟

مامۆستا عومەر لەسەرخۆی:

- هێشتا نا... با کەمێکی دیکەش بمێنینەوە، لەوانەیە یەکێك چاودێری شوێنەکەمان بکات.

خولەکێکی پێ نەچوو دکتۆرەکەش خۆی گەیاندە لایان، بێزاری باڵی بەسەر هەموو ئەندامانی دیکەی دەستەکەدا کێشابوو کە لێرە و لەوێ و لە پەنای تاشەبەردەکان خۆیان لە بۆسە نابوو، هەموویان وەك ئەوەی شتێکیان ون کردبێت، ئەوەندە بێزار و وەڕس بوون، کەسیان نەیاندەزانی هۆی ئەو بێزارییەیان چییە! یەکێکیان گوتی: ئەها... هۆیەکەی تەنها ئەوە ئەو، ئەوە یەکەم جارە بەبێ ئەو لە بۆسەداین، ئای چۆن هەمووانت بێکەس کرد...؟!

دکتۆرەکە بە دەنگێکی ئاساییەوە گوتی:

- بەبێ ئەو وەکوو هەتیومان لێ هاتووە!

ڕەحمان بە دەنگێکی خەمبارەوە:

- مەبەستت مام کاکیلە؟

سعوودیش بە تاسەوە:

- هەرگیز باوەڕ ناکەم کارەکە بەبێ دەستکێشیی کەسێك کرابێت.

مامۆستا عومەر:

- زۆر دەربارەی ئەم گومانە قسەمان کرد. هیچ بەڵگەیەك نییە پشتگیری ئەوە بکات.

- کەواتە چۆن درکیان بە جووڵەمان کرد و بەو ژمارە زۆرە بۆسەیان بۆ دانایەنەوە. ئاخر مام داواکراو بوو. خۆزگە لە قسەکانی یاخی دەبووین و لەگەڵیدا دەماینەوە. بەڵام ئەوەندە توند بوو کێ دەیوێرا لە قسەی یاخی بێت. ئەو گوتی: هەمووتان بڕۆن تای تەرازووی لایە بێهێزەکە ڕاست بکەنەوە... حەقی منتان نەبێت، من دەتوانم چاریان بکەم، ئەوە چ ئازایەتییەك بوو. بە تەنها ڕووبەڕوویان بووەوە، ئەو هەموو هێزەیان نەیانتوانی یەك هەنگاو بێنە پێش، مام کاکیل بە تەنها ڕێگەی لێ گرتبوون و لە دواوە پارێزگاری لێ دەکردین، هەموومان باش دەمانزانی و شارەزای دەست و تفەنگ و ورەی پۆلایین و هزری تیژی بووین، ئەو هەر کە سەنگەری خۆی لە پەنا بەردێك گرت و تفەنگە کۆنەکەی خستە کار و ڕووی تێ کردن، ئیدی هێز نییە بتوانێت تێبپەڕێت مەگەر بەسەر لاشەکەیدا.

هەر کە سعوود قسەکانی تەواو کرد، ڕەحمان بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی:

مەبەستت لەوەی ناوی داوین و نهێنی ئاشکرا کردووین کێیە؟!

- تەنها قسەیەکی بێ بەڵگە بوو، هەراوهوریایەکی نێوان خۆمان بوو، کە قاسم بێت. هۆیەکەیشی ئەوەبوو کە مام کاکیل دوای هێرشی دووەممان بۆ سەر مۆڵگەکەی دوژمن دەریکردبوو، چونکە لە کاتی پەلاماردانادا ترسنۆك دەرچووبوو. ئەمەش وای لێ کردین هەموومان بۆ ئەوە بچین کە قاسم لە

ئەنجامی ئەو ڕق و قینەی هەیبووە وای لێ کردووە هەواڵی جووڵەی مام کاکیل بە دوژمن بڵێت... وەلێ ئەوە تەنها گومانێك بوو و هیچی تر.

دکتۆرەکە گوتی:

- نابێ هەر لە خۆمانەوە زوڵم لە کابرا بکەین. چونکە دەرکردنی پێویست بەوە ناکات خۆی بدۆڕێنێت و بچێت هەواڵی ئێمە بە دوژمن بدات، جگە لەوەش ئەو چۆن دەزانێت چی دەکەین و بۆ کوێ دەچین، کە ئەو لە ناوماندا نەمابێت؟

ڕەحمان گوتی:

- ئەو چۆن لەگەڵتان نییە، بەڵکوو تا ئێستا لە ناوتاندایە؟

- مەبەستت ئەوەیە دوای ئەوەی ئەو جارە دەریکرد، بەڵام دوایی پاڕایەوە کە جارێکی دیکە وەریبگرنەوە، دوای ئەوەی دانی بەوەدا نا کە لە چالاکییەکە ترسنۆك بووە.

دیسانەوە ڕەحمان گوتی:

- ئێوە سەیرن...! چۆن وەریدەگرنەوە دوای ئەوەی مام کاکیل دەریکردبوو. سوودی بۆتان چییە؟! بە ڕاستی ئەمە زۆرە.

مامۆستا عومەر گوتی:

- ئەو کوڕی ئەم ناوچەیەیە لە وەرگرتنی هەواڵ و زانینی ڕووداوەکاندا سوودی بۆمان دەبێت.

- سوودی بۆتان دەبێت؟! ها! چۆن سوودی بۆتان دەبێت؟! ئەو هەواڵی جووڵە و هاتوچۆتانی ئاشکرا کردووە، هەتا ئەگەر بێ مەبەست و تەنها بۆ چەنەبازییش بووبێت.

- گوتمان هیچ بەڵگەیەك لە دژی نییە. ناشبێت بەو جۆرە

زوڵمی لێ بکەین، تەنها لەبەر ئەوەی گومانی خەراپمان لێی کردووە.

سعوود گوتی:

- دەزانی جەماعەتەکەی مام جەمال چەند بە شانازییەوە باسی خۆیان دەکرد و دەیانگوت: "لەو شەڕەدا چەندیان لێ کوشتین؟ دە، بیست، قەیناکا کورە تۆ بڵێ سەد! ئێ چ قەیدی؟ هەرچییەکیان کرد، خۆ دەرئەنجام ئێمە سەرکەوتین، لەبەر ئەوەی ئەو مام کاکیلەمان کوشت!"

دکتۆرەکە گوتی:

- ئای چەند سووك و چرووك و گەمژەن. ئەوانەی ئێستا بە خۆیانەوە دەنازن کە مامیان شەهید کردووە، ژمارەیان لە ژمارەی ڕەوە کوللە زۆرتر و زیاتر بوون، یەك کەسیان زاخی ئەوەیان نەبوو سەریان لە پەنای گاشە بەردەکان و ئەو سەنگەرانەی خۆیان تێدا حەشار دابوو هەڵبڕن، مام کاکیلیش دانەدانە بەو فیشەکە کەمەی کە پێی مابوو، یەك یەك دەیکردنە ئامانج و نیشانە، تا ئەو کاتەی کۆتایی بە فیشەکەکانی هات و ئەو بەژن و باڵا شکۆدارەیان بینی کە وێڕای کەمێك پشتە چەماوەکەی، کەچی وەکوو لوتکە شاخێکی سەرکەش لە بەرانبەریان ڕەق ڕاوەستاوە و هەتا چاویش ناپرووکێنێت، ئینجا ئەوان لە بن بەردەکان هاتنە دەرەوە، کەچی ئەو بە ئەنقەست لە بەرانبەریان وەکوو چیای هەندرێن سەرکەش سەرکەش بە پێوە ڕاوەستابوو. ئەم قسانە یەکێك لە چەکدارەکانی مام جەمال گێڕابوویەوە، دەڵێن: کە فیشەکی پێ نەمابوو، ئیدی چەکەکەی توورهەڵداوە و کاتێك بینیویەتی لوولەی تفەنگەکان هەر هەموویان ترسنۆکانە ڕوویان کردۆتە ئەو، ئیدی بە سینگ

دەرپەڕاندنەوە بەرانبەریان ڕەپ ڕاوەستاوە و سەرنجەکانی ئاڕاستەی ئاسۆیەکی دوور کردووە، هەتا ئەو چرکەساتەش چۆکی بۆ دانەداون، ئەوان زۆریان پێ خۆش بووە ئەو لێیان بترسێت و ڕابکات، یان لێیان بپاڕێتەوە کە نەیکوژن، هایهووو های! ئینجا مام کاکیل کەی باکی بە مەرگ هەبووە، تا لە بەردەم ئەو هەرزەومەرزانەدا چۆك دابدات، یان ڕابکات، تاکوو ئەوانیش لە پشتەوە بە گولله دایبێژن؟! بەڵام ئەوە هەرگیز لە خەسڵەت و کەسایەتیی ئەودا نەبووە، ئەو لەو خۆشی و حەزەیان چاوەڕوانی بوون، بێبەش و هیوابڕاوی کردن، نە لەوان و نە لە مەرگیش نەترسا، ئیدی لە چرکەساتێکی غەدر و خیانەتدا لە هەمــوو لایەکەوە دایــانە بەر دەســتڕێژی گــولله و جەستە باریکەڵەکەیان دابێژاو هەر بە چاوی کراوە و ئومێدەوە کەوتە سەر زەوی و لە کاتی دوا ساتەکانی مەرگیشیدا گۆشەنیگای سەرنجەکانی لە ئاسۆی لوتکەی مرۆڤدۆستی لانەدا... ئاخ مام کاکیل... ئاخ!

ڕەحمان لەگەڵ خۆی و بە دەنگێکی نزم و دانەجیڕەوە گوتی:

- بە دڵنیاییەوە ئەگەر بزانم ئەو هەواڵی گەیاندۆتە دوژمن، بەڵێن بێ بەم دەستانەی خۆم پارچەپارچەی بکەم.

مامۆستا عومەر لەو کاتەی بە سەری ئاماژەی بۆ شوێنێکی دوور دەکرد، گوتی:

- ناوی پشیلەمان هێنا بە میاوەمیاو هات.

- کێ؟

ڕەحمان پرسیاری کرد و مامۆستا عومەریش وەڵامی دایەوە:

- قاسم و ئەوەی لەگەڵیەتی، ڕێك وەكوو سێبەری لێ هاتووە، برای خوشكە كوژراوەكە، عەولا.

ڕەحمان بەوپەڕی توانایەوە هەوڵی ئەوەی دەدا كە هێمن و ئاسایی بێت، كاتێك چاوی بڕیبووە ئەو دوو گەمژەیە. مامۆستا عومەریش لە خەم و ترسی ئەوەدا بوو كە ئێستا نا ئێستا ڕەحمان لە ناخەوە خوێنی فوارە دەكات و هەڵدەقوولێت و دۆ و دۆشاو تێكەڵ دەكات، لەبەر ئەوەی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو، وەكوو گڕكان خەریك بوو بتەقێتەوە، چونكە لە ئەنجامی هەڵچوونی زۆرییەوە سوور هەڵگەڕابوو.

مامۆستا عومەر لە تەنیشتی دانیشتبوو و بە چرپەوە شتێكی بە گوێیدا دا:

- دەبینم خەراپ هەڵچوویت... ڕەحمان ئەوەت لە یاد بێت كە پێت گوتم.

- چیم پێ گوتی؟

- پێت گوتم كە بەڵێنت بە خوشكی ئەو شێتۆكەیە داوە كە گێچەڵ بە هیچ یەكێك لە خانەوادەكەیان نەكەیت. ئەدی تۆ ئەو بەڵێنەت بە خۆت نەدابوو؟! كەواتە پێویستە پابەندی بەڵێنەكەی خۆت بیت، تۆ كەسێكی بەڵێنشكێن نیت. هیچ كێشە و هەرایەكمان ناوێت. جگە لەوەش كارەكە بە باشترین شێوە كۆتایی هات. ئەدی نەتگوت ئەو كچە شۆخە عاشقی پیاوەكەی بوو، دوای ئەوەی هەستی بە باشی و ناسكی كرد، سەرباری ئازایەتییەكەی كە ئاسوودەیی و ئارامی پێ بەخشی كە هەموو كچە گوندنشینێك خەونی پێوە دەبینێت؟

- ڕێك وابوو، ئەو شیرینە شۆخە هەر بە تەواوی عاشق و شەیدای بووبوو، ئاخر هەموو كچێك خەون بەوەوە دەبینێت

خۆشەویستێکی وەکوو سامانی هەبێت، بەڵام خۆ لە هەموو گوندەکاندا هیچ کەسێك هاوشێوەی سامان بوونی نییە و هەتا بەشێکیش لە ئاکار و خەسڵەتەکانی ئەو شك نابەن. وەلێ من هێندەی یەك دونیا لەو دوو مرۆڤە پیس و گەمژانە تووڕەم، ئاخر هەردووکیان بەوپەڕی درندەییەوە دوو کچی جوان و شۆخوشەنگیان بە پاساو و لە سایەی هزری باوکسالارییەوە خەڵتانی خوێن کرد و گوڵی بەهاری تەمەنیانیان هەڵوەراند، کەسێکیش لە ئێمە توانای سزادانی ئەو دووانەمان نەبوو.

ئەو لەو چرکەساتەدا وا هەستی دەکرد هەردوو قوربانییەکە، -کچە بەفرینەکە و خوشکەکەی قاسم، ئەو عاشقەی برا گەمژەکەی نەیهێشت خۆشی لە هاوسەرگیری ببینێت و کوشتی- ئەو دوو کچەی بە ناهەق خوێنیان ڕژا وا بانگی دەکەن و دەمودەست داوای تۆڵەکردنەوەیان دەکەن و وای لێ دەکەن هەر لێرە ئەم دوو درندەیە بکوژێت و تۆڵەی ئەو دوو شۆخە کچەیان لێ بکاتەوە.

مامۆستا عومەر هاتە دەنگ:

- ڕەحمان ئەمە زۆر قورسە ها. ئەوە یاسا و دەستووری ژیانیانە. لە شەو و ڕۆژێکیشدا هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت. ئەوانە پێویستییان بە سەدەیەکی تەواوە، تاکوو هزر و هۆشیان تۆزێك پێش بکەوێت و گەشە بکات و پەرە بسێنێت. ئەم شاخە چۆلوهۆلە مرۆڤی ناگاتێ. ئەوەی پێمان دەکرێت و ناکرێت ئەوەیە کە ناوەناوە بە ئاشکرا لەگەڵ جووتیاراندا کۆ ببینەوە و بە هەندێك بیرۆکەی هاوچەرخانە کەمێك ئەو مێشکە ژەنگگرتووانەیان مشتوماڵ بکەینەوە، بەڵکوو کەمێك هوشیار بینەوە و هەوڵی ڕۆشنبیرکردنیان بدەین، ئێرە و ئەمانە هەر بە تەواوی لە دونیا دابڕاون، دابڕانێکی قێزەون و سەیر، جگە

لەوەش خۆ خەڵکی هەتا لە شارە گەورەکانیش گەمژەیی وا ئەنجـــام دەدەن، ئەدی لێـــرە و لەم چـــۆڵەوانی و دوور لە شارستانییەتە چۆن کاری وا ناکەن؟!

- تۆ ڕاست دەکەیت. نازانم بۆ سەری خۆم لەگەڵ ئەمانە دەئێشێنم و مێشکی خۆم لە پێناویاندا دەسووتێنم، دەبا هەموویـان توناوتوون بەرەو دۆزەخ بچن، ئاخر ئەمانە شتێك نـین جگە لە کۆمەڵە گەوجێك بەولاوە.

قاســم لێیــان دەرکەوت و عەوڵای هاوڕێیشــی بەدوایەوە، نـاوەکەی عەوڵاش کـورتکراوەی نـاوی عەبـدوڵلا بـوو، ئەوان، هەزار و یەك ناوی لاوەکی لە ناوە ڕەسەنەکەیان جیا دەکەنەوە، هەر بە نمـوونە قوڕبەسـەر یەکێـك ئەگەر نـاوی مـحەمەد بێـت، ئیدی لە حەمەوە بیگرە تا دەگاتە عەمە و حەمەد و حەمکۆ و... تاد، ناوەکانی دیکەش هەروا. هەردووکیان سـەرنجێکی سـارد و بزڕکاویان ئاڕاستەی ئەوانە کرد کە لەوێ دانیشتبوون، بەڵام هەر زوو سەرنجەکەیان بەر سەرنجە بکوژانەکەی ڕەحمان کەوتەوە.

قاسـم ڕاسـتەوخۆ لە بەردەمیـان لەسـەر چنچـك دانیشـت و گوتی:

- سوپا و جاشە بەکرێگیراوەکان هەموویان بەرەو ڕەواندز پاشەکشەیان کرد و کەسیان لە ناوچەکەدا نەمانەوە.

مامۆستا عومەر گوتی:

- ئەم هەواڵانە باشـــن، کەواتە ئـــێمەش دەکشـــێینەوە، مانەوەمان لێرە هیچ پێویست ناکات.

پەیوەنـدییەکی هـاوڕێیەتی و دۆسـتایەتیی بە تـین لە نێـوان قاسم و عەوڵا کە لووتی خوشـکەکەی بـڕی دروسـت بووبـوو،

ماوەیەکی درێژی نەخایاند پەیوەندییەکەی نێوانیان بەهێزتر بوو، هۆیەکەیشی ئەوە بوو بارودۆخی هەردووکیان هاوشێوە بوو، بۆیە لەگەڵ یەکتری هەستیان بە ئاسوودەیی دەکرد. لە کاتی دیدار و چاوپێکەوتنەکانیان هەمیشە قاسم هەوڵی ئەوەی لەگەڵ دەدا کە بێتە ڕیزی پێشمەرگەکانەوە و پارچە چەکێک و مانگانەش پێنج دینار بەدەست بهێنێت، عەولا زۆر حەزی دەکرد، بەڵام ئەی چی لە باوکی بکردایە، کە لە کاروباری ماڵ و کشتوکاڵ و بایەخدان بەو ئاژەڵە کەمەی هەیانبوو زۆر پێویستیی پێی بوو، بۆیە ئەو کاتە ئەو بڕیارەی دواخستبوو، بەڵام زۆر زۆری حەز لێ بوو، چ زوو بێت، یان درەنگ هەر دەبێ ڕۆژێك ئەو ئاواتەی بهێنێتە دی. لەوانەیە ئەو کاتە ناچار بێت بۆ چەکهەڵگرتن، کاتێك جاشە چلکاوخۆرەکان و سوپای ڕژێم پەلاماری گوندەکان دەدەن بۆ دەستگیرکردنی گەنجەکان و ناردنیان بۆ بەرەکانی شەڕی نێوان هەردوو وڵات، ئەو کاتە چوونەڕیزی پێشمەرگەکان دەبێتە کارێکی پێویست و بە سوودیش بۆی و باشترە لەوەی بە خورتی بیکەنە سەرباز. نەخاسمە لە گوند و ناوچەکەی خۆیانیش دانابڕێت و هەر کاتێکیش بیەوێت دەتوانێت سەردانی ماڵەوەیان بکات. جارێکی دیکە دڵەڕاوکێ و شڵەژانی دەروونی ڕەحمان لە ڕوخساریدا دەرکەوتەوە، ئەوەش کاتێك لاجانگ و کاجێرەکانی گرژ دەبوون و ڕەنگی تێك دەچوو، دیسانەوە سەرنجە مردووەکانی بەرانبەریان بەئاگا دەهاتنەوە، وا سەرنجی دەدانێ وەك ئەوەی بیەوێ ڕاویان بکات. ئەو بەڵێنەی بە شیرینی شۆخوشەنگی دابوو، بەوەی دەست لە کەسوکارەکەی نەدا، هەموو جارێك ساردی دەکردەوە، وەلێ خەریك بوو دەیخنکاند، ئەو بەڵێنە نەفرەتییەی خۆزگەی دەخواست نەیدابووایە، بەڵام چۆن لە بەردەم مەترسییەکانی دڵخوازەکەی و چاوە پڕ لە فرمێسکە

درەوشاوەکانیدا خۆی دەگرێت، هەڵبەتە هەر دەبوو نەرم بێت و ئەو بڕیارە بدات، هەتا ئەگەر دڵی لە بەردیش بووایە. یادەوەرییەکانی لەو چرکەساتەدا کەمێك دەروونیان گەشاندەوە و ئەو سۆزەی بۆی وای لێ کرد تووڕەییەکەی لەو دوو گەمژەیە کەمتر ببێت و بڕەوێتەوە. هەتا ئەگەر بیانەوێت لەگەڵیشیدا بدوێن، ئەو وەڵامیان دەداتەوە و هەتا ئامادەشە بیانبورێت، هەرچەندە خەیاڵی کچە بەفرینەکە، وەکوو ئازاری سەهۆڵبەندان دەیبەستی، کاتێك بیری لەو مەرگە پڕ ئازار و بە سوێیەی دەکردەوە، ئاخر چۆن بتوانێت لێیان خۆش بێت. مرۆڤایەتی لە ناخی ڕەحماندا هێندە لەڕولاواز بووبوو، ڕێك لە مەڕە کەترەیەکی لەڕاندابڕاو دەچوو، وەلێ ڕق و دڕندەیی لە ناخیدا لەوپەڕی بەهێزی و ستەمکاریدا بوو، بەڵکوو هەتا ئارەزووی تۆڵەکردنەوە لەم دوو بکوژە لای ئەو بووبووە خولیایەکی ڕۆژانە و خەمێکی کوشندە و هەموو سنوورێکیشی بەزاندبوو، کوشتنی ئەوان بەلایەوە، تاوان نەبوو، بەڵکوو خودی دادپەروەری بوو بە هەموو ژیری و حیکمەتەکانییەوە، وەلێ مرۆڤ لەو جیهانەدا، مرۆڤی خۆڕسك، بوونەوەرێکی لاواز و بێدەسەڵات و خاوەن دڵێکی نەرمونیان و پڕ لە سۆزە، لەو جیهانە پڕاوپڕ لە مرۆڤە ئەهریمانانە، هەتا توانای پاراستنی خودی خۆیشی نییە. خۆبەدەستەوەدان بۆ مرۆڤی خۆڕسکی لەڕولاواز و بێدەسەڵات، واتە مەرگێکی مسۆگەر و ملکەچکردن بۆ ستەمکاری. خۆبەدەستەوەدان بەلای مرۆڤی ئاشتیخواز و تابلۆی دیمەنی قوربانییەکانیش بە بەرچاویدا دێن و دەچن، دەمرن و ئازار دەچێژن، بێ ئەوەی یەك جووڵەشی لێوە بێت، ئەمە خۆی لە خۆیدا خودی تاوانەکەیە. لای ئەم مرۆڤی ئاشتیخوازیش بەشدارە لە کوشتن و ئەتککردنی ئەو کچەی وایان لێ کرد لەناو بەفردا ڕەقهەڵێت و بە ئازارەوە بمرێت و ببێتە تۆپەڵە

بەفرێک، نەک هەر ئەو هەتا کچە ئاشقەکەی دیکەش، بۆیە مرۆڤایەتی لە ڕەحماندا بووبووە تارمایی و تاوانبارێکی دڕندە و چڕنووک بە خوێنی ئەوتۆ کە بەزەیی بە هەردووکیاندا نەیەتەوە، ئێستا ئەو ڕێک بۆتە کێویلک لە دڕندەیی و دەیەوێ تۆڵە بکاتەوە، تۆڵەکردنەوەش بە لای ئەوەوە واتە خودی دادپەروەری، ئەو دڕندە تاوانبارەش لە بنەچەدا مرۆڤێکی ئاشتیخواز و تێکشکاوە و ئەویش بە لاوازی و بێدەنگییەکەی بەشداری لە تاوانی هەردووکیاندا کردووە. ڕەحمان بەوپەڕی توانای خۆیەوە جڵەوی سەرکێشی خۆی توند توند بەرزەفت دەکرد، نەبادا دابڕووخێت و کەتنێک بنێتەوە، بۆیە بە جووڵەیەکی لە ناکاو هەستایە سەر پێ و وەکوو هەورە تریشقە لێیان دوور کەوتەوە و لەبەرخۆیەوە دەیگوت: "ئاخر ئەگەر کەمێکی تر لێرە بمێنمەوە، کارێکی وا ئەنجام دەدەم دواتر لێی پەشیمان ببمەوە، ئەو کاتە پەشیمانیش دادم نادات". هەر کە نزیکەی سەد هەنگاوێک لێیان دوور کەوتەوە، پڕ بە گەرووی نەڕاندی: مام کاکییییل... بۆچی جێت هێشتییین؟!!!

قاسم لە دڵی خۆیدا گوتی: "چەند حەز دەکەم سینگی ئەو ڕەحمانە وەکوو خوشکەکەم و مێردەکەی بە گوللە دابێژم... ڕۆژێک هەر وای لێ دەکەم، بۆ کوێ دەچێت؟! ئەو کاتە پیشانی دەدەم قاسم کێیە؟!"

عەولا کە سەرنجی دابووە پێش خۆی و تەماشای دووری دەکرد گوتی:

- ئەم ڕەحمانە ئێمەی خۆش ناوێت، من نازانم چیم کردووە، تا ئەوەندە سووکایەتیم پێ بکات و ئەوەندەش ڕقی لێم ببێتەوە؟!

مامۆستا عومەر هەڵی دایە و گوتی:

- ئەو ڕقی لێتان نییە، بەڵکوو خۆی هەر وایە، لەگەڵ ئێوە و لەگەڵ کەسانی دیکەش. دیسانەوە عەوڵا هەڵی دایە و پرسی:

- بەڵام بۆچی؟

- وا (موعەقەد)ە، واتە وا مڕومۆچە؟

دکتۆریش بە دەنگێکی شۆخیئامێزەوە ڕووی لە قاسم کرد و بە هەندێك وشەی شێوێندراوی عەرەبییەوە، کە زۆر جار کوردەکان بۆ سووککردنی گرانی و زەحمەتی شێوەی زمانی عەرەبی بەکاری دەهێنن گوتی:

- مازا یەعنی معکد؟ لەوەش مەبەستی "ماذا یعنی معقد؟" واتە مڕومۆچ یانی چی؟!

دیسانەوە دکتۆر گوتی:

- واتە پیاوەکە "عکدە"ی هەیە، بە واتایەکی دیکە گرێکوێرەی دەروونی هەیە و پێویستیی بە کەسێکە بۆی بکاتەوە. سعوودیش بە پێکەنینەوە پەنجەی بۆ قاسم ڕاداشت و گوتی:

- کەس "عەککەد"ی نەکردووە تۆ نەبێت، واتە کەس مڕومۆچ و تووڕەی نەکردووە تۆ نەبێت.

- ئینجا من حەقم چییە؟

قاسم دەستی بە منگەمنگ و پرتەوبۆڵە کرد، دکتۆریش بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

- لەوانەیە ویستبێتی هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکەکەتدا

بکات، تۆش بە ڕەتکردنەوەی، وەك ئەوەی سعوود دەڵێ ئاوا "موعەککەدت" کردووە.

ڕەنگوڕووی قاسم هەڵبزڕکاو شەڕانگێزی لە چاوەکانیدا دەباری، بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە و گوتی:

- قسەکردن سنووری خۆی هەیە، ڕێگە نادەم بیبەزێنیت.

دکتۆر ویستی هێوری بکاتەوە و گوتی:

- چییە دەڵێی تۆش "موعەککەد" بوویت، هیچ مەبەستێکم نەبوو، تەنها بۆ خۆشی بوو، ئەوە تۆ چیتە؟!

قاسم هەموو قسەکانی بە تووڕەیی کزد و گوتی:

- ئەمە پەیوەندیی بە پیاوەتی و شەڕەفمەوە هەیە.

- باشە باشە، کەواتە بابەتەکە دابخە و وازی لێ بێنە.

بەڵام قاسم بە شێوازێکی واوە کەوتە قسەکردن وەك ئەوەی زۆر شانازی بە خۆیەوە بکات، کاتێك گوتی:

- من ئامادەم بمرم، بەڵام دەستبەرداری پیاوەتیم نابم.

سعوودیش وەکوو سووکایەتییەك و بە توندی پێی گوت:

- باسی چ پیاوەتییەك دەکەیت هەی گەمژە.

زۆربەی ئەندامانی دەستەکە دەیانزانی کە ئەم قاسمە نەفرەتییە خوێنی لە لایەن یەکێك لە خێڵەکانەوە حەڵاڵ کراوە، بەڵام ئەوان زۆر بایەخیان بەوە نەدەدا، چونکە ئەوە تایبەت بوو بە خۆیەوە، هەروەها خەڵکە خێڵەکییەکەش دەیانزانی چۆن ئەم جۆرە کێشانە لە نێوان خۆیاندا چارەسەر دەکەن، جارێکیان لە ئاخاوتنێکیدا هەوڵی ئەوەیدا پاساو بۆ ئەو کردارە چەپەڵەی

خۆی بهێنێتەوە، کە خێڵێك خۆیان بۆ کوشتنی مەلاس دابوو، چونکە ئەم ئەو کەسەشی کوشتبوو کە داڵدەی خوشکەکەی و هاوسەرەکەی دابوو. بە جۆرێك قسەی دەکرد، مرۆڤ هێڵنجی دەهاتێ لەوەی کە دەیگوت. ئەو دابڕان و گۆشەگیرییەی بەسەر ئەم ناوچانەدا سەپێندراوە ئەو دابونەریتە بەسەرچووانەی بەهێزتر کردووە و هەتا دەیگۆڕن پێویستییان بە یاساگەلێکی زۆر ئەستەم هەیە، تاکوو مرۆڤ بیانشکێنێت، یان هەتا سنوورێکیشیان بۆ دابنێت، لێرە ئافرەت ئەوەندە ملکەچ و وابەستەی پیاوە تا ئاستی کۆیلەبوون، چارەنووسی لە لایەن باوك و برا و مێرد و پیاوانی خێڵەوە بڕیاری لەسەر دەدرێت، ئەوان بڕیار دەدەن هاوسەرگیری لەگەڵ کێ بکات و ژیانیشی چۆن بەڕێوە بچێت؟ ڕێك هاوشێوەی گوندە عەرەبییەکان کە هیچ شتێك بەرهەم ناهێنن، جگە لە دواکەوتوویی نەبێت، وەك ئەوەی پەتایەك بێت و بە هەوادا پەرتوبڵاو بوویێتەوە. کردارێکە وەکوو گرێبەستێکی بازرگانی وایە و کاڵاکەشی کچ و ژنی ئەم کۆمەڵگەیەن و پێویستە لەسەریان ملکەچی خاڵە واژۆکراوەکانی ئەو گرێبەستە بن. ئەم قاسمەی لەمەڕ خۆمان خوشکێکی هەبوو هێشتا حەڤدە بەهاری تەمەنی تەواو نەکردبوو، بەهاری چی تۆ بڵێی زستانێکی پڕ لە باران و بەفر و کرێوەی نەهامەتی و دەردەسەری تەواو نەکردبوو، ئاخر کوانێ کچانی گوندنشین بەهاری تەمەنی خۆیان دەبینن، ئەو بەدبەختە هاوشێوەی هەموو کچە چارەنووس ڕەشەکانی دیکە ناسکۆڵە و چاو جوان، بەژن و باڵایەکی زراف و ڕێك، ڕێکییەکی وا مرۆڤ سەری لەو لەشولارەیان سوور دەمێنێت، هەڵبەتە ئەوەش لە ئەنجامی ئەو توانا لەڕادەبەدەرەی لە کاری هەمەجۆری ناوماڵ و کاری کشتوکاڵیدا ئەنجامی دەدەن،

نه جەستە لەڕولاواز و نە پشت و شانی کۆم و چەماوەش، لەشولاریکی وا ڕێك و جوان هەر شایەنی پێشبڕکێی شاجوانەکانی جیهانن لە ڕێکی و پێوانەی بەژن و ناوقەد و جوانیدا، کە ئەستەمە لە وێنەیاندا هەبێت. ڕێك لە وێنەیەك دەچن، بەهرەمەندترین وێنەکێشی جیهان وێنەی کێشابن، لە ڕاستیدا پیاوەکانیش بەشی خۆیان لەو بەژن و بالآبەرزی و ڕێکییە بەرکەوتبوو، ئەوەشیان هەر لە سۆنگەی زۆری جووڵە و سەرکەوتن بە قەدپاڵی شاخ و چیایەکاندا بەدەست هێنابوو، لێرە مەحاڵە مرۆڤ بتوانێت بە سستی دابنشێت و دەست بە خۆیدا شۆڕ بکاتەوە، چونکە سرووشتی ژیانیان جووڵە و ڕۆیشتنی بەردەوام و بێ ڕاوەستانە. ئەوەتانێ خوشکەکەی قاسمیش بە تیری عەشقی یەکێك لە کوڕی ئەو ماڵانە دەپێکرێت کە لە کۆتایی وەرزی بەهار و سەرەتای هاوین، ناوەناوە ڕوو دەکەنە قەدپاڵ و لوتکەی شاخەکان و ڕەشماڵی خۆیان هەڵدەدەن و دەکەونە کۆکردنەوەی بەری دار و درەخت و بە دوای شانە پڕ لە هەنگوینەکانی هەنگەلانەکاندا دەگەڕێن و هەندێکیشیان لەناو ئەو مێرگ و مێرغوزارانەدا ئاژەڵەکانیشیان دەلەوەڕێنن. دواتریش مووی بزنەکانیان و خوری مەڕەکانیان دەڕێسن و گوریس و کەژی و کونی دڕاوی ڕەشماڵەکانیان پێ نوێ دەکەنەوە و ڕایەخی جوان و دڵڕفێنیشیان لێ دروست دەکەن. ئەو خێزانانە جاری وا هەیە بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ و شەو هیچ کەسێك نابینن و لەو دەشتودەرە بە تاقی تەنها خەریکی کار و کاسبین، هەتا ڕێبوارێکیش بە دی ناکەن، چەند ساتێکی خۆشی لەگەڵدا بەسەر بەرن. وەلێ وا پێ دەچێ ئەم جارەیان خێزانێکی دیکەش لە نزیك خێزانەکەی دیکە ڕەشماڵی خۆی هەڵدابێت و

بارگەوبنەی دانابێت، کە لە گوندە دوورەکانەوە بۆ هەمان مەبەست هاتوون، هێندە نابات هەردوو خێزانەکە دۆستایەتی و هاموشۆ لە نێوانیاندا دروست دەبێت، ئەو خێزانە دوو پیاوی خاوەن ژن و ماڵ و کۆلێک منداڵی کوڕ و کچی سەرکەوبنکەیان دەبێت، لەگەڵ ژن و پیاوێکی پیر کە دایک و باوکیان دەبن، وێڕای گەنجێک بە ناوی عوسمان، کە دەوروبەری بیست ساڵانێک دەبێت و هێشتا سەڵتە و هاوسەرگیری نەکردووە، عوسمان دوو خوشکی هەبوو، هەردووکیان بە ژن بە ژنی بۆ هەردوو براکەی شوویان کردبوو. ماڵباتەکەی قاسمیش لە دایك و باوك و خوشکەکەی و خۆی پێك هاتبوون، ئەندامانی دیکەی خێزانەکەی کە چوار برای بوون، هی وایان هەبوو لە گوندەکە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانیدا مابوونەوە و یەکێکی دیکەشیان لە ڕیزی سوپادا بوو، ماوەیەك بوو هیچ هەواڵێکیان نەدەزانی. تەنها هەفتەیەك لە دیدار و یەکترناسینی هەردوو خێزانەکە تێپەڕی بوو، گڕکانی عەشقی نێوان خوشکەکەی قاسم کە ناوی جوان بوو لەگەڵ عوسمان دەتەقێتەوە، ئەم عەشقە هەر لە سەرەتاوە دیار بوو کە پڕ لە کەند و کۆسپ و دڕکەزی دەبێت، چونکە خێزانی کوڕەکە باری داراییان زۆر باش نەبوو، بەمەش توانای پێشکەشکردنی هیچ برە پارەیەکیان نابێت وەکوو مارەیی پێشکەشی باوکی کچەی بکەن. جوان بە لای قاسمەوە تاکە سەروەت و سامانی بوو کە دڵی پێ خۆش بێت، چونکە هەر ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە قاسم ئارەزووی کچی هەر خێزانێك بکات بیدەنێ، بۆیە دەبێت پارێزگاری لەم سامانە گەورەیە بکات و ڕێگری لەوە بکات کە بیدزن و یان ڕووداوێك ڕوو بدات و لە دەستی بچێت. لە

بێئاگایی هەردوو ماڵباتەکە، عاشقەکان جوان و عوسمان هەر کە شەو ڕادەشکێ و کەسوکاری هەردووکیان دوای کارێکی قورسی ڕۆژانە لە شیرین خەودا دەبن، ئەوان هەردووکیان دزە دەکەنە دەرەوەی ڕەشماڵەکانیان و لە دووری سەد هەنگاوێك و لە پەنای بەردێکدا دەکەونە ڕامووسانی ڕۆحی یەکتری، سەرەتا عوسمان دەست لەناو دەستەکانی جوان دەنێت و لە ئامێزی دەگرێت و بە گرێکی هەڵایساوەوە ماچی دەکات و بە گوێیدا دەدات:

- دەمەوێ هاوسەرگیریت لەگەڵدا بکەم، ئەمڕۆ بەر لە سبەینێ، بەڵام زۆر دەترسم.

- لە چی دەترسیت؟

- کەسوکارت ڕازی نابن.

- بۆچی ڕازی نابن؟! من وای دەبینم کە خێزانەکەمان، خێزانەکەی ئێوەیان زۆر بە دڵە و خۆشیان دەوێن و هەموویان پێکەوە ڕێك و تەبان.

عوسمان لە کاتێکدا خەریك بوو فرمێسك لە چاوەکانیدا بێنەخوارێ گوتی:

- هەر سەبارەت بە خۆمان بە براکەم گوت دەمەوێ هاوسەرگیریت لەگەڵدا بکەم، ئەویش بە باوکمی گوت، نازانی باوکم بەم هەواڵە چەند دڵخۆش بوو، تا ئەو ئاستەی یەکسەر باوەشی پێدا کردم و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی، بەڵام... بەڵام... لە ڕاستیدا، فرمێسکێکی قەتیسماوم لە چاوی باوکمدا بینی و گوتی: "چەند ئاواتی ئەوە دەخوازم هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کچەدا بکەیت، چونکە کچێکی ڕەسەن و لە بنەماڵەیەکی

ڕەسەنیشن، بەڵام توانای پێدانی مارەییەکەیم نییە... من لە ئێستادا هیچم بە دەستەوە نییە. خۆت دەزانی خوشکەکانت لەجیاتیی ژنی براکانت شوویان کردووە... پێم بڵێ چی بکەم". منیش پێم گوت: "هەوڵ بدە باوکی قایل بکەیت"، باوکم گوتی: "بەبێ دابینکردنی مارەییەکەی هیچ شتێکمان دەست ناکەوێت، تەنها سەرشۆڕی نەبێت".

دەی تۆ پێم بڵێ چی بکەم؟ ئاخر ئەگەر من تۆ نەهێنم شێت دەبم، یان لەوانەیە خۆم بکوژم.

جوان لە کاتێکدا موچڕکە بە هەموو جەستەیدا دەهات، گوتی:

- خوانەکا چاوەکەم، توخوا قسەی وا مەکە، بەڵام خۆ هەر دەبێ شتێك بکەیت بەرلەوەی وەرز کۆتایی بێت و هەردوولامان لە یەکتری دابڕێین. ئێمە ئەگەر بگەڕێینەوە گوندەکەمان، دڵنیابە دەمدەنە پیاوێك هەر ناشیناسم، قاسمی برام ئاماژەی بە شتێکی وا کردووە، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە خوشکێکی هەیە و لەوانەیە ببێتە بەشی براکەم، تکایە باوکت قایل بکە با داوای من لە باوکم بۆ تۆ بکات.

- باوکت چۆن قایل بکات. پێی بڵێت لە ڕایی خوا و بێ مارەیی کچەکەتم پێشکەش بکە، ئەو کاتە باوکیشت تووڕە دەبێت و سووکایەتی بە باوکمەوە دەکات، ئاخر هیچ کەسێك بەر لە ئێستا کاری وای نەکردووە، ئەو کاتە باوکت هەست بە سووکایەتی دەکات، بە پرسیار لەخۆکردنەوە دەڵێت: "ئایا کچەکەم ئەوەندە هەرزانە، یان نەنگی و کێماسییەکی هەیە؟!" ئەمە کارێکی زۆر قورسە... گەلێ زۆر.

- کەواتە دەستبەردارم دەبی و وازم لێ دەهێنیت؟!

- نەخێر... نا قسەی وا مەکە، ئەگەر تۆ نەهێنم دڵنیابە خۆم دەکوژم.

- کەواتە ئەی چی بکەین؟!

- باوکم ڕازی دەکەم... تکای لێ دەکەم... هەوڵ بدات باوکت ڕازی بکات، جگە لە من نەتداتە کەسی تر... بەڵام ئەدی ئەگەر باوکم لە قایلکردنی باوکت سەرکەتوو نەبوو، ئەو کاتە هیچ چارەیەك لە بەردەمماندا نامێنێت جگە لە... جگە...

- جگە لە چی؟!

- تۆ ئامادەی هەر چارەسەرێکی دیکەی؟

- وەکوو چی؟

- هاوسەرگیری بکەین و هیچ گوێیان پێ نەدەین.

به دوو لێوی لەرزۆك و بە منگەمنگەوە:

- ئاخر وازمان لێ ناهێنن... هەموویان دژایەتیمان دەکەن.

- من گوێ بە هەموو دونیا نادەم، تەنها تۆم دەوێ. ئایا تۆ لەگەڵمدا ڕادەکەی بۆ هەر شوێنێك کە تێیدا ئاسوودە بین و کەس دەستمان لێ نەدات؟

لە کاتێکدا وەکوو گەڵای بی دەلەرزی گوتی:

- ئەگەر هەموو دەرگاکان لە بەردەممان داخران ئامادەم، بەڵام یەکەمجار باوکت قایل بکە با هەوڵی خۆی بدات.

بەڵام کێ دابونەریتی سەدان ساڵە پشتگوێ دەخات؟ ئەو دڵنیابوو لەوەی هەوڵەکانی ئەم عاشقە شێتە بە هەدەر دەچێت و شکست دەخوات، بۆیە بڕیاریان دا پێکەوە ڕابکەن. شانازیکردنی کچەکە بە خۆیەوە، وای لێ کرد سوور و ڕژد بێت و گیانی

یاخیبوونیشی تێدا بێت. ئەو کچێکە نایەوێت کەسوکاری وەکوو کاڵایەکی هەرزانبەها و لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیاندا مامەڵەی پێوە بکەن. ئەو بڕیارەی ئەم دوو عاشقە وەریانگرت، فتیلی تووڕەیی لە نێوان هەردوو خێزانەکە ئاگر دا. بەڵکوو لە نێوان هەردوو خێڵەکەش کە هەر یەکە و سەر بە خێڵێك بوون. بەهەرحاڵ، ماڵباتی کچەکە بە هەڕەشەوە ئەوێیان بەجێ هێشت و بە بارێکی گرانی شەرمەزاری و ئازارەوە گەڕانەوە، ماڵباتی کوڕە عاشقەکەش لە ترسی تۆڵەسەندنەوە کۆچیان کرد، بە تایبەتی کە خێزانی کچەکە زۆر لە گوندەکەی ئەوانەوە دوور نەبوون و داوای تۆڵەسەندنەوەیان لێ دەکردن وەکوو سزایەك بۆ ئەو کارە دزێوەی —بە بۆچوونی ئەوان- کوڕەکەیان ئەنجامی داوە. هەردوو عاشقە سەرگەرمەکە ڕوویان لە گوندێکی دوورەدەست کرد، کە هاوڕێیەکی کوڕەکەی لێ بوو، ئەویش پێشوازییەکی گەرمی لێ کردن و هەموو پێداویستییەکانی هاوسەرگیری پێشکەش کردن، هاوسەرگیرییەکی بێدەنگانە، نە دەنگی دەهۆڵ و نە دەنگی زوڕنا و نە هەلهەلە و نە هەڵپەڕکێ و نە ژنان و پیاوان و کوڕوکاڵان و نە ڕاکەڕاك و قیژە و هاواری هەرزەکاران و مێردمنداڵان. ئەوانیش —کچە و کوڕە- گوێیان بە هیچ یەکێك لەو پێداویستییانە نەدا کە ئاهەنگی هاوسەرگیری بەبێ ئەنجامدانی ئەوانە تەواو نابێت، بەڵکوو تەنها بە مانەوە و لەئامێزگرتنی یەکتری، لەوپەڕی دڵخۆشی و بەختەوەریدا بوون، لە ڕاستیدا هاوڕێکەی عوسمان بەوە ڕازی نەبوو کە ئەنجامیان دابوو، بەڵکوو پێی وابوو ئەوەی کردوویانە گەمژەییەکی گەورەیە و باجەکەیشی گران دەبێت، بەڵام ویڕای هەموو ئەوانە بڕیاری دا بەوپەڕی توانایەوە یارمەتییان بدات، لەبەر ئەوەی ئەو خۆی بە قەرزباری عوسمان دەزانی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان چاکەیەکی لەگەڵدا کردووە و ئێستاش کاتی وەڵامدانەوەی چاکەکەیەتی، ئەگەر هیچ کەسێك لە خەڵکی

گوندەکە سەرنجی ئەوە نەدەن و دەست بە ناڕەزایی دەربڕین نەکەن دژی ئەو کارەی کردوویانە و لەناو خۆیاندا داڵدەیان بدەن و بیانپارێزن، لە ترسی ئەوەی ئەنجامی ئەو مێواندارییە باش نابێت و قسەوقسەڵۆك و هەراوهوریای زۆر بە دوای خۆیدا دەهێنێت و ئەوانیش لەوانەیان کەم نییە.

قاسم لە شەرمەزاریدا گڕی لێ هەڵدەستا و زیاتر لەوەش ئەو خوشکەی لەدەست دابوو کە لەجیاتیی سەروەت و سامانەکەی بوو، دەبووە مایەی گۆڕینەوەی بە هاوسەرێك، ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ خوشکەکەیدا کرد و هەڵیگرت، وەك ئەوە وایە سەروەت و سامانەکەی دزی بێت، ئێستا لەسەر قاسم پێویستە موڵك و ماڵێکی زۆر کۆ بکاتەوە، تا بتوانێت مارەیی و خەرجی هاوسەرگیری دابین بکات، بۆیە نابێ ڕێگە بدات دزەکە بە ئارامی بژێت و ئاسوودە بێت، پاش ماوەیەك کە نزیکەی مانگێك دەبوو، ئاڕاستە و شوێنی خوشکەکەی زانی، ئیدی خێڵەکەی چەکیان بۆ دابین کرد و ئەویش یەکسەر کەوتە ڕێ، ئەو گوندەی ئەوانی لێ بوون، لە دووری نزیکەی دە ڕۆژ و شەو پیادەڕێ بوو، کاتێکیش گەیشتە گوندەکە، کە تەنها نزیکەی پانزە ماڵێك دەبوون، خۆی مەڵاس دا تاکوو هەواڵیان بزانێت. لە سەرەتای ئێوارەدا خوشکەکەی و پیاوەکەی لە ماڵی هاوڕێکەیان چایان دەخواردەوە. لە چەند چرکەساتێکی کەمدا دەنگی سەگوەڕ بە هاتنی کەسە نامۆکە دەستی پێ کرد و لە چاوترووکانێکدا پەلاماری خانەخوێ و هەردوو مێوانەکەی دا و دەستڕێژی گوللە وەکوو باران دابارییە سەریان و بەوپەڕی شەڕانگێزی و دڕندەییەوە دەستی لێیان نەپاراست. پاشان قاسم چۆن بە نهێنی خۆی گەیاندبووە ئەوێ، هەر بەو شێوەیەش ڕای کرد و بە خێرایی لەو ناوە ون بوو.

## بەشی بیست و شەشەم

لە بەیانیی ڕۆژی دواتر، دەستەکەی ڕۆست لێرە و لەوێ و لە نێوان تاشەبەرد و کەندولەندەکاندا دابەش بووبوون، وەکوو خۆپارێزییەك لەو کۆپتەرانەی بە ئاسمانی ناوچەکەوە دەفڕین، ڕەحمان تا ئاستێکی باش لە هاوڕێیانی دیکە دوور کەوتبووەوە و لەناو کۆمەڵە بەردەکاندا دانیشتبوو و ڕۆمانێکی دەخوێندەوە، چەندین جاری تر خوێندبوویەوە، بەڵام بە هۆی نەبوونی کتێبەوە، ناچار بوو جارێکی تر بیخوێنێتەوە، کاتێك هەستی بە بێزاری کرد، پاڵ کەوت و تفەنگەکەی لەسەر سکی دانا، کتێبەکەی لە ناوەڕاستەوە کردەوە و چاوی خۆی پێ داپۆشی و هێندەی نەبرد هەستی بە گرانی چاوەکانی کرد و خەریك بوو خەو بیباتەوە، بەڵام بەرلەوەی بچێتە ناو بێئاگاییەکی سووکەوە، لە پڕ بە نیمچە تۆقیوی هەستا و چەکەکەی خستە ناو دەستی، قاسم و عەوڵای بینی لە شوێنی خۆمەڵاسدانەکەی نزیك دەکەونەوە، کە زیاتر لێی نزیك کەوتنەوە، سڵاوێکیان لێ کرد و چەند مەترێك لە دووریی ئەو دانیشتن.

قاسم ڕووی لە ڕەحمان کرد و بێ ئەوەی سەرنجی ڕوخساری بدات گوتی:

- ئێستا چاوت چۆنە؟ پێ دەچێ ساغ بێت، ئەی وا نییە؟

- وەکوو جاران نییە، ئەی بۆچی وا دوور دانیشتوون، دەی نزیك بکەونەوە.

هەر وەکوو پشیلە بەوپەڕی سووکەڵەییەوە چەند هەنگاوێك لێی نزیك کەوتنەوە، قاسم دیسان گوتی:

- ئازارت دەدا؟

- دەمێکە ژانەکەی نەماوە.

- هممممم.

قاسم هەمهەمێکی کرد و کەمێك لە ڕاوەستانەکەی خۆی خوار کردەوە. عەولا کە لەو کاتەدا سەرنجێکی بەردەوامی دابووە ڕەحمان گوتی:

- تۆ بەختت هەیە، باش نییە گلێنەی چاوت نەتەقیوە و ئاوەکەی نەڕژاوە. بەڵکوو وا دەردەکەوێت ساغ و سەلامەتە.

ڕەحمان بە حەسرەتەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- کێشەکە لەوەیە هەر ئەوەتە و دەتوانم پێی ببینم. تەمێکی چڕ و خاڵی ڕەشی کەوتۆتە سەر و شوێنەکەی پڕ کردووە و داپۆشیوە.

گوێی لە قاسم بوو دیسان هەمهەمی بوو:

- همممممممم

چرکەساتێکی بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان، لەو کاتەدا قاسم سەرنجێکی تیژتێپەڕی لە ڕوخساری عەولا دا، کە کۆمەڵە واتایەکی لە خۆ دەگرت، لەو کاتەدا سەری نزم کردبوو و بە لقە دارێکی وشك گەمەی بە خۆڵەکەی بەردەمی دەکرد و دەیویست شتێك بڵێ. دوا جار گوتی:

- خۆ من هیچم لێ نەکردووی، ئەی بۆچی بەو ڕادەیە ڕقت لێم دەبێتەوە؟!

بەرلەوەی ڕەحمان وشەیەك بڵێ، عەولاش هەڵی دایە و ئەمەی بۆ زیاد کرد:

- ئێ خۆ منیش هەر ئەوەتە دەتناسم و تا ئێستا ڕۆژێك قسەشم لەگەڵ نەکردوویت، کەچی لەگەڵ ئەوەدا هەست دەکەم ڕقت لە منیشە و دەتەوێ پارچەپارچەم بکەیت.

ڕەحمان نیشانەی سەرسوڕمان بە ڕوخساریەوە دیار بوو و گوتی:

- کێ؟! من ڕقم لێتانە؟! ئەم قسە سەیروسەمەرانە چییە گوێبیستی دەبم، هەتا قسەشمان لەگەڵ یەکتری نەکردووە، ئیدی چۆن ڕقم لێتانە و لەبەر چی؟!

عەولا دیسانەوە گوتی:

- کاتێك سەیرمان دەکەیت شەڕ لە چاوەکانت دەبارێت.

قاسمیش ئەمەی بۆ زیاد کرد:

- خەتای ئێمە نییە، شێوەی ڕوخسارت وامان پێ دەڵێت.

ڕەحمان پێکەنینێکی ساردی دروست کرد و لەسەرخۆ گوتی:

- ئەوە بە ڕاستتانە، ڕوخسارم ئەم هەموو ڕق و کینە دەردەبڕێت؟! سەیرە، لەگەڵ ئەوەی لە ژیانمدا ڕقم لە کەس نەبۆتەوە، کەچی ئێوە وا دەڵێن؟!

قاسم گوتی:

- مەبەستت ئەوەیە هیچ ڕق و کینێکت لێمان نییە؟!

- دەزانی ئێوە سەیرن! ئاخر بۆچی ڕقم لێتان ببێتەوە؟! ئێوە لەو گومانەتاندا هەڵەن، بە پێچەوانەوە، من زۆریش ڕێزتان لێ

دەگرم، ڕاستە من هاوڕێیەتیی کەم کەس دەکەم و ڕۆژێك لە ڕۆژانیش نە گوێ بە ئێوە دەدەم و نە بە کەسی دیکەش، بەڵام بەو جۆرەش نیم کە ئێوە لێم حاڵی بوون.

قاسم منگەمنگێکی لێوە هات، لەو کاتەی هێشتا ڕەحمان لە قسەکردن بەردەوام بوو:

- واتە موعەککەد... یانی موڕومۆچ نیم!

لێرەدا ڕەحمان قاقایەکی لە ناخەوە کرد، ئەوەش بە هۆی گوتنی ئەو وشەیەی کە لە بنەڕەتدا بۆ شۆخیکردن لەگەڵ کەسێك دەگوترێت، بە هۆیەوە ئەوانیش پێکەنین:

- ئەو وشەیەت لە کوێوە هێنا؟

- دکتۆرەکە ئەوەی گوت.

- ئای چ شەڕانی و دووڕوویەکە. هەر ئەویشە ئەو درۆیانەم بە دەمەوە دەکات و تووشی ئەم بەزمەی کردووم، هەر بۆ خۆشی ئەمەیشی بۆ زیاد کرد:

- باوەڕ بەو دووڕووە مەکەن، هەمووان دەزانن من ڕێزتان لێ دەگرم، لەبەر ئەوەی دوو پیاوی ئازا و بەجەرگن و هەرگیز ڕێگە بە هەڵە و کاری چەوت نادەن، کاتێك زانیم ئێوە ئەو کارانەتان کردووە، زیاتر سەرسام بووم پێتان، پیاوی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ڕێگە نەدات ناوبانگی بزڕێت، ئەگەر لە لایەن هەر کەسێکیشەوە بێت، منیش ئەگەر لە جێگەی ئێوە بوومایە هەر هەمان شتم دەکرد، ئێوە لەو جۆرە کەسانەن کە ڕێزیان لێ دەگرم، ئەو جۆرەی هەمیشە بە سەربەرزی بە ڕێگەدا دەڕوات و هەرگیز ئامادە نییە سەری شۆڕ بێت، نەك وەك ئەو جۆرە ملشۆڕ و زەلیل و خوێڕییە، مەبەستم شوانە ناوبانگ زڕاوەکەیە، کە هەموو جار مێوانداریی ئەبوجگارەی دەکرد لە ماڵەکەی.

عەولا بە هەناسەدانێکەوە گوتی:

- ئەگەر پارێزگاریکردنی ئەبوجگارە نەبووایە بۆی، ئەوا خەڵکی گوندەکە لەگەڵ ژنە بەدڕەوشتەکەی لەتوپەتیان دەکردن... هەر کە مام کاکیل ئەبوجگارەی لە ناوچەکە دەرکرد، یەکسەر شوانەکە و ژنەکەیشی گوندەکەیان بەجێ هێشت و دوور کەوتنەوە، تاکوو لە پەنای ئەو پیاوە دەستڕۆیشتووەدا بژیێن، هەڵبەتە نرخەکەیشی لای هەمووان دیار و ئاشکرایە.

ڕەحمان بە قێزلێبوونەوە گوتی:

- ئای چ سووکایەتییەکە، خەریکە بە گێڕانەوەی سەربوردەی ئەوانە دڵم دەگوشرێت و لە ڕق و قینی ئەوانەدا خەریکە دەخنکێم. ئاخر چۆن مرۆڤ تا ئەو ئاستە دادەبەزێتە خوارەوە و خۆی ڕیسوا و سەرشۆڕ دەکات... من ئەگەر چارەنووس وا بخوازێت ڕقم لە کەسێك ببێتەوە، ئەوا ڕقم لە کەس نابێتەوە جگە لەم جۆرە مرۆڤە سەرشۆڕانە، کە سووکایەتی قەبووڵ دەکەن و تۆڵەی خۆیان ناکەنەوە، ئێستا زانیتان ڕۆژێك لە ڕۆژان من ڕقم لە ئێوە نەبووە؟ بە پێچەوانەوە بە ئێوەوە هەست بە شانازی دەکەم، ئێوە بە ڕاستی دوو پیاون... پیاو.

لە بەردەم ئەم ستایش و پێداهەڵدانە هەردووکیان زۆر لە خۆیان بایی بوون و شێوەی دانیشتنەکەشیان گۆڕی، بەڵکوو هەتا سەرنجیان بەرانبەر ڕەحمانیش گۆڕا، لەگەڵیدا هەستیان بە ئارامی و ئاسوودەییەکی زۆر کرد.

قاسم دڵی خۆی بۆ کردەوە و گوتی:

- لە ڕاستیدا من لە چالاکییەکەی سەر ڕەبایەکەی ئەو

جارەوە هەست بە ڕقلێبوونەوەی تۆ دەکەم، لەبەر ئەوەی دەستی یارمەتیم بۆ خۆت و بۆ سعوودی هاوڕێشت درێژ نەکرد، چونکە ئەو کاتە زۆر شەکەت و ماندوو بووم، ڕاستە من وەکوو ئێوە زامدار نەبووبووم، بەڵام بە زۆر خۆم لەسەر قاچەکانم ڕادەگرت.

ڕەحمان بە لایەنگیریکردنەوە گوتی:

- مافی خۆتە قاسم... هەموو کەسێك توانای ئارامگرتن و بەرگەگرتنی دۆخی وا توانـاپڕووکێنی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێ مرۆڤ ڕقی لە کەسێك ببێتەوە تەنها لەبەر ئەوەی یارمەتیی نەداوە، کێ لەو دۆخ و هەلومەرجانەدا توانای پێوانەکردنی بەرگەگرتنی مرۆڤەکانی هەیە؟ من خۆشم وەها شەکەت بووبووم، نایەتە باسکردن، باش دەزانم شەکەتی یانی چی! بەڵکوو مرۆڤ لەو جۆرە دۆخانەدا لە پێستی خۆیشی دەردەچێت، ئەوە کارێکی سرووشتییە، هەر کە ئەو دۆخەش نەما، ئیدی هەموو شتێك دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی.

قاسم هەنگاوێکی دیکەش لە دانیشتنەکەی ڕەحمان چووە پێشەوە، عەوڵاش هەر وای کرد، ئینجا قاسم گوتی:

- بەڵام لێتی ناشارمەوە کە زۆربەی دەستەکە ڕقیان لێ هەڵگرتووم.

- باوەڕ ناکەم، تۆ لەو بۆچوونەتدا بە هەڵەدا چوویت، چونکە هیچ کەسێك ڕقی لە تۆ نییە.

- بەڵێ، من خۆم ئەوە دەزانم، وا هەست دەکەم، هەرچەندە تا ئێستا ڕۆژێك لە ڕۆژان کەس ئەوەی بە ڕوودا نەداومەتەوە. لەو کاتەوەی لە چیای هەندرێن ون بووین، کەسیان خۆشییان پێمدا نایەتەوە... دێتەوە یادتت لە پێناوی زەمزەمیەیەك ئاو...!

- ئەو بارودۆخە دژوارەم لە یادە، بەڵێ باشم لە یادە... بەڵام بە ڕاستی پێم بڵێ: هەر بە ڕاستی پاشەڵی خۆتت پێ شوشت یان خواردتەوە؟ من هەرگیز لۆمەت ناکەم، مرۆڤ لە هەلومەرجی وا کوشندەدا هەموو شتێك دەکات.

- حەق حەقە، بەڵێ بە کەمێکی پاشەڵم شوشت کە لەوانەیە چارەکێکی دەبوو، ئەوەی دیکەشم خواردەوە، ئاخر توانای بەرگەگرتنی ئەو تینوێتییە دژوارەم نەبوو.

عەوڵاش لایەنگیری کرد و چەند وشەیەکی لە قسەکانی ڕەحمان وەرگرت و گوتی:

- لە هەلومەرجی وادا کاری وا ئاساییە.

قاسم بۆی تەواو کرد و گوتی:

- بەڵام ڕقەکەیان لێم بە هۆی ئەو ئاوەوە نییە کە لە چیای هەندرێن ئێوەم لێی بێبەش کرد، بەڵکوو بە هۆی کوشتنی خوشکەکەم و هاوسەرەکەیەوەیە، وەکوو تۆڵەی شەرەف و ئابڕوو و ناوبانگم.

ڕەحمان بەسەرڕاوەشاندنەوە گوتی:

- وازیان لێ بێنە، ئەوانە زۆر لە پرسی شەرەف و ئابڕوو تێناگەن.

عەولا ڕاستەوخۆ گوتی:

- تۆ چی دەڵێی؟ بۆ تۆ لە پرسی شەرەف و پاراستنی ئابڕوو تێدەگەیت؟

ڕەحمان بە توندی هاواری کرد:

- هەی گەمژەی شێت چۆن بوێری ئەوە دەکەیت قسەی وام پێ بڵێی؟

عەولا بە دەنگێکی خاوەوە کە جۆرە ترسێکیشی تێدا بوو گوتی:

- وام زانی تۆش وەکوو ئەوانیت، ئاخر ئەو کاتەی لە ماڵمان مێوان بوون، بەرلەوەی هێرش بکەنە سەر ڕەبایەکە قسەکانت وا نەبوون، بەڵکوو تەواو پێچەوانەی ئەمە بوون.

- تۆ لە هیچ تێناگەیت... بێدەنگ بە... تۆ پێت وایە من هانی ئافرەت دەدەم لەسەر بێڕەوشتی و بەدکرداری، ئێوە چۆن لە شتەکان تێدەگەن؟!

قاسم ویستی هێوری بکاتەوە و گوتی:

- ئەو مەبەستی شتێك نییە نا، بەڵکوو ئەوی و هەموو خەڵکی گوندەکان سەریان سوڕماوە چۆن لە ناوتاندا ئافرەتی سەڵت دەژییت؟! چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن؟! لە کوێ و چۆن دەنوون، لە کاتێکدا ئێوە هەمووتان خۆتان لە ژوورێکی بچووك یان دوو ژوور دەپەستن، ئەمە کارێکە وا بە ئاسانی لێی تێناگەین!

- خەڵکی گوندەکە لەگەڵمان نەژیاون تاکوو لێی تێبگەن، ئەی تۆ هێشتا تێنەگەیشتوویت؟ تۆ لەگەڵماندا دەژییت و بە چاوی خۆشت ژیانمانت بینیوە.

قاسم بە منگەمنگەوە:

- لە ڕاستیدا من ئافرەتم لەگەڵتان نەبینیوە، هەموو هەر پیاون.

ڕەحمان بە سەر خوراندنەوە گوتی:

- مەبەستت بە شێوەیە یان ناوەڕۆك؟

قاسمیش سەری بادا و گوتی:

- به شێوه و به ناوەڕۆکیش.

- هەی زۆڵی حەرامزاده!

ڕەحمان به دەنگی بلندەوه وای پێ گوت و به قاقای پێکەنینەوه گوتی:

- کەواته به شێوه و ناوەڕۆکەوه... ها وایه؟ هەی نەفرەتت لێ بێت، لەوانەیه ئەوانیش وابن، ئەگەر به کچانی جوانی گوندەکان بەراوردیان بکەین... بەڵام ئەگەر جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگی کوردییان بکەینه بەر و بۆنی خۆشیش له خۆیان بدەن، دۆخەکه دەگۆڕێت.

قاسم گوتی:

- نەخێر ناگۆڕێت.

دیسانەوه ڕەحمان دایەوه قاقای پێکەنین و گوتی:

- به دڵنیاییەوه ئەگەر یەکێکیان گوێیان لێت بێت، سەرت له جەستەت جیا دەکەنەوه.

عەولا گوتی:

- چی...؟! ئافرەت چۆن دەتوانێت سەر له جەسته جیا بکاتەوه؟!

- ئەوه به ڕاستته، توورەیان بکەیت، سەری تۆش له جەستەت دەکەنەوه. هاهاهاها... له ڕاستیدا ئێوه به قسەکانتان دڵخۆشتان کردم، سوپاستان دەکەم، ئاخر لەو کاتەی خەمۆکی خەریك بوو وێرانی دەکردم، ئێوه هاتن و بەم قسه خۆشانەتان خەمتان لێ ڕەواندمەوه، بۆیه منیش له پاداشتی ئەم پیاوەتییەتان

دیارییەکی واتان پێ دەبەخشم، هەرگیز بیریشتان لێی نەکردبێتەوە!

هەردووکیان پێکەوە:

- چ دیارییەکە؟!

- هەنگەڵانێکتان پیشان دەدەم، پڕاوپڕ لە هەنگوین، دڵنیام زیاتر لە دوو تەنەکەی گەورە پڕ دەکەن، ئەگەر زیاتریش نەبێت، ئەوە لە ئێستاوە هی ئێوەیە.

قاسم بە سەرسامییەوە گوتی:

- ئەوە بە ڕاستیتە یان شۆخیمان لەگەڵ دەکەیت؟!

- شۆخی ناکەم، بەڵام بە مەرجێك.

- مەرجەکەت چییە؟

- چارەگێکی هەنگەڵانەکە لە شوێنی خۆی بەجێ بهێڵن، ئەوەیان بەشی منە، هەروەها ئەمە بە نهێنی لە نێوانماندا بمێنێتەوە.

- بۆچی بیشارینەوە؟

- بۆ ئەوەی ئەندامانی دەستەکە شێت نەبن و لەسەر لەدەستدانی هەنگەڵانەکە گلەییم لێ نەکەن، لەبەر ئەوەی زۆر پێویستییان پێیەتی، شتێکی شیاویش نییە ئەو هەنگەڵانەتان پێشکەش بکەم تاکوو بیفرۆشن و دەستەکەی لێ بێبەش بکەم.

- باشە، بەڵام لە کوێیە؟

- لە شوێنێکی پارێزراودایە و کەس نایگاتێ، لە لێواری خەرەندێکی بەرزدایە.

عەولا کە ڕوخساری پرسیاری پێوە دیار بوو گوتی:

- دەتوانین بیگەینێ، یان زەحمەتە؟

- زۆر ئاسانە، من ناوەناوە دەچم بەشی خۆمی لێ دێنم، تەنها پێویستتان بە دۆلکەیەك یان تەنەکەیەك هەیە بۆ ئەوەی پڕی هەنگوین بکەن.

- ئەی سەبارەت بە گوریس؟

- پێویستتان بە گوریس نییە، پشتوێنەکانتان بەسە.

قاسم بە پەلەپەلێکەوە:

- کەی پێمانی پیشان دەدەیت؟

- ئەو کاتەی تەنەکە، یان دۆلکەیەك ئامادە دەکەن، بەڵام وریا بن کەس نەتانبینێت، لەبەر ئەوەی دەستەکە هەنگوینەکە بۆ خۆیان دەبەن.

قاسم بە سەرسامییەوە گوتی:

- ئەی بۆچی بە دەستەکەت نەبەخشی ئەو کاتەی دۆزیتەوە؟

ڕەحمان هەناسەیەکی دایەوە و گوتی:

- بە تەما بووم بە دەستەکەی پیشان بدەم، بەڵام دوای ئەوەی بەشێکی باشی لێ دەبەم.

عەولا هەردوو دەستی بەناویەکتردا دەدا و دەخشاند، گوتی:

- سبەی نا دووەی لێرە یەکتر دەبینینەوە.

- لێرە لە چاوەڕوانیتاندا دەبم.

قاسم بە زمانی کوردی لەگەڵ عەولا کەوتنە قسەکردن، وەك ئەوەی هەنگەڵانەکە لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن،

هەروەها چەند قسەیەکی دیکەش کە ڕەحمان لێی تێنەگەیشت و کەمێکیش بیری ڕۆیشتبوو، بە ئاگا نەهاتەوە هەتا هەردووکیان بەرەو گوندەکەیان خوداحافیزییان لێ کرد.

"تۆ بڵێی لۆژیکی ئاکار و ڕەوشت، ئەو دوو خلەفاو و دواکەوتووە لە ڕەگەزی مرۆڤ ئەژمار بکات، یان لە ڕەگەزێکی دیکە، کە نە مرۆییانە بێت و نە ئاژەڵیش؟! ئەم دوو چڕنووك و کەڵبە بە خوێنە لە چ خانەیەکی دابونەریت و ئایندا جێگە دەگرن؟! ئەمانە چ جیاوازییەکیان لەگەڵ جەللادە تێنوو بە خوێنەکانی حکوومەتدا هەیە؟!".

ڕەحمان سەرنجی لە ئاسۆ گرتبوو، هزر و مێشکیشی باڵی پرسیاریان بە ئاسمانی خەیاڵدا لێك دەدا: "با گریمانەی ئەوە بکەین بەها مرۆڤایەتییەکان لەسەر ڕەگەزی مرۆڤ ئەژماریان دەکات، لەبەر ئەوەی یاسای ڕەوشت، ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە لە ڕەگەزی ئاژەڵی دڕندە ئەژمار بکرێن، چونکە شێوەیان گەواهی ئەوە دەدەن کە ئادەمیزادن، واتە کەسانێکن بە شێوە مرۆڤن، وێڕای ئەوەی هیچ خەسڵەت و ڕەوشتێکی دیکەی مرۆڤانە هەڵناگرن، کەواتە هەر دەبێ یاسای مرۆیی و ڕەوشتی بینە یاسایەکی نامرۆڤانە و ناڕەوشتییانە، ئەگەر هەمووان لە یەك خانەدا دابنێین، لەبەر ئەوەی ئەو کاتە یەکسانییەك لە نێوان قوربانی و جەللاد و نێوان مرۆڤ و دڕندەدا دەکرێت".

پاشان ڕەحمان لە شیکردنەوەکەیدا زیاتر ڕۆچووە خوارێ و بە دوای هەموو شێوە و گرفتەکانی بەها ڕەوشتییەکاندا کەوتە پەیدۆز و گەڕان، تاکوو ئامانجەکەی خۆی دەست بکەوێت و جلوبەرگێکی پیرۆزیشی بە بەردا بکات، لە ناخی خۆیدا گوتی: "پێویستە مرۆڤایەتی بە ئاستی پەرەسەندنی ئاوەز، واتە عەقڵ

بپۆرێـــت نەك بە ئاســـتی پەرەســـەندنی جەســـتە... جەســـتە جلوبەرگێکە و هیچ بەهـایەکی نیـیە، مادامێـك لە نـاخی خۆیـدا درنـدەیەکی بکـوژ و تـۆقێنەر دەشـارێتەوە. ئەمـانەش هەموویـان درندەن و لە جەستەی مرۆڤـدان، خـۆزگە جەسـتەیان جەسـتەی درندەی کێوی بووایە و ئاوەزیان، ئاوەزی مرۆڤێکی شارستانی، کەواتە جیـاوازییەکە لە ئـاوەزدایە، نەك لە شـێوە، ئەمەش واتـای ئەوەیە کە مرۆڤایەتی وێڕای وێکچوونی لە شێوەدا، کەچـی لە ڕووی ئەندامێتییەوە دابەش بـووە، ئەم دابەشـبوونە زینـدەگییەش، سەرچاوەکەی مێشکە، کەواتە با مرۆڤانە بین و لەسەر ناولێنانەکە نـاکۆك و جیـاواز نەبـین، قاسـم و هاوشـێوەکانی بە درنـدەکانی دەسـەڵات و ئەوانەی لەسـەر ڕووی زەوی لەوانـیش درنـدەترن پۆلین بکەین، بەوەی مرۆڤن، وێـڕای پێنەگەیشتنی ئاوەزیـان کە زیـاتر لە ئـاژەڵە درنـدەکان نزیکیـان دەخـاتەوە، وەك ئەوەی لە مرۆڤبوونی ئاسـایی نزیکیـان بخـاتەوە، بە دەربڕینێکـی وردتـر و زانستیانەتر: نە مـرۆڤن و نە ئـاژەڵ، ئەمـانە جـۆرێکی دیـکەن لە پەرەسەندنی مرۆڤی دروسـت لایـان داوە. ئەمەش واتـای ئەوەیە کە مرۆڤی سەرکەوتوو هەیە و هـی دیـکەش هەن بە هەنگـاوی هێـواش بەرەو سـەرکەوتن و لـوتکە دەچـن، کـۆمەڵە کەسـی دیکەش هەن مێشکیان چەقیوە و پەرە ناسێنن، کەچی کـۆمەڵەی دیـــکەش هەن توانـــای لادانیـــان بەرەو پلەکـــانی خـــوارەوەی مرۆڤبوون هەیە، یان هەر بە ڕاستی بەرەو پلەکانی خوارەوە لایان داوە و خۆشحاڵیشن بەوەی لەو دۆخەدا دەژین، لەمەیاندا سوورم لەسـەر ئەوەی تـا کۆتـایی بە ئاژەڵیـان نـاوزەد نەکەم، نەك لەبەر ئەوەی لقێکن و لە مرۆڤبوون لایـان داوە و داشـۆراون، بەڵکـوو سووربوونم لەسـەر ئەوەی کە ناوبـانگی ئـاژەڵ پـیس و قێـزەون

نەکرێـت، بەڵام چ مرۆڤـایەتی و لۆژیکێـک دەبێـت ئەگەر ئەم جۆرە لادەر و مەترسیدارانە لەگەڵ مرۆڤی سەرکەوتوو لە ڕووی عەقڵەوە تێکەڵـی یەکتـر بکـرێن؟! دەزانـم ئەم تێکەڵکـردنە زۆر درێژە ناکێشێت، چونکە ئەمە پێچەوانەی یاسـاکانی سرووشـتە، ناشـکرێت ئەم جـۆرە ئـادەمییە لە ژیانیـان لەگەڵ ئەوانـی تـر بەردەوام بن، لەبەر ئەوەی مەترسیدارن و هەر دەبێ چ زوو بێ، یان درەنگ لەناو بچن و لەسەر ڕووی زەوی کۆتاییان پێ بێت، وای چ کارەساتێکە؟! چۆن پێشتر ئەمەم بە خەیاڵدا نەهـاتووە، وا پێ دەچێـت ئەم لۆژیکەیـان دروسـت و تەواو بێـت، هەر ئێستا لەوە دڵنیـابووم کە مرۆڤـایەتیی سـەرکەوتوو، ڕووی زەوی لەم جۆرە مرۆڤە عەقڵ و مێشك تەپیـوانە پـاك دەکـاتەوە، کە ئامـادە نین پەرەبسێنن و بگەنە ئاستی مرۆڤبوونی دروست، بەڵکوو لایان داوە و هەمیشە بەرەو پلەکانی خوارەوەی مرۆڤبوون لە هەڵپەدان، ئاسـانترین ڕێـگەش ئێسـتا ئەوەیە بـۆ کوشـتنی یەکتـری هانمـان دەدات، ئەمەش ململانێـیە لە پێنـاوی مـانەوەدا. ڕووی زەویـش نەمـان و لەنـاوچوونی چەنـدین ڕەچەڵەکـی جیـاوازی بە خـۆوە بینیوە دوای ئەوەی یەکێکی دیـکەی باڵادەسـت و سـەرکەوتوو زاڵ بووە بەسەریدا، وا پێ دەچێت لە کۆتاییدا دانیشـتوانی سـەر گـــۆی زەوی بە هەر شـــەش ملیـــارەکەیەوە، یەك ملیـــاری ســـەرکەوتوویان لـــێ بمێنێـــتەوە، ملیارێـــك بەرەو بـــاڵابوون و ســـەرکەوتن هەنگـاو بنـێن و ڕووی زەوی شـوێنی ڕەچەڵەکـی مرۆڤە چەقبەستووەکان و لادەرەکانی تێدا نەبێتەوە، ئێسـتا دەڵـێم لەوانەیە سـامان لەسـەر حەق بووبێـت! دەبـێ مـن لەگەڵ کـامە جۆرو ڕەچەڵەکیان پۆلین بکرێم؟! من لە بڕبڕەی پشـتی ئەوانەوە هاتووم، تۆ بڵێی منیش لەوان بم، یان تایبەمەنـدی و جیـاوازییەك

هەیە. هەر دەبێت بازدانێك ڕووی دابێت و ئێمەی لەوان جوودا کردبێتەوە، ئەمەش واتای ئەوەیە کە من و ئەوانەی هاوشێوەی منن لەگەڵ ئەواندا پۆلێن ناکرێین، کەواتە بێگومانم لەوەی لەگەڵ ئەوانەدا پۆلێن دەکرێین کە بەرەو سەرکەوتن هەنگاو دەنێن، بەڵێ هەر دەبێ لەگەڵ ئەو جۆرەیاندا پۆلین بکرێم، عەقڵی من چەقبەستوو نییە و ڕۆژێك لە ڕۆژانیش بەرەو پلەکانی خوارەوەی پەرەسەندن خلۆر نابێتەوە. بەڵام دەبێ من پشتگیری کامیان بکەم؟ پرسیارەکە ئەمەیانە... سەرم سوڕ نامێنێت لە هەڵبژاردنی ئەو لایەنەی کە لەگەڵیاندا ڕیز دەکرێم، ئەمە کارێکی بەڵگەنەویستە و خۆمی لێ لا نادەم، هیچ پەیوەندیی بەو خوێنەشەوە نییە کە لە شادەمارەکانمدا دێت و دەچێت، گرفتەکە تەنها ئەوەیە لە کێوە دەست پێ بکەم؟! کام دواکەوتوویان لەناو بەرم و کۆتایی پێ بێنم، چ ئامرازێك هەیە بۆ لەناوبردنیان؟ عومەر دەڵێت ئەوان بەپێی توانای خۆیان هەوڵی هوشیارکردنەوەی جووتیاران دەدەن، هەرچەندە لە بنەڕەتدا باش دەزانن کە ئەمەیان جۆرێکە لە مەحاڵ، خۆ ئەگەر بە هەر هۆیەکەوە بێت، یان پەرچوویەك ڕوو بدات و هەندێکیان لێ هوشیار بکەنەوە و بیانگۆڕن، ئەوە بە دڵنیاییەوە ئەوانە لە مێگەلەکە نین، بەڵکوو هۆیەکەی ئەوەیە هەر لە دێرزەمانەوە گۆڕانکاری و بازدانێکی جۆری لە مێشکیاندا ڕووی داوە، ئەوەی مامۆستا عومەریش دەیکات، شتێك نییە جگە لەوەی فووی لە خۆڵەمێشەکە کردووە و پشکۆ خامۆشەکانی ژێری گڕیان گرتۆتەوە. وەلێ قاسم و هاوشێوەکانی لە کەسە بیربەستەڵەك و دواکەوتووەکانن، ئەوانەی دڕندەی دەسەڵات و خوێنمژی مرۆڤەکانن، نەك مامۆستا عومەر سەدانی وەکوو

ئەویش ناتوانێت پشکۆی خامۆشی ژێر خۆڵەمێشی مێشکیان بە فوویەکی شارستانی بخاتەوەگەڕ و گڕیان تێبەربداتەوە، نەك بە فوویەك، بەڵکوو هەتا پەمپێکیش بهێنێت و فوویان لێ بکات سوودی نابێت و ڕەنج بە خەسار دەبێت، ئەوەش لەبەر هۆیەکی سادە، چونکە هیچ پشکۆیەك لەژێر خۆڵەمێشی ئەمانەدا گەرمایی تێدا نەماوە، تاکوو بگەشێتەوە و مێشکیان چەقیبەستووە و خۆڵەمێش دایپۆشیوە، سەرباری ئەمانە، خۆ ئەگەر ئەم خۆڵەمێشە لەگەڵ زریان و ڕەشەبایەکیش بە ئاسماندا بچێت، ئەو کاتە چاوی تێکڕای ئەوانەی دەوروبەریش کوێر دەکات و هەموو شتێکی بەردەمی خۆیشی پیس دەکات. ئەم قاسمە دواکەوتووە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ دڕندەکانی دەسەڵات و مەترسیشی لە مەترسیی ئیسلامییە توندڕەو و گەمژەو نەزانەکان کەمتر نییە، کە مایەی قێزلێبوونەوەن، هەر بە ڕاستی زبڵدانێکی پڕ لە خاشاکی ژەهراوی و کوژەرن و هیچ مرۆڤێك توانای گۆڕینی ئەمانەی نییە بۆ شتێکی بە کەڵك. بەڵکوو دەرد و بەڵا و ئازارن بۆ مرۆڤایەتی و هەر دەبێ قڕ و قەڵاچۆ بکرێن و لەناو ببردرێن... ئەی دەربارەی خوشکە قوربانییەکەی چی؟! تۆ بڵێی ئەو خوشکە قوربانییەیشی هەر لە ڕیزی نەزان و دواکەوتووەکان ئەژمار بکرێت؟! ئاخر بە ڕیشی کێ ڕەوایە تاوانبار و تاوانلێکراو هەردووکیان لەسەر ڕووی زەوی بسڕێندرێنەوە و قەڵاچۆ بکرێن؟ نەخێر ئەمە کردارێکی دادپەروەرانە نییە، تەنها مەگەر تاوانلێکراو، واتە قوربانییەکە بە نەزانی خۆی و بێ ئەوەی درکی پێ بکات هەموو مرۆڤایەتی لەناو ببات، سەرکەوتووەکان هەرگیز ڕێگەی مەترسیی ئەم جۆرە هەڕەشەیە نادەن، هەتا ئەگەر ئاشتیخوازانەش بێت و لە ڕێگەی زاوزێکردنی خێراوە

بێت. بەمەش بیربەستەڵەکەکان تەنها لە ڕووی ژمارەییەوە، نەك عەقڵییەوە زۆر دەبن و زاڵ دەبن و سەردەکەون...ئاخ... ئێستا دەزانم سامان تۆ چەند لەسەر حەق بوویت، هەر بە ڕاستی لەسەر حەق بوویت! ترسم لەوەی ئێستایە کە دەگوزەرێت، هەر دەبێ سەرکەوتووەکان ڕێگەچارەیەکی ئاشتیخوازانە بدۆزنەوە دوور لە ماڵوێرانی و قێزەونیی جەنگەکان، بۆ دانانی سنوورێك بۆ زاوزێکردن و زۆربوونی ژمارەی ئەم جۆرە زایەندە ئادەمییە چەقبەستوو و لادەرانەی وایان لێ هاتووە هەڕەشە لە پەرەسەندنی سرووشتیی ڕەچەڵەکی مرۆڤ بکەن.

پاشان قاسم و عەولا وەکوو مۆتەکە لە خەیاڵیدا قیت بوونەوە، ئەویش چۆن سەرنجی دوو شێرەبەفرینەی ساردوسڕ دەدات، بەو جۆرە سێرەی سەرنجی دانێ، لە ناخی خۆیدا گوتی: "من ئێستا لە گڕ ئەم دوو تاوانبارەدام، دوای ئەو کارە دڕندانانەی ئەنجامیان داوە، مافی ئەوەیان هەیە بە ئاسوودەیی بژین؟! خۆ ئەگەر سزایان نەدەم، منیش هیچ جیاوازییەکم لەگەڵ ئەواندا نابێت و مرۆڤبوونی خۆم لە دەست دەدەم، لەوانەشە خەڵکانی دیکەش بە دەستی ئەوان ژیانی خۆیان لەدەست بدەن... کێ دەڵێ دەسەڵاتی پیاوسالاریی خۆیان ناخەنە کار و ئافرەتانی دیکەش لە خێزانەکانیان بە هەمان دەردی ئەوانەی پێشووتر نابەن و بەشداری لە کوشتنی کچانی دیکەشدا ناکەن، هەر لە بەر هەمان هۆ؟! ئەگەرنا ئەم جۆرە کەسە قێزەونە دەست لەناودەستی یەکتر دەنێن و بەڵایەك دەسازێنن، ئێستا دەرفەتێکم لەبەردەستدایە بۆ لەناوبردنی ئەم دووپشکە ژەهراوییانە، بەڵام بەر لە هەر شتێك دەبێ وا لە قاسم بکەم دان بەو ڕاستییەدا بنێت، چونکە لەو کاتەوەی گوێبیستی ئەو کارەی بووم خەوم لێ

زڕاوە و هەرچەندی دەکەم و دەکۆشم ئارام نابمەوە، تۆ بڵێی ئەو جووڵە و هاتوچۆ و نهێنییەکانی مام کاکیلی ئاشکرا کردبێت و هەواڵی دابێتە دوژمن؟! بە دڵنیاییەوە ئەگەر ڕاستییەکە بزانم و ئەوە ڕوون ببێتەوە کە ئەو هۆی شەهیدبوونی مام کاکیل بووە، بە دڵنیاییەوە هەرگیز لەسەر تاشەبەردەکەوە فڕێی نادەمە خوارەوە، چونکە بە خێرایی دەمرێت و ئاسوودە دەبێت، لەو کاتەدا من هەرگیز بەزەییم پێیدا نایەتەوە، دەبێ ئەوەندە ئەشکەنجەی بدەم، هەتا وای لێ بێت مردن بە ئاوات بخوازێت، کەچی مردن لەبەری هەڵبێت و ئەو نەیگاتێ!"

# بەشی بیست و حەوتەم

لە ڕۆژی دیدار و یەکتر بینیندا، ڕەحمان لە هەمان شوێن لە چاوەڕوانیاندا بوو، هەر کە دەرکەوتن و گەیشتن، کاتی خۆیان بە فیڕۆ نەدا و بۆی دەرچوون، لە ڕێگەی دۆڵێکەوە کە بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە و هێدی هێدی بەرەو لوتکەکە بەرز دەبووەوە، خۆرەکە لە لایەکی دۆڵەکەوە تیشکی دەهاویشت و سێبەرەکەیشی لە لایەکەی دیکەوە لە نێوان دار و درەخت و تاشەبەردەکانەوە پەلی دەهاویشت و باڵی بەسەر ناوچەکەدا دەکێشا. هەر کە لە دۆڵەکە دەرچوون، دۆڵێکی دیکە پێشوازیی کردن و ناچاری کردن بە لوتکەیەك لە لوتکەکاندا هەڵبگەڕێن کە لەسەر تەوقی سەری چیایەکە چەقی بوو، لە بەرانبەریشیاندا تاشەبەردە سەرکەشەکان لە دووریی نزیکەی کاتژمێرێك لەو شوێنەیانەوە لە پێشوازیی هاتنیاندا بوو، بزنەڕێیەکی قەدپاڵێکیان گرت و گەیاندیانییە ناو کەڵەکە بەردی گەورەگەورە و زۆروزەبەند کە لەژێر باڵای تاشەبەردەکاندا خۆیان مەڵاس دابوو، لەوێش لقێکیان لێ جودا بووبووەوە و بە دەوری چیایەکەدا دەسووڕایەوە و یەکێکی دیکەشیان بە لای تاشەبەردەکاندا هەڵدەزنا تا دەگەیشتە کۆتاییەکەی، وا پێ دەچوو قەدپاڵەکە لەوەتای دروست بووە هەرگیز پێی مرۆڤی بەر نەکەوتبێت. هەر کە زیاتر لە کەڵەکە بەردەکان دوور دەکەوتنەوە ژمارە و چڕیی دار و درەختەکان زیاتر و زۆرتر دەبوون، تا لە کۆتاییدا لە لوتکەکەدا گیرسانەوە، بە ئاگاییەکی زۆرەوە ڕەحمان بەرەو لێواری تاشەبەردەکە دابەزییە خوارەوە و

خـۆی دایە سـەر درەختێـك لە درەختەکـانی ئەوێ، بە دەسـتی ئاماژەی بۆ هەنـگەڵانەکە کـرد کە لە گۆشـەیەکی ئەو گـابەردە تەختەدا وەستایانە دروست کرابوو و لە لایەکی تاشـەبەردەکەوە دەردەکەوت و دیـار بـوو. هەنـگ بە هەمـوو لایەکـدا گیزەیـان دەهات و لە هەڵپە و کار و چـالاکیی خۆیانـدا بـوون، هەرگیـز چاوەڕوانی هاتنی مرۆڤە چاوچنۆك و دڕندەکان نەبوون، نیشتمانە ئارام و ئاسوودە و پڕ لە خێـر و فەڕەکەیـان تەفروتونـا بـکەن و ئەوانـیش دەربەدەر و ئـاوارە و بـێ مـاڵ و جـێگە بـکەن، ئـاخر ئەوان بـۆیە لەو شـوێنەدا نیشـتمانی خۆیـان بونیـاد نـاوە، تـاکوو دەسـتی هـیچ کـاولکەرێکی نەگـاتێ. دوای ئەوەی بە وردی سـەرنجیان دایە شـوێنی هەنـگەڵانەکە، هەردووکیـان چەك و فیشـەکدانەکانیان دانـا، ئینجـا قاسـم سـەرقاڵی کـۆکردنەوەی گەڵاداری وشك و گڕتێبەردانی بوو، دواتریش هەنـدێك چـڵ و گەڵای تەڕ و شێداری خستە سـەر ئـاگرەکە، تـاکوو دووکەڵـی زیاتر بکات و هەنگەکان ناچار بکات هەنگەڵانەکە بەجێ بهێڵن و وا بیانشوێنێت کە هێرشیش نەکەنە سەری، هەنـدێك پشـکۆ و گەڵای تەڕیشی خستە ناو تەنەکەیەکی کونکونی دەسـکدارەوە، کە دووکەڵێکی چڕی لێوە دەردەچوو، بە وریاییەوە هەڵیگرت و بەرەو تاشـەبەردەکە دابەزی، عەوڵاش بە ئاگـادارییەکی زۆرەوە دوای ئەوەی پشتوێنەکەی خۆی و ئەوەی قاسمی پێکەوە گـرێ دا، سەرێکی بەو دارەوە بەستەوە کە ڕەحمان پاڵی پێوە دابـوو و سەرەکەی دیکەشی بە نـاوقەدی قاسـمەوە شەتـەك دا بەرلەوەی ئەویش بەرەو تاشەبەردەکە دابەزێت. قاسم تەنەکە پـڕ لە ڕەژوو و دووکەڵەکەی دایە دەسـتی عەوڵا و خۆیشـی دۆڵـکەکەی هەڵگـرت و زیـاتر بەرەو هەنـگەڵانەکە دابەزیـیە خـوارەوە. پشـتوێنەکە بەو گـرانییەی کەوتبـووە سـەری لەوپەڕی خەراپیـدا بوو، عەوڵاش لـۆیەکی پشـتێنەکەی لە دەسـتی چەپـی بـادا و بە

دەستەکەی دیکەیشی بەملا و بەولادا کەوتە جوولاندنی تەنەکە دووکەڵاوییەکە و دوورخستنەوەی هەنگەکان لە هەنگەڵانەکە، زۆر لە قاسم نزیک کەوتبووەوە، هێندەی نەمابوو پێکەوە بنووسێن، قاسمیش پارچەیەکی گەورەی شانەی هەنگوینی لە هەنگەڵانەکە دەرکرد و کردیە ناو دۆلکەکەوە، ڕەحمان وای زانی قاسم دەستی خۆی دەلێسێتەوە و ئەو هەنگوینەی پێوەی ماوە دەخوات، لەو کاتەدا قاسم بە وریایی و ئەزموونێکی زۆرەوە هەوڵی گەیشتنی بە دوورترین خاڵی ناو هەنگەڵانەکە دەدا، کە ئەوەندە گەورە بوو پێویستی بە گەڕی دووەمیش هەبوو بۆ بەتاڵکردنی لە شەمێ و هەنگوین، ڕوخساری ڕەحمان گۆڕا و چیتر توانای بیرکردنەوەی لە هیچ شتێك نەما، جارێکی تر دانەجیرەی گرتەوە و چاوەکانی دەرپۆقین، وەك ئەوەی بیانەوێت لە چاڵی چاوییەوە بێنە دەرەوە، دڵی ئەوەندە بە خێرایی لێی دەدا، ماسولکەکانی دڵی بە بۆشایی سینگییەوە دەنووسان و لێ دەبوونەوە، بە ئاشکرا گوێی لە ترپەی دڵی خۆی بوو، پەنجەکانی دەستی لەسەر مسکی نێزەکەی دەستی توند کردبوو، چ نێزەیەك، ئەوەندە تیژ بوو، ڕێك لە گوێزانی سەرتاشین دەچوو، ئەو هەمیشە نێزەکەی بە لایەکی تاخمەکەیەوە شۆڕ دەکردەوە و بەسەر ڕانیدا دەهاتە خوارەوە، بە هێواشی ئاوڕێکی لە دەوروبەری خۆی دایەوە و وەها گوێی هەڵخست، هەتا توانای بیستنی جوولەی پێی مێروولەیەکیشی هەبوو، بیرکردنەوەیەکی خێرا، بڕیارێکی توند: "ئێستا دادگاییکردنەکەتان دەستی پێ کرد، دەبێ واتان لێ بکەم هەر کارێکی قێزەون و بەدڕەوشتیتان کردووە هەڵیبێننەوە، وا لەو دڕندایەتییەتان بکەم، ببنە دوو مشکی تۆقیو، دەبێ واتان لێ بکەم دەست بە گریان و پاڕانەوە بکەن و بۆ ژیان و مانەوەتان داوای یارمەتی لە زەوی و ئاسمان بکەن. ئەو کاتە چاوی

داچەقیــوی قوربانییەکانتــان و دڵڕەقیتــان بەرانبەریــان کە هــیچ بەزەییەکی تێدا نەبووە، وەبیرتـان دەهێـنمەوە، دڵنیـام گەمەیەکـی خۆشـتان لەگەڵـدا دەکەم و چێژێکــی زۆرتـان لـێ وەردەگـرم بەرلەوەی بتـانکوژم، تێڕامـان و سـەرنجە تۆقیوەکـانی چاوتـان دڵخۆشـم دەکەن، ئەو کـاتەی ئێـوە بە چـاوی ئەبڵەقتـانەوە لە نێزەکەی دەستم دەڕوانن کە لەسـەر پشـتی پشـتوێنە لەرزۆکەکە دام ناوە و ژیانی هەردووکتان بە تاڵە دەزووەکانییەوە بەندە".

ئینجـا بڕیـارە یەکلایـیکەرەوەکەی جێبەجـێ کـرد و بە جووڵەیەکی خێرا نێزەکەی ڕاکێشا، بەڵام هەر کە دەمی تیژی نێـزەکە تـاڵە دەزووەکـانی پشـتوێنە لەرزۆکەکەی بـڕی، لە چاوتروکانێکـدا بـووە دوو پـارچە و قاسـم و عەولاش پـێ ڕانەگەیشتن هەتا سـەیری ڕەحمـانیش بـکەن، کە لە سەرسـامیی خـۆی و هـاواری ئەوان و شـڵپەی کەوتـنە خـوارەوەی سـەر زەوییان دۆش دامابوو، لە چرکەساتێك و بەرلەوەی ڕەحمان لەو سەرسامییەی بەئاگا بێتەوە، چونکە پێشبینیی ئەوەی نەدەکرد لە چاوتروکانێکـدا ئەوە ڕوو بـدات، چـۆن ئەو بیـری لەوە نەکردبووەوە کە بڕینی دەزوویەکی باریکی قوماشێکی لەرزۆك هەموو قوماشەکە لە چرکەساتێکدا لەتوپەت دەکـات، ئەی تـۆ بەوە چی دەڵێیت ئەگەر قوماشی پشتوێنەکە لە نـایلۆنەوە نزیـك بێـت، نەك پەمـۆ ئەوە هەر خـۆی ناگرێـت و خێراتـر دەپسێت. لەسەر زەوی دانیشت و پشتی دایە ئەو درەختەی کە پاشـماوەی پشتێنەکەی پێوە بەسترابوو، لێدانی دڵی و ماسـولکەکانی جەسـتە شڵەژاوەکەیشی هێدی هێدی خاو دەبووەوە، هەستی بە تاڵاوێکی سەیر کرد لەناو دەمی کە وشك بووبوو، پاشان بە ئاگاهاتەوە کە هێشتا نێزەکەی لەنـاو دەسـتیدایە، کـردییەوە نـاو کـالانەکەی و لەسـەرخۆ هەستایە سـەر پێ، سـەرەتا خۆیشـی نەیزانـی ڕوو لە

کـوێ دەکـات و خـۆی دایە دەسـت پێیەکـانی و نەیشـیدەزانی بەرەو .کوێی دەبەن! هێشتا لە خەیاڵێکی قووڵـدا بـوو، کاتێـك بە خۆی زانی وا خەریکە دەگاتە قەدپاڵەکە و وەکوو مار لە نێـوان گـابەرد و بەرزونزمـی و پێچـاوپێچی قەدپـاڵەکەدا شـۆڕ دەبێـتە خـوارەوە، دوای نـزیکەی دە خـولەك شـۆڕبوونەوە قەدپـاڵەکە دابەش بـوو، بـێ ئەوەی بیـر بکـاتەوە قاچەکـانی بەرەو ئەو قەدپاڵەیان برد کە هێشتا شۆڕ دەبێتە خـوارەوە و بە شـێوەیەکی میکانیزمانە ڕێگەکەی گرتەبەر، لە ڕاستیدا ڕێگە نەبـوو، بەڵکـوو هەڵبەزودابەزێکی ترسـناك بـوو بەرەو خـوارەوە، لێـرە و لەوێـش کەو لەژێر قاچیدا دەفڕین، بێ ئەوەی ئەو ئاگـای لێیـان بێـت و بـایەخێکی ئەوتۆیـان پـێ بـدات، کاتێـك بە خـۆی زانـی وا لە خـــوارەوەی تاشـــەبەردە گەورەکانـــدایە، لەنـــاو گـــابەردە پەرشوبڵاوەکان کەوتە گەڕان، بێدەنگییەکی ترسناك نـاوچەکەی تەنیبووەوە، تەنها قەڵەمبازی کەروێشکێکی تۆقیو، یان دەرپەڕینی لە ناکـاوی ڕێـوییەکی خەولێـزڕاو نەبێـت، هیچـی تـری بە دی نەدەکرد، تیشکی خۆرەکە لەسەر بەردەکـان بریسـکی دەدایەوە، لە لایەکەوە بریسـکەی تیشـکی خـۆرەکە سـەرنجی ڕەحمـانی ڕاکێشا، وەك ئەوەی تیشکدانەوەی خۆرەکە بێت لە ئاوێنەیەکدا، ڕەحمان سـەرنجی گـرتە بریسـکدانەوەکە و بە وریـاییەوە بەرەو لای هەنگاوی نا، هێندەی نەبرد گەیشتە نزیکـی، تیشـکدانەوەکە لە تەنەکەکەوە بـوو کە وەکـوو دۆلـکە بـۆ تێکردنـی هەنگـوین بەکاریان هێنابوو، هەنگوینەکە و خوێنی قاسم لەسەر گابەردێـك تێکەڵی یەکتر بووبـوون و جەستەیشـی بەبـێ جووڵە ڕاکشـابوو، ڕەحمـان زاخـی ئەوەی نەکـرد زۆر لەبەردەمیـدا بمێنێـتەوە، لەو کـاتەی سـەرنجی لە تەرمەکەی قاسـم دەدا قێـزی لە خـۆی و لەویش دەبووەوە، پاشان تفێکـی کـرد و دوو هەنگـاو کشـایەوە دواوە بە ئاڕاسـتەی ئەو شـوێنەی لێـوەی هـاتبوو، پاشـان بە

دڵخۆشییەوە ڕاوەستا، ئینجا داچەمییەوە شتێکی لەسەر زەوی هەڵگرت و خستییە دەمییەوە، ئەوەش پارچەیەك بوو لە شانەی هەنگەکە، تا گەیشتە شەمێکەی هەر مژی و ئینجا کەمێك جاویی و دواتر تفاندییەوە، لە دووری دوو هەنگاوێك لەولایەوە جەستەی عەوڵاش لەسەر گابەردێکی زل نیوەی شۆڕ بووبووە خوارەوە کە نزیکەی مەترێك لە بەژنی ئەو بڵندتر دەبوو، ئەو کاتەی گەیشتە ئەویّ، بە هۆی ئەوەی سەرنجی دابووە تیشکدانەوەی سەر تەنەکەی هەنگوینەکە ئەوی بە دی نەکردبوو، ئەوەتا وا زیاتر سەرنجی تەرمی ئەو دەدات لەوەی قاسم، بەڵکوو لێی چووە پێش و قژی ڕاکێشا و بە بێزراوییەوە لەناو دەستی خزی، چاوەکانی عەوڵا وەك ئەوەی هەڕەشەی تۆڵەکردنەوە بێت، یان ئەو وا هەستی پیّ کرد، زەق زەق سەیری ڕەحمانیان دەکرد، وەلیّ ئەو چاوە زەقە تۆڵەسێنانە، هیچ ترسێکی لە ناخی ڕەحماندا دروست نەکرد، بە قەد ئەوەی یادی ئەو بەڵێنەی کردەوە کە بە شیرینی خوشکە شۆخوشەنگەکەی دابوو!

ڕەحمان بەڵێنی خۆی شکاند و براکەی کوشت، ئەم بیرۆکە لە ناکاوە قاسم و عەوڵای لە بیری بردەوە کە خەڵتانی خوێن بووبوون. شیرینی شۆخوشەنگ بەسەر بیرکردنەوەیدا زاڵ بوو، خەیاڵ شیرینی هێنایە ئەویّ و پەنجە جوان و ناسکەکانی خەریك بوون لە بینەقاقای ڕەحمان گیر دەبوون و خەریك بوو هەناسەی ببڕن، شیرین بووە خەم و ئازاری ئەو، یادەوەرییەکانی زیاتر ئازاریان دەدا، وەك لەوەی دڵخۆشی بکەن. دڵنیابوو لەم ساتە بەدواوە ژەهری بە گەروودا دەکەن و ئەشکەنجەی دەدەن، بۆ کویّ لە دەستی ڕابکات و خۆی دەرباز بکات؟! ئایا ژیان ئەو کەمە خۆشییە تێکەڵ بە ترسەی پیّ ڕەوا نەبینی کە سامان

پێی بەخشیبوو؟! ئەوەتانێ مۆتەکەیەکی تۆقێنەری دیکە باری خەمەکانی قورستر دەکەن و خەم لەسەر خەمی بۆ زیاد دەکەن، لە سەرەتاوە خوشکە جمکەکەی بە دەستی باوك و براکەی کوژرا، پاشان ڕاستەوخۆ دایکی لە حەسرەتی کچەکەی سەری نایەوە و گیانی سپارد، ئێستاش وا عەولای برای دەمرێت، بە دەستی کێش؟! بە دەستی کەسێك شایستەی ئەو کولێرەیە نەبوو کە دەرخواردی دا و شایانی دڵۆپە فرمێسکێکیش نەبوو کە لە کاتی پاڕانەوەی لە ڕەحمان بەوەی براکەی و هیچ کەسێك لە کەسوکارەکەی ئازار نەدات هاتنە خوارەوە؟ ئاخ چەند خۆزگە دەخوازم ئەی شۆخەکەم ئێستا بە دەستی خۆت تۆڵەم لێ بکەیتەوە، من ئێستا ئامادەم لەسەر ئەو تاشەبەردە لە بەردەمتدا ڕابوەستم و ئەگەر بتەوێت فڕێم بدەیتە خوارەوە، ئەگەر ئەوە خەم و ناسۆری دڵی تۆ دەڕەوێنێتەوە... شیرینەکەم... ئەی ڕووگە و مایەی ژیانم، وا پێ دەچێ تۆ ئازاربەخشی ڕۆحی من بیت، دەسا وەرە و ئەشکەنجەی ڕۆحم بدە و منیش ملکەچ و بێدەنگ لە حزووری تۆدا دەوەستم، بە ئارەزووی خۆت و چۆنت دەوێ ئەشکەنجەم بدە، وەلێ تەنها تۆ خەم مەخۆ و ئازار مەچێژە. ئای لە بەدکرداری و سەرسەختیی من، خۆ ئەو منی بە یەکێك لە خانەوادەکەی دانا، ئەو منی بە خۆشەویستی خوشکەکەی دانا، ئای لە بەدبەختیم، بۆ کوێ لە دەستی خۆم ڕا بکەم، جوانکیلەکەم چاوەکانت دەمکوژن و ئابڕووم دەبەن، من چۆن تۆم لە یاد کرد قیبلەگاکەم؟! چۆن گیانی تۆڵەسەندنەوە بەسەر بەڵێندانم بە فرمێسکەکانت زاڵبوون و کوێریان کردم؟! من هەرگیز شایانی ئەو فرمێسکانەی تۆ نیم، کاری من تەواو، خۆزگە ڕێگەیەك دەبوو بۆ ئەوەی تاوان و گوناهەکانی خۆم پاك بکەمەوە و ئالای ئەستۆپاکی بە مەرگی خۆم بشەکێنمەوە!"

کەوتنەخوارەوەی بەردێکی بچووك لە دووریی نزیکەی پەنجا مەترێك لە بەردەمی هێنایەوە سەرخۆی، بۆیە قەڵەمبازێکی دا و خۆی هەڵدایە پەنای گابەردێك و سەنگەری گرت، چاوەڕێی هاتنی پێشهاتێك بوو، گریمانەی ئەوەیشی دانا، کە لەوانەیە بەردەکە بەر سمی ئاژەڵە کێوییەك کەوتبێت و خلۆر بووبێتەوە خوارەوە، چونکە گەلێ جار شتی وا ڕوو دەدات. بۆیە هەموو جەستەی بوونە چاو و گوێ، سەرنجی بڕییە شاخەکە و قەدپاڵ و پەنا بەردەکانی، لە پڕ یەکێك لە پێشمەرگە ئافرەتەکانی دەستەکە کەوتە ناو سێرەی سەرنجەکانییەوە، کە بە دزییەوە هاتبوو و خۆی لە پەنای گابەردەکاندا حەشار دابوو، "بۆ خاتری ئاسمان ئەم بەڵایە لێرە چی دەکات؟! خۆ ئەگەر ڕووداوەکەی بینیبێت، ئەوا هەموو شتێکی لێ تێك چووا" بێ ئەوەی جووڵە بکات، هەناسەی لە خۆی بڕی و لە شوێنی خۆی چاوەڕێی کرد، تا بە تەواوی دەرکەوێت و لە بوونی دڵنیابێت، بەڵام ئەو کاری وای نەکرد و خۆی دەرنەخست، وەك ئەوەی چاودێریی بکات، یان لەوانەیە بوونی لێرەدا تەنها ڕێککەوتێك بێت و هیچی تر، یان ژوانی لەگەڵ یەکێکیان هەبووە، دوای چەند ساتێك کە بە لای ڕەحمانەوە درێژەی کێشا، سەری لەناو گابەردەکاندا بە دی کرد و دیسانەوە بە خێرایی ون بووەوە، پاش کەمێك بینی لەسەر هەر چوار پەلی دەڕوات و تفەنگەکەیشی لەسەر پشتییە، پاشان لەسەر چۆکی دادەنیشێت و سەیری هەموو لایەك دەکات، تا سەرنجی لەسەر تەرمەکەی عەولا نیشتەوە، کە لەسەر گابەردەکەوە شۆڕ بووبووە خوارەوە، بۆیە دەستی لەسەر زاری دانا، لە ترسی ئەوەی نەبادا لە سەرسامیدا دەنگێکی لێوە بێت و بێ خواستی خۆی هاوارێك بکات، زیاتریش نزیك نەکەوتەوە، بەڵکوو جارێکی دیکە لەسەر هەر چوار پەلی کەوتەوە ڕۆیشتن و لە نێوان گابەردەکاندا ون

بووەوە. ڕەحمانیش بە خۆچەماندنەوە پاشەکشەی کرد، تاکوو هیچ شوێنێکی دەرنەکەوێت و دیار نەبێت، هەر کە کەمێك بە ئاڕاستەی پێچەوانەی شوێنی ئەو چەکدارە ئافرەتەوە ڕۆییشت، بە خێرایی بەرەو ناودارەکان ڕای کرد و مەودایەکی باشی بڕی، لەوێوە کەوتە سووسەکردن و چاودێریی قەدپاڵەکە، ڕێك ئەو شوێنەی لە کاتی گەڕانەوەی چەکدارەکە لێوەی دەردەکەوێت و دیار دەبێت، زۆر لە شوێنی خۆی نەمایەوە، بینی لە سەرەتای قەدپاڵەکەوە خەریکە بە تەنها دەڕوات، بیری لەوە کردەوە: "لەوانەیە پاش کەمێك ئەو کەسەش دەربکەوێت کە جێژوانی لەگەڵ بەستووە، ڕەنگە وایان پێ باش بووبێت کە لە دووریی یەکتر بڕۆن بۆ ئەوەی کەس هەست بە پەیوەندییان نەکات". پاشان ڕەحمان ئەم بیرۆکەیەی لە مێشکی خۆی دەرکرد. هیچ پێ ناچێ کارەکە بەو جۆرە بێت کە ئەو مەزەندەی کردووە، بۆیە بە خێرایی بەرەو لای ئەو گردۆلکەیە ڕۆییشت کە لەگەڵ دۆڵەکەدا درێژ بۆتەوە و ڕێگای گەڕانەوەی کورت دەکاتەوە، کاتێك گەیشتە ئەو قەدپاڵەی دەیگەیەنێتە ئافرەتە چەکدارەکە، بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن بێ ئەوەی یەکتری ببینن، تەنها دوای ئەوە نەبێت کە زۆر لە یەکتری نزیك کەوتنەوە. وا پێ دەچوو لە لایەکەی دیکەوە هاتبێت، بەڵام کاتێك لێی نزیك کەوتەوە، ئافرەتە چەکدارەکە ڕاچڵەکی و بە وردی سێرەی سەرنجەکانی کەوتنە پشکنینی ڕوخساری ڕەحمان، تا ڕادەیەکی زۆر بە دیداری مشەوەش و نامۆ و شڵەژاو دیار بوو، ڕەحمان ویستی بزانێت بیر لە چی دەکاتەوە؟! سەرنجێکی تیژی گرتە چاوەکانی، ئەویش بە خێرایی ڕوخساری خۆی لێ لادا و ئاماژەی بۆ پشتەوەی خۆی کرد و گوتی:

- لەوێ... تەرمی دوو کوژراو هەن!

- دوو کوژراو؟! لە دەستەکەی خۆمانن؟

- نازانم!

ڕەحمان:

- شوێنەکەیانم پێ پیشان بدە.

دیسانەوە بە دەستەکانی ئاماژەی کرد و گوتی:

- لەوێ...!

- لەگەڵم دێیت، یان دەگەڕێیتەوە بۆ بارەگا؟!

- لەگەڵت دێم و پێکەوەش دەگەڕێینەوە. چونکە لە ڕێگەی گەڕانەوە دڵنیا نیم، دەترسم ون ببم.

هەردووکیان بۆ ماوەی دە خولەکێك بە بێدەنگی ڕێیان کرد و دوودڵی و هەزار و یەك پرسیاریش لە مێشکی هەردووکیاندا ختووکەی ڕۆحی دەدان. کاتێك گەیشتنە لای گابەردەکانی خوار تاشەکەوە، ڕەحمان لە ناکاو گوتی:

- چۆن بۆ ئێرە هاتیت و ڕێگەی گەڕانەوەش نازانیت، مادام تۆ شارەزای ڕێگە ونەکانی دۆڵەکان نیت کە مرۆڤ هەڵدەلووشن و توانای دەرچوونی لێیان نییە؟!

ئەو سەرنجی گرتبووە گابەردەکانی پێش خۆی و گوتی:

- کاتێك لە بارەگای دەستەکە کەمێك دوور کەوتمەوە، قەدپاڵێکم گرت و بێ ئەوەی ئاگام لێ بێت ونی کردم و فڕێی دامە ئێرە، لێم شێوابوو نەمدەزانی قاچەکانم بۆ کوێم دەبەن. هەستم بە هیچ نەکرد، تا کاتێك خۆم لێرە دۆزییەوە، وەکوو کوێر لە ڕۆیشتن بەردەوام بووم و قەدپاڵەکە لەگەڵ خۆیدا دەیبردم و درێژ دەبووەوە و هەڵدەکشا، خۆ ئەگەر تووشی تۆ

نەبووایەم، ئەوا ڕێگەی گەڕانەوەشم نەدەزانی!

- وا پێ دەچێت بەختت هەبێت.

- منیش پێم وایە، بەڵام ئەی تۆ لەم چۆڵەوانی و شاخ و داخە چی دەکەیت؟!

- من بۆ ڕاو دەرچووبووم، پێش تۆ لێرە ژیاوم هەموو دۆڵ و قەدپاڵ و لوتکەکانی شارەزام.

چەکدارە ئافرەتەکە ئاگای لە تەرمی عەوڵا نەبوو کە لەسەر گابەردەکەوە شۆڕ بووبووەوە، وێڕای ئەوەی چاوەکانی هەڵوەدای گەڕان و سووڕان و پشکنینی ناوچەکە بوون و بە دوای هەردوو تەرمەکەوە لە گەڕاندا بوون و هەستیشی سەرقاڵی بیرکردنەوە لە شتێکی دیاریکراو بووبێت، چاوەکانی لە چاوی باز دەچوون، وردورد ئەو دەوروبەرەیان دەپشکنی، لەو ئانوساتەدا ڕەحمان لە بەردەمیدا ڕاوەستا و سەرنجی گرتە ڕوخساری، ئەویش بە هێواشی سەری هەڵبڕی و ڕێك ئەو گابەردەی کە سەری عەوڵا لێیەوە شۆڕ بووبووە خوارەوە کەوتە بەر سێرە نیگای، بەڵام بە بینینی دیمەنەکە نە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و نە سەرسامیش بوو، وەك ئەوەی لە جاری یەکەمدا کردی، کاتێك تەرمەکەیانی دۆزییەوە، بەڵکوو بە دڵ و مێشك و هەستێکی جێگیر و چەسپاو و خوێنێکی ساردەوە سەرنجی تەرمەکەی دا، پێچەوانەی ئەوەی بە زۆری بە هۆی هەست ناسکی و هەستیاریی ئافرەتانەوە ئەوە ڕوو دەدات.

ڕەحمان قژە سەری تەرمەکەی گرت و بەرزی کردەوە و لەژێر لێوەوە گوتی:

- ئەوە عەوڵایە!

- ئەو چەکدارە گوندنشینەیە کە لووتی خوشکەکەی بڕی و کوشتی؟!

- بەڵێ خۆیەتی... بەرەو دۆزەخ!

ئـافرەتەکە لەو کـاتەی لێـی دوور دەکەوتەوە بە دڵێکـی ساردەوە گوتی:

- سزای خۆی وەرگرت، شایانی ئەم مردنەیە، وەرە بـا بە دوای ئەوەی دیکەدا بگەڕێین.

ڕەحمان کەوتە منگەمنگ و بە سەری ئاماژەی بۆ پێشـەوە کرد:

- ئەوەی دیکەش ئەوەتانێ، لێرەوە دەتوانم ببینم.

کاتێك لە نزیکییەوە ڕاوەستان، ڕاستەوخۆ گوتی:

- ئەمەشـیان قاسـمە... نـازانم ئەم جـۆرە بیچمـانە چـۆن وا لەگەڵ یەکتـری کـۆ دەبـنەوە. ئەم گەمـژەیەش خوشـکەکەی و مێـــردەکەی و ئەوەی پەنایشـــی دابـــوون و ڕێـــگەی بـــۆ هاوسەرگیرییان خۆش کردبوو، ئەویشـی کوشـتبوو، تەنهـا لەبەر ئەوەی هاوســەرگیرییەکە بەبــێ ڕەزامەنــدیی جەنابیــان بــووە...! تفووو!

ئافرەتەکە بە بێزارییەوە گوتی:

- چۆن ڕێگە دەدەن ئەم جۆرە قێزەون و پیسانە لە ناوماندا بژین؟!

- ئیتر لە ئێستا بە دواوە ئەوان لەناوماندا نابن.

پاشان سـەرنجی دایە دۆڵـکەی هەنگـوینەکە و بـۆ لـوتکەی تاشەبەردەکە سەری بەرز کردەوە، ئافرەتەکەش هەر وای کـرد، ڕەحمان گوتی:

- وا پێ دەچێت هەنگەڵانێك لە لوتکەی تاشەبەردەکەدا هەبێت.

ئافرەتە چەکدارەکە بە منگەمنگەوە سەرنجی کوژراوەکە و پشتێنە لوولدراوەکەی تەنگەی و تەرمەکەی دا و گوتی:

- کەواتە هاتبوون هەنگوین کۆ بکەنەوە و دیارە کەوتوون.

- دەبێ هەر وابێت.

پاشان داچەمییەوە و سەرێکی پشتێنە پچڕاوەکەی گرتە دەستی و بە دەنگێکی هاوسەنگەوە گوتی:

- پشتوێنەکەیان پساوە...

ڕەحمان سەری پشتوێنە پچڕاوەکەی لە دەستی وەرگرت، سەرنجی دایە و ورتەی لە دەم نەهاتە دەرەوە، ئافرەتەکە بۆی تەواوکرد و گوتی:

- یان کەسێك پشتوێنەکەی پساندوون؟!

ڕەحمان بە سەختییەوە چاوی بڕییە چاوەکانی و ماسولکەی شەویلاگی گرژبوونەوە، بە دەنگێك ڕێك لە فیشکەی مار دەچوو، گوتی:

- چیت گوت؟! ڕوونی بکەوە!

ئافرەتەکە هەستی بە موچڕکێك کرد کە سەرتاپای جەستەی گرتەوە، لەگەڵ ئەوەش لە کۆتاییدا خۆی بینییەوە کە دەڵێت:

- ئاخر من بینیم!

مارەکە فیشکاندی.

- چیت بینی؟!
- تۆم بینی!
- تەواوی کە!
- ئەوانە هەردووکیان شایانی سزان!
- کەواتە بەدوامانەوە بوویت؟!
- لەوە ترسام غەدرت لێ بکەن، ئاخر ئەو دوو تاوانبارە نەخۆشن و ڕقیشیان لێتە!
- دوای ئەوە؟!
- بیرم لەوە کردەوە لەوانەیە لە شاخەکەوە هەڵتبدێرن و بڵێن کەوتۆتە خوارەوە!

ڕەحمان کەمێك خۆی هێور کردەوە و بە منگەمنگەوە گوتی:

- جگە لە تۆ کێی تریش دەزانێت؟!
- کەسی تر...
- ئەی تۆ چۆن زانیت ئێمە دێین بۆ ئێرە؟!
- ئەو ڕۆژەی لەناو گابەردەکان بەڵێنی ئەوەتان دا بێنە ئێرە گوێم لێتان بوو، بەڵام ئێوە تێبینیی منتان نەکرد و ئەو کاتە ئاگات لە من نەبوو.
- کەواتە گوێت لە هەموو قسەکانمان بوو؟!
- بەڵێ، هەر هەمووی، ئاخاوتنەکانیشت وایان لێ کردم مەزەندەی ئەوەم هەبێت کە دەتەوێ لە خۆت دڵنیایان بکەیتەوە و بەرەو ئەو شوێنەیان پەلکێش بکەیت، قسەکانت لەگەڵیاندا

ئەوەی ناختی ئاشکرا کرد، ئاگام لێ بوو ڕێك بە لۆژیکی نائومێدانەی ئەوان قسەت دەکرد، بێ ئەوەی باوەڕت بە قسەکانت بێت!

- ئەی چی دەبوو ئەگەر باوەڕم بەوە بووایە کە پێیانم دەگوت؟!

- ئەوە مەحاڵە، هەرگیز تۆ وەکوو ئەو دوو سەرشێتە نابیت!

- جا تۆ چووزانیت؟!

- لەبەر ئەوەی سزای تاوانەکانیانت پێ نۆشین.

- لەوانەیە بە هۆی شتێکی دیکەوە کوشتبێتیانم!

- هەرگیز ئەوە نابێت، من زۆر باش بیر و بۆچوونەکانت دەزانم!

- ئەوەی دەیڵێین شتێکە و ئەوەی لە ناخیشماندا چێنراوە شتێکی دیکەیە!

- ئەوەش مەحاڵە، هەرگیز باوەڕ ناکەم!

- هەلومەرجەکانمان هاوشێوەن و هەر ئەوانیش کەسایەتیمان گرێچن دەکەن، هۆی سەرەکیی ئەو توندوتیژییەی دژی ئافرەت هەیە چەپاندنە، هەموومان لە بێبەشیدا دەژین، هەتا بووین بە دڕندە و کێوی، من کەسێکی ڕۆژهەڵاتیی بەدبەختم، بە ناچاری و بێ خواستی خۆم لە وڵاتێك لەدایك بووم، هەموو کولتوور و بۆماوەییە ڕۆشنبیرییەکەی ئەوەیە جەللادێك بمخنکێنێت، بۆماوەییەك و پاشخانێکی سووك و چرووك و گەمژانە، وای لە هەموو خانەکانی جەستەم کردووە چەپێندراو بێت و لە بێزاری و وەڕسبووندا بسووتێم، ئاگر بگرم، ببمە

قەقنەس، من کەسێکی ئەورووپی نیم تا ئاستی نغرۆبوون تێر بم، خەریکە من لە تێنووان لە مەرگ نزیک دەبمەوە. ئافرەتیش پەرداخێك ئاوە، نایخۆمەوە چونکە پیسە.

- پیسە؟! بۆچی پیسە؟ ئەوە چ قسەیەکی پووچە! دڵنیابە پیسییەکە لە مێشکی پیاودایە. پاشان ئەی دەربارەی من چی؟! خۆ منیش ڕۆژهەڵاتیم و هەموو خانەکانی جەستەم لە بێزاری و وەڕسبووندا چەپێندراوە و ڕێك وەکوو تۆ خەریکە گڕ دەگرێت، بەڵکوو لە تۆش زیاتر، چونکە کۆمەڵگەکەمان و یاسا داڕووخاو و بێ بنەما و پووچەکانی مۆڵەتی زۆر شتی بە تۆ داوە، کەچی من هیچ، بۆیە من بە پیس و خۆت بە خاوێن و بێگەرد دادەنێیت. ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم کە تۆ پاشماوەی بیر و هزری بیابانشینەکانی، نە من و نە تۆش ناکرێ وەکوو ئەو دوو سەرشێت و گەمژانە بین.

- بەڵام خۆ ئەوان لە بەدووی بیابانەکانەوە نەهاتوون.

- ئایین مێشکی بۆگەن کردن و وای لێ کردن وەکوو بەدووی بیابانیان لێ بێت. وام لێ مەکە باوەڕ بەوە بهێنم کە تۆش وەکوو ئەوانیت. هەرگیز تۆ کاری وا ناکەیت ئاو لە بیرێك بخۆیتەوە و بەردی تێ بهاویت. ئەگەر ئەوهایت، دەبێ ڕووبەڕووم ببیتەوە!

ڕەحمان بە سووکایەتییەوە پرسی:

- ڕووبەڕووی تۆ؟! ئینجا تۆ کێیت؟!

- ئایا تا ئەو ئاستە تۆ ڕقت لێمە؟! پیشانت دەدەم من کێم!

ئەوەی گوت و بە تووڕەییەوە ویستی چەکەکەی شانی دابگرێتە خوارەوە، ڕەحمان دەرفەتی ئەوەی پێ نەدا و مەچەکی

گـرت و دەمـی نێـزەکەی بە سـەرەوژێری لەسـەر ملـی دانـا. وا هەستی کرد ئەو ئافرەتە هێزەکەی لە ئاشـکراکردنی نهێنیـیەکەی ئەمـدایە، لاوازییەکەیشـی خـۆی لەو ترسـەدا دەبینێـتەوە نەبـادا نهێنییەکەی ئاشکرا بکات، بۆیە بە دڵەڕاوکێوە پێی گوت:

- ئایا تـۆ بـاوەڕت بەوە کـردووە کە ئێـوە پێشـمەرگەن... هە؟! ئەوەی لە ئێزگە و ڕۆژنامەکانیش لە سەرتان دەگوترێـت و دەنووسرێت، تەنها بۆ بەکـاربردنی ڕۆژانەیە و هیچـی تـر. تەنهـا مشکێك دەتوانێ هەترەشتان ببات و تێکتان بشکێنێت.

ڕەنگێکـی سـووری تـۆخ سـەرتاپای ڕوخسـاری ئـافرەتە چەکدارەکەی داپۆشی و گوتی:

- ئەو فرۆکانەی دێن و بۆردومانمان دەکەن، جیـاوازی لە نێوان من و تۆدا دەکەن؟! ئەو قسە پووچە چییە دەیکەیت؟!

- بە ڕاست؟! ئەو فڕۆکـانە ئەگەر بـزانن ئێـوە لێـرەن، لەو کاتەوە لەجیاتیی ڕۆکێت و بۆمبا مشك بارانمان دەکەن!

- شـەرمە سـووکایەتیمان پـێ دەکەیـت... هە... وام زانـی کەسێکی پێشکەوتنخوازی و جیاوازی لە نێوان ئافرەت و پیـاودا ناکەیت...؟!

- مـن جیـاوازی لە نێـوان ژن و پیـاودا نـاکەم! بەڵـگەش ئەوەتە ئامادەم ڕووبەڕووت ببمەوە. بەڵام بەر لە تۆ هاتمە دەست و نێزەکەم لەسەر گەردنت دانا، ئەگەرنـا لەوانەیە تـۆ بەر لە مـن دەستی خۆت بوەشاندایە.

بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- چاوەڕێی چیتە؟! شادەماری گەردنم بپسێنە، تۆ بـراوە و سەرکەتوویت!

ڕەحمان نێزەکەی لەسەر قوڕگی لادا و بە پێکەنینەوە پێی گوت:

- ئەو کەسەم خۆش دەوێ گوێ بە مەرگ نادات و بۆی ناپارێتەوە، کێماسی و نەنگییەکەی تۆ لەوەدابوو کە زوو خۆت دا بەدەستەوە.

- چییە، دەڵێی لەوەی کردت ڕۆڵت نواند و شۆخییت کرد؟!

- گومانت لەوەدا هەیە؟!

- نەخێر... هەرگیز تۆ نابێت لە بەدووەکانی بیابان بیت، ئاخر تۆ هەتا باوەڕت بە خوداش نییە.

- ئەوەی لە تۆدا بە دڵم نییە، خۆدانەدەستی مردن بوو.

- خۆم نەداوەتە دەستی مەرگەوە، ئەوە ڕووبەڕووبوونەوەی مەرگە.

- ئەی تۆ ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆت نەداوەتە دەستی مەرگەوە؟

- من پشتی خۆم لە مەرگ ناکەم. لەبەر ئەوەی متمانەم پێی نییە.

بە هەناسەکێشانێکی قووڵەوە گوتی:

- هەر کاتێك مەرگ دێت با بەخێر بێت!

ڕەحمانیش گوتی:

- ئاخر ئەمە خودی خۆبەدەستەوەدانە... بۆسە بۆ مەرگ دابنێوە و پێش ئەوەی بگاتە سەرت بۆنی بکە، ئاخر مەرگ بۆنێکی تیژی هەیە.

به چاوی پڕ له فرمێسکەوە گوتی:

- دەزانیت؟ ئەگەر حەقت دەوێت، قسەکانت تووشی شکست و نائومێدییان کردم، هەرگیز له تۆم چاوەڕێ نەدەکرد.

- ترسم له چاوەکانتدا بە دی کرد. تەواوی ڕوخسارت خەم و ئەندێشەیەکی زۆری دەردەبڕی، زۆر ترسناك بوویت.

- ئەگەر مرۆڤ بترسێت شەرمە؟! هەموومان دەترسین.

- ترس ئەو کاتە شەرم و شوورەیی دەبێت، ئەگەر لێیەوە فێری ئاگایی نەبین.

- ئایا لێم دەترسیت؟

- بەڵێ، وەکوو تۆ چۆن له مشکێك دەترسیت.

- ئاگات له قسەکانت بێت، من مشك نیم.

- ببوره لەوەی گوتم، بە هەڵە لێم تێگەیشتیت، مەبەستم ئەوە نەبوو بە قسەکانم بیریندارت بکەم. بە دڵنیاییەوە تۆ مشك نیت.

سەرنجی ڕوخساری دا و وەك ئەوەی له ئاگاییەکەی پەشیمان بێتەوە گوتی:

- کەواتە سڵم لێ دەکەیتەوە، وەك ئەوەی من سڵ له مشك دەکەمەوە؟!

- سڵت لێ دەکەمەوە؟

- بۆچی لێم دەترسیت و سڵم لێ دەکەیتەوە؟

- نازانم.

- من بۆیە بەدواتدا هاتم بۆ ئەوەی ڕێگە نەدەم دەستت لێ بوەشێنن، کەچی تۆش له من دەترسیت؟!

- با وای دابنێین هەوڵیان دا دەستم لێ بوەشێنن و تۆ ڕزگارت کردم، کەواتە من قەرزاری تۆم؟!

- خۆ ئەگەر تۆ نەتکوشتبان، بە دڵنیاییەوە من ئەوەم دەکرد. هەرچەندە دەیانمبینی مۆتەکەی تووڕەیی هەراسانی دەکردم، ئاخر ئەوان هەردووکیان بەوپەڕی خوێنساردی و گەمژەییەوە خوشکەکانیان خەڵتانی خوێن کرد.

ڕەحمان لەو کاتەی خەریك بوو پێیەوە بنووسێت، گوتی:

- منیش خەریك بوو پێش کەمێك تۆ بکوژم.

- تۆ ڕووبەڕوو بەرەنگارم بوویتەوە.

- ڕەحمان خۆی و تەرمی هەردوو کوژراوەکەی لە یاد کرد و خرۆشانێکی هەورەتریشقەئاسا لە چاوەکانییەوە بریسکەیان دەدا و هەستی مرۆڤایەتی لێیەوە هەڵدەقوولا، بلێسەیەکی بریقەدار لە چاوەکانییەوە وەکوو تیشکی خۆر دەتریقانەوە، هەوڵی دا ماچێکی سوپاسگوزاری گەرم لەسەر گۆناکانی بنەخشێنێت، هەر کە لێوەکانی بەر گۆنای کەوتن، ئیدی ئەو لێوە گڕگرتووانەی کەوتنە پایدۆزی لێوەکانی و ئاوێتەی یەکتری بوون و ماچێکی گەرم گەیشتە لوتکە و چێژ و خۆشی کەوتنە سەما، ئیدی دەرگای لێوەکان بۆ یەکتری کەوتنە سەر گازەرای پشت و زمانەکانیش تێکەڵی یەکتری بوون، وەکوو دوو سەماکەری بالێ، ترقەی تاخم و تفەنگ و خڕەی فیشەکی فیشەکدانەکان لە کاتی کەوتنە سەر زەوی لە جۆشوخرۆشدا بوون. جەستەی ئەو مێینە تینوو و چەپێندراوە لەژێر جلە فشۆڵەکانییەوە دەرکەوتن، نێرینە چەپێندراوەکەش باوەشی پێدا کرد و توندتوند بە خۆیەوەی نووساند، ئەویش بە خانە گڕگرتووەکانی جەستەی زیاتر ئاگری تێ بەردا. ئیدی خرۆشان و ئاڵۆشیی ناخی

چەپێندراویان جڵەویان لەدەست دا و لەناویەکتریدا تووانەوە و بوونە ڕووبارێ گڕکانێکی گەرم و لە لوتکەی شاخێکی ئارامەوە هەڵپەیان کرد و کەوتنە ڕاماڵینی هەموو شتێك، ئارامی پەی پێ نەبردنەوە، تا بە تەواوی ئاڵۆشی بارگاویی ناخی چەپێندراویان بە تەواوی چکیان کرد. وەلێ وەکوو خۆیان مانەوە و بێ جووڵە هێشتا ناخیان تامەزرۆیی دانەکەوتبوو و لە خۆشیاندا پشکۆئاسا بە چێژەوە بەیەکترییەوە دەچزان، هێندەی نەخایاند جارێکی تر وەکوو دوو ماری عاشقەوماشقە بە یەکترییەوە ئاڵانەوە و ئاوێزانی یەکتری بوونەوە، لە خۆشیاندا کینگڵیان دەدا و چێژی زیاتریان لە یەکتری وەردەگرت، تۆڵەی بێبەشبوونێکی درێژخایەنی خۆیان لەو چێژە تایبەت و چرکەساتە خۆشە سەندەوە. دوای بێئاگابوونێکی زۆر و هەستکردن بە بوونی خۆیان و چوونە ناو ورووژان و شۆڕشی جەستەوە و دوای ئەوەی شیلەی هەنگوین ئاسای ناخی یەکتریان هەڵمژی، هاتنەوە باری ئاسایی و ڕوخساری قاسمیان بینی گەواهی لەسەر سەمای جەستەی خرۆشاوی هەردووکیان دەدا، چاوەکانی لەسەریان هەڵنەدەگرت، وەك ئەوەی بیەوێ شتێکیان پێ بڵێت! ژنەکە کەمێك ڕاچڵەکی و دواتر بەسەر ترسەکانیدا زاڵ بوو و بە خێرایی جلوبەرگەکانی خۆی پۆشییەوە و پشتوێنەکەی لەناو قەدە باریکەکەی شەتەك دایەوە، تاخمەکەی توند لە پشتی بەستی و چەکەکەیشی کردە شان و بە ڕەحمانی گوت: کە دوای مژینی شیلەی ئەو هەموو شەکرە سێو و چێژە خۆشە، هێشتا خەریکی مڵچوهۆڕی مژینی پارچە شەمێیەکی هەنگوینەکە بوو:

- تۆ پێش من دەکەویت و من بەدواتدا بێم، یان پێکەوە بڕۆین؟

- پێکەوە دەڕۆین، پێش ئەوەی بگەینە جێ، تۆ بەر لە من بڕۆ و دواتر من پاش کاتژمێرێک یان دووان دێمەوە. بەڵام بەرلەوەی دابرێین بۆ زانینی ڕێگای قەدپاڵەکە و گەیشتنەوە بە دەستەکە ڕێنماییت دەکەم.

- لە ڕێگەی دۆڵ و ڕووبارەکەوە دەزانم... لەو شوێنەی کە ڕووبارەکە وەکوو تاڤگە دێتە خوارەوە بەردێکی گەورەی لێیە.

- بەو جۆرە مەوداکە دەبێتە دوو ئەوەندە.

- بەڵام مسۆگەر و ئارامە.

- دەی قەیناکا، چۆنت پێ باشە.

ئیدی هەردوو تەرمەکەیان بەجێ هێشت و مەودایەکی درێژیان بڕی بێ ئەوەی بچنە ناو دۆڵەکەوە. زۆر بە هێواشی و لەسەرخۆ و بە بێدەنگی دەڕۆیشتن و باسی هیچیان نەدەکرد، چەکدارە ئافرەتەکە ناوەناوە ئاوڕێکی لە تاشەبەردەکان دەدایەوە، تا بە تەواوی دوور کەوتنەوە و ئەو تاشەبەردانە وەکوو پاکەتە جگەرە بە تەنیشتی یەکەوە دەهاتنە بەر چاو.

- تا ئێستاش لێم دەترسیت؟

ئافرەتەکە لە ناکاو و دوای بێدەنگییەکی زۆر وای گوت، ڕەحمانیش بێ ئەوەی زۆر گوێی بداتێ گوتی:

- لە دوای ئەوەی لە نێوانماندا ڕووی دا، ئیدی لێت ناترسێم.

ئافرەتەکە قیژاندی بەسەریدا و چاوەکانی زەق بوونەوە:

- مەبەستت چییە؟! وای چ زۆڵێکیت! چییە هەڕەشەی

ئابڕووچوونم لێ دەکەیت؟! تۆ ئەوە بکە شەرت بێ منیش دەتکوژم و خۆمیش دەکەمە قوربانی گوللەیەك.

ڕەحمان ئیستێکی کرد و بە داخەوە گوتی:

- ئەرێ تۆ ئەم بیرۆکانە لە کوێوە دەهێنیت؟! گوێ بگرە... من بەرد فڕێ نادەمە ناو بیرێکەوە چ ئاوم تێدا خواردبێتەوە یان نا.

- کەواتە چ مەبەستێکت هەیە و دەتەوێ چی بڵێیت؟! وا هەست دەکەم مەبەستت ڕوون بێت، وەك ئەوەی دەتەوێ ئاماژە بەوە بکەیت کە هەر هەڵەیەك لە منەوە ڕوو بدات لەوەی بینیم، تۆش ئەوەی لە نێوانمان ڕووی دا ئاشکرای دەکەیت!

- دە بەسسە کۆتایی بەم قسە قۆڕانە بهێنە. چ بیرۆکەی گەمژانەت بە مێشکدا دێت؟! ئەو قسانەت مایەی سووکایەتیکردنن بۆ من. بڕۆ بێ منەت بە چیت بینیوە بۆیان بگێڕەوە، هەرگیز ئەوەی لە نێوانماندا ڕووی دا لای کەس باسی ناکەم، وای ئێوە لەم بارەیەوە چەند هەستیارن!

- لەبەر ئەوەی کۆمەڵگەکەت کۆمەڵگەیەکی پیاوسالاریی قێزەون و بێکەڵکە.

- باشە، من چ پەیوەندییەکم بەو قێزەونییەوە هەیە، تا ئێستا بەو گرێکوێرەیەتم نەزانیوە.

- گرێکوێرەی من یان هی کۆمەڵگەکەت. بەهەرحاڵ، ئەوەی لە نێوانماندا ڕووی دا شتێك نییە مادام دڵنیام دەکەیتەوە. ترسەکانمان بەرانبەر یەکتری یەکسان بوون، ئێستا منیش لێت دەترسێم وەکوو چۆن تۆ لێم دەترسیت!

- پێم گوتی من لێت ناترسێم.

- دەزانم ئێستا لێم ناترسیت، لەبەر ئەوەی نهێنییەکم دەزانیت، وەك ئەوەی منیش نهێنییەکی تۆ دەزانم... ئێستا جیاوازیی نێوان خۆم و خۆتت بینی لەم کۆمەڵگە قێزەونەمان؟! تۆ دۆن جوانیت و منیش کەسێکی پیس و بەدڕەوشت!

- باشە چی بکەم بۆ ئەوەی ئاسوودە و ئارامت بکەمەوە؟!

پاشان لوولەی تفەنگەکەی نایە ژێر چەناگەی و گوتی:

- ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێیت لە مێشکمدا بێت، هەر ئێستا لە بەرچاوت دەیپژێنم، چونکە هیچ پێویستیم بە مێشکێکی وا سپڵە نییە، هەر ئێستا وەڵامم بدەرەوە، ئایا تا ئەو ئاستە بە زۆڵ و نمەکحەرامم دەزانیت؟!

ئافرەتەکە پڕ بە چاوەکانی تەماشای کرد، ئاسوودەییەك باڵی بەسەر ڕوخساریدا کێشا و بزەیەکی لەرزۆك لێوەکانی گرتەوە و گوتی:

- لە ناخەوە هەست بە ڕاستگۆییت دەکەم، کە هەر بە ڕاستی و بێ دوودڵی دەتەوێ مێشکت بپژێنیت، مرۆڤی وەك تۆ هەرگیز نابێ سپڵە بێت، وات لێ کردم شەرم لە مەترسییەکانم بکەم!

ڕەحمان منگەمنگێکی کرد و گوتی:

- تۆ ئەمرۆکە دووەم جارە ژیانی من ڕزگار دەکەیت.

لەسەرخۆ و بێ گوێدانە شتێك گوتی:

- من ژیانتم ڕزگار نەکردووە، لەبەر ئەوەی هەر لە بنەڕەتەوە هیچ شتێکت بەسەر نەهاتووە.

- جاری یەکەم ئەو کاتەی بەدوامدا هاتی نەبادا ئەو

دووانەی بکوژی خوشکەکانی خۆیان بوون منیش بکوژن.

- بەڵام نەیانتوانی دەستت لێ بوەشێنن.

ڕەحمان بەردەوام بوو و گوتی:

- جاری دووەمیش ئێستا، لەبەر ئەوەی هەر بە ڕاستی ئەگەر پێچەوانەی ئەوەی گوتت بتگوتبایە، یەکسەر پلم پێوە دەنا.

- تۆ شێتیت؟!

- لەوانەیە...

بەرلەوەی لە یەکتری داببڕێن گوتی:

- ئایا بە دیداری یەکتر دەگەینەوە؟!

- ئەگەر بتەوێت.

- دەمەوێ بە یەکتری بگەین، بەڵام لەوەی ڕووی دا زیاتر داوام لێ مەکە.

بە سەرسوڕمان و کەمێك تووڕەییەوە پرسی:

- مەبەستت چییە؟!

- مەبەستم ئەوەیە ناتوانم خۆشتم بوێ... نە ئێستا و نە ئایندە.

- چووزانی؟

- لە خەیاڵمدا ئافرەتێك هەیە، کە لەوانەیە هەرگیزیش نەیبینمەوە. بەڵام هەر بە دوایدا دەگەڕێم... ئێستا تێگەیشتیت؟!

- تێگەیشتم... خۆ تۆ دۆن جوان نیت ژنان بەدواتدا شەیدا بن؟!

ئەمەی بە کەمێک پۆز و لە پشت لووتییەوە گوت و بە لووتبەرزییەکەوە سەری هەڵبڕی و لێیدا ڕۆیی، بێ ئەوەی ئاوڕێك لە دوای خۆی بداتەوە.

ڕەحمان لە شوێنی خۆی ڕەق بوو، دەمەبەشە دایگرت. سەرنجی لە ڕاوەستان و ڕۆیشتنەکەی دا و لەگەڵ خۆی و بە هەمان شێوە لاسایی کردەوە و گوتی: "تۆ دۆن جوان نیت، تاکوو ژنان بەدواتدا شەیدا بن!"

پاشان تفێکی بەدوایدا کرد و بە منگەمنگەوە گوتی:

- دەزانم دۆن جوانی ئاژەڵت دەوێ!

## بەشی بیست و هەشتەم

بەرلەوەی ڕەحمان لە بارەگای دەستەکە نزیك بکەویتەوە، لە دوورەوە گوێی لە دەنگی یەکێك بوو لقەدارێکی وشکی لەسەر زەوییەکە کەرت دەکرد، دوای کەمێك بۆی دەرکەوت، ئەوە مامۆستا عومەرە تەورەکەی بە دەستەوەیە و دار شەقوپەل دەکات. کە زیاتر لێی نزیك کەوتەوە لە ناکاو هەستی بەوە کرد کە وەشاندنی تەورەکەی توندتر و دژوارتر دەبێت و بەر هەر شوێنێکی دارەکە بکەوێت شەقی دەکات، بەوەندەشەوە نەوەستا هەتا سەری تەورەکە لە قەدی دارەکە چەقی و کلکەکەی شکا. مامۆستا عومەر لە لێدانی کلکە شکاوەکەی تەورەکە کە لە دارەکە چەقیبوو، بەردەوام بوو، لێدانێکی وا دژوار و سەخت هەر نەبێتەوە، بە زمانی کوردییش هاواری دەکرد، وەلێ ڕەحمان هیچی لێ تێنەدەگەیشت، بەڵام هەر کە گەیشتە بەرانبەری بۆ هێورکردنەوەی هاواری بە سەردا کرد، کاتێك مامۆستا عومەر وەڵامی نەدایەوە کە لەوانەیە گوێی لێی نەبووبێت، ڕەحمان بە توندی باوەشی پێدا کرد، بە تایبەتی ئەو کاتەی بە مشتەکۆڵە و هیستریاوە بەردەوام بوو لە لێدانی کلکە شکاوەکەی تەورەکە، دوای ململانێیەکی زۆر کە زیاتر لە شەڕ و زۆرانبازی دەچوو، ماسولکەکانی مامۆستا عومەر خاو بوونەوە و لەسەر زەوییەکە دانیشت و لە شەکەتیدا هەناسەبڕکێی بوو، لە دوورەوە گوێت لە دەنگی هەناسەی دەبوو، وەك ئەوەی بگرییێت و چاوەکانیشی پڕ لە فرمێسك بووبوون.

ڕەحمان لە کاتێکدا لەوپەڕی سەرسامیدا حەپەسابوو، بە منگەمنگێکەوە گوتی:

- هاوڕێم لەسەرخۆ بە، چییە بۆ وا لە خۆت دەکەیت، چی ڕووی داوە؟!

لەناو هەنسکە شەکەتەکانیدا گوتی:

- تکایە وازم لێ بێنە.

بێدەنگییەك باڵی بەسەرداکێشان، دواتر ڕەحمان بیری کردەوە: "تۆ بڵێی ئەویش بەوەی زانیبێت کە بە سەر قاسم و عەولادا هاتووە، وەك ئەوەی ئەو ئافرەتە چەکدارە زانی؟! تۆ بڵێی هەست بەوە بکات کە کەمتەرخەم بووە لەوەی هەوڵی ئاساییکردنەوەی نێوانمانی نەداوە؟! بەڵام کوشتنی ئەو دووانە پێویست بەو هەموو هەڵچوونە هیسترياییە دەکات؟!

ڕەحمان بە منگەمنگ و بە دەنگێکی زۆر هێمنەوە گوتی:

- دە پێم بڵێ چ شتێك لە دونیا شایانی ئەو هەموو.....

مامۆستا عومەر قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- ئەمە هەرگیز قسەی تۆ نییە ڕەحمان!

- ئیتر لەمڕۆ بەدواوە ئەوە قسەی من دەبێت.

- تۆ هیچ نازانیت.

ڕەحمان دیسان بە منگەمنگێك و بە سەرسوڕمانەوە:

- چی بزانم؟ دەزانی نیگەرانت کردووم!

- دڵم خەریکە دەسووتێت، ئەو گڕەی لە ناخمدایە ئەگەر بەسەر شاخێکیدا بکەیت دەیتوێنێتەوە. ڕەحمان بێدەنگ بوو و بیرۆکەکان مێشکیان داگیر کرد: "تۆ بڵێی عاشق بووبێت؟ ئەوە بە عەقڵی کێدا دەچێت، ئەوەی لەگەڵ مندا بووبێت دڵخوازەکەی بووبێت؟! ئەی هاوار، ئایا دەبێ ئەو هەموو شتێکی

زانیبێت کە لە نێوانماندا ڕووی دا؟ ئایا دەبێ ئەویش بەدوامدا هاتبێت و شوێنپێی هەڵگرتبم؟ تۆ بڵێی ئەویش بینیبێتی کاتێك ئەو دووپشکانەم لەناو بردا! وای چ کارەساتێك دەبێت، ئەگەر ئەویش زانیبێتی... هە... ڕاوەستە... دیارە کەسێك نەماوە لەم شاخە بە کارەکەمی نەزانیبێت... هەر لە ئێستاوە کارەکەم ئاشکرا بوو. ئەوە چی بەسەر هاتووە، هەرگیز بەم شێوەیەم نەبینیوە... خۆ وا دەگرییێت!".

ڕەحمان وازی لێ هێنا تاکوو بە گریان خەمەکانی بەتاڵ بکاتەوە. ئەویش بۆ چەند ساتێکی دیکە لە بێدەنگییەکەی بەردەوام بوو، دەستی بە بیرکردنەوە کرد: "بەڵام ئەو شایانی ئەوە نییە بەو جۆرە لە پێناویدا ئازار بچێژێت، بەڵکوو شایانی ئەوە نییە لە پێناویدا تەنانەت یەك دڵۆپە فرمێسکیش بڕێژێت، ئەو کوردە و گەنجێکی قیتوقۆزە، هەموو کچە جوانە گوندنشینەکان بە ئاواتییەوەن... چییە ئەو شێت بووە دەستبەرداری ئەو هەموو جوانکیلانە دەبێت و بە پەرۆشەوە بە دوای ئەم ئاژەڵە کەوتووە، کە جگە لە دۆن جوان کەس چاوی تێر ناکات".

لە کۆتاییدا دوای ئەوەی کەمێك دەروونی مامۆستا عومەر ئارام بووەوە، دەستی خستە ژێر کراسەکەی و کیسە نایلۆنێکی گەورەی دەرهێنا، کە نزیکەی دووسەد پەڕەیەکی تێدا بوو، بە دەستێکی نیگەران و کەمێك لەرزۆکەوە کاغەزەکانی بۆ ڕەحمان درێژ کرد، بە دەنگێکی نزمیش منگەمنگێکی کرد و گوتی:

- چاوێك بەو کاغەزانەدا بخشێنە.

لە سەرەتادا ڕەحمان چاوێکی خێرای بە ژمارەیەکی زۆری کاغەزەکاندا خشاند تا بزانێت چییان تێدایە و باسی چی دەکەن،

پاشــان وردتــر و بە دیقەتتــر لێیــان ورد دەبــووەوە، ســەرنجدانی هەندێکیشیان درێژەی دەکێشا و زیاتر تەماشای دەکردن.

- تۆ ئەم تابلۆیانەت کێشاوە... وایە؟

- هەرگیز نەخێر... من عاشقی وێنەکێشانم بەڵام نایزانم.

- ئەم هونەرمەندە بلیمەتە!

مامۆستا عومەر لەسەرخۆ و بە منگەمنگێکەوە:

- بەڵێ، بە ڕاستی هونەرمەندێکی بلیمەتە.

- ئەی خوایە ئەمە چ تابلۆیەکی تۆقێنەرە؟!

- ڕات چییە دەربارەی ئەوەی تێیدا هاتووە؟

ڕەحمانیش بە منگەمنگێکەوە و زەردەخەنەیەکی سەرسامانە ڕوخساری داپۆشی:

- ئەمە داهێنــانە داهێنــان هەر بە ڕاســتی داهێنــانە... بە کارەکانی تەواو سەرسامم، ئەم هونەرمەندە لە شێوەی کەمە.

- بە وردی سەرنج لەو تابلۆیەی دواتر بدە.

- ئەمەیان؟

- نەخێر، ئەوەیان نا... ئەوەی دواتر... نا نــا ئەمەشــیان نــا... بەڵێ ئەوەیان... کەمێك سەرنجی بدەرێ.

دوای چرکەساتێك ڕەحمان بە سەرسامییەوە:

- بە ڕاستی دانسقەیە، تۆ سەرنج لە چاوی ئەو پیــاوە پیــرە

بده، چەند بە وردی لە یەك كاتدا خەم و خۆشی تێدا بەرجەستە كردووە.

- زێدەباری دوودڵی و پەرۆشی، دوای چاوەڕوانییەكی زۆر و درێژ.

- هەر بە ڕاستی ئەو چاوە خەریكە دەدوێت، ڕێك وەكوو چامەیەكی شیعری وایە.

مامۆستا عومەر گوتی:

- نازانم چامەیەكی شیعرییە و لە شێوەی تابلۆیەكدا بەرجەستەی كردووە، یان لە بنەچەدا تابلۆیەكە و لەسەر شێوازی چامەیەكی پڕاوپڕ لە ئەندێشە و خەم و ئازار و نەهامەتییەكانی ژیان دایڕشتۆتەوە. تۆ تەماشای پەڕەكەی دواتر بكە... ئەم چامەیە ڕێك لەسەر ئەم تابلۆیە پەیڕەو و پیادە دەكرێت، هەر دەڵێی هێماكانی ناو تابلۆكەن و بە زمانێكی ئەدەبیانەی دانسقە گرێچنێكی وەستایانەیان بۆ كراوە. وای لەو دەربڕینە جوانانە... ئەم داهێنەرە خۆ شاعیریشە!

ڕەحمان بە پەرۆشەوە گوتی:

- ئەمە دەبێ كێ بێت؟! هەر بە ڕاستی لە ڕیزی هونەرمەندە جیهانییەكاندایە، بەڵكوو من بۆ خۆم لە زۆرێك لەوانیش بە باشتری دەزانم، ئەوانەی شتێكی ئەوتۆ لە تابلۆكانیان تێناگەم.

- ئێستا ئەم مرۆڤە دەگمەن و هەست ناسكەت بینی؟!

دیسانەوە ڕەحمان گوتی:

- ئەمە كێیە؟! بە دڵنیاییەوە ئەگەر یەكێك بێت لەوانەی

لەگەڵ خۆمانن، هەر ئێستا بە سەرسامییەوە لە بەردەم هەمووانـدا پەنجەکـانی دەسـتی مـاچ دەکەم و لەجیـاتیی ئەویـش نـۆرەی دارشکاندن و هەموو کارەکـانی دیـکەی لە ئەسـتۆ دەگـرم، کە دەست و پەنجەکانی دەڕووشێنن.

مامۆسـتا عـومەر بە خەم و داخێکـی زۆر و لەژێـر لێـوەوە گوتی:

- ئەی چی دەبێت ئەگەر لەگەڵماندا نەژییێت، یان با بڵێین یەکێك بێت لە دوژمنەکانمان.

- لە سۆنگەی ئەو هونەرە بـاڵایەی هەیەتـی، هەر دەسـتی مـاچ دەکەم. جـگە لەوە مرۆڤێکـی وا مـرۆڤ هەرگیـز نـابێتە دوژمنی کەس، ئاخر ئەوە هونەرمەندە، شاعیرە.

- ئـاخر هەر ئەوەیە دڵـم لەتـلەت دەکـات و لە نـاخەوە دەمگرییێنێـت... بە دەسـتە نەفرەتییەکـانی خـۆم ئەم هونەرمەنـد و ئەدیب و نووسـەرەم کوشـت... ڕەحمـان بەم دەسـتە شـکاوانەی خـۆم. چەنـد خـۆزگەم دەخواسـت بەر لە مـن ئەو چەکەکەی ئاڕاسـتەی مـن بکـردایە و پلـی پێـوە بنـابووایە، ئەو ئەگەر وای بکردبـووایە، ئێسـتا ئەو هەمـوو خەم و ئـازار و ئەشـکەنجە دەروونیـیەم نەدەچەشـت، زۆر بـۆی خەفەتبـارم و نەفـرەت لەو هەلـومەرجە دەکەم کە ناچـاری کـردین ڕووبەڕووی یەکتـر بجەنگین!

- ئێستا لە ئازارەکەت گەیشتم... تێگەیشتم لە ئازارەکەت.

مامۆستا عومەر لە قسەکانی بەردەوام بوو و گوتی:

- کاتێـك لەم چـالاکییەی دواییمانـدا دزەمـان کـردە نـاو مـۆڵگەکەی دوژمـن، زۆربەیـان لە شـیرین خەودا بـوون، لە

چاوترووکانێکــدا پەلامارمــان دان، وەك دەزانیــت لەو جــۆرە چــالاکی و چرکەســاتانەدا هەڵلایەکــی وا ڕادەبــێ، هەمــووان سەریان لێ دەشێوێت، هەندێکیان پەلاماری چەکەکانیان دا و لە دەرگا و پەنجەرەکانەوە بەر دەستڕێژی گوللەیان دایـن، ئـێ لەو چرکەساتانەدا، ئەگەر نەکوژیت دەکوژرێیت، مرۆڤ ناچارە بـۆ مانەوەی خۆی گولله بە سینگی بـزای خـۆیەوەش بنێـت، بۆیە بەپێی ئەو نەخشە و پلانەی دامانڕشتبوو بە دەستڕێژیی چڕی ئێمە ئەوان بێدەنگ کران، هەر هێندەم زانی خـۆم لە بەردەم یەکێـك لە ژوورەکــان بینیــیەوە و ئاگربــارانم کــردن و هەرچــی لەنــاو ژوورەکەدا بـوو کـوژران و تێـدا چـوون، ئەم شـاعیرەی نـاوی ســیروانە، لەو ژوورەدا بــوو، هەمــوو ئەوەی باســی دەکەم لە خولەکێــك یــان کەمتــر لە دوو خولەکــدا ڕووی دا، هەمــوو ئەوانەی لە ژوورەکەدا بـوون بەم دەسـتانەی مـن لەنـاو چـوون، وەکوو گوتم ئەم کوڕە بلیمەتەش لەنـاو ئەوانـدا بـوو، بەرلەوەی وەکوو کەسێکی پەرکەمـدار خۆیشـی نەزانێـت چـی دەکـات و بەرلەوەی بەلادا بێـت لە چرکەسـاتێکدا بینـیم بە پەشـۆکاوییەوە دانیشتووە، چەکی بەدەستەوە نەبوو، هێشتا حەپەسابوو نەیـدەزانی چی بکات، لای ڕاستییەوە جانتـایەکی بچـووك و لە بەردەمیـدا کۆمەڵە کاغەزێکی پەرشـوبڵاو هەبـوون، لەو درەنگـانی شـەو و دۆخە هــێمن و ئــارامەدا کە هەمــووان خەوتــوون، نــازانم دەینووسی، یان لەوانەبێ بیـری لە کێشـانی تـابلۆیەك کـردبێتەوە، خۆشـم نـازانم لەو چرکەسـاتەدا بـۆچی ئەو جانتـا بچـووکەی سەرنجی ڕاکێشام و دەستم بۆ برد و بێ ئەوەی هەست بە خـۆم بکەم و لەو دۆخەکە ترسناکەدا، دەسـتم کـرد بە کـۆکردنەوەی کاغەزە پەرشوبڵاوەکانی بەردەمی، خـۆزگە ئەوەم نەکردبـووایە، ئـاخر ئەو کـاغەزانە و ئەو تابلۆیـانەی بەردەمـت بـۆ هەتاهەتـایە ئاگریــان لە نــاخی دڵــم بەر دا و هەتــا بمێــنم چــڕە دووکەڵــی قرچەیان یەخەی هزر و هەڵکڕووزانی ناخم بەر نـادەن، خـۆزگە

•

ئەوەم نەکردبووایە... خۆزگە، بەڵام کەنگێ داری خۆزگە بەردار بووە، ئاخر ئەگەر ئەم کاغەزانە نەبوونایە، وەکوو جارەکانی تر ئاسایی بەسەرمدا تێدەپەڕی. دوای تێپەڕبوونی دەوروبەری هەفتەیەك بەسەر چالاکییەکەماندا بیرم بۆ لای ئەو جانتا بچووکە چوو کە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم، لەگەڵ کەلوپەلەکانی خۆم لە ژوورەکەماندا بە لقەدارێکی بنمیچەکەوە هەڵمواسیبوو. هێنام و لە بن درەختێك دانیشتم و کەوتمە پشکنینی جانتاکە، پەڕاوێکی بچووك وا دیار بوو یادەوەریی خۆی تێدا تۆمار کردبێت، لە ڕێگەی خوێندنەوەی ئەو پەڕاوە بچووکە زانیم دواناوەندی تەواو کردووە و نەیتوانیوە بچێتە زانکۆ. بۆیە بە ناچاری ڕووی لە خزمەتی سەربازیی زۆرەملێیی کردووە، تەنها چەند مانگێکیشی ماوە خزمەتەکەی تەواو بکات، لە شاری هەولێریش دادەنیشێت و لە خێزانێکی زەحمەتکێش و دەستکورتیشە، بۆ نەگبەتی باوکی هەزار و یەك ئەملا و ئەولایشی کردووە، تاکوو کوڕەکەی لە باشووری عێراقەوە بۆ بگەڕێننەوە ئێرە، داخۆ بۆ ئەمەش لە چەندین بەرپرسی سووك و چرووك پاڕاوەتەوە، هەر بە هۆی دەستکورتییەکەیشییەوە ئەو کاتەی لە باشووری عێراق بوو، دوای چەندین مانگ ئینجا توانیویەتی بە مۆڵەت سەردانی کەسوکاری بکات، دەزانی باوکی کوردە و دایکیشی عەرەبە؟ هەر ئەو کوڕەیشیان بۆ مابووەوە دوای ئەوەی کوڕە گەورەکەیان لە بەرەکانی جەنگی عێراق و ئێران بووبووە قوربانی خواستەکانی ئەو دیکتاتۆرە سەرشێتە. ترسی گەورەی دایك و باوکیشی لەوەدا بوو کە ئەمیش وەك براکەی لەدەست بدەن. بۆیە کەس نامێنێت باوکی پەنای بۆ نەبات و لێی نەپاڕێتەوە بۆ گەڕاندنەوەی کوڕەکەی بۆ ئێرە، هەر لە موختاری گەڕەکەوە، تا دوا جار بە ناچاری لە بەردەمی ئاغا کڕنۆشی برد، ئەو ئاغایەی کە هەرگیز داوای لای سەرۆك جاشەکان ڕەتکردنەوەی نەبوو، تا لە کۆتاییدا خاوەن دەسەڵاتەکان توانییان

بیگەڕێننەوە و لەم ڕەبایەیەی دابنێین کە ئێمە دەستمان بەسەردا گرت و ئەو کارەساتە ڕووی دا. ئەو کاتێک گەڕابووەوە ئێرە ناوەناوە لە کۆتایی هەفتەدا سەردانی ماڵەوەیانی دەکرد، ئەو باوکە جگەرسووتاوەی هەرگیز چاوەڕوانی ئەم خەمە کوشندەیەی نەدەکرد. خۆزگە هەر نەگەڕابووایەتەوە ئێرە، دەزانی بێزم لە خۆم و هەموو شتێك دەبێتەوە، ئەوانیش وەکوو ئێمە چەوساوە و هەژار و نەدارن. وای ئەو کەسە چەند ڕاستی فەرمووە کاتێك گوتویەتی: "لە جەنگدا خەڵکانێك یەکتری دەکوژن، هەر یەکتریش ناناسن، لە پێناو کەسانێك کە یەکتری دەناسن و شەڕیش لەگەڵ یەکتریدا ناکەن!" ئاخ ڕەحمان ئەگەر دەزانیت چەند ئازار دەچێژم و خەم دەخۆم.

ڕەحمان بە هێمنییەوە:

- خۆت سەرزەنشت مەکە، ئەگەرنا ناتوانی لێرە بژیت، لە بیری کە.

- هەرگیز ناتوانم ئەوە لە بیر بکەم کە ڕووی دا.

- بەڵام ئێمە لە جەنگداین، یان دەکوژین، یان دەمانکوژن، هەڵبژاردەی سێیەممان لەبەردەمدا نییە.

- لەم حاڵەتەدا بژاردەیەکی دیکەم دەبێت! ئەرێ ڕەحمان تۆ هەست بەوە ناکەیت ئەوانەی جەنگ هەڵدەگیرسێنن، وەك ئەو کەسە وان چەکێك هەڵدەگرێت و بە چێژ و خۆشییەوە ئاراستەی دوو کەسی هەژاری دەکات کە یەکتریش ناناسن، لەژێر هەڕەشەی لوولەی تفەنگەکەیدا ناچاریان دەکات بەر بینە وێزەی یەکتری و تا ئاستی ئەوەی یەکێکیان ئەوەی تریان لەناو ببات بجەنگن، ئێمەش ئێستا ئەوهاین؟!

- ئەی چیمان لە دەست دێت بیکەین؟ ئەم زەوییە هیچ کەسێکی تێدا ناژێت، جگە لە دڕندەکان نەبێت، خۆ ئەگەر ببیتە

کەرویشك، یەکەم ڕێوی کە تووشت دەبێت لەتوپەتت دەکات و دەتخوات. دەی وەرە پێم بڵێ چۆن لەگەڵ ئەم دڕندانەدا هەڵدەکەیت و دەژیت؟ ئەگەر داوای ئاشتی و ئاسوودەیی بکەیت، ئەوا پێیان دەنێنە سەر گەردنت و دەبێ هەر بە کۆیلەیی و زەلیلی بژیت، بەڵکوو هەتا ئەگەر بەو کۆیلەیی و زەلیلییەش ڕازی بیت لە پێناوی ئەوەی تۆزێك ئاسوودە و ئارام بیت، لە کۆتاییدا تۆی هەژار و ئاشتیخواز خۆت دەبینیتەوە ڕاپێچی جەنگێکت دەکەن هیچ بەرژەوەندییەکی تۆی تێدا نییە و دەبێ شەڕ لەگەڵ کەسانێکی هاوشێوەی خۆت هەژار و بەدبەخت بکەیت، کە نەدەیانناسی و نەدەتناسن.

مامۆستا عومەر بە خەمێکی بێئەندازەوە:

- ئەگەر شەڕ لەگەڵ دڕندە کێوییەکان بێت و بیانناسم ئەوا بە دڵنیاییەوە پێشوازیی لێ دەکەم و هەرگیز بۆ ساتێکیش ویژدانم ئازارم نادات، بەڵام کاتێك کەسێکی هەست ناسك و بێتاوان و لەوپەڕی هەژاری و نەداریدا بە دەستی من دەکوژرێت، بەرگەی ئەوەیان ناگرم. ئاخر ڕەحمان خۆت دەزانی ئێمە لە بنەڕەتدا لە پێناوی ئەو جۆرە کەسە باش و بێتاوانانەدا شەڕ دەکەین و دەجەنگین.

- هاوڕاتم، ئەگەر دڕندەیەك بکوژیت، جیاوازە لەوەی مرۆڤێك بکوژیت کە لە بنەڕەتدا خۆی قوربانی بێت. بەڵام جەنگە و لە جەنگیش هەر دەبێت قوربانی هەبێ.

- پێت باشە خۆت یان کوڕێکت ببنە قوربانیی جەنگێکی وا قێزەون؟!

- هەڵبەتە ڕێگە نادەم، بەڵام تۆ پێم بڵێ چیمان لە دەست دێت؟ گەمەیەکی پیس و ترسناکە و لە ئێمە گەورەترە!

- ئاخ ڕەحمان ئەگەر حاڵی دایك و باوكیت دەبینی؟

- دایك و باوكی كێ؟!

- ئاخ ڕەحمان، چییە تۆ لەگەڵم نیت! بیرت لە كوێیە؟! من پێویستم بە كەسێكە گوێم لێ بگرێت، بە كەسێك ئازاری ویژدانم كەم بكاتەوە... مەبەستم دایك و باوكی شاعیرە هونەرمەندە قوربانییەكەی دەستی خۆمە... ئەو قوربانییەی ئێستا تۆ بە دەستەكانی خۆت هەستە تۆماركراو و كێشراوەكانیت لە هۆنراوەی جوان و تابلۆی سەرنجڕاكێش بە دەستەوە گرتووە.

- هیچ هەواڵێكت لێیانەوە پێ گەیشت؟!

- خۆم بینییانم، لە ڕێگەی ئەو نامانەی لەناو جانتا بچووكەكەیدا بوو ناونیشانەكەیانم زانی و بە نهێنی چووم بۆ هەولێر.

- چی...؟! چۆن و بۆچی؟!

- نازانم. هەندێك پارەم لەگەڵ خۆمدا برد. ئەوەی هەمبوو، لەگەڵ قەرزكردنی بڕە پارەیەكی دیكە لەو هاوڕێیانەی جگەرە ناكێشن، تا ببووە بڕە پارەیەكی باش، پاشان ڕووم لەو ماڵە كرد كە دایك و باوكی قوربانییەكەمی تێدا نیشتەجێ بوون، ماڵەكەیان بەڵگەی هەژاری و نەدارییان بوو، لە ناكاو هاتمەوە سەرخۆ لەوەی پێیان دەڵێم. هەرگیز ئەوەم بە خەیاڵدا نەهاتبوو، ڕاستە من بە مەبەستی یارمەتیدانیان چووم بۆ لایان، وەلێ تا ئێستا من بكوژی كوڕە تاقانەكەیانم. چییان پێ بڵێم؟ من كێم و بۆچی هاتووم؟! ئەی چۆن كوڕەكەیانم ناسیوە؟ ئایا بڵێم هاوڕێیەكی سەربازیم و لەگەڵیدام، شێوەی من لە سەرباز ناچێت. بە تایبەتی ئەو قژە درێژ و لوول و گڤەی من، كە ئەوەم هاتەوە یاد، ئیدی بە نێو كوچەوكۆڵانە تەسكەكانی شاردا

کەوتمە سووڕانەوە، پاشان کەوتمە پایدۆزی گەڕان بە دوای سەرتاشخانەیەك، بۆ ئەمەش ناچار بووم بچمە شەقامە گشتییەکە، بەو ئومێدەی سەرتاشخانەیەك بدۆزمەوە، دانەیەکم دۆزییەوە کەوتبووە سەر دووڕیانەکە، بوێریی ئەوەم تێدا نەبوو بچمە ناوییەوە، گلۆپەکانی ناوی ڕووناك و ئەوانەی لەوێش دانیشتبوون زۆر بوون، منیش خۆم لە خەڵکی دەپاراست، چونکە پێم وابوو کە زۆربەیان جاش و بەکرێگیراو و ئاسایشی نهێنیین و دەموچاو و ڕوخساری هەموو خەڵکی شاریان دەناسی، نەخاسمە کڵاوسوورەکان —ئینزباتی عەسکەری-، ئەوانەی کەسێك لە چنگیان دەربازی نابێت، ئەگەر پرسیاری ئەوەی لێ بکەن لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەڕوات و پێداویستییەکانی خۆناساندنی پێیە یان نا؟! منیش هیچ یەکێکم لەو شتانە نەبوو، بۆیە لەو سەرتاشخانەیە دوور کەوتمەوە، بەرلەوەی یەك هەنگاو بۆ ناوی بنێم، هەستێکم لا پەیدا بوو کە ئێستا هەموو ئەوانەی سەر شۆستەکە دەمناسنەوە، ئەو سەرنجانەی لێیشیان دەترسام و خۆم لێ لادەدان، دەبینم بە دوامەوەن و چاودێریی هەنگاو بە هەنگاوم دەکەن، وەلێ هێشتا جگە لە چەند هەنگاوێکم نەهاویشتبوو، گۆشەیەکی بچووکم بە دی کرد، لە دوو مەتر دووجا زیاتر نەدەبوو، پیرە پیاوێك لە بەرانبەر ئاوێنەیەکی کۆنی گۆشەکەلدا دانیشتووە، پێم وابوو ئەوە یەکەم و کۆنترین سەرتاشی ئەم شارەیە و ئەوانەی کاتی خۆی کڕیاری بوون و سەریان لا چاك دەکرد، هەموویان نەماون و ماڵئاواییان لە ژیان کردووە، دەبێ ماوەیەکی زۆریش بێت کەس هاموشۆی دوکانەکەی نەکات، ئەوەتانێ من لە ناکاو دەبمە مێوانی و داوای سەرچاککردنی لێ دەکەم، پێ دەچێ ئەم سەرتاشە دێرینەی شار، توانای ڕێکردنی لەگەڵ کاروانی سەرتاشە هاوچەرخەکان و ئەو مۆدێلانەی کە گەنجان دڵیان دەیخوازێت

نەبووبێت، بۆیە وا بەرکەنار بووە و کەسێك بە لایدا نایەت، وا دیارە خۆی داوەتە دەستی چارەنووسی و هەتا لە سەرنجدانی ئەو سەرتاشخانە ڕووناکەی بەرانبەریشی بێزار و وەڕس بووە کە زۆربەی کڕیارەکانی ئەمیشیان بۆ خۆی پەلکێش کردووە، بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت کە نەخێر هێشتا ئەمیش دڵخوازی خۆی هەیە و زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی دێنە لای و سەریان چاك دەکەن، لە چین و توێژە هەژار و نەدار و بەشمەینەتەکانی شار و دەوروبەرین، لەوانەی دەسفرۆش و کۆلکێش و ڕۆژانە بە کاری بۆیەکردنی پێڵاو و جۆرەها کاری دیکەی دەستگێڕییەوە خەریکن، دوای سڵاو، هەر کە لەسەر تەختی دانیشتنە کۆنەکەی دانیشتم، دەستی دایە ئامێرە کۆنەکەی سەرتاشین، کە باوەڕ ناکەم هیچ کەسێك لەم ڕۆژگارەدا بەکاری بهێنێت، تەنها یەك وشەشی لە زار هاتەدەر و گوتی: "قوتیکەم؟" منیش بە داوای لێبوردن لە قژە درێژەکەم گوتم: "قوتی کە"، ئیدی دەستی پێ کرد، هەتا پێستی سەرم هەمووی دەرنەکەوت وازی لێ نەهێنا، ئەم سەرتاشە پێچەوانەی سەرتاشە زۆربڵێیەکانی تر ورتەی نەکرد، تا بە تەواوی لێ بووەوە، کە تەنها چەند خولەکێکی کەمی خایاند و گوتی: "پیرۆزە". ئیدی شێوەی منیش تەواو گۆڕا و ڕێك لە سەربازە سەروگوێلاك چاککراوەکان دەچووم. هەستم بە یەك سەرما و موچڕکێکی وا کرد نەبێتەوە، سەرتاپای جەستەی داگرتبووم. کات ئێوارەیەکی درەنگ بوو، هەر دەبێ بە نهێنی بگەڕێمەوە بۆ شاخ بەرلەوەی ئاشکرا ببم و کۆتاییم پێ بێت، وەلێ خۆ من تەنها لە بەر خاتری ئەم خێزانە هاتووم بۆ شار و ملی خۆم خستۆتە بەردەمی چەقۆی دڕندەکانی دەسەڵاتەوە، بە هەر جۆرێك بێت هەر دەبێ بیانبینم.

بە کوچەوکۆڵانە تەسك و تاریکەکاندا گەڕامەوە، خۆزگەم

دەخواست کەسم تووش نەیەت، بەڵام کەنگێ داری خۆزگەی ئێمەومانان بەردار بووە؟! ئەوەتانێ یەکێکیان لە دوامەوە بانگم دەکات. سەرەتا خۆم لە خەت دا، وەك ئەوەی گوێم لێی نەبێت، بەڵام هەستم کرد هەنگاوەکانی لە پشتەوەم خێراتر دەکات، ناچار بووم ڕابوەستم و ئاوڕێکی لێ بدەمەوە بزانم کێیە و چۆن خۆمی بۆ ئامادە بکەم، ئەگەر دۆخەکە پێویستی پێ کرد، بینیم دوو پیاوی تێکسمڕاون، لام وابوو سەر بە دەزگای ئەمنی نهێنیین کە هەمیشە سەرقاڵی ڕاوەدوونانی سیاسییە بەرهەڵستەکارەکانن، چەند بە داخەوە بووم کە چۆن ئاوا بێ چەك هاتمە شارەوە، خۆ بە لای کەمەوە هەر دەبوو چەقۆیەکم لا بووایە بۆ کاتی پێویست، وەلێ هەر لەو ئانوساتەدا بیرم لەوە کردەوە، ئینجا دەبێ لە دۆخی وادا چەقۆ بە کەڵکی چی بێت، لە بەرانبەر دوو پیاوی چەکدار کە دڵنیام بە لای کەمەوە دەمانچە و شتی دیکەشیان پێیە، هیچ چارێکم نەما، جگە لەوەی بیاندوێنم و هەوڵی فریودانیان بدەم، ئەگەر توانای ئەوەشم نەبوو لە یەکەم دەرفەتدا بازێك بدەم و بۆی دەربچم، یەکێك لە پیاوەکان گوتی:

- تۆ خەڵکی ئێرەی؟

تێدا مام، نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە؟! ئەگەر بڵێم بەڵێ، ئەوە درۆکەم ئاشکرا دەبێت، ئەگەر هەر پرسیارێکی دیکەم لێ بکەن کە پەیوەست بێت بەم گەڕەك و ناوچەیەوە، چونکە هیچی لێ نازانم، یان لەوانەیە لەگەڵم بێنە ماڵەوە بۆ دڵنیابوون، خۆ ئەگەر بە نەخێریش وەڵامیان بدەمەوە، ئەوە دەست بە لێکۆڵینەوە و پرسیاری زیاتر دەکەن، کە لێرە چی دەکەم و بۆچی هاتووم، وەلێ لە کۆتاییدا بە نەخێر وەڵامم دانەوە، بەڵکوو بتوانم خۆم لە پرسیارەکانی دیکەیان بدزمەوە. ڕێك

لێکدانەوە و بۆچوونەکەم دەربارەیان لە شوێنی خۆیدا بوو، هەر بە ڕاستی ئەوان سەر بە دەزگا نهێنییەکانی دەسەڵات بوون، بەڵام وا دیار بوو بۆ کاری دیکە هاتبوونە ئێرە، نەك بە دوای من و بۆ کاری سیخوڕی.

کەسی دووەمیان بە کەمێك توندییەوە:

- کەواتە بۆ کوێ دەچیت؟!

تەواو خۆم کۆ کردبووەوە و بەسەرخۆمدا زاڵ بووم و گوتم:

- هاتووم بۆ سەرەخۆشیکردنی دایك و باوکی یەکێك لە هاوڕێکانم.

ئەوەی دیکەیان وەك ئەوەی بە وردی ئاگای لەوە بێت لە گەڕەکەکەدا چی دەگوزەرێت، گوتی:

- مەبەستت ماڵی ئەو سەربازەیە پێش ماوەیەك یاخیبووەکان لە شاخ کوشتیان؟

- بەڵێ بەڵێ، ڕێك خۆیەتی.

وا پێ دەچوو گومانەکان زیاتر بە لای ئەوەدا بچن کە منیش وەکوو کوژراوەکە سەرباز بم، بۆیە لێی پرسیم:

- ئەی کوا مۆڵەتی دابەزینت؟

لەو کاتەی دەمویست بەسەر دڵەڕاوکێکەمدا زاڵ بم، گوتم:

- هەڵبەتە پێمە ئەی چۆن.

دەستم کردە باخەڵم و وا خۆم پیشان دا کە دەمەوێ

مۆڵەتەکەی بۆ دەربێنم، هێندەی نەمابوو بڵێم لەناو کراسی سەربازییەکەم لە ماڵەوە لە بیرم کردووە، بەڵام بەرلەوەی هیچ بڵێم پێی گوتم:

- بڕۆ خوات لەگەڵ.

پشتم تێ کردن و بە منگەمنگێکەوە سوپاسگوزاری خۆمم بۆ کردن و بە هەنگاوی پتەوی ئەوتۆوە ڕێم دەکرد، وەك ئەوەی هەر بە ڕاستی وابم، بۆ ئەوەی گومانم لێ نەکەن. سەرتاشینەکەم لە مەرگێکی مسۆگەر دەربازی کردم و کەسایەتیی ڕاستەقینەی بە باشی بۆ شاردمەوە، بەڵکوو هەتا لە ماڵباتی قوربانییەکەش دەیشاریتەوە کە سەرلەنوێ نزیکی ماڵیان کەوتبوومەوە. تا ئەو کاتەش موچڕکەکە بە سەرتاپای جەستەمدا دەهات و دەچوو، پاشان بە دەستێکی لەرزۆك و ناخێکی تێکشکاوەوە بە هۆی پارچە ئاسنێکی هەڵواسراو لە شێوەی مستێك بەردێکی لەناو دەستدا بێت لە دەرگاکەم دا، دەرگاکە لەو کۆنە دەرگایانە بوو کە لە تەختە دروست کرابوو و بە بزماری سەر تۆپزی گەورە گەورەی ئاسنین، بزمار ڕێژ کرابوو، کە سەری بزمارەکان ڕێك لە هێلکەی مریشك دەچوون، هێندەی نەبرد پیرە پیاوێکی باریکەڵە کە ئێسکی ڕوومەت و شانەکانی بە ئاشکرا لە ئێسکە پەیکەرێك دەچوو بە زۆری زۆرداری پێستەکەیان پێوە خۆشە کردبێت، ڕوخساریشی پڕاوپڕ بوو لە خەم و ژان و ئەندێشە، چاوەکانی ڕێك چاوی پیرە پیاوەکەی ناو ئەو تابلۆیەی هێنامەوە یاد کە کوڕە کوژراوەکەی کێشابووی، هەر کە گەیشتە بەرانبەرم گوتی:

- نیگەرانت کردین، بۆچی...؟!

پاشان هاتەوە سەرخۆی، وا دیار بوو منی بە کوڕەکەی

چواندبوو که ماوەیەکی زۆر بوو ماڵئاوایی لێ کردبوون، نەخاسمە قژە تاشراوەکەم، حەپەسام و زمانم لە گۆچوو، نەمزانی چی بڵێم؟! وەك ئەوەی لە گیانەڵای مەرگدا بم، پاشان بە دەنگێکی نیمچە خنکاو و پچڕپچڕ و هەرچۆنێك بوو گوتم:

- هاتووم سەرەخۆشیتان لێ بکەم...

وەك ئەوەی وشەکان نەیانەوێ لە زارم بێنە دەرەوە، دەستم بۆ گیرفانم برد، دەمویست ئەو پارەیەی بۆم پەیدا کردبوون دەربێنم و بیدەمێ و بڕۆم، وەلێ کەسایەتی و دەروونبەرزییەکەی ڕێگەی نەدا وەربیگرێت، بڕیارم دا بە زۆر لە گیرفانی بئاخنم و ئینجا بڕۆم و ئاوڕ لە دوای خۆم نەدەمەوە، لە ئایندەشدا بەپێی کات و توانا هەمان هەڵوێست دووبارە بکەمەوە، بەڵکوو کەمێك لە ئاسوودەیی ویژدان بەدەست بهێنم، کاتێك کەمە خۆشییەك بخەمە دڵی ئەم پیرە باوکە جگەرسووتاوەوە. وەلێ هایهووووو... ئاخر خۆ سامان و زێڕ و زیوی هەموو دونیا بە لای ئەم باوکەوە، ناکاتە دەستلەملانێیەکی کوڕەکەی... ئای ڕۆژگاری شووم چیت پێ کردم و چۆن ڕیسوای مرۆڤایەتیت کردم؟! هیچ دەرفەتێکم بۆ نەڕەخسا پارەکەی بدەمێ و بڕۆم، بەڵکوو ئەو بانگهێشتی ژوورەوەی کردم و ڕووی وەرگێڕا و پشتە چەماوەکەی کە نیشانەی خەم و ئەندێشەکانی ژیان بوون، لە ناخەوە ئازاریان دام، بەرەو ژوورەوە دەستی بە ڕۆیشتن کرد و منیش بە ناچاری بەناو ڕێڕەوێکدا دوای هەنگاوەکانی کەوتم، کە جۆگە ئاوێکی درێژی پێدا دەڕۆیشت و پێ دەچوو پاشماوەی شوشتنی قاپوقاچاخ و جلوبەرگ بێت، پاشان بە حەوشەیەکی پانوبەریندا ڕۆیشتین، زەوییەکەی خۆڵاوی و بە بەردی گەورە پڕ کرابووەوە، وەلێ هەستت دەکرد زەوییەکی نەرمان بێت، خانووەکە وێرانە بوو، ژوورێکی لەقوڕدروستکراو،

یەکێکی دیکە لەوانەبوو لە ماوەی مانگێکدا دابڕووخێت، ئەگەر کۆڵەکەی دارینی نەدەنە پاڵ، ژوورێکی دیکەی تا ڕادەیەك بەهێز و بەبێ کۆڵەکەی دارین، ئەمەیان بە چیمەنتۆ کەفماڵ کرابوو، وەلێ بێ پەنجەرە بوو، پیاوە پیرەکە بەرەو ئەو ژوورە پێشم کەوت و هەر ئەوەتە بەرپێی خۆم دەبینی، گڵۆپێکی کارەبایی کز ڕووناکایی بە ژوورەکە دەبەخشی، پێ دەچوو گڵۆپەکەش دوا ساتەکانی ژیانی بێت و ئەویش ڕووناکی بە تاریکی بسپێرێت، لە بەرانبەر دەرگای ژوورەکە تەختێکی دانیشتن هەبوو کە بە دۆشەگێکی ئیسفەنج داپۆشرابوو، لە بەردەمیدا مێزێکی بچووکی چای هەبوو، کۆمدینۆیەکی کۆنەش کە نیوەی تەمەنی ڕۆیبوو بە دیوارەکەوە نووسابوو، لەسەر تەختەکە دانیشتم و باوکە پیرەی جگەرسووتاویش لەولای تەختەکەوە دانیشت. بە دەنگێکی کزەوە گوتی:

- حاڵ و ئەحواڵت چۆنە کوڕم؟

وەك ئەوەی ئاگام لە خۆم نەبێت، گوتم:

- من مۆڵەتم وەرگرتبوو و لە ماڵەوە بووم، کاتێك گەڕامەوە هەواڵی سیروانی کوڕتانم بیست، کوڕتانە وایە؟

پیرەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

- بەڵێ کوڕم، من باوکی ئەوم، سوپاس بۆ سەلامەتیی تۆش.... هەموو شتێك لای خوا نووسراوە...

دەستم بۆ گیرفانم برد، تاکوو پارەکە دەربهێنم، بەڵام هەستا و گوتی:

- دەچم چای دەهێنم.

منیش هەستامە سەرپێ و پارەکەم دەرهێنا و گوتم:

- مامه گیان من کارێکی پەلەم هەیە و دەبێ بڕۆم، تەنها ویستم بێم و سەرەخۆشیتان لێ بکەم و ئەم بڕە پارەیەتان بدەمێ، دەستیم گرت و ویستم پارەکە بکەمە ناو دەستی، دەستی کشاندەوە و گوتی:

- نەخێر کوڕم، پارەکەت هەڵگرە، خێرەومەند زۆرن و منیش هێشتا توانای پەیداکردنی بژێوییم هەیە.

لەو کاتەی خەریك بوو لێی دەپاڕامەوە و هەتا نوشتامەوە بۆ ئەوەی دەستی ماچ بکەم، گوتم:

- توو خودا لێمی وەربگرە، تۆ نازانی ڕەوانشاد بە لای منەوە چەند گرنگ بوو، بە کوڕی خۆتم دابنێ، تکایە لێمی وەربگرە، ئاخر چاکەی ڕەوانشادم زۆر بە سەرەوەیە، ئەو زۆر چاکەی لەگەڵ کردووم و قەرزەکەی لە ئەستۆمدایە و هەر دەبێ بۆی بگەڕێنمەوە.

لەو چرکەساتەدا هاوسەرەکەی هات و قۆرییە چایەك و پیاڵەو پێداویستییەکانی دیکەی چایەی لەسەر سینییەك هەڵگرتبوو، وا دیار بوو لەو کاتەی من لە دەرگام داوە، ئەوان ویستبێتیان چای بخۆنەوە، پیاوە پیرەکە گوتی:

- کوڕم پارەکە بخەرەوە گیرفانی خۆت و دابنیشە، نابێ بێیتە ماڵەکەمان و میوانداریت نەکەین.

پاشان لە بەردەم دەرگاکە سینییەکەی لە دەست ژنەکەی وەرگرت و گوێم لێ بوو پێی گوت: "هاوڕێی خوالێخۆشبووە". هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو، گوێم لە نووزانەوەی ژنەکە بوو، کە بۆ شوێنێکی دیکەی ماڵەکە ڕۆیشت، پیاوە پیرەکە هاتەوە لام دانیشت و بە دەستێکی لەرزۆکەوە چایەکی پێشکەش کردم و گوتی:

- حاڵی کەسوکارت چۆنە؟

لەژێر لێو و بە نیگەرانییەوە:

- هەموویان باشن.

دیسانەوە دەستی بە قسە کردەوە و کەوتە باسکردنی خەمەکانی:

- ئاگات لە خۆت بێت کوڕم، لەوە باشتر نییە لە دونیادا باش بیت، باش بیت مەبەستم ئەوەیە خەم و ئازار لە کەسوکارت دوور بخەیتەوە. دوای تەنها چەند خولەکێك دایکی سیروانیش هاتە ژوورەوە و ڕاستەوخۆ و بێ مۆڵەتوەرگرتن لە بەردەممدا لەسەر چۆك دانیشت و بە زمانێکی کوردی شارەزایانەوە گوتی:

- بەو خوایە گەورەیە سوێندت دەدەم، کە باسی هەموو شتێکی کوڕەکەم، سیروانی هاوڕێتم بۆ بکەیت.

ڕوخساری بە فرمێسك تەڕ و سوور هەڵگەڕابوو، چرچولۆچەکانی دەموچاوی، لە ئەنجامی ئەو هەموو جگەرسووتان و لە دەستدانی ئازیزانەی وا دەردەکەوت لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا بێت، وێڕای ئەوەی هێشتا پەنجای تێنەپەڕاندبوو.

- هەستم بە ترس و دڵەڕاوکێیەکی دژوار کرد، دەبێ بتوانم چ درۆیەك هەڵبەستم. وەلێ خۆ هەر دەبێ شتێك بڵێم و باسی شتێك بکەم، دوای کەمێك گوتم:

- داوای ئارامگرتن و خۆشیت بۆ دەکەم دایە گیان.

- تکایە باسی کوڕەکەمم بۆ بکە!

- دەتوانم دەربارەی چی بڵێم، هەر قسەیەکی خۆشیشی بکەم، تازە هیچ سوودێکی نابێت.

- ئەو هاوڕێی نەبوو، ئێوە چۆن یەکترتان ناسی؟! مادام تۆی بە هاوڕێی خۆی دانابێت، کەواتە زۆر خۆشی ویستووی، کوڕەکەی من تا ڕادەیەکی زۆر گۆشەگیر و دوورەپەرێز بوو، زۆر بە کەمی لەگەڵ خەڵکی قسەی دەکرد، بێدەنگ و بێوەی و نەرمونیان بوو، لە هەموو ژیانیدا ئازاری زیندەوەرێکی نەداوە.

منیش ئەوەندەم بۆ زیادکرد و گوتم:

- هەمـــوو ئەوانەی دەیانڵێیـــت ڕاســـتن، هونەرمەنـــد و نووسەریش بوو، هەموو کاتی خۆی لە وێنەکردندا دەبەخشی، شانازیی بە کارەکانییەوە دەکرد، من زۆر بایەخم بە بەهرەکانی دەدا و بۆ بەردەوامبوون لەسەر هونەرەکەی هانیم دەدا، بۆیە ڕێزی دەگرتم و هاوڕێیەتیمان هێواش هێواش بەهێز بوو، ڕۆژێکیان پێی گوتم: وەسیەتی من ئەوە بێت ئەگەر ڕۆژێك تووشی ڕووداوێکی نەخوازراو هاتم، دەبێ ئاگات لە دایك و باوکم بێت و هەموو وێنە و شیعرەکانم لای خۆت بپارێزیت.

منیش بۆ دڵنیاکردنەوەی پێم گوت:

- هیچمان بەسەر نایەت، بەڵام بەڵێن بێ بۆ وێنە و شیعرەکانت، هەوڵ دەدەم لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاویان بکەمەوە. زۆر دڵی بەم بەڵێن و پێشنیارەم خۆش بوو.

- دایکە چاو پڕ لە فرمێسکەکەی گوتی:

- ئەو هەستی کردبوو کە مەرگی نزیك بۆتەوە.

پیاوە پیرەکە لەگەڵ بۆچوونەکەیدا نەبوو، گوتی:

- ناوی خوا بێنە، ژنەکە کەس نهێنییەکان نازانێت تەنها خوا نەبێت.

دیسانەوە دایکی بە زمانێکی گیراوەوە پرسی:

- ئێ چیتر کوڕم... چیتر؟!

ناچار بووم بە دوای شتی دیکەدا بگەڕێم، بەڵام لە بیرم چووبوو کە هەرچییەك بڵێم و باسی هەرچییەك بکەم، خەمی ئەو پیرە دایك و باوکە گرانتر دەکەم و زیاتر دەیانورووژێنم، لەو چرکەساتەشدا بوێریی ئەوەم نەبوو سەرنج بدەمە ڕوخساری دایکی سیروان، سەری خۆم نزم کردبوو و بە دەنگێکی کز و لەسەرخۆ گوتم:

- ئەو زۆر ئێوەی خۆش دەویست، کە ناتوانم بە قسە باسی بکەم، خۆزگەی ئەوەی دەخواست سەربازییەکەی تەواو بکات، کە زۆری نەمابوو تەواویشی بکات، بەڵام ئەو ترسی ئەوەی هەبوو بە هۆی شەڕەوە مانەوەی لە سوپا درێژ بکرێتەوە و تەواو نەبێت، ئەو دەیویست ئەرکی ماڵەوە بگرێتە ئەستۆی خۆی و ئەو بارە گران و خەم و ناسۆرە زۆرە لەسەر شانی باوکی لابدات و خۆی پارووە نانێك پەیدا بکات. کاتێك مۆڵەتم وەرگرت، باوەشی پێدا کردم و گوتی، ڕۆژەکانی دادێن بەبێ تۆ ئەستەم دەبن، ئاخر ئەو منی تەنها وەکوو هاوڕێیەك دانەدەنا، بەڵکوو وەکوو برایەکی گەورەی خۆی. پاشان بە سۆزەوە دەستی گوشیم و بە گەرموگوڕی بانگی کردم، زوو بگەڕێوە و دوا نەکەویت.

هەر کە ئەو قسانەم کرد، -یان باشتر بڵێم ئەو درۆیانەم ڕێك خست- ئەو دایکە کڵۆڵ و ناخ سووتاو و تاسەبارەی لەسەر چۆکی دانیشتبوو، دەستی گرتم و گوتی:

-   لێم گەڕێ با ئەو دەستانەت بگرم، وا هەست دەکەم دەستی سیروانی کوڕمن دەستت دەگرن.

پاشان لە ڕێگەی دەستی منەوە دەستی سیروانی کوڕی ماچ کرد و لەسەر لێوەکانی خۆی دانا و بە هەنسکی گریان و باراندنی فرمێسکی بە خوڕەوە گوتی:

-   مادام سیروانی کوڕمان تۆی خۆش ویستووە، ئێمەش خۆشمان دەوێی، تۆ دەبیتە کوڕی ئازیزم، هەر کاتێك بێیت و سەردانمان بکەیت، لەگەڵ خۆتدا شەبەنگ و بۆنوبەرامەی دەهێنیت... ئاخ کوڕەکەم چەندە جوان و دڵگیر بوویت، هەر دەبێ ئێستا سیروانی کوڕمان بەم سەردانەی تۆ دڵی خۆش بێت، هەڵبەتە ئێستا بە بەختەوەرییەوە سەیرمان دەکات، هەتا لەوانەیە لەگەڵ خۆیدا شەبەنگ و بۆنوبەرامەی برا گەورەکەشی هێنابێت، تۆ هەر کاتێك سەردانمان بکەیت، لەگەڵ هەردوو کوڕەکەمان کۆمان دەکەیتەوە، پێم بڵێ سەردانمان دەکەیت، کوڕی خۆم وایە؟ هاتنی تۆ وایان لێ کردم هەست بکەم ئێستا کوڕەکانم لە دەورم دەخولێنەوە. ئاخ خودایە چەند هەستێکی خۆش و جوانە.

پاشان ڕووی لە پیاوە پیرەکەی کرد و بە ڕوویەکی گەشەوە لێی پرسی:

-   تەماشاکە... هەست بە بوونی هەردووکیان ناکەیت...؟! هەردوو کوڕەکەم لێرەن، من وا هەست بە بوونیان دەکەم، ڕۆحیان وەکوو شنەبایەکی نەرم خۆیان لە ڕوخسارم هەڵدەسوون، دڵنیام ئێستا بەم دیدار و سەردانەی تۆ دڵخۆشن، بە تایبەتی کە زانییان هەستم بە بوونیان کردووە.

ئیدی وات هەست دەکرد ئامێز بە خۆیدا دەکات، وەك ئەوەی ئامێز بە تارمایی و شەبەنگی کوڕەکانیدا بکات، پیرە پیاوەکەش لە شوێنی خۆیدا جووڵەی نەدەکرد و ورتەی لە دەم

نەدەهاتە دەرەوە، دڵنیابووم ئەویش لە ناخەوە شەقارشەقار دەبێت و ئاگری جگەرسووتان، قوڵپی گریانی لە گەرووداگیر کردووە و هاکا دایە پرمەی گریان. لەگەڵ خۆمدا گوتم: "ئەو ژنە بەستەزمانە هۆشی لەسەر خۆی نەماوە!"

پاشان داوای مۆڵەتی ڕۆیشتنم لێیان کرد، بەوەی بە کاری دیکەوە سەرقاڵم و دەبێ بڕۆم، بەڵێنی ئەوەشم پێ دان کە هەر دەرفەتم بۆ بڕەخسێت سەردانیان بکەم، بە زۆریش قایلم کردن بەوەی ئەو بڕە پارەیەم لێ وەربگرن. بەهەرحاڵ هەرچەندە پارەکەش زۆر نەبوو، بەڵام لەوانەیە خەرجیی مانگێکی ماڵەکەیان یان زیاتری پێ بەرنە سەر و بە ڕێ بکەن. ئەوان وێڕای ئەو نەبوونی و دەستکورتییەیان، بەڵام خاوەن هەست و ناخێکی بەرز و شکۆمەند بوون. وەلێ بەرلەوەی بگەمە ئەو جۆگە پیساوە بچووکەی ناو حەوشەکەیان، لە ناکاو ڕاوەستام و ئاوڕێکم لێیان دایەوە، ئەوانیش ڕەق ڕاوەستان، ڕوخسارم لە شەرمان سوور هەڵگەڕابوو، چیتر نەمتوانی فریویان بدەم، نازانم لەو چرکەساتەدا بۆچی ئەوەندە قێزم لە خۆم دەبووەوە، کە گوێم لە تکا و نزا و پاڕانەوەکانیان دەبوو، کە هەندێکی دیکەش لایان بمێنمەوە، یان زوو زوو سەردانیان بکەم و سەریان لێ نەبڕم، وەك ئەوەی لە ڕۆژی لەدایکبوونمەوە بمناسن. ئەوەتا شێتیی بیر و بڕوا و بەهای ڕەوشتیم بەسەرمدا زاڵ دەبن و دەمگەڕێننەوە دۆخی ڕاستەقینەی خۆم و باڵ بەسەر بیرکردنەوەمدا دەکێشن، بە جۆرێك کە جگە لە ڕەوشت و بەها ڕاستگۆکان هیچی تر نەبینم، وەك ئەوەی لای هەندێك لە شێتەکان هەیە و پێی دەناسرێنەوە و لە پێناویشیدا دەمرن، ئەگەر دۆخەکە ئەوە بخوازێت، منیش ڕێك ئاوام لێ هات، چۆن شێتەکان ساختەکاری و شاردنەوەی ڕاستییەکان ڕەت دەکەنەوە و هەمیشە هەر ڕاستییەکان دەڵێن، هەتا ئەگەر فێڵ و درۆکە

سپیش بێت و زیانێکیش نەگەیەنێت، ئەوان ئامادە نین بیکەن. منیش بۆ ئەوەی ئەو تەپوتۆز و خاشاکی درۆ و فریودان و بەدڕەوشتیی خەڵاتاندنەی ئەو دوو مرۆڤە پاك و فریشتەییە لە خۆم بتەکێنم و باری خۆم سووك بکەمەوە، ڕووم تێ کردن و گوتم: "لە ڕاستیدا من هێندەی باوك و دایکی خۆم خۆشم ویستن و لەگەڵ خۆمدا بڕیارم دا بۆ هەتاهەتایە بەجێتان نەهێڵم و ببنە بەشێك لە ژیانم، بەڵکوو هەموو ژیانم، بەڵام چیتر بەرگەی ئەوە ناگرم کە زیاتر فریوتان بدەم و بە ئاشکرا درۆتان لەگەڵدا بکەم، چونکە من نازانم درۆ بکەم، مردنم هەزار جار پێ باشترە لەوەی لەو فریودانەتان بەردەوام بم... لە ڕاستیدا... من ئەوە نیم کە بۆم باس کردن و پێم گوتن... من نە سەربازم و نە لەگەڵ سیروانی کوڕیشتان بووم و نە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەویشم ناسیوە، بەڵکوو لە ڕێگەی وێنە و شیعرەکانییەوە ناسیم کە دەستم بەسەریاندا گرت.

دایکە هەشبەسەرەکە کەوتە هەناسەبڕکێ و سەری لێ شێوا، کەوتە دڵەکوتە، خەریك بوو چاوی ڕێشکەوپێشکە بکات، بەڵام پیرە پیاوە جگەرسووتاو و پشتشکاوەکە لە شوێنی خۆی وشك بوو، وشکبوونێك، ڕێك لە پیرەدارێکی پاییزەی ڕەق و ڕووتوقووت و گەڵاهەڵوەریو دەچوو، چاوەکانی لە چاوم بڕی و یەك پیتیشی نەگوت، منیش قسەکەی خۆم تەواو کرد و گوتم: "من یەکێك بووم لەو دەستەیەی ئێوە پێی دەڵێن پێشمەرگە، من یەکێك بووم لەوانەی هێرشمان کردە سەر ئەو مۆڵگە سەربازییەی سیروانی تێدا بوو، خوێنیشی لە گەردنی مندایە، دەتوانن هەر ئێستا بە هەر ڕێگەیەك بتانەوێ، سزام بدەن و تۆڵەم لێ بکەنەوە!"

دایکەکە بە دەنگێکی خنکاو و زمانێکی شێواوەوە بە خێرایی سەیری ئەملا و ئەولای خۆی کرد و وەك ئەوەی چاو

لە شتێك بگێڕێت گوتی:

- نـا نـا...؟! تـۆ بەشـداریت لە کوشـتنی کوڕەکەمـدا کردووە؟! نەخێر...!

پیاوە پیرەکەش کە هەموو گیانی هەڵدەلەرزی گوتی:

- کەواتە تۆ بۆچی هـاتیتە لامـان؟! لەوانەیە هەر خـۆتیش تەقەت لە کوڕەکەم کردبێت...!

- بەڵێ منم من، بۆیە هاتووم و کفـنەکەی خۆشـم لەگەڵ خۆمدا هێناوە، بەڵکـوو لەو ئازارە دەروونییەی دەمسـووتێنێت و ناخم دەرزیئاژن دەکات، ڕزگـارم بـکەن و هەر لێرە بمکـوژن، ئێمە هەردووکمان قوربانی قەدەرین، هەردووکمان قوربـانیی ئەم ڕۆژگـارە نەفـرەتییەین کە یەکتـری دەکـوژین، بـێ ئەوەی یەکتریش بناسین. ڕادەستی ڕژێمم بکەنەوە، بەڵکوو لە سێدارەم دەدات و کـوڵی دڵـی خۆتـان دابمـرکێننەوە، بەڵام مـن تاوانبـار نـیم... ئـێمە لە پێنـاوی ئێـوەدا دەجەنگـین، زوڵـم و زۆرداری هەموومـان دەخنکێنێـت و ئـێمەش لە پێنـاوی نەهێشـتنیدا لە شەڕێکی دەستەویەخە و بەردەوامداین.

ژنەکە بە دەموچاوی خۆیدا کێشا و گوتی:

- ئەوە چ زوڵم و ستەمێکە دەتەوێ لەسەرمانی لابدەیت و داکۆکیمان لێ بکەیت، تۆ دێیت و کوڕەکەی مـن دەکوژیـت؟ هەی نەفرەتـت لـێ بێـت، ئەو زوڵـم و سـتەمکارییە لە ڕێـگەی تەرمی کوڕە تاقانەکەمەوە هەڵدەگریت؟! ئەوە چ سـتەمکارییەکە زیاتر لەوەی تۆ لەگەڵ ئێمەدا کردووتە؟! ئەوە چ ستەمکارییەکە باسـی دەکەیـت؟! ئەی بـۆچی ڕوو لە جەللادەکـانی بەغـدا ناکەیت؟! بـۆچی لەوێ کۆشـك و تەلارە بەرزەکانیـان بەسـەردا ناڕووخێنیت؟! دێیت و کوڕەکەی من دەکوژیـت؟! مـن ئامـادەم کوڕەکەی خۆم لەگەڵ ئەو هەموو ستەمکارییانەی ئەماندا بوێـت

و بەبێ ئەویش نەفرەت لە بەهەشتەکەی تۆش دەکەم و نامەوێت. ئێستا چیت لێ بکەم؟! بتکوژم یان ڕادەستی جەللادەکانی ڕژێمت بکەم؟! بەڵکوو لەتوپەت و زیندەبەچاڵت دەکەن، وەك ئەوەی کوڕەکەمت کوشت؟! بەهەشتەکەی تۆم ناوێت! نامەوێ ئەو ستەمکارییەم لەسەر هەڵبگریت، من هیچم ناوێ جگە لە کوڕەکەم. گوێت لێمە کوڕەکەم بۆ بێنەوە؟! دەتکوژم و جەرگی دایکت دەسووتێنم، لێ ناگەڕێم دایکت پێت دڵخۆش بێت و منیش بە مردنی کوڕەکەم بسووتێم، کوڕەکەم بۆ بێنەوە کوڕەکەم! هەر ئێستا کوڕەکەم لێت دەوێ! خۆ ئەگەر کوڕەکەم جەللادێکی دڕندە بووایە دەمگوت قەیناکا سزای تاوانەکانی خۆی وەرگرت کە جەرگی دایکانی سووتاندووە، بەڵام کوڕە خۆشەویستەکەم، نە دڕندە و نە جەللاد و نە جاشیش بوو، کوڕەکەم قوربانیی ئەو چارەنووسە بوو گەیاندییە ئەوێ، لە چاوەڕوانی ئەوەدا بووین بەم نزیکانە چاومان بە بینینی کلڕێژ بکەین، کەچی وا تۆ هاتوویت و وامان لێ دەکەیت بە گریان بۆ کۆستەکەی چاومان کوێر بکەین؟!

ئیدی دایکەی جگەرسووتاو دایە پڕمەی گریانێکی بە کوڵ و چاوی بەملا و بەولایدا دەگێڕا.

پیاوە پیرەکە بە دەنگ و زمانێك کە هەرگیز لێبوردەییان تێدا بە دی ناکرێت گوتی:

- ئێوە لە کلکی مارەکە دەدەن و واز لەسەری دێنن، تاکوو ژیانمان ژەهراوی بکات، ئەگەر ناتوانن سەری بپلیشێننەوە، واز بێنن و ملی خۆتان بشکێنن و بڕۆنەوەماڵەکانی خۆتان، ژیانێکی ئاسایی بژین، لایەنی کەم لەو هەموو خەم و ناسۆرە دوورمان دەخەنەوە کە ئێوە هۆکاری بەشێکین، نازانین ڕوو لە کوێ بکەین؟! ئەگەر لە ئەهریمەنەکان دەربازمان ببێت، فریشتەکان دەمانکوژن، هەی بکوژی کوڕەکەم دەی ملی خۆت

بشکێنە و چیتر لە بەردەممدا مەمێنەوە، با کارێك نەکەم لێی پەشیمان ببمەوە.

لە کاتێکدا پیاوە پیرەکە ئەو قسانەی پێ دەگوتم، دایکە جگەرسووتاوەکە بە زللە تێم وەرهات، زللە لە دوای زللە و جار جارەش مشتەکۆڵەی لەسەر سینگم دەدا، ئینجا بەرەو ژوورەوە ڕای کرد و چەقۆیەکی هێنا، پیاوە پیرەکە پاڵی بە سینگمەوە دەنا و هاواری دەکرد: دەی بڕۆ، بڕۆ بۆ دۆزەخ، نەگەڕێیتە دواوە! ئەو بڕە پارەیەی بەزۆر پێم دابوون هەر هەمووی بە دەموچاومدا دایەوە. لەو کاتەی ژنەکە بە چەقۆوە هێرشی بۆ هێنام بە چۆکدا هاتم و دڵنیابووم لەوەی ئەوە دوا ساتەکانی ژیانمە و دەمرم. بەڵام پیاوە پیرەکە باوەشی پێدا کرد و توند دەستی گرت، کەچی ئەو خۆی لەناو دەستەکانی ڕادەپسکاند و دەیویست داخی ناخی سووتاوی خۆی پێم دابڕێژێت، هەرچۆنێك بوو چەقۆکەی لەناو دەستی دەرهێنا و تووڕی هەڵدایە ئەولاوە، ژنەکە بە چۆکدا هات و لە تاوان مشتەکانی بە زەویدا دەکێشا، پیاوە پیرەکە لە باوەشی گرت. ماوەیەك بەم جۆرە مانەوە، تاکوو کەمێك هێور بووەوە، ئینجا هەستانە پێوە و پشتیان تێ کردم و بە هەنگاوی تێکشکاوەوە بەرەو ژوورەکەی خۆیان ڕۆیشتن و دەرگاکەیان لە دوای خۆیانەوە داخست. منیش هەر لەوێ نزیکەی پێنج خولەکێك لە کڕنۆشبردندا مامەوە، ئینجا بە چاوی پڕ لە فرمێسك و دڵێکی پڕ لە ناسۆر و جەستەیەکی شەکەت و گرانەوە هەستامە سەر پێ و بە هەموو خەم و ئازارێکەوە ماڵەکەیانم بەجێ هێشت.

## بەشی بیست و نۆیەم

دوای ئەوەی ڕەحمـان گـوێی لەو بەسـەرهاتە گـرت کە مامۆستا عومەر ئازاری پێوە دەچەشت، ئەویش بەو ڕووداوە زۆر نیگەران و خەمبار بوو. بە هێواشی و خەمەوە گوتی:

- ئەشهەدو مافی خۆتە... بە ڕاستی لەو نەهامەتییەی تێیـدا دەژیت، بەزەییم پێتدا دێتەوە. هەر یەکەو لە ئێمە کارەساتێکی بەسەردا هاتووە و بێ ئەوەی بەزەیی پێماندا بێتەوە تاڵاوی ئـازار و ئەشکەنجەمان بە ناخدا دەکات. وەك ئەوەی هەرگیـز ژیانمـان بەبێ غەم و ناسۆر و حەسرەت ڕاستەڕێ نەبێـت و ژیانمـان لـێ تاڵ نەکات.

مامۆستا عومەر دوای هەناسەکێشانێکی قووڵ گوتی:

- ڕەحمـان، ئێستا هەسـت بەو خەم و ناسـۆرەی نـاخم دەکەیت؟

ڕەحمان هەر لە هەوڵی دڵدانەوەیدا بوو، تاکوو هێور بووەوە و هاوسەنگی بۆ گەڕایەوە.

پاشـان بابەتەکەیـان داخسـت و هەردووکیـان گەڕانەوە لای دەستەکەیان، لە ڕێگا مامۆستا عومەر گوتی:

- پێم وابوو گاڵتەت بە خەم و ئەندێشەکانم دێت.

- بۆچی گاڵتەم پێی بێت؟!

- لەبەر ئەو ڕەقەکاری و سەرسەختییەی هەتە، هەستەکانم زۆر بە لاوازی بێتە بەر چاوت.

ئەم وشـــانە ڕەحمانیـــان ورووژانـــد، بـــۆیە ڕەحمـــان بە سەرسامییەوە هاواری کرد:

- ئەوە ئێـوە چیتـانە؟! بـۆچی ئەو گومـانە خەراپەم لـێ دەکەن؟! هەمووتـان بەو جـۆرە ناخۆشـە نـاوم دەزڕێـنن! ئـێمە هـاتووین لەگەڵ درنـدەترین دیکتاتۆرییەتـدا بجەنگـین کە ئەم وڵاتە بەخۆوەی بینیبێت. لە پێناوی ئەوەدا چەکمـان هەڵگرتـووە، ئەی تۆ لە چەکداری وا چاوەڕوانی چی دەکەیت؟!

- مەبەستم ئەوە نەبوو. بەڵکـوو دەنـگ و هەرایەکـی زۆر بـڵاو بـووەتەوە کە دەسـتدرێژییت کـردۆتە سـەر هەنـدێك لە گوندنشـینەکان و شوانێکیشـت دارکـاری کـردووە، هەرووەهـا ئەشکەنجەی زیندانییەکانیشت داوە، بەڵکـوو هەتـا هەڕەشـەت لە خودی پیرەکانیش کردووە، ئەمەش تووڕەی کـردوون، بەڵکـوو لە ڕاسـتیدا لێـت تۆقیـون و قسـە و هەڕەشـەکانتیان بە ڕاسـت وەرگرتـووە و هەتـا لە پێنـاوی ئەوەدا هەنـدێك ڕێوشوێنیشـیان بەرانبەرت گرتۆتەبەر.

- عومەر ئەو قسانە زێدەڕۆییان تێدایە، ئەوەی هەیە ئەوەیە جارێکیان لە "پشتئاشان"، ڕێگەم بە شوانێك نەدا ڕانەکەی بهێنێـتە نـاو بارەگـا، خـۆت دەزانیـت ئـاخر ئـێمە ناسنامەی ئەو شـوانانە نازانین و نایانناسین، لەوانەیە سـیخوڕیمان بەسـەردا بـکەن و هەر زانیارییەکیان لە سەرمان دەست بکەوێت بیفرۆشن. جارێکیـانیش بە دوو سێ زللەیەك هەندێك جاشم تەمێ کـرد، خـۆتیش بـاش دەزانیت ئەگەر ئێمە بکەوینە بەردەستیان چۆن نامەردانە قووتمان دەدەن و هەر بە زیندوویێتی و بەبێ خوێ دەمـانخۆن. سـەبارەت بە پیرەکـانیش، ئەوانە کەسـانی شکسـتخواردوون و پێویسـتە بە کەسـانی لە خۆیـان بە توانـاتر بگـۆڕدرێن، لەبەر ئەوەی دەبیـنە قوربانیی پیرێتییەکەیان، تۆ تەماشای حاڵمان بکە گەیشتینە کـوێ

و چیمان بەسەر هاتووە، بە عەقڵی کێدا دەچێت وا بەبێ سوود بمرین و لە ڕێگەیەکی زۆر هەرزانیش؟! ئەمە سووکایەتیکردنە بە ژیانمان، هەرچەندە ئەگەر بە ئەنقەستیش نەبێت. مردن لە پشتئاشان بە هۆی هێرشی لە ناکاوەوە نەبوو بۆ سەرمان، ئەوەی بەو دەردەی بردین و ئەو هەموو قوربانییەمان دا، خەراپ خوێندنەوە و تەگبیرکاری و خۆشباوەڕی بوو. ئێمە دوای ئەوەی دونیامان لێ بەرتەسك بووەوە بۆ مردن ڕوومان لێرە نەکردووە، ئێمە بۆ ئەوە ڕوومان لێرە کردووە، تاکوو واقعی خەراپی کۆمەڵگە بگۆڕین، لەگەڵ ئەمانەدا توانای گۆڕینی هیچمان نییە، ئەوان وەکوو دەستوپێوەند و خزمەتکار و پیاوی خۆیان تەماشامان دەکەن، ئەوان دەیانەوێ ئێمە ملکەچ و گوێڕایەڵیان بین، هەرچییەکیان پێ گوتین بۆ جێبەجێکردنی لە ئامادەباشیدا بین، وەك ئەوەی کوڕانی خێڵ بۆ سەرۆك خێڵەکەیان دەیکەن، ئێمە ڕانەمەڕ و ئەوانیش شوانێکی باڵادەست. تۆ سەرنج لە بێزاری و تووڕەیی هەموو پێشمەرگەکان بدە، سەرنجی ئەو پیرە بدە کە لە لایەن هێزەکانی مام جەماڵەوە بەدیل گیرا، ئەوان باوەشیان بۆ کردەوە و دەمانچەیەکیشیان بە دیاری پێ بەخشی و ڕێککەوتنامەیەکیشیان لەگەڵیدا واژۆ کرد، لەو کاتەی لە یەك ڕۆژدا حەفتا کەسیان لێ شەهید کردین، کە زۆربەیان کەسانی بێ چەك بوون و نەیاندەزانی شەڕیش بکەن، ئەوە جگە لە ئەشکەنجەدانی دیلەکان و سووکایەتی و دەستدرێژیکردنە سەر هەندێکی دیکەیان و دواتریش گوللەبارانکردنیان. هاوڕێ عومەر کەمێك ویژدانتان هەبێت، من لەبەر ئەوە تووڕە و بێزارم بە دەستی خۆمان گەنجەکانمان لە پێناوی هیچدا لە گۆڕ دەنێین، هەتا بەم جۆرەش بمێنینەوە مەحاڵە نە هیچمان دەست دەکەوێت و نە سەرکەوتنیش بە چاوی خۆمان دەبینین.

- گوێم لێ بوو یەکێک لە پیرەکان هەڕەشەی لەسێدارەدانی لە هەندێک لەو هاوڕێ بێزار و تووڕانە کردبوو کە گوایە هۆکاری ئاژاوە و دەنگەدەنگی ناو بارەگاکانن، بە پاساوی ئەوەی گوایە ئەو سزادانە توندە دەسەڵاتی بەرپرسان بەسەر پێشمەرگە تووڕە و بێزارەکاندا دەسەپێنێتەوە.

- منیش گوێم لەوە بووە، ئەرێ بۆ ئەو پیرە وا باشتر نەبوو لەجیاتیی هەڕەشەکردن، جێگەکەی خۆی بۆ کەسێک لە خۆی شایستەتر چۆل بکات؟ ئاخر بە دەیان کەسمان لێ شەهید بوون، ئەویش تازە بە تازە لەدەستدانی پێگە و پلەوپایەکەی خۆی دەترسێت، ئەمە چ بێویژدانییەکە؟! جگە لەوەش نازانم بۆچی پیرەکان لەو کەسانەی وازیان هێنا و پابەندی بڕیارەکان نەبوون، دڵتەنگ و تووڕەن؟ بۆچی دەبێ لێیان بترسن؟ ئەوانە جگە لە هەندێک زۆربلێ هیچی تر نین و هەرگیز هیچیشیان لە دەست نایەت. من بە ڕاشکاوییەوە دەیلێم و باکیشم بە کەس نییە، چی دەڵێن و چیم بەرانبەر دەکەن من زۆر جیاوازییم لەگەڵ ئەوانەدا هەیە، ئەوانەی تەنها و تەنها هەر قسان دەکەن و جگە لە زۆربلێیی و چەنەچەن بەولاوە هیچی تریان پێ نییە!

- هەڵبەتە تۆ جیاوازیت، لەبەر ئەوەی زۆر گوێ بە زۆربلێیی ئەوان نادەیت، بەڵکوو...

لەم کاتەدا مامۆستا عومەر قسەکەی پێ بڕێ و دەستی لەسەر ملی دانا وەک ئەوەی بیەوێت بیخنکێنێت، ڕەحمان ئۆفێکی لێ هەستا، عومەریش هەوڵی دا بە زۆر زەردەخەنەیەکی بۆ بکات و گوتی:

- چیتە بۆ وا پف درایت، من گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، بەڵام ڕەحمان تۆ دەزانیت قسەی پیرەکان ڕێک شایستەی

ئەوانەیە، لەبەر ئەوەی لە هەمـــبەر ڕووداوەکانـــدا هـــیچ هەڵوێستێکیان نییە، تەنها هەلومەرجێک بە ڕێککەوت ئەوانی گەیانـدە ئەو پـلە و پـێگەیە، گەلـیش چەپـڵەی بـۆ کـوتین و بەدوایاندا کەوتنە ڕێکردن، ئەوەیان لە یاد چوو کە گەل چەپڵە بۆ هەمـوو کەسێکی تـازە و هـاتوویەکی نـوێ لـێ دەدات و نەفـرەتیش لە هەمـوو کـۆن و ڕۆیشتوویەک دەکـات. گەلێکـی دواکەوتـوون، دروشـمە هەمیشـەییەکەیان: "هەرکەسێك دایکـم بهێنێـت پێـی دەڵـێم مـامە"، دەزانـی ئەم وتە نەسـتەقە چـی دەگەیەنێت؟! بەهەرحاڵ ئەو پیرانە لە ماوەی پەنجاکاندا خەریـك بوون ببنە مامەی میللەت، هەتا خودی سۆڤیەتییەکان پیرۆزباییـان لەو هاوسەرگیرییە کرد و ڕەزامەندیشیان لەسەری دەربڕی، بەڵام پیرەکان هیـوا و ئومێدی خەڵکیـان تێـك شـکاند و شـایانی ئەو زاوایەتییە نەبوون و هەر لە بنەڕەتەوە ئەم هاوسەرگیرییەیان ڕەت کردەوە.

ڕەحمان گوتی:

- هەڵبەتە ژنەکە ناشیرین بووە.

دیسانەوە مامۆستا عومەر گوتی:

- بە پـێچەوانەوە، ژنەکە جـوان و شۆخوشـەنگیش بـوو، هەمـــوو لایەنەکـــان لیکـــی دەمیـــان بە لالغاوەیانـــدا بـــۆی دەهاتەخوارێ، ئاخر کـێ لە دونیـادا حەزی لە دەسـەڵات نیـیە؟ بۆیە خەڵکی پشـتی تـێ کـردن و پرسـیاری ئەوەی لـێ کـردن، کەواتە پیرەکـان بـۆچی و بەرەو کـوێ ڕێبەرایەتیمـان دەکەن، ئەگەر نەمانگەیەننە دەسەڵات؟

- لەوانەیە هەر بە ڕاستی خەسێنرابن.

مامۆستا عومەر بە داوای لێبوردنەوە گوتی:

- ڕێك شتێكی لەو جۆرەیە، یان دەتوانین بڵێین پیرەكان كەسانی باش و چاوچنۆك نین و داواكارییەكانیشیان سادە و ساكار و كەمن، خۆ لەوانەیە دروشمی "قەناعەت گەنجینەیەكە و لە بن نایەت"یان بەرز كردبێتەوە. تەنها كەمێك ناوبانگ و پلەوپایەی ناو سەركردەی هێزە چەكدارەكانی تر و لە لایەك دۆستایەتی و ڕێزی مام جەمال و لە لایەكی دیكەشەوە ڕێزگرتنی مەحموود بورهانی بۆیان بەس بووبێت، بەڵكوو هەتا خودی دیكتاتۆریش ڕێزیان لێ دەگرێت و ئازاریان نادات، بە مەرجێك ئاستی جەماوەرییان فراوانتر نەكەن، لەبەر ئەوەی لەو حاڵەتەدا هەر كاتێك نینۆكیان درێژتر بێت، ئەوا بۆیان قوت دەكات، وەك ئەوەی ئێستا بۆی قوت كردین، ئەوەندە بەسە كە دیكتاتۆر بەو خوێنڕێژی و سەرشێتییەی خۆیەوە بە خەراپە دەستی بۆ هیچ كەسێكیان درێژ نەكرد، لە كاتێكدا توانای قڕكردنی هەموویانی هەبوو، كەچی ناوەناوە پەلاماری ئێمەی ڕۆڵەی ڕەنجدەر و ڕەنجەڕۆكان دەدات و ئەوەی ناكرێت پێمانی دەكات، ئاخر دیكتاتۆریش پیلان و پلانی خۆی هەیە، ئەو بیر لە قڕكردنی هەموو ئەوانە ناكاتەوە كە پیرەكان پشتیان پێ دەبەستن، چونكە مانەوەی پیرەكان بۆ ئەوی بەسوودە، ئەوان لە گۆڕەپانەكەدا بەرهەڵستكارن و بە ئاسانییش توانای بەسەریاندا دەشكێت، دەیەوێت پەنجەیان پاشەڵی نەڕووشێنێت، ئەمەیان لە گەمە سیاسییەكاندا زۆر گرنگە، تا ئەو ئاستەی ئەگەر پیرەكان پەنجەشیان نەمێنێت، ئەوا دیكتاتۆر پەنجەیان بۆ دروست دەكاتەوە، بەڵام كورتتر لە پێوانەی پاشەڵی و بەبێ نینۆكیش، هەتا هەستی پێ نەكات، هێ هێ هێ، ئاخر ئەوە سیاسەتە ئەزیزم.

- وای لەو كارەساتە. واتە ئێمە جگە لە سەربازی

شەترەنج بەولاوە شتێکی دیکە نین، خەون دەبینین و دەناڵێنین و بەبێ هیچ هۆیەك دەکوژرێین و تەنها خۆمان فریو دەدەین، ئەوەی گەورەکان نەخشەکاری و پلان و پیلانرێژی بۆ دەکەن، هەر ئەوە دەبێت؟

- ڕێك وایە.

- کەواتە نەفرەت!

دوای ئەوەی دەروونی مامۆستا عومەر لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیە کەمێك ئارام بووەوە، دەروون و ناخی ڕەحمان گڕی گرت و هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ کوژاندنەوە و دامرکاندنەوەی. دوو ڕۆژیش تێپەڕی بوو، هێشتا تووڕەییەکەی دانەمرکابووەوە و هەر لە زیادبووندا بوو، هەستکردنی بە تەنیایی باڵی بەسەرداکێشابوو، ئەو دووری و نامۆییە سەختە، خەریك بوو دەیخنکاند. بە قووڵی هەناسەیەکی وەرگرت و بە منگەمنگێکەوە گوتی: "دەستەکەی ڕۆستیش وەکوو جاران نەماوە". زۆربەی هاوڕێکانی لەدەست داوە، بە تایبەتی ئەو هاوڕێیانەی ڕەحمان بێ بوونی ئەوان ناتوانێت ژیانی ڕاستەڕێ بێت، هەندێکیان بەرەو شوێنی دیکەی دوور کۆچیان کرد و هەر نەگەڕانەوەش، هەندێکی دیکەشیان لە شەڕەکان کوژران و جگە لە یادەوەرییەکانیان شتێکی دیکەیان بەجێ نەهێشت، دەموچاوی تازەش هاتبوونە ڕیزی دەستەکەوە کە زۆربەیان ئەوانە بوون کە لە "پشتئاشان"ەوە پاشەکشەیان کردبووە لایان و پێویستییان بە ڕۆژگارێکە تاکوو فێری حەز و ئارەزووی شەڕکردن دەبن، کاتێك کۆپتەرەکان دەهاتن، زۆربەیان نەیاندەزانی چۆن هەڵسوکەوت بکەن، گڕی کوانووی خۆراك و دووکەڵی زۆپاکانیان وەکوو خۆی دەهێشتەوە و نەیاندەکوژاندەوە، ئەمەش ئاماژە و ڕێنماییەکی باش بوو بۆ ئەوەی فڕۆکەکان بارەگا و

سەنگەرەکانیان بزانن و دایانکوتن، یان هەر بە پێوە ڕادەوەستان و دەستێکیان دەخستە سەرچاویان تاکوو بەری خۆرەکە بگرن و بە جوانی لە ئاسمانی ناوچەکەدا فڕۆکە و کۆپتەرەکان ببین و ئەوانیش بیانبینن و بیانکەنە نیشانەی ڕۆکێت و شەستیرەکانیان، وەك ئەوەی بۆ ئەوە هاتبێتنە ئاسمانی ناوچەکە تاکوو نمایشێکی فڕۆکەوانی تێدا بکەن، یاخود تەنها بۆ ئەوە هاتوون بە دوای پێشمەرگە کۆنەکانی دەستەی ڕۆستدا بگەڕێن و پەیوەندییان بەوانەی دیکەوە نەبێت. ئەوانەی لە پشتئاشانیشەوە هاتبوون پێشمەرگەکانی دەوروبەری خۆیان دەبینی بە قەڵەمبازێك و لە چاوترووکانێکدا خۆیان دەگەیاندە پەنا بەرد و ناو سەنگەرەکان، یان لەسەر سك ڕادەکشان و جووڵەیان لە خۆیان دەبڕی و بە دەنگی بڵندەوە بەوانەی دیکەیان دەگوت: "ئاگرەکانتان بکوژێننەوە... بیکوژێننەوە و پەرتەی لێ بکەن". کاتێکیش کۆپتەرەکان بەبێ تەقە و شەڕکردن ئاسمانی ناوچەکەیان بەجێ دەهێشت، یەکێك لەوانەی لە پشتئاشانەوە هاتبوون، بە سەرسامییەوە دەیپرسی: "ئەوە چیتانە بۆ ئەوەندە لێیان دەترسێن؟! خۆ ئەوانە زۆر لێمانەوە دوورن!" یەکێك لە پێشمەرگەکانی ئەوێ بە تەوسەوە وەڵامی دەدایەوە: "ئێمە ترسنۆکین و فڕۆکەکان دەمانتۆقێنن". ئیدی هەموویان دەیاندایە قاقای پێکەنین و دەستیان بە توانج و پەلاری جۆراوجۆر دەکرد و درێژەیان دەدایێ، پاشان هەر کەسە و دەگەڕایەوە سەر کارەکەی خۆی، ئەو ئافرەتەی نهێنییەکەی ڕەحمانی دەزانی بە پەرۆشەوە بە دوایدا دەگەڕا، لێرە و لەوێ پرسیاری زۆری کردبوو، تا لە کۆتاییدا دۆزییەوە، نزیکەی دوو سەد هەنگاوێك دوور لەوانەی دیکە لەژێر سێوورە چنارێکی بچووك دانیشتبوو، پشتی بە بەردێکی گەورەوە دابوو، نوقمی خوێندنەوەی یەکێك لە کتێبەکان بوو، لەبەردەمیدا دانیشت بێ ئەوەی یەك پیتیش بڵێت،

چیلکەیەکی وشکی بە دەستەوە بوو و لە زەوییەکە خەریکی هێلکاری بوو، وا پێ دەچوو چاوەڕوانی تەواوکردنی دوا دێڕەکانی دەقەکەی بەردەستی بێت و کتێبەکە دابخات، وەك ئەوەی لەگەڵ کەسانی دیکەش ڕوو دەدات، کاتێك لە ناکاو خوێندنەوەکەی لێ دەپسێنن، وەلێ بێدەنگییەکەی نێوانیان درێژەی کێشا، ڕەحمان لاپەڕەیەکی دیکەیشی هەڵدایەوە بۆ خوێندنەوە و بەردەوام بوو لەسەری، وا پێ دەچوو ئەم هەڵسوکەتەی بە ئەنقەست بوو بێت، چونکە هەر کە بینی بۆ لای هات، ئیدی ئەم وا خۆی نیشان دەدا کە دەخوێنێتەوە، لەبەر هۆیەك کە خۆیشی نەیدەزانی چییە، ئیدی ئافرەتەکە بە دەنگێکی نەرمونیانەوە، بەڵام جێگیر و چەسپاو گوتی:

- گوندنشینەکان زانیویانە... پێشبینی چی دەکەیت ڕوو بدات؟!

ڕەحمان بێ ئەوەی ڕووی لە کتێبەکە لا بدات گوتی:

- باسی چی دەکەیت؟!

- دەربارەی قاسم و عەولا... هەردوو کوژراوەکە؟!

ڕەحمان سەری لەسەر کتێبەکە هەڵبڕی و بە پرسیارەوە سەرنجی سرەواندە ڕوخساری:

- چییان لێ هاتووە؟!

- گوندنشینەکان بە مەرگیان زانیون.

- گورگەکان هیچی وایان لێ هێشتوونەتەوە، تاکوو بدۆزرێنەوە؟!

ئەمەی گوت و دیسانەوە وا خۆی نیشان دایەوە کە دەخوێنێتەوە و ئەو کارە هیچ پەیوەندی بەوییەوە نەبێت،

ئافرەتەکە دیسانەوە پرسییەوە، بەڵام ئەم جارەیان کەمێك دوودڵی بە دەنگییەوە دیار بوو:

- پێشبینیی چی دەکەیت ڕوو بدات؟!

- هیچ شتێك!

بە کورتی وەڵامی دایەوە و کتێبەکەی داخستەوە. کە سەرنجی لە ڕوخساری گرت، بینی ورژووێنەر و خۆشەویستە، وەك ئەوەی یەکەم جاری بێت بیبینێت، جۆشوخرۆشێکی جوان باڵی بەسەردا کێشا و توانای شاردنەوەی نەما، بە تایبەتی دوای ئەوەی لە چاوەکانیدا بریسکەیەکی پڕ لە سۆزی بینی تیشك دەداتەوە و ئاماژەی هەڵگیرسانی گڕکانێکی ئارەزووە و لە ماوەی ئەم دوو ڕۆژەی ڕابردوودا کۆ بوونەتەوە، چیتر لە توانایدا نەماوە بیچەپێنێت و بیشارێتەوە، پرسی دۆزینەوەی تەرمی قاسم و عەولاش لە لایەن گوندنشینەکانەوە شتێك نییە، جگە لە دەرفەتێك کە لە ئاسمانەوە بۆی دابەزیبێت، تاکوو پاساوی گەڕان بە دوای و پەرۆشی و خرۆشی دیدار و بینینی بۆ بهێنێتەوە.

بە کەمێك ڕووگیرییەوە گوتی:

- دەزانی بیرم لێ دەکردیتەوە و ئارەزووی بینینت بووم.

بزەیەکی مەکربازانەی بۆ کرد و دەستی لەسەر گۆشەیەکی لێوەکانی دانا و بەرزی کردەوە و گوتی:

- دە بزەیەکت بێتێ خۆ دونیا وێران نابێت، بۆ وا مڕومۆچیت و برۆکانت بەیەکدا داون؟

بزەیەکی دروستکراوی خێرا لەسەر ڕوخساری ڕەحمان دەرکەوت و لە نیو چرکەدا ڕەوییەوە:

- له هه‌مان شوێندا ده‌تبینم؟!

- هه‌تا بمێنم جارێکی دیکه ڕوو ناکه‌مه‌وه ئه‌وێ.

- که‌واته له کوێ بتبینم؟

- له دۆڵه‌که، پێچه‌وانه‌ی ڕێڕه‌وی ئاوه‌که، دوای تاڤگه‌که، پێش نانی ئێواره به دوو کاتژمێر له‌وێ به دوامدا بگه‌ڕێ.

- بۆچی به‌دواتدا بگه‌ڕێم هه‌ی مه‌کرباز؟!

- چونکه ئه‌گه‌ر له‌مه‌ودوا بته‌وێ بمبینیت ده‌بێ به‌دوامدا بگه‌ڕێیت.

- چییه ده‌ستت به مه‌کر و فێڵی ژنانه کردوه‌وه، هه‌ی خۆبه‌خۆ بن.

- بێده‌نگ به ماموٚستا عومه‌ر و سعوود هاتن.

چه‌ند چرکه‌ساتێکی کورت تێپه‌ڕین به‌رله‌وه‌ی بگه‌نه لایان، هه‌ر که دانیشتن، سعوود یه‌کسه‌ر گوتی:

- هاوڕێکه‌ت له‌گه‌ڵ براده‌ره‌که‌ی مردن.

ڕه‌حمان به گوێپێنه‌دانه‌وه پرسی:

- مه‌به‌ستت کێیه؟!

ماموٚستا عومه‌ر گوتی:

- قاسم و عه‌ولا!

ڕه‌حمان به منگه‌منگ و ساردییه‌که‌وه گوتی:

- به ڕاستی مردوون؟ چۆن مردن؟!

- له تاشه‌به‌رده‌که‌وه که‌وتوونه‌ته خواره‌وه.

- مردنێکی چاکە!

سعوود بە سەرسامییەوە گوتی:

- دوو ڕۆژ بەسەر مردنەکەیاندا تێپەڕیوە و بۆنی هیچمان نەکردووە.

- گورگ هیچی لێ نەهێشتوونەتەوە تاکوو بۆنی بکەیت.

مامۆستا عومەر بە سەرسامییەوە گوتی:

- چ وەڵام و پەرچەکردارێکی ساردوسڕت هەیە.

- دەتەوێ چی بکەم؟!

- کەمێك سەرسام بوون، بۆ نموونە.

- باشە، پێت سەیر دەبێت و سەرت سووڕ دەمێنێ ئەگەر بڵێم سعوود بە پاژنەکانی دوو دووپشکی پلیشاندۆتەوە؟

- بە لایەنی کەمەوە بێزم دەبێتەوە.

- زۆر باشە، ئەوەتا منیش بە مردنیان بێزم دەبێتەوە، چیترت دەوێ؟

سعوود بە دوای قسەکانی ڕەحمان و ونبوونی هەردوو جەستەکە گوتی:

- جووتیارەکانیش جەختیان لەوە کردەوە کە تەنها هەندێك ئێسکوپرووسکی پەرشوبڵاویان لە دووری یەکتر دۆزیوەتەوە.

ئافرەتە چەکدارەکە گوتی:

- کەواتە گوندنشینەکان چۆن ئەوانیان ناسیوەتەوە؟!

مامۆستا عومەر لە کاتێکدا سەرنجی بڕیبووە ڕوخساری ڕەحمان، بە منگەمنگەوە گوتی:

- دیارە عەولا پێشتر بە باوکی ڕاگەیاندووە کە ئەوان دەچن لای تاشەبەردەکە هەنگوین دەهێنن، دوای تێپەڕبوونی دوو ڕۆژ کە نەگەڕاونەتەوە، ئیدی ئەمانیش نیگەران بوون و لەگەڵ جووتیارانی دیکەدا بەدوایاندا گەڕاون، لەوێ تەنەکەی دووکەڵەکە و دۆلکەی هەنگوینەکە و پاشماوەی لەتوپەتی ئەوان و لە سەرەوەی تاشەبەردەکەش چەك و تاخمی هەردووکیانیان دۆزیوەتەوە، دواتر دوو گوندنشین هاتن و ئێمەیان لەو ڕووداوە ئاگادار کردەوە، لەبەر ئەوەی دەیانزانی قاسم لەگەڵ ئێمەیە.

ڕەحمان بە منگەمنگێکەوە:

- لەدەستدانی ئەو قاسمە زیانێکی گەورەیە.

مامۆستا عومەر بە دەنگێکی داخدارەوە گوتی:

- لە پایدۆز و کنەکردن و دەرچوونەکانمان سوودێکی بۆمان هەبوو.

دیسانەوە ڕەحمان بە منگەمنگەوە:

- هەڵبەتە بۆتە مایەی ژانێکی گەورە لە گەدەی گورگەکان.

سعوود لەو کاتەی ڕوخساری کرانەوەیەکی پێوە دەبینرا و دەیویست بابەتەکە بگۆڕێت، گوتی:

- ژمارەمان لێرە زیادی کردووە و لەوبەر لوتکەی ئەو شاخەوە بە دووری نیو ڕۆژە ڕێگا بارەگایەکی دیکەمان دروست کردووە، لەگەڵمان دێیت، یان لێرە دەمێنیتەوە؟

- ئەگەر ئێوە بمێننەوە، منیش دەمێنمەوە، ئەگەر بڕۆن، منیش دەڕۆم.

- کەواتە تۆش لەگەڵمان دێیت.

- بەڵێ دێم، بارەگاکەی ڕۆستیش وەکوو جاران نەماوە.

- ئیدی لەمەودوا چیتر تێکڕای شاخەکان تۆزقاڵێک خۆشیم پێ نابەخشن.

هەروەها مامۆستا عومەریش وای گوت و هەستا و ڕۆیشت، لە کاتێکدا سعوود و ئافرەتەکە لەگەڵیدا مانەوە و ئیدی گفتوگۆ و قسەوباسەکانیان لە بابەتێکەوە بە بابەتێکی دیکەوە گرێ دەدا، تا ئافرەتەکە گوتی:

- ڕەحمان تۆ بۆچی وات لێ هاتووە؟!

- من چیم لێ هاتووە؟! لە مەبەستەکەت تێنەگەیشتم!

- مەبەستم ئەوەیە تۆ کەسێکی نەرمونیان و هێمن دیاریت، کەس نوقلانەی ئەوە لێ نادات کە تۆ ئەو هەموو ڕق و تووڕەییەت تێدا بێت، وێڕای گاڵتە و شۆخییەکانت لە هەندێک جاردا.

ڕەحمان بە سەرسامییەوە گوتی:

- چ ترسێکە؟! ئەوە چییە هەمووتان بە هەمان شێوە و بە هەمان ڕێگە باسی من دەکەن؟! بەر لە دوو ڕۆژ مامۆستا عومەریش هەمان قسەی کرد. دەی دەی پێم بڵێ باسی چیی من دەکەن؟! شتێک لە پشتی منەوە ڕوو دەدات، دەبێ چی بێت؟!

- هیچ شتێک لە پشت تۆوە ڕوو نادات و هیچ کەسێکیش باست ناکات، ئەوە ڕێککەوتە مامۆستا عومەر پێش دوو ڕۆژ

ئەو باسەی لەگەڵ کردبیت، ڕوخساری تۆ هەمیشە گرژەو وا دەردەکەویت کە دڵڕەق بیت، ئەمە هەموو کێشەکەیە.

- ئێ با کەللەڕەق بێت، ئێوە چ زیانێکتان لەوە کردووە؟!

سعوود ئەمەی بە دەنگێکەوە گوت، کەمێك بۆنی داخ و خەمی لێ دەهات:

- ئەو هەرگیز ڕۆژێك مرومۆچ نەبووە، تەنها مەگەر ئەو کاتەی بۆ خۆشی وا خۆی نمایش کردبێت.

ڕەحمان بە خەفەتێکەوە، کە ناخی مرۆڤی دەهەژاند گوتی:

- ئێوە هیچ شتێك نازانن.

ئافرەتەکە گوتی:

- دەی کەواتە پێمان بڵێ و بەرچاومان ڕوون کە.

- بۆچی؟

- بەڵکوو یارمەتیت بدەین.

- لەبەر چی؟!

- ئەی هاوڕێ نین؟

- کەس توانای یارمەتیدانی منی نییە. من ئامادەم نیوەی تەمەنمی پێ ببەخشم ئەگەر توانای یارمەتیدانی منی هەبێت.... وەلێ هەیهات!

ئافرەتەکە بە ناسکی و بەزەییەکەوە گوتی:

- دەی قسە بکە شتێك لە دەست نادەیت.

ڕەحمان ماوەیەك بێدەنگ بوو. پاشان بە دەنگێکی نائومێدانەوە گوتی:

- ژیانم زنجیرەیەکی بەردەوامە لە ژان و ئازار.

سعوودیش بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

- تۆ تەنها کەسێك نیت وا بیت، ئێمە هەموومان ژیانمان زنجیرەیەکی بەردەوامە لە ئەشکەنجە و خەم.

ڕەحمان درێژەی بە قسەکانی دا، وەك ئەوەی بیەوێت لەو مۆتەکەیەی ماندووی دەکات باری خۆی سووك بکات، وەك ئەوەی هەڵەکار و گوناهبارێك لە حزووری قەشەیەکدا دادەنیشێت و دان بە هەموو تاوانەکانی خۆیدا دەنێت، تاکوو لە خەم و ئازارەکانی کەم بکاتەوە. ڕێك وەك ئەوەی مامۆستا عومەر بەر لە دوو ڕۆژ هەرچی ئازاری دەدا درکاندی و ئاسوودە بوو، لەوانەیە ڕەحمانیش ئارەزووی هەمان دڵنەوایی بکات، تاکوو لە بەدەستهێنانی کەمێك ئاسوودەیی یارمەتی بدات، بۆیە گوتی:

- من تاکە کەسم ئازار دەچێژم و هەتا ڕۆژی دوایی ژیانیشم هەر دەبێ ئەو ئەشکەنجە و ئازارە بخۆم، من تاکە کەسم ئەمڕۆکە مەرگی خۆم دەخوازم بەر لە سبەینێ، من ئیرەیی بە ژیانتان دەبەم، ئێوە لە بەهەشتدا دەژین، چەند ئارەزووی دزینی چرکەساتێکی ژیانی پڕ لە خۆشیتان دەکەم! دوایی با هەر بمرم. خۆزگە هەرگیز ڕووم لەم شاخە نەفرەتییانە نەکردبووایە، هاتم بۆ ئێرە تاکوو تۆڵە لەو دڕندانە بکەمەوە کە لە زینداندا ئەشکەنجەیان دام، ئەوانەی ئەشکەنجە و کارە دزێوەکانیان هەموو دڕندەکانی دونیای بە ئاگا هێناوەتەوە و لە ناخی مندا نیشتەجێی کردوون، پاشان تۆڵەم کردەوە، خۆزگە هەر نەمکردبووایە.

سعوود لێوەکانی خۆی کرۆشت و گوتی:

- سێ ساڵە لەگەڵ تۆدا دەژیم، ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرم لەوە نەکردبووەوە کە تۆ ئەو هەموو ڕق و کینە و تووڕەییە لە ناخی خۆتدا هەڵدەگریت.

- سعوود ئەوە بە دەستی خۆم نییە، هەموو شتێك لە دەستم دەرچووە، منیش دەمتوانی نمایش بکەم، تاکوو وەکوو ئێوە بم. پێدەکەنیم و چەنەبازیی زۆرم دەکرد و فەلسەفەی زۆرم لێ دەدا. شتێکم دەگوت و لە هەمان کاتیشدا هەستم بە شتێکی دیکەی زۆر جیاوازتر دەکرد، جاری وا هەیە دڕندەکە سەر دەردەکات و لە جڵەوی خۆی دەردەچێت و ڕەشمە دەپسێنێت، جاری واش هەیە هێمن دەبێتەوە و مرۆڤێکی سادە دەردەکەوێت، هەرچەندە ئەگەر سەرخۆشیش بێت و بەلادا بێ.

ئافرەتەکە گوتی:

- هەر هەموو ئەمانە بە هۆی زیندان و ئەشکەنجەوە؟

- تۆ پێت وایە ئەشکەنجەدان کارێکی وا ئاسانە؟! ئاخر زیندان دۆزەخە دۆزەخ، لەوێ لە شوێنێکی وا قێزەون و پیس و گەنیو داتدەنێن و دەتبەستنەوە و خەلقەندە مرۆڤە بەدڕەوشت و هیچوپووچەکان قونکە جگەرەکانیان لەسەر جەستەت دەکوژێننەوە، چزەچزی ئەو پێست و گۆشتەت بۆنکڕووزی بەری ئاسمانی تەسکی ژوورەکە دەگرێت، یان بەر تەزووی کارەبات دەدەن، زیرە لە ڕۆحتەوە دەردەکەن، وای لە ئازاری تەزووی کارەبا... وای! ئەوانیش قاقای پێکەنینی ڕابواردنیان و سووکایەتیکردنیان بە زیندانییەکان بەری ئاسمان دەگرێت و دەگاتە کەشکەڵانی فەلەك. تۆ لە ئازاری خۆت هاوار دەکەیت و ئەوانیش قاقا پێت پێدەکەنن. هەر خولەکێك، خولەکی چی تۆ بڵێ هەر چرکەیەك کە ئەشکەنجەت دەدەن و بەسەرتدا

تێـدەپەڕێت لە ناختـدا هەزاران دڕنـدە و جنـۆکە دەخـولقێنن و چڕنووك و کەڵبەیان لە ناخت گیر دەکەن. خۆ ئەگەر باڵ بەسەر جیهاندا بکێشن، بێگومانم هەڵیدەلووشن، بۆ کەس هەیە بتوانێـت لە چنگیان دەربازی بێت.

سعوود گوتی:

- لە هەمـــوو لایەکەوە دڕنــــدە و جنۆکەیـــان بەرداوەتە وێزەی ئەم وڵاتە و کەس نیـیە بەشـی خـۆی تێـری لەو ئـازار و ئەشکەنجانە نەخواردبێت کە ئەمانە کردوویانەتە پیشەیان.

- ڕێـك وایە، وڵاتـی دڕنـدە و جنۆکەکـان، وەلـێ هێشـتا ماویەتی، دڵنیام ڕۆژێـك دێـت مرۆڤەکـان یەکتـری حەپەلـووش دەکەن.

ئافرەتەکە گوتی:

- بەڵام تۆ کەسێکی ڕۆشـنبیر و هەسـتیاریت، هەر دەبـێ ڕۆژێ مرۆڤەکان لە ناختدا بەسەر دڕندەکاندا زاڵ بن.

ڕەحمان گوتی:

- لەوانەیە پێشتر... ئێ، بەڵام تازە هەیهات، کـات تێپەڕی و مەحاڵە شتی وا ڕوو بدات.

سعوود بە هاندانەوە گوتی:

- ڕەحمان هێشتا کات تێنەپەڕیوە.

- بەلکـــوو دەمــێکە تێپەڕیـــوە، لەبەر ئەوەی ئـــازار و ئەشـــکەنجەدان هێشـــتا لە جەســـتەمدا بەردەوامە و نەبـــڕاوەتەوە، ئێستاش چزە و ئازاری ئاگری جگەرەکانیان، بۆنکرووزی کـونە لـووتم دەچـزێنێتەوە، هەر چـرکە و سـاتێکم ژان و ئەشـکەنجە

چەشتنە، تا ئەو ئاستەی دڕندەکان بوونە بەشێك لە خۆم و تیامدا دەژین، دەژین و هەرگیزیش نامرن.

ئافرەتەکە گوتی:

- ئێستا چی ئازارت دەدات؟!

- ئەوەی ئێستا ڕۆحم دەرزیئاژن دەکات و ئازارم دەدات، ئەوەیە کە هەرگیز ناتوانم پەی بە ئارامی و ئاسوودەیی ببەم، تا مردن، من لە بەردەم ئێوەدا نمایشی ئارامی دەکەم، ئەگەرنا هەر ئێستا کە لەگەڵتاندا دەدوێم خەریکە شێت و پارچەپارچە دەبم، تێکڕای ئەوانەش لە سۆنگەی ئەو ئازار و تاڵاوی مەرگەوەیە کە دەینۆشم و تێیدا کینگڵ دەدەم و خۆم دەخۆمەوە.

- چۆن؟!

- شتێك،لە ناخمدا لە کار کەوتووە، هۆیەکەی نازانم، دەنگێك لە مێشکمدا دەڵێی ئاشی ئاولێبڕاوە خەریکە وێرانم دەکات و دونیا هەڵدەگرێت هەر زرم و کوتیەتی، ڕێك دەڵێی تەقەتەقی مەنجەڵ و هاژەی تاڤگەیەکی سەرشێتە و گابەردەکانی خوارەوەی کونکون دەکات، دەنگی تەقینەوەی بەردەوام، بۆ ساتێکیش گرمەوزرمەیان ڕاوەستان نازانن، بۆیە ناچارم هەتا لە کاتی خەوتنیشدا خۆم لەگەڵیاندا ڕابهێنم ئەگەرنا دەبێ دەمودەست کۆتایی بە ژیانی خۆم بهێنم، ئەمە چ ئازارێکە منی تێدام؟!

سعوود پەی بە دژواری و ئاڵۆزی ئەو دۆخە برد کە ڕەحمان بە دەستییەوە زەلازەلایەتی، بۆیە ویستی بە سۆزەوە بیدوێنێت و بە دەنگێکی خەمبار و ناسکەوە گوتی:

- ئەی بۆچی پێشتر باسی ئەوەت نەکردووە؟! ئێستاش

گوێت لەو ژاوەژاو و هەراوزەنایەی ناو مێشکی خۆت دەبێت؟!

- ئێستا و لەو کاتەوەی هێرشمان کردە سەر فەرمانگەی گۆڕینی مرۆیی، یان ڕوونتر بڵێم دایەرەی ئەمن، لەو کاتەوە و تا ئێستاش من هەموو چرکەساتێکی ژیانم ئازار دەچێژم و دەمرم، هەموو ڕۆژێك ئەو هەراوزەنایە زیاتر دەبێت و کەم ناکات و ناڕەوێتەوە، بەم بێدەنگییەم فریو مەخۆ و ئەو شۆخی و گاڵتەوگەپانەشم هەڵتنەخەڵەتێنن کە هەندێك جار دەیانکەم، هەموو ئەمانە درۆ و نواندنن، سەرجەمیان ڕاکردنێکی ئاشکران بۆ خۆسەرقاڵکردن لە چیرۆکێك لە چیرۆکەکانی، کە ساتێکی کەم بیر و هزرم لەو هەراوزەنا تواناپڕووکێنە دوور دەخەنەوە کە هەمیشە پێمەوە نووساون و مەحاڵە خۆمیان لێ دەرباز بکەم.

ڕەحمان چاوەکانی داخست و نوقمی فرمێسکی کردن، دڵۆپە فرمێسکێك بەرگەی قەتیسمانی لەناو پێڵووی چاوەکانیدا نەگرت و وەکوو پەنجە ماسییەکی غەمگین، خۆی هەڵدایە ئامێزی هاتونەهاتەوە، "یا هورمان لە جێی نەرمان"، خۆی لەسەر گۆنا شەقارشەقاربووەکەی گرتەوە، دەیویست بەهەرحاڵێك بێت خۆی بخزێنێتە ناو درزی ڕوخسارە خەمبارەکەیەوە و دڵنەوایی بکات، وەلێ لەوێش خۆی بۆ نەگیرا و کەوتە خوارەوە، سەری خستە قەد گابەردەکەی پشتی و دەستی بە منگەمنگ کرد و ژنەکە و سعوودی لە بیر کرد، وەك ئەوەی هەر لەوێش نەبن. ئافرەتەکە بە بێدەنگی تەماشای سعوودی کرد، ئەویش ئاماژەی پێدا کە بە بێدەنگی دابنیشێت و هیچ قسەیەك نەکات، هەستی بەوە کرد کە ڕەحمان هۆشی لای ئەوان نەماوە و بێ ئەوەی

پەی پێ ببات و درکی پێ بکات لە خەیاڵێکی قووڵ ڕۆ چووە، وەك کەسێك دەردەکەوت کە بە دەنگی بەرز بیر دەکاتەوە.

ڕەحمـان بە هێمنـی و خەمبـاری و ناسـۆرێکی ئەوتـۆوە لە قسەکردن لەبەرخۆیەوە بەردەوام بوو، خەریك بـوو بیخنکێنێـت، ئافرەتەکە بێئەندازە دڵی پێ سووتا و بەزەیی پێدا هاتەوە، ئەویش لەگەڵ خۆیـدا بیـری کـردەوە: "کەواتە ئەم شـتەیە کە ژیـانی لەتـلەت و کـاول دەکـرد، منـیش بە هەوەسـی خـۆم داوای خەندەیەکی لێ دەکەم، ئاخر چۆن توانـای بزەیەکـی هەبێـت و خەنـدەیەك لە ڕوخسـارییەوە دەرکەوێـت، کە ئەو بەو بەڵایەی هاتۆتەسەری ئازار دەچێژێت و دەناڵێنێت و هەر بە ڕاسـتی نغـرۆ بـووە، وای چ ئەشـکەنجە و ئـازارێکە؟!" سـعوودیش لە نێـوان خـۆی و ئەودا کەوتە بیرکـردنەوە: "ئەگەر مـن لە جـێگەی ئەو بوومایە خۆم دەکوشت و لەو ئازار و ئەشکەنجەیە خۆم ئاسوودە دەکرد، بە درێژایی ڕۆژ دەنگەدەنـگ و ژاوەژاو و هەراوزەنـا لە مێشکیدا، هەتا لە کاتی خەوتنیشدا، ئەوە چ ژیـانێکە...؟!". وەلـێ کە ڕەحمان وەخۆ هاتەوە، یەکسەر قسـەکانی بـڕی و بەرلەوەی خۆی بخزێنێتە جیهانی بێدەنگی و تێیدا نقوم ببێت، بە دەنگێکی پڕ لە تکا و پاڕانەوە پێی گوتن:

- بە یارمەتیی خۆتان ئەگەر بە تەنها جێم بهێڵن.

سـعوود ڕاسـتەوخۆ بـێ ئەوەی وشـەیەکیش بڵـێ هەسـتا و ڕۆیشت، ئافرەتەکەش کەمێك دوودڵ و ڕاڕا بۆو، بەڵام ئەویـش هەستا و بە بێدەنگی ڕۆیشت، هەردووکیان سـوور بـوون لەسـەر ئەوەی بەزەیـی خۆیـانی بـۆ دەرنەخەن و دڵنەواییشـی نەدەنەوە،

چونکە دڵنەوایی و بەزەیی پێداهاتنی ئەو جۆرە کەسانە زیاتر نغرۆی ئەشکەنجە و خەم و ئەندێشەی دەکەن، ئیدی بە هەنگاوی لەسەرخۆ و هێواش لێی دوور کەوتنەوە.

هەر کە بە تەنها لەگەڵ خەم و ئەندێشەکانیدا مایەوە، سامانی وەبیر هاتەوە کە چۆن بەرەو ئێران سەری هەڵگرت و ڕۆیشت. لەبەرخۆیەوە دەیگوت: "خۆزگە سامان گیان زووتر دەمناسیت، کەمێکیش لەو ژیری و بلیمەتییەی تۆشم دەبوو!" قسەکانی سامان لە مێشکیدا دەزرینگانەوە و دەنگیان دەدایەوە، باوەڕی بەو قسەیەی کرد کاتێك گوتی: "هەر کەسێك لەم وڵاتە بمێنێتەوە، یان بکوژ یاخود کوژراو دەردەچێت"، ئا ئەوەتا ڕەحمانیش لە یەك کاتدا بووە بکوژ و کوژراویش، واتە هەم جەللاد و هەم قوربانی، ئەوە چ لۆژیك و فەلسەفەیەکە؟! حیکایەتێکە درێژەی کێشاوە و بەردەوامیش دەبێت، ئەوە تەنها حیکایەتی ڕەحمان نییە، بەڵکوو حیکایەتی هەموو خەڵکی و هەر وڵاتێکی هاوشێوەی ئەم وڵاتەیە، ***حیکایەتێکە خەریکە بەسەرهاتی وڵاتگەلێك بگێڕێتەوە دڕندە و مرۆڤی تێدا دەمرن!***
دڕندە چڕنووك بە خوێنەکەی ناخی ڕەحمان هاوسەنگییەکەی لێ زەوت کرد، ئەو مێردەزمەیە باڵی بەسەردا کێشا و ڕۆژگارێك بەرەو لای دڕندە مرۆییەکانی دیکەی برد. بۆیە بە نهێنی هاواری کرد: "ئیدی کاتی تۆڵەسەندنەوەیە، ئەوەتانێ هاتووم و مەرگ بەسەر سەرتاندا بباریێنم!" هەتا زەوییش پێکەوە جێی نەدەکردنەوە و ڕقی تۆڵەسەندنەوەش لە دڵیدا دەتەقێنێتەوە، یان ئەو دەمرێت، یاخود ئەوان، ئەم جارەیان جڵەوی دەستپێشخەرییەکە لای خۆیەتی، لەگەڵ دەستەکەی ڕۆست لە

پەرگەی شار و لە تاریکییەکی ئەنگوستەچاودا لە بۆسەیەکی پۆلاییندان، سەرنجێکی ساردوسڕی سرەوانده بەردەمی خۆی، لەو چرکەساتەدا بیرەوەریی شتێك باڵی بەسەردا کێشا و وای لێ کرد هەموو شتەکانی دەوروبەری بچووك بێتە بەر چاو، هەموو شتەکانی دەوروبەری پووچ و بێ واتان، هەموو شتەکانی دەوروبەری قێزەونن، خۆیشی بە بەشێك لەو پووچی و قێزەونییەی دەوروبەری خۆی دەزانی. هەر چرکەیەك شتێکی تۆقێنەر لە ناخی جەستەیدا گەشە دەکات و دەئاوسێت، هەتا خەریکە جەستەی دەتەقێنێت. ئەم ئادەمییە ڕەحمان نییە، بەڵکوو تارماییەکەیەتی، هیچ شتێك لەو ڕەحمانە نەرمونیانە نەماوەتەوە باسی بکرێت، هەر ڕۆژێك تێدەپەڕی شتێك لە ناخیدا دەمرد و شتێکی دیکە لەسەر داروپەردووەکەی دەژیایەوە، ڕەحمانی ئەمڕۆکە، ڕەحمانەکەی بەر لە ساڵێك نییە و ڕەحمانەکەی بەر لە ساڵێکیش، ڕەحمانەکەی بەر لە دوو ساڵ نییە، ئەو خەریکە لە ونبووندا ون دەبێت و وەکوو ئەستێرەیەکی داکشاو بەرەو نەمان دادەکشێت، هەستەکانی وشك دەبن و دەبنە بیابانێکی پڕاوپڕ لە تۆز و تراویلکە و وشکوبرینگ، چیتر ئەو گاڵتە و شۆخییەی نەماوە، هەتا ئەگەر نمایشی گاڵتەوگەپیش بکات، لەگەڵ خۆیدا زۆر هەوڵی دا قەوارەی خۆی نووژەن بکاتەوە، وەلێ شکستی هێنا و چۆکی دادا، ئێستاش: دەبێ کێ بەسەر کێدا زاڵ بێت؟! دڕندەکە یان مرۆڤەکە؟

دڕندەکەی ناخی خودان هێزێکی تۆقێنەر و ترسناکە، خەریکە مارئاسا دەفیشکێنێت و شێرئاسا دەنەڕێنێت، دەیەوێ قەفەسەکەی وردوخاش بکات و خۆی دەرباز بکات و ئازاد

بێت. به ڕاستی تۆقێنەر و ترسناکە، شتێکی سەیریش نییە ئەگەر مرۆڤ بکەوێتە ئەو ململانێیەوە، ئەگەر لە بەردەم ترسناکیی ئەو دێوەزمە ڕۆچووەی ناخیدا بە شەکەتی و بێهێزی بەلادا بێت، ئەو دێـوەزمە فـیلەتەنەی لەنـاو ئەشـکەنجە و ئـازارێکی پـڕ لە ژان گەشەی کردووە. مشتەکۆڵەی توند کـرد و بیـری لەوە کـردەوە کە کەیفسازییەکەی لێڵ و تەمومژاوی دەکات: "بۆ کوێ دەچن هەی چەپەڵیـنە، هەر دەبـێ تەفروتووناتـان بـکەم، ئێـوە لاقەی پیرۆزییەکانی ژیانتان کرد، کاتێك لە خاکی خەرابات و وێرانەدا ژیانتان بۆ تاوانێکی قێزەون گۆڕی، لاقەی پیرۆزیی ژیانتان کرد، کاتێك مرۆڤەکانتان کوشـت و بە مرۆڤبـوونی خـۆی تاوانبارتـان کرد، بۆ کوێ دەچن هەر دەبێ پارچەپارچە و لەتوپەتتان بـکەم! نەك تەنها خۆتـان، تەنـانەت ئەوانەی دڵیشیان پێتـان دەسـووتێت. هەر دەبێ ئازار و ژانەکانتـان بـکەمە خۆشـی و کاتبەسـەربردنی ڕۆحم، هەر دەبێ خەم و ئەشکەنجەکانتان بـکەمە پرسـەی دڵـم، من تەنها بۆ تۆڵەسەندنەوە هاتووم، کوڕانی نەفرەتلێکراو، کوڕانی جنۆکە و ئەهریمەنەکان، کوڕانی قێزەونییەکانی گەردوون "ئێـوە مرۆڤایەتیتان کوشت!"

هەســـتا، وەك ئەوەی بە زۆر خەوێتـــدرابێت و خواســـت و ئیرادەی لێ زەوت کرابێت، هەر بە پێوە و بێ ئەوەی خۆی تێك بدات، ڕووی لە تەلاری دڕندەکان کرد، بە هەردوو پێی خـۆی بـێ هـیچ بیرکـردنەوەیەك بەرەو مەرگـی مسـۆگەری خـۆی هەنگاوی نا، بێ ئەوەی حیساب بۆ هیچ یەکێك لەوانە بکات کە لە بۆسـەکەدا لەگەڵیـدان، بەمەش ئەنـدامانی دەسـتەکە بێزاریـی خۆیان دەربڕی، سعوود خـۆی بە باسکییەوە هەڵواسـی، بەڵکـوو

هۆشـی بێـتەوە خـۆی و بگەڕێـتەوە، بەڵام خـۆی لە دەسـتی ڕاپسکاند، ئەم شێتە دەیەوێ چی بکات؟! خستیانییە تەنگژەیەکی ترسناکەوە، مامۆستا عـومەر خۆی گەیانـدێ و شانی ڕاکێشـا، تاکوو عەقڵی بێتەوە سەرخۆی، بە تووڕەییەوە بە گوێیـدا چپانـد: "ئێرە ڕەبایە نییە و لەوە زیاتر ناکرێ دزەی بۆ بکرێت". خۆی لە دەستی مامۆستا عومەریش ڕاپسکاند و هەر بە پێوە و بێ ئەوەی خۆی بچەمێنێتەوە و کوورەکوورێك بکات، بەرەو مەرگی خۆی بەڕێوە بوو، مامۆستا عومەر بە ناچاری گەڕایەوە لای دەستەکە و بە چپەوە ناڕەزایی خۆی دەربڕی: "ئەم گەمژەی سەرشێتە بە پێی خـۆی بـۆ دۆزەخ دەڕوات، ئێسـتا چـی بکەیـن؟!" ئەنـدامانی دەستەکە کە لە بۆسـەدابوون، کەوتـنە ئەوپەڕی ئامادەباشییەوە و خۆیـان بـۆ چرکەسـاتەکانی دواتـر ئامـادە کـرد کە دەبـێ چـی لەگەڵ خۆیـدا بهێنێـت؟! ڕەحمـان کـۆمەڵە دڕنـدەیەکی بینـی لە یەکێـك لە ژوورەکـان قەڕەپەسـتانێیان کـردووە و بە دەوری یەکترییەوە دانیشتوون، ڕەحمان ئارپیجییەکەی خستە سەرشانی و سێرەی لـێ گـرتن و لەگەڵ داروپەردووی ژوورەکەدا لاشـەی دڕندەکانیشـی هەپـروون بە هەپـروون کـرد و بە ئاسـمانێی وەرکردن، وا پێ دەچوو ئەم پیـاوە شـێتە هەر بە ڕاسـتی نیـازی کارێکی خۆکوژی بووبێـت، ئەگەرنـا بـۆ وای دەکـرد. چونکە دوای تەفروتوونـاکردنی ژوورەکەش ئەو هەر بە پێـوە، وەکـوو کەڕولاڵ ڕاوەستابوو و جووڵەی نەدەکرد، پێ دەچوو دیسـانەوە کەلـلەی بە ژاوەژاو و تەقەی مەنجەڵەکـان پـڕ بووبێـت. گـوللە ئـارپیجییەکی دیـکەی لە کۆڵەپشـتەکەی ڕاکێشـا و سـەرەکەی کردەوە و لە لوولەی ئارپیجییەکەی پەستاو، دیسـانەوە خسـتییەوە

سەرشانی و سێرەی لێ گرتەوە، ئەم جارەیان ئاراستەی ژوورێکی دیکەی کرد، ئیدی لە تەواوی مۆڵگەکەدا هاوار و ڕۆڕۆ بەری ئاسمانی گرت، دوای چەند ساتێك ئیدی دەستڕێژی گوللەی چەکی دڕندەکانیش بە هەموو ئاراستەیەکدا گیزەی دەهات. ناوچەکە بووە یەك پارچە بەرەی جەنگ، پێکدادانێکی دژوار لەگەڵ دەستەکەدا دەستی پێ کرد کە تەنها چەند هەنگاوێك لە مۆڵگەکەوە دوور بوون، ڕەحمان وەك ئەوەی نە بای دیبێت و نەباران و بێ ئەوەی ساتێك گوێ بداتە گیزەی گوللەی هەردوولا کە وەکوو گەواڵە تەزرەی بەهار هەموو لایەکی گرتبووەوە و قرمەژنی گوللە گوێچکەی کەڕی دەهێنایە بیستن، وەلێ ئەو وەك ئەوەی بە ڕاستی کەڕ بێت هەر گوێیشی پێ نەدەدا، وێ دەچێ بە هۆی ئەو ژاوەژاوەی مێشکییەوە بێت، هەرچەندە لەو ساتەدا مەترسیی گوللەی هاوڕێکانی زۆر لە مەترسیی گوللەکانی دوژمن زیاتر بوون بۆ گیانی، ئیدی ئەوە مەرگە و ئەگەر پەی بە ڕۆحی کەسێك نەبات و دەستڕێژی گوللەش ئەگەر کەسێك نەگرێتەوە، نایگرێتەوە خۆ بە زۆر نییە، ئەگەرنا ئەو ڕەحمانە دەبوو ئێستا سەرتاپای جەستەی وەکوو سەرەندوبێژینگ لێ بهاتبووایە، دەربازبوونی لە مردن جۆرێك بوو لە مەحاڵ، پاشان دەستەکە شارەکەیان بە هێمنی بەجێ هێشت بێ ئەوەی شتێك لە دوای خۆیانەوە بەجێ بهێڵن و بێ ئەوەی پەنجەی کەسێکیان بە خوێن بێت. ڕەحمان وەکوو سەرخۆشێك کە کاریگەریی شەرابەکە هاوسەنگی پێ نەهێشتبێت بەوجۆرە ڕێی دەکرد، جارێك بەملا و جارێك بەولادا دەچوو، بێ ئەوەی بزانێت چی لە دەوروبەری ڕوو

دەدات. خەم و ئازار و ژانی ناخی زۆر لەوانە دژوارتر بوو کە لە هێرشەکەدا لەناو چوون. جەللادەکان مردن و کۆتاییان هات، بەڵام ئەو لە ئێستاوە هەر چرکەساتێك سەدان جار خەم دەخوات و ئازار دەچێژێت، بە دوای مەرگدا ڕا دەکات و مەرگ خۆی لێ دەشارێتەوە. ئیدی لەم کاتەوە ژیانێکی وا دەژێت بۆ ساتێکیش ئاسوودەیی بە خۆیەوە نابینێت، ئاخر دەنگی تەقینەوەکان بە بەردەوامی لەناو کەللەسەریدا زرموهوڕیانە و هەرچی ئارامی و ئاسوودەیی هەیە لێی دەدزن و ناخی دەکەن بە وشکەساڵی و نائارامی، تا وای لێ دەکەن لە دایك نەبوونی خۆی بە ئاوات بخوازێت: "ئەرێ ئەم ژاوەژاو و هەراوزەنایە... بۆ وا بەو جۆرە کۆتایی نایە؟!" هەر لەگەڵ خۆیدا دەکەوێتە مشتومڕ و هیچ وەڵامێکیشی دەست ناکەوێت، ئەو دەستەواژەیەی سەرەوە دەبێتە دەروازەی قسەکردن لەگەڵ خودی خۆی و هەموو چرکە و خولەکێك هەر دەیڵێت و دەیڵێتەوە، بێ ئەوەی وەڵامێکی چنگ بکەوێت و ئاسوودەی بکات و بحەسێتەوە. ئەی چی بکات و چۆن خۆی لەم ئازار و ژانە دەرباز بکات؟! بە دڵنیاییەوە ئەم نەفرەتە لە ناوی دەبات. لە ئێستا بە دواوە چرکەساتێکی ئارامی بە ئاوات دەخوازێت، دوای ئەوە هیچ خەفەت لە مەرگی خۆی ناخوات، لە ئێستا بە دواوە ئومێدی ئەوە دەخوازێت بزانێت ژیان بەبێ ئەم ژاوەژاوە نەبڕاوەیە چۆن بەردەوام دەبێت. ئەو ژاوەژاوەی لە شەقامەکاندا هەیە زۆر سووك و سادەترە لەوەی لەناو کەللەسەریدا وەکوو مریشکی سەربڕاو هەڵیدەپەڕێنێت. ئیرەیی بە هەموو زیندەوەرێك دەبات ئاژەڵ بێت یان مرۆڤ کە بۆ ساتێك بە ئارامی چاو لێك بنێت، دەبێ کێ

لەم دونیایەدا هەبێت بە شەو و ڕۆژ دەنگی تەقەتەقی مەنجەڵ و ژاوەژاو و هەراوزەنای بەردەوام لە مێشکیدا بێت و بزێت؟! ئەم دەنگەدەنگە نەفرەتییە کتومت دەڵێی تافگەیەکی بەخوورە و لە وەرزی لافاودایە. هەر هاژە و هاژە و هاژەیە و نابڕێتەوە. نە ڕادەوەستێت و ئیستێك دەدات و نە ئۆقرە دەگرێت و جگە لە هاژەهاژ شتێکی دیکە نازانێت، وای چ خەم و ژانێکی بەردەوامە و هێندەی بەشە چرکەیەکی کاتیش چاوێك لێك نانێت و لەو هاژەهاژەی ناکەوێت و بە درێژایی ژیان بەردەوام دەبێت.

کچەکە کاتێك لەگەڵ سعوود لای ڕەحمان دوور کەوتنەوە پرسی:

- پێت وایە بەرگە بگرێت، یان پەنا بۆ خۆکوشتن دەبات؟!

- لەوانەیە کارێکی خۆکوژی بکات، بەڵام لەبەر هاژەهاژ و ژاوەژاوەکە نا!

- ئەی بۆچی؟!

- لەبەر ئەو جلەی لەبەری کردووە.

کچەکە بە منگەمنگەوە:

- چ جلوبەرگێك؟! مەبەستت چییە؟!

سعوود وەڵامی دایەوە:

- ئەو مرۆڤێکی ناسك و نەرمونیانە، لەوانەیە دڕندەکان بەرگێکی جیا لەوەی خۆیان پێ بپۆشیبێت، ئەو هونەرمەندە و

حەز لە ژیـان دەکـات، وەلـێ بە قێزەونتـرین شـێوە سـتەمی لـێ کراوە و دەستی لێ وەشێنراوە، دەزانی ئەگەر تۆزقاڵێـك هیـوای بەم تێکۆشانەی ئێمە هەبێـت، ئەو کارەسـاتانە لە یـاد دەکـات و دەبێتەوە کەسێکی ئاسایی، بەڵام هەست بە ونبوونی ژیانی خۆی و بەردەوامبوونی ئەو ئازار و ئەندێشە خوێنـاوییەی نـاخی خـۆی دەکات، ناچارە دابڕمێـت و برووخێـت، ئەو وا هەسـت دەکـات فریـــودراوە و لە یەك کاتیشـــدا قوربـــانیی دەســـتی ڕژێـــم و پیرەکانیشە.

- ئەرێ ئەوە ڕاستە هەڕەشەی مردنی لە پیرەکان کردووە؟

- لە ڕاســتیدا مــن گــوێم لێــی نەبــووە وا بڵێــت، بەڵام دەنگۆکــان دەڵــێن: لە ئەنجــامی جۆرێــك لە نائومێــدبوون، بە پیرەکانی گوتـووە چەقـۆیەکی تیـژ لەسـەر ملـی هەر یەکێکتـان دادەنێم و هەر کاتێك پێویستی کرد دەستی پێدا دێنم و قڕتـان دەکەم.

- من گوێم لێ بووە، گوایە نامەیەکی بۆ پیرەکان ناردووە و وەکوو بێزارییەك لێیان پێی گوتوون: هەر پیرێکیان بە قەیتـانی پێڵاوەکانی خۆیان هەڵدەواسێت. پێت وایە شانەی نهێنی دروست کردبێت؟!

- ڕاشکاوانە بڵێم، هـیچ شـتێك بە دوور نـازانم. ئەم شـێتە مەتەڵـــی وا لە ناخیـــدایە کەس پەی بە وەڵام و ئەنجـــامەکەی نابات، ئەو بێزاری و تووڕەییەی دوای قەسـابخانەکەی پشتئاشـان لەناو ڕیزەکانی پێشمەرگەدا بڵاو بووەتەوە و تەشەنەی کـردووە، خـاك و زەمینەیەکـی بە پیـتە بـۆ چانـدنی تـۆوی هەر کـارێکی

سەرشێتانە، ڕەحمانیش بەم دۆخەیەوە سەرکردە و ڕابەری بێڕکابەری ئەو سەرکێشی و سەرشێتانەییە دەبێت.

وەلێ ڕەحمان بە دوای خۆدەربازکردندا دەگەڕێت. توانای ژیانی لەناو جلوبەرگی درندەییدا نەماوە، سعوود پێناسەیەکی جوانی کرد، خەمی گەورەی ئەو گەڕاندنەوەی هاوسەنگیی خۆی و نۆژەنکردنەوە و دووبارە بونیادنانەوە و مشتومالّکردنەوەی مرۆڤەکەی ناخی خۆیەتی. هەڵبەتە ئەمەش لە شاخ ناکرێت، چونکە لێرە مرۆڤ یان دەبێ کوژراو بێت، یان بکوژ، بژاردەی سێیەم نییە!

دوای چەند مانگێك لە گواستنەوەیان بۆ بارەگا نوێیەکە، کە سعوود ئاماژەی پێ دا، ڕەحمان بە تەنها بڕیاری کۆچکردنی دا و هیچ کەسێکیش نەیتوانی لەو سووربوونەی ساردی بکاتەوە و ڕێگەی لێ بگرێت!

# بەشی سێیەم

- ڕەحمان بگەڕێوە، پیاوی چاك بە بە قسەمان بکە!

مامۆستا عومەر پڕ بە گەرووی هاواری کرد. ئەویش بە دەنگێکی بەرز وەڵامی دایەوە:

- ناتوانم، من دەڕۆم بۆ کوشتنی دڕندەکەی ناخی خۆم.

- مەوداکە دوورە و ڕێگاش ون دەکەیت و وێڵ دەبیت!

- دەبا کۆتاییم بێت، هەتا لە خودی خۆیشم بێزارم!

مامۆستا عومەر بە دەنگێکی پڕ لە سۆز و پاڕانەوە گوتی:

- ڕەحمان گوێ بگرە، تەنها گوێم لێ بگرە، تۆ لە ئێستادا خەمۆکی ویران و داغانی کردوویت، بەڵێنم پێ بدە دوای یەك دوو ڕۆژی تر ئەگەر ئەو بێزارییەت ڕەوییەوە، بگەڕێیەوە لامان. نایشارمەوە منیش بڕیاری ڕۆیشتنم داوە، بەڵام هێشتا نا، ئەگەر بگەڕێیتەوە، دواتر پێکەوە دەڕۆین.

ڕەحمان گوتی:

- هەوڵ دەدەم.

مامۆستا عومەر بە پەرۆشەوە گوتی:

- قسەکەت لای من وەکوو بەڵێندان وایە ها.

ڕەحمان بە سەرسامی و منگەمنگەوە:

- لەوانەیە... بەڵام بەڵێنت پێ نادەم. من سوورم لەوەی

نەگەڕێمەوە، ئەگەر دڕندەکە لە ناخمدا مرد، ئیدی لەم شاخانە سوودێکم نامێنێت.

ئەمە دوا قسەی ئەو مرۆڤە شارستانییە بوو، بەرلەوەی لە یەکەم پێچدا ون بێت، ئاوڕێکی دایەوە و ڕۆیشت.

بەو جۆرە ڕۆیشت و بۆ یەکەم جارە چەکی بە شانەوە نەبێت، ئەمە یەکەم جاری بوو بەبێ چەك بەناو دۆڵ و قەدپاڵی چیاکاندا ڕێ بکات. ڕەحمانی بەدبەخت جگە لە نێزەیەك و پەتوویەکی تەنك و چەند کولێرەیەك و زەمزەمییەیەك ئاو بەولاوە هیچی تری پێ نەبوو، وەرزیش سەرەتای زستان و بەفریش لە لوتکەی شاخەکاندا چاوبازێی لەگەڵ ڕێبوارەکاندا دەکرد و ترسی سەرمای بەسەردا دەبارانلدن، بە تایبەتی لە شەودا، ئاڕاستەی بەرەو ڕۆژئاوا بوو، خۆرەکە ڕێبەر و ڕێنیشاندەری بوو، پارچە کاغەزێکیشی لە گیرفانی ئاخنی بوو، ناوی ئەو گوندانەی تێدا تۆمار کردبوو کە پێیاندا تێدەپەڕێت. بیری لەوە کردەوە بە هەر گوندێکدا تێپەڕێت، پرسیاری ئاڕاستەی گوندەکەی دواتر لە جووتیاران بکات، جا بۆ ئەوەی کەسایەتیی خۆی بگۆڕێت، دەبێ بە جلوبەرگی کوردییەوە وا خۆی پیشان بدات کە ڕێبوارێکی کەڕولاڵی کوردە و دەبێ هەر بە ئاماژە خەڵکی تێبگەیەنێت کە دەیەوێت لەم گوندەوە بچێت بۆ ئەو گوند، چونکە ئەو زمانە کوردییەی دەیزانێت، وەك دەڵێن دووکەڵ دەکات و بەمەش ئاشکرا دەبێت. ئەگەر چاوپۆشی لەو دواکەوتوویی و گۆشەگیری و دوورەپەرێزییەی گوندنشینان بکەین کە بەسەریاندا سەپاوە و لە شارستانی دابڕاون، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا خاوەن دڵێکی باش و مێواندۆست و بەڕێزن، هەرچەندە لە کاتی وادا ئاگایی و خۆپاریزی کارێکی هەرە لە پێش و پێویستە، ئاخر دوژمن سیخوڕ و بەکرێگیراوانی خۆی بە

زۆری لە ناویانـدا دەچێنێـت، هەر بە هـۆی ئەوانەشـەوە لەوانەیە تووشی پێشهاتێك ببێت هەر لە خەیاڵیشیدا نەبووبێت. بەوەی باش بوو ماوەی پێنج ڕۆژە ڕێگای بە ناو ئەو دۆڵ و قەدپاڵ و لوتکە شاخانەدا شارەزا بوو، وەلێ دوای ئەوە ئیـدی مەرگـی مسـۆگەر چاوەڕوانی دەکات، ئەگەر بەبێ پرسوڕا و ڕێنوێنیی جووتیارێك یان شوانێك بچووکترین هەنگاوی هەڵەش بهاوێت.

ئێستا دەبـێ ئەو شـاخە بەرزەی بەرانـبەری ببڕێـت و پاشـان ڕێگەی خۆر هەڵبژێرێت و خـۆریش بەرەو ئامـانجەکەی ببـات، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئاڕاستەکەی گۆڕی و ڕووی کردە لوتکە شاخێکی بەرز و دوور کە هەمیشە بەفر جامـانەی سـەری بوو، وا خۆی نمـایش دەکـرد کە بەرزتـرین لـوتکەی نـاوچەکە بێـت. دوای چەنـد کاتژمێرێـك گەیشـتە دۆڵەکەی و بەناویـدا کەوتە گەڕان، ڕووبەڕووی قەدپـاڵی وا تــووش و تاشــەبەردی زەبەللاحـی وا دەبـووەوە، مرۆڤـی تووشـی سـەرەگێژە دەکـرد، بەوەی ئەگەر بەناویـدا بـڕوات، وێـڵ دەبێـت و هەرگیـز ڕێـگە دەرناکـات و توانـای دەربـازبوونی نابێـت، دوای ئەوەی چەنـد هەنگـاوێکی تێـدا هاویشـت، هـاتەوە سـەرخۆی و وای بە بـاش زانی ئەو ڕێگە تاریك و هاتونەهاتە نەگـرێتەبەر، لە بەرانـبەر ئەو شاخە زلانەدا خۆی زۆر بچووك هاتەپێش چـاو، وا خـۆی بینـی "مێروولەیەکە و دەچێت بە گژ قوولەی قافا". ئاخر تەنهایی لەناو ئەو هەموو گابەرد و تاشە تووش و تاوێرانە، نەك هەر گەمژەیی، بەڵکـوو شـێتییەکی تەواوە، ئیسـتێکی کـرد و لە چرکەسـاتێکی هەستیاردا، هەستی بە نەبوونی خۆی کرد و وای لێ کرد، ترس لە هەموو شتێك بـاڵی بەسـەردا بکێشـێت و شـپرزەی بکـات، بە تایبەتی ترسی تەنهایی کە سەر لە مـرۆڤ دەشـێوێنێت و هەر بە ساغی دەست لە بینەقاقای دەنێت و دەیخنکێنێت. کەمێك لە پاڵ

گابەردێکدا دانیشت و پشوویەکی دا، چ گابەردێك؟! خۆ بە هەر هۆیەکەوە، خلۆر ببێتەوە، ئیدی ئەم وەکوو ئەسپێی نێوان نینۆکی پەنجە گەورەی هەردوو دەستەکانی دەپلیشێنێتەوە و ونی دەکات، ئەو ئەسپێیانەی سالانێکە ئاشنای ڕۆحیی ڕەحمان و هاوسەنگەرەکانین، ئەو ئەسپێیانەی بە خوێنی ئەو نەبێت ئامادەنین بژین و سوکنایی دڵیان دانایەت. بۆیە لە ترسی ئەو پلیشانەوە و ونبوونەی، بیری لە شتێك کردەوە کە زۆر جار خۆی تێدا لە بیر دەچووەوە، سەرەتا بە دەنگێکی بیستراو لەگەڵ خۆیدا کەوتە گفتوگۆ، لەگەڵ بزەیەکی گاڵتەجارییانە کە لەسەر لێوەکانی وێنەی کێشان: "ئەی چی دەبوو ئەگەر مێروویەك بوومایە؟ بەڵێ مێروو؟! بۆچی ئەو هەموو سەرسامییە؟! خۆ هەموومان خۆمان لە درز و کونوقوژبنەکان، یان بۆشاییەکاندا حەشار دەدەین، وەك ئەوەی ئەسپێ لەناو لۆچی کراس و پزووی شەرواڵی پێشمەرگەدا خۆی پەنا دەدات، ئەم دۆڵە نەفرەتییەش ڕێك ئەو بۆشایی و پەناگەیەیە کە دەبێ خۆمی تێدا حەشار بدەم. باشە بۆچی مێروو؟! با بڵێین بەکتریا، یان هەر بوونەوەرێکی زەڕەبینیم و هەر شوێنێك بێت، دەیکەم بە نیشتمانی خۆم. هەهههه نیشتمان! لەسەر ئەو بەردە بۆ نموونە، خۆ ئەو بەردە بچووکەش لەسەر سینەی خۆیدا ئەوەندە بوونەوەری وردیلەی هەڵگرتووە، زیاتر لە ژمارەی مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی. ئاخر ئەگەر بەرەو ئاسمان لە زەوی دوور بکەوینەوە، تا ئەم گۆی زەوییە لە بەرچاومان هێندەی ئەم بەردە بچووکەی لێ دێت، ئەو کاتە کێ باوەڕ بەوە دەکات کە ئەو بەردە بچووکەی پێی دەڵێین گۆی زەوی، لەسەر خاکەکەی و ناو دەریا و زەریاکانیدا ئەو هەموو ئاژەڵ و مرۆڤ و ئاوات و خەونانە لەخۆ دەگرێت؟ کێ باوەڕ دەکات ئەو ئەشکەوتە بەردینە گەورەیەی کە خۆمی تێدەپەستم، شتێك نییە جگە لە درزێکی هەڵکەندراوی سەرە دەرزییەکی گۆیەکی

خڕ و لووسی شووشەیی؟ ئەو درز و ڕووشانەی کە هەر بە چاویش نابینرێت، بەو هەمـوو خواست و ئاوات و خولیا و ئەندێشە و خەون و ترس و ئازارانەمەوە دەمگریتە خۆی. تێکڕای ئەو گیانلەبەرانەی تێیشیدا دەژین بەوانەی بە زەڕەبینیش دەبینرێن هەست دەکەن و دەترسێن و ئازار و ژانیش دەچێژن. ڕێك وەکوو مرۆڤ، هەرچەندە ئەگەر ئێمە هەستیش بە ئازارەکانیان نەکەین، ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئەوانیش ئازار ناچێژن، ئەگەر نا لە کاتی هەستکردنیان بە ترس ڕایان نەدەکرد و خۆیان نەدەشاردەوە، کێ دەزانێت چی لە ناخی جیهانی بەکتریا و سیسرکەدا دەخولێتەوە، هەڵبەتە جیهانی ئەوانیش پەیوەندیی وایان تێدایە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە خەیاڵی ئێمەدا نەهاتبێت! ئەی بۆچی وا پێی سەرسام دەبین؟ ئەدی ئەوانیش لە پێناوی دەسەڵات و دەستکەوتەکاندا بەرنابنە وێزەی یەکتری و یەکتری ونجڕونجڕ ناکەن؟ ئەمە لە جیهانی ئاژەڵانیشدا هەیە، بەڵکوو هەتا لە جیهانی مێروو و زیندەوەرە بچووکە زەڕەبینییەکانیشدا هەیە و تەنها پەیوەست نییە بە ئێمەی مرۆڤەوە. بەڵکوو بە کۆمەڵەی مێرووەکانیشەوە پەیوەستە. هەر سیسرکەیەکیش دەخوازێت دەسەڵات و قەڵەمڕەویی بەسەر خاك و ناوچەکەی خۆیدا هەبێت، جیهانێکی سەیر و نامۆن، جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ جیهانەکەی ئێمەدا نییە، هەتا دابونەریتەکانیشیان زۆر لێمانەوە نزیکن، خۆزگە ئەم جیهانەی ئێمە نەهاتبووایەتە بوونەوە، مادام ئێمە لە نەریتەکانماندا لەگەڵ جیهانی سیسرکەکاندا هاوشێوەین، کێ دەزانێ؟! خۆ لەوانەیە ئێستا سیسرکێك بێزاری و ناڕەزایی دەربڕێت لەوەی نەریتە مرۆییە قێزەونەکان بە نەریتی ڕەسەنی سیسرکەکان دەچوێنین...؟!

ڕەحمان قاقایەکی کرد و دوای کەمێك لە پەنای گابەردە

گەورەکە هەستا و ئەو ویلانگە تۆقێنەرەی بەجێ هێشت و لە ڕێگەی قەدپاڵە ڕووتەنەکەوە بەرەو لوتکەکە هەنگاوی نا، ئەو قەدپاڵەی لە ئەزەلەوە هیچ کەسێك نەیگرتۆتەبەر، بە سەرنجدانێکی ورد لە لوتکەکەوە ئاراستەکانی دەستنیشان کرد، ئەوەتە توانی ئاراستەی ڕۆیشتنی خۆی دیاری بکات و ڕوو لە سەرماوسۆڵە توانا پڕووکێنەکە و زریان و باهۆزە دژوارەکە بکات. ئەوەی جێگەی هەڵوەستەکردن و سەرسامبوونە، مرۆڤ لەو شاخە سەختانە، ئەو هەموو وزە و توانا بێئەندازەیە لە کوێ دێنێت، بێ ئەوەی هەست بە برسێتی، یان نەخۆشی، یاخود شەکەتی بکات؟! چۆن مرۆڤ دەتوانێت بە ئاسمان خۆی داپۆشێت و زەوییش لەژێر خۆی ڕابخات، هەموو ئەوانەش بە گەدەیەکی بەتاڵەوە، بێ ئەوەی لەناو بچێت و بۆگەنیش بێت؟! ڕەحمان ئێستا ئاژەڵێکی کێوییە و لە شێوەی مرۆڤدایە، لە بەختی ئەو ئاژەڵە کێوییەش ئەو ڕۆژە هیچ زریان و باهۆزێکی ترسناك بوونیان نەبوو، سەرنجە کزۆڵەکانیشی بەرەو ئاسۆ دەیانڕوانی و توانییان ڕێچکەی ئاوابوونی خۆری بۆ دەستنیشان بکەن. ئێستاش سوورە بگاتە ئەو لوتکەیە، تەنها ئەو لوتکەیەی مەبەستێتی، نەك ئەوانی تر، هەرچەندەش بەرزتر دەبووەوە لە هەموو لایەکەوە کڵۆبەفری زیاتری لێ کۆ دەبوونەوە، تا لە کۆتاییدا بە تەواوی کەوتە ناو ئابڵوقەی بەفرەوە، ژێری بەفر و هەرچوار لایشی هەر بەفرو بەفر... ئیستێکی کرد و هزر و مێشکی دوور ڕۆیشتن و بە سەرنجەکانی لوتکە بە لوتکە و شاخ بە شاخی ئەو دەڤەرەی ڕووپێو کرد، وەك ئەوەی بە دوای شتێکی ونبوودا بگەڕێت، پاشان گەڕایەوە و بە دەوری هەمان لوتکەدا خولایەوە. کاتێکیش نەگەیشتە مەبەستی خۆی و سەرنجەکەی توانای پێکانی ئامانجەکەی نەبوو، بە ناچاری لوتکەکەی لە پشتی خۆیەوە بەجێ هێشت و سەرلەنوێ بەرەو دۆڵەکە خلۆر بووەوە،

دوای ئەوەی سەرماوسۆڵەکە زیاتر تەنگیان پێ هەڵچنی و تووشی نائومێدیان کرد. لە دۆڵەکە پەتووە لوولدراوەکەی سەرشانی داماڵی و کردییەوە و خۆی پێ لوول دا، پاشان دەستی بە حەپەلووشکردنی پارچە نانەکان کرد و پشوویەکی دا، دوای پشوویەکی کەمتر لە کاتژمێرێك، جارێکی تر بە ڕاست و چەپدا بە ناو دۆڵەکەدا کەوتەوە گەڕان و بە دوای ئەو شتەدا دەگەڕا کە سەرقاڵی کردبوو، ئەوەتانێ دوای ماندووبوونێکی زۆر، لە بەردەم ڕووبارەکەدا ڕاوەستاوە، ئەو ڕووبارەی قەڵبەزەی ئاوەکەی خوڕەی دێت و خۆی بەملا و بەولادا دەدات و سپی سپی دەچێتەوە، ڕێك ڕەنگی بەفری گرتووە، ئیدی شانبەشانی ڕووبارەکە شۆڕ دەبێتەوە و تا دەگاتە ئەو پێچەیەی ئاوی کانیاوەکان دەڕژێنە ڕووبارەکەوە، ڕێك لەو شوێنە کاریتە گەورەکەی سەر ئاوەکەی بینی کە ئەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکەی بە یەکترییەوە گرێ داوە و بۆتە پردی پەڕینەوەی پیادەڕۆکان، زەردەخەنەیەکی وای بە ڕوخساردا هات، هەرچی شەکەتی و ماندوێتی هەبوو لە جەستەیدا ڕەوینەوە، لەبەر خۆیەوە دەستی بە قسان کرد: "دەزانی چەندت ماندوو کردم...؟! وەلێ دڵنیابووم هەر دەتدۆزمەوە ئەی دارە نەفرەتییەکە!" ڕێك ئەو دارە بوو کە ڕۆژێك لە ڕۆژان و لەو شوێنە پردێکیان بۆ پەڕینەوە پێ دروست کرد، ئەو کاتەی ڕووبەڕووی ڕووبارەکە بوونەوە و بۆ پەڕینەوە لێی سەریان سوورمابوو. پاشان ڕووبارەکەی بەجێ هێشت و بەرەو پاشماوە و داروپەردووی گوندە ڕووخاوەکە هەنگاوی نا، تەنها چەند خولەکێکی کەم لەوێ مایەوە و چاوی بڕییە ئەو کۆمەڵە دارە سووتاوەی بەردەمی، وەك ئەوەی لەو ڕۆژگارەوە جگە لەمان کەس بێرەدا تێنەپەڕیبێت، ئەو کۆمەڵە دارە سووتاوە، پاشماوەی ئەو ئاگرەیە کە لە شەوێکی سارد و سەهۆڵبەنداندا چۆن گیریان خواردبوو

لەوەی بە چ شێوەیەك ئاگر بکەنەوە و خۆیان گەرم بکەنەوە، تا لە سەرما گەیشتنە ئاستی نزیکبوونەوە لە ڕەقبوونەوە و مەرگ، وەلێ دواتر توانییان ئاگرەکە بکەنەوە و لە مەرگی مسۆگەر دەربازیان ببێت، شوێنەکە بە تەواوی لە مێشکی ڕەحماندا ڕوون بووەوە، جارێکی دیکە دەستی بە هەڵگژان بە شاخەکەدا کرد بەرەو لوتکەکەی، ململانێی لەگەڵ کاتدا دەکرد بۆ گەیشتن بە لوتکە. دیسانەوە لەگەڵ خۆیدا گوتی: "هەر کەمتەرخەمی و خۆگنخاندنێك، شەوی نەفرەتاوی پەلامارم دەدات و لە تاریکییەکەیدا وێڵ و سەرگەردان دەبم، وەلێ لە بەختی من وا دیارە ئەمشەو مانگ لە چواردەیە و تیشکی مانگەکە ڕەنگدانەوە و کاریگەریی لەسەر بەفرەکە دەبێت و تاریکییەکە دەرەوێنێتەوە". لە لوتکەکەدا چڕیی بەفرەکە وەکوو وەرزی زستان نەمابووەوە، بە ئاسانی سەری تیژی گابەردەکان کە بەفر دایپۆشیبوون دەبینران وەك ئەوەی نووکە بەردی دەرپۆقیوی سەر ڕووبەرێکی تەخت بن و بەفر کەمێك دایپۆشیبن، ئیدی ڕەحمان دەستی بە ڕاماڵین و لادانی بەفرەکە کرد لەسەر بەردەکان و دەوروبەری، پاشان دەستەکانی خستەوە بن هەنگڵی و کەمێك گەرمی کردنەوە و ئینجا زیاتر هەستی بە لێدانی ترپەی دڵی کرد و زیاتر و زیاتریش هەڵچوو و بە هەموو دەنگییەوە هاواری کرد:

- خۆیەتی ئێرەیە.

بەرلەوەی دەست بە چاڵکردنی شوێنەکە بکات، دیسانەوە گوتی:

- نەخێر ئێرە نییە... ئەم نووکە بەردە زۆر گەورەیە، ئەو قەبارەکەی ئەوەندە نەدەبوو، لەوانەیە لەوێ بێت.... هۆ لەوێ!

بە دەستی ئاماژەی بۆ شوێنێك كرد و خۆی گەیاندێ، دەستی بە هەڵكەندنی بەفرەكە كرد، بەردەكە دەركەوت خۆی لێ لادا و لە هەڵكەندنی بەفرەكە بەردەوام بوو، هەتا دۆزییەوە، بە هێواشی و ڕێزەوە وەكوو شوێنەوارناسێك لەسەرخۆی بەفرەكەی لە سەری لادەدا. ڕێك وەكوو خۆی بوو، هەردوو دەستی لە پشتەوە بە دارێكی چەقێنراوەوە بەسترابوونەوە، ڕوخساری كەمێك بەسەر شانیدا شۆڕ بووەتەوە، چاوەكانی بە كراوەیی بریسك دەدەنەوە و ڕەق ڕاوەستاون و جووڵە ناكەن، وەك ئەوەی ئومێدی ئەوە بخوازێت بگەڕێنەوە لای وەكوو چۆن ڕۆیشتن و جێیان هێشت، بەڵام هەرگیزاوهەرگیز..... نە.......... نەهاتنەوە!

ڕەحمان نێزەكەی ڕاكێشا و بە زەحمەت توانی پەتە بەستووەكەی بپچڕێنێت، پاشان پەتووەكەی لەسەر بەفرەكە ڕاخست، هەوڵی دا هەڵیبگرێت، بەڵام ئەو بە جۆرێك چەقیبوو، وەك ئەوەی ڕەگی درەختێك بێت و بە قووڵایی ئەو خاكەدا ڕۆچووبێتە خوارەوە، بۆیە دەستی بە هەڵكەندنی زیاتری بەفرەكەی دەوروبەری كرد و چاڵەكەی قووڵتر كرد، تا لە ئەنجامدا توانی لەگەڵ زەوییەكە جیای بكاتەوە، پاشان پەتووەكەی لێ ئاڵاند و هەوڵی دا بە كۆڵیدا بدات، هەستی بە گرانییەكەی نەكرد، هێندە سووك بوو، ڕێك هێندەی كێشی پەرەسیلكەیەك، ڕەحمان بەرەو دۆڵەكە بە خۆی و ئەوەی دۆزیبوویەوە و لە پێناویدا هاتبوو، شۆڕ بوونەوە و لە ساردی و بەفرەكە دوور دەكەوتنەوە. ترسی گەورەی ڕەحمان لەوەدا بوو، نەبادا لە كۆڵی بترازێت و وەكوو پارچە كریستاڵێك بكەوێتە سەر بەردێك و بشكێت، كاتێك شەكەتی هێرشی بۆ هێنا، ئیستێكی كرد و كەمێك دانیشت، تاكوو پشوویەك بدات، وەلێ

هەستی بەوە کرد کە دانیشتن ڕەقی دەکاتەوە و دوور نییە بیبەستێت، بۆیە هەستایەوە و دیسان کردییەوە کۆڵ، دواتر کردییە باوەشی و زۆر لەسەرخۆ و بە وریاییەوە ڕێی دەکرد، لە ترسی ئەوەی نەبادا بکەوێتە خوارەوە و وردوخاش بێت، بەردەوام بوو تا گەیشتە ناو دۆڵەکە، تاریکایی گەیشت و بایە ساردەکەش هێرشی دەست پێ کرد، ئەو کریستاڵە بەفرینەی سەر سینگیشی هەرچی گەرمایی جەستەی هەبوو هەڵیمژیبوو، هەر کە ڕاوەستا هەستی بە سەرمایەکی زۆر کرد، وای زانی خەریکە ساردییەکە بە مۆخی ئێسکیدا ڕۆ دەچێتە خوارێ، بۆیە ناچارە لە ڕۆیشتن بەردەوام بێت، تاکوو گەرماییەك بۆ جەستەی بگەڕێتەوە. پاش کەمێکی تر ڕۆیشتن، ئینجا دەستی بە کۆکردنەوەی چیلکە و پووشوپەڵاش کردەوە، کاتێکیش کۆکردنەوەی ئەو پووشوپەڵاشە گەرماییەکی پێ بەخشی، بیری لەوە کردەوە کە بەبێ جووڵە دانەنیشێت، بۆیە زەوییەکی نەرمی هەڵبژارد و بە نێزەکەی دەستی و لەبەر ڕۆشنایی مانگەشەوەکە دەستی بە هەڵکەندنی زەوییەکە کرد، تا نیوەشەوی تێپەڕاند، دوای ئەوە لە بەرانبەر کچە بەفرینەکە دانیشت، بەڵام سەرماکە ڕێگەی نەدا چێژ و خۆشی لەو پشوودان و خاوبوونەوەیە وەربگرێت، بۆیە جارێکی دیکە دەستی بە قووڵترکردنی چاڵەکە کرد و هەتا نزیکەی بەرەبەیان و کازیوە بەردەوام بوو، ئەو دەیزانی شخاتەکەی لە بیر کردووە. بەڵام ماوەیەکە ناوەناوە لە گیرفانەکانی بەدوایدا دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە: "شخاتەکە لە کوێیە؟! چۆن بەبێ شخاتە، یان چەرخی نەوتی دەرچووم و ئەم ڕێگە سەختەم گرتەبەر؟! دەك بە دۆزەخ بی! چ بەدبەختییەکە تووشی من بووە؟! ئەرێ چ شێتێك هەیە لە وەرزی زستان بەبێ ئامرازێك بۆ ئاگرکردنەوە بەناو ئەو شاخ و داخانەدا ڕێ بکات؟! ئەمە چ گەمژەییەکە من کردم، هەتا گەمژە و کاڵفامەکانیش

کاری وا ناکەن، ئێستا دەبێ چی بکەم؟! تۆ بڵێی بتوانم بە بەرد ئاگر بکەمەوە، ئەمە کارێکە لە مەحاڵەوە نزیکە، زۆربەمان هەتا توانای هەڵکردنی سۆبەیەکی دارینیشمان نییە، هەتا نیوەی دەنکە شخاتەکان بە هەدەر نەدەین، بەڵکوو هەندێکیان هەتا توانای هەڵکردنی جگەرەیەکیشیان لە شاخدا نییە، هەتا ژمارەیەکی زۆری دەنکە شخاتەکان نەکەنە قوربانی و بە فیڕۆی نەدەن، ئیدی من چۆن ئەم پووشە شێدار و تەڕە بە بەرد دابگیرسێنم. خۆ ئەگەر یەکێک لە چاخی بەردینیشەوە بهێنم و هەرچەند هەوڵیش بدات، باوەڕ ناکەم بتوانێت سەرکەوتوو بێت. نازانم ئەو درۆیە کێ بە بەرۆکی مێژووی گەلانی سەرەتاییەوەی کردووە. ئەرێ چ گەمژەیەك هەیە باوەڕ بەوە بکات کە کەسێك هەبێت بتوانێت بە بەرد ئاگر بکاتەوە؟! مەگەر تەنها کەمێك بەنزینی هەبوو بێت، ئای ئەگەر ئێستا کەمێك بەنزینم پێ دەبوو، لەوانەیە بمتوانیبووایە. ئاخر لەوانەیە بە بڵاچەیەك هەڵمی بەنزینەکە گڕ بگرێت و دابگیرسێت، وەلێ پووشوپەڵاش بە تەنها گڕ بگرێت، ئەمەیان نەخێر". کاتێکیش سەرمایەکە زیاتر هێرشی بۆ هێنا، دەستی بە پێکداداني بەرد کرد لەناو کۆمەڵە پووشوپەڵاشێك، کاتێك بێ ئومێد بوو، بە نێزەکەی دەستی بە تاشینی لقە دارێکی وشك کرد و لایەکی وەکوو نووکی قەڵەم تیژ کرد، پاشان بە نووکی نێزەکەی کونێکی بچووکی لەسەر دارێکی وشك و گەورە دروست کرد، ئینجا پووشە نەرمەکەی پەستایە ناو ئەو کونە بچووکە و سەری دارە تیژەکەیشی خستە ناو کونی دارەکە و بە قیتی ڕایگرت، ئەو بەشەی دارەکەی مابووەوە خستییە ناو هەردوو لەپی دەستی و لە ناوقەدی دارەکەوە بە چەپ و ڕاست و ڕاست و چەپدا دەستی بە سووڕاندنی کرد، ڕێك وەك ئەوەی ئەفریقییەکان لە دەشتودەردا ئەنجامی دەدەن، بە سووڕاندنی دارەکە و بەرکەوتنی بە پووشوپەڵاشەکە،

لەجیاتیی ئەوەی پووشەکە گڕ بگرێت، یان دووکەڵێك بکات، ناولەپی دەستی لە ئەنجامی بەرکەوتنی بە دارەکە گەرم داهات، ماوەیەکی باش بەردەوام بوو، تا بێئومێدی باڵی بەسەردا کێشا و لقە دارە وشکە نووك تیژەکەی تووڕهەڵدا و تفێکی کرد و گوتی: "دڵنیام ناولەپم ئاگر دەگرێت و دەسووتێت، وەلێ ئەم پووشە نەفرەتییە هەرگیز گڕ ناگرێت و ناسووتێت، بە نەفرەت بێت". پاشان ڕاوەستا و لە شوێنی خۆیدا دەستی بە هەڵبەزودابەز کرد، وەك ئەوەی سمکۆڵان بکات، بەڵام زۆر درێژەی نەدایێ، بیری لەوە کردەوە کە خۆی بخزێنێتە ناو ئەو پووشوپەڵاشەی کۆی کردبووەوە، بەڵکوو بتوانێت تۆزێك جەستەی گەرم ببێتەوە، لەمەیاندا کەمێك سەرکەوتوو بوو و بۆ ماوەیەکی کەم چاوی لێك نا، بەڵام خەوێکی سووك و پڕ لە دڵەڕاوکێ، پاڵکەوتنەکەی نیو کاتژمێر زیاتری نەخایاند و لە ناکاو لە شوێنی خۆیەوە قەڵەمبازێکی دا و جارێکی تر دەستی بە هەڵبەزودابەز کردەوە، بە مەبەستی بەدەستهێنانی گەرمایەك، ئینجا بە پرتەوبۆڵەوە گوتی: "وای سەرمای بەرەبەیان چەندە دژوارە؟!" پاشان لەبەر پاشماوەی ڕووناکایی مانگە ونبووەکەی پشت لوتکەکان، بە دوای لقە دارە نووك تیژەکەدا دەستی بە گەڕان کردەوە و دۆزییەوە، هەروەها کەوتە گەڕان بە دوای دارە پانە کونکراوەکەش، ئەویشی دۆزییەوە، جارێکی تر وردە پووشوپەڵاشی لە چاڵی دارەکە پەستایەوە، ئەو کاتەی هێشتا لەناو پووشوپەڵاشەکە خۆی مەڵاس دابوو، بیرۆکەیەکی شیاوی بە خەیاڵدا هات و ئێستا وا خەریکە جێبەجێی دەکات، یەکەم شتێك کردی تاشینی لایەکەی دیکەی لقە دارە وشکەکە بوو، پاشان پارچە دارێکی بچووکی هێندەی مشتێك هێنا و کونێکی لێ کرد بێ ئەوەی دووبەدەری بکات، ئینجا لە پشتوێنەکەی پشتی بە درێژی مەترێك و سێ پەنجە پان، پارچەیەکی بڕی و

پارچە پەڕۆکەی لوول دا، تا وەکوو پەتی لێ هات و کورتیش بووەوە، بەڵام بەهێز و قایم، ئینجا هەردوو سەری پەتەکەی بە هەردوو سەری شووڕە دارە سەوزە پتەوەکەوە بەستەوە و بایدا هەتا شێوەکەی وەکوو کەوانی لێ هات، پاشان لقە دارە تیژکراوەکەی بە پەتی کەوانەکە لە ناوەڕاستییەوە یەك جار لوولدا، سەرێکی دارە تیژکراوەکەی خستە ناو کونی ئەو پارچە دارەی هێندەی مشتێك بوو، بە دەستی چەپی بە دارەکە پاڵەپەستۆی خستە سەر پەتە بادراوەکە و بە دەستی ڕاستیشی دەستی بە سووڕاندن و جووڵاندن و هێنان و بردنی دار کەوانەکە کرد، وەك ئەوەی ئامێری ڕەبابە بژەنێت، هێندەی نەخایاند، دوای کەمێك ماندووبوون لە ئەنجامی بەرکەوتن و پاڵەپەستۆو سووڕاندنی پەتەکەوە، ئاونگە تەڕەکە لە پووشوپەڵاشەکەوە بووە هەڵم و گەرماییەکەی بەرزتر بووەوە، ڕەحمان باوەڕی بە چاوەکانی خۆی نەکرد، ئایا ئەوە خەیاڵە یان ڕاستییە؟ کەمە دووکەڵێکیشی لێ بەرز بووەوە، بەڵکوو هەتا بۆنیشی کرد، وای لە بۆنی دووکەڵ لەو کاتانەدا چەند خۆشە، زیاتر خرۆشا و خێرایی بەرکەوتنی دارەکان لەگەڵ یەکتری زیاتر بوون و لەگەڵ ئەوەشدا فووی لە پووشەکەش دەکرد، ئا ئەوەتانێ لەناو دووکەڵەکەوە گڕێك وەکوو ئاگری جگەرە خۆی نمایش دەکات، ڕەحمان وازی لە بادانەکە هێنا و چەمایەوە سەر ژیلەمۆکە و بە هەموو توانایەوە کەوتە فوو لێکردنی و پووشی نەرمەی زیاتر و وردە چیلکەیشی لەسەر دادەنا، هەتا لە ژیلەمۆکەوە گڕێکی کز سەری دەرهێنا و بە دانانی پووش و چیلکەی زیاتر بۆ سەری، گڕەکەش زیاتر دەبوو. ڕەحمان بەبێ ئاگاییەوە هاوارێکی وای کرد لەو ناوە دەنگی دایەوە و وەکوو گورگ دەیلووراند و لە خۆشیاندا هەڵدەپەڕی و پڕ بە گەرووی خۆشی دەردەبڕی، هەرچی

چـيلكەداری وشـكی ئەو دەوروبەرە هەبـوو، هەمـووی كـۆ دەكردەوە و لە نزيك ئاگرەكە كەڵەكەی دەكـردن، لە كۆتاييـدا توانی بە ڕێگەی سەرەتايی ئـاگر بكـاتەوە، پاشـان تەرمەكەی بە پەتـۆكەوە هێنـا و لە نزيـك بڵێسـەی ئـاگرەكە داينـا و گـوتی: "فريشـتەكەم وەرە ئێـرە... وەرە ئێـرە هەی بێنـازە بەدبەخـتەكەم! وەرە نزيك ئاگرەكە، ئەم ئاگرە خەڵاتی منە بۆ تـۆ، ڕۆژگارێـك تێپەڕی و تـۆ هێشـتا خەون بە گەرمبـوونەوەوە دەبينيـت، دەبـێ هەستت چۆن بووبێت و بيرت لە چی كردبێتەوە، ئەو كـاتەی بە دڵـی شـكاو و ڕوخسـاری شـێواوەوە لەم چۆڵەوانييە پشـتگوێيان خسـتی و بەجێيـان هێشـتی؟! هەر دەبـێ خەونـت بە ئـاگر و گەرماييەوە بينيبێـت. هەڵبەتە لە نـاخی خۆتـدا گوتـووتە: ئەگەر چارەنووسی من هەر مردن بێت، خۆزگە لە ژوورێكی گەرم بەر چەقۆيان دەدام و دەمردم، بۆچی بـۆ ئێرەيـان هێنـام؟! بـۆچی بە زينـدوويێتی لێـرە بەو سـتوونەيان بەسـتمەوە و بەجێيـان هێشـتم و خۆيـان ڕۆيشـتن؟! ئەم ئەشـكەنجەيە بـۆ بـاوكە گيـان؟! ئەی نەتاندەتوانی بە شەتەكدراوی بمكوژن و ئينجا بڕۆن؟! بۆچی ئەم جۆرە لە سەرما ڕەقبوونەوەيەتان بـۆ هەڵبـژاردم بـۆ؟! بـۆچی ئەم هەموو ئازار و ئەشكەنجەيەتان پێ بەخشيم؟! لەسەر تاوانێـك كە من هەرگيز ئەنجامم نەدابوو... هەرگيز!"

پاشـان ڕەحمـان لەگەڵ خۆيـدا گـوتی: "ئەمڕۆكە وات لـێ دەكەم لە گۆڕێكی وشك و شايستە بەخۆتدا ڕابكشێيت و ئـارام بيت، ناو گۆڕەكەشت بە پووشوپەڵاشی نەرم بـۆ ڕادەخەم و بەو گوڵە كێوييانەی ماونەتەوەش داتدەپۆشـم، ئەی سـتەملێكراوترين مرۆڤی ئەم سەر زەمينە، ئەی كچی بەفر و بەستەڵەك!"

ئاگرەكە بە داگيرساوی و جوانی و ڕووناكييەوە مابووەوە و نـێڵەی دەهـات. هەر كەمێـك دابمركـايەتەوە، باوەشـە دارێكـی

وشك و تەڕی بۆ دەهێنا و بە گەرووییدا دەکرد و سەرلەنوێ ئەویش بلێسەی دەدایەوە و گەرمایی بە دەوروبەری خۆی دەبەخشییەوە، وای لەو گەرمایییەی مرۆڤ لەناو بەفردا دەستی دەکەوێت، چ خۆشی و چێژێکی هەیە! گەرماییەکە هەستەکانی خاو کردەوە و هەر بە دانیشتنەوە خۆی دایە دەستی خەوێکی کورتەوە، ناوەناوە بە تەوەزەلییەکی زۆرەوە چاوەکانی دەکردەوە و بۆ ماوەیەکی تر دایدەخستنەوە. دوا جار کە چاوەکانی کردەوە وا هەستی کرد تەرمی کچە جمکە بەفرینەکە دەلەرێتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەبێ ژیانی بۆ بگەڕێتەوە؟! هەندێك بوونەوەر لە زستاندا ڕەق دەبنەوە و دەچنە دۆخی متبوونەوە، هەر کە سەرماوسۆڵەی زستانیش باروبنەی لێك دەنێ و دەڕوات، ئیدی سەرلەنوێ ژیانیان بۆ دەگەڕێتەوە. بۆ ئەم شۆخە وا باشتر و شیاوترە گاڵتەی وا نەکات و نەگەڕێتەوە، ئاخر ئەم ژیانە هیچوپووچ و بێمانایە شایانی ئەوە نییە مرۆڤ تێیدا بژێت، خۆ ئەگەر ژیانیشی بۆ بگەڕێتەوە، دەبێ حاشای لێ بکات و هەرچی پەیوەندی هەیە بەم ژینگە قێزەون و پیسەوە بپچڕێنێت کە هەتا شایانی ئاوڕدانەوەیەکیش نییە".

تەرمەکە هێدی هێدی بەلادا دەهات و ڕەحمانیش هەردوو چاوەکانی زەق بووبوونەوە، ئەو کاتەی تەرمەکە بەربووەوە و سەری بەر پێیەکانی کەوتن، ئەم لە شوێنی خۆی ڕاچڵەکی، بەفری بەستووی تەرمەکە بە گەرمایی ئاگرەکە توایەوە، زۆری حەز دەکرد پەتۆکەی لەسەر لابدات و ڕوخساری ببینێت، بۆ هیچ نا، تەنها بۆ زیاتر ڕقئەستووربوونی بەرانبەر کەسوکاری و خەڵکی نەفامی گوندەکەی و کوڕی ئاغا کە هاوسەرگیری لەگەڵدا کردبوو. ترسی ئەوەی هەبوو، سەرشێتییەك بنوێنێت و بگەڕێتەوە و تۆڵەی بکاتەوە، ئارەزووی تۆڵەکردنەوەی لەو

کاتەوە لە ناخی لە تەقینەوەدا بوو کە بە شاخەکەدا هەڵزنا بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە، ئارەزووی سەرنجدانی ڕوخسارە فریشتەییە شێوێندراوەکەی بوو کە چارەنووسی نەفرەتاوی بە دەستی نزیکترین کەسی خۆی وای لێ کرد، لەو کاتەدا هەستی بەوە کرد ئەگەر ئەو کارە بکات، لەوانەیە پێوەری ڕقی سەر بکات و توانای جڵەوکردنی ئەو ڕق و کینە هەڵقوولاوەی ناخی نەمێنێت. ئەو بیرۆکانە خەویان لە چاوی تۆران، هەستا و داری وشکی زیاتری کۆ کردەوە، تا دەهات گڕ و بڵێسەی ئاگرەکە بەرز و بڵاوتر دەبووەوە و دەنگی سووتانی دارەکان قرچوهۆڕێکی سەیریان بە سرووشت دەبەخشی، ئەو گۆڕەی کچە شۆخەکە تیایدا ڕادەکشا لێیەوە دوور نەبوو، ڕووناکی ڕۆژ ڕەنگی تێدا دەدایەوە، بە لای ڕەحمانەوە شێدار و سارد بوو، هەندێك پووشوپەڵاش و چیلکەداری هەڵگرت و فڕێی دایە ناوییەوە و بە پشکۆی دارەکان ئاگری لە گۆڕەکەش کردەوە.

کاتەکە زۆر خەمۆکیانە و بێزارکەرانە تێدەپەڕی، پاشان خۆرەکە لەسەر لوتکەی شاخەکان دەرکەوت و هێدی هێدی دابەزییە خوارەوە، تا گەیشتە ناو دۆڵەکە و کەمە گەرماییەکی پێ بەخشی، سمۆرەکان لەسەر لق و چڵی دارەکان کەوتنە ڕاکەڕاك و زیکەزیك و هەندێکیان دابەزینە سەر زەوی و بە دوای ژەمەخۆراکی خۆیاندا لە هەڵپەدابوون، بە خەیاڵی هیچ یەکێکیاندا نەدەهات ببنە ژەمەخۆراکی ڕەحمان، بەڵکوو هەتا خودی ڕەحمانیش پێشبینیی ئەوەی نەدەکرد، ڕەحمان بەردێکی هاویشتە یەکێکیان کە خەریك بوو لە تەرمی شۆخەکەی نزیك دەکەوتەوە، لێی نەدا و ڕای کرد، وەلێ چەند مەترێك لەولاتر بەر سمۆرەیەکی دیکە کەوت و پەلەواژ بوووەوە، ڕەحمان گرتی، لە جورجێك گەورەتر نەبوو، نەخاسمە کاتێك پێستەکەی داماڵی و کلکی باریك و درێژی دەرکەوت. پووشوپەڵاش و

چیلکە و داری ناو گۆڕەکە سووتابوون و بووبوونە خۆڵەمێش، ڕەحمان دابەزییە ناوی و بە دوای پشکۆیەکدا دەگەڕا، ئەگەر تا ئەو کاتە بە گەشی مابێت بە پێیەکانی بیکوژێنێتەوە، پاشان لەبەرخۆیەوە گوتی: "ئەی کچە شۆخەکە، ئێستا گۆڕەکەت وشك و گەرمیشە، پووشوپەڵاشی نەرمیشیت بۆ ڕادەخەم!"

دوای ئەوەی گۆڕەکەی بە دڵ و داو بۆ ئامادەکرد، بە کفنەکەیەوە هەڵیگرت، کفنی چی؟! کفنەکەی پەتۆکەی ڕەحمان بوو، ئینجا لەناو گۆڕەکە، یان ڕاستتر بڵێین ئەو چاڵەی ڕەحمان بۆی لێ دابوو درێژی کرد، بەرلەوەی خۆڵی بەسەردا بکات، دەستی بۆ درێژکرد و پەتۆکەی لەسەر ڕوخساری لادا، کە بینی وا بە دوو چاوی کراوە و جوانەوە تەماشای دەکات، ڕەحمان لە شوێنی خۆی ڕاچڵەکی و شۆك بوو، سەرنجدانێك مرۆڤ توانای باسکردنی نییە، سەرنجدانێك پڕاوپڕ لە حەپەسان و دۆشدامان و شۆکبوون، تەژی لە ترس و تۆقین، لێوانلێو لە گڕ و حەسرەت و بڵێسە، لە نووکی پێی تا تەوقی سەری پڕ لە پاکیزەیی و شکۆمەندی، سەرنجێك لەو چاوەی کە ئاڕاستەی بکوژەکانی کرد لەو کاتەی بەو جۆرە جێیان هێشت و دایانەدەستی چارەنووسێکی ڕەش و نادیارەوە. وەك ئەوەی هێشتا لە ژیاندا بێت و زیندوو بێت، ڕەحمان دەستی لە شادەمارەکانی لاملی دا، تاکوو دڵنیابێت لە مان و نەمانی، لە لێدانی دڵ و هەناسەی، پاشان بە نەرمییەکەوە و بەناو لەپی چاوەکانی بۆ داخستن و بۆ هەتاهەتایە ئەو فریشتە پاکیزەییە شۆخوشەنگە بە حەسرەتەوە ماڵئاوایی بکات، بێ ئەوەی لەو ماوە درێژەدا هەروەکوو چۆن جێیان هێشتبوو، بێ ئەوەی بۆ ساتێکیش چاوەکانی لێك بنێت، وەك ئەوەی لە چاوەڕوانی فریادڕەسێکدا بووبێت، هەر وەکوو خۆی مابووەوە، وەلێ نە فریادڕەس گەیشت و نە کەسیش لەو مەرگە پڕ لە سوێیەی دەربازی کرد.

ئەو سەرنجەی وا ڕەحمانی سەرقاڵ کرد نەبێتەوە، ئەوەی ئەو درندانە بە ڕوخساری ئەو پەریەیان کردبوو، ئاژەڵی درندەش نایکات، لووتێك و دوو گوێی بڕاوا ڕەحمان بە شڵەژانێکی دەروونیی بارگاوی بە سۆز و ڕق و کینەوە بە خێرایی پەتۆکەی دادایەوە سەر ڕوخساری و بە توندی چاوەکانی خۆی گرت. پاشان سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕی و هەردوو باسکەکانی و دەستی وا گرژ و ڕەق بووبوون لە حەژمەتا نەیدەزانی هاوار بۆ کوێ و بۆ کێ بکات، وەلێ بە دڵێکی شکاوەوە هەستایە سەر پێ و دەستی بە کۆکردنەوەی پووشوپەڵاشی وشکی زیاتر کرد و تەرمەکەی پێ داپۆشی و ئینجا خۆڵی بەسەردا کرد و ژمارەیەك بەرد و چەوی بچووکی لەسەر زەوییەکە کۆ کردنەوە و لەسەر خۆڵی گۆڕەکەی ڕیزی کردن و بە دەنگێکی بیستراوەوە دەیگوت: "تۆڵەت دەسێنم کچە شۆخەکە، تۆ دڵنیابە، پەریە شەنگەکە".

ئەم شۆخە بۆ هەتاهەتایە لە یادەوەرییدا بە زیندوویتی دەمێنێتەوە. خۆشییەکانی ژیانی لێ لێڵ و تاڵ و تاریك دەکات، ئەگەر بەڵێنەکەی خۆی نەهێنێتە دی و تۆڵەی نەکاتەوە. "ئەوە چ سوودێکی دەبێت؟!" ئەو شۆخە بە گوێی یادەوەریی ڕەحماندا چپاندی و ئەمەیشی بۆ زیاد کرد: "نەکەی ئەوەی لە مێشکتدایە ئەنجامی بدەیت، ئەوانە کەسوکاری منن، سزادانی براکەم بەس نییە، ئەگەر وا بکەیت و ئازاریان بدەیت، ئەم جارەیان لێت زویر و دڵگران دەبم، مافی منت لەو ساتەوە وەرگرت و تۆڵەی منت کردەوە کە هاتیت و لەو سەهۆڵبەندانەدا ڕزگارت کردم، ئەوەندەم بەسە کە لە پێناوی مندا کردت".

ئیدی ناخی ڕەحمان دوای ئەو هەموو خرۆشان و شڵەژانە کەمێك ئارام بووەوە و سوکنایی دڵی داهات. لەبەرخۆیەوە گوتی: "لە سزادانی براکەی لێم زویر نییە... ئەمەیان بۆ من

باشــه... هەر زۆریــش باشــه". گەڕایەوە و لە نزیــك ئــاگرەکە دانیشت، تا ئەو کاتە دارەکـان دامرکـابوونەوە بووبـوونە پشکۆ، جـارێکی تـر جۆشـی دایەوە و بڵێسـەی بەرز کـردەوە، دوای ئەوەی هەندێك داری دیکەی خستە سەر پشکۆکان و فووی لێ کردن، هەستی بە گرانبوونی پێڵوەکـانی چاوی دەکـرد، سـەری خسـتە سـەر بەردێکـی نزیکـی و خـۆی دایە دەسـت سـووکە خەوێکەوە. هەستی کرد لەسەر لق و چڵوپۆپی دارەکەی سـەری کە لقەکـانی ئەوەنـدە پەلوپۆیـان هاویشـتبوو، هەتـا بـان سـەری هـاتبوون، سـمۆرەکانیش ڕاکەڕاك و بازبازێتیـان بـوو، لەو لـقە گەورەیە وشـکەوەبووەی بـان سەریشـییەوە، سـمۆرەکان وەکـوو مشــار بە شـێوەیەکی بــازنەیی بە ددانە تیژەکانیــان خەریکــی قرتانــدنی دارەکەن و پەیتاپەیتــا زیــاتر هەڵیــدەکۆڵن، لە ناکــاو دارەکە بەو گەورەوگــرانییەی خـۆیەوە دای بە تەپڵــی ســەری ڕەحمان و سەری پلیشـاندەوە، ڕەحمـانیش لەو سـووکە خەوەی ڕاپەڕی و دەستی بەسەری پلیشاوییەوە گرت و ویستی ڕابکـات. بینـی سـەری سـەلامەتە و لقـی دارەکەش نەکەوتـۆتە خـوارەوە، زانی ئەوە خەونێکی لە ناکاو بووە و هیچـی تـر... مۆتەکەیەکی سووك بووە و پێیدا تێپەڕیوە، تاکوو بە ئاگای بهێنێـتەوە، ئـاوڕی لە دەوروبەری خۆی دایەوە، سمۆرە کەولکراوەکەی لە تەنیشتی خـۆیەوە بینــی کە بە هەڵە کوشـتبووی، هەڵیگــرت و لەســەر بەردێکی دانا و هەندێك پشکۆ و ڕەژووی لە دەورانـدەوری کۆ کردەوە، گۆشتێکی ناسك، تەنها بە چەند خولەکێکی کەم بـووە ژەمێکی ئامادە، گۆشـتی سـمۆرەکەی دەخـوارد و لەبەرخـۆیەوە دەیگوت: "وای ئەگەر کەمێك خوێم پێ دەبوو، چۆن ئەوەشـم لە بیر چوو؟!". ئەوەندەی بە خۆی زانـی تەنهـا ئێسکوپرووسـکی سمۆرەکە ماونەتەوە و هەمـووی خـواردووە، بەهەرحـاڵ خـۆ لە دوو پــارووی بچــووك زیــاتر نەبــوو، بە ناچــاری ئێســکە باریکەڵەکانیشی لەسەر گەڵادارێکـی بچـووك کـۆ کـردەوە و لە

پشکۆکانی نزیک خستنەوە، تاکوو زیاتر ببرژێن، پاشان هاتەوەسەری و ئێسکوپرووسکەکانیشی خوارد. ئینجا لەبەرخۆیەوە گوتی: "وای ئێمە چەند دڕندەین، خۆ ئەو سمۆرە بەستەزمانەم حەپەلووش کرد، بێ ئەوەی بەها و سەنگێك بۆ ئەوانەی سەر دارەکان دابنێم کە هەست بە چی دەکەن؟! هەڵبەتە کرداری پێستداماڵین و برژاندنی سەر ئاگرەکەشیان بینیوە و لێی تۆقیون"، رێك وەك ئەوەی بەم کچە بەستەزمانە کرا، بەڵام لە شوێن و کاتی جیاوازدا. بە خەمێکی قورسەوە پێستە داماڵراوەکەی هەلگرت و لە نزیك سەری کچە شۆخەکەوە چاڵێکی بچووکی بۆ کرد و داپۆشی. دیسانەوە لەبەرخۆیەوە گوتی: "هەردووکتان قوربانیی دڕندەیی مرۆڤەکانن، کە پێیان لە هەر شوێنێك دانا، ئیدی خەم و ماڵوێرانی و کاولکاری و حەسرەتی تێدا جێ دەهێڵن". پاشان لە شوێنەکە دوور کەوتەوە و بوێریی ئەوەی تێدا نەبوو سەرنجی سمۆرە نەرمونیان و ڕووخۆشەکانیش بدات کە لەسەر چلوپۆپی دارەکانەوە بە گومان و ترسەوە لێیان دەڕوانی، دەیویست داوای لێبوردنیان لێ بکات... وەلێ چ داوای لێبوردنێك تازە سوودی دەبێت؟! ئەمەیان دەنگدانەوەی هەستی مرۆڤێکە لە ناخی ڕەحمان کە لە گیانەڵادایە. تۆ بڵێی بتوانێت سەرلەنوێ هەستێتەوە سەر پێ، دوای ئەوەی دڕندەکان بە درێژایی چەندین ساڵ بەر نووکە نێزەی دڕندەیی و ئازار و ئەشکەنجەی هزر و بیرۆکە گەنیوەکانی خۆیان دا؟! ئایا توانای هەستانەوەی هەیە، دوای ئەوەی دڕندەکەی ناخی خۆیشی بەر نووکە نێزەی دا؟ ئەو دڕندەیەی لە ناخیدا خۆی مەڵاس داوە. بیری کردەوە بگەڕێتەوە لای هاوڕێکانی، بەرلەوەی شەودا بێت، گەیشتەوە لایان، تاکوو وەرزی زستانیشیان لەگەڵدا بە ڕێ بکات.

## بەشی سی و یەك

زستانی ئەم ساڵ زۆر نەرمونیان و جوان و لێوانلێو لە بەزەیی بوو، وێڕای ئەوەی هەمووان دایاننابوو زستانێکی تەڕوتووش و سەخت بێت.

شەوەکەیان ئەوەندە سارد نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆپاکە بەوپەڕی برسێتییەوە دارەکانی یەك لە دوای یەك هەڵدەلووشی، تا هەر چوار لای وەکوو دەندووکی کەو سوور هەڵگەڕا، ئەوانەی لە دەوراندەوری دانیشتبوون، هێدی هێدی بە خۆهەڵکڕاندنەوە لێی دوور دەکەوتنەوە، چ لەبەر گەرمای ئاگری زۆپاکە، چ بە هۆی کەوتنە جووڵەی کێچ و ئەسپێی ناو پزووی شەرواڵ و بنهەنگڵ و کاکە تۆ بڵێی سەرتاپای جەستەیان. تاریکاییش بە تەواوی باڵی بەسەر ناوچەکە و کونوقوژبنی ئەو ژوورەشدا کێشابوو کە ئەوانی تێدا نیشتەجێن، چونکە فانۆسە نەوتینەکە، هاوشێوەی هەموو فانۆسە هاوشێوەکانی خۆی لە گوندەکان، تەنها ڕووناکی بۆ خۆی هەیە و گوێ بە کەسی دەوروبەری خۆی نادات، وەك ئەوەی ڕووناکییەکە بڕیاری جیانەبوونەوەی لە گڕی فتیلەکە دابێت. ژوورەکە جمەی دەهات، خۆی لە بنەڕەتدا جێگەی حەوت کەسی لێ دەبووەوە، کەچی ئێستا سیانزە کەس خۆیان تێی پەستاندووە، لە ناویاندا چوار ئافرەتیش، دووانیان بە هاوسەرەکانیشیانەوە. بە سرووشتی خۆی شەوەکان درێژی و بێدەنگی و خەمۆکی دەبنە پاڵەوانی تەمەنیان و خەریکن بیانخنکێنن، وەلێ شەو لەبەردەستی ئەم پۆلە مرۆڤە و لەناو ئەو ژوورە بچووکەدا چۆن ڕێگە بەو مۆتەکانە دەدا توخنیان

بکەوێـت؟! هەرچەنـدە دەموچاوەکـان بـێ ئەوەی یەکێکیـان وشەیەکیشی لە زار بێتە دەر، بە یەکتری دەڵێن: "چۆن ئەم شەوە درێژ و پڕ لە خەم و ئەندێشەیە بە ڕێ بکەین؟ ئەوەتانێ مامۆستا عومەر بیرۆکەی سازدانی ئاهەنگێکی بچووکی لا گەڵاڵە بووە و دەیەوێ وەکوو پێشنیارێك بیخاتە بەردەستیان:

- ئەرێ ڕاتـان چیـیە بە سـازدانی ئـاهەنگێکی بچکـۆلانە، درێژیی ئەم شەوەی پێ بکوژین؟

دکتۆر بە دەنگێکی ماندوو و بێزار و لەژێر لێوەوە:

- وای لە شەوی درێژی زستان چەنـد بێـزارکەرە و تەواو نابێت.

مامۆستا عومەریش ئەمەی دەخاتە سەر و دەڵێت:

- بەڵکـوو تـۆ بڵـێ چەنـد نـاخۆش و ناشـیرینە و شـەوانی هاوینیش چەندە جوان و خۆشن. ئەم زستانە ژوورەکەی کردۆتە قووتـوویەك و هەموومـانی وەکـوو ماسـیی سـەردین لە ناویـدا بەسەریەکدا پەستاندووە.

یەکێك لە کچەکان ئەملا و ئەولایەکی کرد و لە ناوەڕاستی ژوورەکە دانیشـت، مامۆسـتا عـومەریش هـاوارێکی لـێ کـرد و گوتی:

- تــوو خــودا لە بەرانــبەر فانۆســەکە دامەنیشــە، پێشــی ڕووناکییەکەت گرت، خەریکە ڕۆحم لە لووتمەوە دێتە دەرێ.

لە پشتییەوە و لە تاریکاییەکە ڕەحمان دانیشتووە و پشـتی بە دیوارەکەوە داوە، بە دەنگێکی کز و شەکەتەوە پرسی:

- چۆن ڕۆح لە لووتەوە دەردەچێت؟!

مامۆستا عومەر بە دەم قسەکردنەوە خۆی سووڕاند و گوتی:

- کامە ڕۆح و کامە لووت؟!

ڕەحمان کەمێك دەنگی بەرزتر کردەوە و دووبارە گوتی:

- تۆ وات گوت! چ زوو لە بیرت چوو؟!

- من وام گوت؟! لەوانەیە! بەهەرحاڵ تەنها ڕستەیەکی باوە و مرۆڤ لە کاتی بێزاریدا دەیڵێت. ئینجا کێ دەزانێت ڕۆح لە کوێوە دەردەچێت؟! لەوانەیە لە دەمەوە بێت، یان لە گوێچکەوە.

- یان لە دواوە هههههههه...

ڕەحمان بە قاقای پێکەنین و بێزەوقییەکی زۆرەوە وای گوت و ئەمەیشی بۆ زیاد کرد:

- جا ئەگەر دەرچوونی ڕۆح لە دەرچەیەکەوە بێت، دەبا هەموو دەرچە و دەروازەکان بگرین، بەڵکوو چیتر هیچ گیانلەبەرێك نەمرێت. یان هەموو دەرچە و دەروازەکان دادەخەین و تەنها هەردوو گوێچکە بە کراوەیی دەهێڵینەوە، کاتێك گیانلەبەرێك دەمرێت، ئاژەڵ بێت یان مرۆڤ، دەبێ هەردوو گوێچکەی بپشکنین، تاکوو بزانین پەردەی یەکێك لە گوێچکەکانی دڕاوە یان نا، ئەو کاتە دڵنیا دەبین کە ڕۆح لەوێوە دەرچووە، خۆ ئەگەر نەشدڕابوو، لەوانەیە دەرچە و دەروازەیەکی دیکەی دۆزیبێتەوە کە بە خەیاڵی هیچ کامێکماندا نەهاتووە دایبخەین. لەوانەیە لە کونە وردیلەکانی سەر جەستەمان بێت، ئەوانەی دڵۆپە ئارەقی شەکەتی و گەرماییان لێوە دەردەچێت، کەواتە دەبێ جەستەمان بە کەتیرە، یان قیڕ و زفت سواخ بدەین، تاکوو ڕۆح لەناو جەستەماندا بەند بکەین ههههههههه.

ئەو کچەی لە نزیك فانۆسەکەوە دانیشتبوو گوتی:

- من دەمەوێ شتێك دەربارەی ڕۆح بزانم، بەڵام بەبێ گاڵتەجاڕی.

مامۆستا عومەر دوای چرکەساتێك لچولێوی هەڵگێر و وەرگێڕ کرد و گوتی:

- ناتوانین بڕیار لەسەر بوونی، یان نەبوونی بدەین، تا ئێستا زانست نەگەیشتۆتە ئەنجامی کۆتایی و لێی دڵنیا نەبۆتەوە، بۆیە ئەمەش مەتەڵێکە لە مەتەڵەکان.

ڕەحمان دوواندی و بە دەنگێك کە هەموویان گوێیان لێ بوو گوتی:

- من گەیشتوومەتە هەڵهێنانی مەتەڵەکە!

کچەکە بە پەرۆشەوە گوتی:

- دەی کەواتە پێم بڵێ.

ڕەحمان لە بەرزیونزمیی دەنگیدا هیچ جۆرە گاڵتەیەکی پێوە دیار نەبوو، گوتی:

- ڕۆح بە یەك ڕستەی سادە بریتییە لە شۆربایەکی نیسك و کولێرەیەکی گەرم، لەگەڵ کەمێك چای و لە کەشوهەوایەکی خۆش و کراوەدا.

کچەکە دیسانەوە گوتی:

- گوتمان بە بەبێ گاڵتەجاڕی و توانج!

- من بە ڕاستیمە و هیچ گاڵتەش ناکەم.

- دەی پێمان بڵێ بلیمەتی زۆرزان، ڕۆح کە یەکێکە لە

ئاڵۆزترین مەتەڵەکان، چۆن لە لۆژیکە سەیروسەمەرەکەی تۆدا گۆڕاوە و بۆتە شۆربای نیسک؟!

ڕەحمانیش بە کەمێك توندییەوە گوتی:

- دە تۆ یەکەم جار بەردەم فانۆسەکە چۆل کە، لەبەر ئەوەی هەر بە ڕاستی ڕۆحمان خەریکە لە لووتمانەوە دەردەچێت، ئێستا من مەتەڵی ڕۆحت بۆ شیتەل دەکەم، نازانم بۆچی فانۆس لەسەر زەوی دادەنێن، ئەی ئەوە نییە شوێنی هەڵواسینیشی بۆ کراوە؟!

کچەکە بە بێزارییەوە گوتی:

- لەبەر ئەوەی وەکوو کوێرەکان بە ڕێگەدا دەڕۆن، هەر کاتێك بە تەکیدا دەڕۆن سەرتانی پێدا دەکێشن.

دیسان ڕەحمان گوتی:

- لە سەر زەویش بە پێمان ساتمەی لێ دەکەین.

کچەکە خۆی لە پێش فانۆسەکە لادا و گوتی:

- دەی ئەوە ڕووناکیی فانۆسەکەش بۆ تۆ، ئێستا پێمان بڵێ و تێمانبگەیەنە و شرۆڤەی ڕۆحمان بۆ بکە، کە لای تۆ بۆتە شۆربای نیسك.

ڕەحمان لە کاتێکدا چاوەکانی بە تیشکی کزی فانۆسەکە دەبریسکایەوە گوتی:

- ئەو ڕۆحەی گریمانەی بوونی دەکەین، شێوەی تەنێك وەردەگرێت، یان شتێکی بەبێ ڕەهەند و شێوەیەکی دیاریکراوە؟

مامۆستا عومەر هەڵی دایە و گوتی:

- ئەوە شتێکی نادیارە و کەس نایزانێت، بەڵام فیلمەکانی هۆلیوود ڕۆح وەکوو شێوەیەکی تەواو بەرجەستە دەکەن.

- واز لە هۆلیوود بهێنە با زانستیانە بدوێین، هەر هۆلیوودیشە ڕۆح لە شێوەی جلوبەرگدا بەرجەستە دەکات و پیشان دەدات. ئەمە واتای ئەوەیە کە جلوبەرگیش ڕۆحیان هەیە هەههههههههههه. ئێستا تۆ لەگەڵ مندا بیر بکەرەوە، تۆ لە وڵاتێکی پێشکەوتوودا دەژیت لە ڕووی تەکنیکییەوە، لەوێ پزیشکەکان ڕێز لە ژیانی مرۆڤ دەگرن و بە هەموو توانای خۆیانەوە کۆشش لە پێناوی مانەوەیدا دەکەن، ئەوەتا تۆش لەسەر شەقامێکی خێرا ڕووداوێك دەکەیت، کۆپتەرێکیش بە خێرایی دێت و دەستەیەك پزیشکیان بۆ ڕزگاکردنت هێناوە، دەبینن دەست و قاچەکانت پارچە بوون و بڕاونەتەوە. سینگت بە درێژی شەق بووە و ملت لە بڕبڕەی پشتت ترازاوە و کەللەی سەرت تەنها لە ڕێگەی شادەمارە خوێنبەرەکانەوە بە جەستەتەوە هەڵواسراوە، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە دوای یەك خولەك لە ڕووداوەکە دەگەنە سەرت و دەبینن هێشتا لە ژیاندا ماویت و بە مەزەندەی ئەوان لەوانەیە دوای یەك خولەك یان دووانی دیکە بمریت، واتە ڕۆحە گریمانە کراوەکە هێشتا لە جەستەتدا ماوە، دەی پێم بڵێن لە کوێدایە؟! ئایا ئەو شێوەی شەبەنگێکی مڵەمایی -جەلاتینی- بێ ڕەهەندە و تەنها لە کەللەی سەرتدایە، نەك جەستەت، یاخود لە شێوەی جەستەتدایە و ئێستا لە دەست و قاچە بڕاو و پەڕیوەکانتدایە. هەر ئێستاش تیمە پزیشکییەکە پێشوازییان لە دەست و قاچە بڕاوەکانت کرد و تازەترین تەکنیکیان بۆ چاککردنەوەت تەرخان کرد و دوای ڕۆژێك لە کاری بەردەوام توانییان هەموو پارچەکانی جەستەت لە مردن ڕزگار بکەن، بەڵام هەر یەکە و لە شوێنێك. دەستیان بە

ئـــامێرێکی پەرەســـەندووەوە بەســـتۆتەوە، لەو ئـــامێرانەی لە ژوورەکانی نەشتەرگەریدا زۆرن، ئامێرەکەش جگە لە پەمپێك بۆ بەستنەوەی خوێنبەرەکـانی دەسـت بەولاوە شـتێکی تـر نـین و هەموو پێداویستییەکانی مـانەوەی بـۆ دابـین دەکەن و خانەکـانی جەستە بە زیندوویێتی دەهێڵنەوە، وەك ئەوەی دەستەکە لە جەستە نەبووبێتەوە، تا ئێستا ڕوونە؟ هەرچەنـدە پێویسـتیش بە خەیـاڵێکی وا ژیر و بلیمەت ناکات لێی تێبگـات، هەنـدێك جـار دڵـیش لە سـینە دەردەکەنە دەرەوە و خـوێنبەرە سـەرەکییەکەی جەسـتە بە جۆرێــك لەو ئــامێرەوە دەبەســتنەوە و جەســتە بە زینــدوێتی دەمێنێــتەوە، تــاکوو چارەســەری دڵە پەککەوتــووەکە دەکەن و دەیگەڕێننەوە شوێنی خۆی. کەواتە دەست و هەموو پارچە بـڕاو و پەڕیوەکـانی دیـکە گیانیـان سـپارد و لە ژیانـدا نەمـان، بەبـێ خۆراك و هەوا، کە لە ڕێـگەی خـوێنەوە دەگـوازرێنەوە بۆیـان، وەك دەزانین هەر پەل و شوێنێکی بـڕاو ئەو پێداویسـتییانەی پـێ نەگەیەنرێت، هەڵبەتە کۆتایی دێت. دەرئەنجام ئەو بەشـە بـڕاوانە بە شـوێنی خۆیـانەوە بلکێنـدرێنەوە، یـان نـا، ئەوا بە زینـدوێتی دەمێننەوە مادام خۆراك و هەوایان دەگاتێ.

لەو کاتەدا چاوەکانی کچەکە پڕ لە پرسیار بوون، مامۆسـتا عومەر هەڵی دایە و گوتی:

- ئەی چـی دەبێـت ئەگەر سـەری مـرۆڤ بـڕدرا و لە جەستە جودا کرایەوە؟

ڕەحمان گوتی:

- ئەوەی بۆ پەلوپۆ بڕاوەکان دەکرێت، بە هەمان شێوە بـۆ ئەویش دەکرێت، سەریش بە زیندوویێتی دەمێنێـتەوە لە کاتێکـدا لە جەستەش جودا بووەتەوە. تـاقیکردنەوەیەکی کـۆنیش هەیە و

وەكوو فیلمێكی دیكۆمێنتاری لە پەنجاكان یان پێشتر وێنەی گیراوە و بە پێداویستییەكانی مانەوەی خانەكان بە زیندوویتی لكێندراوەتەوە. سەرەكە بەبێ جەستە لە ژیاندا ماوە.

كچەكە لە كاتێكدا دەیویست لە بیرۆكەكە تێبگات گوتی:

- مەبەستت ئەوەیە ڕۆح هوشیاری و هەستە؟

- هەرگیز وا نابێت و تەنانەت وەكوو هوشیاری و هەستیش نابێت، چونكە دەكرێ مرۆڤ زیندوو بێت و ڕۆحە گریمانەییەكەشی لێ جودا نەبێتەوە، كەچی لە هۆش خۆی چووە و نە هۆشی هەیە و نە هەست، هەست بەوەش ناكات لە دەوروبەریدا ڕوو دەدات.

- كەواتە ڕۆح چییە؟ بەو شرۆڤە و شیكردنەوانەت بێزار و وەڕست كردین و هێشتا پێت نەگوتووین ڕۆح چییە.

ڕەحمان بە ناوچەوانی خۆیدا كێشا و بە كچەكەی گوت:

- دوای ئەو هەمووەی گوتم، هێشتا دەپرسی ڕۆح چییە؟!

مامۆستا عومەر ئاوڕێكی لە كچەكە دایەوە و پێی گوت:

- من باوەڕم بەوە هێنا كە ئەو گوتی. ڕۆح بە لای ئێمەی پێشمەرگەی شاخەوە، بریتییە لە شۆربای نیسك و ژاژیی نەفرەتی، لەگەڵ هەوا و ئاو، سەبارەت بە خەڵكە ڕەشۆكییەكەش پاقلەو نۆكە، بۆ دەوڵەمەندەكان و هەموو گیرفانپڕەكانیش لە ڕووی داراییەوە مریشك و نەرمە گۆشتی ئەنجنكراو و باشترین مەی و شەرابە.

ڕەحمان ئاماژەی بۆ كچەكە كرد و گوتی:

- واتە بە وشەیەك ڕۆح بوونی نییە. ئەم بیرۆكەیەش ئاستی

نەزانی لای خەڵکە ڕەشۆکییەکە بەهێزیان کرد، ئەگەرنا شتێکی دیکە نییە، دواتریش بازرگانانی هونەر و فەنتازیا جۆرەها چیرۆك و حیکایەتیان بۆ هۆنییەوە و فیلمیان بۆ ساز دا و ملیاران دۆلاریان لە سایەیدا چنییەوە. واتە هەر لە منداڵێتیی بەدبەختیمانەوە هەرچییەکیان ویستووە و نەوە دوای نەوە بۆ باوانمان گوازراوەتەوە، لە مێشکیان پەستاوین و جگە لە درۆ و شتی تروهات بەولاوە هیچی تر نییە. نە عزرائیل ڕۆح دەکێشێت و نە هیچ تارماییەکیش هەیە، ئەوەی ئەم چیرۆکانەشی هەر لە دێر زەمانەوە داهێناوە، ئامانجی نەپێکاوە و کەسێکی وردەکار نەبووە، وەکوو چۆن مرۆڤ لە مێشکی خۆیدا ئەو وەهمەی خولقاندووە، کە لە بنەڕەتدا بوونی نییە و پێی دەگوترێت وەهمی ڕۆح، ئیدی بە دەوراندەوریدا گەڕا و سووڕا و بە دوای شرۆڤەرکردنێکدا دەگەڕێت بۆی. هەروەها بیرۆکەی خوای زاڵ و دەسەڵاتدار بە سەر ملیۆنان کەس، ئیدی وەسفێکی خەیاڵیانەی ئەو خوایەشیان کرد و چەندین خەسڵەتی ئەفسووناوییان دایە پاڵی، بەڵام ئەو، واتە خوا بە هەموو ئەو توانایەی کە گەمژەیی مرۆڤ پێی بەخشیوە، نە خۆی و نە هێزە ئامادەکەی عزرائیل توانای کێشانی ڕۆحی زۆرێك لەو خەڵکەیان نییە کە لە لایەن پزیشکەکان و لە نەخۆشخانەکان چاك بوونەتەوە، دوای ئەوەی خوا هەوڵی دا و ئومێدی ئەوەی خواست ڕۆحیان لێ بسێنێتەوە. هەندێك جار خەیاڵ دەکەم کە خوا عزرائیلی بۆ ئەوە ناردووە گیانی هەندێ کەس لە ڕێگەی ڕووداوی دیاریکراوەوە بکێشێت، کەچی پزیشکەکان بە هانای تووشبووەکانەوە چوون و خۆیان بە کلکی ڕۆحەکەوە هەڵواسیوە و نەیانهێشتووە دەربچێت. وەلێ عزرائیلیش خۆی بە لایەکەی دیکەی ڕۆحیانەوە هەڵواسیوە و هەوڵی کێشان و دەرکردنی لە جەستەیان دەدات، تا شەکەت و ماندوو بووە و ئارەقی ڕشتووە و پێی نەکراوە و

هەمـــوو هەوڵ و کۆششـــەکانی بە هەدەر چـــووە. کـــاتێکیش دڵنیـابووە هـیچ ئەنجـامێکی لەو هەوڵە تـاکە کەسـیە دەسـتگیر نابێت، داوای یارمەتی لە خوا دەکات و هاوڕێکەشمان –هەڵبەتە مەبەستمان عیزرائیلە- لەگەڵ هەرچی جنۆکە و خێو و دێـو هەیە لەگەڵیـدا ڕۆح دەکێشـن، بەڵام هەمووشـیان شکسـت دەخـۆن و سـەر نـاکەون، زۆر جـاریش دکتۆرەکـان بە سـەر خـوادا سەرکەوتوون، کاتێك عزرائیل بە دەستی بەتـاڵەوە گەڕاوەتەوە و توانای کێشـانی ڕۆحیـانی نەبووە کە خـوا داوای لـێ کردبوو، وێڕای ئەو توانسـتە ئەفسـووناوییە بێئەنـدازانەی لە لایەن خـودی مرۆڤەوە پێی دراوە.

کچەکە دیسان پرسییەوە:

- مەبەستت ڕوونە، کە ڕۆح بیرۆکەیەکە و لە هـۆنینەوەی عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤە.

- هەروەها خواش.

- چ قەیدییە... خواش، بەڵام ئێستا با لەگەڵ ڕۆحدا بـین... پرسیارەکەم ئەوەیە: بۆچی مرۆڤ بیرۆکەی ڕۆحـی خولقانـدووە و لەگەڵیدا ژیاوە؟!

ڕەحمان بە منگەمنگ و لەسەرخۆ:

- ترسی خۆڕسك لە مردن و بـردن و پاڵـانی مـرۆڤ بـۆ خولقاندنی بیرۆکەی ڕۆح و بیرۆکەی خـوا، شـتێکی نـامۆیە بـۆ پەیوەندیکردنێکی بەردەوام و هەمیشەیی. خوا و ڕۆح پەیوەسـت و گرێدراوی یەکترین، ئەگەر بیرۆکەی ڕۆح سڕدرایەوە و نەما، ئەوا خواش بوونی نامێنێت، واتە بۆ ئەوەی مرۆڤ دوای مردنـی بە زینـدوویی بژێـت، ئەوا هەڵـبەتە دەبـێ ڕۆح هەبێـت، هەر دەشبێت ئایندەیەك بۆ ئەم ڕۆحە هەبێت کە خـوایە، تـاکوو ئەو

ئاوات و ئومێدانەی بهێنێتە دی کە لە ژیانی یەکەمدا بەدەستی دەهێنێت و سزاش لەوانە وەربگرێتەوە کە ستەمیان لێ کردووە.

پاشان ڕەحمان بێدەنگیی هەڵبژارد و درێژەی بە بێدەنگییەکەیشی دا، مامۆستا عومەریش هەر وای کرد. کچەکە بۆ ماوەیەك بە سەرنجەکانی ڕوخساری ڕەحمانی دەپشکنی، وەك ئەوەی چاوەڕوانی قسەی زیاتری لێ بکات، چونکە بە قسەکانی هەستی بە ئارامی زیاتر دەکرد، زیاتر لە بێدەنگیی ئەو گۆڕەی کە لوولیان دەدات. بەڵام لە کۆتاییدا پشتی تێ کرد و لە تاریکاییدا نقومی کرد. دوای تێپەڕبوونی نیو کاتژمێرێك، کچەکە بە دوودڵی و شڵەژان و ترسەوە ئاوڕی لە جەستە ڕاکشاوەکانی دەوروبەری دایەوە و بێ ئەوەی لە شوێنی خۆی بجووڵێت هاواری کرد:

- ئەوە چیتان بەسەر هاتووە؟! بۆ وەکوو مردوو ڕاکشاون؟! دەی... دەی چەپڵە لێدەن و با کەمێك گۆرانییش بڵێین.

مامۆستا عومەر بە ڕوویەکی خۆش و ڕەزامەندییەوە لە هەڵپەدابوو:

- دەی گۆرانی بڵێین... هەمووتان چەپڵە لێدەن و ئێمەش گۆرانی دەڵێین.

وەلێ کاتێك هیچ کەسێکیان وەڵامی بانگەوازەکەیان نەدایەوە، دەستی بە چەپڵەلێدان کرد و ئەوانەی ڕاکشابوون بە زۆری زۆرداری قیت دەکردەوە.

- دەی با هەموومان گۆرانی بڵێین... پێکەوە گۆرانی بڵێین.

دوای سووربوونی مامۆستا عومەر لەسەر داواکارییە

بێزارکەرەکەی، یەکێکی دیکەشیان هاتە پاڵی، پاشان ئەوانەی چەپڵەیان لێ دەدا بوونە کۆرسێکی تەواو، هەر کە خولەکێکی تر تێدەپەڕی یەکێکی دیکە دەهاتە ڕیزی ئەڵقەی ئاهەنگگێڕانەوە، ئیدی بە خۆشی و کەیفسازییەکی زۆرەوە پێدەکەنین، تا جۆرە ژیانێکیان خستەوە بەر ژوورەکە. ئەوەی جێگەی ئاماژەیە، ئەگەر سەرنج بدەینە ڕوخساری ئەوانەی ژوورەکە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بەبێ هۆ پێدەکەنن، بەڵکوو تەنانەت هۆیەکیش نەبوو بۆ خەندە و پێکەنینیان، بەڵام وا دیار بوو بێ ئەوەی درکی پێ بکەن دروستیان دەکرد، تاکوو وا بکەن جۆرە خۆشی و ئاهەنگ و هەرایەك باڵ بەسەر ئەو کەشە خەمۆکییەیاندا بکێشێت، ئینجا کچەکانیش هاتنە ناو کۆڕی گۆرانیبێژانەوە و سەرنجەکان هەموو ئاڕاستەی ئەوان بوون، وەلێ هێندەی نەخایاند دەنگی سیانیان کپ بوو و دەنگی چوارەم بەسەریاندا زاڵ بوو و بە خۆشییەوە گۆرانی دەچڕی. ئیدی هەموویان یارمەتییان دەدا و هەر کە گۆرانییەکەی دەهاتە کۆتایی، ئەوان بۆ بەردەوامبوونی زیاتر هانیان دەدایەوە:

- بڵێ بڵێ ڕامەوەستە گۆرانی بڵێ... هەر شتێك دەزانی بیڵێ، دەی بینەری تەوەزەلمان ناوێت هەموو چەپڵە لێدەن، دەنگی کچەکە بە گۆرانییەکی دیکە ژوورەکەی پڕ دەکردەوە، ئەم جارەیان ڕەزمێکی خێرای هەبوو و پێویستیی بە جووڵەی زۆر بوو، ئیدی زۆربەیان دەستیان بە شایی و هەڵپەڕکێی میللی کرد، توانج و پێکەنینەکانیان دەگەیشتە دەرەوەی ژوورەکە، ئەوەندە هەڵپەڕین و چەپڵەیان لێ دا، سەرتاپای جەستەیان ئارەقەی لێ دەچۆڕا و هەراوزەنایان ئەو ژوورە چکۆلانەیەی پڕ کردبوو:

- ها ها ها، ئافەرین... دەست خۆش، گۆرانیبێژەکە وەکوو

تیر لە کەوان دەرچوویێت، دەستی پێ کرد، دەبێ تا بەیانی بەبێ بێزاربوون بەردەوام بێت، بە مەرجێك لە چەپڵەلێدان نەکەون.

لە ڕاستیدا کاتێك لەو "شاییولۆغانە"یان بەردەوام بوون، ئەو کەشە خەمۆکییەی پێشتر بەسەر ژوورەکەدا زاڵ بوو، گۆڕا بۆ پێکەنین و خۆشی، تەنانەت پێکەنینەکانیشیان هۆیەکیان بۆ دروست بوو، بەڵام شەو و ڕۆژەکانی زستان زۆرن، دەبێ چەند شەویان گۆرانی بڵێن و ئەهریمەنی بێزاری لە خۆیان بڕەوێننەوە؟! هیچ شتێکی نوێ لە ژیانی دوورەپەرێزی و گۆشەگیریدا نییە، دوێنێش وەکوو ئەمڕۆیە و ئەمڕۆش هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ سبەینێ نابێت و سبەینێش وەکوو دووسبەی دەبێت، لەوانەیە ئەو دەستە پێشمەرگانەی بە گوندەکاندا لە گەڕان و سووڕانەوەن بارودۆخیان باشتر بێت، چونکە گەڕان و سووڕانەوە بە گوندەکاندا ئەو بێزاری و شلوخاوییە دەڕەوێنێتەوە. ئەگەر ڕاستییەکەمان بوێت، جووڵەی خۆکردەیی ژیان و وەرز و سووڕە ساردوسڕەکانی، بێزاری دەهێنێت هەتا بۆ ئەوانەی لە گوندەکانیشدا لە گەڕان و سووڕانەوەدان، ئەوانیش لە نەبوونی گۆڕانکاری و نوێبوونەوە بێزار بووبوون و هەستیان بەبێ ئەنجامی ئەوە دەکرد کە دەیکەن، یەکێکیان بە خەمێکی گرانەوە گوتی:

- لەم کارەمان چیمان دەستکەوت و چیمان چنییەوە؟!ساڵانێکە ئێمە هەموو شتێك هەرزان دەکەین و هەر کاتێك بمانەوێ هەنگاوێك بەرەو قووڵایی زەوییەکانمان بچینە پێش، دەبینین چەند هەنگاوێك دەگەڕێینە دواوە؛ ئەوەتانێ ئێمەش خۆمان لە نزیك سنووری نێودەوڵەتییەکان پەنا داوە و وەکوو کەسانی بیانی و نامۆ دەژین، هەتا نامۆ لە خۆمانیش، بەڵکوو نازانین چیمان دەوێت و ڕاستییش لە کوێدایە؟!

ئێستا تازە دوای چی؟!

هەرگیز هیچ... لەو ژووورە چکۆلانە و تاریکەدا کچەکە لە گۆرانیگوتن بەردەوامە و پشوویەك نادات، ئەوانی تریش لە سەما و شایی و گاڵتە و شۆخی بەردەوامن، کەچی چەپڵەلێدانەکە هێدی هێدی کەم بووەوە، هەتا دوا کەس کە چەپڵەی لێ دەدا شەرم گرتی و خەندەیەکی گەمژانەی کرد و ڕاوەستا، کچەکەش بەرلەوەی گۆرانییەکە تەواو بکات، بڕی.

یەکێکیان گوتی:

- ئەوە چییە وزە و بارگەی پیلەکانتان دابەزی؟!

- بیگۆڕن و پیلی تازەی بۆ دابنێن.

یەکێکی دیکەشیان کەوتە گاڵتە و شۆخی بەوەی تەنیشتی دەکرد، بەڵام ڕوخساری هەمووان ئەو جۆشوخرۆشەی تێدا نەما کە توانای شۆخی و قسەی خۆشیان مابێت.

یەکێك لە ئافرەتەکان بە دەروونێکی شێواوەوە بە ڕووی مێردەکەیدا هاواری کرد و گوتی:

- ئەرێ ئەو بێدەنگییەتان لە چی؟! من هەست بە ترس دەکەم، دەی با لە گۆرانیگوتن بەردەوام بین.

- هاوسەرەکەیشی وەڵامی دایەوە:

- بێزار بووین.

- ئەی لە بێدەنگی بێزار نەبوون؟!

کەس وەڵامی نەدایەوە جگە لە قرچوهووڕی داربەڕووی گڕگرتووی ناو سۆبەکە، پاشان یەکێکیان لە ناکاو ڕوخساری کرایەوە، وەك ئەوەی بیرۆکەیەکی باش و بەسوود خزابێتە ناو

کەللەسەرییەوە، بۆیە بە دەنگێکی پڕ لە جۆشوخرۆشەوە گوتی:

- شتێکتان بۆ پێشنیار دەکەم... شتێکی جوان و نوێ، بەڵکوو پێشتر کەس نەیکردبێت، دەی بزانم کێ دەزانێت چییە؟ نەخێر نایڵێم پێش ئەوەی ئێوە مەزەندەی لێ بگرن... بزانم مەزەندەی کێتان تەواو دەبێت؟ بەڵێ بەڵێ، مەزەندەی چی دەکەن؟! دەمەوێ چ مەتەڵێکتان پێ بڵێم؟!

ئۆقرەی نەگرت تا وەڵامێکی دەست بکەوێت، خۆی هەڵی دایە و بە خێرایی گوتی:

- ڕاتان چییە بقیژێنین؟!

یەکێکیان لێی نزیك کەوتەوە. ئەوانەی دیکەش سەرنجیان دایە ڕوخساری یەکتری، لەسەر ئەو بێدەنگییەیان ژوورەکە بێدەنگییەکی تەواو باڵی بەسەردا کێشا، هێندەی نەخایاند هەندێکیان بە قنگەخشکێ لێی نزیك کەوتنەوە و ئەڵقەیەکیان بە دەوریدا دروست کرد و چاوەکانیشیان زەق زەق دەیڕوانی.

- دەقیژێنین؟!

یەکێکی دیکەش تفی دەمی قوت دەدا و دەیگوت:

- دەقیژێنین؟! بەڵێ دەقیژێنین!

- بیرۆکەیەکی باشە! با بقیژێنین!

- دەی هەموومان.

- هە.........هەمووومان؟!

- بە بەرزترین دەنگمانەوە؟!

- بەڵێ بە بەزرترین دەنگمان، ئێ باشە لەم گۆشەگیری و دوورەدەستییەدا کێ گوێی لێمان دەبێت؟!

- دەبا بە بەرزترین دەنگمان بێت.

هەمووان لە دەوراندەوری بە شەرمەوە بە دوای ئەو کەسەدا دەگەڕان کە دەست پێ دەکات. دەنگی قیژەی یەکێکیان کە پێ دەچوو بوێرترین کەسیان بێت، ئیدی هەموویان بە خەندە و پێکەنین و چاوی زەقیانەوە بە شەرمەوە سەیریان دەکرد، ئەوانی دیکەش دایانە قاقای پێکەنین، تاکوو لەو شەرمەی هەیانە کەم بکەنەوە. پاشان هێندەی نەخایاند دووەم کەسیش بە دەنگێکی بەرز و بەهێزەوە قیژاندنێکی درێژ و بەردەوام قیژاندی و دەنگدانەوەیەکی تۆقێنەری هەبوو، ئیدی یەکێکی تر و ئەوی تر و ئەوی تر و ئەوی تر و ئەوی تر و ئەوی تر... دەستیان بە قیژاندن کرد، دەنگی قیژەیان هەموو شتێکی ئەو ناوەی داگرتەوە، وەکوو گورگ دەیانقیژاند و دەیانلووراند، وەکوو دێو و درنجەکان دەیان نەڕاند، وەکوو ئەهریمەنەکان دەیانقیژاند، وەکوو دڕندەکان، شێتەکان، هەژار و بەستەزمانەکان، سەرشێت و سوالکەرەکان، تووشی هیستریا بوون، پێکەنین، فرمێسك بە چاویاندا هاتە خوارەوە، چڵم و لیکی دەم و لووتیان تێکەڵی یەکتری بوو و بەو ناوەدا پەرشوبڵاو بووەوە، لەسەر ڕوخساریان جۆرە ترسێك دەرکەوت... ترس لە خودی ترس! لە قیژە و هاوار بەردەوام بوون، زیاتر لە گۆرانیگوتنەکە. لە قووڵایی ناخ و دەروونی جۆشسەندوویانەوە چەقۆی تیژ ناو هەناوی پارچەپارچە دەکردن و لەگەڵیشیدا هەست و نەستیشیانی بەوپەڕی دژوارییەوە لەتوپەت دەکرد. لە ئەنجامی ئەو قیژە و هاوار و گاڵتەجاڕییە سەرشێتانەیە و ناخ خوێناوییانەیاندا ئەو چەقۆ تیژانەیان دەرشاندەوە.

- دەی ڕەحمان لەگەڵمان بقیژێنە. نەفرەتت لێ بێت ئەوە بۆ وا بێدەنگیت؟!

- بقیژێنە ڕەحمان بقیژێنە.

- تـوو شـەیتانەکانی دەریـا بقیـژێنە. هەتـا هێـزت تێـدایە بقیژێنە.

- لەو بێدەنگییەی خۆیدا لێـی گەڕێ، لەوانەیە شـتێك لەم جیهانە بۆگەنییەدا بدۆزێتەوە.

یەکێکیان بە هەموو دەنگی هاواری کرد:

- ڕەحمـان دەتەوێ چـی بـدۆزیتەوە؟! ئەتـۆم دەمـێکە دۆزیویانەتەوە، ڕۆکێت ئەوەندە زۆر بووە لەو هێسـترانە زۆرتـرن کە هەمـانە، بەڵام عەقـڵە ئەلیکترۆنییەکـان و مرۆڤـی خـودڕۆ، سبەینێ شوێنمان دەگرنەوە، ئەم جیهانە شتێکی تێدا نەماوە بیـری خـۆتی پێـوە سـەرقاڵ بکەیـت و بیـدۆزیتەوە... بقیـژێنە ڕەحمـان بقیژێنە. نەفرەت لەوەی بێدەنگ دەبێت و بێدەنگی هەڵدەبژێرێت.

قیژانــدیان و قیژانــدیان و هەر قیژانــدیان، هەتــا هەمــوو کۆتوبەندەکانی جیهـانی کۆنیـان تێـك شـکاند. شـتێك لە نـاخی شـڵەژاو و تێکشـکاویاندا هەبـوو، هەر دەبـێ دەریـبکەنە دەرەوە، بەڵێ شـتێکی وەکـوو چەقـۆ، شمشـێر، تیـروکەوان، ڕم، دڕنـدە، نەفـرەت، شـتی دیـکەی زۆروزەوەنـد، هەر دەبـێ هەڵیبێننەوە و خۆیانی لێ بەتاڵ و دەرباز بکەن.

"بقیژێنە ڕەحمان بقیژێنە". لەگەڵ خۆیـدا دەدوا و چاوەکـانی پـڕ بووبـوون لە فرمێسـك. "بقیـژێنە ڕەحمـان، هەر دەبـێ تـۆش وەکوو ئەوان بکەیت، چی وات لێ دەکا شەرم بکەی؟! بقیـژێنە و ئەوەی لە ناختــدایە بەتــاڵ بــکەرەوە!". بە جـۆرە خـرۆش و تاڵاوێکەوە وەڵامی خۆی دەداتەوە: "نەخێر، من ناتوانم... هەرگیز نــاتوانم. بەڵام هەر دەبــێ ئەوە بــکەم. ســبەینێ دەچــمە ســەر بەرزتـرین لـوتکە، لەوانەی تـا ئێسـتا مـرۆڤ پێیـان نەگەیشـتووە!

لەوێ دوور لە چاوی هەمووان و دوور لە گوێچکەی هەمووان دادەنیشم و پڕ بە دەنگم هاوار دەکەم... بە دڵنیاییەوە وا دەکەم، بەوپەڕی هێزەوە دەقیژێنم و هاوار دەکەم. هەتا هێزم تێدایە هاوار دەکەم و دەقیژێنم، هەتا قورگ و دەنگم دەنووسێن، بەڵکوو من تەنها بە قیژاندن سوکنایی دڵم دابنێت، دەگریێم و زۆریش دەگریێم، بەوپەڕی دڵسووتان و چەشتنی تاڵاوی مەرگەوە دەگریێم، هەر دەبێت ئەو گڕکانە هەڵچووەی تێمدایە دابمرکێنمەوە، یان بێبەزەییانە خۆم دەکوژم".

لەو گاڵتە و شۆخییە شەکەت و ماندووبوون، دەروونیان ئارام بووەوە و بێزارییەکەی ڕوخساریان ڕەوییەوە، هێڵی ڕق و تووڕەیی سەر ناوچەوانیان نەما، پاشان کەشەکە بۆ گاڵتەجاڕی پێکەنین گۆڕا و سەرەوژێر بووەوە... پێکەنین بە هەموو شتێك، بە خۆیان، بە ژیان، بە مردن، بە دواکەوتن، بە شارستانی، بە جیهان، پێکەنین بە خودی خۆیان، بە هەموو شتێك، هە... مـ... وو... ش... ت... ێك!

یەکێکیان بە گاڵتەجاڕییەوە گوتی:

- ئێوە بیر لەوە بکەنەوە، چی دەبێت ئەگەر مرۆڤی ڕۆبۆت بهێنن و لەجیاتیی ئێمە ئەم جەنگی پارتیزانییە بکەن؟

هەموویان پێکەنین و یەکێکیان ئەمەی بۆ زیاد کرد:

- ڕاتان چییە بە هێستری ڕۆبۆتیش؟ دروستکردنی ڕۆبۆتی هێستر پێویستیی بە توانایەکی زۆر نییە و نرخەکەیشی هەرزانە، چونکە ئەوان وەکوو پیاوە ڕۆبۆتەکان عەقڵیان پێویست نییە.

هەر کەسێکیان ڕستەیەکیان بگوتبایە، لە هەموو لایەکەوە توانجیان لێی دەدا و دەنگدانەوەی پێکەنین و قاقایان وای لێ دەکردن لە زەویدا بگەوزێن، هەر کە ناخیان ئارام و ئاسوودە

دەبووەوە، یەکێکی دیکەیان دەیگوت:

- کاتێکیش دەگەنە گوندەکان هەر سێ پیاوێکی ڕۆبۆت بە سەر ماڵێك لە ماڵە جووتیارەکاندا دابەش دەبن.

- ئەوانیش وەك هەمیشە ژاژییان پێشکەش دەکەن.

بەم قسەیە قاقـای پێکەنینیـان بەرز دەبـووەوە و یەکێکـی دیکەیان شتێکی لەم جۆرەی بۆ زیاد دەکرد:

- ئێـوە بیـر لەو پیـاوە ڕۆبـۆتە بـکەنەوە کە لەبەر بـۆنی گەنیوی ژاژی لووتی خۆی توند دەگرێت.

- بیـر لە پیـاوێکی ڕۆبـۆتی بـکەنەوە سواری هێسترێکی ڕۆبۆتی بێت.

- ها ها ها ها ها ها ها ها...!

- دەسـتەیەك لە پیـاوە ڕۆبۆتییەکـان لەنـاو مزگەوتـی گونـدەکە دەخەون و لە بەر زۆریـی کـێچ و ئەسپێ خەویـان دەزڕێت و دەکەونە پرتەوبۆڵە.

- تێـرامێنن و سـەرنج بـدەن، پیـاوێکی ڕۆبـۆتی کـڵاو و جامـانەیەك لەسـەر سـەری دەبەسـتێت و سـکی خـۆی بە پشتوێنێکی دە مەتری توند توند شەتەك دەدات.

ئەم توانجە وای لێ کردن بە توندی پێبکەنن، هەتا کەوتنە سەر زەوی. یەکێکی دیکەیان بێ ئەوەی یەك چرکە مۆڵەتی پشوویان پێ بدات ئەمەی بۆ زیاد کرد:

- پیاوێکی دیکەی ڕۆبـۆتی چـاو لە کچێکـی گوندنشـین دادەگرێت.

- پیـاوێکی ڕۆبـۆتی دیـکەش چـوار سـاڵ لەگەڵ

جووتیارەکاندا دەژێت، بێ ئەوەی هیچ لە زمانەکەیان فێر بێت، تەنها ئەوەندە نەبێت بڵێ: "نان هەیە؟"

- بیر لە هێسترێکی ڕۆبۆتی بکەنەوە جووتکە دەهاوێت و لێ ناگەڕێت ئازووقەکەی لێ بار بکەن، پیاوێکی ڕۆبۆتی دیکەش لەسەر پشتی هێسترەکە دەکەوێتە خوارەوە و سەری بەرەو دۆڵەکە خلۆر دەبێتەوە.

- ئەی ڕاتان لەسەر ئەو پیاوە ڕۆبۆتە چییە کە کیسە تووتنەکەی بە ناوقەدەوە هەڵواسیوە و خەریکی پێچانەوەی جگەرەیە؟

- باشە باشە... بیر لەو پیاوە ڕۆبۆتە بکەنەوە کە لە ترسان خۆی لە شەڕەکە دەدزێتەوە و لە شەرمەزاریدا ئارەق لە ناوچەوانی دادەچۆڕێت.

بێ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن، قسەوباسەکانیان بەرەو لای جەنگ و کوشتاردا ڕۆیشت، پاشان بەرەو لای خیانەتەکەی مام جەمال و ئەو غەدرەی لە بارەگاکانی "پشتئاشان"یان کرد، بە خوێنێکی ساردیشەوە هاوڕێ شەهیدەکانیان هاتەوە یاد، ئەو دەنگە ئاشتیخوازانەو گاڵتەجارییانە گۆڕان بۆ هاوار و قیژە و مشتومڕی توندوتیژ، هەتا پێیەوە داخ بوون و هەتا ئەو ڕووداوانەشیان گێڕاییەوە کە پێشتر سەدان جار مشتومڕیان لەسەر کردوون.

یەکێکیان بە توندی هاواری کرد:

- نازانم چ نەفرەتییەکە ئێمە بەرەو گێڕانەوەی ئەو

ڕووداوە ماندووکەرانە دەبات؟ باشە بابەتی دیکە نەماوە قسەی لەسەر بکەین، تەنها ئەم کارەسات و خەفەتانە نەبێت؟! ئەوە کێ بوو قسەکەی گواستەوە بۆ کوشتارگەکەی پشتئاشان؟! بە ڕاستی ماندووبووین و ماندووبووین و چیتر ناتوانین زیاتر گوێ بگرین. سوێندتان دەدەم، کەسێك لە ناوتان هەیە دەیان جار گوێی لەم قسانە نەبووبێت؟! بەسە دەبا تۆزێك بەزەییمان بەخۆماندا بێتەوە.

یەکێکی دیکەیان گوتی:

- بەڵێ، من هاوڕام لەگەڵتدا. دەبا لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدەینەوە و بابەتەکەش بگۆڕین. ئەوە چ زۆرزان و بلیمەتێکە هەموو جارێك مشتومڕ و گفتوگۆکانمان بەرەو ئاڕاستەیەك دەبات، هیچ سوودێکی نەبێت، جگە لە خەم و ژان؟ توو خودا با بەس بێت، بابەتەکە دابخەن و لێمان گەڕێن با ئەو کارەسات و خەمە گورچکبڕانە لە یاد بکەین.

دەنگی یەکێك لە کچەکان بەرز دەبێتەوە و دەڵێت:

- دەی با پێبکەنین و دەست بە گاڵتەجاڕی بکەین، چونکە پێکەنین تەمەن درێژ دەکات. ئەرێ بگەڕێینەوە لای پیاوە ڕۆبۆتەکان یان گۆرانی بڵێین؟

- لە هەردووکیان بێزار بووین. من پێم باشە بخەوین.

یەکێکیان بە تەوسەوە دەڵێت:

- ئایا ئێمە مریشکین لە کاتژمێر حەوت و نیوەوە بنووین؟!

بە پرتەوبۆڵەوە یەکێکی دیکەیان دەڵێت:

- دەبێ لە خەوتن زیاتر بتوانین چی بکەین، بۆ ئەوەی درندەیی شەوی نەفرەتاوی بکوژین؟!

یەکێکی دیکەیان بە بێزارییەوە دەڵێت:

- خەو خەو خەو، ئەمە چ ژیانێکە؟! سبەینێ بۆ هەتاهەتایە چاو لێک دەنێین و دەنووین، بۆ پێتان وایە کوشتارگەکەی پشتئاشان سەرلەنوێ دووبارە نابێتەوە؟

دەستی بە سەرزەنشتکردنی خۆی کرد: "ئۆف، نەفرەت لە زمانم بدات، چۆن دیسانەوە باسی ئەوەم کردەوە!"

پاشان تیروتوانجەکان کۆتاییان هات و بێدەنگی قووتی دان.

## کۆتایی

ڕەحمان خۆی کوشت و ئەمەی نووسیبوو:

**"مرۆڤەکەی ناخم مرد، بۆیە دەبێ دڕندەکەش بمرێت...!"**



## عامر حوسێن (نووسەر)

- لە ساڵی ١٩٥٧ لە عێراق لەدایك بووە.

- لە ساڵی ١٩٧٩ بە هۆی بیروڕاکانی زیندانی کراوە. هەر ئەوکاتەش ڕەشنووسی یەکەم ڕۆمانی "القرف" لە لایەن ڕژێمەوە دەستی بەسەردا گیرا.

- هەر لە ساڵی ١٩٧٩ بووەتە پێشمەرگە و بەشداریی چەندین چالاکیی چەکداریی کردووە.

- هەڵگری ڕەگەزنامەی دانیمارکییە و لە ساڵی ١٩٨٥ەوە لە کۆپنهاگن دەژی.

- لە ساڵی ١٩٩١ ڕۆمانی (خلف الطواحين-پشتئاشان)ی تەواو کردووە، کە ڕۆمانێکی ڕیالیزمییە و وێنایەکی واقیعییانەی هەلومەرجی شەڕی پارتیزانی و چەکداریی کوردستانی هەشتایەکانە لە دژی دیکتاتۆرییەت، هاوکات باسی شەڕ و ئاژاوەی نێوان براکانیش دەکات.



## ڕابەر ڕەشید (وەرگێڕ)

- لە دایکبووی ١٩٦٥ گوندی کتکە ـ پردێ ـ کەرکوک
- دەرچووی خانەی مامۆستایان ـ بەشی وەرزش/ ١٩٨٣
- ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی "ئاڵای ئازادی و گۆڤاری پێشکەوتن" قۆناغی شاخ ـ ناوەڕاستی هەشتاکان.
- ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان و فیدراسیۆنی ڕۆژنامەنووسانی جیهانی.
- بەرپرسی سەنتەری ڕۆشنبیریی پردێ و سەرنووسەری ڕۆژنامەی "پردێی ئازاد".
- بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی لقی کەرکووکی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان و لقی کەرکوکی کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانی کوردستان.
- بە سەدان وتار و بابەتی لە ڕۆژنامە و گۆڤار و ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییە کوردییەکان بڵاو کردووەتەوە.

- خاوەنی "١٢" کتێبی چاپکراوی جۆراوجۆرە.
- "٢٥" کتێبی وەرگێڕاوی تایبەت بە بواری ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەنووسی ئامادەی چاپە، لەگەڵ ژمارەیەک ڕۆمان و نامیلکەی تایبەت بە ئەدەبی منداڵان.

# پشتئاشان



هەندێك لە جووتیارانی گوندی پشتئاشانی كاول و وێرانكراو لە هاوینی ڕابردووەوە گەڕابوونەوە گوندەكەی خۆیان، گوندەكە لە سەرووی بارەگای پیرەكانەوە تەنها دە خولەكێك بە پێ دوور بوو. جووتیارەكان خاوەنی ڕەسەنی خاك و باغ و بێستانەكان بوون. بە درێژایی ڕۆژ سەرقاڵی كۆكردنەوەی بەری دارگوێزەكانیان بوون و بایەخیان بە درەختە بەرییەكانی دیكەشیان دەدا، بوونیان جۆرێك لە ژیانی بەو ناوچە جوان و دابڕاوە لە جیهان بەخشیبوو. ئەم ناوچەیە پێشبینیی ئەوەی لێ دەكرا لە ئایندەدا هەڵاتووەكان سوودی لێ وەربگرن و وەكوو ئەڵقەی گرێدانی نێوان ئەو گوندانەی دەكەونە ناو سنووری ئێران و گوندەكانی ئەمدیو بۆ دابینكردنی پێداویستییەكانی خەڵكی بەكاری بهێنن، بە تایبەتی لەو قەیرانانەی كە خەڵكی بە هۆی ئەو شەڕە نەگریسەی نێوان هەردوو وڵاتەوە تووشی هاتبوون.









دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication